عەلی باپیر

# قورئان و پاکسازی و چاکسازی

# لە هەرێمی کوردستاندا

ameer.maktab@yahoo.com

/AliBapir /AliBapir /MediaAmeerOffice

www.alibapir.net

2018 - 1439

بەرهەمی

تۆڕی میدیایی کۆمەڵ



# قورئان و پاكسازیی و چاكسازیی لە هەرێمی كوردستاندا

نووسینی: عـەلی بـــاپیر

چاپی یەكەم ١٤٣٩ز- ٢٠١٨ك

خـەتی بـەرگ : نـەوزاد كۆیــی

دیزاینی ناوەوە و بەرگ : زەردەشـت كاوانــی

بابـەت : ئـایینی

تیراژ : ١٥٠٠ دانە

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی كتێبخانە گشتیەكان - هـەرێمی كوردستان
ژمـارە سـپاردنی ( ٧٢٣ ) ی ساڵی ٢٠١٨ پێدراوە

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

﴿ فَلَوۡلَا كَانَ مِنَ ٱلۡقُرُونِ مِن قَبۡلِكُمۡ أُوْلُواْ بَقِيَّةٖ يَنۡهَوۡنَ عَنِ ٱلۡفَسَادِ فِي ٱلۡأَرۡضِ إِلَّا قَلِيلٗا مِّمَّنۡ أَنجَيۡنَا مِنۡهُمۡۗ وَٱتَّبَعَ ٱلَّذِينَ ظَلَمُواْ مَآ أُتۡرِفُواْ فِيهِ وَكَانُواْ مُجۡرِمِينَ ١١٦ ﴾

هود: ١١٦.

## پێشکەش بێ

بەهەرکەسێك کە دڵسۆزانە مشووری هەرێمی کوردستان دەخوات و، لێبڕاوانە هەوڵی چارەسەرکردنی کێشەو قەیرانەکانی دەدات و، بەپێی توانا پڕۆسەی پاکسازیی و چاکسازیی تێدا ئەنجام دەدات.


ameer.maktab@yahoo.com


/AliBapir  /AliBapir  /MediaAmeerOffice

www.alibapir.net

# پێشەکیی

**بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان**

لە ڕوانگەی ئەوەی کە نووسین، یەکێکە لە سەرەکیترین ژانری بواری ڕۆشنبیری، دەتوانێت لە دوو ڕوانگەی جیاوازەوە، کاریگەرییەکانی خۆی لەسەر خوێنەر، دروست بکات.

**یەکەم:** ڕوانگەی ڕاستەوخۆ، نووسین دەتوانێت بەشێوەیەکی کردەیی و خێرا ئەو مەبەست و ئامانجانە لە نووسەرەوە بگوازێتەوە بۆخوێنەر، بەشێوەیەکی تێرو تەواو، هەروەها زۆر خێرا کاریگەریی لەسەر زیهن و بۆچونەکانی دروستبکات، هەربۆیە کتێب لە مێژووی خۆیدا توانیویەتی یەکێك بێت لە ڕێگا خێراو کاریگەرەکان لەبواری هۆشیاریی و ڕۆشنبیرییدا.

**دووەم:** نووسین لەچوارچێوەی کتێبدا ئەرشیف دەکرێت و بۆ ماوەیەکی زۆر دەمێنێتەوە، ڕەنگە تێکست لەچوارچێوەی کتێبدا شانسی گەورەی هەبێت بۆ مانەوە.

لەم ڕوانگانەوە و پەرۆشیمان بۆ بواری مەعریفەو کتێب، هەروەها بۆ خوێنەرانی کوردو ئاگایی زیاتریان بۆ نووسراوەکانی بەڕێز (مامۆستا عەلی باپیر)، کە بەرلەوەی سیاسییەکی کارای سەرگۆڕەپانی سیاسەتکردن بێت، بۆ (چواردەیە) دەچێت وەك نووسەرێکی پڕ لە ئەرك و پەیامدار، سەرگەرمی نووسین و ئارگۆمێنتکردنی بۆچونەکانییەتی.

ئەم بەرهەمە کەپێشتر یەکێك بوو لەبەرنامەکانی کەناڵی ئاسمانیی پەیام بەناوی (بەدانایی) جارێکی دیکە لەبەر گرنگی بابەتەکە، بە پێویستمانزانیی بەشێوەی کتێب پێشکەشی خوێنەرانی بکەین.

گرنگی ئەم بەرهەمە لەوەدایە کە مامۆستا عەلی باپیر، لە ڕوانگەی دونیابینیی قووڵی خۆیەوەو بەپشتبەستن بە بەڵگە قورئانییەکان و فەرموودە ڕاستەکانی پێغەمبەر (دروودی خوای لە سەر بێت)و ئەو ئاگاییەی کە لەسەر داکەوتەو واقیعەکان هەیەتی، تێزەکانی خۆی دادەڕێژێت.

مامۆستا عەلی باپیر زۆر ڕاشکاوانەو بەشێوەی ڕوون و ڕەوان ئەو داکەوتە دوور لەقورئانییە بەهۆکاری تەنگ و چەڵەمەو ئاریشەکان دەزانێت و پاشتریش بۆ چارەسەرکردنی گرفتەکان، گەڕانەوە بۆ ئەو دووسەرچاوە بەگرنگ دەزانێت.

هەروەها ئەم کتێبە کە (تۆڕی میدیایی کۆمەڵ) چاپ و بڵاوی دەکاتەوە، لەوەوە دێت کە لەکاتی دابەزینی ئەم بەرهەمە بەشێوەی دیداری تەلەفیزیۆنی، پێشوازییەکی باشی لێکراو توانی ئەندازەیەکی باش وەڵامی کۆمەڵێك پرسیاری هەنووکەیی پەیوەست بە کاریگەریی ئاینی ئیسلام و کاریگەریی شەریعەتەکەی لەبواری کردەییدا ڕوون بکاتەوە، لەم بەرهەمەدا ئاگایی و توانای فیکریی و ڕەنگدانەوەی لەبواری ئاینناسیی و گواستنەوەی بۆ ڕووبەری کردەیی کردنی مامۆستا دەردەخات، دوای خوێندنەوەی ئەم بەرهەمە، لەوە تێدەگەیت کە ئاستی تێگەیشتن و توانای تەفسیرکردن و تەرجەمەکردنی ئیسلام و شەریعەتەکەی لەلای مامۆستا، لە ئاستێکی باڵاو قووڵدایە.

ئێمە نامانەوێت لەمە زیاتر قسە لە ناوەڕۆکی کتێبەکە بکەین، ئەوە بۆخوێنەران بەجێدەهێڵین، تەمەنناى ئەوە دەکەین هەوڵەکەمان لەلایەك خزمەتکردن بێت بەفیکرو تێگەیشتنی مامۆستاو دواتریش سوودێکمان بە خوێنەرانی خۆشەویست گەیاندبێت.

فاروق عەلی

بەڕێوەبەری گشتیی تۆڕی میدیایی کۆمەڵ

# پێشه‌كیی

الْحَمْدُ للهِ نَحْمَدُهُ وَنَسْتَعِينُهُ، وَنَسْتَغْفِرُهُ، وَنَعُوذُ بِاللَّهِ مِنْ شُرُورِ أَنْفُسِنَا، وَمِنْ سَيئَاتِ أَعْمَالِنَا، مَنْ يَهْده اللهُ فَلاَ مُضِلَّ لَهُ، وَمَنْ يُضلِلْ فَلاَ هَادِيَ لَهُ، وَأَشْهَدُ أَن لاَ إِلَهَ إلاّ اللهُ وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ، وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّداً عَبْدُهُ وَرَسولُهُ.

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ حَقَّ تُقَاتِهِۦ وَلَا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنتُم مُّسۡلِمُونَ ١٠٢ ﴾ آل عمران

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُواْ رَبَّكُمُ ٱلَّذِي خَلَقَكُم مِّن نَّفۡسٖ وَٰحِدَةٖ وَخَلَقَ مِنۡهَا زَوۡجَهَا وَبَثَّ مِنۡهُمَا رِجَالٗا كَثِيرٗا وَنِسَآءٗۚ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ ٱلَّذِي تَسَآءَلُونَ بِهِۦ وَٱلۡأَرۡحَامَۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلَيۡكُمۡ رَقِيبٗا ١ ﴾ النساء

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَقُولُواْ قَوۡلٗا سَدِيدٗا ٧٠ يُصۡلِحۡ لَكُمۡ أَعۡمَٰلَكُمۡ وَيَغۡفِرۡ لَكُمۡ ذُنُوبَكُمۡۗ وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ فَقَدۡ فَازَ فَوۡزًا عَظِيمًا ٧١ ﴾ الأحزاب

أَمَا بَعد:

فَإِنّ أَصْدقَ الَحديث كَلامُ الله وَخَيرَ الهَدْي هَديُ مُحَمَّد صَلَّى اللَّه عَليهِ وَسلَم وَشَرَّ الأُمورِ مُحْدَثاتُها، وَكُلّ مُحدثةٍ بِدْعة، وَكُلّ بِدْعةٍ ضَلالة، وَكُلّ ضَلالةٍ في النّار.

**خوێنه‌ری سه‌نگین و شیرین!**

به‌دڵنیاییی كۆمه‌ڵگا زیندوو و ته‌ندروست ئه‌و كۆمه‌ڵگایه‌یه‌ كه‌ تاكه‌كانی به‌ گشتیی به‌وردو درشت و سه‌روخواره‌وه‌ خۆیان له‌به‌رانبه‌ر دین و ژینی كۆمه‌ڵگایه‌كه‌یاندا به‌ به‌رپرسیار ده‌زانن و، هیچ كاتێك به‌ڕه‌وای نازانن گوێی خۆیان له‌ئاست گیرو گرفت و هه‌وارو ئازاره‌كانیدا بخه‌وێنن و، هه‌رگیز له‌خۆیانی ناوه‌شێننه‌وه‌ له‌به‌رانبه‌ر ده‌ردو نه‌خۆشیی و نه‌هامه‌تییه‌كانیدا چاوی خۆیان بنووقێنن!

ئنجا ئه‌م به‌رهه‌مه‌ی به‌رده‌ستیشت هه‌وڵ و هه‌نگاوێكی دیكه‌ی به‌نده‌یه‌ له‌و پێناوه‌دا "دوای كتێبی: (ڕوانینێكی ئیسلامییانه‌ بۆ واقیعی ئێستامان: گرفت و چاره‌سه‌ر)" كه‌ هیوادارم كه‌لێنێكی باش بگرێ و مایه‌ی به‌رچاو ڕوونیی و هۆشیاریی و بێداریی زیاتری خه‌ڵكێكی زۆر بێ.

دیاره‌ ئه‌م كتێبه‌ش بریتیه‌ له‌كۆی بیست (٢٠) ئاڵقه‌ چاوپێكه‌وتن و وتووێژی نێوان به‌نده‌و كاك (دانا موحه‌ممه‌د)، كه‌ له‌كه‌ناڵی ئاسمانیی په‌یام په‌خش كراو[١]، له‌كه‌ناڵی تایبه‌تی خۆم له‌ یوتیوب، به‌و لینكه‌ ده‌توانن بینه‌ری سه‌رجه‌م به‌رنامه‌كه‌بن (https://www.youtube.com/playlist?list=PL6HuvNeX-iFwtJHnTMr3LtTfQi2Hce2vfw).

ئه‌ویش له‌ژێر ڕۆشنایی ئه‌و بابه‌ته‌ بیست و پێنج (٢٥) ئاڵقه‌ییه‌دا، كه‌ پێشتر له‌لاپه‌ڕه‌ی تایبه‌تی خۆم له‌ فه‌یس بوك (www.facebook.com/alibapir)دا بڵاوكرابوونه‌وه‌، له‌ژێر ناو و نیشانی: (بۆ چاره‌سه‌ری واقیعی هه‌رێم با گوێ له‌قورئان بگرین)دا.[٢]

ئیدی دوای هێنرانه‌ سه‌ر كاغه‌زیان له‌لایه‌ن چه‌ند برایه‌كی دڵسۆزه‌وه‌و چاوپێداگێڕانه‌وه‌ی وردی خۆم و دووباره‌ هه‌ڵه‌چنیی وردبینانه‌ی برای به‌ڕێزم كاك (هه‌رێم هادی)یه‌وه‌، به‌م شێوه‌ی ئێستای لێهات.

خوا به‌باشترین شێوه‌ پاداشتی هه‌موو ئه‌و به‌ڕێزو دڵسۆزانه‌ بداته‌وه‌، كه‌ ڕۆڵیان له‌ ئاماده‌كردنی ئه‌م كتێبه‌دا گێڕاو سوپاسی (تۆڕی میدیایی كۆمه‌ڵ)یش ده‌كه‌م كه‌ ئه‌ركی دیزاین و چاپ و بڵاوكردنه‌وه‌یان وه‌ ئه‌ستۆ گرت، خوا پاداشتی شایسته‌یان بداته‌وه‌و هه‌مووولایه‌ك هه‌ر شادو ساغ و سه‌ربه‌رزبن.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ ،أشهد أن لاَ إِلَهَ إلاَّ أَنْتَ ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ

عه‌لی باپیر / هه‌ولێر

٢ی شه‌ووال/١٤٣٩ ك - ٢٠١٨/٦/١٦ ز

---

(١) له‌ ڕۆژی : (٢٢ / ٧ / ٢٠١٦ تاكو: ١ / ٥ / ٢٠١٧).

(٢) له‌ ڕۆژی: (٢٩ / ٢ / ٢٠١٦ تاكو: ٢٧ / ٤ / ٢٠١٦).

**دەقی بیست و پێنج (٢٥) بنەمـا قورئـــانییەكە:**

**بنەمای یەكەم:** بوونناسیی ئیسلامیی خوازیاری ئازادیی و ماف و ڕێزی یەكسانە بۆ مرۆڤەكان.

**بنەمای دووەم:** خوا بەیەكگرتن (التوحید) خوازیاری یەكسان بوونی مرۆڤەكانەو ڕێگرە لە پێشێلكردنی ئازادیی و ماف و كەرامەتیان.

**بنەمای سێیەم:** خوا هەموو پێغەمبەرانی بۆ چەسپاندنی دادگەریی ناردوە، تاكو ڕێ لەستەم و چەوساندنەوە بگیرێ.

**بنەمای چوارەم:** ستەمكاریی، هۆكاری نەفرینی خوا و ڕووخانی كۆمەڵگایە.

**بنەمای پێنجەم:** قۆرخكردنی دەستەڵاتو دەست بەسەرداگرتنی سامان، دوو بەرجەستەكەری سەرەكیی ستەمن.

**بنەمای شەشەم:** با سیمرغانە بیرنەكەینەوە: گۆڕانی واقیعمان، بەرهەمی خۆگۆڕینمانە!.

**بنەمای حەوتەم:** بینینی هەڵەو تاوانەكانمان و دانپێدانانیان، یەكەمین هەنگاوی چاكسازییە.

**بنەمای هەشتەم:** گەڕانەوە بۆ لای خوا مایەی دەرووی خێر لێكرانەوەیە.

**بنەمای نۆیەم:** خەڵك و جەماوەر بۆ چاككردنی واقیعی كۆمەڵگا، بەرپرسیارێتیی سەرەكییان لەسەرشانە.

**بنەمای دەیەم:** با پەند لەمێژوو وەربگرین، چونكە یاساكانی خوا (سنن الله) لەژیانی بەشەردا هەمیشەیی و گشتگیرن.

**بنەمای یازدەیەم:** پاكسازیی بە پاكان و، چاكسازیی بەچاكان و، ڕاستكردنەوە بەڕاستان دەكرێ.

**بنەمای دوازدەیەم:** خۆبەزلگران نەمانیان و، چەوسێنراوان مافەکانیان لە پەیامی پێغەمبەران دا دەبینن.

**بنەمای سێزدەیەم:** تێکدان ئاسانەو بەکەمێکیش دەکرێ، بەڵام بنیاتنان قورسەو بەزۆران نەبێ ناکرێ.

**بنەمای چواردەیەم:** هۆکاری بنەڕەتیی سەرکەوتنو شکستمان، خۆمانین، نەك دەوروبەری خۆمان.

**بنەمای پازدەیەم:** خەرجیی بەرەنگاربوونەوەی ستەم و خراپە، زۆرکەمترە لەباجی بەردەوامبوون لەسەر ملکەچکردن بۆ ستەمو خراپە.

**بنەمای شازدەیەم:** ویستی خوای دادگەر پشتیوانی چەوساوانەو دژی ستەمکارو چەوسێنەرانە.

**بنەمای حەڤدەیەم:** با لەسەر بناغەی دڵسۆزیی و ساغیی و ڕاستیی (النُّصْح والإخلاص والصدق) بۆیەکدی، پێکەوە مامەڵە بکەین، نەك بەگرێ و گۆڵی دەروونییەوە.

**بنەمای هەژدەیەم:** با لەواقیعدا بژین نەك لە مێژووداو، لێنەگەڕێین ڕابردوومان دەستمان ببەستێ لەبەردەم ئێستاماندا.

**بنەمای نۆزدەیەم:** تێگەیشتن و بیرۆکە ڕاست و ئاکارو بەها بەرزەکان، هۆکارێکی گرنگی تەبایی کۆمەڵایەتیی و سیاسیین لەکۆمەڵگادا.

**بنەمای بیستەم:** تەبایی و هاوکاریی پێکەوە کردنی پێکهاتەکانی کۆمەڵگا، مەرجی بنەڕەتیی بەرەو پێشچوون و سەرکەوتنیەتی.

**بنەمای بیست و یەکەم:** بەهۆی نەزانیی و ترس و تەماعەوە، خەڵك بەژێردەستەیی ستەمکاران قایل دەبێ.

**بنەمایی بیست و دووەم:** هەمیشە ستەمکار و خۆشگوزەرانانی گەندەڵکار، دژی گۆڕانکاریی و چاکسازیی بوون.

**بنەمای بیست و سێیەم:** نیشتە جێ بوون لەشوێنی ستەمکاران داو، دووبارە کردنەوەی کردەوەو ڕەفتارەکانیان، نیشانەیەکی زەقی حوکمڕانانی خۆسەپێنو قۆرخکارە.

**بنەمای بیست و چوارەم:** هاندان و وروژاندنی خەڵکو جەماوەرو چەواشەکردنیان، لەبەرانبەر هەوڵدان بۆ پاکسازیی و چاکسازیی، نەریتێکی کۆنی قۆرخکەرانی دەستەڵات و سامانە.

**بنەمای بیست و پێنج:** داهاتوو بۆ پارێزکارانی پاکسازیی و چاکسازییکارەو، سەرەنجامی دنیا و دوارۆژی ستەمکاران، شوومە.

## بــەرایی

## بەرنــامەی بە دانــایی

(بەدانایی) بەرنامەیەکی تایبەت دەبێت، لەگەڵ کەسایەتی سیاسیی و رۆشنبیری دیاری نێو کۆمەڵگەی کوردی، بەڕێز مامۆستا عەلی باپیردا.

(بە دانایی) بۆ حیکمەتە قورئانییەکان دەگەڕێت و دەیەوێت حضورێکی دیکە دروست بکات، کە قورئانی پیرۆز دەبێتەوە بە چاوگ و سەنتەری ژیان، ژیان لێرەوە سەرلەنوێ تاجی فەخری قورئانیی بوون ئەکاتە سەری و کۆشکی ژیان سەرلەنوێ دەڕازێنێتەوە.

بە دانایی دەیەوێت دەستێکی تەژی دوعا بەرز بکاتەوە و، جوانییە ئاسمانییەکان بگێڕێتەوەو وەکو زەمزەمی حەیات، بە هەمووانی نۆش بکات.

ئێمە لێرەوە، لەگەڵ ئاسۆ روونەکانی فیکر و بیری مامۆستا عەلی باپیردا، جارێکی دیکە لەسەر پەنجەرەکانی ژیانتان هەڵدێین و، سەلامی میهرەبانی قورئانە پیرۆزەکەی ئیلاهیتان بۆ دەهێنین.

(بەدانایی)، جیهانبینی مامۆستا عەلی باپیر دەبێت، لە کۆ ئەڵقەیەکی بەدانایی و لە کەناڵی ئاسمانی (پەیام)ەوە پێشکەش دەکرێت، لێرەوە بەهرەمەند دەبن لە حزوورە بەرجەستەکانی قورئانی پیرۆز لە تێزەکانی بەڕێز مامۆستا عەلی باپیردا، تەمەنناى ئێمە ئەوەیە بتوانین لە ئاست دەرخستنی درەوشاوەییەکانی قورئانی پیرۆز، بە جۆرێك بین کە خەرمانی بیرمان سەرڕێژی چاکەکاریی بکات و، ئیدی تێگەیشتن و راڤەکانی مامۆستاش جارێکی دیکە، دڵی تۆراومان بە حیکمەت و جوانییەکانی قورئان ئاشت بکاتەوە.

# ئاڵقەی یەکەم

## چۆن لە قورئان
## بەهرەمەندبین بۆ چارەسەری
## ئەم واقیعەمان؟


ameer.maktab@yahoo.com

 /AliBapir  /AliBapir  /MediaAmeerOffice

www.alibapir.net

بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان، سڵاوتان لێ بێت بینەرانی ئازیز و خۆشەویستی کەناڵی ئاسمانی پەیام، خۆم بەخۆشحاڵ دەزانم لە ئەڵقەیەکی نوێ لە کەناڵی پەیام، بەناوی (بەدانایی) لە خزمەت بەڕێز جەنابی مامۆستا عەلی باپیر، ئەمیری کۆمەڵی ئیسلامی، هەروەها رۆشنبیر و نووسەر و موفەکیری دیاری هەرێمی کوردستان، بەدیدارتان شاد دەبمەوە لەم بەرنامەیەدا تیشك دەخەینە سەر چەند بابەتێکی گرنگ، کە جەنابی مامۆستا لە زنجیرەیەك بابەتدا لە تۆڕی کۆمەڵایەتی فەیسبووك و لە هەژماری خۆیدا ئاماژەی پێکردوون، لەسەر بارودۆخی هەرێمی کوردستان.

**دانـــا:** **مامۆستا گیان! سوپاس بۆ ئەوەی، کە دەرفەتت پێ بەخشین، کاتی خۆتت دا بە ئێمە بۆ ئەوەی کە ئەم بەرنامەیەو ئەم ئەڵقانە لەگەڵ جەنابتدا تۆمار بکەین.**

**مامۆستـا:** سوپاس بۆ جەنابیشتان و زۆر بەخێر بێی کاك دانا.

**دانـــا:** **زۆر سوپاس، مامۆستا! جەنابت لەسەر بارودۆخی هەرێمی کوردستان، کە ئێستا بە شێوازێکی زۆر چڕ ئاڵقاوە بەیەکداو وەك ئەوەی ئەوترێ هیچ شتێ لە هیچ شتێ جیاناکرێتەوە، لە هەژماری تایبەتی خۆت لە تۆڕی کۆمەڵایەتی فەیسبووك زنجیرە بابەتێکت بەناوی "بۆ چاککردنی ئەم دۆخەی هەرێم، با گوێ لە قورئان بگرین"، بڵاو کردووەتەوە، بێگومان ئەوەی سەیردەکرێت خەڵکێکی زۆر، خوێنەرێکی زۆر کۆمێنتیان نووسیوەو پرسیاریان کردووەو، لایکی بابەتەکەی جەنابتیان کردوە، بۆیە بووە مایەی ئەوەی کە ئێمە بەشێوازێکی دەنگیی و ڕەنگیی بەرنامەی لەسەر بکەین، کە بە گرنگمانزانی، من لە جەنابت ئەپرسم: ئێمە چۆن سوود لە قورئان وەربگرین، بۆ بارودۆخێکی شێواوی ئێستای هەرێمی کوردستان؟**

**مامۆستا:** بسم الله الرحمن الرحيم، الحمد لله، وصلى الله تعالى وسلم وبارك على رسول الله محمد وآله المهتدين بهداه، من الصحب والأزواج والقرابة والتابعين لهم باحسان الى يوم اللقاء. دووبارە بەخێربێن کاك دانا، وەکو موژدە بۆ جەنابیشت و بۆ بینەران و بیسەرانی بەڕێزیش، ئەو زنجیرە ئاڵقەیە لە ژێر ناوونیشانی (بۆ چارەسەری بارودۆخی هەرێم، با گوێ لە قورئان بگرین)، ئێستا بووەتە

بەشێكی سەرەكی لە كتێبێك بە ناوی (ڕوانینێكی ئیسلامییانە بۆ واقیعی ئێستامان)، ئەوە لە ژێر چاپە، وە ان شاء الله لە ڕۆژانی داهاتوودا دەكەوێتە بەر دیدی خوێنەران[1].

خوای پەروەردگار قورئانی ناردوە، وەك بۆخۆی فەرموویەتی و پێناسەی كردوە:

﴿ إِنَّ هَٰذَا ٱلْقُرْءَانَ يَهْدِى لِلَّتِى هِىَ أَقْوَمُ ﴾ [الإسراء: ٩]

بێگومان ئەم قورئانە ڕێنمایی دەكات بۆ شێوە ژیانێك كە ڕاستترە، چاكترە، تەواوترە، جا خوا (سبحانه وتعالى) لێرەدا دیاریی نەكردوە، شێوە ژیانی چی؟ بۆ تاك، بۆ خێزان، بۆ كۆمەڵگا، لە ڕووی ئابووریی، لە ڕووی سیاسیی، لە ڕووی كۆمەڵایەتی؟ بە گشتی فەرموویەتی، هەروەها لەسەرەتای سورەتی (ابراهیم) دا، خوا (سبحانه وتعالى) دەفەرمویٚ:

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ ﴿ الٓر ۚ كِتَٰبٌ أَنزَلْنَٰهُ إِلَيْكَ لِتُخْرِجَ ٱلنَّاسَ مِنَ ٱلظُّلُمَٰتِ إِلَى ٱلنُّورِ بِإِذْنِ رَبِّهِمْ إِلَىٰ صِرَٰطِ ٱلْعَزِيزِ ٱلْحَمِيدِ ﴿١﴾ ﴾ [ابراهیم: ١]

واتە: ئەمە كتێبێكە ناردوومانەتە خوار بۆ لای تۆ، تاكو خەڵك لە تاریكییەكان دەربێنیت بەرەو ڕۆشنایی، بەرەو ڕاستە شەقامی خوای زاڵی ستایشكراو.

قورئان هاتوە خەڵك لە تاریكییەكان دەربێنیٚ، تاریكی نەناسینی بوون، واتە نەبوونی بوونناسیی، ئەنتۆلۆجییەكی ڕاست و دروست دەربارەی ئەم دەورووبەر و بوونەوەرە كە تێیدا دەژین، تاریكی سەراسیمەیی و سەرگەردانی، نەبوونی عەقیدەیەكی ڕاست و دروست، تاریكی نەزانینی كە كیٚ بپەرستریٚ، كیٚ تەنیا شایستەی پەرستنە، كە تەنیا خوایە (سبحانه وتعالى)، تاریكی چۆنییەتی پێكەوەژیانی كۆمەڵگا لە ڕووی ئابووریی، سیاسی، كۆمەڵایەتی.. هتدەوە!

قورئان هاتوە كە وەك خوا فەرموویەتی: ئینسان بەرەو ژیانێكی ڕێكتر، چاكتر لە هەموو ڕەهەندەكانی ژیاندا ڕێنمایی بكات، هاتوە كە مرۆڤایەتی دەربێنیٚ لە

---

(١) دوایی لەساڵی ٢٠١٧ دا لەچاپ كرا.

تاریكاییه‌كان به‌ره‌و رۆشنایی، ئه‌وه‌ش كه‌ خوا فه‌رموویه‌تی، له‌ دنیای واقیعدا به‌رجه‌سته‌ بووه‌، واته‌ نه‌ك وه‌ك (كۆماری ئه‌فلاتون)، یان (مه‌دینه‌ی فازیله‌ی فارابی) و ئه‌و كتێبانه‌ی دیكه‌ كه‌ فه‌یله‌سوفه‌كان نووسیوویانن، هه‌ر تیۆر بێت و له‌ دوو توێی كتێبێكدا مابێته‌وه‌، به‌ڵكو له‌ عالـه‌می فیكر و تیۆره‌وه‌ گوازراوه‌ته‌وه‌ بۆ دونیای واقیع و، له‌ واقیعێكی مێژووییدا به‌رجه‌سته‌ بووه‌، له‌ ده‌وڵه‌تێك، له‌ قه‌واره‌یه‌كی سیاسیدا كه‌ سێزده‌ سه‌ده‌ ته‌مه‌نی بووه‌، كه‌ درێژترین ده‌وڵه‌ت بووه‌ له‌سه‌ر ڕووی زه‌وی، كه‌ مرۆڤ دروستی كردبێت به‌ هه‌موو قۆناغه‌كانی سه‌رده‌می پێغه‌مبه‌ر (صلى الله علیه وسلم) و چوار خه‌لیفه‌ ڕاشیده‌كان و ئومه‌وییه‌كان و عه‌باسییه‌كان و عوسمانییه‌كان، تاكو له‌ ساڵی (١٩٢٤)دا له‌سه‌ر ده‌ستی كه‌مال ئه‌تاتورك، به‌ده‌ست له‌پشتدانی زلهێزان و هاوكاریی ئه‌وان، كۆتایی پێ هێنرا، كه‌واته‌ قورئان، ئه‌وه‌ی كه‌ خوا ده‌فه‌رموێ: (به‌ره‌و باشترین ژیان خه‌ڵك ڕێنمایی كات) هه‌روه‌ها وه‌ك خوا ده‌فه‌رموێ: (ئه‌ی پێغه‌مبه‌ر (صلى الله علیه وسلم) قورئانمان بۆ تۆ ناردوه‌ تاكو خه‌ڵك له‌ تاریكاییه‌كاندا ده‌ربێنی) به‌كرده‌وه‌ ئه‌مه‌ له‌ دونیای واقیعدا به‌رجه‌سته‌ بووه‌، كۆمه‌ڵگایه‌ك دروستبوو، كه‌ باشترین كۆمه‌ڵگا بوو، به‌ هه‌موو پێوه‌ره‌كان، له‌ ڕووی فیكریی، له‌ ڕووی ڕه‌وشتی و به‌ها به‌رزه‌كان، له‌ ڕووی شارستانیی، له‌ ڕووی ڕووحیی (مه‌عنه‌ویی)، له‌ ڕووی ئابووریی و ئیداریی.. له‌ هه‌موو ڕووه‌كانه‌وه‌ مرۆڤایه‌تی قه‌رزداری ئه‌و قه‌واره‌ ئیسلامییه‌یه‌، ئه‌و ده‌وڵه‌ته‌ ئیسلامیه‌یه‌، كه‌ بووه‌ به‌ مایه‌ی خێر و خۆشیی و، بووه‌ به‌ مایه‌ی بێداری و هۆشیاریی مرۆڤایه‌تی به‌ گشتیی، له‌ هه‌موو ڕووه‌كانه‌وه‌ كه‌ ئه‌وه‌ دیاره‌ پێویستی به‌ ورده‌كاریی و له‌سه‌ر ڕۆیشتنی زیاتر ده‌كات.

**دانا: مامۆستا! ئێستا ئه‌گه‌ر بینه‌رێك ئاگای له‌م قسانه‌ی جه‌نابت بێ، ده‌ڵێت: ئێمه‌ خۆ یه‌كمان له‌سه‌ر قورئان نه‌كه‌وتوه‌ له‌ هه‌رێمی كوردستان دا، ئه‌وه‌ی ئێمه‌ یه‌كمان له‌سه‌ری كه‌وتوه‌ كۆمه‌ڵێك یاسان، كه‌ خۆمان دامانناون و خۆمان پێشێلیان ئه‌كه‌ین، پرسیاره‌ جه‌وهه‌رییه‌كه‌ لێره‌دا ئه‌وه‌یه‌، بۆچی جه‌نابت ئه‌مانگێڕیته‌وه‌ بۆ ئه‌وه‌ی كه‌ گوێ له‌ قورئان بگرین، بۆ چاره‌سه‌ركردنی ئه‌م دۆخه‌ی خۆمان تێكمان داوه‌، به‌و یاسایانه‌ تێكمانداوه‌، كه‌ خۆمان ئێستا جێبه‌جێیان ناكه‌ین؟**

**مامۆستا:** بۆیه‌ ده‌بێ بگه‌ڕێینه‌وه‌ بۆلای قورئان و بۆلای خاوه‌نی قورئان، چونكه‌ ئینسان ته‌نیا عه‌قڵ نییه‌، ئینسان وێڕای ئه‌وه‌ی، كه‌ عه‌قڵه‌ و، به‌و عه‌قڵه‌ راستییه‌كان ده‌رك ده‌كات و، ڕاست و چه‌وت و، چاك و خراپ، لێك جیاده‌كاته‌وه‌، ئینسان وێڕای ئه‌وه‌ش، ده‌روونه‌، دڵه‌، ئیراده‌یه‌، هه‌ر بۆیه‌ من جارێك له‌گه‌ڵ یه‌كێك له‌ بڕیاربه‌ده‌ستان و سه‌ركرده‌كانی ئه‌م وڵاته‌ قسه‌م ده‌كرد، كه‌ ئه‌ویش باسی ئه‌وه‌ی ده‌كرد: ئه‌م كۆمه‌ڵگایه‌ی خۆمان گۆڕانكاریی تێدا بكه‌ین، پاكسازیی و چاكسازیی بكه‌ین و بیگۆڕین.

من گوتم: تۆ به‌ته‌مای چیت؟ چۆنی چاك ده‌كه‌ی؟

گوتی: له‌ ڕێی ئیعلام و راگه‌یاندنه‌وه‌، له‌ ڕێی هۆشیاركردنه‌وه‌ی خه‌ڵكه‌وه‌.

منیش به‌ پێكه‌نینێكه‌وه‌ گوتم: ئنجا خۆ به‌ڕێز ئه‌وانه‌ی له‌م وڵاته‌دا گه‌نده‌ڵیی ده‌كه‌ن، قۆرخكاریی ده‌كه‌ن، سته‌م ده‌كه‌ن، هۆشیارانه‌ ده‌یكه‌ن، ناهۆشیارانه‌ نایكه‌ن، خۆ زیاتر ئه‌و چینه‌ سیاسییه‌یه‌، كه‌ به‌ حساب بژارده‌ی نێو كۆمه‌ڵگایه‌، له‌ خه‌ڵكه‌كه‌ی دیكه‌ هۆشیارترن و شاره‌زاترن و به‌ ئه‌زموونترن.

ئه‌ویش هه‌ڵوه‌سته‌یه‌كی كرد و گوتی: ڕاسته‌، گوتی: ئه‌دی كه‌واته‌ چی بكه‌ین؟

گوتم: مرۆڤ ته‌نیا به‌وه‌ چاك نابێ زانیاریی باش بچێته‌ عه‌قڵیه‌وه‌، به‌ڵكو ده‌بێ ئه‌و مه‌علوومات و زانراوه‌ ڕاست و دروستانه‌ له‌ عه‌قڵه‌وه‌ ته‌حویل ببن بۆ دڵ، بۆیه‌ پێغه‌مبه‌ری خوا (علیه الصلاة والسلام) له‌ باسی خه‌واریجدا ده‌فه‌رمویێ: "يقرؤون القرآن لا يجاوز حناجرهم"، "لا يجاوز تراقيهم" متفق عليه، هه‌ردووك وشه‌كه‌ هاتوون، قورئان ده‌خوێنن، به‌ڵام له‌ گه‌روویان ئه‌ودیو نابێ، واته‌ هه‌ر له‌ مێشكیاندایه‌ وه‌ك مه‌علوومات و زانین، به‌ڵام نه‌گۆڕاوه‌ بۆ بوونه‌ حاڵ و توانین، من له‌ هه‌ندێ له‌ كتێبه‌كانی خۆمدا باسی ئه‌وه‌ ده‌كه‌م، كه‌ حاڵه‌تی چاكی ئینسان ئه‌وه‌یه‌، كه‌ زانینه‌كه‌ی بگۆڕێ بۆ توانین، حاڵیبوونه‌كه‌ی تێدا بێته‌ حاڵ، هه‌م شاره‌زا بێ، هه‌م كارا بێ، ئنجا ئێمه‌ له‌ڕێی ئیمانه‌وه‌ نه‌بێ ئه‌و پرۆسه‌یه‌مان بۆ ناكرێ، بۆیه‌ش كه‌ باسی قورئان ده‌كه‌م له‌ (بنه‌مایه‌كاندا) له‌ پێش

هەموو شتێكدا باسی (بوونناسیی)م كردوە، دوایی باسی خوا بەیەكگرتنم كردوە، كە كرۆك و بناغەی ئیمان و عەقیدەیە، دوایی باسی دادگەریی و باسی هەموو ئەو بەها بەرزانەی دەكەین، كە لە قورئاندا هەن بۆ بەڕێوەبردنی كۆمەڵگا، بۆ چاككردنی كۆمەڵگا، كەواتە ئێمە بۆیە دەبێ بگەڕێینەوە بۆ قورئان، چونكە خەڵكێكی زۆر هەیە دەزانێ كە ئەوە حەرامە، ئەوە گەندەڵییە، ئەوە ستەمە، ئەوە خراپەیە، بەڵام دەشیكات، بۆچی؟ چونكە وەك گوتم، وەك زانیاریی لە مێشكیدا هەیە، دەزانێ، بەڵام ناتوانێ، حاڵیی بووە، بەڵام تێیدا نەبۆتە حاڵ، ئەوە بەچی دروست دەبێتەوە جارێكی دی؟ بە ئیمان و پەیوەستبوون بە خواوە، بە خۆ بە بەندەی خوا زانین، ئنجا خۆبەبەندەی خوا زانینیش لەچیدا بەرجەستە دەبێت؟ لە شوێنكەوتنی كتێبی خوادا، لە شوێنكەوتنی ئەو بەرنامەیەدا كە خوا بە پێغەمبەری خاتەمدا (علیه الصلاة والسلام) ناردوویەتی، كە وەك گوتم، بۆیە هاتوە كە مرۆڤایەتی ژیانێكی ڕاستتر و چاكتر بگوزەرێنێ و، لە تاریكاییەكان بێتە دەر، تاریكایی سیاسیی، ئابووریی، كۆمەڵایەتیی و لە ڕووی ڕەوشت و هەڵسوكەوتەكانەوە، بەرەو ڕۆشنایی هەمەلایەن.

**دانا: مامۆستا! دەتەوێ ئەوە بە خوێنەران و بینەران و هاووڵاتیانی هەرێمی كوردستان بڵێیت كە: جگە لە قورئان، دەستوورێك، نیزامێكی دیكەمان نیە بۆ ئەوەی ژیانی خۆمانی پێ ڕێكبخەین، یان نا؟ ئەگەر پرسیارەكە بەم جۆرە بكەم: ئایا غەیری قورئان، دروستە كۆمەڵگایەكی مسوڵمان سوودببینێ لەهەر ڕێبازێكی دیكە، یان هەر یاسایەكی دیكە، یان هەر پەیڕەوێكی دیكە بۆ ئەوەی كە ژیانی سیاسی و كۆمەڵایەتی و ئابووریی خۆی پێ ڕێكبخات؟**

**مامۆستا:** قورئان، هەروەها سوننەتی پێغەمبەریش (صلى الله علیه وسلم)، كە وەك زۆرجار گوتراوە شەرح و لێكدانەوەی قورئانە، بەڵام ئەوە وانیە، خوای فەرموویەتی:

﴿وَأَنزَلْنَآ إِلَيْكَ ٱلذِّكْرَ لِتُبَيِّنَ لِلنَّاسِ مَا نُزِّلَ إِلَيْهِمْ وَلَعَلَّهُمْ يَتَفَكَّرُونَ ﴿٤٤﴾﴾

[النحل: ٤٤]

زیكرمان بۆلای تۆ ناردوه تاكو ئەوەی بۆ خەڵك نێردراوەته خوار، بۆیان ڕوون بكەیەوە و بۆ ئەوەی خۆشیان بیر بكەنەوە.

جا هەندێك لە زانایان، بە بۆچوونی من تۆزێك بەسەر كێڵیی، ئەم ئایەتەیان ئەم ڕستە قورئانییەیان مانا كردوە، گوتوویانە: پێغەمبەری خوا (علیه الصلاة والسلام) ئەركی بریتی بووە لە تەفسیركردنی قورئان و ڕوونكردنەوەی قورئان.

**دانـــا:** بۆچی وانیه؟

**مامۆستا:** نەخێر، چونكه قورئان ڕوونه و پێویستیی بە ڕوونكردنەوە ناكات، خوا فەرموویەتی:

﴿ الٓر ۚ تِلۡكَ ءَايَٰتُ ٱلۡكِتَٰبِ وَقُرۡءَانٖ مُّبِينٖ ﴾ [الحجر: ١]،

﴿ تِلۡكَ ءَايَٰتُ ٱلۡكِتَٰبِ ٱلۡمُبِينِ ﴾ [الشعراء: ٢]،

﴿ طسٓ ۚ تِلۡكَ ءَايَٰتُ ٱلۡقُرۡءَانِ وَكِتَابٖ مُّبِينٍ ﴾ [النمل: ١]،

﴿ تِلۡكَ ءَايَٰتُ ٱلۡكِتَٰبِ ٱلۡمُبِينِ ﴾ [القصص: ٢]،

﴿ تِلۡكَ ءَايَٰتُ ٱلۡكِتَٰبِ ٱلۡحَكِيمِ ﴾ [لقمان: ٢]،

قورئان بۆخۆی ڕوونه و ڕوونكەرەوەشە، چونكه وشەی (مبین) دەگونجێ لە (أبان)ی لازمەوە بێ، كە پێویستی بە (مفعول به) ناكات، واته: ڕوون، ڕۆشن، دەشگونجێ لە (أبان)ەی موتەعەددییەوە هاتبێ، كە ئەوكاته (مبین) یانی: ڕوونكەرەوە و ڕۆشنكەرەوە، ئنجا قورئان هەم ڕوونه و هەم ڕوونكەرەوەشە.

**دانــا: ئەدی ئەم هەموو تەفسیر و موفەسیرە كە تەفسیری قورئانیان كردوە، چییان بەسەرهات؟!**

**مامۆستا عەلی باپیر:** ئێستا بۆت باس دەكەم: دیاره كە قورئان ڕوونه و ڕوونكەرەوەیه یانی: بۆ ئەهلی خۆی، بۆ كەسانێك كە شارەزا بن، بەڵام من قسه لە پێغەمبەری خوا دەكەم (علیه الصلاة والسلام)، ئایا كار و ئەركی پێغەمبەری

خوا ئەوەبووە كە قورئان تەفسیر بكات، ئەدی كوا تەفسیری پێغەمبەری خوا بۆ قورئان؟

**دانـــا: پرسیارێكی بەجێیە؟**

**مامۆستا:** ئەگەر پێغەمبەری خوا (علیه الصلاة والسلام)، خوا روونكردنەوەی قورئانی پێ سپاردبایە، ئێستا (التفسير النبوي للقرآن الكريم)مان دەبوو، ئەو كاتەش پێویستیمان بە تەفسیرێكی دیكە نەدەبوو، بەڵام نا، روونكردنەوەی پێغەمبەری خوا بۆ قورئان، بریتی بووە لە چۆنیەتی كارپێكردنی قورئان، چۆنێتی تەتبیقكردن و بەرجەستەكردنی قورئان، یانی: خوای پەروەردگار دەفەرموێ: نوێژ بكەن (أقيموا الصلاة)، چۆن نوێژ بكەین؟ پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم)، بەلای كەمەوە دووجار لەسەر مینبەر وەك لە صەحیحی بوخاریی و موسلیمدا هاتوە، لەسەر مینبەر نوێژی كردوە، فەرموویەتی: (صلوا كما رأيتموني أصلي) واتە وەك چۆن منتان بینی نوێژم كرد، ئاوا نوێژ بكەن، هەروەها حەجی كردوە و فەرموویەتی: (لتأخذوا عني منساككم) رواه مسلم، واتە: بۆ ئەوەی خواپەرستییەكانی حەج لە منەوە فێر ببن.

هەروەها پێغەمبەری خوا (علیه الصلاة والسلام)، كە دایكمان عائیشە گوتوویەتی: (كان خلق نبي الله القرآن) رواه مسلم، واتە: رەوشتی پێغەمبەری خوا (علیه الصلاة والسلام)، قورئان بووە، واتە قورئانی لە خۆیدا بەرجەستە كردبوو، كەواتە روونكردنەوەی پێغەمبەری خوا (علیه الصلاة والسلام)، بۆ قورئان، ئەوە بووە كە ئێمە فێر بكات: قورئان چۆن كاری پێ دەكرێت؟ هەر ئایەتەو هەر سوورەتەو هەر یاسایە لە كوێدا، لە چ هەلومەرجێكدا كاری پێدەكرێت؟

**دانا: مامۆستا! ئەدی فەرموودە شیرینەكانی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) وەك ئەوەی كە خۆشت ئاماژەت پێداو ئێمەش هەروا فێركراوین و وا تێگەیەنراوین، جۆرێك نیە لە تەفسیری قورئان؟**

**مامۆستا:** با، جۆرێكە لە روونكردنەوەی ئەو چەمك و مەبەستانەی كە لە قورئاندا هاتوون، بەڵام وەك دووبارەی دەكەمەوە: پێغەمبەری خوا (علیه الصلاة

والسلام)، هەڵنەستاوە بە تەفسیرکردنی هەموو قورئان، چونکە قورئان زۆربەی هەرە زۆری ڕوونە بۆ ئەهلی خۆی، واتە بۆ کەسێك شارەزای زمانی عەرەبی بێ، بۆ کەسێك لە قورئان تێ بگات، ڕوونە، پێویستیی بەوە نەبووە پێغەمبەری خوا (علیه الصلاة والسلام)، ڕوونی بکاتەوە، ئەدی پێغەمبەری خوا کوێی ڕوونکردۆتەوە؟ ئەگەر هاوەڵان شوێنێکیان لێ ئیشکال بوو بێت، بۆ وێنە: کاتێك ئەو ئایەتەی سوورەتی (الأنعام) دێتەخوارێ، کە دەفەرموێ:

﴿ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَلَمۡ يَلۡبِسُوٓاْ إِيمَـٰنَهُم بِظُلۡمٍ أُوْلَـٰٓئِكَ لَهُمُ ٱلۡأَمۡنُ وَهُم مُّهۡتَدُونَ ٨٢﴾

[الأنعام: ٨٢]

واتە: ئەوانەی بڕوایان هێناوەو ئیمانەکەشیان لەگەڵ زوڵمدا ئاوێتەدا نەکردوە، ئا ئەوانە دڵنیاییان بۆ هەیە و ئەوانە ڕێی ڕاستیان گرتوە، هاوەڵان چوونە خزمەت پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام)، گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا! (وأينا لم يظلم نفسه؟) کام لە ئێمە زوڵمی لەخۆی نەکردوە؟ وشەی (ظلم) وای لێ تێگەیشتوون واتە: گوناه، گوتیان: ئەم ئایەتە دەفەرموێ: ئەوانەی کە ئیمانیان هێناوەو دوایی گوناهیشیان نەکردوە، ئنجا کام لە ئێمە گوناهێکی نەکردوە؟ چونکە خوا دەفەرموێ:

﴿أُوْلَـٰٓئِكَ لَهُمُ ٱلۡأَمۡنُ وَهُم مُّهۡتَدُونَ ٨٢﴾ [الأنعام: ٨٢]

هەر ئەوانە دڵنیاییان بۆ هەیە، ئەمینن لە سزای خوا و هەر ئەوانەش ڕێی ڕاستیان گرتوە، فەرمووی: (ليس بذلكم)، وشەی زوڵم لێرەدا مەبەستی پێی گوناه نیە، گوناه بە گشتیی، هەرچەندە لە قورئاندا (ظلم) بە مانای گوناه بە گشتیی هاتوە، بەڵام لەم سیاقەدا مەبەستی ئەوە نیە، گوتیان ئەدی چۆن؟ فەرمووی: ئەدی گوێتان لە عەبدە ساڵحەکە نەبووە:

﴿يَـٰبُنَيَّ لَا تُشۡرِكۡ بِٱللَّهِۖ إِنَّ ٱلشِّرۡكَ لَظُلۡمٌ عَظِيمٌ ١٣﴾ [لقمان: ١٣]

لوقمان ئامۆژگاریی کوڕەکەی دەکات "ڕۆڵە گیان! هاوبەش بۆ خوا دامەنێ، هاوبەش بۆ خوا دانان ستەمێکی مەزنە"، کەواتە: مەبەست لە (ظلم) لێرەدا

شیركە (ئەوانەی كە ئیمانیان هێناوە و شیركیان بۆ خوا پەیدا نەكردوە) چونكە كە شیركت بۆ خوا پەیدا كرد، ئەوە ئیمانەكەت هەڵدەوەشێتەوە و مانای وایە دڵنیا نابی لە سزای خوا.

ئەگەر شتێكی وایان لێ ئیشكال بووبێ، پێغەمبەری خوا (صلی الله علیە وسلم) بۆ هاوەڵانی روونكردبێتەوە، ئەگەرنا ئەویدی، فەرمایشتەكانی كە فەرمووی، پێغەمبەری خوا بەو مەبەستە نەیفەرموون كە: ئەو ئایەتەی پێ تەفسیر دەكەم، نا، بەڵكو چەمكەكانی قورئانی پێ تەفسیر كردوون، بۆ وێنە: پێغەمبەری خوا (علیە الصلاة والسلام)، لە فەرموودەیەكدا دەفەرموێ: (إنما الأعمال بالنیات وإنما لكل امرئ ما نوى) متفق علیە، لە درێژەی فەرموودەكەدا، باسی كۆچكردن دەكات، ئەمە ڕوونكردنەوەی واتای ئەوەیە كە خوای پەروەردگار لە قورئاندا دەفەرموێ:

﴿ وَمَآ أُمِرُوٓاْ إِلَّا لِيَعۡبُدُواْ ٱللَّهَ مُخۡلِصِينَ لَهُ ٱلدِّينَ ﴾ [البینة: ٥]

واتە: فەرمانیان پێ نەكراوە مەگەر بەوە نەبێ كە ملكەچیی خۆیان بۆ خوا ساغ بكەنەوە، واتە بەشی غەیری خوا بە ملكەچیی و تاعەت و فەرمانبەرییانەوە نەهێڵن و بە ساغیی خوا بپەرستن، ئنجا پێغەمبەر (علیە الصلاة والسلام)، لەو فەرموودەیەدا ڕوونی دەكاتەوە و دەفەرموێ: هەموو كردەوە چاكەكان بەپێی نیەتەكانن، هەركەسێك مەبەستی پێ ڕازیكردنی خوا بێ و، خوا پێ مەبەستبوون هاندەری بێ، ئەوە كردەوە چاكەكەی لێ قبووڵ دەكرێ، بەڵام با كردەوەكەی بە ڕواڵەتیش باش بێ، ئەگەر خوا پێ مەبەستبوون هاندەر و پاڵنەری نەبێت، ئەوە نابێ چاوەڕێی پاداشت بكات، دوایی باسی كۆچكردن دەكات، (فمن كانت هجرتە الى الله ورسولە، فهجرتە الى الله ورسولە، ومن كانت هجرتە لدنیا یصیبها او آمرة ینكحها، فهجرتە الى ما هاجر الیە)، واتە: ئنجا هەركەس كۆچكردنەكەی بۆلای خوا و پێغەمبەرەكەی بێ، ئەوە بۆی دەنووسرێ كۆچكردنەكەی بۆلای خوا و پێغەمبەرەكەیەتی، بەڵام هەركەسێك كۆچكردنەكەی (ئەوانەی كە لە مەككەوە كۆچیان دەكرد بۆ مەدینە) بۆ

ئەوەبێ كه بەرژەوەندییەكی دنیایی بۆ دابین ببێ، یاخود حەزی له ئافرەتێك كردوه له مەدینه، بچێ پێی بگا لەوێ، ئەوه كۆچكردنەكەی بەو شێوەیه بۆی دەنووسرێ كه له دڵیدا هەیه.

لێرەدا پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) ئەوەی كه ئایەتەكه فەرموویەتی، ئاوا به وێنەی بەرجەستەی ژیانی خەڵك ڕۆشنی دەكاتەوه.

ئنجا من وەڵامی ئەو پرسیارەتم نەدایەوه كه: ئایا ئیسلام ڕێ له مسوڵمانان دەگرێ، دەستیان دەبەستێ لەبەردەم ئەزموونی بەشەردا، لەبەردەم حیكمەتی بەشەردا، لەبەردەم شتی چاكی خەڵكی دیكەدا، ئایا دەڵێ دەبێ له چوارچێوەی قورئان نەچنەدەرێ؟ وەڵامەكەی ئاوایه:

قورئان فەرزی دەكات لەسەر مسوڵمانان كه زانیاریی بەسوود، قسەی ڕاست و بەجێ، كرداری باش و پەسەند، لەهەر كەسێكەوه بێ، نەك هەر دروسته و ڕەوایه وەریبگرن، بەڵكو لەسەریان پێویسته وەریبگرن، له سوورەتی (الزمر)دا خوا (سبحان و تعالى) دەفەرموێ:

﴿فَبَشِّرْ عِبَادِ ﴿١٧﴾ الَّذِينَ يَسْتَمِعُونَ الْقَوْلَ فَيَتَّبِعُونَ أَحْسَنَهُ ۚ أُولَٰئِكَ الَّذِينَ هَدَاهُمُ اللَّهُ ۖ وَأُولَٰئِكَ هُمْ أُولُو الْأَلْبَابِ ﴿١٨﴾﴾ [الزمر: ١٧- ١٨]

موژده بده بەو بەندانەم كه گوێ بۆ هەموو قسەیەك دەگرن، هی كافر، هی مسوڵمان، هی ڕۆژهەڵاتیی، ڕۆژئاوایی، هی كۆن، هی ئێستا، گوێ بۆ هەموو قسەیەك دەگرن، كامەی باشتره شوێن ئەوەی دەكەون و تەبەننیی دەكەن، ئا ئەوانه كەسانێكن خوا خستوونیەته سەر ڕێی ڕاست و هەر ئەوانه خاوەن عەقڵانن.

واته: ئەوەی وانەبێ هەر عاقڵ نیه و، ئەوەی وانەبێ به ڕێی ڕاستدا ناڕوات، كەواته: مسوڵمانان لەسەریان پێویسته زانیاری بەسوود، قسەی بەسوود، ئەزموونی باش، بەتایبەت لەو بوارانه دا كه شەریعەت به بۆشایی بەجێیهێشتوون، چونكه شەریعەت دوو بەشه:

١- بەشێكى كە بريتييە لە مامەڵە لەگەڵ خوا، چ مامەڵەى فيكريى (نظري)، چ مامەڵەى كردەيى، مامەڵەى فيكريى واتە: بووناسيى و ئيمان و عەقيدە مامەڵەى كردەيى واتە: دروشمەكان و خواپەرستييەكان، لەوێدا قورئان نوختەى خستووەتە سەر پيت، هەندێك شتى بۆ پێغەمبەريش بەجێنەهێشتوون، مەگەر هەندێك وردەكاريى، كە پێغەمبەرى خوا بۆى، روونكردوينەوە وەك چۆنيەتى جێبەجێكردنى دروشمەكان، ئەوانە نوقتەيان تێدا خراوەتە سەر پيت، چونكە مامەڵە لەگەڵ خوا (سبحانه وتعالى) هەر خوا دەزانێ دەبێ چۆن مامەڵەى لەگەڵدا بكەين، بە درێژايى مێژوو، بەشەر خواى ناسيوە، بەڵام لە مامەڵە لەگەڵكردنيدا بەهەڵەدا چووە، هەرچى لێى بپرسى خواى ناسيوە و زانيويەتى گەردوون، بەديهێنەرو خاوەن و پەروەردگارێكى هەيە، بەڵام لە مامەڵە لەگەڵ خوادا، لە چۆنيەتى ناسينى خوادا، تووشى هەڵە بوون، فەيلەسووفەكانى يۆنان، هيند، چين، هەموويان.

٢- بەشى دووەمى ياساكانى شەريعەتى ئيسلام، كە لە قورئان دا مەتنەكەيان هەيە و، سوننەتى پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) ڕوونكردنەوەو چۆنيەتى بەرجەستەكردنيانى گرتۆتە خۆى، ئەو شتانەن كە زۆر گۆڕانيان بەسەردا دێ و پەيوەندييان بە ژيانى ماددیى بەشەرەوە هەيە، ژيانى كۆمەڵايەتيى و سياسيى و ئابووريى، ئيسلام لێرەدا ئيكتيفاى كردوە بە دانانى چەند نيشانەيەك، چەند قووچكەيەك، چەند هێڵێكى گشتى، بەڵام نەچووەتە نێو وردەكارييەكانەوە، بۆ ئەوەى دەستەپێى خەڵك نەبەستێ، بۆ ئەوەى عەقڵى خەڵك كۆت نەكات، بوارێكى زۆرى هێشتووەتەوە بۆ ئيجتيهاد و عەقڵ و ئەزموونى بەشەر، كە ئەو بۆشاييانە پڕ بكاتەوە.

**دانا: زۆر باشە، ويستم بپرسم: لە قورئانى پيرۆزدا چەمكگەلێكى زۆر هەن، بۆ نموونە وەفا، دادپەروەريى، دڵپاكى، دەستپاكيى، داوێنپاكيى، زمانپاكيى، پێكەوەژيان، ڕاوێذكردن، يەكترقبوڵ كردن، تەبايى، كۆمەڵێ چەمكى ديكە، كە هەست ئەكرێ ئێستا لە ژيانى سياسى و كۆمەڵايەتيماندا لەم هەرێمەى ئێمەدا كە ئێمە ئەمانەوێ قسە لەسەر ئەزموونى ئەم هەرێمەى خۆمان بكەين، ئەم چەمكانە ونن، ئەم چەمكانە**

**لە ئەزمەدان، ئێمە نەمانتوانیوە بەرجەستەیان بکەین، ئەمەوێ بزانم هۆکارەکەی بۆ چی ئەگەڕێتەوە؟**

**مامۆستا:** من پێموایە ئەوەی دەیڵێ، جۆرێك لە زیادەڕەویی تێدایە، جۆرێ لە ڕەشبینیی تێدایە، واقیع بەو شێوەیە نیە، بەڵام دەتوانی بڵێی لە ژیانی سیاسی بڕیاربەدەستانی ئەم وڵاتەدا، زۆربەی ئەو چەمكانە نادیارن، ئەگەرنا كەم و زۆر خەڵكێك هەر هەیە: دەستپاكە و داوێنپاكە و دڵپاكە و زمانپاكە و، كاریش بەڕاوێژ دەكات و حیسابیش بۆ خەڵك دەكات و، خۆیشی لە خەڵك بە زیاد ناگرێ وهتد، ئەو ڕەوشت و ئاكارو خەسڵەتە بەرزانە كەم و زۆر هەن، بەڵام ڕاستە لە ژیانی ئەوانەدا كە كاروباری ئەم وڵاتە بەڕێوەدەبەن بڕیاربەدەستن، كەمتر دیارن، بێ ڕەنگ و بۆ ترن، كاڵن، یان جاری واهەیە هەر نین، ئەوە هۆكارەكەی ئەوەیە كە پێشتر باسمكرد، ئینسان تەنیا بەوە چاك نابێت كە حەق بزانێت، چەندان كەس دەزانن كە جگەرەكێشان زیانی هەیە، دەشیكێشێت، من پزیشكم بینیوە جگەرەكێش بووە، چەندان كەس دەزانن كە مەی خواردن زیانبەخشە، دەشیخۆنەوە، پزیشكم بینیوە شەرابخۆر بووە، بۆچی؟ لەبەرئەوەی كە زانینەكەیان نەبووە بە توانین، چونكە كە ئینسان تەنیا عەقڵ نیە، دڵ و دەروونیشە، ئنجا ئەو دڵ و دەروونە، ئەو ئیرادەیە، جاری وا هەیە ڕوو لە خراپە دەكات، لە جیاتی (هدى) ی لەدڵدا بێ، (هوى)ی تێدایە، (هوى) یانی: ئارەزوو، لەجیاتی ئەوەی كە ئیلهامی فریشتەكان بێتە نێو دڵ و دەروونەوە، (هدى)ی خوتخوتەو وەسوەسەی شەیتانەكان دێتە نێوی، لە ئەنجامی ئەوەش دا ئینسان بە لاڕێدا دەڕوات، شتێك دەزانێت حەقە و دانی پێداناهێنێ، شتێك دەزانێت حەقە و پێیەوە پابەند نابێ، شتێك دەزانێت زیانی تێدایە، بەڵام دەڵێ دەسەڵاتم بەسەر خۆمدا نیە، چەندان كەس هەن خوو دەگرن بە عادەتێكی خراپەوە، كە نموونەمان بە جگەرەكێشان و مەیی خۆریی، هێنایەوە، دەزانێ خراپە، شوێنەوارەكەی لەبەرچاویەتی، كەچی هەر دەشیكات، چەندان كەس دەزانن نوێژكردن، ڕۆژوو گرتن، بۆخوا سوڵحان، خۆپاراستن لە گوناحەكان، شتێكی باشە، بە بەرژوەندیی دەگەڕێتەوە بۆ تەندروستی جەستەیی، ڕووحیی، فیكریی، بۆ تەبایی خێزانیی، بۆ كۆمەڵگا،

لەسەر ئاستی سیاسی، ئەگەر كۆمەڵگایەك دەوڵەتێك تاكەكانی پاك و رێك و چاك بن، دوژمنان زەفەریان پێ نابەن، بیانكڕن و بیانكەنە سیخوڕ و، ئاسایشی گشتی دەپارێزرێ، هەموو كەس ئەوە دەزانێ، بەڵام بۆچی نایكەن؟ لەبەرئەوەی ئینسان تەنیا عەقڵ نیە، هەر عەقڵ نیە كە مەعلووماتی تێدا بێ، كۆمپیوتەر نییە، كۆمپیوتەر مەعلووماتی تێ بكە و دوایی ئەنجامەكەی لێ داوا بكە، چی تێدا بێ، دەتداتێ، بەڵام مرۆڤ وا نیە، خوای پەروەردگار دەربارەی ئالی فیرعەون دەفەرموێ:

﴿ وَجَحَدُوا۟ بِهَا وَٱسْتَيْقَنَتْهَآ أَنفُسُهُمْ ظُلْمًا وَعُلُوًّا ﴾ [النمل: ١٤]

واتە: دارو دەستەی فیرعەون نكوڵییان كرد لە موعجیزەكانی موسا لە بەرنامەكەی موسا، لە پەیامەكەی موسا، (وَٱسْتَيْقَنَتْهَآ أَنفُسُهُمْ) دڵنیاش بوون لە دەروونی خۆیاندا كە ڕاستەو حەقە، بۆچی؟ (ظُلْمًا وَعُلُوًّا) چونكە چاویان لە ستەم و لە خۆبەرزكردنەوە بوو، چەندان كەس لەم وڵاتەدا دەزانن كە قۆرخكاریی خراپە، ستەم خراپە، بەكەم تەماشاكردنی خەڵكی دیكە، خۆ لە خەڵكی جیاكردنەوە، خراپە، تەنیا خێر بۆ خۆ قۆرخكردن و، تەنیا خزم و حیزب و دەوروبەری خۆبینین و خۆكورتهەڵهێنان لە قاوغ و قەپێلكی بچووكدا، خراپە، بەپێچەوانەشەوە: خەڵك بینین و خوا بینین باشە، ئەدی بۆچی واناكرێ؟ لەبەرئەوەی ئینسان تەنیا بریتی نیە لە عەقڵ، بەڵكو وێڕای عەقڵ و هۆش، ئینسان دڵ و دەروونیشە، ئیرادەیەشە، خوای پەروەردگار بۆچی لە قورئاندا بەزۆریی باسی دڵ دەكات:

﴿ كَتَبَ فِى قُلُوبِهِمُ ٱلْإِيمَـٰنَ ﴾ [المجادلة: ٢٢]

﴿ وَلَمَّا يَدْخُلِ ٱلْإِيمَـٰنُ فِى قُلُوبِكُمْ ﴾ [الحجرات: ١٤]

لەبەرئەوەی ئینسان لەڕاستییدا ئیرادە دەیجووڵێنێ، بەرەو خێر یان بەرەو شەڕ، جاری وا هەیە ئەو مەعلووماتە لە مێشكیدا هەیە، بەلام نەبۆتە یەقین، زانایان دەڵێن جیاوازیی یەقین لەگەڵ گومان ئەوەیە كە یەقین خاوەنەكەی دەجووڵێنێ، من پێموایە زۆر لەو خەڵكە ئەو چەمكانە، هەر گومانی تێیاندا هەیە، تێیاندا (متوهِّم)ە، ئەگەر بوون بە یەقین، یەكسەر ئینسان دەجولۆێنن، یەقین بریتییە لەو

حاڵەتە كە ئینسان لایەنی عیلمیی و عەمەلیی ببنە یەك، عەقڵ و دڵی ببێتە یەك، پێكەوە ئاوێتە بن، هەرچی زانی، بیتوانێ، جیاوازیی نێوان فەیلەسوفەكان و پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) ئا لێرەدا بووە، فەیلەسووفەكان زانیویانە، بەس نەیانتوانیوە، حاڵیی بوون، بەس نەیانتوانیوە نە لە خۆیاندا، نە لە خەڵكی دیكەدا، بیكەنە حاڵ، بەڵام پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) هیچ شتێكیان نەفەرمووە، كە نەیانكردبێ، بە تەواویی حاڵەتی كردەیی و حاڵەتی تیۆرییان پێكەوە ئاوێتە بووە، كە دیارە ئەوەش بە هۆی ئیمانەوەو، بەهۆی پەیوەندیی لەگەڵ خواوە، ئەو حاڵەتە دەروونییەی ئینسان وای لێ دێ، كە هەرچی زانی، بیتوانێ، هەرچی بە چاكی زانی و تەصدیقی كرد، تەتبیقیشی بكات.

**دانـــا: مامۆستا! ئایا قورئان بۆ ئەوە دابەزیوە ئێمە تەنها پاداشتی لەسەر وەربگرین و بە خوێندنەوەی و بە لەبەركردنی، یان لەوە گرنگتر ئەوەیە كە ئێمە بتوانین قورئان بە كرداریی جێ بەجێ بكەین؟**

**مامۆستا:** خوای پەروەردگار زۆر بە ڕوونیی ئەو ڕاستییەمان بۆ ڕوون دەكاتەوە، لە سوورەتی (ص)دا دەفەرموێ:

﴿ كِتَٰبٌ أَنزَلْنَٰهُ إِلَيْكَ مُبَٰرَكٌ لِّيَدَّبَّرُوٓا۟ ءَايَٰتِهِۦ وَلِيَتَذَكَّرَ أُو۟لُوا۟ ٱلْأَلْبَٰبِ ﴿٢٩﴾ ﴾ [ص: ٢٩]

ئەمە كتێبێكی بەرهەمدارە [(مبارك) واتە: بەپیز، بەرهەمدار، خاوەن بەرەكەت، كە بە داخەوە زۆربەی مسوڵمانان وشەی (مبارك) وەك شتێكی موتەفەڕك و پیرۆز و موقەددەس تەماشا دەكەن، لە قورئاندا وشەی (موقەددەس) بۆ قورئان بەكارنەهاتوەو (مبارك) بەكارهاتوە، جوولەكە و نەصرانییەكان بە كتێبی خۆیان دەڵێن: موقەددەس، خوا دەفەرموێ: (كِتَٰبٌ أَنزَلْنَٰهُ إِلَيْكَ مُبَٰرَكٌ)، (مبارك) یانی بەرهەمدار، بەپیز، بەڵام موقەددەس یانی پیرۆز، یان وەك بڵێی شتێكی موتەفەڕك] ئەمە كتێبێكی بەرهەمدارە، ناردوومانەتە خوار، (لِّيَدَّبَّرُوٓا۟ ءَايَٰتِهِۦ) بۆ ئەوەی لە ئایەتەكانی وردببنەوە، تێیانەوە ڕامێنن، (تدبُّر) ئەوەیە كە تۆ وێڕای ئەوەی كە سەرەتای شت دەبینی، كۆتاییەكەشی سەرنج بدەی، چونكە (دبر)ی هەر شتێ، واتە كۆتاییەكەی، دەبێ سەركێڵ نەبێ، قووڵ بێ،

وەك سەرەتاى دەبينى، كۆتاييشى سەرنج بدەى، ئە(وَلِيَتَذَكَّرَ أُوْلُواْ ٱلۡأَلۡبَٰبِ)، هەر تەنيا بۆ تێگەيشتنيش نا، بەڵكو بۆ ئەوەى خاوەن عەقڵان پەندى لێوەربگرن، كارى پێ بكەن.

من لە كتێبێكدا بەناوى (با لە خزمەت قورئاندا بين) لە حەوت هەنگاودا باسى مامەڵە لەگەڵ قورئانم كردوە، كە دەبێ بخوێنرێ و، فام بكرێ و، پەندى لێوەربگيرێ و هەتا كۆتايى، قورئان هەم بۆ خوێندنەوە هاتوە، هەم بۆ لێوردبوونەوە هاتوە، هەم بۆ كارپێكردن هاتوە، قورئان زانايان ئاوا پێناسەيان كردوە: [قورئان ئەو كتێبەيە بە سورەتى (الفاتيحە) دەستپێدەكات، بە سوورەتى (الناس) كۆتايى پێ دێ و (يُتَعَبَّدُ بِتِلاوَتِهِ) خوێندنەوەكەشى بۆخۆى عيبادەتە، بەڵام خوێندنەوەكەى، هۆكار و وەسيلەيە بۆ لێتێگەيشتنى، لێتێگەيشتنيشى بۆ ئەوەيە كە كارى پێ بكەى، بەڵام هەموو جۆرە مامەڵەيەك لەگەڵ قورئاندا، بە مەرجێك بۆ خوا بێت، بە عيبادەت لە قەڵەم دەدرێ، يانى: كەسێكيش نەخوێندەواربێ و تێينەگات، ئەوانەى كە بە زمانى بيانيى قورئان دەخوێنن، بۆ ئەوانيش عيبادەتە، پێغەمبەر (عليه الصلاة والسلام) كاتێك كە دەفەرموێ: هەركەسێك پيتێك لە قورئان بخوێنێ دە چاكەى بۆ دەنووسرێن، دوايى دەفەرموێ: ناڵێم (ألم) پيتێكە، بەڵكو (ئەلف) پيتێكە، (لام) پيتێكە، (ميم) پيتێكە، واتە (ألم) دەكاتە سێ پيت، جارانى دەى بكە، دەكاتە سى (٣٠) چاكە، ئەوە هاندانى مسوڵمانانە كە قورئان بخوێننەوە، چونكە ئەگەر تۆ نەتتوانى بيخوێنيتەوە، لێشى تێناگەى، كە لێيشى تێنەگەيشتى، ناتوانى كاريشى پێ بكەى.

**دانـــا: مەبەستى پرسيارەكەى من: ئێستا بۆ نموونە لە مانگى رەمەزانى پيرۆزدا كە رابورد خەڵك زۆر تامەزرۆى قورئان بوون و، زۆر ئاوێتە و ئاوێزانى بوون، ئەنجا ئايا گرنگ ئەوەيە ئێمە تەنها بخوێنينەوە و لەبەرى بكەين، يان لەوە گرنگتر بۆ ئێستاى بارودۆخى خۆمان، ئەوەيە كە ئێمە ئەم قورئانە بكەينە كردار؟**

**مامۆســـتا:** من باسم كرد، خوا دەفەرموێ: (كِتَٰبٌ أَنزَلۡنَٰهُ إِلَيۡكَ مُبَٰرَكٞ)، بۆچى ناردوويەتە خوار؟! (لِّيَدَّبَّرُوٓاْ ءَايَٰتِهِۦ)، بۆ ئەوەى لە ئايەتەكانى وردبنەوە، لێيان تێ

بگەن، دواییش: (وَلِيَتَذَكَّرَ أُوْلُواْ ٱلۡأَلۡبَٰبِ)، هەروەها بۆ ئەوەی ئەوانەی خاوەن عەقڵن، پەندی لێوەربگرن، كاری پێ بكەن، بەرجەستەی بكەن لە ژیانی تاكیی و خێزانیی و كۆمەڵایەتیی و سیاسیی خۆیاندا، بەڵام وەك گوتم، كەی دەتوانی قورئان پیادە بكەی؟ كە لێی تێبگەی، كەی دەتوانی لێی تێ بگەی؟ كە بیخوێنی، ئەوانە هەموویان پێكەوەن و، هەمووشیان بە عیبادەت و تاعەت لە قەڵەم دەدرێن.

**دانــا: زۆر باشە، هەر لەو سۆنگەیەوە دەتوانین بڵێین: قورئان یەكێ لە ئیشە سەرەكییەكانی ئەوەیە كە ئەیەوێ تاكێك بەرهەم بێنێت كە زمانی كرداری پێش زمانی گوفتاری بێت؟**

**مامۆستا:** هەر ئیمان خۆی واتە: بڕوا بە خوا (سبحانه وتعالى) و بە هەموو ئەو شتانەی كە خوا فەرموونی، بڕوا بە فریشتەكانی خوا، بڕوا بە كتێبەكانی خوا، بە ڕۆژی دوایی، بە پێغەمبەران، (عليهم الصلاة والسلام) و بە هەموو ئەو شتانەی كە پێغەمبەران هەواڵیان پێداوە، ئەو ئیمانە وا لە مرۆڤ دەكات عەقڵ و دڵی یەك بن، وا لە مرۆڤ دەكات دڵ و زمانی یەك بن، زمان و كردەوەی یەك بن، بۆچی؟ چونكە ئیمان پێش ئەوەی سەروكاری لەگەڵ رواڵەت و دەرەوەی مرۆڤدا بێت، سەروكاری لەگەڵ پەنهان و نێوەوەی مرۆڤدایە، تۆ پێشێ دەبێ بە عەقڵ و دڵ خوا بناسی، ئنجا بە جەستە فەرمانەكانی خوا جێبەجێ دەكەی، (الإيمان سرٌ والإسلام علانية) زانایان وایان گوتوە، ئیمان پەنهانە، بەڵام ئیسلامەتیی ئاشكرایە، هەتا ئیمان نەبێت، ئیسلام پەیدا نابێت، ئیسلامێك ئیمانی پێش نەكەوتبێ، ئەوە ئیسلامێكی ڕووكەشیی و ڕواڵەتییە.

﴿ قَالَتِ ٱلۡأَعۡرَابُ ءَامَنَّاۖ قُل لَّمۡ تُؤۡمِنُواْ وَلَٰكِن قُولُوٓاْ أَسۡلَمۡنَا ﴾ [الحجرات: ١٤]

عەرەبە خێڵەكییەكان گوتیان: ئیمانمان هێنا [خوا دەفەرموێ]: بڵێ ئیمانتان نەهێناوە، هەر بڵێن مسوڵمان بووین [بە ڕواڵەت و ڕووكەش] ئەگەرنا مسوڵمانەتیی ڕاستەقینە ئیمان پێشی دەكەوێ، چونكە تۆ تاكو ئیمانت لە عەقڵ و دڵدا جێگیر نەبێت، هەتا پەنهانت، هەتا دیوی نێوەوەو شاردراوەت نەڕازێتەوە بە ئیمان و خواناسین و بەندایەتیی بۆ خوا، ڕواڵەتەكەت ملكەچ نابێ بۆ شەریعەتی

خوا و، فەرمانبەريی بۆ خوا تێدا نايەتەدی، كەواتە: ئەوەی كە پرسيارت كرد، لەڕاستييدا ئيمان ڕێك پێچەوانەی ئەوەيە كە ئينسان كردەوە و قسەی لێك جيابن، وەك خوا سبحانه وتعالى لە سوورەتی (صف)دا دەفەرمویّ:

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ ﴿سَبَّحَ لِلَّهِ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلۡأَرۡضِۖ وَهُوَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡحَكِيمُ ۝١ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لِمَ تَقُولُونَ مَا لَا تَفۡعَلُونَ ۝٢ كَبُرَ مَقۡتًا عِندَ ٱللَّهِ أَن تَقُولُواْ مَا لَا تَفۡعَلُونَ ۝٣﴾ [الصف: ١ـ ٣]

ئەی ئەوانەی ئيمانتان هێناوە! بۆچی قسەيەك دەكەن كە كردەوەی پێ ناكەن، گەورەترين گوناهە لەلای خوا قسەيەك بكەی و كردەوەی پێ نەكەی.

واتە قسە و كردەوە لێكجيابوون، پێچەوانەی ئيمانە.

ئەدی خەڵكی ديكە؟ خەڵكی ديكە چونكە سەروكاری لەگەڵ ئيمان و خواناسين و چاودێری خوا و حيسابكردن بۆ ڕۆژی دوايی دا نيە، سەد قسە دەكات و كردەوەشی پێ ناكات، بەڵام فەرموودەی پێغەمبەرە (صلى الله عليه وسلم): (لا يستقيم لسان عبد حتى يستقيم قلبه)، واتە: زمانی ئينسان ڕاست نابێت، تاكو دڵی ڕاست نەبێت، دڵ ڕاست بوون و زمان ڕاست بوون، لەڕاستييدا پێكەوە پەيوەستن، هەڵبەتە بۆ ئينسانی بڕوادار.

**دانـــا: مامۆستا ئەم قورئانەی لەبەردەستی ئێمەدايە، ئێمەش وەك تاكی مسوڵمان بە بەرنامەی ژين و دينی خۆمانی ئەزانين، بێگومان پێشينانی ئێمە كۆمەڵێك لە موفەسيرين تەفسير و ڕاڤەيان كردوە بۆ قورئانی پيرۆز، ئەمەوێ بپرسم تا چەند پێويستە ئێمە بە تەفسيری نوێ، بە خوێندنەوەی نوێ، بۆ ئەم ڕۆژگارەی خۆمان، ئەوەی دەوترێ كوردييانە لە قورئان تێ بگەين، بۆ ئەرز و واقيع و ژيان و دەوڵەتداری خۆمان؟**

**مامۆستا:** هەندێك زاراوە دادەهێنرێن، بەهەرحاڵ ئەوە زاراوەيە و دادەهێنرێ و بەكاردەهێنرێ، من ڕام لەگەڵيان نيە، ئيسلام ئيسلامە بۆ هەموو بەشەر هاتوە، خوای پەروەردگار دەفەرموێ:

﴿وَأَنزَلۡنَآ إِلَيۡكَ ٱلذِّكۡرَ لِتُبَيِّنَ لِلنَّاسِ مَا نُزِّلَ إِلَيۡهِمۡ﴾ [النحل: ٤٤]

قورئان بۆ خه‌ڵك به گشتی هاتوه، وه به‌ڵێ پێغه‌مبه‌ری خوا (علیه الصلاة والسلام) له خزمه‌كانی و له هۆزه‌كه‌ی، وه پاشان گه‌له‌كه‌یه‌وه ده‌ستی پێكردوه، به‌ڵام هه‌ر له مه‌ككه ئه‌و جۆره ئایه‌تانه دابه‌زیون:

﴿ وَمَآ أَرۡسَلۡنَٰكَ إِلَّا كَآفَّةٗ لِّلنَّاسِ بَشِيرٗا وَنَذِيرٗا ﴾ [سبأ: ٢٨]

﴿ قُلۡ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِنِّي رَسُولُ ٱللَّهِ إِلَيۡكُمۡ جَمِيعًا ﴾ [الأعراف: ١٥٨]

به‌ڵێ قورئان و ئیسلام بۆ هه‌موو مرۆڤایه‌تیی هاتوه، به‌ڵام ده‌توانین بڵێین: كابرایه‌كی فارس له وڵاتی خۆیدا، توركێك له وڵاتی خۆیدا، ئه‌فغانێك، پاكستانێك، هیندێك، ئینگلیزێك، ئه‌مریكییه‌ك، عه‌ره‌بێك، كوردێك، پێویسته ژینگه‌و هه‌لومه‌رج و بارودۆخ و وه‌زعی میلله‌ته‌كه‌ی خۆی و وڵاته‌كه‌ی خۆی له‌به‌رچاو بگرێ، ئنجا ته‌ماشای قورئان بكات و ته‌ماشای سوننه‌تی پێغه‌مبه‌ر (علیه الصلاة والسلام) بكا، كه ئه‌و گرفت و كێشانه‌ی و نه‌خۆشییانه‌ی كۆمه‌ڵگای دی هه‌ینی، قورئان و سوننه‌ت چۆن چاره‌سه‌ریان بۆ داده‌نێن، ئه‌وه ڕاسته، ئه‌وه‌ی كه من تێبینییم له‌سه‌ری هه‌یه، ئه‌وه‌یه كه ئیسلامیی كوردیی جیابێ له ئیسلامی عه‌ره‌بیی و، ئیسلامی عه‌ره‌بیی جیابێ له ئیسلامی فارسیی و، هی فارس جیابێ له هی توركمان! چونكه خوا یه‌ك ئیسلامی ناردوه، ئیسلام یه‌ك ئیسلامه:

﴿ وَرَضِيتُ لَكُمُ ٱلۡإِسۡلَٰمَ دِينٗاۚ ﴾ [المائدة: ٣]

خوا ئه‌وه‌ی بۆ هه‌مووان فه‌رمووه، ئنجا بناغه و جه‌وهه‌ری ئیسلامه‌تیی ده‌گونجێ هه‌موو مرۆڤانه‌كان پێیه‌وه پابه‌ند بن، به‌ڵام ئه‌وه له‌گه‌ڵ ئه‌وه‌دا تێكناگیرێ كه هه‌ر میلله‌تێكیش تایبه‌تمه‌ندیی خۆی ببێ، چونكه (قواگع الدین) واته ئه‌و شتانه‌ی كه ده‌قی ڕوون و ڕاشكاویان له‌سه‌ره، به‌شی ئه‌وه ده‌كه‌ن كه له‌سه‌ر ئاستی مرۆڤایه‌تیی هه‌موو خه‌ڵك ببێته یه‌ك ئوممه‌ت، یه‌ك كۆمه‌ڵ، به‌ڵام له ورده‌كارییه‌كاندا بواری ئه‌وه‌ی تێدا هه‌یه كه هه‌ر میلله‌ته‌و هه‌ر نه‌ته‌وه‌یه‌ش تایبه‌تمه‌ندیی خۆی له‌به‌رچاو بگرێ، به‌ڵام ئه‌وه نا كه ئه‌وه ئیسلامی كوردییه و سه‌دوهه‌شتا پله جیایه له‌وه‌ی دی و، ئه‌وی دیكه‌ش جیا

لە ئەو، ئەگەرنا هەر زانایەكیش، هەر لە وڵاتەكەی خۆیدا، كاتێك هەلومەرج گۆڕاوە، فەتواكەی گۆڕیوە، شافیعی رەحمەتی خوای لێ بێت، هەردووك مەزهەبەكەی عیراق و مصری جیاوازبوون، زانایانیش گوتوویانە: (لا ینكر تغیر الأحكام بتغیر الأزمان) نكوولیی ناكرێ لە گۆڕینی یاساكان بەپێی گۆڕینی ژینگەكان، بەڵام لەچیدا، ئایا هەموو شتێكی ئیسلام دەگۆڕێ؟ نەخێر، ئیمان و عەقیدە، بووننـاسیی، حەڵاڵ و حەرام، چاكە و خەراپە، بەها و رەوشتە بەرزەكان، دروشمەكان چۆن جێبەجێ بكرێن، گەلانی عەرەب و كورد و تورك و هیند و فارس و هەموویان یەك قیبلەیان هەیە، هەموویان یەك قورئانی هەیە، هەموویان یەك خوا دەپەرستێ، هەموویان پێكەوە رۆژوو دەگرن، هەموویان پێكەوە نوێژ دەكەن، هەموویان نوێژی جومعە دەكەن، هەموویان دەڵێن: زینا حەرامە، دزیی حەرامە، زوڵم حەرامە، دادگەریی پێویستە، برایەتیی پێویستە، پێكەوەژیان پێویستە، واتە لە بنچینەكاندا هەموو مسوڵمانان یەكدەنگن، ئەوەی دەقی ڕوونی لەسەرە، بەڵام لە وردەكارییەكاندا خوای پەروەردگار، خوای كاربەجێ، ئەو كاتە كە قورئانی ناردوە، كۆمەڵگای بەشەری سادە بووە، بەڵام ئێستاو دوای ئێستاشی لەبەرچاو بووە، بۆیە شەریعەت پێشتریش باسمكرد، لە مامەڵە لەگەڵ خوادا، چووەتە نێو وردەكارییەكانەوە و زانانایان بنچینەیەكیان هەیە دەڵێن: (إجمالٌ في المتغيِّرات وتفصيلٌ في الثوابت)، ئەو شتانەی دەگۆڕێن، قورئان بە كورتیی باسی كردوون. بەڵام ئەوانەی كە ناگۆڕێن، قورئان چووەتە نێو وردەكارییەكانیانەوە، بۆ نموونە: لە یەك ئایەتدا لە سوورەتی (المائدة) هەموو فەرزەكانی دەستنوێژی تێدان:

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا قُمۡتُمۡ إِلَى ٱلصَّلَوٰةِ فَٱغۡسِلُواْ وُجُوهَكُمۡ وَأَيۡدِيَكُمۡ إِلَى ٱلۡمَرَافِقِ وَٱمۡسَحُواْ بِرُءُوسِكُمۡ وَأَرۡجُلَكُمۡ إِلَى ٱلۡكَعۡبَيۡنِۚ وَإِن كُنتُمۡ جُنُبٗا فَٱطَّهَّرُواْۚ وَإِن كُنتُم مَّرۡضَىٰٓ أَوۡ عَلَىٰ سَفَرٍ أَوۡ جَآءَ أَحَدٞ مِّنكُم مِّنَ ٱلۡغَآئِطِ أَوۡ لَٰمَسۡتُمُ ٱلنِّسَآءَ فَلَمۡ تَجِدُواْ مَآءٗ فَتَيَمَّمُواْ صَعِيدٗا طَيِّبٗا فَٱمۡسَحُواْ بِوُجُوهِكُمۡ وَأَيۡدِيكُم مِّنۡهُۚ مَا يُرِيدُ ٱللَّهُ لِيَجۡعَلَ عَلَيۡكُم مِّنۡ حَرَجٖ وَلَٰكِن يُرِيدُ لِيُطَهِّرَكُمۡ وَلِيُتِمَّ نِعۡمَتَهُۥ عَلَيۡكُمۡ لَعَلَّكُمۡ تَشۡكُرُونَ ٦﴾ [المائدة : ٦]

هەروەها چۆنیەتی ئەنجامدانی نوێژەكان ڕوونكراوەتەوە، بەڵام دەوڵەت چۆن پێكبێنین؟ كۆمەڵگا چۆن بەڕێوە بەرین؟ چۆن دادگەریی بچەسپێنی؟ چۆن زوڵم ڕیشەكێش بكەین؟ چۆن قۆرخكاریی نەهێڵین؟ ئەوانە هەموویان زانایان یەك بنچینەی گشتییان بۆ داناون: (أینما وجد العدل فثم شرع الله)، (كیفما تحققت المصلحة فثم شرع الله)، دادگەریی چۆن بچەسپێ، بەرژەوەندیی خەڵكی چۆن بێتەدی، شەریعەتی خوا لەوێیە، واتە: نەچووەتە نێو وردەكارییەكانەوە و، بۆ عەقڵی بەشەر و ئەزموونی بەشەری لێ گەڕاوە.

**دانـــا: بەڕێز مامۆستا! لەسەر تەفسیرەكە وەڵامت نەدامەوە، تا چەند زەرورە تەفسیری نوێمان بۆ دەقەكانی قورئان هەبێ، نەك هەر خۆمان وابەستە بكەین بە تەفسیرەكانی ترەوە؟**

**مامۆستا:** هەر زۆر زۆر پێویستە، بەڵام لێرەشدا دیسان دەبێ بە هەڵەدا نەچین، قورئان هەندێكی كات و شوێن كاریگەری لەسەری نیە، ئەوەی كە باسی بوونناسیی دەكات، باسی ئیمان و عەقیدە دەكات، باسی حەڵاڵ و حەڕامە جێگیرەكان دەكات، باسی خواپەرستییەكان دەكات، باسی ڕەوشت و بەها بەرزەكان دەكات، ئەوە (طبری، ابن كثیر، فخرالدین الرازی) لەگەڵ (محمد الطاهر بن عاشور) لەگەڵ (سید قطب)، لەگەڵ (المودودی)، بەندە، یەكێكی دیكە، تێیدا جیاوازنین، بەڵام هەركەسە بە تام و بۆی خۆی، بەلەبەرچاوگرتنی هەلومەرج و تایبەتمەندییەكانی كۆمەڵگای خۆی، ئەوە لایەكی تەفسیر، كەواتە مەرج نیە كە دەڵێین: تەفسیری قورئان، دەبێ لە كاتێكەوە بۆ كاتێك، لە هەموو شتێكدا جیا بێ، نا، نا، لەو شتانەدا كە دەگۆڕێن، بۆ وێنە: ئەو ئایەتە كە باسی دادگەریی دەكات، خوای پەروەردگار دەفەرموێ:

﴿ إِنَّ ٱللَّهَ يَأۡمُرُ بِٱلۡعَدۡلِ ﴾ [النحل: ٩٠]

خوا فەرمان دەكات بە دادگەریی، هەركام لە (طبری) و (ابن كثیر) و، زانایانی دیكە بە تێگەیشتنی خۆیان و لە هەلومەرجی خۆیاندا، لە وشەی دادگەریی و میكانیزمەكانی چەسپاندنی دادگەریی، حاڵی بوون، ڕەنگە زیاتر وەك بەهایەكی

ئه‌خلاقیی تاكی، یان خێزانیی، یان كۆمه‌لآیه‌تیی، ته‌ماشایان كردبێ، به‌لآم ئێستا دادگه‌ریی، زۆر ڕه‌هه‌ندی سیاسیی، ئابووریی، كۆمه‌لآیه‌تیی، ئه‌منیی، لێ په‌یدا بوون، كه‌واته‌: له‌و شتانه‌دا كه‌ گۆڕانیان به‌سه‌ردا دێ، به‌ ته‌ئكید پێویستی به‌وه‌ هه‌یه‌، بیروڕا و تێگه‌یشتنی تازه‌ و نوێ له‌باره‌یانه‌وه‌ بێنه‌ ئاراوه‌، هه‌ربۆیه‌ش هه‌ر زانایه‌ك هاتوه‌ ئیكتیفای نه‌كردوه‌ به‌وه‌ی پێشوی، (طبری) ئیكتیفای نه‌كردوه‌ به‌ زانایانی پێش خۆی، كه‌ قورئانیان ته‌فسیر كردوه‌، دواییش (ابن كثير)یش ئیكتیفای نه‌كردوه‌ به‌ (طبری)، دواییش (فخر الدين الرازی)، ئه‌وی دیكه‌، ئه‌وی دیكه‌، تا ئه‌م سه‌رده‌مه‌ی ئێستا، ئێستاش به‌نده‌ جه‌نابتان ده‌زانن كه‌ وێڕای ئه‌و كتێبه‌ی له‌ زینداندا نووسیومه‌ (موسوعة)ی: (الإسلام كما يتجلّى في كتاب الله)، ته‌فسیرێكی كوردییشم به‌ده‌سته‌وه‌یه‌، كه‌واته‌ له‌و شتانه‌دا كه‌ گۆڕانیان به‌سه‌ردا دێ، به‌ ته‌ئكید پێویستی به‌ دووباره‌ تێگه‌یشتنه‌وه‌ و لێحاڵیی بوونه‌وه‌ی هاوچه‌رخانه‌ هه‌یه‌، به‌لآم دیاره‌ به‌ له‌به‌رچاوگرتنی ئه‌و شتانه‌ی كه‌ له‌ ئیسلامدا چه‌سپاوو نه‌گۆڕ (ثوابت وقواطع)ن، ده‌قی ڕاست و ڕوون و ڕاشكاویان له‌سه‌ره‌، ئه‌وانه‌ی ئه‌و بناغه‌ فیكرییه‌ پێكدێنن كه‌ ئۆممه‌تیان له‌سه‌ر كۆده‌بێته‌وه‌، ئه‌وانه‌ من ته‌فسیریان بكه‌م، یان یه‌كێكی دیكه‌ ته‌فسیریان بكات هه‌روه‌ك خۆیانن، به‌لآم هه‌ندێ شتیش هه‌یه‌ كه‌ گۆڕانی به‌سه‌ردا دێ، به‌پێی چاخ و سه‌رده‌مه‌كان، به‌ ته‌ئكید ده‌بێ ته‌فسیری تازه‌ و لێكدانه‌وه‌ی تازه‌ی بۆ بكرێ.

**دانـــا: ماموٚستا!قورئان له‌ ساته‌وه‌ختێك دا و بۆ جوگرافیایه‌ك دابه‌زی، كه‌ هه‌م ساته‌وه‌خته‌كه‌ مێژووناسان به‌ ساته‌وه‌ختێكی تاریكستان له‌ قه‌ڵه‌می ده‌ده‌ن، هه‌م جوگرافیایه‌كه‌ش زۆر دواكه‌وتووبوو له‌ هه‌موو رووه‌كانه‌وه‌، به‌ڵام قورئان توانی نیمچه‌ دوورگه‌ی عه‌ره‌ب كه‌ عه‌ڕه‌ب زمانی لێبوون، بكاته‌ خاوه‌نی حه‌زاره‌ت، بۆچی ئێستا قورئان ئه‌م ڕۆڵه‌ نابینێ؟ یان بڵێم: بۆچی ئێمه‌ ناتوانین ئه‌م سووده‌ له‌ قورئان ببینین، كه‌ ئێمه‌ش وه‌ك میلله‌تی كورد بۆ حوكمڕانیی خۆمان سوودی لێ ببینین؟**

**ماموٚستا:** ئه‌وه‌ی دووه‌مت ڕاسته‌، پرسیاری دووه‌مت، قورئان هه‌میشه‌ ده‌توانێ ئه‌و ڕۆڵه‌ ببینێ، به‌لآم قورئان بۆ خۆی نایه‌ت، ئه‌وه‌ مرۆڤه‌كانن به‌ ئه‌ندازه‌ی ئه‌وه‌ی كه‌ كارلێكی ڕاست و دروست له‌گه‌ڵ قورئاندا ده‌كه‌ن، به‌ ئه‌ندازه‌ی ئه‌وه‌

كە باش تێی دەگەن و، باش پێیەوە پابەند دەبن، باش جێبەجێی دەكەن، گۆڕانیان بەسەردا دێنێ، عەرەبەكان، لە رووی سیاسییەوە، شپرز و پێكەوە ناكۆك و ناڕێك، لە ڕووی ئابوورییەوە، دواكەوتوو، لە ڕووی كۆمەڵایەتییەوە دەزانین چۆن بووە، زۆر دواكەوتوو بوون، حسابیان بۆ ئافرەت هەر نەدەكرد، منداڵی خۆیان دەكوشت، زیندەبەچاڵیان دەكرد، لە رووی نەتەوەییەوە عەرەب ئەسڵەن وەك نەتەوەیەك نەبوون، وەك چەند هۆزێكی پێكەوەبەشەڕ هاتوو هەبوون، قورئان لە هەموو ڕوویەكەوە گۆڕینی، بۆچی؟ چونكە ئەوانەی كە مسوڵمان بوون، باش لە قورئان تێگەیشتن و، باش پێیەوە پابەند بوون، قورئان گۆڕینی، ئنجا نەك هەر ئەوان، دوایی چاخ لە دوای چاخ، ئەیبوبییەكان، توانیان بەرەی خۆیان و خەڵك لە ئاوێ دەربێنن، بەهۆی قورئان و ئیسلامەوە، دەوڵەتێكیان دروستكرد، كە زۆربەی دنیای ئیسلامی ئەوساكەی گرتبۆوە، دوایی سەلجوقییەكان، ئنجا عوسمانییەكان، ئێستاش لەم سەردەم و چاخەی ئێمەدا هەموو ئەو گەل و نەتەوانەی كە هەوڵ دەدەن باش لە قورئان تێبگەن و، باش پێیەوە پابەند بن، قورئان گۆڕانیان بەسەردا دێنێ، قورئان و ئیسلام لە ڕاستییدا وەك هەر بەرنامەیەكی دیكە، بە ئەندازەی ئەوە پەیڕەوەكانی شوێنكەوتووەكانی دەگۆڕێ، كە پێیەوە پابەند دەبن.

**دانا: زۆر سوپاس كە لە ئاڵقەی یەكەمی بە دانایی دا كە تایبەت لەسەر قورئان قسەمان كرد، هەرچەندە من زۆر پەلەم كرد لە پرسیارەكان بۆ ئەوەی كە لە یەك ئاڵقەدا كۆتایی پێ بێنین، سوپاست دەكەین كە وەڵامت داینەوە، پشت بەخوا لە ئاڵقەی ئایندەدا دەچینە خزمەت ئەو بیست و پێنج بنەما قورئانییەی كە جەنابت (بۆ چاككردنی ئەم دۆخەی هەرێم) لەژێر ناوونیشانی: (با گوێ لە قورئان بگرین)دا لە قورئان هەڵت هێنجاون.**

**مامۆستا:** ان شاء الله ئێمە لەم ئاڵقەی یەكەمەدا وەك بڵێ ئاوپژێنی بابەتەكەمان كرد، ئەگەرنا ئەگەر قسە بكەین لەبارەی گرنگیی قورئان و كاریگەریی قورئان لە ژیانی مرۆڤەكاندا و، ئایا قورئان دەتوانێ چیمان بۆ بكات؟! ئەوە هەویرێكە ئاوی زۆر دەوێ، بەڵام ئاوپژێنێكمان كرد.

# ئاڵقەی دووەم

بنەمای یەکەم: بووناسیی ئیسلامیی خوازیاری ئازادیی و ماف و ڕێزی یەکسانە بۆ مرۆڤەکان.

بنەمای دووەم: خــوا بەیەکگرتــن (التوحــید) خوازیـــاری یەکســان بوونی مرۆڤــەکانەو ڕێگرە لە پێشێلکردنی ئازادیی و ماف و کەرامەتیان.


ameer.maktab@yahoo.com

 /AliBapir  /AliBapir  /MediaAmeerOffice

www.alibapir.net

**دانـــا:** به‌ناوی خوای به‌خشنده‌ی میهره‌بان، سڵاوتان لێ بێت بینه‌رانی به‌ڕێز و خۆشه‌ویستی كه‌ناڵی ئاسمانی په‌یام، خۆم به‌ خۆشحاڵ ده‌زانم كه‌ له‌ ئاڵقه‌یه‌كی نوێی به‌رنامه‌ی به‌دانایی دا، به‌ ئێوه‌ی ئازیز و خۆشه‌ویست شادبووینه‌وه‌، له‌ خزمه‌ت به‌ڕێز جه‌نابی مامۆستا عه‌لی باپیر، ئه‌میری كۆمه‌ڵی ئیسلامی، مامۆستا گیان سوپاست ده‌كه‌ین كه‌ له‌ ئاڵقه‌ی دووه‌م دا كاتت به‌ ئێمه‌ به‌خشی، ئێمه‌ له‌ خزمه‌ت جه‌بانت داین بۆ گوێگرتن و تۆماركردنی ئه‌و به‌رنامه‌یه‌.

**مامۆستا:** منیش سوپاسی ئێوه‌ ده‌كه‌م.

**دانـــا:** زۆر سوپاس، مامۆستا! وه‌ك له‌ ئاڵقه‌ی یه‌كه‌م له‌ پێشه‌كییه‌كه‌یدا باسمان كرد كه‌ له‌سه‌ر بارودۆخی سیاسی هه‌رێمی كوردستان كه‌ ته‌واو تێكچووه‌، هیچی به‌سه‌ر هیچه‌وه‌ نه‌ماوه‌، پێم وایه‌ موباله‌غه‌ نیه‌، به‌تایبه‌ت له‌ رووی سیاسییه‌وه‌ و له‌ رووی ئابوورییه‌وه‌، به‌ڕێزتان له‌ هه‌ژماری تایبه‌تی خۆتان له‌ تۆڕی كۆمه‌ڵایه‌تی فه‌یسبووك وه‌ك چاره‌سه‌رێك، زنجیره‌ بابه‌تێكتان بڵاوكردووه‌ته‌وه‌ به‌ناوونیشانی (بۆ چاككردنی ئه‌م دۆخه‌ی هه‌رێم با گوێ له‌ قورئان بگرین)، ده‌پرسم: ئه‌م دۆخه‌ی هه‌رێم چ په‌یوه‌ندییه‌كی به‌ قورئانه‌وه‌ هه‌یه‌؟ یان قورئان ئه‌توانێ كوێی چاك بكات؟

**مامۆستا:** بسم الله الرحمن الرحیم. كاك دانا! من به‌ قسه‌یه‌كی خۆش ده‌ست پێده‌كه‌م، یه‌كێ له‌و كۆمێنتانه‌ی كه‌ هاتبوون، من كه‌ جارجار ته‌ماشای كۆمێنته‌كان ده‌كه‌م، گه‌نجێك، ئیدی نازانم خوشكێك بووه‌، یا برایه‌ك بووه‌، نووسیبووی: "مامۆستا! من له‌ مێژه‌ گوێ له‌ قورئان ده‌گرم و ئه‌م بارودۆخه‌ش هه‌ر چاك نه‌بووه‌"، وایزانیوه‌ ده‌ڵێم گوێ له‌ قورئان بگرن ئنجا محمد صدیق مه‌نشاویی یان هه‌ركام له‌ قورئان خوێنه‌كانی دیكه‌، ئیدی خه‌تمه‌كه‌ ته‌واو ده‌بێ و ئه‌وه‌ ده‌رمانی یه‌ك ساته‌یه‌! جا ئه‌و جۆره‌ تێگه‌یشتنه‌ش وتاره‌كانم ئه‌وه‌ی هێنامه‌وه‌ بیر، ده‌ڵێن: كاتی خۆی كه‌ ناپلیۆن له‌ سه‌ده‌ی هه‌ژده‌دا له‌ ساڵی ١٧٩٩و١٨٠٠دا، ١٧٩٩ تا ١٨٠٠، كه‌ میسری گرتوه‌، ئه‌و كاته‌ ئاستی هه‌ندێك له‌ زانایان ئاوا بووه‌، كه‌ زانایانی ئه‌زهه‌ر به‌شێكیان، ره‌نگه‌ هه‌موویان نه‌بووبن، به‌شێكیان كۆبوونه‌وه‌ و گوتیان: چی بكه‌ین باشه‌، بۆ ئه‌وه‌ی ئه‌و به‌ڵایه‌ ده‌فع بێت له‌ وڵاتدا، ئه‌و دوژمنه‌ هاتوه‌، به‌ڵكو خوا شكستی پێ بێنێ؟ گوتیان: باشترین

شت ئەوەيە بچين دابنشين بە دەستەجەمعى صەحيحى بوخاريى بخوێنينەوە، ئيدى دانيشتبوون صەحيحى بوخارييان خوێندبۆوە و سوپاى دوژمنيش هاتوە، بێ خەبەر لەوەى كە قورئانيش و صەحيحى بوخارييش، ئەوەيان تێدايە كە ئەگەر دوژمنێك بەسەريدا داى، هێزى بۆ ئامادە بكە، وەك عەرەب دەڵێن: (لا يَفُلُّ الحديدَ الا الحديد) هەر ئاسن ئاسن، دەپاچێنێتەوە، هەروەها خواى پەروەردگار دەفەرمویٚ: هەركەسیٚ دەستدرێژيى كردنە سەر، بە شێوەى خۆى بەرپەرچى بدەنەوە، (فمن اعتدى عليكم فاعتدوا عليه بمثل مااعتدى عليكم..)، ديارە مەبەستم لەوە كە گووتوومە: (بۆ چارەسەرى بارودۆخى هەرێم، با گوێ لە قورئان بگرين)، واتە با بزانين قورئان چى دەفەرمویٚ؟ ديارە لە پێشەكييەكەيدا[1] باسى ئەوەم كردوە كە دواى سەرنجدان و تێوەڕامانى قورئان (ديارە ئەوەى من بە خەڵكى دەڵێم: بۆ چارەسەرى بارودۆخى هەرێم با گوێ لە قورئان بگرين، بۆخۆم دەبیٚ لە پێشدا وامكردبیٚ) ئنجا بەو مەبەستە، بەو نيازە كە ئەم بارودۆخەى ئێستاى هەرێمى كوردستان - ئەوكاتە كە نووسيبووم و ئێستاشى لەگەڵدا بیٚ كە هەر درێژەپێدەرى ئەو كاتەيە- با بزانين قورئان چى تێدايە لەوبارەوە؟ من بيست و پێنج بنەما، بيست و پێنج ئەسڵم لە قورئان دەرهێناون، كە پێموايە بە لەبەرچاوگرتنى ئەو بيست و پێنج بنەماو پايە و ئەسڵە، ئێمە دەتوانين پاكسازيى و چاكسازييەكى ڕيشەيى لە وڵاتى خۆماندا بكەين و، ئەو بارە لارەى كە هەمووومان بەدەستييەوە گرفتارين، ڕاستيبكەينەوە، ئنجا ديارە ئێمە كە دوايى سەرنجى بنەمايەكان دەدەين، سەرنجى ئەو بيست و پێنج ئەسڵە دەدەين، ئەوكاتە وەڵامى ئەو پرسيارەى جەنابت زۆر ڕۆشن دەبێتەوە كە بۆچى چارەسەرى ئەم دۆخە پەيوەستە بە قورئانەوە؟!؟



---

(١) واتە: لە پێشەكى ئەو (٢٥) بنەمايەدا.

**دانـــا:** **مامۆستا! له ئاڵقەی رابردووشدا بیرمه لێم پرسیت ئێمە گرفتمان لەگەڵ ئەو یاسایانەدا هەیە كە بەدەستی خۆمان داماننناون، پێشێلیان دەكەین، لەوانەیە ئێستا كەسێك بڵێت: جەنابی مامۆستا بۆ ئەوەی ئەم بارودۆخەی هەرێم چاك بێت، ئەبێ یاساكان جێبەجێ بكەین، نەك گوێ لە قورئان بگرین؟**

**مامۆستا:** قورئانیش وا دەفەرموێ، لە ئاڵقەی پێشووشدا باسمكرد كە خوا سبحانه وتعالی بانگی بڕواداران دەكات:

﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لِمَ تَقُولُونَ مَا لَا تَفْعَلُونَ ﴿٢﴾ كَبُرَ مَقْتًا عِندَ ٱللَّهِ أَن تَقُولُوا۟ مَا لَا تَفْعَلُونَ ﴿٣﴾ ﴾ [الصف: ٢-٣]

یەكێك لە بنەمایەكانی قورئان ئەوەیە كە ئێمە قەناعەتی دڵ و قسەی زمان و كردەوەی ئەندامەكانمان یەك بن، دڵ و زمانمان یەك بن و زمان و كردەوەكانمان یەك بن، دووفلیقانەیی لە وجوودماندا نەبێت، ئەوەی كە بە خەڵكی دەڵێین چاكە بۆ خۆشمان پێمان چاك بێ،ئەوەی بە خەڵكی دەڵێین بیكەن، لە چاكە خۆشمان پێشێ ئەنجامی بدەین، خوای پەروەردگار لە قورئاندا بە جولەكەكان دەفەرموێ:

﴿ أَتَأْمُرُونَ ٱلنَّاسَ بِٱلْبِرِّ وَتَنسَوْنَ أَنفُسَكُمْ وَأَنتُمْ تَتْلُونَ ٱلْكِتَـٰبَ ۚ أَفَلَا تَعْقِلُونَ ﴿٤٤﴾ ﴾

[البقرة: ٤٤]

واتە: ئایا بە خەڵك دەڵێن چاكە بكەن و خۆتان لەبیر دەكەن و، ئێوە كتێب دەخوێننەوە، ئایا نافامن!

واتە: خەڵكی نەفام شتی چاك بە خەڵك دەڵێ و بەڵام خۆی كردەوەی خراپ دەكات، تۆ تەماشا بكە، یەكێك لەو شتانەی كە جەنابت دەفەرمووی بۆچی وایە؟ یاسا زۆرن، قسەی باش زۆرە، بەڵام كاری پێناكرێ، كە ئەوە خوای پەروەردگار، ئەگەر ئێمە لە قورئان تێ بگەین و، پابەندبین بە قورئانەوە و میللەتێكی مسوڵمان بین، خوا بە گەورەترین گوناحی داناوە، بە گوناحێكی زۆر ناقۆڵای داناوە و، بە عادەتی جولەكەكانی داناوە،

﴿ أَتَأۡمُرُونَ ٱلنَّاسَ بِٱلۡبِرِّ وَتَنسَوۡنَ أَنفُسَكُمۡ وَأَنتُمۡ تَتۡلُونَ ٱلۡكِتَٰبَۚ أَفَلَا تَعۡقِلُونَ ﴿٤٤﴾ ﴾

[البقرة: ٤٤]

بەهی عاقڵانی دانەناوە حاشا، حاشای هەموو ئینسانێكی نەجیب و چاك و عاقڵ، بە عادەتی نەفامانی داناوە، كە تۆ قسەی چاك بكەی بۆ خەڵك، بەڵام خۆت كردەوەی خراپ بكەی.

هەروەها لە فەرموودەی پێغەمبەردا (صلى الله عليه وسلم) هاتوە لە صەحیحی موسلیمدا، دەفەرموێ: ڕۆژی قیامەت پیاوێك دەهێنرێ دەخرێتە دۆزەخەوە و بە ڕیخۆڵەكانی لە شتێك دەئاڵێ، وەك چۆن كەر لە دەوری ناعوور دەسووڕێ (وەختی خۆی ناعوور هەبووە سەتڵیان لێبەستوون، كاتێك دایانهێشتوە بۆ نێو ئاوەكە بۆ خوارێ، ئنجا كەرەكە سوڕاوە بە دەوری ناعوورەكەدا و، سەتڵەكان چوونە خوارێ، پڕبوون لە ئاوو هاتوونەوە سەرێ و ئاوەكە ڕژاوەتە نێو جۆگایەكەوە) ئەو كەسەش ئاوا بە ڕیخۆڵەكانی خۆیەوە دەسووڕێتەوە، خەڵكی دۆزەخ لێی كۆدەبنەوە، دەڵێن: ئەرێ فلان كەس خۆتۆ چاكەت بە ئێمە دەگوت و، خراپەت لێ قەدەغە دەكردین و، فەرمانت بە چاكە پێ دەكردین، بۆچی وات لێهاتوە؟، ئەویش دەڵێ: (كنت يمر بالمعروف ولا يتيه، وكنت أنهاكم عن المنكر ويتيه)، فەرمانم بە شتی پەسەند پێ دەكردن، بەڵام خۆم نەمدەكرد و، ڕێگریم لە شتی ناپەسەند لێ دەكردن، بەڵام خۆم دەمكرد.

ئنجا تۆ تەماشا بكە ئەو چینە سیاسییەی ئەم هەرێمی كوردستانە، ناوی كەس ناهێنم، ئەو چینە سیاسییە، چەند شتی باش بە خەڵك دەڵێن: یاسا سەروەریی، خەڵكینە! ئەم وڵاتە وڵاتی هەموو لایەكە، خەڵكینە! دەبێ هەموو پێكەوە تەبابین، پێكەوە ڕێك بین، دەبێ وابین، دەبێ وا بچین، دەبێ دڵسۆز بین، بەڵام چەندی جێبەجێ دەكەن؟ چەند كەس هەیە لەم چینە سیاسییەی كە بڕیاربەدەست و حوكمڕانن لەم وڵاتەی ئێمەدا، كە كوڕ و كچەكانی خۆی جیانەكردووەتەوە لە كوڕ و كچی خەڵك؟ كامیان نەبوونە چینێكی جیاواز و تایبەت لەنێو كۆمەڵگادا؟! ئنجا ئەوە خوا بە گەورەترین گوناحی داناوە:

﴿ كَبُرَ مَقْتًا عِندَ اللَّهِ أَن تَقُولُوا مَا لَا تَفْعَلُونَ ﴿٣﴾ ﴾ الصف: ٣.

قورئان به عادەتی جولەكەكانی داناوە و، به عادەتی مونافیق و دڵنەخۆشەكانی داناوە، جەنابت دەڵێی: چارەسەری بارودۆخی هەرێم چ پەیوەستە بە قورئانەوە؟! یەكێك لە بنەما گرنگەكانی قورئان ئەوەیە كە كۆمەڵگایەكی موسڵمان و شوێنكەوتووانی قورئان، دەبێ قسەی دڵ و زمانیان یەك بێ و كردەوە و قسەیان یەك بێ، ئەگەرنا گەورەترین گوناح ئەنجام دەدەن، لەكاتێكدا شتی باش بە خەڵك بڵێن، بەڵام خۆیان شتی خراپ بكەن، یان شتی باشیان بۆ خۆیان بوێ، بەڵام بۆ خەڵكیان نەوێ، بەتایبەتی لە ئاستی بەرپرسیارێتییدا، ئینسان لە ئاستی بەرپرسیارێتییدا، دەبێ چی بۆ خۆی پێ چاكە، لە هەموو ئاستەكاندا، دەبێ هەمان شتی بۆ خەڵك پێ باش بێ و، چی بۆ خۆی دەكا، دەبێ هەمان شتیش بەپێی توانا بۆ خەڵك بكات.

**دانـا: مامۆستا ئەم واقیعەی ئێستای هەرێمی كوردستانی پێگەیشتوە دوای بیست و پێنج ساڵ لە حوكمڕانیی خۆماڵیی، دەرئەنجامی چییە وای لە جەنابت كردوە كە كەسایەتی سیاسیت لە گۆڕەپانەكەدا، بە جۆرێك لە جۆرەكان ترست هەیە لە داهاتووی ئەم هەرێمە ئەگەر چارەسەر نەكرێ، بۆیە كۆمەڵێك رێگەچارەت بۆ داناوە، دەرئەنجامی چییە ئەم بارودۆخە وایە؟**

**مامۆستا:** كاك دانا ئەم دۆخە وەك پەندە عەرەبییەكە دەڵێ: (یداك أوكَتَا، وفوك نفخ) بەدەستی خۆت گرێت داوە بەزاری خۆت فووت پێدا كردوە، پەندەكەت بیستوە؟! كابرایەك دەچێتە سەر ڕووبارێك خەڵك دەپەڕێتەوە یەكی دینارێك دەدەن و سواری بەلەم دەبن، ئەویش دەڵێ: ئنجا من چ مەجبوورم دینارێك بدەم، هەر خۆم دەپەڕمەوە، مەشكەیەكی پێ دەبێ، فووی تێ دەكات و، دەیبەستێ و خۆی هەڵدەداتە سەرێ، لە نێوقەدی ڕووبار، دیارە مەلە نازانێ، پەلێكی تێ رادەچێ، یاخود زارەكەی دەبێتەوە، هەواكە بەتاڵ دەبێ و كابرا دەكەوێتە پەلەقاژەی مەرگ، هاوار دەكات دەربازم بكەن، لەوبەرەوە بانگی دەكەن دەڵێن: (یداك أوكَتَا، وفوك نفخ)، بەدەستی خۆت گرێت لێداوە و بەزاری خۆت فووت تێ

کردوە، چۆن خۆت دەربازدەکەی دەربازی بکە، کاکە ئەم واقیعە کردەی دەستی ئێمەیە، خوا سبحانە وتعالی دەفەرموێ:

﴿ وَمَآ أَصَٰبَكُم مِّن مُّصِيبَةٍ فَبِمَا كَسَبَتۡ أَيۡدِيكُمۡ ﴾ [الشورى: ٣٠]

**واتە:** هەر بەڵایەکتان تووش دێ، بەرهەمی دەستی خۆتانە، ئەم وڵاتە بیست و پێنج ساڵە ئێمە نیمچە حکوومەتێکمان هەیە، خاوەنی ئیدارە و ئیرادەی خۆمانین، کێ دەستی گرتووین ناهێڵێ یاسا سەروەر بێ؟ کاتی خۆی باسی سەیارەی جام رەش کرا، پێموایە جگە لە ئێمە کەس پێیەوە پابەند نەبوو بەو یاسایەوە، ئێستاش لەگەڵدا بێ، من کە گوتیان: قەدەغەیە و وا مەسڵەحەتە سەیارەکان جامیان ڕەش نەبێ، هەر گوتوومە: کاکە با سەییارەکان جامی رەش نەبێ، ئێستا خەڵك دەمان بینێ، وەك گۆشتی سەر چەپەرێ هەموو شتێکمان دیارە، ئنجا ماڵمان لەنێو ماڵەکانی خەڵکە، منداڵمان لەنێو منداڵی خەڵکە، خۆمان لەنێو خەڵکین، بەنێو خەڵکیدا کە دەڕۆیین، با دیار بین! هەمیشە من بە شۆفێرەکانی خۆمم گوتوە. کە دەگەنە ئەو برا پۆلیسانەی ڕاوەستاون لەسەر جادەکان، ئەو برایانە، ئەو پێشمەرگانە، ئەو پۆلیسانە، ئەو سەربازانەی کە لە بازگەکان ڕادەوەستن، جامەکە داگرن، سڵاویان لێ بکەن، دەستخۆشییان لێ بکەن، ئەوانە بۆ ئەمنیەت و ئاسایشی ئێمە ڕاوەستاون. بۆ نەزم و نیزامی ئەم وڵاتە ڕاوەستاون.

بەڵام خەڵکی دیکە دەبینم کابرا تا بەرپرسێتیی گەورەترە، یاسا زیاتر پێشێل دەکات، ئەصڵەن یاسای هاموشۆ رادەوەستێ، کاتێك کە قافڵەی هەندێك لە بەرپرسەکان دەگاتە ترافیك، قانوون ڕادەوەستێ، بەڵێ گڵۆپ سوورە، بەڵام سەیارە هەر دەڕوات، پۆلیسەکەش یەکسەر ڕێی بۆ دەکاتەوە! لەو وڵاتانە کە دەڵێن یاسا سەروەر بێ، کێ لە هەموو کەس باڵادەستتر بێ، لە هەموو کەس زیاتر پێیەوە پابەندە، ئاوا یاسا سەروەر دەبێ، نەك یاسا بەسەر خەڵکی بێ دەسەڵاتدا جێبەجێی بکەی، بەڵام خۆت پێیەوە پابەند نەبیت، ئەم وڵاتە خۆمان بەو حاڵەمان گەیاندوە، پەرلەمان خۆمان پەکمانخستوە، حکومەت خۆمان ئیفلیجمان کردوە، دەسەڵاتی دادوەریی خۆمان سەدو یەك نیشانەی پرسیارمان خستەسەری، چەند

تاوانبار هەن، لەم وڵاتەدا، لەبەرئەوەی پشتی بە حیزبێكەوەیە، دێت و دەچێ، تاوانی گەورەی ئەنجامداوە، بەڵام دێت و دەچێ، یاخود زۆر بە سادەیی دەربازی دەبێ، بەڵام خەڵكی دیكە هەیە بە تۆمەت و بوختان، گیراوە و حوكمیش دراوە! خەڵك هاتوە بۆ لام، (دوای ئەوەی حوكمەی تەواوكردوە)، گوتوویەتی: مامۆستا! دەزانی من چۆن حوكم دراوم؟ بەخوا لە ئێوارەوە هەتا بەیانی لە ژوورێكیان كردبووم وەك سەلاجە وابوو، بە زستانێ، نیوە بەفراو بوو، مەجالیشم نەبوو سەریش هەڵهێنم، نەمزانی چۆن ڕۆژم لێ بووەوە، دوایی كابرای پاسەوان هاتوە، جەللادەكە بەپێ لەقە دەرگاكەی كردەوە و جنێوێكی پێدام گوتی: ئەوە هەر ماوی، خۆ بۆیە لێرەمان كردبووی ڕەق ببییەوە، هەر ماوی، دەوەرە چیت پێ دەڵێین ئیمزای بكە، گوتم: چیم پێ دەڵێن، ئیمزای دەكەم، چونكە بەرگە ناگرم دەمرم.

**دانـــا: لەم هەرێمەی ئێمەدا؟**

**مامۆستا:** لەم هەرێمەی ئێمەدا، ئنجا بە بەرپرسانی باڵای ئەم وڵاتەشم گوتوە: من چوار لەو نەفەرانە دێنم بۆ لات، كە كابرا هەڕەشەیان لێكردوە بەوەی شتی زۆر خراپی بەسەر بێنن، لەتاو خۆی گوتوویەتی: ئەوە مەكەن، چی دەڵێن ئیمزای دەكەم، ئێستا پازدە ساڵ حوكم دراوە لەسەری!! یانی ئێمە خۆمان یان دامەزراوەكانی ئەم وڵاتەمان پەكخستوە، یان نیشانەی پرسیارمان خستوونەتە سەر، لەبەرچی؟ لەبەر بەرژەوەندیی تاكیی، بنەماڵەیی، حیزبیی، لەبەر بەرژەوەندیی ناشەرعیی، كاك دانا! هەمیشە ئینسان ئەگەر ئامانجی بەرز و شەرعیی بێ، مشووری ئامراز و هۆكاری شەرعیشی بۆ دەخوات، بەڵام ئەگەر ئامانجت ناشەرعیی بوو، مەبەستت ناشەرعیی بوو، بەناچاری دەبێ خەفتانی شێواز و ئامرازی ناشەرعییشی بۆ بكەی، هەمیشە ئامانجە شەرعییەكان، پەكیان لەسەر ئامراز و شێوازە شەرعییەكان كەوتوە، ئامانجی ناشەرعیی، دەبێ بۆی بگەڕێی بۆ شێوازی ناشەرعیی، كوردەواریی خۆشمان دەڵێن: (دز بازاڕی ئاڵۆزی دەوێ) یان (ڕاوچی خراپ لە ئاوی لێڵدا ڕاو دەكات)!! كەواتە: خۆمان ئەم وڵاتەمان ئاوا لێكردوە، چی وای لێكردووین؟ من

له‌وێدا باسمكردوه‌ له‌ بنه‌ماكاندا كه‌ ئه‌گه‌ر جه‌نابت ئه‌گه‌ر به‌پێی ڕیزبه‌ندییه‌كه‌یان پێیاندا بڕۆی، من به‌ ڕیزبه‌ندییه‌كی مه‌نتیقیی هێناومن، كه‌ له‌ڕاستیدا ئێمه‌ له‌ ئه‌نجامی ئه‌وه‌دا كه‌ خوا نابینین سبحانه وتعالی، (دیاره‌ قسه‌ له‌ كۆمه‌ڵگایه‌كی موسڵمان ده‌كه‌م) قیامه‌ت نابینین و، له‌ ئه‌نجامی ئه‌وه‌دا كه‌ له‌ سوڕگه‌ی خۆمان و به‌رژه‌وه‌ندییه‌ تایبه‌تی و حیزبایه‌تی و خزمایه‌تی و بنه‌ماڵه‌یی و شته‌ بچووكه‌كاندا ده‌خولێینه‌وه‌، نایه‌ینه‌ فه‌زای فراوانی وڵات بینین و خه‌ڵك بینین، له‌ ئه‌نجامی ئه‌وه‌دا ئه‌م وڵاته‌مان به‌و شێوه‌یه‌ لێكردوه‌، كه‌ نیشانه‌ی پرسیاری زۆرمان خستووه‌ته‌ سه‌ر دامه‌زراوه‌كان، سه‌ر خۆمان، سه‌ر قه‌واره‌ سیاسییه‌كه‌مان به‌ گشتی، ئنجا ده‌رفه‌تی زۆر كراونه‌وه‌ كه‌ ده‌وڵه‌تانی دراوسێ ته‌ماعیان تێماندا هه‌بێ، ئه‌و حیزبه‌ به‌ولادا بچێ و، ئه‌ویدیكه‌ به‌ولادا بچێ و ئه‌ویكه‌ به‌ولادا بچێ! ئه‌و دۆستانه‌مان كه‌ ڕه‌نگه‌ هه‌ندێكجار مامه‌ڵه‌یه‌كی تاكتیكیمان له‌گه‌ڵدا بكه‌ن، ئه‌گه‌ر دڵی خۆیان بكه‌نه‌وه‌، ده‌ڵێن ئێوه‌ كه‌ی وڵاتن! ئێوه‌ كه‌ی قه‌واره‌ی سیاسیین! چۆن وڵات ئاوا به‌و شێوه‌یه‌ به‌ڕێوه‌ ده‌چێ؟ كوا یاسا سه‌روه‌رییتان! كوا په‌رله‌مانتان! كوا حكومه‌تتان! كوا ده‌سه‌ڵاتی دادوه‌رییتان، كوا دامه‌زراوه‌كانتان؟!

**دانا: باشه‌ مامۆستا! ئه‌مه‌ ئه‌كرێ ته‌عمیمی بكه‌ین به‌سه‌ر هه‌موو قیاده‌ی ئه‌حزابی سیاسی، بڵێین: هه‌مووتان به‌شدارن له‌مه‌دا، ئه‌گه‌ر وانیه‌ بۆ ئه‌بێ كه‌مینه‌یه‌ك زۆرینه‌یه‌ك گرفتاربێ به‌ده‌ستیه‌وه‌؟**

**مامۆستا:** كاك داناگیان! كه‌مینه‌یه‌كی پاره‌به‌ده‌ستی ده‌سه‌ڵات قۆرخكه‌ر، ئه‌م وڵاته‌یان وا لێكردوه‌، ئه‌وه‌ زۆر به‌ بێویژدانیی ده‌زانم، هه‌ر له‌به‌رئه‌وه‌ی كه‌ لایه‌نه‌ سیاسییه‌كان پێیان ده‌گوترێ: حیزب، بڵێی هه‌موو وه‌ك یه‌كن، ئه‌وه‌ وه‌ك ئه‌وه‌ وایه‌ كه‌سێك ناوی موحه‌ممه‌ده‌ خراپ بێ، بڵێی هه‌رچی موحه‌ممه‌ده‌ خراپه‌، یان ئه‌و كابرا شه‌رابخۆر و تریاك كێشه‌ی كه‌ له‌ فه‌ڕه‌نسا به‌و ترێڵه‌یه‌ هه‌شتا سه‌د كه‌سێكی فه‌وتاندوه‌، كه‌ ده‌ڵێن: كابرایه‌كی شه‌ڕابخۆره‌، من گوێم (له‌ئێن ئاڕ تی) بوو، گوێم له‌ ئاژانسه‌كان بوو كه‌ كابرایه‌كی تریاك كێشه‌، شه‌رابخۆره‌، دزه‌، خراپه‌كاره‌، بێنی ئه‌وكه‌سه‌ له‌سه‌ر مسوڵمانان و ئیسلامی حیساب بكه‌ی، دوو حیزب، كه‌ له‌م وڵاته‌دا بڕیاربه‌ده‌ستن به‌ ڕوونیی و ڕاشكاویی من گوتوومه‌:

ئەم هەرێمە دابەشکراوە بۆ دەڤەری زەرد و سەوز، ئەو دوو حیزبە بە پلەی یەکەم، بەرپرسیارێتیی ئەم دۆخە هەڵدەگرن، بەڵێ گومانی تێدا نیە، ئێمە بەرپرسیارین بەرانبەر بە چاککردنی ئەم بارودۆخە، بەڵام بەرانبەر بە تێکدانی، ئەوانە بەرپرسیارن کە بە دەستیانەوە بووە، تۆ لە دانووان ئاویشت بەدەست نەبووە، چونکە بیستوومە، ئاگام لێبووە جاری واهەبووە بابایەکی ئیسلامیی خۆی کردوە بە نەخواردووی لە سمێڵان مەیو، گوتوویەتی: هەمووومان بەرپرسیارین، ئاخر تۆ چیت بەدەست بووە، فەقیر، تۆ بێدەسەڵات و دەستەپاچە و هیچ نەبوو بووی، تۆ مەحرووم بووی، بۆ خۆت بەرپرسیار دەکەی، هەر بۆ موجامەلەکردن و ڕازیکردنی خەڵکێك؟! نا ئەو کەسە بەرپرسیارە کە بووەتە هۆکاری بەم دۆخە گەیشتنی ئەم وڵاتە، کە بڕیاربەدەست بووە، پارە و ئیمکانیەتی ئەم وڵاتەی بەدەست بووە، ئەمر و نەهی ئەم وڵاتەی بەدەست بووە، پەیوەندییەکانی ئەم وڵاتەی بەدەست بووە، هێزی چەکداری ئەم وڵاتەی بەدەست بووە، ئەوانە بەرپرسیارن، بەڵام تۆ کە هیچت بەدەست نەبووە، بەرپرسیاری چی؟!

**دانا: کەواتە ئێوە چی بکەن، مادام ئێوە دەستتان لە ئاڵۆزکردن و لە تێکدانی ئەم بارودۆخە نیە، ئەوەی تێکی داوە، ئەبێ چاکی بکات، وەك پەندەکەی پێشوو باست کرد؟!.**

**مامۆستا:** نا بە هەمووومان.

**دانا: بەتەنیا هیچتان بۆ ناکرێ ؟**

**مامۆستا:** نا نا بە هەمووومان، پاشان ئەوە ئەوان ئیرادەیان هەر نەبوو، ئەدی ئەو خەڵکە بۆ دەبێ دەستەپاچە بێ؟ بۆ زانیاریت یەکێك لەو بنەمانەی من کە هێناومە، خوا سبحانە وتعالی ئەرکی بەرپرسیارێتیی پێشێ دەخاتە ئەستۆی خەڵك و جەماوەر، خەڵك و جەماوەر پێش هەموو کەس بەرپرسیارە، لە بەسەرهاتەکەی مووسادا (علیه الصلاة والسلام) کە بەنو ئیسرائیل دوای ئەوەی مووسا دەچێ تەوڕات لە خوا وەربگرێ، هەتا دێتەوە خەڵکەکەی دەستیان کردوە بە گوێلك پەرستیی، کێ هەڵیخەڵەتاندوون؟ (سامیریی)، بەڵام ئایا مووسا کە دەست

دەکا بە لێپرسینەوە لەو بارەوە و بەدواداچوون بۆ ئەو مەسەلەیە، لە سامیرییەوە دەستپێدەکات؟ نا، لە هارڕوونەوە دەستپێدەکات، کە جێگری بووە؟ نا، لە کێوە دەستپێدەکات؟ لە خەڵك، پێشیٚ ڕوو لە خەڵکەکە دەکات، وەك دوایی دەیگەینیٚ، ئەوە بۆچی واتان کرد؟ ئەوانیش بێچارەیی و دەستەپاچەیی خۆیان پیشان دەدەن، وەك هەر میللەتێکی دیکە، هەر میللەتێکی لاساییکەرەوەی چاولێکەری هیچ لەدەستنەهاتوو، وەڵامێکی زۆر سەلبی و خراپ دەدەنەوە، دەڵێن: ئێمە بەدەست خۆمان نەبوو (سامیریی) وای پێگوتین، ئنجا ئەوە سامیریی وای پێگوتوون، ئەدی خۆتان عەقڵتان نەبوو؟ دوای ئەوەی لەوان دەبێتەوە، ئنجا ڕوو لە هارڕوونی برای دەکات، هارڕوون! بۆچی کەمتەرخەم بووی؟ هارڕوونیش عوزری خۆی دێنێتەوە، ئنجا دوایی دێتەسەر لێپرسینەوەی سامیڕیی:

﴿ قَالَ فَمَا خَطْبُكَ يَسَـٰمِرِيُّ ﴿٩٥﴾ ﴾ [طه: ٩٥]

ئێمەش بەرلەوەی گلەیی لە سامیرییەکان بکەین، لە هەڵخەڵەتێنەرەکان بکەین، خەڵك و جەماوەر بەرپرسیارە، من هیچ کاتێك ئەو خەڵك و جەماوەرە لە بەرپرسیارێتیی نابەمە دەر، ئەوە دروست نیە، بەپێی مەنتیقیی قورئان، چونکە کە تۆ بە خەڵکت گوت: هیچ خەتات نیە، چۆنی هێناوە هەروا دەڕوا و هەست بە بەرپرسیارێتیی ناکات.

**دانا: باشە مامۆستا، ئێستا بینەرێك کە گوێی لە قسەکانی جەنابتە، ئەڵێ مامۆستا! من چیبکەم وەك جەماوەر، تۆ وەك حیزبێکی سیاسیت، حیزبێکت لە پشتە، کەسایەتییەکی، تۆ و هەموو لایەنە سیاسییەکان، ناتوانن ئەم وەزعە چارەسەر بکەن، منێکی فەرمانبەر، منێکی هاووڵاتیی، منێکی کرێکار، چیبکەم، چۆن چاکی بکەم؟**

**مامۆستا:** فارس دەڵیٚ: "قگرە قگرە دریا میشود"، دڵۆپە دڵۆپە دەبێتە دەریا، کاتی خۆی جەمالەددینی ئەفغانیی دەچیٚ قسە لەگەڵ هیندەکان دەکات، دەچێت بۆ هیندستان، ئەوکاتە هیندستان نزیکەی سەد ملیۆنێك بووە، بەریتانیاش ڕەنگە دە پازدە ملیۆنێك بوویٚ، گلەیی لە هیندەکان دەکات، دەڵیٚ: ئێوە بۆچی مستەعمەرەی بەریتانیان، هەم وڵاتتان لە هی وان زیاترە، هەم بۆخۆتان

چەند بەرانبەری ئەوانن؟! ئنجا قسەیەكیان پێ دەڵێ، قسەكەی زۆر جوانە، دەڵێ "هەركامێك لە ئێوە سەتڵە ئاوێك بێنێ بیرێژێ، نیوەدوورگەی بەریتانیا ون دەكات لە ئاودا"، سەد ملیۆن سەتڵ ئاو برێژێ، بە بەریتانیایدا بكەی، نوقمی ئاوی دەكات، بۆچی وا خۆتان بێ ئیرادە كردوە؟ دوایی كە غاندیی پەیدا دەبێ، هیندەكان رۆحێكی دیكەیان دەچێتە بەر و ئەو گۆڕانكارییە دەبێ كە هیند رزگار دەبێ، من هەرگیز لەگەڵ ئەوەدا نیم قوتابییەك، كارمەندێك، كرێكارێك، جووتیارێك، بڵێ من هیچم لەدەست نایەت، چۆن هیچت لەدەست نایەت؟ ئەدی باشە ئەو شێوە حوكمڕانییە لەسەر شانی كێ بینا كراوە؟ كێ دەنگی بەو خەڵكە داوە؟ كێ ئەم واقیعە سیاسییەی دروست كردوە؟ ئەم واقیعە لەسەر شانی كێ ڕاوەستاوە؟ نا، لەڕاستییدا هیچ كاتێك ئەو چینە سیاسییە كە هەیە، بەتەنیا لەم بارودۆخە ناهەموارە بەرپرسیارنیە و خەڵكێكیش كە هاوكار و در و دەستبارگریتەتی، ئنجا بەگشتی قسە دەكرێ، ئەگەرنا چینە سیاسیەكەش هەمووی وەك یەك نیە، هەر لەو چینە سیاسییە هەیە دێ بۆ لای من، دڵی خۆیم بۆ دەكاتەوە، زۆر لەم وەزعە نارازییە، زۆر بێزارە، زۆر ڕەخنەی لێی هەیە، بەڵام هیچیشی بەدەست نیە، كە من پێشم عەجیبە ئینسان لە حیزبێكدا بێ و هیچی بەدەست نەبێ و لەوێشدا بمێنێتەوە، ئەوەش زۆر جێی پرسیارە! ئنجا هەبووە لێم پرسیوە: چۆن لەوێدا ماوی؟ گوتوویەتی: ژیان و گوزەرانم وا دەسووڕێ، جا دەبێ ژیان و گوزەرانت وات لێ بكات لە حیزبێكدا بمێنیتەوە؟ بەخوا تەنەكەسازیی بكەی، سەوزە بفرۆشی، كە ئەوانە پیشەیەكی شەریفن، ئەوە بكەی باشترە لەوەی لە حیزبێكدا بمێنیەوە، لەبەرئەوەی كە ژیانت ناسووڕێ، بڵێی تازە كەسابەتێكی دیكەم بۆ ناكرێ!

لەراستییدا بەرپرسیارێتییەكە ڕوو لە هەموان دەكات، بەڵام گلەییەكە زیاتر لە بەرپرسان دەكرێت، بەرپرسانی ئەم وڵاتە، چینە سیاسییەكەی ئەم وڵاتە، بە كودەتا نەهاتوون و چونكە ئێمە هەموومان لە شاخ بووین، لەبیرمە هەموو پاتەی (وێن)مان لەپێ بوو، جلەبەرگەكەمان وەك یەك بوو، هەموومان لە ئێران شڕە پیكابمان هەبوون، هەموومان بە ئێستر بارو سوارمان دەكرد، هەموو ژیانمان وەك

یەك بوو لەو شاخ و داخە، میللەت دەوڵەمەند بوو، حیزب فەقیر بوو، خواخوامان بوو كە دەچووینە دێیەك، خەڵك شۆربایەكمان بدەنێ و بەگەرمی بەخێرمان بێنن، ئێستا یانی چی حیزب دەوڵەمەند بووە و چووەتە ئاسمان، نەك هەر میللەت، حكومەتیش قەرزدار و فەقیرە؟! ئەوە بۆیە گلەیی لەو چینە سیاسییە دەكرێ، ئەگەرنا لەراستییدا بەرپرسیارێتییەكە هی هەموو لایەكە، هەموو لایەك دەبێ هۆشیار و بێدار بن، هەموو لایەك هەست بە بەرپرسیارێتی بكەن و، چیدیكە لەم واقیعە خراپەوە ڕانەمێنن.

**دانا: مامۆستا! لە بنەمای یەكەمی ئەو زنجیرە ئاڵقەیەدا كە داتبەزاندوە، باس لەوە ئەكەی (بووناسیی ئیسلامیی خوازیاری ئازادیی و ماف و ڕێزی یەكسانە بۆ مرۆڤەكان)، من حەزدەكەم ئەوە بۆ من هەم بۆ بینەران ڕوون بكەیتەوە، مەبەستت چییە لەم چەمكە؟**

**مامۆستا:** دیارە بناغەی ئیسلامەتیی بریتیە لە بووناسیی، كە هەندێك پێیدەڵێن دنیابینیی، یان جیهانبینیی، بەڵام ئەگەر تەرجەمەی وردتری وشە ئینگلیزییەكە بكەین، (ئۆنتۆلۆجی -Ontology-) دەبێتەوە بە (علم الوجود)، یان (معرفة الوجود)، واتە: بووناسیی، زانیاریی دەربارەی ئەم بوونە، من كتێبی یەكەمم لە (موسوعة): (الاسلام كما یتجلى في كتاب الله) كە بە عەرەبی نووسیوومە، تەرخانم كردوە بۆ (بووناسیی) و دەوری چوارسەد پێنج سەد لاپەڕەیە، بووناسیی ئیسلامیی چیمان پێ دەڵێ؟ پێمان دەڵێ: ئەم بوونەوەرە، خاوەنی هەیە، بەدیهێنەرێكی هەیە كە خوایە سبحانە وتعالى، خوا هەموو گەردوونی دروستكردوە و كردوویەتی بە شانۆیەك، مرۆڤی تێدا داناوە بۆ تاقیكردنەوە، وەك لە ئایەتی ژمارە حەوتی سوورەتی (هود)دا هاتوە، كە من لە كتێبی (تەوژمی ئیسلامیی و عەلمانیی و خاڵە هاوبەش و جیاوازەكان)دا بە وردیی باسی بووناسیی ئیسلامییم كردوە، لەبەر ڕۆشنایی ئەو ئایەتی (٧)ی سوورەتی (هود)دا كە دەفەرموێ:

﴿ وَهُوَ ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ فِى سِتَّةِ أَيَّامٍ وَكَانَ عَرْشُهُۥ عَلَى ٱلْمَآءِ لِيَبْلُوَكُمْ أَيُّكُمْ أَحْسَنُ عَمَلًا ﴾ [هود: ٧]

خوا ئەو كەسەیە كە ئاسمانەكان و زەوی بە شەش ڕۆژان (واتە: بە شەش قۆناغ، چونكە ئەوكاتە خۆ شەوو ڕۆژ نەبوون، شەش ماوە لە كات) دروست كردوون و عەرشی خوا لەسەر ئاو بوو، (ئەوەش لەوانەیە مەبەست پێی ماددەیەكی یەك شێوە بێ، چونكە پێكهاتەی سەرەكیی بریتیە لە هایدرۆجین، ئنجا ڕەمزە كیمیاییەكەی ئاو بریتیە لە ($H_2O$) واتە دوو گەردیلەی هایدرۆجین و گەردیلەیەكی ئۆكسجین گەرد (مۆلكول: جزئي)یكن ئاو پێكدێنن، ئێستاش زانایان دەڵێن: بوونەوەر دوای تەقینەوە گەورەكە(بیك بانگ) زۆرترین ڕێژەی توخم لە بوونەوەردا هەبێ هایدرۆجینە، هەندێك دەڵێن مەبەست پێی ئەوەیە، گرنگ ئەوەیە خوا دەفەرموێ عەرشی خوا لەسەر ئاو بوو، بۆچی؟ خوا بۆچی ئەم حەوت ئاسمان و زەوییەی دروستكردن (لِيَبْلُوَكُمْ أَيُّكُمْ أَحْسَنُ عَمَلًا)، كەواتە: بووناسیی ئیسلامیی پێمان دەڵێ: ئەی مرۆڤ هەموو ئەو بوونە بۆ ئەوە دروستكراوە تۆی تێدا تاقیبكرێتەوە، ئنجا لەوەوە، ئەم ئەنجامگیرییە پەیدا دەبێ، كە مرۆڤ زۆر دروستكراوێكی گەورە و گرنگە.

كاكڵەی (بووناسیی ئیسلامیی) ئەوەیە كە باسمكرد: خوا ئەم گەردوونەی هێناوەتە دی و خاوەنییەتی و مشووری لێ دەخوات و بەسەری ڕادەگا، ئنجا دروستكراوێك كە لەم بوونەدا هەیە، ناوازەیە، كە مرۆڤە و، ئەم بوونە خوا دەفەرموێ: هەموویم بۆ ئەوە هێناوەتە دی تاكو مرۆڤی تێدا تاقی بكەمەوە، ئایا ئەمە چی لێوە وەدی دێ، ئەمە چی دەخوازێ؟ ئەمە ئەوە دەخوازێ كە مرۆڤ جێنشینی خوایە، واتە خوا مرۆڤی لەم سەرزەویە داناوەو دەستیشی ئاوەڵا كردووەتەوە چۆن تەسەڕوفی تێدا دەكات، وەك دەفەرموێ:

﴿ هُوَ أَنشَأَكُم مِّنَ ٱلْأَرْضِ وَٱسْتَعْمَرَكُمْ فِيهَا ﴾ [هود: ٦١]

خوا ئێوەی لە زەویدا پێگەیاندوە و ئاوەدانكردنەوەشی عایدی ئێوە كردووە، كە بە داخەوە مرۆڤ زۆرجار وێرانی دەكا لەجیاتی ئاوەدانكردنەوە.

پاشان خوا ناوی له مرۆڤ ناوه: جێنشینی خوا (خليفة الله):

١- ﴿ وَإِذْ قَالَ رَبُّكَ لِلْمَلَـٰٓئِكَةِ إِنِّي جَاعِلٌ فِي ٱلْأَرْضِ خَلِيفَةً ﴾ [البقرة: ٣٠].

واته: كاتێك خوا به فریشتانی فەرمووː من جێنشینێك لەسەر زەوی دادەنێم.

٢- ﴿وَهُوَ ٱلَّذِي جَعَلَكُمْ خَلَـٰٓئِفَ ٱلْأَرْضِ ﴾ [الأنعام: ١٦٥]

واته: خوا ئێوەی كردوه به جێنشینانی خۆی لەسەر زەوی.

٣- پاشان خوا سبحانه وتعالى به گشتی باسی مرۆڤ دەكا و، دەفەرموێ:

﴿وَلَقَدْ كَرَّمْنَا بَنِيٓ ءَادَمَ ﴾ [الإسراء: ٧٠]

واته: ڕێزمان له وەچەی ئادەم گرتوه.

ئنجا ئەو هەموو پێغەمبەرانه هاتوون (سەڵات و سەلامی خوایان لەسەر بێ)، كه له موسنەدی ئیمام ئەحمەددا دەفەرموێ: سەدو بیست و چوار هەزار (١٢٤,٠٠٠) پێغەمبەر هاتوه، بۆچی هاتوون؟ ئەو هەموو كتێبانەی خوا دابەزیون، بۆچی دابەزیون پەیامەكانی خوا؟ دیاره هیچكام له پێغەمبەران نەبووه كه خوا پەیامی بۆ نەنێرێ، بەڵام هەندێكیان پەیامەكانیان له دووتوێی كتێبێكی سەربەخۆدا كۆكراونەوه، بۆچی؟ بۆ بەختەوەریی مرۆڤ، بۆ ئەوەی مرۆڤ بزانێ چۆن لەم سەرزەوییە مەدار دەكات و ژیانه كاتییەكەی دەگوزەرێنێ، كەواته: ئەمه خوازیاری ئەوەیە كه مرۆڤەكان یەكسان بن، ئازاد بن، ڕێزلێگیراو بن و، دەبێ ماف بۆ دابینكراو بن، مەبەستمان ئەوەیە، كه بووناسیی ئیسلامیی له ڕاستییدا بناغەی دابینكردنی ماف و ئازادییەكانه، بناغەی ڕێزگرتنه له مرۆڤەكان و، بناغەی ئازادی مرۆڤەكانه، واته: مرۆڤێكی موسوڵمان لەگەڵ مرۆڤێكی ناموسوڵمان دا، جیاوازییان نیه لەوەدا كه هەردووكیان جێنشینی خوان، هەردووكیان ڕێزلێگیراون لەلایەن خواوه و لەسەر زەوی دانراون به جێنشینی خوا، ئنجا هەرچی ڕێزلێگرتنی مرۆڤ پەكی لەسەری كەوتوه، دەبێ بۆی دابین بكرێ، كەواته: لەسەر بناغەی بووناسیی ئیسلامیی، هیچ كەسێك بۆی نیه

خۆی لە كەسێكی دیكە بە زیاد بزانێ، یان كەسێكی دیكە بەكەم تەماشا بكات، یان پێیوابێ حەقێكی زیادەی بە یەكێك لە نیعمەتەكانی خواوە هەیە، مەگەر توانای زیاتر صەرف بكات، مەگەر ڕەنجی زۆرتری بۆ بدات، ئەگەرنا لە ئەصڵدا هەموویان وەك یەك بەشیان بە نیعمەتەكانی خواوە هەیە.

**دانـا: مادام ئاماژەت پێ كردوە، كەواتە تۆ هەستت كردوە لە كۆمەڵگەی ئێمەدا تاكەكان كە دەبێ لە ماف و ئیمتیاز ئازادییەكاندا هاوتا بن، هاوتانین و، تەبەقەیەك هەیە كە خۆی پێ لەوان باشترە؟**

**مامۆستا:** نەك هەر هەستم پێكردوە، هەر بە چاوی سەر دەیبینم و، زۆر زۆر ڕوونە، زۆر زۆر ئاشكرایە، ئەم وڵاتە تۆ دەبینی: سەروەت و سامانەكەی، نەوتەكەی، پارەی نەوتەكەی، زەوییەكەی، خێروبێری نێو زەوییەكەی، هەمووی لەلایەن كەمینەیەكەوە قۆرخ كراوە، پێشتر باسمكرد، گوتم تۆ ئەگەر نەتەوەیەكی دیكە بێت وڵاتێك داگیر بكا، نەتەوەیەك داگیر بكات و بیكاتە بندەستی خۆی، خەڵكەكە دەڵێ: ئەوە دوژمنە، بەڵام عەجایبە بۆ چینێكی سیاسی كە هەتا دوێنێ بەو شاخەوە موحتاجی خەڵك و میللەتەكەی خۆیان بوون، موحتاجی نانەڕەقەی ماڵێك و شۆربای ماڵێك بوون، ئاتاج بوون كە ماڵێك بە خێریان بێنێ و، شەو بیانحەوێنێتەوە لە قوژبنێكدا، ئێستا ئەو چینە سیاسییە، ئەو بڕیاربەدەستانە خۆیان بە خاوەنی هەموو شتێك بزانن و خەڵكی دیكەش پێیان وابێ سواڵكەرە و دەبێ بە سواڵ و صەدەقە شتێكی بدەنێ، یاخود لەبەرامبەر كڕینی دەنگ و ڕەنگ و ئیرادەی دا، هەندێ لە مافەكانی خۆی پێ بدەن! كە ئەوە زوڵمێكی زۆر گەورەیە و ڕاست پێچەوانەی ئەو بوونناسییە ئیسلامییەیە و، ڕاست پێچەوانەی ئیمان و عەقیدەی ئیسلامییە و، ڕاست پێچەوانەی ئەو حیكمەتەیە خوا مرۆڤی بۆ خوڵقاندوە، خوا مرۆڤی بۆ ئەوە خوڵقاندوە تاقیبكرێتەوە، مرۆڤ كەی تاقیدەكرێتەوە؟ دەبێ ئازاد بێ، دەبێ سەربەست بێ، ئنجا خوا مرۆڤی ڕێز لێناوە، ئەوە كە تۆ بێنی بەخێری خۆت هەندێك لە حەق و مافەكانی خۆی پێ بدەی و منەتباری بكەی، چاولەژێری بكەی، پێشی بڵێی: ئەوەت بۆیە پێدەدەم كە تۆ با رەئیشت لەگەڵ من نەبێ، دەبێ

ده‌نگم پێ بده‌ی، شه‌ڕم بۆ بكه‌ی، له‌گه‌ڵمدا بی! كه‌ ئه‌وه‌ به‌ڕاستی ئه‌وپه‌ڕی بێڕێزییه‌ به‌رامبه‌ر به‌ مرۆڤ و پێچه‌وانه‌ی ئه‌و حیكمه‌ته‌یه‌ كه‌ خوا مرۆڤی بۆ خوڵقاندوه‌ و، ئه‌وه‌ به‌كه‌م ته‌ماشاكردنی مرۆڤه‌كانه‌، بگره‌ به‌ كۆیله‌ ته‌ماشاكردنی مرۆڤه‌كانه‌ و، خۆ زۆرهه‌ڵكێشانه‌ به‌سه‌ر مرۆڤه‌كاندا، هه‌مووومان وه‌ك یه‌كین، به‌ڵێ ئه‌گه‌ر خه‌ڵك بۆ خۆیان ڕێز له‌ كه‌سێك بنێن، ئه‌وه‌ هه‌ڵبژاردن هه‌یه‌، ئه‌وه‌ی كه‌ ئیسلام دایناوه‌:

﴿ وَأَمْرُهُمْ شُورَىٰ بَيْنَهُمْ وَمِمَّا رَزَقْنَاهُمْ يُنفِقُونَ ﴾ [الشورى: ٣٨]

ئێستا له‌ دنیادا باوه‌، خه‌ڵك بۆخۆیان ڕێز له‌ كه‌سانێك ده‌گرن ده‌ڵێن: نوێنه‌رمان به‌ له‌ په‌رله‌مان، ده‌سته‌ڵاتی جێبه‌جێكردن با به‌ده‌ست تۆوه‌ بێ، تۆ با فلان دامه‌زراوه‌یه‌ت به‌ده‌سته‌وه‌ بێت، ئێمه‌ تۆ داده‌نێین، به‌ڵام به‌وشێوه‌یه‌ كارمان بۆ بكه‌، كه‌ به‌رژه‌وه‌ندییه‌كانی ئێمه‌ ته‌حقیق بكا، ئنجا هه‌تا ئه‌و كاته‌ی ئێمه‌ ڕه‌وایه‌تییت پێ ده‌ده‌ین، تۆ له‌سه‌ر ئه‌و كورسییه‌ به‌ و، تۆ ده‌بێ بۆ خزمه‌تی ئێمه‌ له‌سه‌ر ئه‌و كورسییه‌ بیت، نه‌ك بۆ خزمه‌تی خۆت و بنه‌ماڵه‌ و حیزب و خزم، بۆ خه‌ڵكی دیكه‌ش پێت وابێ كه‌ سواڵكه‌ره‌ هاتووه‌ته‌ ده‌رگات!!.

**دانا: مامۆستا! بۆچوونێك هه‌یه‌ ئه‌وترێ ئه‌م لایه‌نه‌ سیاسییانه‌، قیاده‌ی ئه‌م لایه‌نه‌ سیاسییانه‌ بۆیه‌ ناكۆكن، له‌به‌ر ئه‌و میلله‌ته‌ نییه‌ ئه‌م سامان و داهاته‌ی له‌م وڵاته‌دا هه‌یه‌، ئه‌و شه‌ڕه‌ كه‌ ئێوه‌ ده‌یكه‌ن، شه‌ڕی ئه‌وان نییه‌، ئه‌وه‌یه‌ چه‌ند حیزبێك له‌م سامانه‌ سوودمه‌ند ده‌بن و به‌هره‌مه‌نده‌، ئێوه‌ی لێ ته‌ریكن، بۆیه‌ ئاوا ده‌نگتان لێ به‌رزبووه‌ته‌وه‌، من حه‌زه‌كه‌م له‌سه‌ر ئه‌مه‌ قسه‌م بۆ بكه‌ی.**

**مامۆستا:** كاكه‌ دانا، ئه‌وه‌ له‌ پشت په‌رده‌ی ڕه‌شه‌وه‌ ته‌ماشای خه‌ڵك كردن و گومانی خراپ به‌ خه‌ڵك بردنه‌، جا بۆ ئه‌وه‌ با بێن سه‌روه‌ت و سامانی ئه‌م خه‌ڵكه‌، بده‌نه‌وه‌ به‌م خه‌ڵكه‌، ئه‌م سه‌رزه‌وییه‌ كه‌ خوا ئێمه‌ی له‌سه‌ر داناوه‌، با بۆ هه‌موان وه‌ك یه‌ك بێ، نه‌ك هه‌ندێكیان به‌ چه‌ندان دۆنم بۆ خۆیانی دابڕن، دوایی دووسه‌د مه‌تر دووسه‌د مه‌تر به‌ خه‌ڵكی هه‌ژار و نه‌داری بفرۆشنه‌وه‌، یاخود بیده‌ن به‌ كه‌سێك به‌ناوی به‌رهه‌مهێنان (استپمار)ه‌وه‌ و له‌گه‌ڵیدا شه‌ریكه‌

دز بن و ملیۆنان دۆلاری لێوەربگرن، ئەویش بێنێت كۆمەڵێ خانووی لەسەر دروست بكات، بیفرۆشێتەوە بە خەڵكی ڕەش و ڕووت و قەرزداریان بكات تا چەند ساڵێك، هەموو ڕەنجیان بۆ ئەو بێ، ئەویش هەر لەبنەو پاڵەوە، هەر لە خۆڕا ببێ بە ملیاردێر، با بێن ئەم وەزعە بگۆڕن، بۆ ئەوەی ئێمە بێ قسە بكەن! تاكو بزانن داخۆ ئێمە ڕاست دەكەین، شەڕی خەڵكە دەیكەین، یان شەڕی خۆمانە؟! ئەو قسەیە ئەصڵ و ئەساسی نیە، ڕەنگە خەڵكێكیش لەوجۆرە هەبێت، بەڵام حەقیقەت ئاوا تەفسیركردنی شتەكان زۆر چەواشەكارییە، وەك گوتراوە: بەڵێ مەیدان مشكان نەیانكێڵاوە، ئەوە عەرز و ئەوە گەز، فەرموو تۆ بێنە دادگەریی بچەسپێنە، عەرز بگێڕەوە بۆ خەڵك، سەروەت و سامان و پارەی نەوت و موقەددەراتی خەڵك بگێڕەوە بۆ خەڵك، ئەوجار ئەگەر كەسانێك هەبوون هەر قسەیان دەكرد، ئەوە دیارە شەڕی خۆیان دەكەن، ئەگەر گوتیشیان دەستتانخۆش، زۆر مەمنون، بەڕاستی ئەوەی ئێمە دەمانەویست، هاتەدی، ئەوە ئەوكاتە مانای وایە ئەو گومانە، گومانێكی بێ جێیە و، لە پشت پەردەی ڕەشەوە تەماشاكردنە.

**دانا: لە بنەمای یەكەمدا كەمێك ئاماژەت پێ دا، بەڵام من ئەمەوێت لە بنەمای دووهەمدا تۆختر باسیبكەی گوتووتە: خوا بەیەككگرتن (توحید)یش وا لێمان ئەخوازێ هەموو مرۆڤەكان، هەموو رەنگەكان، نێر و مێ، هەموو یەكسان بن، نە هیچ هۆزێك، نە هیچ تایەفەیەك، نە هیچ حیزبێك، نە هیچ لایەنێك، خۆی بە باڵادەست تر و خۆی بە گەورەتر و شت زانتر بەسەر ئەوی دیكەدا نەزانێ، من ئەپرسم مامۆستا عەلی باپیر بە حوكمی ئەوەی كە چەند ساڵە ئەزموون ئەكەی لە هەرێمی كوردستان بەتایبەت لە رووە سیاسییەكەیەوە، ئەم حاڵەتە ئەبینی لە هەرێمی كوردستان دا، چینێك لە سەرەوە بێ و چینێك لە خوارەوە بێ، ئەوەی ئەوترێ چینێك لە گوندی خەونەكاندا بن و، چینێكیش لە گوندی خەمەكاندا بن؟**

**مامۆستا:** بەڵێ زۆر بە زەقیی دەبینرێ، بەداخەوە، ئەوە واقیعێكی بەرجەستەیە دەچێتە بەرچاوی هەموو كەسێكەوە، هەر تەماشای كۆشك و تەلارەكان بكە و، تەماشای شێوەی ژیانیان بكەو، تەماشای سەفەر و، ماڵ و منداڵیان و

تەماشای هەر شتێك بكەی، زۆر بە ئاشكرا دیارە، تەماشای ڤیللاكان بكە، تەماشای قافڵەی سەیاران بكە، تەماشای شێوەی ژیان بكە، تەماشای سفرە و خوان بكە، تەماشای جل و بەرگ، تەماشای هەر شتێ بكەی ئەوە زۆر بەزەقیی دەچێتە چاوەوە، ئنجا ئایا من دەڵێم: دەبێ كەس لە كەسی زیاتر نەبێ؟ ناوەڵڵا ئەوە ناڵێم، بەڵام من دەڵێم: دەبێ هەلەكان لەبەردەم هەموان دا وەك یەك ڕەخساوبن، ئنجا دوایی یەكێك كەسابەت ناكات و تەمبەڵ تەمبەڵ دادەنیشێ، ئەویدیكە شەوو ڕۆژ ڕەنج دەدا و زەحمەت دەكێشێ بەرهەمی دێتە دەست، بەڵام لەڕێی حەلاڵەوە و بە پارەی حەلاڵ دەوڵەمەند دەبێ، دەستی خۆش بێ، ئەویدیكەش دەستی ناخۆش بێ و شتێكی خراپی كرد، تەمبەڵ تەمبەڵ دانیشتوە، بەڵام گرنگ ئەوەیە هەلەكان لەبەردەم هەموویاندا وەك یەك یەكسان بن، بەڵام ئێستا، كە ڕەنگە ئێمە ئاگاشمان لەزۆر شت نەبێ، خەڵكێك هاتوە بۆ لام، گوتوویەتی من ویستم كارگەیەك دابنێم، لەم وڵاتەدا، لەم دەڤەرە، گوتیان باشە، بەڵام هەر سەرەتا دەبێ سەدا ئەوەندە پارەمان بدەیە و دواییش، دەبێ سەدا ئەوەندەی بۆ ئێمە بێت، گوتم: ئاخر بۆ خۆم هیچی نامێنێتەوە، گوتیان دایمەنێ! كاكە ئاخر وا باشە ئەم وڵاتە پێی ئاوەدان دەبێتەوە، كۆمەڵێك كرێكار، دەستی كار لێرە هەلی كاریان بۆ دەڕەخسێ، گوتیان: پێویستیمان پێی نیە، دایمەنێ!

من بەرپرس هەیە لەم وڵاتەدا بۆی باسكردووم، بەڵام بە ئەمانەت پێی گوتووم، منیش (صدور الرجال صندوق الأسرار)، لە دڵەوە بۆ گڵ، نایدركێنم، گوتی: یەكێك لە هاوەڵەكانم گوتی: لە ڕەفیقەكانی من نەفەرم پێ شك دێ دە ملیۆن دۆلاری لە مامەڵەیەك سوود بینیوە، گوتی: منیش گوتم: ئەوە زۆر زۆرە، گوتی: زۆرە؟ گوتم: بەڵێ، گوتی: وەڵڵا نەفەرم پێ شك دێ سەد ملیۆن (١٠٠٠٠٠٠٠٠) دۆلاری لە یەك گرێبەست ئیستیفادە كردوە!! كاكە دانا بەڵێ زۆر زەقە ئەو قرپی و پرپیە، ئەو چوونە ئاسمان و بەزەویدا چوونە خوارەوە، زۆر زۆر زەقە و دەچێتە چاوەوە، لەهەر ڕەهەندێكی ژیانەوە تەماشا بكەی.

**دانا: چینێك هەیە خەڵك بە خزمەتكار و كۆیلەی خۆی بزانێ، بە جۆرێ لە جۆرەكان.**

**مامۆستا:** جا كاكە دانا تەماشا بكە! بە خزمەتكار و بە كۆیلەدانانی خەڵك، یان خۆ لە خەڵك بە پەروەردگار و پەرستراوكردن، خۆ ماست نیە بە لێوەوە بێ، خۆ مەرج نیە هاوار بكات وەك فیرعەون بڵێ:

﴿أَنَا۠ رَبُّكُمُ ٱلْأَعْلَىٰ ﴿٢٤﴾﴾ [النازعات: ٢٤]

خوای پەروەردگار بۆچی لە قورئاندا زۆر باسی فیرعەون دەكات، زۆر باسی قارون دەكات، باسی هامان دەكات؟ لەبەرئەوەی ئەوانە سێ كوچكەیەك بوون، سێ كوچكەیەكی شووم: فیرعەون ڕەمزی قۆرخكاریی و ئیستیبدادی سیاسییە، قاروون ڕەمزی قۆرخكاریی ئابوورییە، هامان ڕەمزی چەواشەكاریی ئیعلامییە، ئەو سێ كوچكە شوومە، هەمیشە ئەو دووانەی دیكە، لە خزمەت دەسەڵاتە سیاسییە قۆرخكارەكەدان، ساماندارەكە لە پەنای ئەو دەسەڵاتدارە سیاسییەدا دەوڵەمەند دەبێ و دەبێتە ملیاردێر، ئنجا بۆچی خزمەتی نەكات و لەگەڵی دەبێتە شەریكە دز!! نایبینی لەم وڵاتەدا، نەمانبینی كە خەڵك هەبوو ڕەش‌ءڕووت، من پێم شك دێ، خەڵك هەبووە كە ڕاپەڕین كراوە وەك سلێمانەیی دەڵێن كێچ سەوزەڵە خانمی لە گیرفانیدا گوتوە، ئێستا حسابی خۆی نازانێ، لە كوێی بوو، كەسابەتی وامان نەبینیوە، خەڵكی وڵاتان دێ هەر سەری سوڕدەمێنێ، دەڵێ خەڵكم بینیوە بناغەیەكی هەبێ، لە باب و باپیری میراتێكی بۆ بەجێمابێ، كەسابەتێكی بۆ بەجێمابێ، بەڵام خەڵكم نەبینیوە دوێنێ سواڵی پێ شیابێ، ئێستا ببێتە ملیاردلێر، شتی وا نیە، بەس لە هەرێمی كوردستاندا شتی وا هەبووە، خەڵكم بینیوە دەڵێن: دەوڵەمەندترین حیزب لە هەرێمی كوردستاندایە لەسەر ئاستی هەموو دنیادا، هەرێمی كوردستانی چوار پێنج ملیۆنیی، خەڵكی فەقیری ڕەش و رووت، بۆ دەبێ حیزبەكەت دەوڵەمەندترین حیزبی دنیا بێت، ئەگەر قۆرخكاریی و گەندەڵیی نەبێ؟!

**دانـا: ئەمە بە جۆرێك لە كۆیلایەتیی نابینی ماموستا؟**

**ماموستا:** ئنجا فیرعەون كە دەیگوت:

﴿ أَنَا۠ رَبُّكُمُ ٱلْأَعْلَىٰ ﴿٢٤﴾ ﴾ [النازعات: ٢٤]

واتە: من بەرزترین پەروەردگارتانم و، دەیگوت:

﴿ قَالَ لَئِنِ ٱتَّخَذْتَ إِلَٰهًا غَيْرِى لَأَجْعَلَنَّكَ مِنَ ٱلْمَسْجُونِينَ ﴿٢٩﴾ ﴾ [الشعراء : ٢٩]

ئەگەر جگە لەمن پەرستراوێكی دیكەت هەبێ، وەگەڵ گیراوانت دەخەم، واتە زۆری دیكەشم زیندانی كردوون! ئێستا كابرا ناڵێ: من پەروەردگارم، دەڵێ: من خزمەتكارم و لە خزمەتدام، بەڵام بە كردەوە بە زمانی حاڵ خۆی بە خاوەنی هەموو شتێك دەزانێ، پەروەردگارێتیی یانی چی،؟ هەموو ئەگەر شتێكی قۆرخ كرد و خەڵكی ناچار كرد بۆ ئەوەی بژیەت، هەڵبەتە خەڵكی زەعیف، (بارك الله)ی بۆ بكێشێ و لە دڵیدا نەفرینی لێ بكات، من ئەو خەڵكە ڕەش و ڕووتانە زۆرجار دێن بۆ لام، دەڵێ: دەزانم حیزبەكەم ناحەقە، دەزانم وەزع وا بەڕێوە ناچێ، بەس كاكە چیبكەم ناژیەین، لەگەڵیدا نەبین ناژیەین، لەگەڵیدا نەڕۆی ناژیەی، ئەدی بە كۆیلە تەماشاكردنی خەڵك چۆنە؟! تۆ خەڵك ناچار بكەی هەرچەندە ئەو شتەی ناوێ، ئەوەی پێ ناڕاستە، بەڵام ناچاری بكەی دەنگت پێ بدا و، چاودێری بەسەرەوە دابنێی و، وە بیترسێنی و، تەماعی وەبەربنێی، ئیرادەی زەوت بكەی و، ئەو تۆزە ئیمتیاز و مافانەی كە پێدەدەی، كە رۆنی خۆیەتی لەسەری خۆی دەدەیەوە، بێنی پێی بفرۆشیەوە، بەنرخی كڕینی ئیرادە و دەنگ و، بەنرخی ئەوە كە خۆی تەسلیمی تۆ بكات، ئەدی باشە كۆیلایەتی چۆنە و خەڵك بە كۆیلە تەماشاكردن چۆنە؟ بە تەئكید ئەوە بەزمانی حاڵ، ئەو حاڵەتەی بەرجەستە كردوە.

**دانا: وەك ئەوەی كە ئێستا موچە مافێكی زۆر سەرەتایی فەرمانبەرانە، كاتێك كە لە دەزگاكانی ڕاگەیاندنەوە وادەی دابەشكردنی مووچە، ڕادەگەیەنرێ ئەو مووچەیەش بەو شێوازەیە نیوە مووچە و روبعە موچەیە، ئەبێتە جۆرێك لە هەڵڵاو لە جەژن و**

**له خۆشی بۆ فەرمانبەران، وەك خۆت فەرمووت ڕۆنی خۆیانه له سمێڵی خۆیانی دەدەنەوە، ئەمەش جۆرێكه له به كۆیلەكردن و وەك خەدم و حەشەم سەیركردنی خەڵكی؟**

**مامۆستا:** پێموایه هەركەسێك له بەرگی دیندا بێ، له بەرگی سیاسەتدا بێ، وەك حیزب بێ، وەك ڕژێم و حكومەت بێ، وەك رەئیس عەشیرەت بێ، له هەر بەرگێكدا بێ، له هەر قاڵبێكدا بێ، ئیدیعای ئەوەی كرد كه هەر له ئەسڵدا ئەو حەقی زیاتری هەیه به نیعمەتەكانی خواوە، وە بەرامبەرەكانی حەقی كەمتریان هەیه، یان ئیدیعای ئەوەی كرد كه هەر له خۆڕا له خەڵك چاكترە و، خۆی به ڕەچەڵەك و نەسەبەوە هەڵكێشا، خۆی به بنەماڵەیەوە هەڵكێشا، خۆی به خزم و عەشیرەتییەوە هەڵكێشا، یان لەبەرئەوەی كه ئەو ئەندامه له حیزبی منه، له سەرووی یاساوە دەبێ، ئەو ئەندامه لەبەرئەوەی لەگەڵ منه، ئەگەر زوڵمیش بكات، نابێ سزا بدرێ، بەڵام ئەویدیكه لەبەرئەوەی بەرامبەرەكەمه ئەگەر زوڵمیش نەكا، هەر دەبێ سزا بدرێ! به حەقیقەت ئەوە فیرعەونایەتی كردنه، ئەوە خۆ له خەڵك كردنه پەروەردگار و پەرستراوە و، ئەوە خەڵك به خزمەتكارو كۆیله سەیركردنه، بەو جۆرە مامەڵەكردن لەگەڵ خەڵكدا، چونكه خوا دەفەرموێ:

﴿ قُلِ ٱللَّهُمَّ مَٰلِكَ ٱلۡمُلۡكِ ﴾ [آل عمران: ٢٦]

بڵێ ئەی خوایه! خاوەنی موڵك، كەواته: هەر خوا خاوەنی موڵكه، (قُل لِّمَن مَّا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۖ قُل لِّلَّهِ) الأنعام-١٢-، واته: بڵێ موڵكی ئاسمانەكان و زەوی هی كێیه؟ بڵێ هی خوا، ئا خوا له چەندان شوێندا دووبارەی كردووەتەوە له قورئاندا، كه هەر خوا خاوەنه، هەر خوا هەمەكارەیه، خوا هەموو شتێكی بەدەستە، بۆچی؟ بۆئەوەی ئەو حوكمڕان و كاربەدەست و بڕیاربەدەستانه، خۆیان لێ نەگۆڕێ و پێیان وابێ بوونه خاوەن، لەڕاستیدا خاوەنی شتەكان بەس خوایه، ئەوانی دیكه لەبەرامبەر خوادا یەكسانن، بەڵام كەسێك زیاتر مافی دەكەوێته نێو نیعمەتەكانی خواوە كه ڕەنجی زیاتر دەدات، زەحمەتی زیاتر دەكێشێ، وەك گوتم من لەگەڵ ئەوە نیم كه خەڵك هەمووی یەكسان بكرێن، ئەوەی تەمبەڵه

و ئەوەی گورج و گۆڵەو چالاکە و، ئەوەی زیاتر خۆی ماندوو دەکا و، ئەوەی خۆی ماندوو ناکات، دوایی بێنێ بەشەکەی خۆی بداتە ئەوی دیکە، وەك سیستمی سۆسیالیزم دەیکرد، نا، بەڵام دیسان وەك سیستمی سەرمایەداریی (کاپیتالیزمی) دەیکا، نا، کە کۆمەڵگا لە ژێر پێی تاکدا بپلیشێنرێتەوە و، تاك دەستی ئاوەڵا بێ چۆن کەسابەت دەکا، چی دەکا بیکات، بازەرەر بە بەرژەوەندیی گشتیش بگەیەنێ، بەڵکو با زیان بە چینی ئۆزۆنیش بگەیەنێ و ژینگەش تێك بدات و بەستەڵەکەکانیش بتوێنێتەوە، وەك ئەمریکا و زلهێزەکان دەیکەن، نایهێڵن کارگەکانی چەکیان لەکار بکەون، بۆ ئەوەی کە ڕۆژ بە ڕۆژ سەروەت و سامانیان و ئابووریيان هەڵکشێ، با ئەوە بە زیانی هەموو بەشەریەتیش تەواو ببێ، ئەوە وەك گوتم هەمان شتە کە لە فیرعەون و قاروون و نەمرود و خۆلەخەڵکی بکەرە پەروەردگارەکان بە درێژایی مێژوو دووبارەیان کردووەتەوە، ئنجا سەرەنجامیشی هیچ نیە، تۆ تەماشا بکە چییان لێهات، هەر لەم ماوە مێژووە نزیکەی خۆماندا چەند کەسمان بینی سەرنگوون بوون، ئنجا وەك گوتراوە: "السعيد من اتعظ بغيره"، بەختەوەر کەسێکە پەند لە غەیری خۆی وەربگرێ، بەڕاستی بۆ وڵات و قەوارەکەی خۆمان زۆر بە پەرۆشم، خوا ئاگادارە، هەرچی ڕق و بوغزە لەدڵمدا نیە بەرامبەر بە هیچ کەس، کەلێرەدا مەبەستم حوکمڕانەکانی هەرێمە، بەڵام وەڵڵا ڕقم لە کردەوەی خراپە، وەك لووط (عليه الصلاة السلام) بەگەلەکەی خۆی گوت:

﴿قَالَ إِنِّي لِعَمَلِكُم مِّنَ ٱلْقَالِينَ ١٦٨﴾ [الشعراء : ١٦٨]

واتە: من ڕقم لە کردەوەکەتانە، لەخۆتان نا وەك بەشەر، وەك بەشەر خوا ڕێزی لێگرتوون، بەندەی خوان، مرۆڤن، خوا دایناون لەسەر زەوی تاکو تاقیتان بکاتەوە، من ڕقم لە بابایەکی کافریش هەڵناستێ وەك مرۆڤ، بەڵام ڕقم لە کوفرەکەی و ڕقم لە زوڵمەکەی و ڕقم لە خراپەکەی هەڵدەستێ، خوا لە قورئاندا ئیسلام ڕێگای داوە خەڵك بێ بڕوابێ، (..فمن شاء فليؤمن ومن شاء فليكفر..) الكهف-٢٩-، بەڵام ڕێی نەداوە خەڵك زاڵم بێ، چونکە بە کوفر وئیمانەوە

خەڵك پێکەوە دەژین، بەڵام بە زاڵم و مەزڵوومی پێکەوە ناژین و، هاوسەنگیی کۆمەڵایەتیی تێکدەچێ.

**دانا: لەم ئاڵقەیەدا لە کۆتاییەکەیداین، با من بە بۆچوونێکی کە باوە و ئەوترێت، ڕای تۆ لەسەر ئەو بۆچوونە بزانم، ئەوەی کە ئەوترێت و پەندێکی کوردیشمان هەیە ئەڵێ: تا خوا کێو نەبینێ بەفری تێ ناکات، ئەم میللەتە ئەم خەڵکەی ئێمەش ئەم جۆرە دەسەڵات و حوکمڕانییەی پڕ بە پێستیەتی، بۆیە خوای گەورە ئەمەی بە نسیب کردوە، بۆچوونی تۆ لەسەر ئەم قسەیە؟**

**مامۆستا:** ئەوە حەقی تێدایە، بەڵام هەمووی حەق نیە، چونکە جاری وا هەیە کەسێك، حیزبێك، چینێك، خۆی بەسەر خەڵکێکدا دەسەپێنێ و بە زوڵم دەیانچەوسێنێتەوە، بێبەشیان دەکات و، غەدریان لێ دەکات، ئەدی خوای پەروەردگار بۆچی دەفەرموێ:

﴿فَقُطِعَ دَابِرُ ٱلۡقَوۡمِ ٱلَّذِينَ ظَلَمُواْۚ وَٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ٤٥﴾ [الأنعام : ٤٥]

کۆمەڵی ستەمکاران دوابڕاو بوون و ستایش بۆ خوای پەروەردگاری جیهانەکان، ئنجا خوا سبحانه وتعالى، زۆر زەمی فیرعەون و هامان و قاروون دەکات، زەمی ئەو چینە سیاسییە دەکات کە دەسەڵات و سەروەت و سامان و ڕاگەیاندنیان بۆ خۆیان قۆرخ کردوە، زەمیان دەکات:

﴿إِنَّ فِرۡعَوۡنَ وَهَٰمَٰنَ وَجُنُودَهُمَا كَانُواْ خَٰطِـِٔينَ ٨﴾ [القصص: ٨]

لەولاشەوە: دیفاع دەکات لە بەنی ئیسرائیلی چەوسێنراوە و، خەڵکی میسری بە کۆیلەکراوی چەوسێنراوە، کەواتە قسەکە لایەنە ناحەقەکەی ئەوەیە کەکۆمەڵگایەکە بەزاڵم و مەزڵوومەوە هەموویان یەك حیسابیان بۆ بکرێ، نا، لە قورئاندا یەك حیساب نەکراوەو نەفرینی خوا تایبەت کراوە بەستەمکارانەوە: ﴿أَلَا لَعۡنَةُ ٱللَّهِ عَلَى ٱلظَّٰلِمِينَ ١٨﴾ [هود: ١٨]، نەیفەرمووە: (ألا لعنة الله على المظلومين)، ﴿أَلَا لَعۡنَةُ ٱللَّهِ عَلَى ٱلظَّٰلِمِينَ ١٨﴾ [هود: ١٨]، ئاگاداربن! نەفرینی خوا لەستەمکاران، واتە: ئەوەی ستەم دەکات، بەڵام ئەوەندە حەقەی

تێدایە كە خەڵك نابێ لە بن باری زوڵمدا بمێنێتەوە و دەبێ هەڵوێستی هەبێت: (كلكم راع وكلكم مسئول عن رعيته) رواه مسلم، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێ: هەركامێك لە ئێوە چاودێرە و بەرپرسیاریشە بەرامبەر بە كۆمەڵگایەكەی، ئەبوبەكری صدیق (خودا لێ رازی بێ) رۆژێك وتاری دا - وەك ئەبوداود و تیرمزیی و نەسائیی و ئیبنو ماجە ـ هەموویان هێناویانە، وتاری دا: خەڵكینە! ئێوە ئایەتێك دەخوێننەوە، بەڵام بە هەڵە لێی تێ دەگەن:

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ عَلَيۡكُمۡ أَنفُسَكُمۡۖ لَا يَضُرُّكُم مَّن ضَلَّ إِذَا ٱهۡتَدَيۡتُمۡۚ ﴾

[المائدة: ١٠٥]

واتە: ئەی خەڵكینە! وریای خۆتان بن، ئەگەر ئێوە رێی راستگرتووبن، ئەوانەی گومڕان زیانتان لێ نادەن، واتە: ئێوە وای لێ تێدەگەن كە ئەگەر ئێوە موسوڵمان بن و چاكەكار بن، خەڵك زوڵم و خراپەش بكات، زیانی بۆ ئێوە نیە، گوتی: بەڵام من گوێم لە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) بووە فەرموویەتی: (لتأمرون بالمعروف ولتنهون عن المنكر، أو ليوشكن الله أن يعمكم بعقاب منه، ثم تدعونه فلا يستجيب لكم) واتە: دەبێ فەرمان بە چاكە بكەن و رێ لە خراپە بگرن، ئەگەرنا خوا بەڵایەكتان بۆ دەنێرێ بە گشتی، دوایی هەرچەند لێی دەپارێنەوە، وەڵامتان ناداتەوە، ئێوە پێشتر وەڵامی خواتان نەداوەتەوە، كە فەرمانەكانی جێبەجێ نەكەن، قەدرتان هێندە لەلای خوا نیە كە خوا وەڵامتان بداتەوە.

كەواتە: قسەكە بەشە حەقەكەی ئەوەی دوایەتی و، ئەو بەشە ناحەقەكەی ئەو قسەیەش ئەوەیە كە هەر چینێكی سیاسی، هەر حیزبێك لە سوریا، لە یەمەن، لە كوێ، لە كوێ، خۆی بەسەر میللەتێكدا فەرز كرد، بگوترێ: دیارە خەڵكەكە خراپن، نا، هەر خەڵكی میصر بوون شۆڕشیان كرد دژی حوسنی موبارەك، بەڵام دوایی كە سیسی بە دەستلەپشتدانی زلهێزەكان و حكوومەتە ناوچەییەكان، كە ئەوانیش دیفاعیان لە كورسییەكەی خۆیان دەكرد، كودەتا دەكا،

بەسەر ڕەوایەتی خەڵك دا، دەبێ بڵێی خەڵکی میصر شایستەیەتی؟ نەخێر، بەڵام بە تەئکید خەڵك دەبێ لە بەرامبەر زوڵم و خراپەدا هەڵوێستی هەبێ.

**دانا: بەڕێز مامۆستا عەلی باپیر! زۆر سوپاس کە لە ئاڵقەی دووەمی بەدانایی دا ئامادە بووی، پشت بەخوا لە ئاڵقەی داهاتوودا باس لە یەکتاپەرستیی دەکەین، باس لەوە دەکەین کە بۆچی دائیمەن حوکمڕانە خۆسەپێنەکان، قەڵسن بە یەکتاپەرستیی، زۆر سوپاس بۆ ئامادەبوونت دووبارە.**

**مامۆستا:** سوپاس بۆ جەنابیشت.

# ئاڵقەی سێیەم

بنەمای سێیەم: خوا هەموو پێغەمبەرانی بۆ چەسپاندنی دادگەریی ناردوە، تاکو ڕێ لەستەم و چەوساندنەوە بگیرێ.

دانا: بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان، سڵاوتان لێ بێت بینەرانی ئازیز و خۆشەویست، خۆم بەخۆشحاڵ دەزانم خوای پەروەردگار دەرفەتی پێ بەخشین کە جارێکی تر لە ئاڵقەیەکی نوێی بەرنامەی بەدانایی لە خزمەت مامۆستا عەلی باپیر نووسەر و رۆشنبیر و رووناکبیر دا پێکبگەینەوە، بێگومان لە دوو ئاڵقەی ڕابردوودا باسمان لە گرنگیی قورئان کرد، هەروەها لەو بیست و پێنج بنەمایەی کە جەنابی مامۆستا بۆ چاککردنی بارودۆخی هەرێمی کوردستان نووسیونی، دوو بنەمامان باسکردن، بووناسیی و خوابەیەکگرتن، بەڵام خوا بەیەکگرتنمان تەواونەکرد، بۆیە لەم ئاڵقەیەدا ئەو بابەتەش کۆتایی پێ دێنین.

مامۆستا گیان! دووبارە سوپاس، کە دەرفەتت پێ بەخشین، وەك لە پێشەکییەکەدا ئاماژەم پێ کرد، لە دوو ئاڵقەی ڕابردوودا لەسەر ئەو زنجیرە بنەمایەی کە جەنابت نووسیویەتە ئێمە دوو بابەتمان کۆتایی پێ هێنان، هەم بووناسی ئیسلامی و هەم خوا بەیەکگرتن، بەڵام لەسەر خوابەیەکگرتن یەك دوو پرسیاری گرنگ ماوە بەپێویستی ئەزانم لەبەرئەوەی جەنابت لە نووسینەکاندا ئاماژەت پێ کردووە روون بکەینەوە، دوایی بێینە سەر بنەمای سێهەم، کە دادگەرییە.

جەنابی مامۆستا قورئان زۆر باسی یەکتاپەرستی ئەکات، بۆچی حوکمڕانە خۆسەپێنەکان قەڵسن بە وشەی یەکتاپەرستی، یەك خواناسی، یەك خوا بە مەعبوود زانین، بۆ؟

**مامۆستا:** بسم الله الرحمن الرحيم، الحمد لله ، وصلى الله تعالى وسلم وبارك على رسول الله، محمد وآله المهتدين بهداه.

کاك دانا ئەم بوون و گەردوونە تەنیا خوا سبحانه وتعالى بەدیهێنەر و پەروەردگار و خاوەن و مشورخۆریەتی، ئنجا بینا لەسەر ئەو راستییە کە گەورەترین ڕاستییە لە وجوددا یانی: ئەوە خوا سبحانه وتعالى تاکە بەدیهێنەر و پەروەردگار و خاوەن و هەمەکارەی بوونەوەرە:

﴿ ٱللَّهُ خَٰلِقُ كُلِّ شَيۡءٖۖ وَهُوَ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ وَكِيلٞ ﴾ (الزمر: ٦٢)

﴿ قُلْ مَن رَّبُّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ قُلِ ٱللَّهُ ﴾ [الرعد: ١٦]

﴿ لِّمَنِ ٱلْمُلْكُ ٱلْيَوْمَ لِلَّهِ ٱلْوَٰحِدِ ٱلْقَهَّارِ ﴿١٦﴾ ﴾ [غافر : ١٦]

﴿ قُلِ ٱللَّهُمَّ مَٰلِكَ ٱلْمُلْكِ ﴾ [آل عمران: ٢٦]

له چەندان ئایەتدا خوای پەروەردگار ئەو حەقیقەتەی ڕوونكردووەتەوە، بەڵێ بینا لەسەر ئەوە كە تەنیا خوا شتەكانی وەدیهێناوە و دروستیكردوون و تەنیا خوا مشوورخۆری كائیناتە و بەڕێوەیان دەبات و سەرپەرشتییان دەكات، دەیانژێنێ، دەیانمرێنێ، دەبێ تەنیا خواش بەندایەتیی بۆ بكرێ و، تەنیا خوا بپەرسترێ، پەرستنیش وەك زانایان دەڵێن: بریتیە لە ئەوپەڕی ملكەچیی لەگەڵ ئەوپەڕی خۆشویستن و، ئەوپەڕی بە گەورەگرتن و، ئەوپەڕی سام و هەیبەت و ئەوپەڕی پشت پێبەستن، تەنیا بۆ خوا سبحانه وتعالی، ئنجا ئایا بۆچی حوكمڕانە خۆسەپێنەكان قەڵسن بە بانگی زوڵاڵی خوا بەیەكگرتن، چونكە ئەوەی زەمینەخۆش دەكات بۆ زوڵم و ستەم، بریتیە لە شیرك و، ئەوەی ڕێدەگرێ لە چەوساندنەوەی مرۆڤەكان، هەندێكیان بەدەستی هەندێكیان، بریتیە لە خوا بەیەكگرتن (توحید) تەنیا خواپەرستن، هەربۆیە ئەگەر تۆ تەماشای هەموو پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) بكەی، كێبوون دوژمنی سەرسەختی پێغەمبەران؟ خۆبەزلگرەكان بوون، خۆشگوزەرانەكان بوون، ئەوانەی كە خۆیان بە پەروەدگار و پەرستراو زانیوە، فیرعەون دەڵێ:

﴿ أَنَا۠ رَبُّكُمُ ٱلْأَعْلَىٰ ﴿٢٤﴾ ﴾ [النازعات: ٢٤]

هەروەها فیرعەون دەڵێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلْمَلَأُ مَا عَلِمْتُ لَكُم مِّنْ إِلَٰهٍ غَيْرِى ﴾ [القصص: ٣٨]

واتە: ئەی دەستڕۆیشتووان، بڕیاربەدەستانی مەجلیس، ئەی دیوەخاننشینان! بێجگە لە خۆم كەسی دیكەم پێ شك نایەت پەرستراوی ئێوە بێ! یان دەڵێ:

﴿ قَالَ لَئِنِ ٱتَّخَذْتَ إِلَٰهًا غَيْرِى لَأَجْعَلَنَّكَ مِنَ ٱلْمَسْجُونِينَ ﴿٢٩﴾ ﴾ [الشعراء : ٢٩]

بە مووسا دەڵێ: ئەگەر جگە لە من پەرستراوێکی دیکە بگری، کەسێکی دیکە، شتێکی دیکە بپەرستی، دەتخەمە بەندیخانەوە و، ڕەگەڵ گیراوانت دەخەم، بۆچی؟ چونکە ئەگەر تەنیا خوا بپەرسترێ، واتە: دەبێ تەنیا ملکەچیی بۆ خوا بکرێ و، تەنیا خوا ئەوپەڕی خۆشویستن و لێ ترسان و بەگەورەگرتنی بۆ بڕیار بدرێ، ئەمەش ئەوە دەخوازێ کە دەبێ بەرنامەی خوا پەیڕەویی لێ بکرێ، ئنجا بەرنامەی خواش، چونکە لە خواوەیە بۆ هەموو بەندەکانی، هیچ فەرق و جیاییی تێدا نیە، تۆ تەماشا بکە! هەرکاتێ بەشەر بەرنامە دابنێ، ئەگەر دەوڵەمەند دایبنێ، بە زیانی هەژارە، چینی بۆرژواز دایبنێ بە زیانی چینی پڕۆلیتارە، ئەگەر چینی پڕۆلیتار دایبنێ، بە زیانی چینی بۆرژوایە، ئەگەر هەر نەتەوەیەك دایبنێ بە زیانی نەتەوەکانی دیکەیە، عەرەب دایبنێ بە زیانی غەیری عەرەبە، تورك دایبنێ بە زیانی کوردە...هتد دیسان ئەگەر پیاو بەرنامە دابنێ، بە زیانی ڕەگەزەکەی بەرامبەریەتی کە ئافرەتە، ئافرەت دایبنێ، بە زیانی رەگەزەکەی بەرامبەریەتی کە پیاوە، هەروەها، سپی پێست دایبنێ، ڕەشپێست دەچەوسێنێتەوە، ڕەشپێست دایبینێ، سپیپێست زیانبار دەبێ، بەڵام ئەگەر خوا سبحانە وتعالی بەرنامە دابنێ، چونکە خوا سبحانە و تعالی بەدیهێنەری هەموانە، خاوەنی هەموانە، بە ڕەش و سپییەوە، بە نێر و مێ وە، بە هەموو ڕەنگەکانەوە، بە هەموو زمانەکانەوە، واتە خوا لایەنگریی (انحیاز)ی نیە لەسەر حیسابی کەس بۆ هیچ کەس.

هەڵبەتە بۆیەش فیرعەون و تاغووت و خۆبەخوا زان و خۆبە پەروەردگار زانەکان دوژمنی سەرسەختی پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام)بوون، چونکە ئەگەر بانگەواز و پەیامی پێغەمبەران بچەسپێ، کە دەڵێن دەبێ تەنیا خوا بپەرسترێ و بەندایەتیی بۆ بکرێ، واتە: نابێ هیچ کەس چاوی لەوە بێ و کەڵکەڵەی کوێخایەتی و خۆفەرزکردنی لە کەللەدا هەبێ، بەرامبەر بە مرۆڤەکان، بۆیە ئەوان دژی پەیامی خوا بەیەکگرانەی پێغەمبەران بوون، دیسان هەر بۆیەش شوێنکەوتووی پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام)؟ بەزۆریی چەوساوەکان، (مستضعفین)بوون، چونکە ئەوانە ئازادیی خۆیان و مافەکانی خۆیان لەلای

پێغەمبەران بینیوەتەوە، ئەدى كێ دژى پێغەمبەران بوون؟ بەزۆریى دوو چین:

١- خۆبەزلگران (المستكبرین).

٢- خۆشگوزەرانان (المترفین)

چونكە خۆبەزلگران ترساون كە دەستەڵاتە سیاسییە قۆرخكراوەكەیان لێ تێكبچێ، خۆشگوزەرانانیش ترساون لەوەی كە ئەو بەزم و بازاڕەی ئابووریی و قۆرخكاریی و گەندەڵییەیان لێ تێكبچێ، بەڵام چەوساوە و مافخوراو و ماف پێشێلكراوەكان، تەماشایان كردوە ئەگەر ئەوەی پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) دەیڵێن بچەسپێ، ئەوان ئازاد و رزگار دەبن و لەگەڵ خەڵكەكەی دیكە دا یەكسان دەبن.

**دانـــا: كەواتە كاتێك حوكمڕانەكان كەڵكەڵەی كوێخایەتیی ئەچێتە كەللەیانەوە سەرئەنجام چی رووئەدات، ئەو میللەتەی كە ژێردەسیی ئەو حوكمڕانانەیە؟**

**مامۆستا:** هەركاتێك لەنێو هەر كۆمەڵگایەكدا سەردەست و بندەست هەبوون، چەوسێنەرو چەوسێنراوە هەبوون، دیارە شیرازەی كۆمەڵگا تێكدەچێ، خوا سبحانە وتعالى ئەو ڕاستییەی لە چەندان ئایەت دا خستووەتە ڕوو كە هەركاتێك زوڵم هەبوو، كۆمەڵگا تێكدەچێ، نەیفەرمووە ئەگەر كوفر هەبوو، بۆ نموونە:

١- ﴿ وَمَا كُنَّا مُهۡلِكِي ٱلۡقُرَىٰٓ إِلَّا وَأَهۡلُهَا ظَٰلِمُونَ ۝٥٩ ﴾ [القصص: ٥٩]

٢- ﴿ وَكَمۡ قَصَمۡنَا مِن قَرۡيَةٖ كَانَتۡ ظَالِمَةٗ ﴾ [الأنبياء : ١١]

واتە: زۆر ئاوەدانیی و كۆمەڵگامان لەنێوبردوون كە خەڵكەكەیان ستەمكاربووە. بەڵێ بەبە زوڵم هاوسەنگیی كۆمەڵگا تێكدەچێ، شیرازەی كۆمەڵگا تێكدەچێ، بەڵام بە كوفر و ئیمان، خەڵك پێكەوە دەژین، پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) هاتوون خوابەیەكگرتن (توحید الله) بچەسپێنن، بەڵام نەهاتوون خوابەیەكگرتن بسەپێنن، واتە بەزۆر بەسەر خەڵكیدا بسەپێنن، چونكە: (لا اكراه في الدین) البقرة --، بەڵام هاتوون بانگەشەی بۆ بكەن، خەڵكی بۆ بانگ بكەن، خەڵكی

لێ تێبگەیەنن، لەڕێی قەناعەت پێهێنانی خەڵك و، هۆشیاركردنەوەی عەقڵیان و بێداركردنەوەی دڵ و دەروونیانەوە، ویستوویانە پەیامی خواپەرستیی و خوابەیەكگرتن بچەسپێنن، لەبەرئەوەی بەدیلی خوابەیەكگرتن بریتیە لە شیرك و، یەكێك لە دەرهاویشتەكانی شیركیش بریتیە لە زوڵم، چونكە: لە ئەنجامی ئەوەدا كە بابای حوكمڕان دەڵێ: منیش هاوتای خوام، منیش دەبێ بە پیرۆز بگیرێم، بە گەورە بزانرێم، من جیام لە خەڵكی دی! هەمیشە ئەو خۆ لەخەڵك پێ زیاد بوون و خۆبەسەرخەڵكدا فەرزكردنە، ڕیشەیەكی شیركیی هەیە، بەڵام خوابەیەكگرتن وا لە خەڵك دەكات یەكسان بن، ئنجا لە ئەنجامی ئەوەدا كە خوابەیەكگرتن لە كۆمەڵگایەكدا لادەچێ، مانای وایە شیرك دێتە جێگای كە یەكێك لە دەرهاویشتە و شوێنەوارە شوومەكانی شیرك، بریتیە لە زوڵم و چینایەتیی و قڕیی و پڕیی و بەرزیی و نزمیی.

**دانـــا: ئەگەر بگەڕێینەوە بۆ سەرەتای ئەو تایتڵەی جەنابت بۆ بابەتەكەت ئاماژەت پێكردوە، بۆ چاككردنی ئەم دۆخەی هەرێم، با گوێ لە قورئان بگرین، چۆن ئەمە ببەستینەوە بە ئێستای هەرێمی كوردستانەوە؟ یانی ئەگەر ئێستا بابایەكی سیاسی گوێی لەم بەرنامەیەی ئێمە بێ، بینەری بێ، ئەڵێ: خوابەیەكگرتن چ پەیوەندییەكی بەم لێكترازانە كۆمەڵایەتیی و سیاسییەوە هەیە كە لە كوردستاندا ڕوویداوە؟**

**مامۆستا:** من مەبەستم ئەوەیە و هەر لە كۆی زنجیرە بنەمایەكەش كە بیست و پێنج بنەمایە، مەبەستم ئەوەیە كە ئێمە میللەتێكی مسوڵمانین، كاتێك كە ڕووبەڕووی قەیرانێكی سیاسیی دەبینەوە، قەیرانی ئابو یان وریی، كۆمەڵایەتیی، یان قەیرانی ڕووحیی، یانقەیرانی ئەخلاقیی، پێویستە چاو بەخۆماندا بگێڕینەوە: چۆن خۆمانی لێ دەرباز بكەین، ئێمە میللەتێكین ناسنامەیەكمان هەیە، بە دان پێداهێنانی چینە سیاسییەكەش هەمووی هەر دەڵێ ئێمە گەلێكی موسوڵمانین، باشە خۆ موسوڵمانەتیی ناوی بێ نێوەرۆك، مسوڵمانەتیی نێوەڕۆكێكی هەیە، مسوڵمانەتیی بەرلەهەر شتێك بریتیە لە پابەندیی بە قورئانەوە و تێگەیشتن لە قورئان و، گەڕانەوە بۆ قورئان، خوای پەروەردگار دەفەرموێ:

﴿ وَمَا ٱخۡتَلَفۡتُمۡ فِيهِ مِن شَيۡءٖ فَحُكۡمُهُۥٓ إِلَى ٱللَّهِۚ ذَٰلِكُمُ ٱللَّهُ رَبِّي عَلَيۡهِ تَوَكَّلۡتُ وَإِلَيۡهِ أُنِيبُ ١٠ ﴾ [الشورى: ١٠]

واته: له هەر شتێكدا تێیدا كەوتنه ڕاجیایی، بڕیارەكەی بۆ لای خوایه، تەنیا پشت بەو دەبەستم و بۆ لای وی دەگەڕێمەوە.

واته: موسوڵمانەتیی ئێمە خوازیاری ئەوەیە كە ئێمە بگەڕێینەوە بۆ چاوگ و ئەصڵی موسڵمانەتییەكەمان كە بریتییە له قورئان و سوننەت بۆیە من گوتوومە: (بۆ چارەسەری ئەم دۆخەی هەرێم با گوێ له قورئان بگرین) واته: بابزانین قورئان چیمان پێ دەڵێ؟ ئەوەش بە تەئكید هەم لایەنە سیاسییەكان، هەم كۆمەڵگای مەدەنیی و، ڕێكخراوە مەدەنییەكان، هەروەها كەسایەتییەكان و، هەموو ئەو دڵسۆزانەی كە لەنێو كۆمەڵگادا هەن، پێویستە بیر لەوە بكەینەوە كە ئێمە مادام میللەتێكی موسوڵمانین موسڵمانەتییەكەشمان، پابەندیمانە بە قورئان و سوننەتەوە، بۆیە با بگەڕێینەوە لای قورئان داخۆ چی دەفەرموێ؟ هەڵبەتە من باسی سوننەتم نەكردوە، بەڵام پێموایە سوننەتی پێغەمبەر (علیهم الصلاة والسلام) كاكڵەكەی و جەوهەرەكەی بریتیە له قورئان، پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) كە هاتوە تەنیا قورئانی پێبووە، سوننەتی پێغەمبەریش (علیه الصلاة والسلام) واته تەتبیق و بەرجەستەكردنی قورئان لەسەر ئەرزی واقیع، یانی: ئێمە بەهۆی پێغەمبەری خوا (علیه الصلاة والسلام) و بەهۆی سوننەت و سیرەی پێغەمبەری خواوە، دەزانین قورئان چۆن پیادە دەكرێ له هەموو ڕەهەندەكانی ژیاندا.

ئنجا ئایا ئەمە چۆن دەبێ؟ جارێ پێشێ دەبێ خەڵك ئیستیعابی ئەو ڕاستییەقورئانییە بكات و تێیان بگات و له عەقڵ و دڵ دا بدرەوشێنەوە، پاشان دەبێ لەلایەن دەستەڵاتی سیاسییەوە لەلایەن پەرلەمان و حكومەت و دامءدەزگا بەرپرسەكانەوە، ئەو حەقیقەت و بنەما قورئانییانە دەرك بكرێن و هەزم بكرێن، كە بێگومان ئەوانە هەموویان بەهای بەرزی مرۆیین، بۆنموونە: ئێستا له هەموو دنیادا تەماشا بكە، هەر دەڵێن مرۆڤەكان دەبێ یەكسان بن، ئەوە

بەهایەکی گشتی مرۆییە کە قورئان هێناویەتی، هەروەها ئەوە کە نابێ کەس کەس بچەوسێنێتەوە و ئەوە کە نابێ کەس لە کەس خۆی بە گەورەتر بزانێ، هەروەها ئەوە کە نابێ هیچ کەس بپەرستریێ و نابێ کەس کۆیلە بێ بۆ ئەوی دیکە، هەموو ئەو بنەمایانە، بەهای بەرزی مرۆیین، مەبەستم ئەوەیە ئەگەر کەسێك موسوڵمانیش نەبێ، ئەو بنەمایانە هەر دەیگرنەوە: کەسێك مەسیحییە، جوولەکەیە، زەردەشتییەکە، کاکەییەکە، یەزیدییەکە، مەجووسییەکە، ئەویش وەك عەقڵی سەلیم و فیترەتی ساغی، خوازیاری ئەوەیە کە ستەم نەبێ، فەرق و جیایی نەبێ، کەس کەس نەپەرستێ، کەس کەس نەچەوسێنێتەوە، قۆرخکاریی نەبێ، هەموو ئەو بنەما قورئانییانە کە من هێناومن، خاڵی گشتیین و بنەمای گشتیین و کۆمەڵگای بەشەریی بەوە چاك دەبێ، کە پێیانەوە پابەندبێ، ئنجا پاش هەزم کرانیانلەلایەن خەڵکەوە و تەبەننیی کرانیان لەلایەن دەستەڵاتدار و حوکمڕاناتەوە، دانانی میکانیزم و شێوازی جێبەجێکردنیان، ئەوە ئیش و دامودەزگا ڕەسمییەکان و ئەو دامەزراوانەیە کە نێو خەڵك و کۆمەڵگادا ڕەوایەتییان پێ دەدرێ، ئەوان دەبێ بێنن تەبەننیی ئەو بەها بەرزانە بکەن و پراکتیزمیان بکەن.

**دانـا: بەڵێ، مامۆستا ئەو بنەمایانەی جەنابت ئاماژەت پێکردوون، بە ڕوون و بە ڕاشکاویی تەنیا ئاڕاستەی جەماوەری هەرێمی کوردستان و خەڵکی هەرێمی کوردستانن؟ یان نەخێر، بۆ چینە سیاسییەکە و سەرکردە و حوکمڕان و دەسەڵاتدارەکانیشن؟**

**مامۆستا:** بۆ هەموو لایەکە، من بەپلەی یەکەم مەبەستم چینە سیاسییەکەیە، کە لەوانەیە لە هەموان کەمتر گوێ بگرن، لەبەرئەوە کە بەداخەوە بەداخەوە دەڵێم زۆرجار ئەو تەبەقە سیاسییە لە ئەنجامی ئەو دەسەڵاتەی دا جۆرێك لە جۆرەکان سەرخۆشیی و بێهۆشیی بۆ دروست دەبێ، هەروەك چۆن بابای دەوڵەمەند، ئەگەر زۆر صالح و بۆخوا صوڵحاو نەبێ و پارەکە و کەسابەتەکەی لە ڕێی حەڵاڵەوە نەبووبێ، بەهۆی سەروەت و سامانەکەیەوە مەغرور دەبێ و، جۆرێك لە لەخۆباییبوون و لە کەوڵی خۆدەرچوونی بۆ دروست دەبێ،، پێیوایە لە خەڵکی دیکە عاقڵترە!!

بەڵام وێڕای چینە سیاسییەکە مەبەستم پێی هەرکەسێکی دیکەشە، هەر تاکێکی کورد، بە درشت و وردەوە، بە نێر و مێ وە، بە خوێندەوار و نەخوێندەوارەوە، بە بەرپرس و بە خەڵکی سادەوە، مەبەستم پێی هەموویەتی، بە زانایانەوە، ئەهلی مینبەر و میحراب، بە هەموو چین و توێژەکان، هەموو ئەوانەی کە خۆیان بە موسوڵمان دەزانن، چونکە ئایا خۆ بە موسڵمان زانین لە چیدا بەرجەستە دەبێت و ئیسپاتەکەی چییە؟ بریتیە لە تێگەیشتن لە قورئان و پابەندیی بە قورئانەوە، موسوڵمانەتیی ئەگەر پایەندیی بە قورئانەوەی لێدەربێنین، دەبێتەوە بەناوێکی بێ نێوەڕۆك، کەواتە هەرکەسێك خۆی بە موسوڵمان دەزانێ، حوکمڕانە، سیاسییە، ئەهلی فیکرە، ئیعلامییە، جووتیارێکە، کرێکارێکە، گەنجێکە، نێرە، مێیە، دەوڵەمەندە، هەژارە، من مەبەستم پێی هەموویەتی.

**دانا: زۆر باشە، با بێینە سەر ئەصڵی بەرنامەکەی ئەمڕۆمان، ئەڵقەی سێهەممان کە بنەمای سێهەمە کە جەنابت ئاماژەت پێکردوە (دادگەریی)یە، من لە جەنابت ئەپرسم: دادگەریی چی ئەهێنێتە بەرهەم و ڕێ لە چی ئەگرێت؟**

**مامۆستا:** جارێ دەربارەی دادگەریی پێشێ دەبێ ئەو ڕاستییە بزانین کە خوا سبحانە وتعالی وەك چۆن خوابەیەکگرتن (توحید) و تەنها خواپەرستی کردوە بە ئامانجی نێررانی هەموو پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام)، وەك لە ئایەتی ژمارە (٢٥)ی (الأنبیاء)دا دەفەرموێ:

﴿ وَمَآ أَرۡسَلۡنَا مِن قَبۡلِكَ مِن رَّسُولٍ إِلَّا نُوحِيٓ إِلَيۡهِ أَنَّهُۥ لَآ إِلَٰهَ إِلَّآ أَنَا۠ فَٱعۡبُدُونِ ٢٥ ﴾ [الأنبیاء: ٢٥]

واتە: لەپێش تۆدا هیچ پێغەمبەرێکمان ڕەوان نەکردوە، مەگەر پێمان ڕاگەیاندوە کە جگە لە من هیچ پەرستراوێك نیە، تەنیا بەندایەتیی بۆ من بکەن، بەڵێ وەك چۆن خوا بەیەکگرتن (توحید) ئامانجی نێردرانی هەموو پێغەمبەرانە (علیهم الصلاة والسلام)، وەك پەیوەندیی مرۆڤەکان لەگەڵ خوادا، کە دەبێ لە تەوحیددا بەرجەستە ببێ و، مرۆڤەکان تەنیا خوا بپەرستن، لەولاشەوە دادگەرییش ئەو بەها بەرزەیە و، ئەو ئامانجە گەورەیەیە کە خوا هەموو پێغەمبەرانی بۆچەسپاندنی

ناردوه تاكو له نێوان بەندەكان و بەندەكان خۆیاندا بەدادگەرانە ڕەفتار بكەن، وەك له ئایەتی ژمارە (٢٥)ی سورەتی (الحدید)دا دەفەرمویٚ:

﴿ لَقَدْ أَرْسَلْنَا رُسُلَنَا بِٱلْبَيِّنَٰتِ وَأَنزَلْنَا مَعَهُمُ ٱلْكِتَٰبَ وَٱلْمِيزَانَ لِيَقُومَ ٱلنَّاسُ بِٱلْقِسْطِ ﴾ [الحدید: ٢٥]

واتە: هەموو پێغەمبەرانمان (علیهم الصلاة والسلام)، بە بەڵگە ڕوون و ئاشكرایەكانەوە ناردوون (هیچ پێغەمبەرێك نەبووە، كە موعجیزە و بەڵگەیەكی پیٚ نەبیٚ دەستەوسانكەر بۆ تەرەفی بەرامبەری و ئیسپاتكەر بۆ دەعوای پێغەمبەرایەتیی خۆی، موعجیزە یانی دەستەوسانكەر، كە بەرامبەرەكە دەستەوسان بكات و نەتوانیٚ وەك ئەو بێنیٚ، وەك پێغەمبەری خوا (علیه الصلاة والسلام) له فەرموودەیەكدا كە بوخاریی و موسلیم هێناویانە دەفەرمویٚ: (ما من الأنبیاء من بني إلا وأوتي من الآیات ما علی مثله آمن البشر) واتە: هیچ كەس له پێغەمبەران نەبووە، مەگەر خوا ئەوەندە موعجیزە و بەڵگەی پێداوە كە بەپێی ئەوە خەڵك بڕوای پیٚ بێنیٚ، كە پێغەمبەری خوایە و ڕاست دەكات) ئنجا خوا دەفەرمویٚ: پێغەمبەرانمان بە بەڵگە ئاشكرایەكانەوە ناردوون و، كتێب و تەرازووشمان پێدا ناردوون، بۆچی؟ (لِيَقُومَ ٱلنَّاسُ بِٱلْقِسْطِ) تاكو خەڵك بە دادگەرانە بەڕێوە بچن.

ئنجا بۆ زانیاریی جەنابیشت و بینەران و بیسەرانی بەڕێزیش: وشەی (قسط) و (عدل) هەردووكیان بە مانای دادگەریین، بەڵام (عدل) زیاتر له ڕووی مەعنەوییەوە دەیگرێتەوە و، (قسط) زیاتر له ڕووی ئابووریی و مادییەوە، مانای دادگەریی دەگرێتەوە، لێرەش كە خوا دەفەرمویٚ: (لِيَقُومَ ٱلنَّاسُ بِٱلْقِسْطِ) یانی: تاكو خەڵك له ڕووی ژیانی ئابووریی و گوزەرانەوە بە دادگەریی بەڕێوە بچن.

بەڵیٚ هەموو پێغەمبەران بۆ ئەوە هاتوون دادگەریی بچەسپێنن، ئنجا جەنابت گوتت: ئەگەر دادگەریی هەبیٚ، چی دەبیٚ و، ئەگەر نەبیٚ چی دەقەومیٚ؟ دەڵێین: ئەگەر دادگەریی هەبیٚ، كۆمەڵگا هاوسەنگیی تێدا دەپارێزریٚ و، كۆمەڵگا دەتوانیٚ ژیانی خۆی ئیدامە پیٚ بدات، ئەگەر كۆمەڵگایەكی كافریش بیٚ.

بەڵام ئەگەر دادگەریی نەبێ، با كۆمەڵگایەكی موسوڵمانیش بێ (كە دیارە ئەوانە لە موسوڵمانەتییەكەی خۆیان حاڵی نەبوون، ئەگەرنا دەبوو پێش هەموو شتێك كۆمەڵگاكانی موسوڵمانان دادگەریی بچەسپێنن) بێگومان سەری بە فەتارەت دەچێ، ئەوەش دەقی ئایەتی لەسەرە، خوای پەروەردگار دەفەرموێ:

﴿ وَمَا كُنَّا مُهْلِكِي الْقُرَىٰ إِلَّا وَأَهْلُهَا ظَالِمُونَ ﴿٥٩﴾ ﴾ [القصص: ٥٩]

واتە: ئێمە لەبەین بەری ئاوەدانییەكان نین، مەگەر خەڵكەكەیان ستەمكاربێ.

[(قری) كۆی (قریە)یە، (قریة) لە قورئاندا بە مانا باوەكەی ئێستای نیە، بە مانای گوند و لادێ، بەڵكو (قریە) یانی شاری گەورە، وڵات] خوا نەیفەرمووە: ئەگەر كافر بن دەیانفەوتێنین، فەرموویەتی ئەگەر ستەمكار بن دەیانفەوتێنین.

لە سوورەتی (الأنبیاءیش )دا دەفەرموێ: ﴿ وَكَمْ قَصَمْنَا مِن قَرْيَةٍ كَانَتْ ظَالِمَةً وَأَنشَأْنَا بَعْدَهَا قَوْمًا آخَرِينَ ﴿١١﴾ ﴾ [الأنبیاء : ١١]

واتە: زۆر كۆمەڵگامان فەوتاندن كە خەڵكەكەیان ستەمكار بوون.

ئنجا لە ئەنجامی نەمانی دادگەرییدا، ئاشكرایە هەر شتێك كە لاچوو، پێچەوانەكەی دێت، ئەگەر ڕووناكیی لاچوو، تاریكیی دێ، ئەگەر سەرما لاچوو، گەرما دێ، ئەگەر دادگەریی لاچوو ستەم دێت، بەپێچەوانەشەوە: ستەم ڕیشەكێش بكە، دادگەریی دێتە شوێنی، ئنجا ئەگەر فەرق و جیایی لاچوو، یەكسانیی دەبێت و، ئەگەر یەكسانیی نەما، فەرق و جیایی و قڕیی و پڕیی و بەرزیی و نزمیی و چینایەتیی پەیدا دەبێ، لە ئەنجامی ئەوەشدا كۆمەڵگاكان زەمینەی سەر بە فەتارەت چوونی خۆیان خۆش دەكەن. هەڵبەتە كەس مافی ڤیتۆی نیە لە بەرامبەر یاساكانی خوادا، كە خوا دەفەرموێ: ئێمە ئاوەدانییەكان نافەوتێنین ئەگەر خەڵكەكەیان ستەمكار نەبێ، ئائەوە یاسا (سنة) یە و هەڵاواردنی تێدانیە و، هیچ كەس مافی ڤیتۆی نیە، بڵێ: لەبەرئەوەی كۆمەڵگایەكی موسوڵمانم با زوڵمیش بكەین، با حوكمەكەش میراتیی بێ، با حوكمەكەش خۆفەڕزكردن و ئۆتۆكراسیی و تاكگەرایی بێ، چونكە ئێمە

موسوڵمانین، بەخشراو(معفوّ)ین! نەخێر، هەركات زوڵم هەبوو، دەرهاوێشتە شوومەكانییشی دەبن.

ئنجا یەكێك لەجۆرەكانی زوڵم ئەوەیە كە ڕەوایەتیی دەسەڵات دەبێ لە لایەن خەڵكەوە بدرێت، دەسەڵات لە ئەصڵدا هی خەڵكە و خەڵك دەبێ ڕەوایەتیی و حوكمڕانێتیی بە یەكێك یان بە چەند كەسێك لە خۆیان بسپێرن، بەڵام وەختێك كەسێك دێ، ئەو مافە لە خەڵك زەوت دەكات و، دەڵێ: من ڕەوایەتیی لە دەسەڵاتی خۆم وەردەگرم، بەقانوونی سروشتی، هەر لەبەرئەوەی دەسەڵاتم هەیە و دەتوانم زوڵمتان لێ بكەم، حوكمەكەم ڕەوایە!! یان ڕەوایەتیی لە بنەماڵەكەم وەردەگرم، حوكمی میراتیی، یان لە حیزبەكەم وەریدەگرم، وەك كاتی خۆی لە سەردەمی [یەكیەتی سۆڤیەت]دا هەبوو، دیكتاتۆرێتی پڕۆلیتاریا، یان هەر جۆرە فێڵ و چەواشەكارییەكی دیكە لە خەڵك و زەوتكردنی دەسەڵات لە خەڵك، بەڵێ: قۆرخكردنی دەستەڵات یەكێكە لە شێوە زۆر ناهەق و زەقەكانی زوڵم.

جۆرێكیدیكە كە لە بواری ئابووریی دا كە جیاكاری هەبێت لە نێوان خەڵكدا، خوا هەموو نیعمەتەكانی بۆ هەموو خەڵك داناون، بەڵام كەسێك بێ، حیزبێك بێت، بنەماڵەیەك، لایەنێك بێ، ئەو نازو نیعمەتانە بۆ خۆی قۆرخ بكا و، تەخشان و پەخشانیان بكا، لەسەر بناغەی كڕینی ئیرادەی خەڵك، ئەوە زوڵمە و بەوە كۆمەڵگا تێكدەچێ و سەریبەفەتارەت دەچێ.

**دانا: زۆر باشە مامۆستا! ئێستا لەلای هەندێك خەڵك بیركردنەوەیەك هەیە، من حەزدەكەم راوبۆچوونی جەنابت لەسەری وەربگرم، دەوترێت: ئەورووپا و ئەمریكا گوێ لە قورئان ناگرن و كردار بە قورئانیش ناكەن، بەڵام ئەو زوڵم و زۆر و، ئەو نادادگەریی و، ئەو بێسەروبەرییەی لەم هەرێمی كوردستان و لەم لەم ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستەدا، هەیە كە هەموومان خۆمان بە موسوڵمان دەزانین، لەوێ بوونی نیە، من حەزدەكەم رای تۆ لەسەر ئەوە بزانم؟**

**مامۆستا:** بەڵێ، وەڵامەكەی ئەوەیە كە ئەوەی قورئان لەوبارەوە فەرموویەتی، ناموسوڵمانان جێبەجێی دەكەن، بەڵام موسوڵمانان خۆیان جێبەجێی ناكەن، ئنجا

لێرەدا شتێكت بۆ دەگێڕمەوە: كاتێ خۆی شێخ محەمەد عەبدە رەحمەتی خوای لێ بێت كە دوورخراوەتەوە لە میصر، چووە بۆ فەرەنسا، لەوێ لە پاریس بووە، لەگەڵ جەمالەددینی ئەفغانیی رەحمەتی خوایان لێ بێت، گۆڤاری (عروة الوثقى)یان دەركردوە، ماوەی چەند ساڵێك لەوێ دەبێ، دوایی ئەفغانیی دەچێ بۆ توركیا، ینا دەچێت بۆ هیند و، ئەویش دەگەڕێتەوە بۆ میصر، كە دەگەڕێتەوە لێی دەپرسن: چیت بینی لە فەرەنسا؟ دەڵێ: كە چوومە ڕۆژئاوا و ئەورووپا، ئیسلامم بینی بەڵام موسوڵمانم نەبینن، كە گەڕامەوە بۆ میصر موسوڵمانانم دیتن بەڵام ئیسلامم نەدیتن!! ئێمە دەمارگیرییمان نیە بۆ موسوڵمانان و تەنیا دەڵێین: حەقی موتڵەق لە ئیسلامدایە، ئەوەی كە ئێستا لە ڕۆژئاوا هەیە، من بۆخۆم چووم، زۆر لەو وڵاتانە گەڕاوم، ئەوەی كە لەوێ هەیە: زۆر لەو بەها بەرزانەی كە ئیسلام دەیانڵێ، چ لە ڕووی حوكم و سیاسەتەوە، چ لە رووی هەڵسوكەوتی كۆمەڵایەتییەوە، وەك كات بەزایە نەدان و، ڕێزگرتن لە بەشەر و... هتد، كە هەموویان ئەو شتانەن كە قورئان و سوننەت فەرموویانن.

ئنجا لە حەقیقەتدا نابێ هیچ كەس گومانی لەوەدا هەبێ كە ئەوەی ئێستا لە ڕۆژئاوا هەیە، ئیسلام لەو واقیعەدا بێ تەئسیر نیەو بێ تەئسیر نەبووە، ئەوەش ئیعتیراف و دان پێداهێنانی زانا بە ئینصافەكانیانە، بۆ نموونە: [كارل برۆكلمان] لە كتێبی (تأريخ الشعوب الإسلامية)دا، زۆریان ئیعتیراف بەوە دەكەن و، دان بەوەدا دێنن كە كاتێك موسوڵمانان لە لووتكەی پێشكەوتندا بوون، لە بوارەكانی سیاسیی و ئابووریی و كۆمەڵایەتیی و فیكریی دا، ئەورووپا لە تاریكایی سەدەكانی نێوەڕاستدا بوو، (سەدەكانی نێوەڕاست لە سەرەتای سەدەی شەشەمەوە دەستپێدەكات، تاكو كۆتایی سەدەی پازدەهەم، دە سەدە، كە دەگوترێ: سەدەكانی نێوەڕاست، ئەو سەدەیەیە)، كە سەدەكانی نێوەڕاست تاریكایی بوون بەنسبەت ئەورووپاوە، نەك بە نیسبەت جیهانی ئیسلامەوە، مێژوونووسە بە ئینصافەكان دەڵێن: ئەگەربێت و بڵێین: سەدەكانی نێوەڕاست سەدەی تاریكیی بوون، سەدەی نەزانیی و دواكەوتن بوون، بەنسبەت هەموو دنیاوە، ئەوە زۆر بێ ئینصافییە، بەڵێ بەنسبەت خۆیانەوە، ئەورووپا وابووە، بەڵام لەو كاتەدا

موسوڵمانان له شاره گەورەكانی وەك: بەغداد، قورتوبە، قەیرەوان، ئەستەمبول و كوێ و كوێ دا، خاوەنی شارستانیەتییپێشكەوتنی هەمەلایەنە بوون، بەڵێ هەڵەو پەڵە هەبووە لە ڕووی حوكمڕانییەوە، بەڵام بەڕاستیی تا ڕاددەیەكی زۆر یەكسانیی هەبووە، دەسەڵاتی دادوەریی هەمەكارەبووە، زانایان حوكمڕانان كەمتر توانیویانە دەستوەردەنە فەتوا و بیروبۆچوون و ڕایەكانیان و، لەسەر ئەوەش باجیان داوە، سجنكراون، بەڵام تەنازولیان نەكردوە، ئنجا خەڵك بەزۆریی هۆشیاربووە، موسوڵمانێك، هاووڵاتیەك لەوپەڕی دنیا لە هیندەوە تاكو مەڕاكیش و مەغریب، بە پسوولەیەكەوە لە دەوڵەتی ئیسلامییدا هاتوە و چووە و كەس ڕێی لێنەگرتوە، ئەوكاتە زۆر لە ئەوروپاییەكان دەهاتن لەسەر دەستی موسوڵمانان زانستیان وەردەگرت و فێری پیشەسازیی و سەنعەت دەبوون، كەواتە: ئەو ئەوروپایەی ئێستا كاتی خۆی وانەبوو، بەڵام زۆر سوودیان لە شارستانیەتیی ئیسلامی وەرگرت، لە ئەنجامی تەرجەمەكردنی كتێبەكانی موسڵمانانەوە، كە بەهۆی شەڕی خاچپەرستەكان و لە ڕێگای دوورگەی قوبرص و ئەوانەوە پێیانگەیشتن و لە ڕێی لە ئەندەلووسەوە پێیان گەیشتن، بەتایبەت كتێبی (القانون) لە (طب)دا هی (ابن سینا) كتێبەكانی (الرازي) و (مقدمە)ی (ابن خلدون) و كتێبەكانی (ابن رشد) بەتایبەت، كە جولانەوەیەكی مەشهوور هەبووە لە ئەورووپا پێیدەگوترا: (الحركة الرُّشدیه)، دوای ئەوەی كە ئەو كتێبانەیان تەرجەمە كرد، ئنجا ئەوانە هۆشیار و بێداربوونەوە، كەواتە: ئەوەی ئێستا لە ئەورووپا دەگوزەرێ، دەڵێم ڕۆنی خۆمانە لەسەری خۆمان دراوەتەوە، ئنجا گریمان، كەسێك دەڵێ: نەخێر تەكنەلۆجیای ئەوڕوپا هیچ پەیوەندیی بە عالەمی ئیسلامییەوە نیە، دەڵێین: زۆر باشە، بەڵام مادام ئەو بەرەوپێشچوونە و ئەو تەكنۆلۆژیایە شتێكی باشە، ئێمەی مسوڵمانیش لەسەرمان فەرزە شتی باش لەهەر كەسێكەوە بێ و، لە هەر شوێنێكەوە بێ بیهێنین، خوا ئەوەی فەرز كردوە و دەفەرموێ:

﴿ فَبَشِّرۡ عِبَادِ ﴿١٧﴾ ٱلَّذِينَ يَسۡتَمِعُونَ ٱلۡقَوۡلَ فَيَتَّبِعُونَ أَحۡسَنَهُۥٓۚ أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ هَدَىٰهُمُ ٱللَّهُۖ وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمۡ أُوْلُواْ ٱلۡأَلۡبَٰبِ ﴿١٨﴾ ﴾ [الزمر: ١٧-١٨]

واتە: موژدە بەو بەندانەم بدە کە گوێ بۆ هەموو قسەیەك دەگرن و دوایی شوێن باشترینی دەکەون، بۆ نموونە: ئایا ئێستا کە لەوێ دەستاودەستی دەسەڵات دەکرێ بەشێوەی ئاشتییانە، شتێکی باش نیە؟! خوا دەفەرموێ: لێیان وەربگرن، یانی: ئەو میکانیزمی حوکمڕانییەیان لێوەربگرن و، لە شوێنی حوکمی میراتیی و ڕژێمی دیکتاتۆریی و تاکڕەویی و خۆفەرزکردنی دابنێن، خواش پێشئەوە فەرموویەتی:

﴿ وَأَمْرُهُمْ شُورَىٰ بَيْنَهُمْ ﴾ [الشورى : ٣٨]

هەروەها فەرموویەتی: (یا أیها الذین آمنوا)، (یا أیها الناس)، لە ئەصڵدا لێدواندنەکانی قورئان هەموویان ڕوویان لە خەڵکە، یانی: دەسەڵات هی خەڵکە، وەك من لە کتێبی: (ئیسلام و دەوڵەتداریی)دا بە تەفصیلْ باسم کردوە.

مەبەستم ئەوەیە ئەوەی کە ئێستا لەڕۆژئاوا هەیە،هەندێ کەس دەیەوێ چەواشەکارانە بڵێ: ئەوە بەرهەمی نەصرانییەتە، ئەوەی ئێمەش ئەو دواکەوتوویییە، بەرهەمی ئیسلامەتییە! بەڵام بەخوا وانیە، چونکە ئەگەر وابێ، دەبێ بشڵێین: چینییەکان کە ئێستاش مشك و مار و مانگا و جڕوجانەوەر دەپەرستن و، یابانییەکان کە تا ئێستاش پادشا دەپەرستن، پەیکەر و ماری کوبرا دەپەرستن، دەبێ ئەوانیش بە هۆی بتپەرستییەوە پێشکەوتبن! نا، وانیە، بەڵکو پێشکەوتن لە ژیاندا، هۆکارەکەی بریتیە لە ڕەچاوکردنی ئەو یاسایانەی کە خوا لە ژیانی بەشەردا دایناون، کە خوا بەیاساکان (سنن) تەعبیری لێکردوون.

**دانا: مامۆستا! ئێستا لە هەرێمی کوردستان دا فەراغمان هەیە لە ڕووی دادگەرییەوە، چۆن سیاسییەکانمان، هاوولاتیان ئەم چەمکە بەرجەستە بکەن، دادگەریی بچەسپێنین، چۆن بەچ میکانیزمێك؟**

**مامۆستا:** دیارە دادگەریی بەهایەکە، بەهایەکی ڕەهایە، بەهایەکی بەرزە، بەڵام کە تۆ بتەوێ بیهێنیتە سەر ئەرزی واقیع، دەبێ چاوی بۆ بگێڕی بۆ شێواز و ئامرازی گونجاو، من پێموایە دادگەریی ئەگەر بویسترێ لە هەر شوێنێکدا بچەسپێنرێ، لەم ڕۆژەگارەی ئێمەدا:

١- پێش هەموو شتێك پێویستی بە دامەزراوەکان (مؤسسات)هەیە، پێویستی بەوە هەیە کە میزاجی شەخص و حیزب و بنەماڵە و ئەوانە حاکم نەبێت، دامەزراوەکان هەبن و دەسەڵاتیشیان جیاجیا بێت (فصل السلطات) هەبێ، هەبێ، دامەزراوەی پەرلەمانمان هەیە، بۆ یاسادانان، دامەزراوەی حکوومەت، دامەزراوەی دادوەریی، دامەزراوەی دیکەی تەنفیزی دەگونجێ هەبێ، حکوومەتە.

٢- یاسا سەروەریی یەکێکی دیکەیە لەو بنەما و پرەنسیپانەیە.

٣- پاشان هاووڵاتییبوون و مرۆڤبوون کردن بەپێوەر بۆ مامەڵە لەگەڵ خەڵکدا، نەك ئینتیمای حیزبیی و عەشیرەتیی و بنەماڵەیی، کە سەرەنجام وەك هەموو جارێ دەڵێم: حیزب و خزم پڕ بکرێن و، جەماوەریش قڕ بکرێت.

**دانـــا: کە بەچاوی سەیر دەیبینین؟**

**مامۆستا:** ئەوە بە چاوی سەر دەیبینین و دەچێتە چاوی هەرکەسێکەوە، بەڕاستی زۆر جاران بەزەییم بە وشەی گەندەڵییدا دێتەوە، کە بۆ ئەو تەصەڕووفە زەق و ڕەق و سەرسوڕهێنەرە بەکاری دێنن و پێناسەی ئەو تەصەڕووفەی پێدەکەن، کە لە هەرێمی کوردستاندا لەلایەن، بەشێك لە تەبەقەی سیاسی و بەشێك لەو دەوڵەمەندە مشەخۆرانەی کە لە پەنای ئەو چینە سیاسییەدا بوونە ملیاردێر،کراوەتە پیشەءنەریت بەزەییم بە وشەی گەندەڵییدا دێتەوە، گەندەڵیی یانی: کارمەندێك یان کاربەدەستێك سوودی خراپ ببینێ لە ئیشە ئیدارییەکەی خۆی، ئیمتیازێکی ناشەرعیی وەربگرێ، مەعنەویی یان ماددیی، بەڵام ئەوەی لە هەرێمی کوردستاندا دەگوزەرێ، دەستبەسەردا گرتنە، گەندەڵیی ئەوەیە لە پەنامەکیی دا و کەس پێی نەزانێ و، دوایی لێی ئاشکرا بێ یا ئاشکرا نەبێ، بەڵام لەبەر چاوی تۆ لەم وڵاتەدا دەوڵەمەندێك لە پەنای سیاسییەکدا چەند دۆنم زەوی پێ دەدرێ و ئەویش دێنێ کۆمەڵێك باڵەخانەی لەسەر دروست دەکات، پاشان هەر شوققەیەك دەفرۆشێتەوە بە فەقیرێك و بۆماوەی چەندان ساڵ قەرزداری دەکات، کابراش هەر بە کونفەیەکونێك دەبێت بە ملیاردێر، کابرای سیاسیش کە لە پەنایدایە، دیفاعی لێدەکات و پشتگیریی دەکات و، هەر بەو

قەرارەش زەوی پێ دەدات! بیستوومە كابرایەك ویستوویەتی كارگەیەك دابنێ، پێی گوتراوە: باشە، بەڵام دەبێ لەسەدا سی و سێی بۆ ئێمە بێ (ئەوە دیارە بە ئینصافیش بووە)، ئاخر بۆ خۆم هیچم نامێنێتەوە، چۆن بۆ خۆت هیچت نامێنێتەوە؟ ئاخر ئێمە پشتگیرییت دەكەین، ئێ تۆ چیت پشتگیریی دەكەی؟! كە دەگوترێ: یاسا سەروەرە، ئەگەر ئەم قسەیە درۆ نەبێ، درۆیەكی زۆر گەورە، ئەگەر یاسا سەروەر بێ، بابای بازرگان و كاسب - ئەگەر ڕاستبكات بازرگان و كاسب بێ و شەریكە دز نەبێ - بۆچی دەبێ پێویستیی بە بەرپرسێكی باڵا بێ كە بەرگریی لێ بكات و پشتی بگرێ؟! لەراستییدا كاكە دانا ئەوەی كە لەم وڵاتەدا دەگوزەرێ، وەك گوتم پێناسەی دزیی و گەندەڵیی و ئەوانە وشەی زۆر بچووكن و، ئەو شتە زۆر گەورەترە لەوەی كە لە قاڵبی ئەو وشە بچوكانەدا جێی ببێتەوە، ئەوەی دەگوزەرێ و گوزەراوە، بریتیە لە دەستبەسەردا گرتن، بریتیە لە بەتاڵانبردنی موقەددەراتی ئەم وڵاتە، كەواتە: ئەو دادگەرییە بە چی دەچەسپێ؟ بەوە دەچەسپێ:

١- دامەزراوەكان هەبن.

٢- یاسا سەروەر بێ.

٣- دەسەڵاتەكان جیابن.

٤- وە مرۆڤبوون و هاووڵاتییبوون پێوەر بێ بۆ مامەڵە لەگەڵكردن نەك ئینتیمای حیزبیی و سیاسی، هەڵبەتە هەڵدەگرێ زۆر شتی دیكەش بگوترێ، بەڵام ئەوانە شتە سەرەكییەكانن.

**دانا: ئەگەر ئێستا بابایەكی سیاسی، یان مشەخۆرێكی ئەوەی كە جەنابت فەرمووت لە پاڵ سیاسییەكاندا پێی بڵێی دز، قبووڵی نیە، بەس پێی بڵێی گەندەڵ لەوانەیە زۆر پێی ئاسایی بێ.**

**مامۆستا:** من پێموایە دزیی یان گەندەڵیی وشەی زۆر بچووكن، ئەو شتە زەبەلاحەی ئەوان ئەو ڕەفتارە ناقۆڵایەی ئەوان لە قاڵبی ئەو وشە بچووكانەدا جێی نابێتەوە.

**دانــا: ئێمە وەك میللەت، هەم وەك خەڵك هەم وەك سیاسییەكان، ئەگەر هەوڵمان نەدا دادگەریی بچەسپێنین، چی چاوەڕێمان دەكات، یان لەلای خوای پەروەردگار یان لە دنیادا بەرەو ڕووی چی ئەبینەوە؟**

**مامۆستا:** خوای دادگەر دەفەرموێ: ﴿أَلَا لَعۡنَةُ ٱللَّهِ عَلَى ٱلظَّٰلِمِينَ ١٨﴾ [هود: ١٨]

واتە: نەفرینی خوا لە ستەمكاران، نەفرین (لعنە) لە زمانی عەرەبیدا بریتیە لە دوورخستنەوەی ئەو كەسە، یان ئەو شتە لە بەزەیی و ڕەحمەتی خوا، ئنجا زاڵمانێك نەفرینیان لێ كرابێ، هەركەسێك نزیكیان بكەوێتەوە، لە نەگبەتیی ئەو نەفرینكراوانەدا پشك و بەشی دەبێت، بۆیە خوا دەفەرموێ:

﴿وَلَا تَرۡكَنُوٓاْ إِلَى ٱلَّذِينَ ظَلَمُواْ فَتَمَسَّكُمُ ٱلنَّارُ﴾ [هود: ١١٣]

واتە: پشت بە ستەمكاران مەبەستن، لێیان نزیك مەبن، لەگەڵیاندا مەڕۆن، ئەگەرنا ئاگرتان تووش دەبێ، پێغەمبەری خواش (علیە الصلاة والسلام) دەفەرموێ: (إذا رأيت أمتي تهاب الظالم أن تقول له: أنت الظالم، فقد تودِّع منهم). (مسند أحمد ٦٥٢١، ٦٧٨٤)، واتە: ئەگەر ئۆممەتی منت بینی سامی دەكرد، هەیبەتی دەكرد كە بە ستەمكار بڵێ: تۆ ستەمكاری، ئەوە خوا حافیزییان لێ كراوە، واتە بە كەڵكی هیچ نایەن و سەریان بە فەتارەت دەچێ.

كە لەخوا بەزیاد بێ كۆمەڵگای ئێمە نەگەیشتووەتە ئەو حەددە، خەڵكی حەقبێژ زۆرە، نووسەری بوێرمان هەیە، ڕاگەیاندنكاری باش، حیزب و لایەنی و سیاسی ئازا و بوێرمان هەیە، خەڵكی پاك و دەستپاكمان لەم وڵاتەدا هەیە، بەڵام بێگومان ئەوانەی كە ستەمكاریی و خراپە دەكەن و ئەوەندەی ئیرادەكەی ئەوان بەرجەستە بووە، ئیرادەی ئەو هەموو خەڵكە دڵسۆز و ڕاست و خێرخوازە، تاكو ئێستا بەوجۆرە بەرجەستە نەبووە، دەبێ ئەو حەقیقەتە بسەلمێنرێ، تا ئێستائیرادەی دڵسۆزانە و خێرخوازانە بەو جۆرەی پێویستە بەرجەستە نەبووە لە دنیای واقیعدا، بەڵام من ناڵێم، ئەو خەڵكە هەمووی ستەمكار و لادەرە، چونكە جاری وا هەیە كۆمەڵێك ستەمكار دەتوانن وڵاتێك بخەنە ژێردەستی خۆیانەوە، ئنجا ئەوە مانای وانیە كە خەڵكەكە هەمووی ستەمكارە، بەڵكو خەڵكەكە

یان ده‌سته‌پاچه‌ و بێده‌سه‌ڵات و بێ هه‌ڵوێستن، یاخود له‌ بێ ئاگایی ئه‌واندا ئه‌و سته‌مكارییه‌ ته‌نیوه‌ته‌وه‌ و وه‌ك نه‌خۆشیی و په‌تایه‌ك وڵاته‌كه‌ی داگرتوه‌، به‌ڵام ئایا تا كوێ ده‌ڕوا؟ بێگومان وه‌ك گوتراوه‌: هه‌موو په‌تێك له‌ باریكیی دا ده‌پچڕێ، به‌ڵام په‌تی زوڵم له‌ ئه‌ستووریدا ده‌پچڕێ، وه‌ یه‌كێك له‌ زانایان ده‌ڵێ: شه‌وگار كاتێك كه‌ تاریكیی زۆر زۆر خه‌ست ده‌بێته‌وه‌، به‌ره‌به‌یان له‌وكاته‌دا له‌ هه‌موو كاتێكدا نزیكتره‌.

**دانا: مامۆستا! دادگه‌ریی كه‌ خوای گه‌وره‌ سه‌رجه‌م پێغه‌مبه‌رانی بۆ چه‌سپاندنی ناردوه‌، بۆ سه‌رجه‌م بواره‌كانی ژیانه‌، یان تایبه‌ته‌ به‌ هه‌ندێ بوار و بۆ هه‌ندێ بواری دیكه‌ نیه‌؟**

**مامۆستا:** هه‌ر بۆ خۆی وشه‌ی (عدل) كه‌ خوای په‌روه‌ردگار ده‌فه‌رموێ:

١- ﴿إِنَّ ٱللَّهَ يَأۡمُرُ بِٱلۡعَدۡلِ﴾ [النحل: ٩٠]

واته‌: خوا فه‌رمان ده‌كات به‌ عه‌دل، ئیدی نه‌یفه‌رمووه‌ له‌ چیداز

٢- یان كه‌ خوا به‌ پێغه‌مبه‌ر ده‌فه‌رموێ: ﴿وَأُمِرۡتُ لِأَعۡدِلَ بَيۡنَكُمُۖ﴾ [الشورى: ١٥]

واته‌: تۆ بڵێ: من فه‌رمانم پێكراوه‌ دادگه‌رییتان له‌ نێواندا به‌رپا بكه‌م.

٣- یان كه‌ ده‌فه‌رموێ: ﴿لِيَقُومَ ٱلنَّاسُ بِٱلۡقِسۡطِۖ﴾ [الحديد: ٢٥]

نه‌یفه‌رمووه‌ له‌ چیدا، به‌ڵكو له‌ هه‌موو بواره‌كاندا، چونكه‌ وشه‌ی دادگه‌ریی (عدل - قسط) مانایه‌كه‌ی زۆر له‌ مانای یه‌كسانییه‌وه‌ نزیكه‌ و، هه‌ندێك له‌زانایان دادگه‌رییان ئاوا پێناسه‌ كردوه‌: (أخذُ ما لك وإعطاءُ ما عليك) مافی خۆت وه‌ربگری و مافی خه‌ڵكیش بده‌ی، واته‌: خه‌ڵكه‌كه‌ هه‌موویان وه‌ك یه‌كیان لێ بێ، ئنجا ئه‌وه‌ بواری سیاسی ده‌گرێته‌وه‌، بواری ئابووریی ده‌گرێته‌وه‌، بواری كۆمه‌ڵایه‌تیی ده‌گرێته‌وه‌، به‌ڵكو له‌پێش ئه‌واندا بواری نه‌ته‌وه‌ییش ده‌گرێته‌وه‌، یانی: له‌نێو ئۆممه‌تی ئیسلامدا نابێ هیچ میلله‌تێك هیچ نه‌ته‌وه‌یه‌ك خۆی به‌سه‌رده‌ست بزانێ، وه‌ك من له‌گه‌ڵ خه‌ڵكی عه‌ره‌ب و تورك و فارس ئه‌وه‌م گوتوه‌، گوتوومه‌: مادام ئێوه‌ مسوڵمانن و، ئێمه‌ش مسوڵمانین، به‌نیسبه‌ت

ئەو گەلە هاوسێیەتانەوە كە پێیان دەگوترێ: كورد، مادام عەرەب و فارس و تورك دەوڵەتیان هەیە، دەبووایە هەبوونی دەوڵەت و قەوارەی سیاسیی بەو گەلە دراوسێ مسوڵمانەشتان ڕەوا ببینن، بگرە هاوماڵ و دراوسێ، موسڵمانیش نەبێ، دەبێ پێی ڕەوا ببینی، تۆ چیت هەیە، ئەویش هەیبێ.

بەڵێ لەراستییدا چەمكی دادگەریی نەبەستراوەتەوە بە ڕەهەندێكەوە، بە دوو ڕەهەندەوە، بەڵكو بە گشتی هاتوە، ئنجا ئایەتەكان و فەرمایشتەكانی پێغەمبەر (علیە الصلاة والسلام) بۆیان ڕوون كردووینەوە، كە پێویستە ئێمەی مسوڵمان بەهەر نرخێك بێ هەر لەگەڵ دادگەریی و یەكسانیی دابین و دژی ستەم و زۆر بین، بۆ نموونە: پێغەمبەری خوا دەفەرموێ: (سید الشهداء حمزة، ورجل قام الى إمام جائر، فأمره ونهاه فقتله) رواه ()، لە فەرموودەیەكی دیكەدا هاتوە دەفەرموێ: (أفضل الجهاد كلمة عدل عند سلطان جائر)رواه..، ئەوەی پێشییان دەفەرموێ: گەورەی شەهیدان حەمزەیە (مامی پێغەمبەر (صلی الله علیە وسلم) و پیاوێكە هەڵدەستێتەوە و ڕادەپەڕێ لە پێشەوایەكی ستەمكار، ئەمری پێدەكات و نەهی لێدەكات و ئەویش دەیكوژێ، ئەوە لەگەڵ حەمزە پێكەوە دەچنە تەرازوویەكەوە، پێغەمبەر (صلی الله علیە وسلم) چەند داكۆكی كردوە لەسەر ئەوە كە خەڵك دەبێ لە بەرامبەری ستەمدا بوەستێ، ئەوەی لەبەرامبەری ستەمدا دەوەستێ و، لەسەر ئەوە كە ڕێگریی لە ستەم دەكات دەكوژرێ، مادام ئیماندار بێ، دەچێتە ڕیزی حەمزەوە! ئەویدیكەش دەفەرموێ: گەورەترین جیهاد بریتیە لە گوتنی قسەیەكی دادگەرانە لەلای دەسەڵاتدارێكی ستەمكار.

كەواتە: ئەوە ئەركی هەموو لایەكە، بێگومان تا كاتێكیش كە میللەت زیندوو بێ، قەت حوكمڕانێك ناتوانێ ستەمی لێ بكات، میللەتی زیندوو، میللەتی هۆشیار، میللەتی بێدار، میللەتی ئازا و بوێر، كەس ناتوانێ خۆی بەسەردا فەرز بكات، وەك گوتم جاری وایە دەگونجێ لە كاتێكی (إستثنائي) و لە هەلومەرجێكی تایبەتدا، كەسێك، لایەنێك هەندێك زوڵمی بۆ بڕوا، بەڵام سەرەنجام سەری بە فەتارەت دەچێ و خەڵك بە عەقڵی ساغی بە فیترەتی ساغی ئەو بارە نائاساییەی خۆیان ڕەفز دەكەن و دەیگۆڕن.

**دانا: کەواتە مامۆستای بەڕێز! نادادیی کۆمەڵایەتی و سیاسیی و ئابووریی، ئەم دۆخەی هەرێمی کوردستانی خوڵقاندوە؟**

**مامۆستا:** ئەوەی ئێستا هەیە، ئەو قەیرانانەی کە ئێمە لەگەڵیاندا دەستەویەخەین، بێگومان دەرهاویشتەن، دەرهاویشتەی ئەو نادادگەرییەن، ئەگەر دادگەریی هەبووایە، دادگەریی ئەگەربێت و هەموو قەناعەتمان پێی هەبێ، دەشخەفتێین، لە کاراکردن و بە گەڕخستنی میکانیزمەکانی دادگەریی، دەبووایە دامەزراوەکانمان دامەزراوەی ڕاستەقینە بن، وەك پەرلەمان، حکوومەت، دەسەڵاتی دادوەریی، چی، چی...، دەبوو هەمووومان بەڕاستیی ملکەچ کەین بۆ یاسا و دەستوورێك کە بۆ هەموان وەك یەکە، دەبوو هەمووومان وەك مرۆڤ تەماشای یەکدی بکەین و، هیچ کەسێك لە قەراری نەفسی خۆیدا پێی وانەبێ حەقێکی زیادەی هەیە بەسەر ئەویدیکەدا، واتە مرۆڤ بوون و هاووڵاتیی بوون پێوەر و سەنگی مەحەك بێ، دەبووایە هەر هۆکار و ئامرازێك بزانین ڕێگا دەگرێ لەزەبەلاح بوونی دەستەڵات (تغوُّل السلطة)، لە کەوڵی خۆی دەرچوونی حوکمڕان و دەسەڵاتداران، دەبووایە هەموو ئەو دابینکار (چمانە)نانە بڕەخسێنن و، هەموو ئەو کۆسپ و پەرچانە بێنین کەڕی لەستەم و قۆرخکاریی دەگرن، وەك لە وڵاتانی پێشکەوتوودا هەیە، بەڵێ ئەوەی کە ئێستا ئێمە بەدەستییەوە دەناڵێنین و لەگەڵیدا دەستەویەخەین: قەیرانی ئابووریی، قەیرانی کۆمەڵایەتیی، ناتەبایی سیاسیی، بێ دامەزراوەیی، هەمووی دەرهاویشتەی نەبوونی دادگەریی و، نەبوونی ئەو ئامرازانەیە کە دادگەریی لەسەریان دەوەستێت!.

**دانا: مامۆستا! خەڵکی مسوڵمانی هەرێم دەبێت چ پاڵنەرێك وای لێبکات دادگەریی بچەسپێنێت، یاخود ئەو پاڵنەرانە چین کە دەبێت وا لە خەڵك و جەماوەر بکەن دادگەریی بچەسپێنن؟**

**مامۆستا:** بەر لە هەموو شتێك ئینسانی موسوڵمان و خەڵکی مسوڵمان، هەموو شتێك دەبەستێتەوە بە خواوە، سبحانە وتعالی و، دەیبەستێتەوە بە عیبادەت بۆ خواوە و، دەیبەستێتەوە بە پاداشتی لای خواوە، لەبەرئەوە پێویستە هاندەری کۆمەڵگایەکی مسوڵمان ئەوەبێ دادگەر بێ بۆ ئەوەی خوا لێی ڕازی بێت،

هەروەها ستەم نەكات و لێی دووربێ، بۆ ئەوەی له سزای خوا دوور بێ و، بۆ ئەوەی سەرفراز بێ، هەم له دنیادا بەختەوەر بێ و هەم له دوارۆژدا سەربەرز بێ، دەبێ ئەوە پاڵنەر و هاندەری ڕاستەقینەیان بێ، بەڵام ئەگەر كەسێكیش ئەوە پاڵی پێوە نەنێ، وەك خوای پەروەردگار له سوورەتی (آل عمران)دا دەفەرموێ:

﴿ وَقِيلَ لَهُمْ تَعَالَوْا۟ قَـٰتِلُوا۟ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ أَوِ ٱدْفَعُوا۟ ﴾ [آل عمران: ١٦٧]

واتە: ئەگەر پێیان بگوترێ: وەرن یان له ڕێی خوادا بجەنگن، یان لانی كەم دیفاع له خۆتان بكەن، بەڵێ ئەصڵ ئەوەیە خەڵكی مسوڵمان هاندەر و پاڵنەری ئەوە بێ كه خوا لێی ڕازی بێ و سەربەرز و سەرفراز بێ له دنیاو قیامەتدا، بۆیە هەوڵبدات دادگەریی بچەسپێنێ و زوڵم لابەرێ، نەك لەبەر ئەوەی ڕقی له فلان كەسە، دیارە ئێمە ڕقمان له كردەوەی خراپی ستەمكاران هەڵدەستێ، ئەگەرنا وەك بەشەر، بەشەرەكان هەموویان لەلای خوا بەڕێزن، بەڵام ڕقمان له سیفەتی خراپە، ئنجا دەبێ ئەوە پاڵنەر و هاندەری ڕاستەقینە بێ، بەڵام ئەگەر ئەوەش نەبێ، خەڵك هەروەك شتێكی سروشتی پێویستە هەوڵی لابردنی ستەم و چەسپاندنی دادگەریی بدات، ئێستا تۆ بێنە مریشكێك كه لەسەر جوجكەكانی كورك بووە، كەسێك بەلایدا بچێ پێهەڵدەپڕژێت، وەك شتێكی سروشتی مرۆڤ دەبێ دیفاع له بوونی خۆی بكات، دیفاع له بەرژەوەندییەكانی خۆی بكات، له كەرامەتی خۆی بكات، له ئازادیی خۆی بكات، له مافەكانی خۆی بكات، یانی: ئەگەر بە هاندەری دینییش نەبێ، بە پاڵنەری دنیاییش بێ، هەر شتێكی ڕەوایە، مرۆڤ دژی ستەم بێ و داكۆكیكاری دادگەریی بێ، پێغەمبەر (عليه الصلاة والسلام)، دەفەرموێ: (مَنْ قُتِلَ دون مظلمته فهو شهيد) رواه أبو داود: هەركەسێك لەسەر ستەملێكراوێتیی خۆی بكوژرێ، شەهیدە، یانی: مادام موسڵمان بێ شەهیدە، ئنجا مەرج نیە ئیللا زوڵمی دینیی لێ بكەن، كەسێك دێ بە زوڵم دەڵێ: دەبێ ماڵەكەی خۆتم بدەیە، ئەو خانووەم بۆ چۆڵ بكە، دەیەوێ تەعدای نامووس بكات، یان دەیەوێ بیكوژێ، یان دەیەوێ ئیهانەی پێ بكات، ئنجا ئەگەر ئەو كەسە له بەرگریی لێكردنی خۆیدا و له ڕەتكردنەوەی زوڵمدا بكوژرێ، شەهیدە، بۆیە عەجایبە میللەتێك مسوڵمان

بن‌ءمل بۆ زوڵم و بۆ سته‌م و غه‌درو خراپه‌ كه‌چ بكه‌ن، له‌ حاڵێكدا خوا سبحانه وتعالی و پێغه‌مبه‌ر (علیه الصلاة والسلام) له‌ قورئان و له‌ سوننه‌تدا، ئه‌و هه‌موو فه‌رمانه‌یان كردوه‌، به‌وه‌ستانه‌وه‌ دژی سته‌م و، ئه‌و هه‌موو داكۆكییه‌یان كردوه‌ له‌سه‌ر ئه‌وه‌ی كه‌ موسڵمان نابێ سته‌م قبووڵ بكا و، مسوڵمانان ده‌بێ به‌ گژ زوڵم و سته‌مدا بچنه‌وه‌ و، ئه‌گه‌ر بكوژرێن له‌سه‌ر ئه‌وه‌، شه‌هیدن و، له‌ قیامه‌ت دا سه‌ربه‌رز ده‌بن و، له‌ دنیاش دا به‌سه‌ربه‌رزیی ده‌ڕۆن، به‌ شه‌هیدیی ده‌ڕۆن، بۆیه‌ هه‌رگیز له‌ خه‌ڵكێكی مسوڵمان و، له‌ كۆمه‌ڵگایه‌كی مسوڵمان ناوه‌شێته‌وه‌، مل بۆ باری زوڵم و سته‌م كه‌چ بكه‌ن!!.

**دانا: وه‌ك دوا پرسیار، كاتی به‌رنامه‌كه‌مان به‌ره‌و ته‌واوبوون ده‌ڕوات، چی به‌وانه ده‌ڵێی كه‌ ده‌ڵێن بۆ به‌ره‌نگاربوونه‌وه‌ی زوڵم نابێ وڵات تێكبده‌ین و، ئێمه‌ ته‌نها نه‌صیحه‌ت و ئامۆژگارییمان له‌سه‌ره‌ بۆ سه‌ركرده‌ سیاسییه‌كانی خۆمان، نابێ خۆپێشاندان و ڕێپێوان و مانگرتن و هاوشێوه‌كانیان هه‌بن، له‌به‌رئه‌وه‌ی ئه‌مه‌ كۆی پرۆسه‌كه‌ تێكده‌دات؟**

**مامۆستا:** كاكه‌ دانا، ئه‌و قسانه‌ قسه‌ی فه‌قیرحاڵانه‌ن، بیستومه‌ ئه‌و جۆره‌ كه‌سانه ده‌ڵێن: خۆپیشاندان و مانگرتن و ره‌خنه‌گرتن له‌ ده‌سه‌ڵات، بیدعه‌ته‌! ده‌ڵێن: ئه‌وه‌ بابه‌ته‌ له‌ بواری هه‌ڵسوكه‌وته‌كاندایه‌، بواری هه‌ڵسوكه‌وت و عاده‌ته‌كانیش ئیبنو ته‌یمییه‌ (ڕه‌حمه‌تی خوای لێ بێت) له‌ كتێبی: (القواعد النورانیه الفقهیه) داهه‌روه‌ها (عبدالرحمن بن ناصر السعدي) له‌ كتێبی: (اصول الفقه المهمه)دا ده‌ڵێن:: ئه‌صڵ له‌ عاده‌ته‌كان و له‌ هه‌ڵسوكه‌وته‌كاندا بریتیه‌ له‌ ریپێدران، ئه‌صڵ ئه‌وه‌یه‌ هه‌موو هه‌ڵسوكه‌وت و ڕه‌فتارێك ڕه‌وایه‌، مه‌گه‌ر به‌ڵگه‌ هه‌بێ له‌سه‌ر ئه‌وه‌ی كه‌ شتێك قه‌ده‌غه‌یه‌، ئنجا باشه‌ كاتێك زوڵمێك هه‌یه‌ و خراپه‌یه‌ك هه‌یه‌، چۆنی لابه‌رین، چی بكه‌ین؟ ڕه‌خنه‌ی لێ نه‌گری و، خۆپێشاندان نه‌كه‌ی، ئه‌و حوكمڕانه‌ چۆن تێبگه‌یه‌نی، كه‌ من به‌تۆ ڕازی نیم، من به‌و سیاسه‌ته‌ی تۆ ڕازی نیم؟! حه‌دیسه‌كای پێغه‌مبه‌ریش (صلی الله علیه وسلم)، كه‌ پێشتر هێنامنن له‌وباره‌وه‌ ڕوونن، ئنجا ئه‌وه‌ی ئه‌وانه‌ ده‌یڵێن، ڕێك له‌گه‌ڵ حه‌دیسه‌كانی پێغه‌مبه‌ردا تێكده‌گیرێ، كه‌ ده‌فه‌رموێ: (سید الشهداء حمزة، ورجل قام الى

إمام جائر، فأمره ونهاه فقتله)، (قام الى إمام جائر) یانی: بەئاشكرا و لەنێو خەڵكدا، ئەویدیكەش كە دەفەرموێ: (أفضل الجهاد كلمـة عدل عند سلطان جائر) دیارە بۆیە گەورەترین جیهادە، چونكە مەزەندەی هەیە، حوكمڕانەكە بیكوژێ، بیگرێ، ئەشكەنجەی بدات!!

ئنجا ئەو جۆرە كەسانەی ئەو جۆرە بیرۆكانە بڵاو دەكەنەوە، بێگومان ئەو بیروڕایانە نامۆن بە ئیسلام و ئەو جۆرە بیرۆكانە لەو سەرچاوانەوە دێن كە كەسانێك حوكمی بنەماڵەیی، حوكمی میراتییان بەسەر كۆمەڵگاكەیاندا سەپاندوە و ئەو فیكرانە ڕەواج پێدەدەن، بۆئەوەی خەڵك بگەوجێنن و بێهۆش بكەن و لە بەرامبەر دەسەڵات و حوكمڕانە ستەمكارەكاندا دەستەمۆیان بكەن و بیان خەسێنن! كە بە عەكسەوە پێغەمبەران (عليهم الصلاة والسلام) هاتوونە مەیدان بۆ فیرعەونەكان (لكلِ فرعونٍ موسى)، چونكە هەر پێغەمبەران بە گژ ستەمكاراندا چوونەوە و هەر پێغەمبەران بوون (عليهم الصلاة والسلام) كوژراون و دەركراون و گیراون و ناڕەحەت كراون، من نازانم ئەوانە بەدوای كێ كەوتوون؟! تۆ ئەگەر ڕێی پێغەمبەران دەگری، ئەوە پێغەمبەران (عليهم الصلاة والسلام) ئاوابوون، ئەوە موسایە بە گژ فیرعەوندا دەچێ، ئیبراهیم بە گژ نەمروددا دەچێ، ئەویدیكە بە گژ ئەویدیكەدا دەچێ، بەپەنهانیی، بەپەنامەكیی نامەی بۆ هیچ حوكمڕانێكی ستەمكار نەناردوە، بەڵكو ڕێك پێی گوتوە: تۆ پەروەردگارنی، تۆ تاغووتی! من پەروەردگارم ناردوومی، ئەو میللەتە چیدیكە مەچەوسێنەوە، ئەوە ڕێی پێغەمبەرانە، ئەدی ڕێی پێشەوایان و ڕێی زانایان؟ ئەبوحەنیفە سجنكراوە، شافیعی دەركراوە، ئەحمەد لێی دراوە، مالیك داركاریی كراوە، ئەوەش ئیمامەكان، دەی وەرە بزانم تۆ بەدوای كێ كەوتووی؟!.

بەحەقیقەت وەك گوتم ئەو فیكرەیە فیكرەیەكی نامۆیە،و زیاتر لەو ناوەندانەشەوە ڕەواجی ئەو جۆرە بیرۆكانە دەدرێ، كە دەیانەوێ خەڵك دەستەمۆ بكەن بۆ دەسەڵاتدارانی خۆسەپێن و، ئەو حوكمە میراتیی و بنەماڵێی و دیكتاتۆرییەیان هەر دەوامی بێت و، خەڵكیش پێی وابێ شتێكی باشی كردوە، كە بێدەنگە لە بەرامبەر زوڵمدا، لە حاڵێكدا كە دەقی فەرمایشتی پێغەمبەرە

(علیهم الصلاة والسلام) كە فەرموویەتی: (كاتێك ئۆممەتی منت بینی لە بەرامبەر ستەمكاردا بێدەنگ بوو، دەترسا پێی بڵێ: تۆ ستەمكاری، ئەوە بەكەڵكی هیچ نایەت و خواحافیزیی لێكراوە)[1].

**دانا: بەڕێز مامۆستا عەلی باپیر نووسەر و ڕووناكبیر! زۆر سوپاس بۆ ئەوەی وەڵامی پرسیارەكانی ئێمەت دایەوە.**

**مامۆستا:** سەلامەت بی كاكە دانا.

**دانا: پشت بە خوا لە ئاڵقەكانی دیكەدا باس لە زوڵم و ستەم دەكەین.**



---

(١) (إذا رأيت أمتي تهاب أن تقول للظالم أنت الظالم، فقد تودعمنها)

**دانا: بەناوى خواى بەخشندەى میهرەبان، سڵاوتان لێ بێت بینەرانى ئازیز و خۆشەویستى كەناڵى ئاسمانى پەیام، خۆم بەخۆشحاڵ دەزانم خواى پەروەردگار دەرفەتى پێ بەخشین لە ئاڵقەى چوارەمى بەرنامەى بەدانایى دا لە خزمەت مامۆستا عەلى باپیر نووسەر و رووناكبیردا، بەئێوەى ئازیز و خۆشەویست شاد بووینەوە، دووبارە سڵاو مامۆستا گیان، سوپاس بۆ ئامادەبوونت.**

**مامۆستا:** سڵاو بۆ جەنابیشت و بەخێر بێى كاكە دانا.

**دانا: زۆر سوپاس، مامۆستا! لە ئالقەى پێشوودا ئاڵقەى سێیەمى بەرنامەكەماندا، باسمان لە دادگەریى كرد، پشت بەخوا لەم ئاڵقەیەدا باسى ستەمكاریى دەكەین، ستەم لەلاى خوا و لەنێو كۆمەڵگادا، ئەگەر بەرپا بوو، ئەگەر هاتە ئاراوە، دەبێتە هۆكارى چى؟**

**مامۆستا عەلى باپیر:** بسم الله الرحمن الرحيم، الحمد لله ، وصلى الله تعالى وسلم وبارك على رسول الله، محمد وآله المهتدين بهداه، من الصحب والأزواج والقرابة، والتابعين لهم بإحسان الى يوم اللقاء.

كاكە دانا پێشێ ئێمە دەبێ پێناسەى زوڵم بكەین، زوڵم یانى چى؟ ستەم یانى چى؟ لە زمانى عەرەبییدا وشەى (ظلم) دیارە كە قورئان بەكارى هێناوە و وشەیەكى عەرەبییە، بە كوردیى ئێمە دەڵێین: ستەم، جەور و جەفا، بێدادیى.

١- (ظلم) لە زمانى عەرەبییدا و لە بەكارهێنانى قورئاندا، بە ماناى موتڵەقى گوناهكردن و تاوانكردن بەكارهاتوە، وەك خوا دەفەرموێ:

﴿ وَمَن يَعۡمَلۡ سُوٓءًا أَوۡ يَظۡلِمۡ نَفۡسَهُۥ ثُمَّ يَسۡتَغۡفِرِ ٱللَّهَ يَجِدِ ٱللَّهَ غَفُورٗا رَّحِيمٗا ١١٠ ﴾ [النساء : ١١٠].

واتە: هەركەسێك خراپەیەك بكات، یان ستەم لە خۆى بكات، دوایى داواى لێبوردن لە خوا بكات خوا بەلێبوردە و بەبەزەیى دەبینێ. ستەم لەخۆى بكات، واتە: گوناهێك بكات، هەر گوناح كردنێك ستەم لە خۆكردنێكە، كەواتە: (ظلم) بە ماناى موتڵەقى گوناحكردن دێ.

٢- هەروەها (ظلم) بە مانای ناتەواویی و كەموكوڕیی لە شتدا، دێ، خوای پەروەردگار لە سووڕەتی (كهف)دا دەفەرموێ:

﴿ ۞ وَٱضۡرِبۡ لَهُم مَّثَلٗا رَّجُلَيۡنِ جَعَلۡنَا لِأَحَدِهِمَا جَنَّتَيۡنِ مِنۡ أَعۡنَٰبٖ وَحَفَفۡنَٰهُمَا بِنَخۡلٖ وَجَعَلۡنَا بَيۡنَهُمَا زَرۡعٗا ﴿٣٢﴾ كِلۡتَا ٱلۡجَنَّتَيۡنِ ءَاتَتۡ أُكُلَهَا وَلَمۡ تَظۡلِم مِّنۡهُ شَيۡـٔٗاۚ وَفَجَّرۡنَا خِلَٰلَهُمَا نَهَرٗا ﴿٣٣﴾ ﴾ [الكهف : ٣٢ـ ٣٣]

(وَلَمۡ تَظۡلِم مِّنۡهُ شَيۡـٔٗاۚ) یانی: هەركام لە دوو باغەكە بەرو میوەی خۆی بە تەواویی دەركردبوو و هیچ ستەمی نەكردبوو لە بەر و میوەكەی، (وَلَمۡ تَظۡلِم) (أي لم تنقص)، كەواتە: (ظلم) بە مانای داشكاندنی حەقی خەڵك و كەمءكوڕیی و شتی بێ جێ و ناڕەوا دێ.

٣- (ظلم) بە مانای دەستدرێژیی و شكاندنی سنوورەكان دێ بەرەو لای مافی خەڵك، (ظلم) لە خەڵككردن واتە: خواردنی مافەكانیان و تەجاوز بۆ سەركردنیان و، شكاندنی ئەو سنوورانەی كە لە نێوانی تۆ و ئەواندا هەن بەرەو لای ئەوان بچی و سنوور ببەزێنی.

ئەوە مانای زوڵمە، ئنجا دیارە (ظلم) هەم دەگونجێ خەسڵەتێكی تاكیی بێ، مرۆڤ لە زاتی خۆیدا زوڵم بكات و، هەم دەگونجێ خەسڵەتێكی گشتی و كۆمەڵایەتیی بێ، كۆمەڵێك، میللەتێك، دەوڵەتێك، (ظلم) بكات، ئەوەم بۆیە باس كرد، تاكو وانەزانرێ كە (ظلم) تەنیا بە باڵای دەسەڵاتداران و حوكمڕانان براوە، لەڕاستییدا كۆمەڵگایەك تاكەكانی ئامادە نەبن زوڵم بكەن و، ئامادەنەبن هاوكاریی ستەمكار بن و، ئامادەنەبن دەستبارگربن بۆ ستەمكار و، ئامادە نەبن مل بۆ ستەم بدەن، هیچ حوكمڕانێك ناتوانێ ستەمیان لێ بكات، وەك (مالك بن نبي)، بیرمەندە جەزائیرییەكە (رەحمەتی خوای لێ بێت) قسەیەكی جوانی هەیە لەباسی ئەوەدا، دەڵێ: هیچ گەلێك ناچەوسێنرێتەوە و داگیر ناكرێ، تاكو خۆی شایستەیی چەوسێنرانەوە و داگیركران لەخۆیدا پەیدا نەكات، "القابلیه للإستعمار"، بۆیە من پێموایە لە هیچ كۆمەڵگایەكدا زوڵم و ستەم و خراپە

نابێ، ئەگەر خەڵكەكە ئامادەییان نەبێ كە باری زاڵم بەرن و، بۆی ببنە بارەبەر و، كۆڵی زاڵم بخەنە سەر شانی خۆیان، هەر بۆیە لە قورئاندا خوا سبحانه وتعالی وەك چۆن سەرزەنشتی ئەوانە دەكات كە زوڵم دەكەن، واتە: حوكمڕان و دەسەڵاتداران، سەرزەنشتی خەڵك و كۆمەڵگایەكەش دەكات، كە دەستبارگری ستەمكاران دەبێ و، هەردووكیشیان بە زاڵم ناودەبا، لە سووڕەتی (سبأ)دا خوای پەروەردگار هەردووكیان بە زاڵم و ستەمكار ناو دەبات، وەك فەرموویەتی:

﴿ وَلَوْ تَرَىٰٓ إِذِ ٱلظَّٰلِمُونَ مَوْقُوفُونَ عِندَ رَبِّهِمْ يَرْجِعُ بَعْضُهُمْ إِلَىٰ بَعْضٍ ٱلْقَوْلَ يَقُولُ ٱلَّذِينَ ٱسْتُضْعِفُوا۟ لِلَّذِينَ ٱسْتَكْبَرُوا۟ لَوْلَآ أَنتُمْ لَكُنَّا مُؤْمِنِينَ ﴾ سبأ: ٣١

وەك دەبینین خوای دادگەر هەركام چەوسێنراوە و چەوسێنەرەكانی بەستەمكاران (الظالمون) ناوبردوە.

**دانا: ئەوەی كە زوڵمەكەی كردوە و ئەوەش كە زوڵمەكەی لێ كراوە؟!**

**مامۆستا:** بەڵێ چونكە ئەوەی زوڵمەكەی لێ كراوە،، بەبێ دەنگییەكەی ستەمكارەكەی ئازا كردوە و هانداوە كە ستەم و زوڵم بكات.

ئنجا لە سووڕەتی (الأنفال)ش دا ئەو ئایەتە زۆر جێی سەرنج و تێڕامانە، كە دەفەرموێ:

﴿ وَٱتَّقُوا۟ فِتْنَةً لَّا تُصِيبَنَّ ٱلَّذِينَ ظَلَمُوا۟ مِنكُمْ خَآصَّةً ۖ وَٱعْلَمُوٓا۟ أَنَّ ٱللَّهَ شَدِيدُ ٱلْعِقَابِ ﴿٢٥﴾ ﴾ [الأنفال: ٢٥]

واتە: لە بەڵایەك بترسێن كە بەتایبەت تووشی ستەمكارەكانتان نابێ و، بزانن كە خوا سزا و تۆڵەی توندە، واتە: تۆڵە و سزای خوا كە ڕوو دەكاتە كۆمەڵگایەك، تەنیا ئەو كۆمەڵە كە زوڵمیان كردوە ناگرێتەوە، بەڵكو ئەوانەی دیكەش دەگرێتەوە.

**دانا: كورد وتەنی تەڕو وشك پێكەوە، دەسووتێنێ!**

**مامۆستا:** تەڕو وشك پێكەوە دەسووتێنێ، بۆچی؟ چونكە هیچ فیرعەونێك لەخۆڕا نالێ: من پەروەردگارم و پەرستراوم، هەتا خەڵكێك نەبێ ئامادەیی ئەوەی هەبێ، كە پەروەردگارێتیی و پەرستراوێتییان بەسەردا بكات، هەتا خەڵكێك نەبێ كە ئامادەبن چەپڵەی بۆ لێبدەن و (بارك الله) ی بۆ بكێشن و بیپەرستن، ئەوجار دەڵێ: من پەرستراوتانم!!.

**دانا: كەواتە ئێستە هەمووومان كۆكین لەسەر ئەوەی كە بە جۆرێ لە جۆرەكان زوڵم هەیە لە هەرێمی كوردستان دا، ئنجا ئایا خەڵكی هەرێمی كوردستان ئامادەییان هەیە ئەو زوڵمەیان لێ بكرێ و قبووڵی بكەن؟**

**مامۆستا:** گومانی تێدا نیە، بەڵێ، چونكە لە ماوەی بیست و پێنجساڵی ڕابردوودا، ئەم واقیعە بووەوە ئەوەی ئێستا دەرهاویشتەی ئەوەی پێشووە و ئەو پێشەكییانەی كە پێشتر بوون، ئەم دەرەنجامەی ئێستایان لێ كەوتووەتەوە، ئەو حەقیقەتە تاڵە، ئەگەر دانی پێدا نەهێنین، خۆمان دەخەڵەتێنین، ئەوەی كە زۆرجار حوكمڕانان دەڵێن: هۆكاری ئەم قەیرانە ئەوەیە كە بەغدا بودجەی بڕیوە و، شەڕی داعش بووە و لەبەرئەوەی نەوت نرخی داشكاوە، ئەسڵ و ئەساسی نیە، چونكە نە نرخی نەوت هەر لێرە داشكاوە و، شەڕی داعشیش تەنیا لێرە بووە، ئەو قسانە هیچ نین و، لەڕاستییدا ئەوە هەمووی خۆپەڕاندنەوەیە و خۆڵ كردنە چاوی خەڵكە، نا، گرفتی ئێمە نەبوونی دادگەرییە، گرفتی ئێمە نەبوونی دامەزراوەكانە، گرفتی ئێمە قۆرخكارییە، گرفتی ئێمە دەست بەسەر بودجە و سامان و موڵك و ماڵی ئەم وڵاتەدا گرتنە، لەلایەنی چەند كەسێكی كەمەوە، لەلایەن چەند كەسێكی خاوەن دەسەڵات و، كەسانێكی مشەخۆریش كە لە خۆیان كۆكردوونەتەوە و لە پەنا خۆیاندا كردوویاننە ملیاردێر، ئنجا بەداخەوە زۆربەی خەڵكەكەش بێدەنگ و بێ هەڵوێستبووە.

**دانا: كەواتە زوڵم لەلای خوا و لای كۆمەڵگاش شوێنەواری چییەء؟ چی دروست ئەكا دوای خۆی؟**

**مامۆستا:** شوێنەواری ستەم لەدنیت و دوارۆژدا زۆر شوومە:

١- خوا سبحانه وتعالی زۆر بە كەمیی نەفرینی كردوە، بەڵام نەفرینی كردوە لە زاڵمان:

﴿ أَلَا لَعۡنَةُ ٱللَّهِ عَلَى ٱلظَّٰلِمِينَ ١٨ ﴾ [هود: ١٨]

(ألا، أداة التنبيه)ە، ئاگاداربن، یان وەك لە كوردەوارییدا دەڵێ: (ئەها)، نەفرینی خوا لە ستەمكاران، یانی ئاگاداربنەوە! هەواڵێكی گرنگ دەبیستن، چییە؟ خوا نەفرینی لە ستەمكاران كردوە، كە دیارە كەسێك زۆر زۆر خراپ نەبێ، خوا نەفرینی لێ ناكات، كەواتە: ستەمكار لەلای خوا لە ژیانی دنیادا نەفرینی لێكراوە.

٢- لە قیامەتیشدا: ﴿ وَأُتۡبِعُواْ فِي هَٰذِهِ ٱلدُّنۡيَا لَعۡنَةٗ وَيَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِۚ ﴾ [هود: ٦٠]

واتە: لەم ژیانەی دنیادا نەفرینیان شوێن خرا و لە قیامەتیش دا..

بێگومان ئەوەی لە دنیاش دا خوا لەعنەتی لێ بكات، لە ڕەحمی پێ ناكات، ئەوە بە نسبەت لای خواوە.

٣- بۆلای خەڵكیش، پێشتریش باسمكرد: لە زۆر ئایەتی قورئاندا خوا ئەو حەقیقەتەی خستووەتە ڕوو كە كۆمەڵگایەكان لە ئەنجامی زوڵمدا كاول دەبن، لە ئەنجامی زوڵمدا تێكدەچن و، سەریان بە فەتارەت دەچێ، بۆ وێنە: لە سووڕەتی (الإسراء)دا دەفەرموێ:

﴿ وَإِذَآ أَرَدۡنَآ أَن نُّهۡلِكَ قَرۡيَةً أَمَرۡنَا مُتۡرَفِيهَا فَفَسَقُواْ فِيهَا فَحَقَّ عَلَيۡهَا ٱلۡقَوۡلُ فَدَمَّرۡنَٰهَا تَدۡمِيرٗا ١٦ ﴾ [الإسراء : ١٦]

واتە: ئەگەر ویستمان ئاوەدانییەك لەبەین بەرین. ئنجا ئەگەر كەسێك بە سادەیی و سەركێلیی تەماشای قورئان بكات، دەڵێ: خوا چی دەوێ

كۆمەڵگایەكان بفەوتێنێ؟! دەڵێین: خوا سبحانه وتعالى، لێرەدا باسی یاسایەكی خۆی دەكات، واتە هەركاتێك یاسای ئێمە كە لە ژیانی بەشەردا داماننناوە، هاتەدی، یاسایەكە چییە؟ (أَمَرۡنَا مُتۡرَفِیهَا فَفَسَقُواْ فِیهَا فَحَقَّ عَلَیۡهَا ٱلۡقَوۡلُ فَدَمَّرۡنَٰهَا تَدۡمِیرٗا ) فەرمان دەكەین بە خۆشگوزەرانەكانی، ئەوانیش لادان و تاوانی تێدا دەكەن و سەرەنجام بڕیاری خوای بەسەردا دەچەسپێ و كاولی دەكەین. خۆشگوزەرانەكان كێن؟ ئەوانەن كە دەسەڵاتیان بەدەستە، ئەوانەی خێرو بێری وڵاتیان خستۆتە ژێردەستی خۆیان، خوا فەرمانیان بەچی پێ دەكات؟ خوا فەرمان ناكات بە خراپە، یانی: (أمرناهم بالطاعة) فەرمانیان پێ دەكەین بە فەرمانبەری و چاكە، (فَفَسَقُواْ فِیهَا)، بەڵام ئەوان بەپێچەوانەی ئەوەوە كە خوا فەرمانی پێ كردوون، لاڕێی دەكەن، زوڵم و ستەم دەكەن، لادان و تاوان دەكەن، سەرەنجام: (فَحَقَّ عَلَیۡهَا ٱلۡقَوۡلُ فَدَمَّرۡنَٰهَا تَدۡمِیرٗا ) فەرموودە لەسەریان دێتەدی، واتە: قانوونی خوا، قانوونی خوا كە لە ژیانی بەشەردا دایناوە، كە: )هەركاتێك فیسق و زوڵ و لادان و تاوان هەبوو، ئەو كۆمەڵگایە دەفەوتێ ) (فَدَمَّرۡنَٰهَا تَدۡمِیرٗا ) سەرەنجام ئێمە كاولی دەكەین بە كاول كردن، دیارە كاولكردن مەرج نیە دارو پەردووی بەسەر یەكدا بڕووخێ، ئەوەتا فەرموو: تەماشای لیبیا بكە، تەماشای یەمەن بكە، تەماشای عێراق بكە، تەماشای سووریا بكە، تەماشای ئەفغانستان بكە، كاول بوون چییە؟ وەختێك ژێرخان و سەرخانی وڵات دەڕمێ و خوێنێكی زۆر دەڕژێ، وڵات كاول دەبێ، هەر خوا دەزانێ بەچەند دەیە ئنجا بتوانرێ ئەوەی كە كاول كراوە، لەو هەموو شەڕو شۆڕ و وێرانكارییانەدا، بینا بكرێتەوە، مرۆچەكانیش ئەوە هیچ ڕۆیشتنءهەتا قیامەت ناگەڕێنەوە! لە ئەنجامی چی دا؟ لە ئەنجامی ئەو زوڵمەی كە كاتی خۆی سەدام كردی، عێراق كاول بوو، لە ئەنجامی ئەو زوڵمەی بەشار ئەسەد كردی، ئەوەتا سووریا بەسەر خۆی و بەسەر میلەتەكەشیدا وێران بوو، لە ئەنجامی ئەو زوڵمەی عەلی عەبدوڵڵا ساڵح كردی لە یەمەن، زەینەلعابدین بن عەلی لە توونس، حوسنی موبارە لە میصر، موعەممەر قەززافیی لە لیبیا، پێتوایە میصرش هێندە وەزعی باشە! سیسی كەس بە حاڵی نەبێ، هەرچەندە لە هەموو لاڕا دەستیان پێوەگرتوە وەك شێرە بەفرینە، بۆ ئەوەی ڕایبگرن، چونكە كودەتایان پێكردوە، بۆ ئەوەی ڕایبگرن،

هەندێك لە دەوڵەتۆكەی كەنداو و هەندێك لە زلهێزان دەستیان پێوەگرتوە، چونكە دەزانن بەدیلەكەی هەر ئەو ئیسلامییە مەزڵوومانەن كە لە سجنەكاندا بێنەدەرێ و، ئەو رەوایەتییەی كە خەڵك پێیدابوون، ممارەسەی بكەن، بۆیە هەموویان دەستیان پێوەگرتوە، بەڵام تا كوێیە؟ (ئیش بە پینەو پەڕۆ هەر دەگاتە نیوەڕۆ)! مەبەستم ئەوەیە وەك خوا فەرموویەتی: كاتێك دەستەڵاتدارە خۆشگوزەران و خۆسەپێنەكان خراپە دەكەن، وڵاتەكە كاول دەبێ.

**دانا: مامۆستا! لە سایەی ستەمدا ستەمكاران چی دەكەن، پچیان بۆ فەراهەم دێ؟**

**مامۆستا:** ستەم لە دوو شتی سەرەكیی دا بەرجەستە دەبێت:

**یەكەم:** قۆرخكردنی دەسەڵاتی سیاسی.

**دووەم:** قۆرخكردنی نازو نیعمەت و لایەنی ئابووریی، هەربۆیەش خوا سبحانه وتعالى دوو ناوونیشانی داناون بۆ دوژمنانی پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام):

**١**- (المستكبرین) خۆبەزلگران، كە خۆیان لە ئاستی خەڵكی دیكە بەزلتر دەگرن، ئێمە جیاین، ئێمە دەبێ لەسەرێ بین، تۆ دەبێ لە خوارێ بی، من دەبێ سەردەست بم، تۆ دەبێ بندەست و ژێردەست بی، من دەبێ ئاغا بم، ئەتۆ دەبێ نۆكەر بی، (مستكبرین) ئەوانەی ئەو هەوایەیان لەكەللەدایە كە جیان لە خەڵك، (مستكبرین) ئەوانەن كە دەسەڵاتی سیاسی بۆ خۆیان قۆرخ دەكەن و، خەڵك بە چاوی كۆیلە و خزمەتكار و بندەست تەماشا دەكەن.

**٢**-ئەوەی دیكە (مترفین) خۆشگوزەرانان و (مسرفین) زیادەڕۆییكەران، بەڵگەش لەسەر ئەوە كە ئەو دوو ناوونیشانە، دوو ناوونیشانی گشتی ستەمكارانن، ئەوانەی بوونەتە لەمپەری رێی پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام)، ئەوەیە كە خوا سبحانه وتعالى لە قورئان دا زۆرجار وشەی (استكبار) و (مستكبرین) و (متكبرین) بۆ ناحەزانی پێغەمبەران بەكاردێنێ، بۆ وێنە: لە سوورەتی (الأعراف) لە بەسەرهاتی شوعەیب لەگەڵ گەلەكەی مەدینەدا، دەفەرموێ:

﴿ قَالَ ٱلْمَلَأُ ٱلَّذِينَ ٱسْتَكْبَرُوا۟ مِن قَوْمِهِۦ لَنُخْرِجَنَّكَ يَٰشُعَيْبُ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ مَعَكَ مِن قَرْيَتِنَآ أَوْ لَتَعُودُنَّ فِى مِلَّتِنَا ۚ قَالَ أَوَلَوْ كُنَّا كَٰرِهِينَ ﴿٨٨﴾ ﴾ [الأعراف : ٨٨]

واته: دەسترۆیشتووانێكی كه خۆیان به زل دەگرت لەگەڵەكەی، گوتیان: ئەی شوعەیب! خۆت و ئەوانەی ئیمانیان به تۆ هێناوه، دەرت دەكەین له ئاوەدانی خۆمان یان دەگەڕێنەوه سەر ڕێبازی ئێمه. خۆشگوزەرانان (مترفين) له سوورەتی (سبأ)دا دەفەرموێ:

﴿ وَمَآ أَرْسَلْنَا فِى قَرْيَةٍ مِّن نَّذِيرٍ إِلَّا قَالَ مُتْرَفُوهَآ إِنَّا بِمَآ أُرْسِلْتُم بِهِۦ كَٰفِرُونَ ﴿٣٤﴾ ﴾ [سبأ: ٣٤]

واته: هیچ پێغەمبەرێكمان له هیچ ئاوەدانییەك دا نەناردوه، مەگەر خۆشگوزەرانەكانی گوتوویانه: ئێمه بەوەی ئێوه پێی ڕەوانەكراون، بێ بڕواین.

هەمیشه چینی خۆشگوزەرانی حەرامخۆر، ئەوانەی شەپ و گوپ لێدەدەن لەسەر حسابی خەڵكی ڕەش و ڕووت، ئەوانەی كه مشەخۆرن له پەنای چینه سیاسییەكەدا، چینه خۆسەپێنەكەدا، ئەوان دەسەڵاتی سیاسییان قۆرخكردوه، ئەوانیش دەسەڵاتی ئابووریی قۆرخ دەكەن، بۆیه من له زۆر له كتێبەكانی خۆمدا باسی ئەو سێیانەم كردوه:

١- (فیرعەون) ڕەمزی ئیستیبداد و قۆرخكردنی دەسەڵاتی سیاسییه.

٢- (قارِوون) ڕەمزی چەوساندنەوەی ئابوورییه.

٣- (هامان) ڕەمزی چەواشەكاریی ئیعلامیی و ڕاگەیاندنه، ئەو سێكوچكه شوومه، یانی: قۆرخكردنی دەسەڵاتی سیاسیی و، قۆرخكردنی ئابووریی و قۆرخكردنی ڕاگەیاندن بۆ چەواشەكردنی خەڵك، هەمیشه بەدەستی نەیارانی پێغەمبەرانەوه (علیهم الصلاة والسلام)بوون، ئەدی پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) و شوێنكەواتووانیشیان چییان بەدەستەوه بووه؟! بەدەستی خاڵیی و داكۆكییان لەسەر هۆشیاركردنەوەی عەقڵی خەڵك و بێداركردنەوەی دڵی خەڵك

كردوه، ئەوەی نەیارەكانیان جەختیان لەسەر چی كردووەتەوە و تەركیزیان لەسەر چی بووە؟ لەسەر خاڵە بێ هێزەكانی مرۆڤ:

أ- ترساندنی خەڵك بە دەسەڵاتی سیاسی.

ب- تەماع وەبەرنانی خەڵك بە هۆی قۆرخكردنی لایەنی ئابووریی.

ج- چەواشەكردنی خەڵك بەهۆی دەستبەسەردا گرتنی ڕاگەیاندن، پێغەمبەرانیش (علیهم الصلاة والسلام) تەركیزیان لەسەر دوو پێكهاتە بەهێزەكەی مرۆڤ بووە، كە مرۆڤ بەو دووانە مرۆڤە:

١- عەقڵ

٢- دڵ، وەك مەحوی دەڵێ:"سەر كە هۆشێكی نەبێ زڕگە تاڵم بۆ چییە دڵ كە جۆشێكی نەبێ شیشەی بەتاڵم بۆ چییە"، ئینسان بە عەقڵ و دڵ مرۆڤە، پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) تەركیزیان لەسەر ئەوەبووە خەڵك هۆشیار بێ و، دڵیشی بێدار بێ، ئەگەر خەڵك هۆشیار بوو، دنیای وەكوخۆی بینی و، دڵیشی بێدار بوو، دڵی بە خواوە پەیوەست بوو، ئەو كاتە مل كەچ ناكات بۆ غەیری خوا و، باری ستەمكاران نابات و، بە خۆی ڕەوا نابینێ كە بێجگە لە خوا، ئەو سەرەی كە بۆ خوای دادەنەوێنێ بۆ كەسی دیكەی دابنەوێنێ!!.

**دانا: مامۆستا! وەك لە ئاڵقەی پێشوودا لە باسی دادگەریی دا ئاماژەیەكت پێ كرد، حەزدەكەم لێرە ڕوونتر قسەی لەسەر بكەین، خوای گەورە زۆرجار لە قورئاندا ڕێی داوە بەوە كە كێ باوەڕ ئەهێنێ كێ باوەڕ ناهێنێ، بەڵام هەرگیز ڕێی نەداوە بە زوڵم و ستەمكاریی، بۆ؟**

**مامۆستا:** لەبەرئەوەی لە ئەنجامی ستەمدا كۆمەڵگا تێكدەچێت، خەڵك بە كوفر و ئیمان پێكەوە دەژی، بەڵام زاڵم و مەزڵووم پێكەوە ناژین، زاڵم نایێڵێ مەزڵووم ژیانی هەبێ، مەزڵووم لەبەین دەبات، دەیپڵیشێنێتەوە، نابوودی دەكات، بەڵام كافر و موسوڵمان دەتوانن پێكەوە بژین، بۆیە لە سوڕەتی (الكهف) ئایەتی ژمارە (٢٩)دا دەفەرموێ:

﴿ وَقُلِ ٱلۡحَقُّ مِن رَّبِّكُمۡۖ فَمَن شَآءَ فَلۡيُؤۡمِن وَمَن شَآءَ فَلۡيَكۡفُرۡۚ ﴾ [الكهف : ٢٩]

واته‌: بڵێ حه‌ق له‌لایه‌ن په‌روه‌ردگارتانه‌وه‌یه‌، كێ پێیخۆشه‌ با ئیمان بێنێ و كێ حه‌زده‌كات با بێ بڕوا بێت.

به‌ڵێ به‌ كوفر و ئیمانه‌وه‌ خه‌ڵك پێكه‌وه‌ ده‌ژین، به‌ڵگه‌شمان واقیعی ئه‌و هه‌موو كۆمه‌ڵگایانه‌ی به‌شه‌ره‌. ئنجا له‌ هه‌موو قورئاندا ئایه‌تێك نیه‌ بفه‌رموێ: (فمن شاء فليظلم ومن شاء فليعدل) شتی وانیه‌، هه‌میشه‌ زوڵم قه‌ده‌غه‌یه‌ ڕێ پێ نه‌دراوه‌، چونكه‌ به‌ زوڵم كۆمه‌ڵگا تێكده‌چێ، شیرازه‌ی كۆمه‌ڵگا تێكده‌چێ، زوڵم بریتیه‌ له‌ ده‌ستدرێژیی كردن بۆ سه‌ر مافه‌كانی ئه‌وانی دیكه‌، به‌ڵام كوفر بریتیی ده‌سترێژیی نیه‌ بۆ سه‌ر ئه‌وانی دیكه‌، ئنجا خوای په‌روه‌ردگار ئینسانی له‌م سه‌رزه‌وییه‌ داناوه‌، تاقیی بكاته‌وه‌، ئنجا چۆن تاقیی ده‌كرێته‌وه‌، ئه‌گه‌ر ڕێی نه‌بێ داخۆ بڕوا دێنێ یان نا؟ به‌ندایه‌تیی بۆ خوا ده‌كات یان نایكات؟ چاكه‌ ده‌كات یان خراپه‌ ده‌كات؟ بۆیه‌ له‌و ڕووه‌وه‌ له‌ شه‌ریعه‌ت دا مرۆڤ ئیختیاری له‌به‌رده‌ستدایه‌، سه‌رپشكه‌ و ده‌ستی كراوه‌یه‌، به‌ڵام ئایا ڕێپێدراوه‌ ده‌ستدرێژیی بكاته‌ سه‌ر ئه‌وانی دیكه‌، نه‌خێر، چونكه‌ هه‌میشه‌ به‌ زوڵم شیرازه‌ی كۆمه‌ڵگا تێكده‌چێ، هاوسه‌نگیی كۆمه‌ڵگا تێكده‌چێ، هه‌ربۆیه‌ش زانایانی ئیسلام بنچینه‌یه‌كی جوانیان داناوه‌ گوتوویانه‌: (قد يدوم الملك مع الكفر ولا يدوم مع الظلم)، حوكمڕانیی له‌گه‌ڵ كوفردا به‌رده‌وام ده‌بێ، به‌ڵام له‌گه‌ڵ زوڵمدا به‌رده‌وام نابێ، ئه‌وه‌ و هه‌موو وڵاتانه‌ی دنیا: ڕۆژهه‌ڵات، ڕۆژئاوا، كافرستانن و به‌رده‌وامیشن، ئه‌وه‌ش وڵاتانی موسڵماننشینن، ماوه‌ ماوه‌ ئینقیلاب ده‌كرێ و كابرا هه‌ڵده‌گێڕنه‌وه‌ و له‌ كورسییه‌كه‌ی ده‌هێننه‌ خوارێ، به‌زم و ڕه‌زم و خوێنڕێژییه‌كی زۆر له‌ ئه‌نجامی زوڵمدا، بۆیه‌ زانایانی ئیسلام جوانیان گوتوه‌: موڵك و ده‌سه‌ڵات و حوكمڕانیی به‌ كوفره‌وه‌ به‌رده‌وام ده‌بێ، به‌ڵام به‌ زوڵمه‌وه‌ به‌رده‌وام نابێ، هه‌ربۆیه‌ زوڵم هیچ بوارێكی نه‌دراوه‌ له‌ ئیسلامدا، چ زوڵمی شه‌خصیی چ زوڵمی به‌كۆمه‌ڵ، چ زوڵم له‌ لایه‌ن ده‌سه‌ڵات و حوكمڕانه‌وه‌، كه‌ ئه‌وه‌ دیاره‌ زه‌ره‌ری زیاتره‌ بۆ هه‌موو لایه‌ك، چ زوڵمێك كه‌ كه‌سێك زوڵم له‌ خۆی

دەكات، ئەوە دیارە زیانەكەی هەر بۆ خۆیەتی، بەڵام ئەوەش هەر مەمنووعە، بەڵام ئەوەی كە زوڵم دەكات و میللەت و كۆمەڵگایەك لەگەڵی باج دەدا، ئەوە دەبێ زۆرمان ئاگا لێ بێ و، بە هەموومان دژی بوەستین، چونكە ئەگەر ئەو زوڵم بكات، هەموومان باجەكەی دەدەین.

**دانا: ویستم ئەوە بپرسم، لە سەرەتای بەرنامەكەدا لە پێناسەی زوڵمدا فەرمووت: هەر تاوانێ زوڵمە، جیاوازیی چییە لە نێوان ئەوەدا كە تاكێك زوڵم لە خۆی بكات، یانی زوڵمەكە لە نێوان خۆی و خوای پەروەردگاردا بێ، لەگەڵ ئەوەی زوڵم لە تاكەكەی هاوسێی بكات، یان دەستەیەك لە دەستەیەكی تر، یان حوكمڕانەكان لە میللەتەكەی خۆیان، جیاوازیی چییە؟**

**مامۆستا:** زوڵم بێگومان هەمووی هەر گوناحە، هەمووی هەر تاوانە سزای لەسەرە، بەڵام وەختێك كەسێك زوڵم لە خۆی دەكات، ئەوە تەنیا خۆی باجەكەی دەدات، زوڵم لێرەدا بە مانای گوناح و تاوان، نەك بەو واتایەی كە گوتم: زوڵم دەبێ هەموو شێوەكانی ڕێیان لێ بگیرێ، واتە هەموو شێوەكانی كە پەیوەندییان بە خەڵكەوە هەیە، ئەگەرنا كەسێك كە لە زاتی خۆیدا ولم لە خۆی دەكات، كوفری كردوە، شیركیكردوە، نیفاقی كردوە، ئەوە خوای پەروەردگار ڕێگای داوە، هەڵبەتە پێی ناخۆشە و قەدەغەی كردوە، حەڕامی كردوە، چونكە گەورەترین زوڵم شیركە:

﴿ إِنَّ ٱلشِّرۡكَ لَظُلۡمٌ عَظِيمٞ ﴾ [لقمان : ١٣]

هەروەها كوفر زوڵمە: ﴿ وَٱلۡكَٰفِرُونَ هُمُ ٱلظَّٰلِمُونَ ﴾ [البقرة : ٢٥٤]

گەورەترین زوڵم كە ئینسان لە خۆی دەیكات، بریتیە لە شیرك، بریتییە لە كوفر، لە نیفاق، بەڵام خوای پەروەردگار بۆیە بواری پێیان داوە، چونكە وانەبێ مرۆڤ تاقی ناكرێتەوە، ئەمما وەختێ كە زوڵم لەوی دیكە دەكرێ، ئەوە تۆ لە سنووری خۆت چوویە دەرێ، چونكە تۆ خۆتت بەدەستە، ئنجا مومارەسەكردنی ئازادیی خۆت و بەرجەستەكردنی ئیرادەی ئازادانەی خۆت پەكی لەسەر ئەوە

نه‌كه‌وتوه‌ زوڵم له‌ خه‌ڵكی دیكه‌ بكه‌ی، به‌ڵام بۆ خۆت دیاره‌ ده‌بێ مه‌جالت هه‌بێ: بڕوا به‌ خوا دێنی، یان بڕوای پێ ناهێنی، ئه‌و شته‌ی كه‌خوا به‌چاكی داناوه‌، ئه‌نجامی ده‌ده‌ی یان ئه‌نجامی ناده‌ی، به‌ڵام كه‌ له‌ بازنه‌ی خۆت ده‌چیه‌ ده‌ر، ده‌چی بۆ بازنه‌ی ئه‌وانی دیكه‌، ئه‌وه‌ ئازادیی تۆ له‌و شوێنه‌ كۆتایی دێ كه‌ ئازادیی خه‌ڵكی دیكه‌ ده‌ست پێده‌كات، بۆیه‌ ده‌بێ له‌وێ بوه‌ستی، بۆیه‌ش ده‌سه‌ڵاتی ئیسلامیی لێره‌دا ته‌ده‌خخول ده‌كات، ده‌سه‌ڵاتی ئیسلامیی له‌و شوێنه‌ دێته‌ نێو، كه‌ كه‌سێك ده‌یه‌وێ بپه‌ڕێته‌وه‌ له‌ به‌ری خۆی بۆ به‌ری خه‌ڵكی دیكه‌ و سنووره‌كان ببه‌زێنێ.

**دانا: كه‌وابێ ئه‌و سته‌م و زوڵمه‌ی كه‌ بۆ سه‌ر سنووری تاكه‌كانی ده‌وروبه‌ر و به‌رامبه‌ره‌، شوێنه‌واره‌كانی خراپتره‌ بۆیه‌ ئه‌بێ ڕێی لێ بگیرێ؟**

**مامۆستا:** وه‌ك عه‌رزم كردی: گه‌وره‌ترین زوڵم، له‌ دوای شیرك و كوفر و نیفاق، به‌ نسبه‌ت مومارەسه‌ی نێوان به‌نده‌كان خۆیانه‌وه‌، بریتییه‌ له‌ زوڵمی حوكمڕان، زوڵمی كه‌سێكی باڵاده‌ست، كه‌سێك كه‌ ده‌سته‌ڵاتی هه‌یه‌، چونكه‌ ئه‌و كه‌ زوڵم ده‌كات، وه‌ك خوای دادگه‌ر ده‌فه‌رموێ:

﴿ وَٱتَّقُوا۟ فِتْنَةً لَّا تُصِيبَنَّ ٱلَّذِينَ ظَلَمُوا۟ مِنكُمْ خَآصَّةً ﴾ [الأنفال : ٢٥]

وشه‌ی: (ظَلَمُوا۟) لێره‌دا مه‌به‌ست پێی چینی ده‌سه‌ڵاتداره‌، چینی سیاسییه‌، چینی حوكمڕان، زوڵمه‌كه‌ی ئه‌وان هه‌موو كه‌س ده‌گرێته‌وه‌، ئه‌گه‌رنا كه‌سێك له‌ ماڵی خۆی دا شه‌ڕاب ده‌خواته‌وه‌، زینا ده‌كات، قومار ده‌كات، زیانه‌كه‌ی به‌س بۆ خۆیه‌تی[1]، یان كافره‌، موشریكه‌، زیانه‌كه‌ی به‌س بۆ خۆیه‌تی، به‌ڵام كه‌سێك كه‌ حوكمڕانه‌ و موڵك‌ماڵی خه‌ڵكی له‌به‌رده‌سته‌، كاتێك زوڵم ده‌كات، خه‌ڵكه‌كه‌، هه‌موویان باجه‌كه‌ی له‌گه‌ڵ ده‌ده‌ن، له‌به‌رئه‌وه‌ پێویسته‌ هه‌موو خه‌ڵك له‌ به‌رانبه‌ری دا بوه‌ستن و یه‌كده‌ست بن نه‌یه‌ڵن زوڵم بكات.

---

(١) به‌ڵام ئه‌وه‌ له‌حاڵێك دا په‌نهان بێ و پێی نه‌زانرێ، ئه‌گه‌رنا، زیانی بۆ خه‌ڵك و ده‌وروبه‌ریشی هه‌یه‌ و سزادانیشی به‌دوادادێ.(

ڕۆژێك ئه‌بووبه‌كر ڕخى الله عنه چووه سه‌ر مینبه‌ری پێغه‌مبه‌ر (علیه الصلاة والسلام) گوتی: ئه‌ی خه‌ڵكینه! ئێوه ئایه‌تێك ده‌خوێننه‌وه، به‌ڵام به هه‌ڵه لێی تێده‌گه‌ن، ئه‌ویش ئه‌و ئایه‌ته‌ی سووره‌تی (المائدة)یه كه ده‌فه‌رموێ:

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ عَلَيۡكُمۡ أَنفُسَكُمۡۖ لَا يَضُرُّكُم مَّن ضَلَّ إِذَا ٱهۡتَدَيۡتُمۡۚ إِلَى ٱللَّهِ مَرۡجِعُكُمۡ جَمِيعٗا فَيُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمۡ تَعۡمَلُونَ ١٠٥ ﴾ [المائدة: ١٠٥]

(ئه‌ی ئیماندارینه! وریای خۆتان بن، ئه‌گه‌ر ئێوه ڕێی ڕاست بگرن، ئه‌وانه‌ی گومڕابوون زیانتان لێ نادەن، ته‌نیا بۆ لای خوا ده‌گێڕدرێنه‌وه و هه‌واڵتان پێ ده‌دا به‌وه‌ی كه ده‌تانكرد) ئه‌بوبه‌كر گوتی: به‌ڵام من گوێم له پێغه‌مبه‌ری خوا (علیه الصلاة والسلام) بووه، كه ده‌یفه‌رموو: (إن الناس اذا رأوا الظالم يأخذوا على يديه أوشك أن يعمّهم بعقابٍ ثم يدعونه فلا يستجيب لهم) رواه أبوداود (هه‌ركاتێك خه‌ڵك سته‌مكاری بینی ده‌ستیان نه‌گرت، نزیكه خوا به‌ڵایه‌كیان بۆ بنێرێ، دوایی هه‌رچه‌نده بپاڕێنه‌وه وه‌ڵامیان نه‌داته‌وه) كه‌واته به‌ڵایه‌كه بۆ هه‌موویان ده‌نێرێ، چونكه ئه‌و ئایه‌ته ئه‌گه‌ر به سه‌ركێڵیی ته‌ماشای بكه‌ی، وای لێوه‌رده‌گیرێ كه تۆ بۆخۆت مسوڵمان به‌و هه‌ركه‌سێك خراپ بێ، زیانی بۆ تۆ نیه، به‌ڵام ئه‌بوبه‌كر ڕه‌زای خوای لێ بێت ویستی بۆیان ڕاست بكاته‌وه، گوتی: نا، ئه‌وه به موتڵه‌قیی وا نیه، ئه‌گه‌ر خه‌ڵك سته‌مكاری بینی و، ده‌ستیان نه‌گرت له‌و سته‌مكردنه و، نه‌بوونه له‌مپه‌ر و كۆسپ له‌به‌رده‌م سته‌مه‌كه‌یدا، نیزیكه خوا به‌ڵایه‌كیان بۆ بنێرێ، دوایی هه‌رچه‌نده دوعا بكه‌ن، خوا وه‌ڵامیان ناداته‌وه، بۆچی؟ چونكه ئه‌وان پێشتر به قسه‌ی خوایان نه‌كردوه، كه ده‌ستی زاڵم بگرن، بۆیه خوای په‌روه‌ردگاریش ئێستا ئیحتیرامیان ناگرێ، وه‌ڵامی دوعاكانیان بداته‌وه!

**دانا: كه‌واته ئه‌وه ڕاست نیه ده‌ست به كڵاوی خۆمانه‌وه بگرین با نه‌یبات؟**

**مامۆستا:** بێگومان، من زۆرجار گوتوومه: هه‌ندێك په‌ندی كوردی هه‌ن، یان ده‌بێ هه‌ر لایانبه‌رین، یان ده‌بێ ڕاستكردنه‌وه‌یان تێدا بكه‌ین، (ده‌ست به كڵاوی خۆته‌وه بگره با نه‌یبات) من ده‌ڵێم: ئه‌وه ئینسانێكی زۆر خۆپه‌رست ئه‌وه‌ی

گوتوه، هەرچەندە جەنابت - كاك زانا - كڵاوت لەسەر نیە، بەڵام ئەگەر كڵاوت لەسەر بێ، ئەو بایەی كە كڵاوی سەری تۆ دەڕفێنێ، دوایی كڵاوی سەری منیش دەڕفێنێ، یان: (ئاگرە سوورە لە خۆم دوورە) كە ئەم پەندە كوردییە لە دوو لاوە هەڵەیە:

١-ئەو ئاگرە سوورەی برایەكەم دەسووتێنێ، خوشكەكەم دەسووتێنێ، هاووڵاتییەكەم دەسووتێنێ، دەبێ من هەست بە ئازاری ئەو بكەم، كە ئەو سووتاوە، منیش سووتاوم، ئەوە یەك.

٢- پاشان كە ئەمڕۆ ئەو بسووتێنێ، سبەینێ تۆش دەسووتێنێ، یان: (كەس ناچێتە قەبری كەس) ڕاستە كەس ناچێتە قەبری كەس، بەڵام ئایا ئێمە بە هۆی هەڵەی یەكدییەوە سزابار نابین؟ لەبەرچاوی تۆ زوڵم لە كەسێك دەكرێ، كەسێك زوڵم دەكات، تۆش دەتوانی هەر بە دوو وشە لەو زوڵمە بیپرینگێنیەوە، بیسەڵمینیەوە، ئایا ئەگەر بێهەڵوێست و دوایی تۆش بەشداری زوڵمەكەی نابی؟ با، بە دەقی ئایەت: خوا لە سوورەتی (العنكبوت)دا دەفەرموێ:

﴿ وَلَيَحۡمِلُنَّ أَثۡقَالَهُمۡ وَأَثۡقَالٗا مَّعَ أَثۡقَالِهِمۡۖ ﴾ [العنكبوت: ١٣]

واتە: گوناحە قورسەكانی خۆیان هەڵدەگرن و لەگەڵ بارە قورسەكەی خۆیان باری ئەوانی دیكەش هەڵدەگرن، ئەوانەی كە گومڕایان كردوون، یا ئەوانەی كە شانیان بۆ شلكردوون و كەلەكەیان بۆ قوڵكردوون، كە لەپەنای ئەواندا زوڵم بكرێ و تێیانەوە ڕاماون، لە زوڵم و گوناحی ئەواندا شەریكن.

**دانا: زۆر باشە، دەپرسم دەبێت ڕۆڵی خەڵك و جەماوەر لە بەرامبەر زوڵم و ستەمدا چی بێت؟ ئەركی سەرشانیان چییە؟!**

**مامۆستا:**

**یەكەم:** پێش هەموو شتێك دەبێ ئەو ڕاستییە بزانین كە ستەم و، پێشێلكردنی مافی ئەوانی دیكە و، زەوتكردنی مافی ئەوانی دیكە و، پڵیشاندنەوەی ئیرادەی ئەوانی دیكە، كە لێرەدا مەبەستمان پێی ئەو جۆرە زوڵمەیە، ئەوە تەنیا

بۆ ئەوانەی كە پێی هەڵدەستن، بۆ ستەمكارەكان، تاوان نیە، بەڵكو تاوانە بۆ ئەوانەش كە دەرەقیان دەكرێ، وەك پێشتر ئایەتەكەم هێنایەوە لە سوورەتی (الأنفال)دا:

﴿ وَٱتَّقُواْ فِتۡنَةً لَّا تُصِيبَنَّ ٱلَّذِينَ ظَلَمُواْ مِنكُمۡ خَآصَّةٗۖ وَٱعۡلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ شَدِيدُ ٱلۡعِقَابِ ٢٥ ﴾ [الأنفال: ٢٥]

واتە: لە بەڵایەك بترسێن كە بەتایبەت تووشی ئەوانەتان نایەت، كە ستەمیان كردوە، دوایی كە دەفەرمویَ: (وَٱعۡلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ شَدِيدُ ٱلۡعِقَابِ ) بشزانن كە خوا تۆڵە و سزای توندە، واتە: بۆ ئێوەش كە لەو زوڵمەوە ڕاماوون.

پاشان خوا لە سوورەتی (هود)دا دەفەرمویَ: ﴿ وَلَا تَرۡكَنُوٓاْ إِلَى ٱلَّذِينَ ظَلَمُواْ فَتَمَسَّكُمُ ٱلنَّارُ وَمَا لَكُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ مِنۡ أَوۡلِيَآءَ ثُمَّ لَا تُنصَرُونَ ١١٣ ﴾ [هود : ١١٣]

( وَلَا تَرۡكَنُوٓاْ ) دەڵێ: (رَكَن إليه، أي: اعتمد عليه) وەك من لە تەفسیری سوورەتی (هود)دا جوان ئەوەم شیكردووەتەوە، چونكە هەندێك گوتوویانە (ركن اليه أي: مالَ)، بەڵام لە ڕاستییدا (ركن إليه) (رُكْنْ) واتە گۆشە، گۆشە لەبەرئەوەی باش خانوو، ڕادەگرێ، خەڵك بەردی باش لە گۆشەدا دادەنێ و پایەكان لە گۆشەدا دادەنرێن، (ركن اليه)، یانی: (اعتمد عليه)، پشتی پێبەست، خوا دەفەرمویَ: ئیعتیماد مەخەنە سەر ستەمكاران، پشتیان پێ مەبەستن، پاڵیان پێوە مەدەن، لێیان نزیك مەبن، بۆ؟ (فَتَمَسَّكُمُ ٱلنَّارُ ) دەنا ئاگرتان تووش دێ، ئنجا هەموو توێژەرەوانی قورئان دەڵێن: مەبەست پێی ئاگری قیامەتە، بەڵام من دەڵێم: بە تەئكید وایە، بەڵام ئاگری دنیاش دەگرێتەوە، چونكە ڕۆژێك هەردێ ئەو ستەمكارە لە ئاگری زوڵمەكەی خۆیدا بسووتێ، ئنجا هەركەسێك لەگەڵیدا بێ، ئەویش لەگەڵی لە ئاگرەكەی دا دەسووتێ! زۆرت نەبینیون ئەوانەی كە دەست و پێوەندی ئەو ستەمكارانە بوون، لەگەڵ ئەواندا حەشر دەكرێن، هەر لە دنیاشدا لەگەڵ ئەواندا سزا دەدرێن.

**دووەم:** ڕاستیی دووەم كە دەبێ خەڵك و جەماوەر بیزانێئەوەیە كە كەسێك ڕەنگە تۆزێك پارەیەكی حەرام، ئیمتیازێكی حەرام، دەستكەوتێكی حەرامی لەو زاڵمە دەستكەوتبێ، دەبێ بزانێت كە ئەو پارەیە ئەو دەستكەوتە، ئەو ئیمتیازەی لا حەرامە، جاری وایە كەسێك دێ بۆ لای من دەڵێ: لەگەڵ فڵان حیزبم و كاتی خۆشی چەكداری ڕژێم بووم و ئێستا سێ جار زەوییم وەرگرتوە، دراوسێیەكیشم هەیە پێشمەرگەی دێرینە و تا ئێستا ئەرزەی پێنەدراوە!

ئنجا برادەر! تۆ كە دەزانی ئەوە زوڵمە، بۆچی وەریدەگری، پێتوایە وەك بەرزەكی بانان بۆی دەردەچێ و، زوڵم و ستەمەكەت تەنیا دەچێتە ئەستۆی ئەو كەسەی، كە زەوییەكەی بە زوڵم دابەشكردوە، ئەدی ناچێتە ئەستۆی ئەو كەسەشەوە، كە دەشزانێ زوڵمە و زەوییەكەش وەردەگرێ و دوو جار و سێ جار؟ یان مووچەی بندیوار و ئیمتیازای ناشەرعیی! بێگومان دەچێتە ئەستۆی ئەویشەوە، چونكە بەهۆی ئەو خەڵكەوە، ئەو ستەمكارە دەتوانێ ئەو ستەمە بكات، یان كە لە هەڵبژاردندا تەزویر دەكرێ، فرت و فێڵ و گزیی كاریی دەكرێ، بە هۆی كێوە دەیكەن؟ ئایا ئەو حیزبەی تەزویر دەكات، هەمووی بۆ خۆی دێ، سەرۆكی حیزبەكە بۆخۆی تەزویرەكە دەكا؟ بەرپرسی گەورەی ئەو حزبانە هاتوە بۆ لام، گوتوویەتی: ئێمە هەروا تاك تاك تەزویر ناكەین.

گوتم: ئەدی چۆن دەیكەن؟

گوتی: بە لۆری دەیكەین.

گوتم: چۆن؟

گوتی: من لەوێ بووم، یەك لۆری صندووقیان هێنا صندووقی بەتاڵ، گوتم: ئەوە چییە؟ هی چ گەڕەكێكە؟ گوتیان: هی هیچ گەڕەكێك نیە، تۆ حەقت نەبێ، دوایی تەحقیقم كرد گوتیان: ئەوە هەمووی صندووقی بەتاڵە و، تازە پڕی دەكەنەوە، ئیدی ئەو صندوقانەمان پڕكردنەوە و سەرژمێرمان كرد، هەر گەڕەكە چەندی بەردەكەوێ؟پاشان صندووقەكانی دیكەمان هەموویان لەبەین بردن، گوتی: ئێمە بە لۆری تەزویر دەكەین!!

دەی باشه تۆ به لۆری تەزویر دەكەی، خۆ هەر سەرۆك حیزبەكه نیه، ئەدی ئەوانەی لەوێن، ئەو هەموو خەڵكه دانیشتوون تەزویری بۆ دەكەن، هەمووی وەك ئەویدیكه گوناهباره، بۆیه له سووڕەتی (الأعراف)دا خوای پەروەردگار مەشهەدێكمان دەخاته پێش چاو، زۆر جێی سەرنجه، كه دەفەرموێ:

﴿ إِذَا ادَّارَكُوا فِيهَا جَمِيعًا ﴾ [الأعراف : ٣٨]

واته: هەتا كاتێك له دۆزەخدا هەموویان كۆكرانەوه.

﴿ قَالَتْ أُخْرَاهُمْ لِأُولَاهُمْ رَبَّنَا هَٰؤُلَاءِ أَضَلُّونَا فَآتِهِمْ عَذَابًا ضِعْفًا مِّنَ النَّارِ ﴾

[الأعراف : ٣٨]

واته: ئەوانەی كه شوێنكەوته بوون، (قَالَتْ أُخْرَاهُمْ) واته ئەوەی له دواوه بوون، شوێنكەوتەبوون، بەوانەیان گوت كه پەیڕەویی لێكراو بوون، سەركرده بوون، پێشڕەو بوون: پەروەردگارمان ئەوانه ئێمەیان گومڕا كرد، با عەزابی ئەوان دووقات بێ، بۆیان دووقاتكەوه، خوا دەفەرموێ چی؟ دەفەرموێ:

﴿ قَالَ لِكُلٍّ ضِعْفٌ وَلَٰكِن لَّا تَعْلَمُونَ ﴿٣٨﴾ ﴾ [الأعراف : ٣٨]

خوا فەرمووی: بۆ هەركامتان سزای دووقات هەیه، بەڵام نازانن، ﴿ وَقَالَتْ أُولَاهُمْ لِأُخْرَاهُمْ فَمَا كَانَ لَكُمْ عَلَيْنَا مِن فَضْلٍ فَذُوقُوا الْعَذَابَ بِمَا كُنتُمْ تَكْسِبُونَ ﴿٣٩﴾ ﴾ [الأعراف : ٣٩]

ئەوانەی یەكەمەكان كه لەپێشەوەن، سەركردەكان به دواكەوتووەكانی خۆیانیان گوت: ئێوه هیچ فەزڵتان بەسەر ئێمەدا نیه، ئێوەش هەر دووقات عەزاب دەدرێن، وەك ئێمه.

ئنجا من له تەفسیری سووڕەتی (الأعراف)دا كه بەرگی شەشەمی تەفسیرەكەمه، باسمكردوه، كه له حەوت هەشت شوێنی قورئاندا ئەو بابەته هاتوه، ئەو مشتومڕەی نێوان زاڵم و مەزڵووم، نێوان شوێنكەوتوان و سەركردان

باسمكردووە: باشە ئەوە ستەمكارەكە ئەوەی كە لە پێشەوەیە، سەركردەكە، دووقات سزا دەدرێ، لەجیاتی خۆشی، لەجیاتی ئەوانەش كە هەڵیخەڵەتاندوون، ئەدی ئەوانیدیكە بۆچی دووجار سزا دەدرێن؟ وەڵام: ئەوانیش لەجیاتی تاوانی خۆشیان و، لەجیاتی ئەوەش كە ئەو فیرعەونەیان لەسەر خۆیان دروستكردووە، ئەدی تۆ كەست دیوە لە وشكانی مەلە بكات، دەبێ ئاو هەبێ ئنجا مەلە دەكرێ، هیچ فیرعەونێك نەیگوتوە: من پەروەردگارتانم، تاكو خەڵكێك نەبووبێ (بارك الله) ی بۆ بكێشێ و چەپڵەی بۆ لێبدا، بڵێ: قوربان تەواوە جەنابت ئاسمان كونی تێ بووە و تۆ هاتوویتە خوار، تۆ خۆت و بنەماڵەكەت، خۆت و خزمەكانت، جۆرێكی دیكەن، جەنابت هەرچی بڵێی وایە، قسەی تۆ وەك ئایەت وایە و، فەرمانی جەنابت نابێ ڕەدبكرێتەوە و تۆ بەرز و پیرۆزی و..هتد پێیان هەڵاگوتوە، گوێت لێنەبوو كاتی خۆی چۆن بەسەر صەددامدا هەڵیان دەدا، زێڕە زێڕە، صەددەم زێڕە، (غالي غالي، صدام غالي) بە عەرەبی، بە كوردیی، بە توركمانی، دوایی هەندێك لە (وعاظ السلاطين)، لەو مەلا ماستاوچییانەی كە لە دەوری دەسەڵاتداران كۆدەبنەوە، ئەو بەناو عالمانە، نەوەدو نۆ ناوەیان بۆ صەدامی دانابوو، من ئەو كاتە لە پەیمانگای ئیسلامیی بووم، لە پۆلی چواری ئامادەیی، نەوەدو نۆ صیفەتیان بۆ صەددام دانابوو، وەك (أسماء الله الحسنى)! دیارە صەددام دەڵێ: مادام نەوەدو نۆ ناوم هەیە، دیارە خوام، بەڵام خۆم بەخۆمم نەزانیوە!! بەحەقیقەت دەوروبەری خراپ، فیرعەون پەیدا دەكات، دەوروبەری خراپ، وا لەو دەسەڵاتدارە دەكات هەوای بچێتە كەللەوەو بڵێ: من پەروەردگار و پەرستراوم، ئەگەرنا ئەگەر خەڵك بڵێ: وا ڕاوەستێ، تۆش بەشەرێكی وەك ئێمە، لە خەتی خۆت بوەستە!! كابرا هۆشیار دەبێتەوە، بەڵام هەمووی هەر چەپڵەی بۆ لێبدا، هەمووی هەر بەڵێ قوربانی بۆ بكات، هەمووی هەر هوتافی بۆ بكێشێ لەخۆی بایی دەبێ، كەواتە: ئەو هوتاف كێش و چەپڵە لێدەرە و ماستاوچییانە، جێی خۆیەتی وەك ستەمكارەكان حسابیان بۆ بكرێ، بۆیەش خوا دەفەرموێ:

﴿لِكُلٍّ ضِعْفٌ وَلَٰكِن لَّا تَعْلَمُونَ ﴿٣٨﴾﴾

بۆ هەرکامتان دووقات عەزاب هەیە، یاخود چەند قات، هەندێك دەڵێن (ضعف) یانی: چەند قات.

**دانا: زۆر باشە مامۆستا! کەواتە کۆمەڵگایەك جورئەت نەکا بە ستەمکارێك بڵێ: تۆ ستەم ئەکەیت، ئیتر بوەستە، چی لێ چاوەڕێ ئەکرێ، هەم لەلای خوای پەروەردگار تووشی چی ئەبێ؟ هەم کۆمەڵگاکە بەرەو کوێ ئەچێ؟**

**مامۆستا:** وەك چۆن ڕاوەستان لە بەرامبەر ستەمدا، گەورەترین جۆری جیهادە، پێغەمبەری خوا (علیه الصلاة والسلام) گوتنی قسەی حەق و قسەی دادگەرانەی لە بەرامبەر حوکمڕانێکی ستەمکاردا، بە گەورەترین جیهاد داناوە: (أفضل الجهاد کلمة حق عند سلطان جائر)، یان (أفضل الجهاد کلمة عدل عند سلطان جائر)، هەردووك ڕیوایەتەکەی هاتوون. بێگومان بێدەنگیی و بێهەڵوێستییش لەبەرانبەر ستەم و بێدادیی و ملهوڕیی دا، خراپترین جۆری هاوکاریی کردنی ستەمکاران و دەستبار بۆ گرتنییانە. ئنجا بە دڵنیاییی ئەوەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: ڕاست پێچەوانەی قسە و هەڵوێستی ئەوانەیە کە دەیانەوێ خەڵك بخەسێنن و ڕام و دەستەمۆ بکەن بۆ حوکمڕانانی ستەمکار، کە دەڵێن: خۆپێشاندان حەڕامە و ڕەخنەگرتن لەحوکمڕان حەڕامە و، تووڕەبوون حەڕامە و، مانگرتن حەڕامە و.. هتد! ئەدی ئایا تەسلیمبوون حەڵاڵە؟ بۆچی پێشەوایانی ئێمە، سەلەفی ساڵحی ئێمە، تەسلیمی دەسەڵاتداران بوون؟! ئەدی ئەوە سەعیدی کوڕی جوبەیر نیە حەججاجی کوڕی یوسفی سەقەفیی دەیکوژێ؟ ئەدی ئەوە هەموو ئیمامان و پێشەوایانی ئێمە نین، یان زیندانیی کراون، وەك ئەبو حەنیفە و ئەحمەد، یان لێدراون و دەرکراون، وەك مالیك و شافیعی؟! ئێمە عالمێکمان نیە، عالمێکی ڕەسەن بووبێ و سەلامەت بێ لە دەستی ئەو ستەمکارانەی سەردەمی خۆی، کە حوکمیشیان بە شەریعەت کردوە بە گشتی، بەڵام جار جار لادان و ستەمیان هەبووە، ئەدی ئەگەر کەسێك هەر ئیعتیراف بە شەریعەت نەکات، کەچی بڵێی: نابێ لە گوڵ کاڵتری پێ بڵێی، نابێ ڕەخنەی لێ بگری، نابێ تووڕەی بکەی!! بەڕاستی ئەوە دینی فیرعەونەکانە، ئەوە هیچ عیلاقەی بە دینی خواوە نیە

و، هیچ په‌یوه‌ندییشی به‌ ڕێبازی پێغه‌مبه‌رانه‌وه‌ نیه‌ و، هیچ په‌یوه‌ندییشی به‌ ڕێبازی پێشینی چاك و پێشه‌وایانی ئێمه‌وه‌ نیه‌، پێشه‌وایانی ئێمه‌ له‌ به‌ندیخانه‌ی سته‌مكاره‌كاندا ژیانیان به‌سه‌ربردوه‌، به‌ ده‌ركراویی، به‌ ئاواره‌یی، به‌ هه‌ژاریی، به‌ نه‌داریی، به‌ خۆحه‌شاردان ژیانیان به‌سه‌ربردوه‌، ئه‌وه‌ پێشینی چاكی ئێمه‌ بوون، به‌ڵام ئه‌و ده‌سه‌ڵاتداره‌ی كه‌ (سیكۆلاریزم)ی ته‌به‌ننی كردوه‌ و ئیعتیراف به‌وه‌ ناكات كه‌ خوا ته‌ده‌خخول بكات له‌ ژینی به‌شه‌ردا، تۆ بڵێی: نابێ شتێكی پێ بڵێی له‌ دڵی گران بێ، ئه‌وه‌ به‌ڕاستیی نه‌خشه‌ی فیرعه‌ونایه‌تیی كردن له‌ پشت ئه‌و فیكره‌وه‌ هه‌یه‌، (مرجعیه)ێكی فیرعه‌ونایه‌تیی له‌ پشت ئه‌و فیكره‌وه‌ هه‌یه‌، كه‌ بێگومان ئه‌وه‌ حوكمی سته‌مكارانه‌ ڕه‌شه‌رع ده‌خات و، خه‌ڵك ئیخفاڵ ده‌كات، خه‌ڵك ڕام و ده‌سته‌مۆ و كه‌ویی ده‌كات، بۆ ئه‌و ده‌سه‌ڵاتداره‌ ناشه‌رعییانه‌.

ئنجا ئه‌گه‌ر ڕاوه‌ستان له‌به‌رامبه‌ری سته‌مدا، هێنده‌ شتێكی گه‌وره‌ بێ، كه‌ پێغه‌مبه‌ر (علیه الصلاة والسلام) كه‌سێك كه‌ ده‌كوژرێ له‌كاتێكدا كه‌ ئه‌مر و نه‌هی ده‌كات له‌به‌رامبه‌ر حوكمڕانێكی سته‌مكاردا به‌سه‌روه‌ری شه‌هیدانی دابنێ: (سيد الشهداء حمزة، ورجل قام الى إمامٍ جائر، فأمره ونهاه في ذات الله فقَتَلَهُ) وه‌ك ده‌بینین بابای وا پێغه‌مبه‌ری خوا صلى الله عليه وسلم له‌گه‌ڵ حه‌مزه‌ی مامی دا ده‌یخاته‌ ته‌رازوویه‌كه‌وه‌، به‌ڵێ ئه‌گه‌ر ئه‌وه‌ (سید الشهداء) بێ، ئه‌ویدیكه‌ش، قسه‌كه‌ی باشترین قسه‌ بێت و گه‌وره‌ترین جیهاد بێ، كه‌واته‌: بێ هه‌ڵوێستیی له‌به‌رامبه‌ر سته‌مكاراندا، له‌ به‌رامبه‌ر زوڵم و سته‌مدا، له‌به‌رامبه‌ر غه‌در و خراپه‌دا، به‌ ته‌ئكید گه‌وره‌ترین گوناحه‌، چونكه‌ ڕێك پێچه‌وانه‌ی یه‌كدین، ئه‌گه‌ر تۆ له‌ به‌رامبه‌ر سته‌مكاردا بوه‌ستی، ئه‌گه‌ر بكوژرێی باشترین شه‌هیدبی و ئه‌گه‌ر قسه‌ی دادگه‌رانه‌ و هه‌ق له‌به‌رانبه‌ر سته‌مكاردا باشترین قسه‌ و باشترین جیهاد بێ، كه‌واته‌ دیاره‌ بێ هه‌ڵوێستییه‌كه‌ش، خراپترین گوناح و خراپترین هه‌ڵوێسته‌.

**دانا: زۆر باشه، ئەگەر دیسانەوە بێینەوە سەر واقیعی هەرێمی كوردستان كه بیری بینەرانی ئەخەمەوە: ئێمه لەسەر بارودۆخی هەرێم ه قسه ئەكەین، بەڕاست كۆمەڵگای ئێمه زوڵم و ستەم سەغڵەت و بێزاری كردوه ؟!**

**مامۆستا:** بێگومان، هەڵبەته دەشگونجێ هەندێك كەس، تا ئێستا پەتی تەحەممولی نەپچڕابێ و لەسەریەوە نەڕژابێ، بەڵام من پێموایه كه ڕۆژ به ڕۆژ خەڵك زیاتر بێزار دەبێ، تووڕه دەبێ، ناڕەحەت دەبێ، ئنجا لەوانەیه هەندێك كەس سەرمایه و دەستمایەكیان مابێت، هی كاتێك كه هەبوو بوون، دەستیان پێوەگرتبێت و ئێستا سەرف و خەرجی بكەن، چونكه من ئاگادارم، زۆر خەڵك دێ بۆ لام، كرێكار دێ، جوتیار دێ، كاسبكار دێ، دووكاندار دێ، كارمەند دێ، مامۆستا دێ، خەڵك زۆر دێ، خەڵك زۆر بێزاره، خەڵك زۆر ناچاره و، ڕۆژ به ڕۆژ بەرەو نائومێدیی دەچێت، بۆیه شتێك دەڵێم بۆ بڕیاربەدەستانی ئەم وڵاته، بۆ چینی سیاسی بەگشتی و بڕیاربەدەستان بەتایبەتی، بۆ ئەوانەی كه خۆیان به بەرپرسیار دەزانن لەم وڵاتەدا و ماوەی چارەگه سەدەی ڕابردوودا ئیدارەدانی ئەم وڵات و خەڵكەیان بەدەستەوە بووه، دەڵێم: (وریابن! نائومێدكردنی خەڵك و جەماوەر زۆر خەتەره، وریابن! باخەڵك نائومێد نەبێ، چونكه نائومێدیی هەموو شتێك به ئینسان دەكات، شاعیرێكی فارس دەڵێت:

وقت ضرورت چون نماند گریز دست بگیرد سر شمشیر تیز

له كاتی ناچاریدا كه ڕێی هەڵهاتنێ نەما، خەڵك دەس به نووكی شمشێری تیژەوه دەگرێ ) ئنجا هەركات قسەیەكی دڵسۆزانەشمان كرد، مەڵێن خەڵكمان لێ هان دەدەن! من كەس هان نادەم، بەس دەڵێم: خەڵك نائومێدكردن، خەڵك گەیاندنه بنبەست، زۆر خەتەره، زۆرجار گوتوومه: لەسەرەتای ڕاپەڕینی جەماوەریی بەهاری نەوەدو یەكەوه (١٩٩١/٠٣/٠٥)، وەزع زۆر ناڕەحەت بوو، بەتایبەتی له ساڵی نەوەدو دوو (١٩٩٢)دا، ژیان و گوزەران زۆر سەخت بوو، بەڵام بۆچی خەڵك خۆی ڕادەگرت، بۆچی پشوو درێژبوو؟ سێ هۆكار هەبوون:

**یەكەم:** بەرپرسەكانیان دەبینی وەك خۆیان بوون بە زۆریی، ئەوان نەچووبوونە بورجی عاجییەوە و بە گاڕان سەیارەیان بەدوای خۆیان نەدابوو، بە كۆمپانیای زەبەلاح و بە ملیاران دۆلار خۆیان و حیزب و خزمیان ئاوا دەوڵەمەند نەكردبوو، ئاستی ژیانی بەرپرسەكان لە خەڵكەوە نزیك بوو، ئەوە یەك.

**دووەم:** خەڵك ئومێدی هەبوو، ئومێدی هەبوو دەیگوت: ئێمە تا ئێستا پەرلەمانمان نەبووە، حكوومەتمان نەبووە، قەوارەی سەربەخۆی خۆمان نەبووە، بۆیە وەزعمان وایە، لەمەودوا ئینشائەڵڵا پەرلەمانمان دەبێ و حكومەتمان دەبێ، حكوومەتی خۆماڵییمان دەبێ، ئنجا چاوت لێ بێ چیمان لێ دێ!

**سێیەم:** بەها ڕووحی و ئیمانی و ئیسلامییەكان، لە دڵی خەڵكدا بەهێزتر بوون، ئەو تەوژمی عەلمانیی و كاركردن لەسەر وردكردنی شەخصیەتی ئینسانی كورد و، كاركردن لەسەر ئەوەی كە مرۆڤی كورد تەنیا بیر لە پشتێن بەرەوژێری بكاتەوە و، تەنیا غەریزەكانی ببینێ، تەنیا خەریكی عەیش و نۆش بێ، ئەو حاڵەتە رووینەدابوو.

كەواتە: ئەو سێ جیاوازییە هەبوون، بەڵام ئێستا:

١- خەڵك بەرپرسەكان دەبینێ زۆر جیان، خۆیان و حیزب و خزمیان زۆر جیان.

٢- خەڵك حكوومەت و پەرلەمانی هەیە، بەڵام پەكخراون و ئیفلیجكراون و هیوای نیە.

٣- ئەو بەها رووحییانەش بەداخەوە كاڵبوونەتەوە، من زۆر جار گوتوومە: تەوژمی عەلمانیی لەم هەرێمی كوردستانەی ئێمەدا، خوایان لە خەڵك ستاندو خورماشیان نەدانێ، دینیان لێستاندوون و دنیاشیان بۆ دابین نەكردوون، دنیایەكە هەر بۆ خۆیان قۆرخیان كردوە و دینیشیان لە خەڵك ستاندوە، دینیشان لەبەرچاوی خەڵك خستوە، من لەم ڕۆژانەدا لە ڕانیە كۆڕێكم هەبوو، بەناوی: (گەنج و قەیرانی ڕووحیی)، حەقیقەت گەنجی ئێمە -من ناڵێم هەموو گەنجێكی كورد - بەڵام ژمارەیەكی زۆر لە گەنجەكانمان، لە قەیرانی بێ ڕووحییدا

سەراسیمە و سەرگەردانن، كە دیارە تەوژمی عەلمانیی لەوە بەرپرسیارە، ئەو حاڵەتە ماددییگەراییە لەم هەرێمی كوردستانەدا، لەوە بەرپرسیارە كە خەڵكیان وا لێكردوە، تەنیا بیر لە گەدەو داوێن و گیرفانی بكاتەوە.

**دانا: كەواتە ئەركی شەرعیی نیشتمانپەروەران، هاووڵاتیان، خەمخۆران، دڵسۆزانی ئەم میللەتە ئەبێ چی بێ، بەرامبەر ئەم حاڵەتەی ئێستا هەیە؟**

**مامۆستا:** ئەركیان ئەوەیە كە ئێمە بگەڕێینەوە بۆ قورئان، گوێ بۆ قورئان بگرین، نەك وەك گەنجێك لێم حاڵیی بووبوو گوتبووی: من چەندان ساڵە گوێ لە قورئانێ دەگرم، واقیعەكەش هەروەك خۆیەتی، وایزانیبوو دەڵێم: (عبدالباسط عبدالصمد)ێك بخە سەرێ و گوێی لێ بگرە!! نا، بەڵكو لە قورئان بفكریین، گوێی دڵی لێ بگرین، تێوەی ڕامێنین، تێی بگەین، داخۆ قورئان چیمان پێ دەڵێت؟ قورئان حیكایەتی بەرئاگردان نیە، بەڵكو:

﴿ كِتَٰبٌ أَنزَلۡنَٰهُ إِلَيۡكَ مُبَٰرَكٞ لِّيَدَّبَّرُوٓاْ ءَايَٰتِهِۦ وَلِيَتَذَكَّرَ أُوْلُواْ ٱلۡأَلۡبَٰبِ ﴿٢٩﴾ ﴾ [ص: ٢٩]

كتێبێكی پڕ پیت و پێزە، ناردوومانەتە خوار، تاكو عاقڵەمەندان لە ئایەتەكانی ورد ببنەوە و پەندی لێوەربگرن، چارەسەر بەوە دەبێ، ئێمە مادام میللەتێكی مسوڵمانین، دەبێ چاو بەماڵی خۆماندا بگێڕین بزانین چیمان هەیە؟ ئیسلامی خۆمان، قورئان و سوننەتی خۆمان پڕن لە ئامۆژگارییی، پڕن لە ڕێنمایی، پڕن لە هەق و حیكمەتی وا كە زۆر پێویستییمان پێیانە، بۆ ڕاستكردنەوە و پاكسازیی و چاكسازیی تێداكردنی ئەم واقیعە خوارو نالەبار و ناهەموارەی خۆمان.

**دانا: مامۆستا! پێتوانیە هەندێك بیر و قەناعەتی لار، ئەم واقیعە لارەی هێناوەتە بەرهەم؟**

**مامۆستا:** هیچ گومانی تێدا نیە، بەدڵنیاییەوە هەر تەصەڕووفێكی لار، ڕیشەكەی تەصەوورێكی لارە، مرۆڤ بیركردنەوەی هەڵە لە عەقڵ و دڵیدا دەچەسپێ، ئنجا هەڵسوكەوتی هەڵەی دەبێ، بۆیە دەبێ لەوێوە ڕاست بكرێتەوە، خوای پەروەردگار كە دەفەرموێ:

﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُغَيِّرُ مَا بِقَوۡمٍ حَتَّىٰ يُغَيِّرُواْ مَا بِأَنفُسِهِمۡۗ﴾ [الرعد : ١١]

واتە: خوا واقیعی هیچ كۆمەڵگایەك ناگۆڕێ، تاكو ئەوان واقیع و حاڵیخۆیان نەگۆڕن.

حاڵ و واقیعی خۆشیان سێ شتان دەگرێتەوە:



١- بیروڕایەكان (الأفكار):

٢- هەست و نەستەكان (المشاعر).

٣- ئاكار و هەڵسوكەوتەكان (الأخلاق والسلوك).

بەڵێ دەبێ ئێمە خۆمان بگۆڕین، چونكە واقیعەكەمان ڕەنگدانەوەی خۆمانە، ڕەنگدانەوەی خۆمان، ناڵێم من و تۆ، بەڵكو ئەو بەرپرسەی كە پێی وایە دەبێ ئەو هەمەكارە بێت و خەڵك لەبەردەستی بێ، حیزبەكەی ئەو سەردەست بێت و خەڵكی دیكە سواڵكەر بێ لەبەر دەرگای، عەشیرەتەكەی ئەو، بنەماڵەكەی ئەو، دەبێ سەردەست بێت و خەڵكی دیكە لە خزمەتیدا بێ، ئەو تێڕوانین و عەقڵیەتەی ئەو كەسە لە كەللەیدا هەیە و، دەوروبەرەكەی لە كەللەیدا هەیە، ئەو واقیعەی ڕەخساندوە، كە ئەوەتا دەبینی، بەو شێوەیە حوكمڕانیی دەكات و وڵات بەڕێوە دەبات، كەواتە: ئەو عەقڵیەتە دەبێ بگۆڕرێ، هەروەها تێڕوانین و عەقڵیەتی ئەو خەڵكە كە لێی سەلماندوە و لەو جۆرە كەسانە دەسەلمێنێ و دەڵێ: (ئاخر ئەوان جیان) (بڵێی چی، دەسەڵات نیە) (ئەو دەستەی نەتوانم بیبڕم، ماچی دەكەم) كە ئەوەش هەروەك گوتم پەندێكی دیكەی غەڵەتە، لە حاڵێكدا قورئان وا نافەرموێ و سوننەتی پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) وا نافەرموێ، بەڵكو دەفەرموێ: (لتأخذُنَّ على يد الظالم ولتَقْصُرُنَّه على الحق قَصْراً أو ليوشكنَّ الله أن يعمَّكمُ بعقابٍ منه) دەبێ دەستی زاڵم بگرن و بیگێڕنەوە سەر حەق، ئەگەرنا نزیكە خوا (عزوجل) بەڵایەكتان بۆ بنێرێ و هەمووتان پێكەوە سزابار ببن، بەڵێ گومان لەوەدا نیە، هەر كۆمەڵگایەك چ بەباری چاكەدا بڕوا، چ بە باری خراپەدا، پێش ئەوە عەقڵ و دڵەكەی، تێگەیشتن و تێڕوانینی لاری

بۆ دروست بووە، هەست و نەستی لاری بۆ دروست بووە، ڕەوشت و ئاكاری لاری بۆ دروست بووە، بۆیە هەڵوێست و هەڵسوكەوت و واقیعێكی لار، بووەتە دەرهاویشتەی ئەو قەناعەت و بیرو خولیا هەڵەو پەلاَنەی كە لە عەقڵ و دڵیدان، كەواتە دەبێ لێرەوە ڕاست بكرێتەوە، هەروەك چۆن ئاو دەبێ لە سەرچاوەوە ڕوون بكرێتەوە، ئەگەرنا لە جۆگەدا هەر لێڵ دەبێ.

**دانا: ئێمە ئێستا لە هەرێمی كوردستاندا دوو چینمان هەیە، چینە سیاسییەكە و خەڵك و هاووڵاتیی ئاسایی، ئەركی سەرشانی كام لەم دوو چینە قورسترە، بۆ ئەوەی كە زوڵم و ستەم نەهێڵن و دادگەریی بچەسپێنن؟**

**مامۆستا:** بەبۆچوونی من ئەركی سەرشانی خەڵك و جەماوەر، بەڵگەشم لە قورئاندا ئەوەیە كە مووسا (علیه الصلاة والسلام) دوای ئەوەی دەچێ كە تەورات لە خوای زاناءتوانا وەربگرێ، كە زۆر لە زانایان دەڵێن: چووە بۆ سەر كێوی (طور)، دوای ئەوەی گفتوگۆ لەگەڵ خوادا دەكات و تەوراتی لە تەختەكان (ألواح)دا پێ دەدات، كە تێیان دا نووسراوەتەوە، كاتێك دێتەوە و خوا هەواڵی پێ دەدات كە ئەی موسا! سامیریی خەڵكەكەتی هەڵخەڵەتاندووە دەستیان كردوە بە گۆلك پەرستیی، كە دێتەوە مووسا (علیه الصلاة والسلام) چی دەكات؟ ئاشكرایە كە لەو بارەوە سێ لایەن بەرپرسیارن:

١- خەڵك.

٢- هاروونی برای كە لە شوێنی خۆی دایناوە بە جێگر.

٣- سامیریی كە خەڵكەكەی هەڵخەڵەتاندووە.

ئنجا ئایا لەكێوە دەست پێدەكات، لە سامیرییەوە؟ نەخێر، لە هاروونەوە؟ نەخێر، بەڵكو لە خەڵكەكەوە، دەڵێ: چی بۆ واتان كردوە، ئایا من زۆرم پێ چوو؟ ئایا خوای پەروەردگار گفتی چاكی پێ نەدابوون؟ بۆچی واتانكردوە؟ ئەوانیش دەڵێن: ئێمە بەدەست خۆمان نەبوو كە ئاوامان كرد:

﴿ قَالُواْ مَآ أَخْلَفْنَا مَوْعِدَكَ بِمَلْكِنَا وَلَٰكِنَّا حُمِّلْنَآ أَوْزَارًا مِّن زِينَةِ ٱلْقَوْمِ فَقَذَفْنَٰهَا فَكَذَٰلِكَ أَلْقَى ٱلسَّامِرِيُّ ﴿٨٧﴾ فَأَخْرَجَ لَهُمْ عِجْلًا جَسَدًا لَّهُۥ خُوَارٌ... ﴾ [طه : ٨٧، ٨٨]،

ئێمە بەدەست خۆمان نەبوو، كە بەڵێنەكەتمان شكاند!(سەیركە! میللەتی بێ ئیرادە دەڵێ: بەدەست خۆم نیە، هیچ دەسەڵاتم نیە، هەر میللەتێك، هەر كۆمەڵگایەك گوتی: من هیچ نیم، دەسەڵاتم نیە، دەستەپاچەم، ئەوە بزانە هیچ نیە، و میللەتێكی مردوویە، بەنی ئیسرائیل گوتیان: بەدەستی خۆمان نەبوو، خەتای خۆمان نەبوو) بەڵكو ئێمە ئەو زێڕو زیوەی پێمان بوو، فڕێماندا (چاڵێكەوە) سامیریش هەر فڕێیدا قاڵبێكی لە شێوەی گۆلك دادارِشت و خشڵەكەی تێدا قاڵكردەوە، ئیدی گۆلكێكی بۆ ڕەداری بۆ بۆ دروست كردن، گوتی ئەوە پەرستراوی ئێوەیە، مووسا لێی ونبووە (چووە لە كێوی (طور) بۆی دەگەڕێ) دوای لێپرسینەوە لەگەڵ خەڵكەكەدا ئنجانۆڕەیهاڕوونی برایەتی:

﴿ قَالَ يَٰهَٰرُونُ مَا مَنَعَكَ إِذْ رَأَيْتَهُمْ ضَلُّوٓاْ ﴿٩٢﴾ أَلَّا تَتَّبِعَنِ ﴾ [طه: ٩٢- ٩٣]

واتە: هاڕوون! ئەوە بۆچی كە ئەوانت گومڕا بینی (گۆلكیان پەرست) بۆچی بەدوام نەكەوتی؟ ئایا سەرپێچییت لە فەرمانم كرد؟! هاڕوونیش عوزری خۆی بۆ دێنێتەوە دەڵێ: لەوە ترسام كە دوایی بڵێی: خەڵكەكەت پێك وەر كردوە، بۆیە صەبرم گرت تاكو بۆخۆت دێیەوە، بۆم عیلاج نەكرا و دەستەڵاتم نەبوو.

ئنجا لە قۆناغی سێیەم دا دەفەرموێ: ﴿ قَالَ فَمَا خَطْبُكَ يَٰسَٰمِرِيُّ ﴿٩٥﴾ ﴾ [طه : ٩٥]

واتە: سامیریی ئەوە چیتە بۆچی وات كرد؟ كەواتە: ئەگەر چینە سیاسییە خەتابارەكە (چونكە چینە سیاسییەكەش خەڵكی باشیشی تێدایە) قۆرخكارەكە، گەندەڵكارەكە، ئەو خەڵكە مشەخۆر بەدەوری خۆ پەیداكەرەكە، ئەگەر ئەوانە دەوری سامیریی ببینن، لە قۆناغی سێیەم دا دەبێ گلەیی لەوان بكرێ، بەڵام پێشێ خەڵك بەرپرسیارە، بەرپرسیارێتیی یەكەم لەعەقلی خەڵك دایە پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) دەفەرموێ: (كلكم راع وكلكم مسئول عن رعيته) رواه

مسلم، واته: هەركامێك له ئێوە چاودێرە و بەرپرسیارەبەرامبەر بە خەڵكەكەی.

شایانی باسە زۆرێك لە مەلاكان لێرەدا (راع) بە (شوان) لێكدەدەنەوە، وادەزانن خەڵك مەڕو ماڵە! نا، ئەصڵەن شوانیش بۆیە پێی دەگوترێ (راع) چونكە چاودێریی مەڕەكانی دەكات، (راع) یانی: ئەو كەسەی چاودێریی دەكات، یانی: هەركامێك لە ئێوە چاودێرە، تۆ دەبێ چاودێر بی بەسەر دەستەڵات و بەسەر كۆمەڵگاكەت و بەسەر خۆتەوە، (ومسئول عن رعیته) بەرپرسیاریشە بەرامبەر بەو خەڵكەی كە دەبێ چاودێرییان بكات. هەركامێك لە ئێمە، پێشێ خەڵك پلەءپلە و پێ بەپێ، ئنجا كێ خۆی بە بەرپرسیار دەزانێ، دەڕوات تاكو دەگاتە ئەو كەسەی كە دەستی چووەتە زوڵم و خراپەوە و بەرژەوەندیی لەو واقیعە ناهەموارەدا هەیە كە ئێستا دەگوزەرێ لە هەرێمی كوردستاندا، ئەوە ئاخر كەسە كە دەبێ گلەیی لێ بكرێ، رەنگە هەر گلەییشی لێ نەكرێ، بۆچی؟ چونكە ئەو بۆ خۆی ئەو واقیعەی وا ڕەخساندوە و پێی خۆشە ئەو واقیعە ئاوا بەردەوام بێت، كەواتە: دەبێ ئەو خەڵكەی دیكە كە زەرەرمەندە لەم واقیعە، ئەو واقیعە بگۆڕێ، نەك ئەوەی لێی بەهرەمەندە، چاوەڕێی بن ئەو بیگۆڕێ، ئەو بۆ خۆی دزە و بازاڕی ئاڵۆزی دەوێ، ڕاوچی خراپ لە ئاوی لێڵدا ڕاوی دەكات، ئەو بەزم و بازاڕە بۆ وی زۆر باشە؟، ئەو هیچ كێشەیەكی نیە، ئیدی چۆن دەیگۆڕێ و چاكی دەكات؟ نابێ تۆ بەتەمای ئەوە بی، ئەو خەڵكەی كە زەرەرمەندە لەم واقیعە، دەبێ ئەوان قۆڵی لێ هەڵماڵن و واقیعەكە بگۆڕن و چاكی بكەن.

**دانا: مامۆستا! ئەگەر كەسێك ئێستا بینەری ئەم بەرنامەی ئێمە بێ، لەوانەیە لێت بپرسێ: مامۆستا من چۆن بیگۆڕم؟ میكانیزمی گۆڕینمان پێ بڵێ.**

**مامۆستا:** پێش هەموو شتێك دەبێ ئینسان لەگەڵ خوادا ڕاست بكات كە دەڵێ: مسوڵمانم، من قسە لە میللەتێكی مسوڵمان دەكەم، لەگەڵ خوادا ڕاست بكات، لەگەڵ خۆیدا ڕاست بكات، لەگەڵ خەڵكیشدا ڕاست بكات، خواش دەفەرموێ:

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَكُونُواْ مَعَ ٱلصَّٰدِقِينَ ﴾ [التوبة : ١١٩]

ئینسان دەبێ خۆی ڕاست و چاك و ئەهلی تەقوابێ، دوایی لەگەڵ ڕاستاندا قسەی خۆیان بكەنە یەك، دەنگی خۆیان و هەڵوێستی خۆیان بكەنە یەك، وەك كوردەواریی خۆمان دەڵێن: دەستەی زۆر ئاو سەربەرەو ژوور دەبات، واتە: بە هەرەوەزیی ئاو سەربەرەو ژوور دەڕوات، چارەسەر هەر ئەوەیە هەركامێك لە ئێمە لە زاتی خۆیدا خۆی چاك بكات و، ئەوانەی كە زەرەرمەندن لەم واقیعە و، دڵیان بەلێقەوماوان دەسووتێ و پەرۆشی ئایندەی ئەم خەڵك و وڵاتەیانە، قسەو هەڵوێست و دەنگیان بكەن بە یەك، دەنگ و ڕەنگ و سەنگی خۆیان بكەن بە یەك، بڵێن: نابێ چیدیكە ئەم وەزعە بەو شێوەیە بڕوات، ناشڵێم شەڕ و شۆڕو ئاژاوە، بەڵكو بە ئاشتییانە و زۆر بە لەباریی، بەڵام دڵسۆزانە و ڕاستگۆیانە، دەگونجێ سنوور دابنرێ بۆ گەورەترین كەس كە لەم وڵاتەدا ستەم دەكات و، هەركەسێك كە لەم واقیعە ناهەمواردا بەشێوەی ناشەرعیی بەهرەمەندە، دەگونجێ سنووری بۆ دابنرێ، بە مەرجێ خەڵك ڕاست بكاو ساغ بێ، نەك هەركەسە بچێ لەولاوە خەت ڕەجعیەك دروست بكات بۆ خۆی و بۆ خزمەكانی و بۆ كوڕەكانی و بۆ حیزبەكەی و بۆ ئەویدیكە، كەچی خۆشی پیاوچاك پێشان بدات، تەرەفی بەرامبەریش ئەو كەسەی كە دەویسترێ سنووری بۆ دابنرێ دەڵێ: ئەو خەڵكە هەمووی لەگەڵ منە، ڕاستیش دەكات لەبنەوە خەتیان ڕاكێشاوە بۆ لای ئەو و، هێندێك بەهرەی بچووك بچووك وەردەگرن، بەڵام لەسەر حیسابی ئەو زەرەرە گەورانەی كە هەموو لایەكمان دەیكەین.

**دانا:** بەڕێز مامۆستا عەلی نووسەر و ڕووناكبیر! سوپاس بۆ ئەوەی كە لەم ئەڵقایەشدا وەڵامی پرسیارەكانی ئێمەت دایەوە.

**مامۆستا:** سەلامەت بن سوپاس بۆ ئێوەش كاك دانا.

**دانا:** پشت بەخوا لە ئاڵقەی پێنجەمدا باس لە قۆرخكردنی دەسەڵات و دەست بەسەرداگرتنی سامان دەكەین، ئەگەر خوای گەورە دەرفەت بدات.

# ئاڵقەی پێنجەم

بنەمای پێنجەم: قۆرخکردنی دەسەڵات و دەست بەسەرداگرتنی سامان، دوو بەرجەستەکەری سەرەکیی ستەمن.

**دانا:** بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان، سڵاوتان لێ بێ بینەرانی خۆشەویستی كەناڵی ئاسمانی پەیام، خۆم بە خۆشحاڵ دەزانم خوای پەروەردگار دەرفەتی پێبەخشینەوە لە ئاڵقەیەكی نوێی بەرنامەی بەدانایی لە خزمەت میوانی هەمیشەیی بەرنامەكەمان جەنابی مامۆستا عەلی باپیر نووسەر و رووناكبیردا، بە ئێوەی ئازیز و خۆشەویست شاد ئەبینەوە.

مامۆستا گیان! سڵاوی خوات لێ بێت، سوپاس بۆ ئامادەبوونت لە ئاڵقەیەكی نوێی بەرنامەكەمان دا.

**مامۆستا:** سڵاوی خوا لە ئێوەش و بەخێربێن .

**دانا:** مامۆستا! لە چوار ئاڵقەی ڕابردووی بەرنامەكەمان دا، تیشكمان خستە سەر چەند چەمكێك، كە جەنابت ئاماژەت پێكردبوون لە ژێر ناوونیشانی ئەو بابەتەدا كە "بۆ چاكردنی ئەم دۆخەی هەرێم با گوێ لە قورئان بگرین"، پشت بەخوا لە ئاڵقەی ئەمجارەماندا باس لە بنەمای پێنجەم ئەكەین ئەویش قۆرخكردنی دەسەڵات و دەستبەسەردا گرتنی سامانە، لە لایەن چینێكەوە كە لە ئەصڵدا دەسەڵات و سامان موڵكی گشتییە و ئەبێ تەعامولێكی گشتی لەگەڵدا بكرێت، من ئەپرسم: هۆكاری چییە جەنابی مامۆستا ئاماژەی بەم ناوونیشانە كردوە و ئایا: دەستبەسەردا گرتنی دەسەڵات و قۆرخكردنی سامان، دواجار ئەمانگەیەنێ بە كوێ؟

**مامۆستا:** بسم الله الرحمن الرحیم، الحمد لله ، وصلی الله تعالی وسلم وبارك علی رسول الله، محمد وآله المهتدین بهداه.

من ناوونیشانەكەم وەك بێتەوە یادم، ئاوام داناوە: (قۆرخكاریی لە بواری دەسەڵات و سەروەت و سامانداا دوو بەرجەستەكەری هەرە زەقی ستەمكارین) دیارە ئێمە لە وەڵامی ئەو پرسیارەدا: بۆچی ئاماژەم بەو دوو بوارە كردوە؟ دەڵێین: هۆكارەكەی هەر ئەوەیە كە من پێموایە ئەو دوو بوارە، دوو بواری هەرە سەرەكیی و گەورەن كە زوڵم و زۆریان تێدا بەرجەستە دەبێ، بەڵام پێش ئەوە بە پێویستی دەزانم وەك زەمینەسازییەك ئاماژە بە ڕاستییەك بكەم، ئەویشئەوەیە وەك لە ئاڵقەكانی پێشتریش دا باسم كردوە، كە: خوا سبحانه وتعالی مرۆڤی

لەم سەرزەوییەدا داناوە وەك جێنشینی خۆی، وەك هەڵگری ئەمانەتی خۆی، وەك دروستكراوێكی ناوازەی خۆی و ئەركێكی پێ سپاردوە كە ئەو ئەركە نە بە ئاسمانەكان، نە بەزەوی، نە بە چیاكان هەڵنەگیراوە، وەك خوا لە ئایەتی پێش كۆتایی سوورەتی (الأحزاب)دا ئاماژەی پێداوە:

﴿ إِنَّا عَرَضۡنَا ٱلۡأَمَانَةَ عَلَى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ وَٱلۡجِبَالِ فَأَبَيۡنَ أَن يَحۡمِلۡنَهَا وَأَشۡفَقۡنَ مِنۡهَا وَحَمَلَهَا ٱلۡإِنسَٰنُۖ إِنَّهُۥ كَانَ ظَلُومٗا جَهُولٗا ﴾ الأحزاب: ٧٢

بەڵێ خوا سبحانه وتعالى مرۆڤی كە لەم سەرزەوییە داناوە بۆ تاقیكرانەوە و، جێنشینایەتی كردن و ئاوەدانكردنەوەی زەوی و، هەڵگرتنی ئەمانەتی خۆی، لە هەمانكاتدا چوارچێوەیەكیشی دیاری كردوە بۆ ئەو مرۆڤە، كە ئەو ژیانە چۆن بەسەربەرێت، ئەویش ئەوەیە كە پێویستە لە پەیوەندیی لەگەڵ خوادا سبحانه وتعالى، خوا بەیەكگربێ و، تەنیا خوا بپەرستێ، تەنیا بۆ خوا ملكەچ بێ، تەنیا خوا بەوە بزانێ كە بەندایەتیی بۆ بكات، هەروەها مرۆڤەكان لەنێو خۆشیاندا دادگەر بن، ئنجا دوو جۆرە لادان كە ڕاستەوخۆ لەگەڵ دادگەریی تێكدەگیرێن، وە بەگەورەترین و زەقترین شێوە زوڵمیان تێدا بەرجەستە دەبێ، دەستبەسەرداگرتنی دەسەڵات و، قۆرخكردنیەتی، لەگەڵ دەستبەسەرداگرتنی سەروەت و سامان، دیارە خوا سبحانه وتعالى، ئەم ژیانە دنیایەی دانەناوە بۆ تەصفیەی حیساب، وەك دەفەرموێ::

١- ﴿ إِنَّ إِلَيۡنَآ إِيَابَهُمۡ ۝٢٥ ثُمَّ إِنَّ عَلَيۡنَا حِسَابَهُم ۝٢٦ ﴾ [الغاشية: ٢٥. ٢٦]

واتە: گەڕانەوەیان تەنیا بۆ لای ئێمەیە، لێپرسینەوەشیان بەس لەسەر ئێمەیە، هەروەها خوای پەروەردگار بە پێغەمبەری خاتەم دەفەرموێ:

٢- ﴿ إِنۡ عَلَيۡكَ إِلَّا ٱلۡبَلَٰغُۗ ﴾ [الشورى: ٤٨]

واتە: تۆ تەنیا گەیاندنت لەسەرە.

٣- ﴿ وَمَآ أَنتَ عَلَيۡهِم بِجَبَّارٖۖ ﴾ [ق: ٤٥]

واتە: تۆ ناتوانی ناچاریان بکەی.

﴿ لَّسْتَ عَلَيْهِم بِمُصَيْطِرٍ ﴿٢٢﴾ ﴾ [الغاشيه: ٢٢]

واتە: تۆ ناتوانی بەسەریاندا زاڵ بی.

٤- ﴿ وَلَوْ شَآءَ رَبُّكَ لَءَامَنَ مَن فِى ٱلْأَرْضِ كُلُّهُمْ جَمِيعًا ۚ أَفَأَنتَ تُكْرِهُ ٱلنَّاسَ حَتَّىٰ يَكُونُوا۟ مُؤْمِنِينَ ﴿٩٩﴾ ﴾ [يونس: ٩٩]

لەو ڕووانەوە کە ژیانی مرۆڤ پێی تێك ناچێ، خوا لە شەریعەتەکانی خۆیدا مرۆڤی ئازاد کردوە، چی دەپەرستێ؟ چۆن ڕەفتار دەکات؟ چی دەکا؟ چۆن دەکا؟ چونکە لێرەدایە کە ئازادیی مرۆڤ دەردەکەوێ و ئینسانیش بەبێ ئازادیی ناگونجێ تاقی بکرێتەوە و، بەبێ دەستکراوەیی ناگونجێ جێنشینایەتی خوا بکات و، ناگونجێ ئەمانەتی خوا هەڵبگرێ، بۆیە هەرچی کە ئازادیی مرۆڤ و تاقیکرانەوەی، و جێنشینایەیتی خوا کردنی، لەسەری وەستاوە و پەکی لەسەری کەوتوە، خوای پەروەردگار لە شەریعەتەکانی خۆیدا بواری بە مرۆڤ داوە:

﴿ فَمَن شَآءَ فَلْيُؤْمِن وَمَن شَآءَ فَلْيَكْفُرْ ﴾ [الكهف: ٢٩]

واتە: کێ حەزدەکا با بڕوا بێنێ، کێ حەزدەکات با بێ بڕوا بێت، لە بواری چاکە و خراپەدا کە پەیوەندیی بە خۆیەوە هەیە، لە بواری گوناح و تاعەت دا، لە هەموو ئەو شتانەدا کە بەبێ ئەوە مرۆڤ بە ئازاد لە قەڵەم نادرێ، دەستی مرۆڤ ئاوەڵا کراوە و، شەریعەت دەستی خەڵکی نەبەستوە و ڕێی لێنەگرتوون، دیارە وەکو ئیرادەی قەدەریی‌ءتەکوینیی مرۆڤ بە موتڵەقیی ئازادە، هەروەها وەك ئیرادەی تەشریعیی، خوا سبحانە وتعالى دیسان هەموو ئەو شتانەی کە ئازادیی مرۆڤ و جێنشینایەتی کردنی بۆ خوا و، هەڵگرتنی ئەمانەتی خوا، پەکیان لەسەری کەوتوە و لەسەری وەستاون، لە هەموو ئەو بوارانەدا خوای پەروەردگار دەستی مرۆڤی کردووەتەوە، بەڵام ئەو شتانەی کە نەك ئازادیی مرۆڤ پەکی لەسەریان نەکەوتوە، بەڵکو ئەگەر بێت و لەنێو خەڵکدا، پارێزراو

و سەلامەت نەبن، كە گرنگترینیان: ئاسایش و دین و ژین و وەچە و ئابڕوو و عەقڵ و سامانن، ئەوە ئازادیی مرۆڤ لەبەین دەچێ، لەوانەدا خوا سبحانه وتعالی بە ئیرادەی تەشریعیی خۆی دیاریی كردوە، كە نابێ وا بكەن و نابێ وا بچن، بۆ وێنە: لە هەموو قورئاندا نیە كە خوا خەڵكی سەرپشك كردبێ داخۆ دادگەر بن یان ستەمكار بن، زوڵم بكەن، یاخود چاكە بكەن، خەڵك سەرپشك نەكراوە لەوەدا.

**دانــا: ئەوە بڕاوەتەوە.**

**مامۆستا:** ئەوە بڕاوەتەوە، خوا نەیفەرمووە: (فمن شاء فليظلم ومن شا و فليعدل)، وەكو چۆن فەرموویەتی:

﴿فَمَن شَآءَ فَلْيُؤْمِن وَمَن شَآءَ فَلْيَكْفُرْ﴾ [الكهف: ٢٩]، بۆچی؟

چونكە وەك پێشتریش گوتوومانە: بە كوفر و ئیمان خەڵك پێكەوە دەژی، بەڵام بە زوڵم و عەدل پێكەوە ناژین، زاڵم و مەزڵووم پێكەوە ناژین.

ئنجا دوو شت بۆ هەموو خەڵك پێویستن:

**یەكەم:** دەسەڵات.

**دووەم:** سەروەت و سامان.



چونكە كاتێك كە ئەو دووە قۆرخكارییان تێدا دەكرێ، كەسێك، بنەماڵەیەك، حیزبێك، نەتەوەیەك لەسەر حسابی نەتەوەكانی دیكە، توێژێك وەك دەوڵەمەند، یان چینی بۆرژوا بە نسبەت كرێكار و جووتیار و پرۆلیتاریا، یان سپی پێست بەنیسبەت رەشپێستەوە، پیاو بە نیسبەت ئافرەتەوە، ئەو دووانە هەركاتێك لەسەر ئاستی تاك، یا لەسەر ئاستی حیزب و بنەماڵە و گرووپ و نەتەوە، دەستیان بەسەردا گیرا و قۆرخ كران، ژیانی بەشەر تێكدەچێ، بۆیە پێغەمبەران (عليهم الصلاة والسلام) هاتوون جەختیان لەسەر ئەوە كردووەتەوە، كە دەبێ خەڵك بە دادگەریی بەڕێوەبچن، دادگەریی كاتێك دەبێ، كە خەڵك لە بواری دەسەڵاتدا

هەموويان هاوبەش بن، بۆيەش هەموو دواندنەكانى خوا سبحانه وتعالى له قورئاندا ڕوويان له خەڵكە بە گشتى، يان ڕوو دەكاته بەشەر: (يا بني آدم)، (يا أيها الإنسان)، ياخود ڕوو دەكاته خەڵك: (يا أيها الناس)، ياخود ئەگەر كۆمەڵگايەكى بڕواداربێ ڕوودەكاته بڕواداران: (يا أيها الذين آمنوا)، بەڵام ئێمە له هەموو قورئاندا ئايەتێكمان نيه بۆ تەنيا جارێكيش ڕووى كردبێته توێژێك، بۆ وێنە: (يا أيها العلماء)، ياخود (يا أيها المشايخ)، ياخود (يا أيها المسؤولون)، (يا أيها الأغنياء)، (يا أيها الفقراء)، ياخود: (يا أيها الرجال)، (يا أيها النساء) نيمانە، بۆچى؟ چونكە خەڵك بە گشتى خاوەنى دەستەڵاتن و خەڵك بە گشتى مافى خۆيانە وڵاتى خۆيان، و كاروبارى خۆيان، بەڕێوەبەرن، بەچى ئەمە دەزانين؟ دواندنەكانى قورئان ڕوويان له هەموو خەڵكە، ئەوە يەك دوو: خوا يەك بناغەى بۆ داناوين، بۆ بەڕێوەبردنى كاروبار، وشەى كاروبار له قورئاندا وشەى (أمر)ى بۆ هاتوە:

﴿ وَأَمْرُهُمْ شُورَىٰ بَيْنَهُمْ ﴾ [الشورى: ٣٨]

كاروباريان بە ڕاوێژە، بۆيەش ئەوانەى كاروبارى كۆمەڵگايان بەدەستە پێيان دەگوترێ؟ (أولى الأمر):

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَأَطِيعُواْ ٱلرَّسُولَ وَأُوْلِي ٱلۡأَمۡرِ مِنكُمۡ ﴾ [النساء : ٥٩]

خاوەن كاروبارەكان، خاوەن دەسەڵات، خاوەن سوڵتە، كێن خاوەن سوڵتە؟ ئەوانەى كە له موسڵمانانن و خۆيان دايان دەنێن، ئەمە دەقى ئايەتى ژمارە (٥٩)ى سووڕەتى (النساء)ە، هەروەها له ئايەتى (٥٨)دا خوا، ڕوونى كردووەتەوە كە پێويستە ئەركى بەرپرسياريێتيى بەكێ بسپێررێ؟:

﴿ إِنَّ ٱللَّهَ يَأۡمُرُكُمۡ أَن تُؤَدُّواْ ٱلۡأَمَٰنَٰتِ إِلَىٰٓ أَهۡلِهَا ﴾

خوا فەرمانتان پێ دەكات سپاردەكان بە خەڵكى خۆيان بسپێرن، (ابن تيميه) ڕەحمەتى خواى لێ بێت، له كتێبى: (السياسة الشرعية)دا و زانايانى ديكەش دەڵێن: لێرەدا مەبەست له (أمانات) بەرپرسياريێتييەكانن، لەنێو كۆمەڵگادا،

چونكه پێغەمبەری خوا (علیه الصلاة والسلام) ڕۆژێك پرسیاری لێكرا: (متی الساعة؟) وەك له هەردووك صەحیحی بوخاریی و موسلیمدا هاتوه، واته: ئاخیرزەمان كەنگێ یه؟ فەرمووی: (اذا ضیِّعت الأمانة فانتظر الساعة) ئەگەر ئەمانەت زایه كرا، چاوەڕێی (ساعة) به، چاوەڕێی ئاخر زەمان به، پرسیاركرا: (وما إضاعتها؟) ئەمانەت زایەكران، زایەبوون، لەبەینچوون، چییه؟ فەرمووی: (اذا وُسِّدَ الأمرُ إلى غيرِ أهلِهِ فَأنتظرِ الساعة) له ڕیوایەتێكی دیكەدا: (اذا أسند الأمر)، (وُسِّدَ) لەگەڵ (أُسْنِدَ) هەردووكیان بەیەك مانان یانی: هەركاتێك كار به خەڵكی ناشایسته سپێردرا، چاوەڕێی ئاخر زەمانی ئەو كاره بكه، كه به كەسێكی نائەهل دەسپێردرێت، لەبەینی دەبات، سەیارەیەكی باش تەسلیمی سایقێكی ناشێ بكه، به دارو دیواریدا دەدات و تێكی دەدات، هەروەها هەر شتێكی دیكه، به كەسێك بسپێردرێت كه لێی نەزانێ و ناشایسته بێ، تێكی دەدات، ئنجا بەنسبەت بەرپرسیارێتییەوە، وەك گوتم شتێكی گشتییه و دەبێ لەبەردەستی هەموو خەڵك و كۆمەڵگادا بێ.

**دانا: مامۆستا! لێرەدا پرسیارێك دێتەوە پێشەوە، خۆناكرێ دەسەڵاتداران، حوكمڕانان ڕاوێژ و پرس به تاك تاكی ئەو كۆمەڵگایه بكەن، ئەمه چۆن چارەسەر دەكرێ؟**

**مامۆستا:** ڕاسته، زانایان دەڵێن كه خوا دەفەرموێ: ﴿ وَأَمْرُهُمْ شُورَىٰ بَيْنَهُمْ ﴾.

ئەوە بناغەیەكی گشتی كاروبار ئیداردانه، بەڵام میكانیزم و ڕێباز و ئامڕاز و شێوازەكانی، خوا بۆ عەقڵی مرۆڤ و پێداویستیی ڕۆژگاری بەجێهێشتوون. بەڵام پێش ئەمه، قۆناغێكی دیكەی لەپێشتر هەیه و ویستم ئەوەت بۆ باس بكەم، له ئایەتی ژماره (٥٨)ی سوورەتی (النساء)دا خوا سبحانه وتعالى ڕوو له كۆمەڵگا دەكات و دەفەرموێ:

﴿ إِنَّ ٱللَّهَ يَأْمُرُكُمْ أَن تُؤَدُّوا۟ ٱلْأَمَـٰنَـٰتِ إِلَىٰٓ أَهْلِهَا وَإِذَا حَكَمْتُم بَيْنَ ٱلنَّاسِ أَن تَحْكُمُوا۟ بِٱلْعَدْلِ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ نِعِمَّا يَعِظُكُم بِهِۦٓ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ سَمِيعًۢا بَصِيرًا ﴿٥٨﴾ ﴾ [النساء: ٥٨]

واته: به دڵنیایی خوا فەرمانتان پێ دەكات سپاردەكان به كەسانی خۆیان، كەسانی بەتوانا و شایسته بسپێرن، دوایی دەفەرموێ: هەركاتێك دادوەرییتان

لەبەینی خەڵكیدا كرد، دادگەرانە دادوەریی بكەن، باشترین ئامۆژگارییەك كە خوا پێتانی دەكات، ئائەوەیە، دوایی دەفەرموێ: ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ ﴾ پێشێ ڕوو لە كۆمەڵگا دەكات بە گشتی، لەبەرئەوەی دەگونجێ كە كۆمەڵگا تەنیا ئیماندارانی تێدا نەبن و، ناموسڵمانانیش خاوەن پشك و بەشن لە پێسپاردنی بەرپرسیارێتییدا، وەك من لە كتێبی: (ئیسلام و دەوڵەتدارێتی)دا بە تەفصیلْ باسی ئەوەم كردوە، كە ئەوە نەمبینیوە لە كتێبی دیكەدا ئاماژەی پێ كرابێ، كە بۆچی خوا سبحانە وتعالی لە ئایەتی یەكەمیاندا نافەرموێ: ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ ﴾ هەر دەفەرموێ: (إِنَّ ٱللَّهَ يَأْمُرُكُمْ) ڕوو لە كۆمەڵگا دەكات، بەگشتی ئەو كۆمەڵگایە دەگونجێ ئیماندار بن، دەگونجێ خەڵكی بێ ئیمانیشی تێدا بێت، جوولەكە بن، نەصرانیی بن،...هتد، هەموویان خاوەن پشك و بەشن لە سپاردنی بەرپرسیارێتیی بە كەسانی شایستەدا، دوای ئەوە كە ئنجا ڕوو لە كۆمەڵگای ئیماندار دەكات، لە ئیماندارەكان لە نێو كۆمەڵگادا:

﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَأَطِيعُواْ ٱلرَّسُولَ وَأُوْلِى ٱلْأَمْرِ مِنكُمْ ﴾ (النساء: ٥٩)

چونكە خوا سبحانە و تعالی ناگونجێ فەرمان بە جوولەكەیەك، بە نەصرانییەك، زەردەشتییەك، مەجووسییەك، بكات ئیتاعەی خوا و پێغەمبەری خوا (علیە الصلاة والسلام)بكات، كەسێك بڕوای بە ئەصڵی دین نەبێ، پابەند ناكرێ بە لقەكانی دینەوە، پێشێ فەرمان بە كۆی كۆمەڵگا دەكات كە بەرپرسانی خۆتان لە بەینی خۆتاندا هەڵبژێرن، كەسانی شایستە هەڵبژێرن، دوایی فەرمانیشیان پێدەكات بە دادگەرییش وڵات بەڕێوەبەرن، دوایی دەفەرموێ: ئەی بڕوادارینە! فەرمانبەری خوا بكەن و، هی پێغەمبەری خوا (علیە الصلاة والسلام) و هی كاربەدەستانێك [(أولی الأمر) واتە: كاربەدەست، كاریان بەدەستە] (منكم)، لەخۆتان.

جەنابت گوتت: ئەوە چۆن دەبێت؟

جارێ پێشێ كۆمەڵگا بەرپرسە لەوە كە كاربەدەستانی خۆی هەڵبژێرێت، دوایی كاربەدەستان بەرپرسن كە پابەندبن بە قورئان و سوننەتەوە، خەڵكیش

ده‌بێ به‌ قسه‌ی كاربه‌ده‌ستانی خۆی بكات له‌ سنووری شه‌ریعه‌ت و قورئان و سوونه‌تدا، ئه‌مجا ئه‌وه‌ی جه‌نابت ده‌ڵێی: ئه‌دی ئه‌وه‌ چۆن دیاری ده‌كرێ، كاروبار چۆن به‌ ڕاوێژ ده‌بێ؟ ئه‌و كاته‌ ئه‌و چوارچێوه‌ فراوانه‌ی كه‌ دانراوه‌، ئه‌وه‌یه‌ كه‌ ئیش به‌ شه‌ریعه‌ت بكرێ، ئه‌وه‌ی حه‌ڵاڵی خوایه‌، حه‌ڵاڵه‌ تا قیامه‌ت و، ئه‌وه‌ی حه‌ڕامه‌، حه‌ڕامه‌ تا قیامه‌ت، حه‌ڵاڵ و حه‌ڕامه‌كان له‌ جێی خۆیانن، ئه‌مرو نه‌هییه‌كان له‌ جێی خۆیانن، به‌ڵام ئه‌وه‌ی دیكه‌ هه‌مووی بۆشاییه‌ و، به‌جێهێڵراوه‌ بۆ ئیجتیهاد و هه‌ڵهێنجان، ئنجا ئه‌وه‌ی كه‌ له‌ سنووری سه‌ڵاحیه‌تی خۆیاندا بێ (هی حوكمڕان‌ء‌كاربه‌ده‌ستان) كه‌ ده‌گونجێ له‌ ده‌ستووردا ڕوون بكرێته‌وه‌، ئه‌وه‌ی له‌ سنووری سه‌ڵاحیه‌تی خۆیاندایه‌ ئیجتیهادی تێدا ده‌كه‌ن و، ئه‌وه‌ی له‌ سنووری سه‌ڵاحیه‌تی ئه‌واندا نیه‌، ده‌بێ بگه‌ڕێنه‌وه‌ بۆلای خه‌ڵك:

١- ڕاپرسی گشتی.

٢- ده‌گه‌ڕێنه‌وه‌ بۆ ده‌سه‌ڵاتی یاسادانان، په‌رله‌مان.

٣- ئه‌وه‌ش كه‌ له‌ سنووری سه‌ڵاحیه‌تی ده‌سه‌ڵاتی جێبه‌جێكردن دایه‌، وه‌ك حكوومه‌ت، خۆی ئه‌نجامی ده‌دات، له‌ هه‌موو دنیادا ئێستا وایه‌، كه‌واته‌: ئه‌وه‌ ده‌بێ وردبكرێته‌وه‌ و روونبكرێته‌وه‌، من له‌ كتێبی: (ئیسلام و ده‌وڵه‌تداریی)دا به‌ ته‌فصیل باسی ئه‌وه‌م كردوه‌ كه‌ ده‌بێ ئه‌و بابه‌تانه‌ی له‌ سنووری سه‌ڵاحیه‌تی جێبه‌جێكردندان، دیاربن، ئه‌وه‌ی دیكه‌ كه‌ له‌ سنووری ده‌سه‌ڵاتی یاساداناندایه‌، ده‌بێ دیار بێ، هه‌ندێكیشی له‌ سنووری هیچكام له‌ سێ ده‌سه‌ڵاته‌كاندا نیه‌، واته‌ نه‌ یاسادانان، نه‌ جێبه‌جێكردن، نه‌ دادوه‌ریی، ئه‌دی له‌ كوێدایه‌؟ له‌ سنووری سه‌ڵاحیه‌تی كۆی خه‌ڵك دایه‌، ده‌بێ بگه‌ڕێنه‌وه‌ بۆ ڕای خه‌ڵك و راپرسی بكه‌ن كه‌ پێی ده‌وگوترێ: گشت پرسیی، یان ڕاپرسیی، تاكو بزانن داخۆ ئه‌و خه‌ڵكه‌ له‌و باره‌وه‌ ڕای چییه‌؟

**دانا: مادام به‌ڕێزت له‌سه‌ر بارودۆخی هه‌رێم ئه‌م بابه‌ته‌ت نووسیوه‌، پرسیاره‌كه‌ لێره‌دا ئه‌وه‌یه‌ ئایا ئه‌مانه‌ی ئێستا پێیان ئه‌وترێ ده‌سه‌ڵاتدار، حوكمڕان له‌ هه‌رێمی كوردستاندا، هیچی به‌ تۆپزی نه‌هاتووه‌ته‌ سه‌ر كورسی ده‌سه‌ڵاته‌كه‌ی، هه‌مووی به‌و**

**قۆناغانەدا ڕۆیشتوون و هەڵبژێردراون، ئەدی بۆچی دەستیان بەسەر دەسەڵاتدا گرتوە و ئاقاری ئەم هەرێمەیان بەم ڕۆژە گەیاندوە؟**

**مامۆستا:** پێشتر چەند جارێك باسی ئەوەم كرد كە دەستەڵات بە گشتی هی خەڵكە، سەروەت و سامانیش بەهەمان شێوە، ئەگەر تەماشای قورئان بكەین لە دەیان ئایەتدا خوا سبحانە وتعالی كە باسی نیعمەتەكان دەكات، پاڵیان دەداتە لای خەڵك بە گشتی، بۆ وێنە:

١- دەفەرموێ: ﴿ وَسَخَّرَ لَكُم مَّا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلْأَرْضِ جَمِيعًا مِّنْهُ ﴾ [الجاثية: ١٣]

واتە: هەرچی لە ئاسمانەكان و زەویدا هەیە هەمووی لەلایەن خۆیەوە بۆ هەمووتان ڕام و دەستەمۆ كردوە.

٢- هەروەها دەفەرموێ: (وخلق لكم مافی الأرض جمیعاً) البقرة -٢٩-، واتە: هەرچی كە لە زەویدا هەیە بۆ هەموانتانی خوڵقاندوە، چونكە وشەی (جمیعاً) دەگونجێ پەیوەست بێ بە (لكم)ەوە، واتە: بۆ تێكڕاتانی خوڵقاندوە، دەشگونجێ پەیوەست بێ بە (ما في الأرض)یەوە، واتە: هەرچی لە زەویدا هەیە هەمووی بۆ ئێوە دروستكردوە.

٣- هەروەها لە سووڕەتی (الحشر)دا خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿ كَيْ لَا يَكُونَ دُولَةً بَيْنَ ٱلْأَغْنِيَآءِ مِنكُمْ ﴾ [الحشر: ٧]

واتە: بۆ ئەوەی سەروەت و سامان لە دەستی دەوڵەمەندەكانتاندا كورت هەڵنەیەت.

كەواتە: هەم دەسەڵات، هەم سەروەت و سامان، هی خەڵكن بە گشتیبەنیسبەت وەڵامی پرسیارەكەشتەوە دەڵێم: لە سیستمی حوكمڕانیی ئیسلامیی دا هەر ئەوەندە بەس نیە كەسێك بەشێوەیەكی ڕەوا چووبێتە سەر حوكم و ڕەوایەتیی لە خەڵك وەرگرتبێ، بەڵكو دەبێ پارێزگارییش بكا لە سنوورەكانی شەریعەت و بەرژەوەندیی خەڵك، ئنجا ڕەوایەتییەكەی بەردەوام دەبێت، ئەگەرنا بۆ حوكمڕانان كار بەوەندە تەواو نابێ كە بەشێوەیەكی ڕەوا چووبێتە سەر حوكم، ئێمە لەجیاتی

ئەوەى نموونە بە حوكمڕانێكى مسوڵمان بێنینەوە، دەتوانین نموونە بە هەركام لە: هیتلەر و مۆسۆلێنى و ستالین بێنینەوە، هیتلەر بەشێوەى دیموكڕاسى بوو بە حوكمڕان، بەڵام دوایى چى بە گەلى ئەڵمانیا كرد و چى بە دنیا كرد، ستالین بەو پڕەنسیپە حیزبییانەى خۆیان بوویان، بوو بەسەرۆك بەڵام دوایى بوو بە دیكتاتۆرێك، هەروەها، هەندێك لە حوكمڕانانى مسوڵمانیش لە بەنى ئوممەییە و بەنى عەبباس و عوسمانییەكان، تا ڕاددەیەك بەشێوەیەك كە ڕەنگە خەڵك قبووڵى بووبێ، ئەگەر بەبێدەنگییش تەعبیریان لەو قبووڵكردنە كردبێ، چوونە سەر كورسى حوكم، بەڵام دوایى چییان كردوە! كەواتە: ئەوەندە بەس نیە حوكمڕان ڕەوایەتیى لە خەڵك وەرگرتبێ، بەڵكو دەبێ دادگەرانەش حوكمڕانیى بكات، بۆیەش خوا دەفەرموێ:

﴿ إِنَّ ٱللَّهَ يَأْمُرُكُمْ أَن تُؤَدُّوا۟ ٱلْأَمَـٰنَـٰتِ إِلَىٰٓ أَهْلِهَا وَإِذَا حَكَمْتُم بَيْنَ ٱلنَّاسِ أَن تَحْكُمُوا۟ بِٱلْعَدْلِ ۚ ﴾ النساء -٥٨-.

كەواتە: كەسێك كە سپاردەى حوكمڕانیى پێ سپێردراوە، دەبێ بە دادگەرییش وڵات بەڕێوەبەرێ و بە دادگەرییش دادوەریى لەنێوان خەڵك دا بكات.

ئنجا لە هەرێمى كوردستان و لە عێراقدا و، لە هەر شوێنێكى دیكەدا، وەك گوتم: خەڵك و جەماوەر مافى خۆیەتى كە چاو بێ، نەك هەر ماف بگرە ئەركیشیەتى: (كلكم راع وكلكم مسئول عن رعيته) هەركامێك لە ئێوە چاودێرە بەرپرسیاریشە بەرامبەر بە چاودێریيكراوەكانى، كە بەداخەوە هەندێك لە وتاربێژەكان و بانگخوازەكان، ئەو فەرمایشتەى پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بە هەڵە مانا دەكەن، دەڵێن: هەركامێك لە ئێوە شوانە و بەرامبەر بە خەڵكەكەى بەرپرسیارە! وەك ئەوەى خەڵك ڕانەمەڕ و مێگەل بێ، بەڵام فەرمایشتەكە وا نافەرموێ، چونكە (راع) یانى: چاودێر، ئەصڵەن شوانیش بۆیە پێى دەگوترێ (راعي)، چونكە چاودێریى مەڕەكانى دەكات، واتە: هەركامێك لە ئێوە چاودێرە و بەرپرسیاریشە بەرامبەر بە چاودیرییكراوەكانى خۆى، كە خەڵك و كۆمەڵگاكەیە، بەگشتى بەرامبەر بە خەڵك و كۆمەڵگا و،

بەتایبەت بەرامبەر بە بەرپرسان دەبێ چاودێر بی، نەك هەر چاودێر بی و بڵێی: چاكت كرد و خراپت كرد، نا، بەڵكو چاودێر بی، وەك لە فەرمایشتی پێغەمبەردا (علیه الصلاة والسلام)هاتوە: (لتأمرونَّ بالمعروف ولتنهون عن المنكر، ولتقصرنهم على الحق قصراً، أو ليوشِكَنَّ الله أن يَعُمَّكم بعقاب منه)، واتە: دەبێ فەرمان بە چاكە بكەن، رێ لە خراپە بگرن و، كاربەدەستان بگێڕنەوە سەر حەق، ئەگەرنا خوا سزایەك و بەڵایەكتان بۆ دەنێرێ بە گشتی هەمووتان دەگرێتەوە.

**دانــا: پرسیارەكە با ئاوا لێ بكەم: ئایا دەسەڵات و سامان بە بڕوای جەنابت، هەم وەك نووسەر و ڕووناكبیرێك، هەم سیاسییەك قۆرخ كراوە، دەستی بەسەردا گیراوە؟**

**مامۆستا:** هیچ گومانی تێدا نیە، ئەوە شتێكی ئاشكرایە، ئنجا من با لێرەدا شتێكی ڕوون و ڕاشكاو بڵێم: زۆر جار خەڵك گلەیی لە حكوومەت دەكات و، دەڵێن: حیزب حكوومەتی قۆرخ كردوە، بەڵام ئەگەر ورد سەرنجبدەین، و تەنیا ڕواڵەتی شتەكان نەبینین، نەك گلەیی نایەتە سەر حكوومەت، بەڵێ حكوومەت خەتابارە، بەڵام نەك هۆكاری سەرەكیی ئەم قۆرخكارییە، تەنیا حكوومەت نیە، بەڵكو حیزبیش نیە، وەك زۆرجار خەڵك دەڵێ: حیزب، چونكە من ئاگادارم زۆربەی وەزیرەكان بێ چارەن، زۆربەی بەڕێوەبەرە گشتییەكان بێ چارەن، لە بەرامبەر حیزبدا، بەڵام حیزبیش بێ چارەیە لەبەرامبەر هەندێ شەخس و گرووپ و باند دا، لەڕاستییدا ئەگەر واقیع بینانە تەماشا بكەین و، پشت پەردە ببینین:

١- حكوومەت بەقەدەر خۆی گلەیی لێ دەكرێت، تۆ مادام وەزیرێكی دەبێ نەهێڵی دەستت ببەسترێ، مادام بەڕێوەبەری گشتییت، مادام پارێزگارێكی، سەرۆكی حكوومەتی، نابێ قبووڵ بكەی تۆ هیچ كارە بی، ئیرادەت ئیفلیج بكرێ و شتت بەسەردا فەرز بكرێ، ئەوە یەك.

٢- حیزبیش ئەویش بەقەدەر خۆی گلەیی لێ دەكرێت، باشە تۆ ئەندامی مەكتەبی سیاسی حیزبێكی، تۆ ئەندامی سەركردایەتی حیزبێكی، چۆن ئەندامی مەكتەبی سیاسییت لەو حیزبەدا و لە دانوان ئاویشت بەدەست نیە؟! كە من: (كلام الأقران

يُطْوى ولا يُروى) قسه‌ی ڕه‌فیقان ده‌پێچرێته‌وه‌ و ناگێڕدرێته‌وه‌، (صدور الرجال صندوق الأسرار)، سینه‌ی پیاوان صندوقی نهێنییه‌كانن، ئه‌گه‌رنا من شتم زۆر له‌لایه‌، ئه‌ندامی مه‌كته‌بی سیاسی حیزبێك كه‌ خۆی به‌ حوكمران ده‌زانێ، دێ له‌لای من داد و فیغانیه‌تی، ده‌ڵێ: هیچم به‌ده‌ست نیه‌، مه‌زڵوومم، هاتوه‌ بۆ لام، گوتوویه‌تی: من خزمێكم گیراوه‌ دوای شه‌ش جار ته‌كلیف به‌ریان دا، به‌ڵام له‌سه‌ر قسه‌ی من نا، به‌ڵكو كاتێ كه‌ خۆیان به‌ چاكیان زانی، ئه‌وه‌ ئه‌ندامی مه‌كته‌بی سیاسی، ئه‌ندامی سه‌ركردایه‌تی ئه‌و حیزبانه‌ كه‌ بڕیاربه‌ده‌ستی ئه‌م وڵاته‌ن به‌ ڕواڵه‌ت، دێ بۆ لای من ده‌ڵێ: ئێمه‌ هیچمان به‌ده‌ست نیه‌، ئاگام له‌ فرۆشتنی نه‌وت نیه‌، ئاگام له‌ پاره‌ نیه‌، ئاگام له‌ خه‌رجیی نیه‌، ئاگام له‌ هیچ نیه‌، ئه‌دی بۆ له‌وێی؟ ئه‌دی ئه‌وه‌ چ حیزبایه‌تییه‌كه‌ تۆ ده‌یكه‌ی؟! له‌به‌رئه‌وه‌ ئه‌گه‌ر ئێمه‌ ورد سه‌رنج بده‌ین و هه‌موو شته‌كان وه‌ك خۆیان ببینین، ده‌بێ حیزب به‌قه‌ده‌ر خۆی ده‌بێ گله‌یی لێ بكرێ و، حكوومه‌تیش به‌قه‌د خۆی.

٣- ئه‌و شه‌خسانه‌ش كه‌ حیزب و حكوومه‌تیان زه‌ڕبی سفر كردوه‌ و هیچیان بۆ نه‌هێشتوونه‌ته‌وه‌، ئه‌وانه‌ هۆكاری سه‌ركیی و ئاگری بن كای ئه‌و هه‌موو گه‌نده‌ڵیی و سته‌م و خراپه‌كارییه‌ی نێو هه‌رێمن. بۆیه‌ش من له‌ ته‌عبیره‌كانمدا كه‌متر وایه‌ باسی حكوومه‌ت بكه‌م، ده‌ڵێم: بڕیاربه‌ده‌ستان، ئه‌وه‌ی كه‌ بڕیاری به‌ده‌سته‌، نه‌وته‌كه‌ كێ ده‌یفرۆشێ؟ پاره‌كه‌ كێ ده‌یبات و ئاگای لێیه‌؟ ئه‌مر و نه‌هییه‌كه‌ كێ ده‌یكات؟ ئه‌صڵه‌ن كێ وه‌زیر داده‌نێ و لایده‌بات، كێ ناهێڵێ وه‌زیر هیچی بۆ بمێنێته‌وه‌، كێ حكوومه‌تی زه‌ڕبی سفر كردوه‌، ئائه‌وه‌ ده‌بێ به‌رۆكی بگیرێ و بڵێی: كه‌ی حوكمڕانیی ئاوا ده‌بێ؟ تۆ به‌ته‌مای چی؟ ئه‌م وڵاته‌ به‌ره‌و كوێ ده‌به‌ی؟!

ئنجا ئه‌و بڕیار به‌ده‌سته‌: ماڵی ناوده‌نێی، بنه‌ماڵه‌ی ناوده‌نێی، باندی ناوده‌نێی، تاكی ناوده‌نێیت، گرووپی ناوده‌نێی، گرنگ ئه‌وه‌یه‌ شتێكی بچووكتر له‌ حیزبه‌ و هیچی بۆ حیزبیش نه‌هێشتووه‌ته‌وه‌، نه‌ك بۆ حكوومه‌ت.

**دانــا: بەڵام حكوومەتەكە ئەوە بە یاسایی ئەكات!**

**مامۆستا:** ئاخر وەك گوتم، ئەو حكوومەتە بەقەدەر خۆی گلەیی لێ دەكرێت، كە تۆ چ حوكمڕانییەكە دەیكەی؟ من سەرۆكی حكومەت هەبووە پێمگوتوە، وەزیر هەبووە، كاربەدەست لەم وڵاتەدا هەبووە، گوتوومە: تۆ ئەگەر ڕێگایان دای حوكمڕانیی بكەی، بەپێی ئەو پرەنسیپ و بنەمایانە كە حوكمڕانییان لەسەر دەكرێت، بیكە، ئەگەرنا بەس عەیبەت بۆ دەمێنێتەوە و، مەیكە، كابرا هاتوە بۆ لای من گوتوویەتی: ئەگەر حیزبەكەی خۆم لێمگەڕێ، كارێكم لەدەست دێ! بەڵام حیزبەكەم، كۆسپم بۆ دروست دەكەن، گوتوومە: ئەگەر دەزانی بۆت ناكرێ، ڕایگەیەنە بە خەڵك، با ئەو خەڵكە بزانێ چ باسە، با بزانێ لە پشت هەورازەوە چی هەیە، با ئاگادار بێ، با تۆ نەبی بە نەخواردووی لە سمێڵان مەیوو، گلەییت لێ نەكرێ، كە هیچیشت بەدەست نیە.

**دانا: لە ئایەتەكەدا وشەی (أولو الأمر) هاتبوو، هەرچەندە پەیوەندیی ڕاستەوخۆی بە بەرنامەكەی ئێمەوە نیە، بەڵام چونكە لێرەو لەوێ وائەدرێ بە گوێی خەڵكیدا كە هەركەسێك دەسەڵاتدار بوو، ئەوە (اولوا الامر)ە و دەبێ پابەند بین پێیەوە و بەقسەی بكەین، جا سەرۆكی وڵاتە، سەرۆكی حكوومەتە، پارێزگارە، مودیر ناحیەیە، قائیمقامێكە، ئەوە (اولی الأمر)، حەزدەكەم بزانم تێڕوانینی تۆ لەوبارەوە چییە؟**

**مامۆستا:** تێڕوانینی من لەپێشدا ئەوەیە كە لە هەموو قورئاندا بگەڕێ، وشەی (ولی الامر) نەهاتوە، وشەی (أولی الأمر) هاتووە، ئەویش دوو جاران هاتوە، (أولی) یانی (أصحاب) خاوەنانی كار، واتە: كاربەدەستان و بڕیار بەدەستان، ئەویش لە سوورەتی (النساء)دا هەردوو جارەكە هاتوون:

**یەكەمیان:** ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَأَطِيعُواْ ٱلرَّسُولَ وَأُوْلِي ٱلۡأَمۡرِ مِنكُمۡۖ ﴾ (النساء: ٥٩)

واتە: ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! فەرمانبەریی خوا بكەن و، فەرمانبەریی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) و هی كاربەدەستانێك كە لە خۆتانن، واتە: كە بڕوادارن یان خۆتان داتان ناون و لەژێر چاودێریی خۆتاندان.

دووەمیان: ﴿ وَإِذَا جَآءَهُمۡ أَمۡرٞ مِّنَ ٱلۡأَمۡنِ أَوِ ٱلۡخَوۡفِ أَذَاعُواْ بِهِۦۖ وَلَوۡ رَدُّوهُ إِلَى ٱلرَّسُولِ وَإِلَىٰٓ أُوْلِي ٱلۡأَمۡرِ مِنۡهُمۡ لَعَلِمَهُ ٱلَّذِينَ يَسۡتَنۢبِطُونَهُۥ مِنۡهُمۡۗ ﴾ [النساء : ٨٣]

هەڵبەتە (ولي الأمر) واتە: تاكێك كە كاروبارەكانی بەدەستە، لە ئیسلامدا هیچ تاكێك بەتەنیا كاروبارەكانی بەدەست نیە، ئەوە خەڵكە و نوێنەرانی خەڵكن كە كاروباریان بەدەستە، یانی: لە ئیسلامدا دەستەڵات هەرەوەزییە، دەستەجەمعییە، بەڵێ لە هەرەمی دەسەڵاتدا شەخسێك هەیە، كە كاتی خۆی ناویان لێناوە: (خليفة) دوایی ناوی لێنراوە: (أمير المؤمنين)، دوایی ناوی لێنراوە: (سلطان) و دەگونجێ ناوی لێ بنرێ: (سەرۆك كۆمار)، (سەرۆك وەزیران)، ئەوە گرنگ نیە، بەڵام ئەو شەخسە بەتەنیا نیە لە بەڕێوەبردنی كاروباردا، بەڵكو ستافێكی لەگەڵدایە، یانی ئەوەی كە لە ئیسلامدا حوكمڕانیی دەكەوێتە دەست، سیستمی حوكمڕانی بەڕێوە دەبات، ستافە، (أولي الأمر)ە نەك (ولي الأمر)! یانی: شەخس نیە.

ئنجا دیارە كەسێك كاری بەدەست دەبێ لە نێو مسوڵماناندا، كە خۆیان كارەكەی پێ بسپێرن و خۆیان ڕەوایەتیی پێ بدەن، هیچ كەسێك:



١- بە حوكمی میراتیی.

٢- یان بە خۆ فەرزكردن.

٣- یان بەبیانووی ئەوەی كە خوێنی جیایە لە خوێنی خەڵك.

٤- یان بەبیانوی ئەوەی كە پلەیەكی ڕووحیی هەیە، وەك پاپا، بە هیچ حوكمێك لەوانە، هیچ كەسێك ڕەوایەتیی حوكمڕانیی نیە، مەگەر خەڵك بیكەن بە بەرپرسی خۆیان، ئەویش لەو چوارچێوەیەدا كە بۆی دیاری، دەكەن و بەسەریشیەوە چاودێر دەبن، ئەبوبەكر ڕەزای خوای لێ بێت كە بوو بە خەلیفەی مسوڵمانان، یەكەمین جێنشینی پێغەمبەر (عليه الصلاة والسلام) لە یەكەم وتاریدا، دوای حەمد و سەنای خوا، گوتی: (أما بعد أيها الناس فإني قد وليِّتُ عليكم ولست بخيركم إن أحسنتُ فأعينوني، وإن أسأت فقوِّموني ... أطيعوني ما أطعت

الله ورسوله، فإذا عصيت الله ورسوله فلا طاعة لي عليكم)[1]، واته: من كراوم به سەرپەرشتيار به سەرتانەوە و خۆم له ئێوه به باشتر نازانم، ئەگەر فەرمانبەريى خوا و پێغەمبەرەكەيم كرد، فەرمانبەريم بكەن، بەڵام ئەگەر سەرپێچييم لێيان كرد، ئەوە فەرمانبەريى بۆ كرانم لەسەرتان پێويست نيه، ئەگەر چاكەم كرد هاوكاريم بكەن، ئەگەر خراپەم كرد ڕاستم بكەنەوە. كەواتە: ئەوەی كه پێی وايه: هەركەسێك دەسەڵاتی هەبوو له كۆمەڵگايەكی مسوڵماندا و وڵاتێكی مسوڵماندا، تەنيا دەسەڵات هەبوونەكە پاساوی ئەوەيە كه حوكمڕان بێ، له ڕاستييدا ئەو قسەيە قسەيەكی زۆر غەريب و نامۆيە به شەريعەت، چونكە ئەگەر وابێ وەك من جاری ديكەش له موناسەبەتی ديكەدا گوتوومە: نەدەبوو نه مووسا له قسەی فيرعوون دەرچووبا، نه ئيبراهيم له قسەی نەمردوود دەرچووبا، نه موحەممەد له قسەی ئەبوجەهل دەرچووبا، صەڵات و سەلامی خوا لەسەر پێغەمبەران بێ، بەڵام هەر مووسايە به گژ فيرعوندا دەچێ و، ئيبراهيمە به گژ نەمردووددا دەچێ و، موحەممەدە به گژ ئەبوجەهل و تەبەقە سياسييەكەی مەككەدا دەچێ، لەبەرئەوەی كه دەسەڵات و سامانيان قۆرخ كردوە، بۆيە ئەو قسەيە قسەيەكی غەريبە به ڕووحی ئيسلام، به شەريعەت و، به مێژووی پێغەمبەران ((عليهم الصلاة والسلام)، چونكە پێغەمبەران هاتوون ئەوانەی كه سەروەت و سامان و دەسەڵاتيان قۆرخكردوە، خستوويانەته ژێر ركێفی خۆيان، به گژ ئەواندا چوونەتەوە.

**دانـــا: چ پەيامێكی له پشتەوەيه ئەم جۆره تەفسير كردنه بۆ (أولی الأمر)؟**

**مامۆستا:** من پێموايه بەس پينەكردنی زوڵم و ستەمی حوكمڕانانی ستەمكاری لەپشتەوەيە، تەنيا زەمينەخۆشكردن بۆ حوكمی ديكتاتۆريی، حوكمی ميراتيی، حوكمی بنەماڵەيی، خۆسەپاندن، كه هەر ئەوەشە گرفت و كێشەی هەره گەورەی مسوڵمانان و، ئەوەشە كه هێزو پێزی موسڵمانانی نەهێشتوە، له هەر وڵاتۆكەيەكی مسوڵماناندا دەوڵەتۆكەيەك قيت بووەتەوە و بنەماڵەيەك حوكم دەكات، چەندان

---

(١) السيرة النبوية لآبن هشام، ج٤ص٣٩٣ .

ساڵە، شەخسێك حوكم دەكات، هەركەسێك دەسەڵاتی هەبوو وەك كاتی خۆی هەندێكیان گوتوویانە: (من اشتدت وطأتهُ وجبت طاعته) هەرچی هێزی زۆر بوو، دەبێ بە قسەی بكرێ، جا ئەگەر بەو مەنتیقە بێ، دەبێ مسوڵمانان هەركەسێك خۆی بەسەردا فەرز كردن، بڵێین: قوربان ئێمە لە خزمەتتداین، كەی شتی وا هەیە؟! ئەگەر وابووایە ئەدی پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) لە كێ ڕاپەڕیون؟! دوژمنانی پێغەمبەران (مستكبیرین) بوون، (مترفین) و، (مسرفین) و (مجرمین) بوون، ئەهلی زوڵم بوون، ئایا پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) شوێنكەوتووەكانیان كێ بوون؟ (مستضعفین) و چەوساوەكان بوون، ئەوانەی كە فیرعەونەكان پێیان گوتوون (أراذل) خەڵكە سادەكە، ڕەش و ڕووت و بەش خوراوەكان بوون، ئنجا ئەگەر بەو مەنتیقە بێ، دەبوو‌بیە هیچ پێغەمبەرێك لەگژ هیچ فیرعەونێك رانەچێت!!.

**دانــا: مامۆستا! ئەگەر بە مێژوودا بچینەوە، دەبینین تێكڕای حوكمڕانە خۆسەپێن و ستەمكارەكان، هەڕەشەی شاربەدەركردنی نەیارەكانی خۆیان دەكەن، هەڕەشەی خستنە سووچی زیندانە تاریكەكانی خۆیان لەنەیارەكانیاندەكەن، ئەمە لە چییەوە سەرچاوەی گرتوە و ئەمە بۆ؟**

**مامۆستا:** ئەمە شتێكی سروشتییە بۆ كەسێك كە بەشێوەیەكی ناڕەوا حوكمڕانیی دەكات و بەناڕەوایی چووەتە سەر حوكم، یاخود ڕەوایەتی وەرگرتوە لە ئەصڵدا، بەڵام دوایی لایداوە و بەناڕەوا حوكم دەكات، چی بكات، پەنابەرێتە بەر چی بۆ ئەوەی نەیارەكانی خۆی بێدەنگ بكات، چارەی هەر ئاگر و ئاسن و زیندانی كردن و دەركردنە، ئنجا ئەوەی ئاماژەت پێدا لە سووڕەتی (ابراهیم)دا خوا سبحانه و تعالی هەموو پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) لە دەشتێكدا كۆدەكاتەوە، نەیارەكانیشیان لە بەرامبەریاندا، دوای ئەوەی كە پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) بەیەك دەنگ پەیامی خۆیان دەگەیەنن بە خەڵك، بەتایبەتی بە زلە زلەكان، خوا دەفەرموێ:

﴿ وَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ لِرُسُلِهِمْ لَنُخْرِجَنَّكُم مِّنْ أَرْضِنَآ أَوْ لَتَعُودُنَّ فِي مِلَّتِنَاۖ ﴾ [إبراهيم: ١٣]

واته‌: ئه‌وانه‌ی بێ بڕوا بوون، به‌ پێغه‌مبه‌ره‌كانی خۆیانیان گوت [واته‌: هه‌موویان ئه‌وه‌ قسه‌یان بووه‌] یان له‌ نیشتمانی خۆمان وه‌ده‌رتان ده‌نێین، یان ده‌گه‌ڕێنه‌وه‌ سه‌ر رێبازی ئێمه‌ ﴿فَأَوۡحَىٰٓ إِلَيۡهِمۡ رَبُّهُمۡ لَنُهۡلِكَنَّ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴾ [إبراهيم : ١٣]، په‌روه‌ردگاریان سروشی بۆ كردن، بۆ پێغه‌مبه‌ران، خه‌متان نه‌بێ سته‌مكاران ده‌فه‌وتێنین.

كه‌واته‌: كێن ئه‌وانه‌ی كه‌ هه‌ڕه‌شه‌ی شاربه‌ده‌ركردن و نانبڕین و زیندانییكردن به‌ ئاگر و ئاسن مامه‌ڵه‌ له‌گه‌ڵدا كردن، له‌ خه‌ڵك ده‌كه‌ن، ئه‌وه‌ سته‌مكارانن، ئه‌و سته‌مكارانه‌ی خوا ده‌فه‌رموێ: (لَنُهۡلِكَنَّ ٱلظَّٰلِمِينَ ) [إبراهيم : ١٣]، به‌دڵنیایی سته‌مكاران له‌به‌ین ده‌به‌ین، كه‌ ئه‌وه‌ش سوننه‌تی خوایه‌، ئه‌وه‌ قانوونی خوایه‌، ئه‌وه‌ لێره‌دا خوای په‌روه‌ردگار به‌ وه‌حی بۆ پێغه‌مبه‌رانی ناردوه‌، به‌ڵام قانوون و سوننه‌تێكی خۆیه‌تی له‌ ژیانی به‌شه‌ردا، ڕوونی كردووه‌ته‌وه‌، واته‌ ئه‌ی پێغه‌مبه‌ران! (علیهم الصلاة والسلام) له‌و هه‌ڕه‌شه‌ و گوڕه‌شه‌یه‌ مه‌ترسێن، چونكه‌ دوایی ده‌فه‌رموێ:

﴿ لَنُهۡلِكَنَّ ٱلظَّٰلِمِينَ ١٣ وَلَنُسۡكِنَنَّكُمُ ٱلۡأَرۡضَ مِنۢ بَعۡدِهِمۡۚ ذَٰلِكَ لِمَنۡ خَافَ مَقَامِي وَخَافَ وَعِيدِ ١٤ ﴾ [إبراهيم : ١٣- ١٤]

مسۆگه‌ر ئێوه‌ش ده‌كه‌ینه‌ جێنشین له‌ شوێنی ئه‌وان، ئه‌وه‌ بۆ هه‌ر كه‌سێكه‌ كه‌ له‌ پله‌و پایه‌ی من بترسێ و له‌ هه‌ڕه‌شه‌ی من بترسێ [نه‌ك له‌ هه‌ڕه‌شه‌ی ئه‌و حوكمڕانه‌ سته‌مكارانه‌ی كه‌ به‌وشێوه‌یه‌ مامه‌ڵه‌ له‌گه‌ڵ خه‌ڵكی خۆیاندا ده‌كه‌ن، كاتێك داوای مافه‌كانی خۆیان ده‌كه‌ن، ده‌ڵێن یا ده‌رتان ده‌كه‌ین، یا ده‌بێ ملكه‌چمان بن] كه‌واته‌: په‌نابردنه‌به‌ر ئاگر و ئاسنی گاغووته‌كان له‌وه‌وه‌ سه‌رچاوه‌ ده‌گرێ كه‌سێك كه‌ حه‌قی پێنه‌بوو، په‌ناده‌باته‌ به‌ر ناحه‌ق، كه‌سێك كه‌ ئه‌هلی عه‌دل نه‌بوو، په‌ناده‌باته‌ به‌ر زوڵم.

**دانـا: كە بەداخەوە ئێستا لە هەرێمەكەی ئێمەدا، هەم كۆمەڵە خەڵكانێك هەن بەبێ تاوان لە كونجی زیندانەكان خراون، هەم خەڵكانێك هەن لەسەر هەر جۆرە قسەو بیروڕایان بێ لە دەڤەری ئەلیف جێیان نابێتەوە، دەبێ بچنە دەڤەری با، لە دەڤەری (با)دا جێیان نابێتەوە، دەبێ بچنە دەڤەرێكی تر، مامۆستا تا چەند خوای دادگەر و تۆڵەسێن، ئەوەی كردووەتە یاسایەكی خۆی، وەكو ئەوترێ سوننەتی ئیلاهی بێت، كە هەركەسێ ستەمكار بێت، هەركەسێ زاڵم بێت، هەركەسێك قۆرخكار بێت، چ لە دەسەڵات دا، چ لە سامانی خەڵكیدا بێ، خوای گەورە لەناوی ئەبات؟**

**مامۆستا:** لە چەندان ئایەتی قورئاندا، ئەوە وەك یاسایەكی خوا باسكراوە:

١- هەر ئەو ئایەتەی تۆزێك لەمەوپێش ئاماژەمان پێدا، : ﴿ فَأَوْحَىٰٓ إِلَيْهِمْ رَبُّهُمْ لَنُهْلِكَنَّ ٱلظَّـٰلِمِينَ ﴾ [إبراهيم : ١٣]،

پەروەدگاریان سروشی بۆ كردن، بۆ پێغەمبەران، (لَنُهْلِكَنَّ ٱلظَّـٰلِمِينَ ) [إبراهيم : ١٣]، ئەو لامە لامی قەسەمە، نوونەكە نوونی تەئكیدە، یانی: بەدڵنیایی، بە مسۆگەریی ئێمە ستەمكاران دەفەوتێنین.

٢- لە سوورەتی (القصص)دا دەفەرموێ: ﴿ وَمَا كُنَّا مُهْلِكِى ٱلْقُرَىٰٓ إِلَّا وَأَهْلُهَا ظَـٰلِمُونَ ﴾ [القصص : ٥٩]

ئێمە فەوتێنەری ئاوەدانییەكان نەبووین، مەگەر خەڵكەكەیان ستەمكار بن.

٣- لە سوورەتی (الأنبیاء)دا دەفەرموێ: ﴿وَكَمْ قَصَمْنَا مِن قَرْيَةٍ كَانَتْ ظَالِمَةً ﴾ [الأنبیاء: ١١]

زۆر ئاوەدانییمان لەبەین بردن، كە خەڵكەكەی ستەمكار بوون، لە زۆر شوێنی قورئاندا خوای پەروەردگار ئەو ڕاستییەی ڕوونكردووەتەوە و بۆ مەسەلەیەكیش ئێمە پێویستیمان بە بەڵگەی نەقڵیی ناكات، خۆی هەر شتێك بەڵگەی عەقڵیی بیگەیەنێ پێویستی بە بەڵگەی نەقڵی ناكات، تەماشای مێژووی بەشەر بكە، لە چ كاتێك دا كۆمەڵگاكان فەوتاون، لەكاتێكدا كۆمەڵێكی كەم قۆرخكار دەبن بۆ دەسەڵات و سەروەت و سامان و، خۆدەسەپێنن بەسەر خەڵكدا،سەرەنجام خەڵك

بێزار دەبێ‌ هاوسەنگیی كۆمەڵگا تێكدەچێ، شیرازەی كۆمەڵگا دەپچڕێ و خەڵك تووڕە دەبێ و تووشی نائومێدیی دەبێ و، بەگژیاندا دەچنەوە و وڵاتەكە تێكدەچێ، هەروا بووە.

هەڵبەتە خوای پەروەردگار كە دەفەرموێ ئاوەدانییەكان بەهۆی ستەمەوە دەفەوتێنین، مەبەست ئەوەنیە فریشتەیەك بێت و گورزێكیان لێ بدات و وردوخاشیان بكات!! بەڵكو خوا لە سوورەتی (الإسراء)دا زۆر جوان ئەوەمان بۆ شیی دەكاتەوە، دەفەرموێ:

﴿ وَإِذَآ أَرَدۡنَآ أَن نُّهۡلِكَ قَرۡيَةً أَمَرۡنَا مُتۡرَفِيهَا فَفَسَقُواْ فِيهَا فَحَقَّ عَلَيۡهَا ٱلۡقَوۡلُ فَدَمَّرۡنَٰهَا تَدۡمِيرٗا ١٦ ﴾ [الإسراء: ١٦]

واتە: هەركات ویستمان ئاوەدانییەك لەبەین بەرین، فەرمان دەكەین بە خۆشگوزەرانەكانی، [بەزۆری وایە خۆشگوزەرانەكان، ئەوانەن كە دەسەڵاتدارن، ئەوانە سەروەت و سامان بۆ خۆیان قۆرخ دەكەن] فەرمانیان پێدەكەین [واتە: فەرمانیان پێدەكەین بە چاكە] (فَفَسَقُواْ فِيهَا) لادانیان تێدا كرد، (فَحَقَّ عَلَيۡهَا ٱلۡقَوۡلُ) قسە لەسەری هاتە دی، واتە: بڕیاری خوا و فەرمانی خوا لەسەری هاتە دی، كە هەر كۆمەڵگایەك، كۆمەڵێكی كەم تێیدا دەست بەسەر هەمووشتێكیدا بگرن و، خەڵكەكەی بخەنە ژێر زەخت و هەیمەنەی خۆیانەوە، ئەوە بڕیاری خوایە، دەبێ لەبەین بچێ، (فَدَمَّرۡنَٰهَا تَدۡمِيرٗا)، سەرەنجام بەكاولكردن كاولمان كرد.

لێردا نابێ بە سادەیی لەم ئایەتە تێبگەین لێرەدا خوا باس سوننەت و قانوونێكی خۆی دەكات لە مێژووی بەشەردا، باسی ئەوە ناكات و فریشتەیەك بێت و وێرانی بكات، یاخود بوومەلەرزەیەكی لێبدات، بەڵێ كاتی خۆی لە گەلە پێشووەكاندا خوای كارزان هەندێك بەڵای گشتی بۆ هەندێك خەڵك ناردوە، وەك: [عاد و ثەموود و گەلی لووط و گەلی فیرعەون و گەلی نووح بە تۆفان، بەڵام لێرەدا خوا باسی یاسای گشتی خۆی دەكات، كە مەرج نیە تەنیا لەوچەند موفرەدەیەدا ئەو یاسایە بەرجەستە بووبێ، تەنیا خەڵك بە تۆفان

فەوتابێ، بە تۆفانی نووح، یان لە دەریای سووردا، وەك گەلی فیرعەون، یاخود بە با، وەك گەلی عاد، یاخود بە چریكە وەك گەلی ئەموود، مەرج نیە، بەڵكو كێشەی نێوخۆش،هۆكارێكیی فەوتێنرانی كۆمەڵگایەكانە.

**دانــا: ویستم ئەوە بپرسم: ئێستا ئەم هەرێمەی ئێمە بەبڕوای تۆ سەری نەناوە بەوەوە كە بەرەو ئەو لەناوچوونە بچێ؟ ئێستا خەڵك بر سییە، لێرەو لەوێ خەڵك زۆر بێتاقەتن، زۆر بێزار و زۆر پەستە؟**

**مامۆستا:** كاكە دانا! من ڕەشبین نیم، بەڵام بەڕاستی ناشمەوێ لەگەڵ گەل و كۆمەڵگای خۆمدا ڕوون و راست و ڕاشكاو نەبم، هەمیشە عادەتم وابووە، ڕەشبین نیم، بەڵام لە هەندێ لەو بنەمایانەدا گوتوومە: وەك چۆن: دوو كۆ دوو دەكاتە چوار (٢+٢=٤)، من دڵنیام ئەم هەرێمەی ئێمە، ئەگەر بڕیاربەدەستانی ئەم هەرێمە چاو بە هەڵەی خۆیاندا نەگێڕنەوە، لادانەكانی خۆیان چاك نەكەن، ڕووپەڕێكی دیكە لەگەڵ خەڵكەكە هەڵنەدەنەوە، وەرچەرخانێك نەهێننە كایەوە، ئەگەر ئەو شێوە حوكمڕانییەی كە گرتوویانەتە بەر، هەر لەسەری بەردەوام بن، وەك چۆن: دوو كۆ دوو دەكاتە چوار، من ئەنجامەكەم لەبەرچاوە كە ئەم هەرێمەی ئێمە بەم شێوەی ئێستا نامێنێتەوە، من ناڵێم قیامەت دێ، بەڵام بەم شێوەیە پێموایە هەلی زۆر گەورە لەدەست دەدەین، ئێمە دەگونجێ شتی زۆر باش بكەین، هەڵبەتە پێشتر زەمینەمان بۆ ڕەخساوتر بوو، بەڵام بەڕاستی پەكخستنی پەرلەمان و ئیفلیجكردنی حكوومەت و، وردە وردە بەرەو دوولەتكردنی هەرێمچوون، لەخۆباییبوون و هەنگاوبەرەو یەكدی نەنانەی ئەوانەی كە بڕیاربەدەستن، چونكە ئەوەی كە هیچی بەدەست نیە هەنگاوی چی بنێ، مەگەر هەر بچێ بپاڕێتەوە، ئەگەر ئێمەین، ئەگەر هەر كەسێكە، كە ڕەنگە بە ئەندازەی پێویست پاڕابیشینەوە و، ئەوەش كاتی بەسەرچوو، زۆر بەرەو دواچوینەوە. ئێستا ئەوەی بڕیاربەدەستە ئەگەربێت و وەرچەرخانێك نەكەن،ئیرادەی خۆیان بە جیددیی نەخەنە كار، پێموایە ئەم هەرێمە ناگونجێ ئاوا بەردەوام بێ، ناگونجێ بەردەوام بێ، مانای وانیە كە وەك گوتم ئاخر زەمانە و، هەموو شتێك كۆتایی دێ، بەڵام بێگومان ئەم وەزعەی ئێستا نامێنێ، بەشێوەیەكی دیكە دەبێ و، ڕەنگە

ئێمه زۆر بەرەو دواوه بچینه‌وه، له‌وانه‌یه زۆر هه‌ل و ده‌رفه‌تمان له‌ده‌ست بچێ، كه بگونجێ ئه‌م وه‌زعه‌ی ئێستامان بكه‌ینه بناغه‌یه‌ك، بكه‌ینه زه‌مینه‌یه‌ك بۆ ده‌ستكه‌وتی زۆر گه‌وره‌تر، ئه‌وانه‌مان له‌ده‌ست ده‌چێ!

**دانـا: بەڵێ، مامۆستا! له قورئاندا ئه‌گه‌ر له‌لای ڕاست بۆ لای چه‌پ جوان موتابه‌عه‌ی بكه‌ین، جوان بیخوێنیته‌وه، زۆر ناوی فیرعه‌ونی تیایه، كه ڕه‌مزی ده‌سه‌ڵاتدارێكی خۆسه‌پێنه زۆر دووباره كراوه‌ته‌وه، مه‌به‌ست له‌وه چییه، خوای په‌روه‌ردگار ئه‌وه‌نده ئه‌م چیرۆكه ئه‌داته‌وه به گوێی موسڵمانان و تێكڕای كۆمه‌ڵگا؟!**

**مامۆستا:** له‌و مه‌وسووعه‌یه‌ی كه له زیندانی ئه‌مریكییه‌كاندا نووسیومه: (الإسلام كما يتجلّى في كتاب الله)، له باسی پێغه‌مبه‌راندا (عليهم الصلاة والسلام) ئه‌و پانتاییه‌ی كه بۆ به‌سه‌رهاتی هه‌موو پێغه‌مبه‌ران ته‌رخان كراوه، هێناومه، هه‌موو ئایه‌ته‌كان، زۆرترین پانتایی له قورئاندا ته‌رخانكرابێ بۆ به‌سه‌رهاتی مووسا (عليه الصلاة والسلام) و فیرعه‌ون و گه‌لی به‌نی ئیسرائیل له به‌رامبه‌ری فیرعه‌وندا، ته‌رخان كراوه.

**دانـا: به‌بڕوای تۆ هۆكار چییه؟**

**مامۆستا:** هۆكاره‌كه‌ی ئه‌وه‌یه كه ئا ئه‌و حاڵه‌ت و ڕووداوه له هه‌موو شتێك زیاتر دووباره بووه‌ته‌وه و دووباره‌ده‌بێته‌وه له ژیانی به‌شه‌ردا، فیرعه‌ونایه‌تیی له حوكمڕانانداا له ده‌سه‌ڵاتداراندا، له هه‌موو شتێك به‌رجه‌سته‌تر و دیارتره، ئنجا نه‌ك هه‌ر فیرعه‌ون به ته‌نیا، خوای دادگه‌ر له‌گه‌ڵ فیرعه‌وندا باسی دوو كه‌سایه‌تی دیكه‌ش ده‌كات، باسی (قاروون) ده‌كات و باسی (هامان)یش ده‌كات، زۆرجار به‌یه‌كه‌وه ده‌یانهێنێ:

﴿ وَقَٰرُونَ وَفِرْعَوْنَ وَهَٰمَٰنَ ۖ وَلَقَدْ جَآءَهُم مُّوسَىٰ بِٱلْبَيِّنَٰتِ فَٱسْتَكْبَرُوا۟ فِى ٱلْأَرْضِ وَمَا كَانُوا۟ سَٰبِقِينَ ﴾ العنكبوت: ٣٩.

باسی هه‌رسێكیان ده‌كات، چونكه ئه‌وان ئه‌و سێیه، سێكوچكه‌یه‌كن ڕه‌مزی سێ ده‌سه‌ڵات، ره‌مزی سێ شت.

**یەکەم:** فیرعەون ڕەمزی دەسەڵاتێکی قۆرخکاریی سیاسی، ڕەمزی ئیستیبدادی سیاسی.

**دووەم:** هامان ڕەمزی چەواشەکاری ئیعلامییە.

**سێیەم:** قارونیش ڕەمزی چەوساندنەوەی ئابووریی و ئیستیغلالی ئیقتیصادییە، ئەم سێیە بەدرێژایی مێژوو، بەزۆریی پێکەوە بوون، تۆ ئێستاش تەماشا بکە! چ لە هەرێمی خۆماندا، چ عێراق، چ لە هەر وڵاتێکی دیکەی دنیا، کاتێك کە دەسەڵاتی سیاسی لادەدا، ئینحیراف دەکا، پەنا دەباتە بەر کێ؟ جارێ کێ لە دەوری خۆی دەئاڵێنێ؟ پارەدار و دەوڵەمەندانێك کە لە پەنای ئەو دەسەڵاتەدا، ئەو دەسەڵاتە سیاسییەدا، کەسابەت دەکەن، کە (ابن خلدون) دەڵێ: هەرکاتێك چینی سیاسی بوو بە بازرگان، وڵات کاول دەبێ، وەك زۆرجار گوتوومانە: ئێستا لە پەناءبن باڵی حکوومەت دا حیزب و خزم، دەبنە ملیاردێر، لەسەر حیسابی ئەو خەڵکە ڕەش و ڕووتە، ئێ باشە ئەوەیان لە کوێ هێنا؟ بێگومانهەرچی خەڵکە و لێیان دزیون، زۆرینەکە بۆیە لەبەریان براوە، چونکە کەمینەکە لەسەریەوە ڕژاوە، زۆرینەکە لەبەری براوە، بۆیە ئەو کەمینە لەسەری دەڕژێ.

هەروەها حوکمڕانی ستەمکار و خۆسەپێن پەنا دەباتە بەر ڕاگەیاندنی چەواشەکارانە:

﴿ وَقَالَ فِرۡعَوۡنُ يَٰهَٰمَٰنُ ٱبۡنِ لِي صَرۡحٗا لَّعَلِّيٓ أَبۡلُغُ ٱلۡأَسۡبَٰبَ ﴿٣٦﴾ ﴾ غافر: ٣٦

واتە: فیرعەون گوتی: ئەی هامان! کۆشکێکم بۆ دروست بکە، با تەماشا بکەم بزانم پەروەردگاری مووسا لە کوێیە؟ ئەوەیە چەواشەکاریی، هەمیشە ڕاگەیاندنی چەواشەکارانە، ئەو دەهۆڵکوتانەی ماستاو دەکەن و، دنیا بەجۆرێکی دیکە پێشانی دەسەڵاتداران دەدەن، بەسەهوویان دەبەن، کڵاویان لەسەر دەنێن، لەپێناوی ئەوەدا کە خۆیان پاروویەکیان دەست بکەوێ، بەرماوێکیان دەست بکەوێ، ئا ئەو سێکوچکەیە:

١- حوکمڕانی ستەمکار.

٢- ئەوانەی كەسابەت دەكەن لەپەنای ئەو دەسەڵاتدارە ناشەرعیی و حوكمە خۆسەپێنەدا.

٣- ئەوانەی كە چەواشەكاریی دەكەن، ئەو سێیە هەمیشە پێكەوەن، كە یەكەمیان: ڕەمزی چەوسانەوەی سیاسی، بریتیە لە فیرعەون، دووەمیان: ڕەمزی چەواشەكاریی ڕاگەیاندن بریتیە لە هامان، سێیەمیان: ڕەمزی چەوساندنەوەی ئابووریش، بریتیە لە قارون. ئنجا ئایا پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) لە بەرامبەر ئەو سێ دەسەڵاتەدا، لەبەرامبەر ئەو سێ كوچكە شوومەدا، پەنایان بردووەتە بەرچی؟ دووشتیانرەچاوكردوون: كاریان لەسەرئەوەكردوە كە عەقڵی خەڵكی هۆشیار بكەنەوە و، دڵیشیان بێدار بكەنەوە، عەقڵیان بە زانیاری ڕاست و دروست، هۆشیار بكەنەوە و ڕوون بكەنەوە، دڵیشیان بە هۆی ئیمان و پەیوەندیی لەگەڵ خواوە بێدار بكەنەوە، چونكە ئەگەر خەڵك عەقڵی هۆشیار و دڵی بێدار بێ، هەرگیز كۆیلایەتیی ناكات.

**دانـــا: زۆر باشە، بیرۆكەی ئەو سێ كوچكە شوومەی جەنابت ئاماژەت پێكرد، بە بڕوای جەنابی مامۆستا عەلی باپیر، لە هەرێمی كوردستان چەكەرەی كردوە؟ یان نەخێر جارێ نەگەیشتوونەتە ئەو ئاستە؟**

**مامۆستا:** كەم و زۆر ئەو حاڵەتە دەبینم، وەك گوتم لەگەڵ خەڵك و كۆمەڵگای خۆماندا ڕاستدەكەم و، ڕوون و راشكاوم، وەختێك كە ئیرادەی حیزبێك كۆی وڵات دەخاتە بەردەستی خۆی، چەند ماڵێك، چەند بنەماڵەیەك، چەند كەسێك، نیشانەی پرسیار دەخەنە سەر خۆیان كە واریداتی ئەم وڵاتە، نەوتی ئەم وڵاتە، خێروبێری ئەم وڵاتە، لەبەردەستی ئەواندایە، وەختێك حیزبێك بتوانێ گەورەترین دەسەڵاتی ئەم هەرێمەی ئێمە كە پەرلەمانە پەكی بخات، ئەدی ئەمە چی پێ دەگوترێ؟! وەختێك كە ئەو هەموو پارە بەهەدەر دەدرێ، دەدرێ بەو كەناڵانەی كە شەووڕۆژ دەهۆڵ دەكوتن بۆ هەندێك كەس و، دەهۆڵ دەكوتن لە دژی هەندێك كەس، ئنجا ئەگەر كەناڵی ئاسمانییە، ئەگەر ڕادیۆیە، ئەگەر گۆڤار و ڕۆژنامەیە، ئەگەر سایتە، هەموو كەس دەزانێ، گۆڤاری وا هەیە نافرۆشرێ،

زۆرجار یان وێنەیەكی بەندەی لێدەدەن لە بەرگەكەی، یان هی كەسێكی دیكە، بۆ ئەوەی بۆیان بفرۆشرێ، خەڵك دەڵێن: دەبێ چی عەجایبی تێدا هەبێ، لەوانەیە دوو سەد سێسەد كەس ئەو گۆڤارە بخوێنێتەوە، بەڵام چەند هەزارێكی لێ چاپ بكەن، رۆژنامەی وا هەیە رۆژانە بە بەلاش هەزاران دانەی تەوزیع دەكرێت، پارەكەی لەكوێ دەهێنرێ؟ باشە تۆ راگەیاندنی چەواشەكارییت بۆچییە، ئەگەر دەسەڵاتێكی غەشیمت نەبێ؟! ئەوەی پاكە بێ باكە، باشە تۆ بۆچی پارە لەو هەموو ئیعلام و راگەیاندنە دەدەی، ئەگەر تۆ پاكی بێباكی قسەی خۆت دەكەی روون و راشكاو، من ئاوایە وەزعم، ئەدی ئەو هەموو دەهۆڵ كوتانەت بۆچین؟!

ئەو هەموو چەواشەكارییەت بۆچییە؟ ئەو هەموو قسەگوتنەت بە خەڵك بۆچییە؟ بۆ هێندە هەوڵ دەدەی خەڵك ناشیرین بكەی، خۆت ئەو هەموو بە باڵا هەڵگوتنەی خۆتت بۆچییە؟ رێك و روون من ئەوەم و تەواو! بەڵێ پێموایە ئەو سێكوچكەیە لێرەش زۆر چاك سەر و سیمای دەركەوتوە، بەڵكو گەیشتووەتە قۆناغێكی ترسناكیش، هەرئەوەنیە چەكەرەی كردبێ، من پێموایە گەیشتووەتە قۆناغێكی ترسناك، كە ئەگەر فریای خۆمان نەكەوین، وا هەست دەكەم ئێمە ئەم هەرێمە ئەم قەوارەیە، ئەم ئەزموونەی خۆمان، نزیك خستووەتەوە لە ئاكامێكی شووم و لە سەرەنجامێكی خراپ!

**دانـــا: مادام ئەوەی ئاماژەت پێكرد لە چەكەرەش تێپەڕیوە لە میانی بەرنامەكەشت دا فەرمووت: ئێمە تەنانەت چەند جارێك پاڕاوینەتەوە،لە دەسەڵاتداران، بۆ بەرژەوەندیی ئەو خەڵكە، كە بە قسەی ئێوە نەكراوە و، وەزعەكە هەر وایە، لێرەدا بە كورتیی ئەركی هاووڵاتییان چییە؟**

**مامۆستا:** لە ئیسلامدا هیچ كەس بە تەنیا بەرپرسیار نیە، هەموومان بەرپرسیارین، هەموومان خاوەن مافین، خاوەن پشك و بەشین لە دەستەڵات و لە سەروەت و ساماندا، كە خاوەن پشك و بەشین، خاوەن مافین، كەواتە: بەرپرسیاریشین، تۆ دەبێت بەرگریی بكەی لە مافەكەی خۆت كە لێیان زەوت كردووی، لێیان ستاندووی، ئەركی هەموو لایەكە، كە ئەوەی پێویست دەكات بیكەین، بە یەك

دەستيی و يەكدەنگيی بيكەين، بەڵام كە ئەو قسەيەش دەكەم، چاويشم زۆر لە چواردەورمانە، لە هاوكێشەكانە، لە گۆڕانكارييەكانە كە لە ناوچەكەدان، دەبێ زۆر بە وريايیانە مامەڵە بكەين، بەڵام هەندێك جاريش خەڵك نە لەسەر قسەی من ڕادەوەستێ و نە لەسەر قسەی تۆ، نە بە قسەی كەسيشەوە پابەند دەبێ، بەتايبەتی برسێتيی و بێ مووچەيی و بێ ژيانيی و بێ كاريی، بۆيە لێرەشەوە جارێكی ديكە داوا دەكەم بە ئيلحاحەوە داوا دەكەم: با خەڵك نەگەيەنينە نائوميديی، خەڵك گەيشتنە نائوميدی زۆر جێگای مەترسييە، كوردەواريی خۆمان دەڵێن: برسێتيی ڕەگێكی هاری پێوەيە!! خەڵك نائوميد نەكرێ باشە و، لە فريای وەزعەكە بكەوين باشە، ئيدی ئێمە ئێستا هەرئەوەندەمان لەدەست دێ و ئەوەشمان زۆرجاران گوتوە، بەشێوەی تايبەت گوتوومانە، بەشێوەی گشتی گوتوومانە، ئەوكاتە خەڵكيش پێش ئەوەی من و تۆش پێی بڵێين، ئەركی سەرشانی خۆی دەزانێ و بە هەقيشی دەزانێ، جاری واش هەيە بۆ داواكردنی حەقەكەی خۆی ناحەقێكيش دەكات، وە لێرەدا ئامۆژگاريی هەر كەسێك دەكەم كە گوێمان لێ دەگرێ، كە ئەگەر هەركەسێك داوای حەقێكی خۆی كرد، دەبێ وريابێ حەقەكەی خۆی بە شێوەی حەق داوا بكات و ناحەقی ڕەگەڵ نەخات، با كارێك نەكەين بەدەستی خۆمان ماڵی خۆمان كاول بكەين، چونكە بە داخەوە ئێمە ئەزموون و پێشينەيەكی باشمان نيە لە خۆپيشاندان و ڕێپێوان و مانگرتن و ئەوانەدا، زۆرجار يان دەستی پيس دەيقۆزێتەوە، يان خۆمان بە لێنەزانانە، يان بە عاتيفە و هەڵچوونێكی زيادەوە لە شيرازەی دەبەينەدەر و، دوايی بەرامبەرەكان بيانوويان دەست دەكەوێ و دۆخەكە دەشێوێنن و لەسەری قەرزدار دەبينەوە!!

**دانــا: زۆر سوپاس بۆ مامۆستا عەلی باپير، نووسەر و ڕووناكبير كە وەڵامی پرسيارەكانی ئەڵقای پێنجەمی بەدانايیت دايەوە، زۆر سوپاستەكەين.**

**مامۆستا:** سوپاس بۆ جەنابيشتان.

**دانــا: پشت بە خوای تاك و پاك لە ئاڵقەی داهاتوودا باس لە گۆڕانكاريی ئەكەين، ئەگەر خوای بەبەزەيی دەرفەتی پێبەخشين.**

# ئاڵقەی شەشەم

بنەمای شەشەم: با سیمرغانە بیرنەکەینەوە:
گۆڕانی واقیعمان، بەرهەمی خۆگۆڕینمانە!.

ameer.maktab@yahoo.com





**دانــا:** بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان، سڵاوتان لێ بێ بینەرانی ئازیز و خۆشەویستی كەناڵی ئاسمانی پەیام! خۆم بە خۆشحاڵ دەزانم خوای پەروەردگار دەرفەتی پێبەخشینەوە لە ئاڵقەیەكی نوێی بەرنامەی بەدانایی دا، لە خزمەت میوانی هەمیشەیی بەرنامەكەمان، جەنابی مامۆستا مەلا عەلی باپیر نووسەر و ڕووناكبیر دا، بە ئێوەی ئازیز و خۆشەویست شاد ئەبینەوە.

مامۆستا گیان! سڵاوت لێ بێ، سوپاس بۆ ئامادەبوونت.

**مامۆستا:** ئێوەش دووبارە بەخێربێن.

**دانــا:** مامۆستا! لە ئاڵقەكانی ڕابردوودی بەرنامەی بەدانایی دا، لەسەر كۆمەڵێك بنەما كە جەنابت بۆ گۆڕینی ئەم بارودۆخەی هەرێم ئاماژەت پێكردبوون، وەستاین و قسەو گفتوگۆمان كرد، ئەمڕۆش پشت بەخوای گەورە لەم ئاڵقە نوێیەدا، باس لە بنەمای شەشەم دەكەین، كە گۆڕانی واقیعمان جەنابت پەیوەستت كردوە، بەوەی كە بەرهەمی خۆگۆڕینمانە، تاكو خۆمان خۆمان نەگۆڕین، واقیعیشمان پێ ناگۆڕێ، من حەزدەكەم بەشێوازێكی گشتی لەسەر پرۆسەی گۆڕانكاریی قسەمان بۆ بكەی.

**مامۆستا:** بسم الله الرحمن الرحيم، الحمد لله ، وصلى الله تعالى وسلم وبارك على رسول الله، محمد وآله المهتدين بهداه، من الصحب والأزواج والقرابة، والتابعين لهم بإحسان الى يوم اللقاء.

ژیان هەمیشە لە گۆڕاندایە، زانایانی بواری توێكاریی و تەندروستی دەڵێن: لە هەر چركەیەك دا ملیۆنان خانە لە لەشی مرۆڤدا دەمرن و هی تازە شوێنیان دەگرنەوە، ئێمە خواردن كە دەخۆین، تیشكی ڕۆژ كە لێمان دەدات، هەوا كە هەڵدەمژین، ئاو كە دەخۆینەوە، هەموو ئەوانە دەبن بە خوێنی تازە و، دەبن بە خانەی تازە و شانەی تازە، شوێنی خانە و شانە مردووەكان دەگرنەوە، ژیانی مرۆڤ ئەصڵەن بۆیە بەردەوام دەبێ، چونكە ئەو حاڵەتی مردن و تازەبوونەوەی شانە و خانەكان بەردەوامە، ئەگەر بێت و مرۆڤ تەنیا خانەكان و شانەكانی جەستەی بمرن و، هی تازە شوێنیان نەگرنەوە، كۆتایی پێ دێت، هەربۆیە ئەوانەی كە لە برساندا دەمرن، لە شوێنێك كەسێك گیر دەخوات، ئەوانەی كە لە

ساڵانی گرانیدا، لەبەرئەوە کە هەر لە جەستەیان کەمبۆتەوە و خانە و شانەکانی جەستەیان مردوون و، خواردنیان چنگ نەکەوتوە، تاکو لە خواردن و خواردنەوە، خانە و شانەی تازە شوێنی مردووەکان پڕ بکەنەوە، بۆیە وردە وردە جەستەیان لە کەمیی داوە تاکو کۆتاییان پێهاتوە، ئنجا نەك هەر لە جەستەی مرۆڤدا، لە دەوروبەر و لە بوونەوەریشدا، هەمیشە تازەبوونەوە بەردەوامە، مردن هەیە و ژیان هەیە، زانایانی بواری گەردووناسیی دەڵێن: ئەستێرەی وا هەیە یا کەهکەشانی وا هەیە دوای ملیۆنان ساڵی تیشکی تیشکەکەی دەگاتە ئێمە، کەواتە ئەوەی کە بۆ وێنە: بە دەملیۆن ساڵ تیشکەکەی دەگاتە ئێمە، ئەو تیشکەی کە ئێستا ئێمە دەیبینین، ئەگەر هی ئەستێرەیەکە، هی کەهکەشانێکە، ئەوە هی دە ملیۆن ساڵ لەمەوپێش، هەر خوا دەزانێ ئێستا ڕەنگە هەر نەمابێ و، ئەستێرەی دیکە یان کەهکەشانی دیکە شوێنی ئەویان گرتبێتەوە.

بەڵێ لە خودی جەستەی مرۆڤ دا و، لە بوونەوەردا و لە دەوروبەردا وایە، ساڵانە، کەشەکانی ساڵ: زستان و بەهار و پایز و هاوین دێن و، پاشان دووبارە دەبنەوە، هەروەها مانگەکان، هەفتەکان، رۆژەکان، هەموویان تازە دەبنەوە، کەواتە: دەبێ گۆڕانکاریی هەبێ لە ژیانی مرۆڤدا، لە هەموو ڕووەکانەوە و، هەر کۆمەڵگایەك تووشی حاڵەتێکی دۆگمایی بوو، وەستا، جموودی کرد، بێگومان ئەوە نەخۆشە و، ئەو کۆمەڵگایانەی کە دەوەستن، وەك چۆن ئەو کەسانەی کە ژیانیان لە نەشونما دەوەستێ مانای وایە مردوون، یان لە حوکمی مردوودان، بەهەمان شێوە کۆمەڵگاش هەر وایە، کۆمەڵگایەك کە وەستا چ لە ڕووی فیکرەوە، چ لە ڕووی هەست و نەستە دەروونییەکانەوە، چ لە ڕووی ڕاوبۆچوونەکانەوە، چ لە ڕووی گەشەی کۆمەڵایەتییەوە، لە ڕووی گەشەی ئابووریی، گەشەی سیاسی، هەر کۆمەڵگایەك لە بەرەوپێشچوون وەستا، مانای وایە بەرەو مەرگ دەڕوا و بەرەو لەبەینچوون دەچێت، بۆیە پێویستە ئێمە بیربکەینەوە لە گۆڕانکاریی لە کۆمەڵگای خۆماندا، کە من سێ وشەم بۆ بەکارهێناون: پاکسازیی، چاکسازیی، ڕاستکردنەوە، دەبێ هەمیشە پاکسازیی هەبێت، شتی بەکەڵك نەهاتوو فڕێ بدەین، خۆمانی لێ بپارێزین

لێ پاكبكەینەوە، خۆمانی لێ بژار بكەینێ، شتی باش كە تا ئێستا نیمانە، پەیدابیبكەین، ئەگەرنا ئەوەی هەمانە خۆمانی پێ برازێنینەوە، هەروەها حاڵەتی لار دەبێ ڕاست بكرێتەوە، ئەوە سوننەتی خوایە، ئەگەر بمانەوێ كۆمەڵگایەكی تەندروست و ساغ بین، كۆمەڵگایەك بین بتوانین بەردەوام بین، دەبێ حاڵەتی پاكسازیی و چاكسازیی و، ڕاستكردنەوە بەردەوام بێ، هەربۆیەش خوا سبحانە وتعالی بە ئۆممەتی پێغەمبەری فەرمووە:

﴿ وَلْتَكُن مِّنكُمْ أُمَّةٌ يَدْعُونَ إِلَى الْخَيْرِ وَيَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَيَنْهَوْنَ عَنِ الْمُنكَرِ ۚ وَأُولَٰئِكَ هُمُ الْمُفْلِحُونَ ﴿١٠٤﴾ ﴾ [آل عمران : ١٠٤]

چونكە: فەرمان بە پەسەندەكان و ڕێگریی لە ناپەسەندكان لەڕاستییدا هەمان ئەو پڕۆسەی پاكسازیی و چاكسازییە، خوا دەفەرموێ: با لەنێو ئێوەدا كۆمەڵێك ببن، یان ئێوە كۆمەڵێك بن: بانگەواز دەكەن بۆ هەرچی چاكەیە و، فەرمان دەكەین بەهەرچی شتی پەسندە و، ڕێگریی دەكەن لەهەرچی ناپەسەندە. هەر ئەوانەش سەرفرازن، واتە: كۆمەڵگایەكی ئاوا دەتوانێ بەردەوام بێ، كە بەردەوام شتی بە كەڵك نەهاتوو و بەكارنەهاتووی خۆی وازلێبێنێ و، شتی باش و بەكەڵك بێنێ و، ژیانی خۆی بەرەوپێش بەرێ.

**دانـــا: ئایا پێویستە هەموو كۆمەڵگایەك گۆڕانكاریی بكات و، ئایا دەبێت پرۆسەی گۆڕانكاریی تەنها لە پێناو ئەوە دا بێت كە پێی بوترێ: گۆڕانكاریی كراوە، یان نەخێر لەوە گەورەترە؟**

**مامۆستا:** نا بە تەئكید، بەڵكو دەبێ گۆڕانكاریی نێوەڕۆكێكی باشی هەبێ، چونكە خوا سبحانە وتعالی ئەگەر تەماشای قورئان بكەین دەفەرموێ: (وَيَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَيَنْهَوْنَ عَنِ الْمُنكَرِ ۚ)، گۆڕانكارییەكە دەبێ ئاوابێ: (شتە پەسەندەكان دەچەسپێنن و، شتە خراپەكان لادەبەن، قەدەغە دەكەن، ڕیشەكێشیان دەكەن، ئەهلی تەصەووف لە بواری تەزكیەی نەفسدا، زاراوەیەكیان هەیە دەڵێ: (التخلیە من الرذائل والتحلیە بالفضائل) خۆبژاركردن لە صیفەتە نزمەكان و خۆڕازاندنەوە بە صیفەتە پەسەند و بەرزەكان، وەك من لە مەوسووعەی ڕەوشت

و ئاكاری ئیسلامیی لەبەر ڕۆشنایی قورئان و سوننەتدا بە تەفصیل باسم كردوە، نەخێر، گۆڕانكاریی لەبەر خودی خۆی نیە، بەڵكو زانست كە شتێكی زۆر باشە، زانست لەبەر خودی زانست نیە، زانست بۆ كارو كردەوەی چاكە، با نموونەیەك بێنینەوە: كەسێك كە دەچێ بۆ لای پزیشكێك، ئەو پزیشكە پشكنینی بۆ دەكات: سۆنەر و فەحس و ئەشیعە، دەیەوێ لێی حاڵی بێ داخۆ چییەتی؟ دوایی دەچێ بۆ دەرمانخانە و دەرمانەكان وەردەگرێ، ئایا ئەگەر بەكاریان نەهێنێ، هیچ سوودی هەیە؟ بە تەئكید نەخێر، كەواتە: دەبێ گۆڕانكاریی بۆ بەرەوپێشچوون بێ، بۆ ئەوە بێ كە دەست لە شتە خراپەكان هەڵبگرین و، بە شتی باش شوێنیان پڕ بكەینەوە، لە هەموو ڕووەكانەوە، لە هەموو بوارەك دا: لە بواری حوكمڕانیی و سیاسەت دا، لە بواری بازرگانیی و ئابووریی دا، لە بواری كۆمەڵایەتیی دا، لە بواری فیكریی دا، لە بواری ئەخلاقیی دا، لە هەموو ڕووەكانەوە، دەبێ هەمیشە چاومان لەسەر خۆمان بێ، چاو بەخۆماندا بگێڕین شتی خراپ و ناپەسەندكە بەكەڵك نایەت (منكر) بەزاراوی شەرعیی، دەبێ خۆمانی لێ بژاربكەین و فڕێی بدەین و وازی لێ بێنین و، شتی باش و پەسەند بێنینە شوێنی و خۆمانی پێ بڕازێنینەوە.

**دانـــا: مامۆستا تا چەند پێویستە پرۆسەی گۆڕانكاریی لە خودەوە دەستپێبكات، واتە: تاكەكان لەسەر ئاستی تاك گۆڕانكاریی بكەن لە خۆیاندا، تا گۆڕانكاریی لە دەرەوەی خۆیان؟**

**مامۆستا:** هەتا ئینسان لە خودی خۆیدا خۆی نەگۆڕێت، دەرەوەی خۆی بۆ ناگۆڕێ، چونكە دەرەوەی خۆت ڕەنگدانەوەی خۆتە، خوای پەروەردگار لە ئایەتی ژمارە (١١)ی سورەتی (الرعد)دا دەفەرموێ:

﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُغَيِّرُ مَا بِقَوۡمٍ حَتَّىٰ يُغَيِّرُواْ مَا بِأَنفُسِهِمۡۗ﴾ [الرعد : ١١]

واتە:بێگومان خوا حاڵی هیچ كۆمەڵگایەك ناگۆڕێ، تاكو ئەوان ناخی خۆیان نەگۆڕن، ناخی مرۆڤ،، دەروونی مرۆڤ، سێ پێكهاتەی سەرەكیی هەن:

١- تێڕوانین و بیروبۆچوونەكان.

٢- خولیا و هەست و نەستەكان، ئەوانەی كە پەیوەندییان بە دڵ و دەروونەوە هەیە.

٣- ڕەوشت و ڕەفتارو ئاكارەكان، كە پەیوەندییان بە جەستەو ئەندامەكانییەوە هەیە، كەواتە: دەبێ ئینسان دەستكاریی بیروبۆچوونەكانی خۆی بكات، هەروەها هەست و نەستەكانی خۆی، كە پەیوەندییان بە دڵ و دەروونییەوە هەیە، هەروەك چۆن بیروبۆچوونەكانی پەیوەندییان بە عەقڵ و هۆشیەوە هەیە، هەروەها دەبێ ڕەوشت و ڕەفتار و ئاكارەكانی خۆی بگۆڕێ خوا دەفەرموێ: خوا واقیعی هیچ كۆمەڵگایەك ناگۆڕێ، تاكو ئەوان ناخی خۆیان نەگۆڕن، تۆ تەماشا بكە! كۆمەڵگایەك كە گیرۆدەیە بە حوكمی تاكڕەویی و بنەماڵەییەوە، كە لە وڵاتانی عەرەبی لە وڵاتانی ئیسلامیی دا بەداخەوە نموونەمان بۆ ئەوجۆرە حوكمڕانییە زۆرە، یاخود گیرۆدەیە بە قۆرخكاریی لە ڕووی ئابوورییەوە، یان گیرۆدەیە بە نەفامیی و نەزانی و لاساییكردنەوەی كوێرانەی پێشینانەوە، یاخود گیرۆدەیە بە كۆمەڵێك دابونەریتی كۆمەڵایەتیی ڕزیوو بەكەڵك نەهاتووەوە یاخود لاساییكردنەوەی بێگانانەوە، یان لە هەموو ڕووەكانەوە كەسێك گیرۆدەیە بەو شتە خراپانەوە، ئایا ئەوانە لە چییەوە پەیدا بوون؟! بێگومان لە بیروبۆچوونی هەڵە و، لە هەست و نەست و خولیای هەڵە و، لە ڕەوشت و و ڕەفتاری هەڵە، كە پەیوەندییان بە خودی تاكەكانەوە هەیە، یانی: حیزبێك، ڕژێمێك، بنەماڵەیەك، كەسێك پێی وابێت و قەناعەتی وا بێت كە ئەو شتێكی تایبەتە و، ئەو خەڵكە دیكەی هەمووی دروستكراوە كە لە خزمەتی ئەودا بن، كەسێك وا بیر بكاتەوە، كە دەبێ ئەو خزمەتكراو بێت و خەڵكیش خزمەتكار بن، ئایا ئەو جۆرە بیركردنەوەیە سەری لە چییەوە دەردەچێ؟ سەری لەوەوە دەردەچێ كە ئەو كەسە، ئەو بنەماڵە، ئەو حیزبە، ئەو خێڵە، یاخود ئەو دەوڵەتە، لەكەوڵی خۆی دەربچێ و یاخی بێ، بۆ وێنە: هیتلەر، هیتلەر بۆچی وایكرد؟ چونكە پێی وابوو كە توخمی ئاریی باشترین توخمە و توخمەكانی دی، ڕەنگەكانی دی، دەبێ لە خزمەتی ئەوەدا بن، جوولەكە بۆچی لەگەڵ هەموو دنیا كێشەیان هەیە؟ چونكە وەك خوا سبحانە وتعالی لێیان دەگێڕێتەوە:

﴿ وَقَالَتِ ٱلْيَهُودُ وَٱلنَّصَٰرَىٰ نَحْنُ أَبْنَٰٓؤُا۟ ٱللَّهِ وَأَحِبَّٰٓؤُهُۥ ﴾ [المائدة : ١٨]

واته: جوولەكە و نەصرانییەكان گوتیان: ئێمە كوڕانی خوا و خۆشەویستانی خواین، ئنجا هەركەسێ خۆی بە نزیكی خوا زانی، وەك جوولەكە گوتوویانە: (نحن شعب الله المختار) خۆی بە گەلی هەڵبژاردەی خوا زانی، لە تەوڕات و لە تەلموددا دەڵێ: وەك چۆن خوا ئاژەڵی بۆ مرۆڤان خولقاندوە، مرۆڤەكانیشی هەموو بۆ گەلی جوولەكە خولقاندوون، خزمەتیان بكەن، لەبەرئەوە هەرچۆنێكی زەفەرتان بە ماڵ و حاڵیان برد، بۆتان حەلاڵە، چونكە لە ئەصڵدا خوا بۆ ئێوەی خولقاندوون!! ئنجا ئەو بیركردنەوەیە سەری لە چییەوە دەردەچێت؟ سەری لەوەوە دەردەچێت كە ئەگەر پێت چاكبوو دەوڵەتۆكەیەك لەسەر زەمینی میللەتێكی دیكەی خەڵكەكەی فەلەستینە، دروستبكەی، دروستی بكە، ئەگەر پێت چاكبوو كە شەڕی جیهانی یەكەم و دووەم هەڵگیرسێنی، هەڵیگیرسێنە، ئەگەر پێت چاكبوو میللەتێك قڕەبڕ بكەی، قڕەبڕی بكە، چونكە بۆ تۆ وا چاكە!! هەڵبەتە هەمیشە تەصەووری هەڵە، تەصەڕووفی هەڵە لە ئینساندا پەیدا دەكات، بۆیە خوای كارزان دەفەرموێ:

﴿ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُغَيِّرُ مَا بِقَوْمٍ حَتَّىٰ يُغَيِّرُوا۟ مَا بِأَنفُسِهِمْ ﴾ [الرعد : ١١]

ئێستا تۆ تەماشا بكە! ئەم وڵاتەی ئێمە لە چارەكە سەدەی ڕابردوودا، كێ حوكمی كردوە؟ كۆمەڵێك بڕیار بەدەست، كە وەك گوتم باسی دوو حیزبان دەكرێ: (پارتی و یەكیەتی) بەڵام وردتری بكەیەوە، لە نێو ئەو دوو حیزبەشدا شتی بچووكتر هەیە، ئنجا ماڵە، بنەماڵەیە، شەخصە، هەرچی هەیە، گرنگ ئەوەیە بڕیاربەدەستەكان، لە حیزبەكەش بچووكترن، هەڵبەتە ئەگەر هەر حیزبەكەش بێ،هەر ستەمە، ئەگەر دوو حیزبەكەش بن، هەرستەمە، چونكە ئێمە كۆمەڵگایەكین، بۆچی دەبێ هەرچی لەگەڵ ئەو دوو حیزبە نەبێ، مەحڕووم و مەزڵووم بێ؟ ئنجا تۆ ئەندامانی ئەو دوو حیزبەش بدوێنە، نەك سادەیان، بەڵكو ئەندامانی سەركردایەتی و قیادەیان بدوێنە، ئەوانیش ئەگەر بتوانن دڵی خۆیانت بۆ بكەنەوە، خۆیان بە مەزڵووم و مەحڕووم دەزانن: دەڵێن ئێمەیش هیچ كارەین

و هیچمان بەدەست نیە، ئنجا ئایا بەو عەقڵیەتە وڵات بەرێوە دەچێت؟ نەخێر، ئەو عەقڵیەتە دەبێ بگۆڕدرێ، وەك من لە پەیامەكەی جەژندا، گوتبووم ئەو عەقڵیەتەی كە لە چارەكە سەدەی ڕابردوودا ئەم وڵاتەی بەڕێوە بردوە، یان دەبێ بگۆڕدرێ، یان دەبێ ڕاست بكرێتەوە، ئەگەرنا ئەم بارودۆخە چاك نابێ، بەڵێ، خۆگۆڕین بناغەی واقیع بۆ گۆڕانە، ئاشكرایە ئەو حوكمڕان و بڕیاربەدەستەش خۆی ناگۆڕێ، دەڵێ من وام قازانجە، بەڵام ئایا خەڵك دەبێ دەستەوئەژنۆ دابنیشێ؟! ئەدی بۆچی خوا عزوجل دەفەرموێ: (والمؤمنون والمؤمنات)، ئەگەر لە ئایەتی (١٠٤)ی سوورەتی (ال عمران)دا دەفەرموێ:

﴿ وَلۡتَكُن مِّنكُمۡ أُمَّةٞ يَدۡعُونَ إِلَى ٱلۡخَيۡرِ وَيَأۡمُرُونَ بِٱلۡمَعۡرُوفِ وَيَنۡهَوۡنَ عَنِ ٱلۡمُنكَرِۚ ﴾

لە ئایەتی ژمارە (٧١) سوورەتی (التوبة) خوا بەبێ هەڵاواردن، تێكڕای پیاوانی بڕوەڕدار و ئافرەتانی بڕوادار بەوە پێناسە دەكات، دەفەرموێ:

﴿ وَٱلۡمُؤۡمِنُونَ وَٱلۡمُؤۡمِنَٰتُ بَعۡضُهُمۡ أَوۡلِيَآءُ بَعۡضٖۚ يَأۡمُرُونَ بِٱلۡمَعۡرُوفِ وَيَنۡهَوۡنَ عَنِ ٱلۡمُنكَرِ وَيُقِيمُونَ ٱلصَّلَوٰةَ وَيُؤۡتُونَ ٱلزَّكَوٰةَ وَيُطِيعُونَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥٓۚ أُوْلَٰٓئِكَ سَيَرۡحَمُهُمُ ٱللَّهُۗ إِنَّ ٱللَّهَ عَزِيزٌ حَكِيمٞ ﴿٧١﴾ ﴾ [التوبة: ٧١]

واتە تێكڕای پیاوانی بڕوادار و ئافرەتانی بڕوادار، دۆست و پشتیوانی یەكدین، فەرمان بە چاكە و ڕێگریی لە خراپە دەكەن، نوێژ بەرپا دەكەن و زەكات دەدەن و، فەرمانبەریی خوا و پێغەمبەری خوا دەكەن، هەر ئەوانەش خوا بەزەیی پێیاندا دێ، بێگومان خوا زاڵی كارزانە.

ئا ئەوانە شایستەی ئەوەن خوا بەزەیی پێیاندا بێ، كەواتە: بۆیە خوا سبحانه وتعالى ئیمانداران ئاوا پێناسە دەكات، تاكو بزانن كە ئەركی سەرشانیانە و نابێ لە واقیعێكی لاری خوار ڕابمێنن، دەبێ هەوڵ بدەن ڕاستی بكەنەوە، نابێ واقیعێك كە پڕ بووە لە گەندەڵیی، تێوەی ڕامێنن، دەبێ پاكسازیی تێدا بكەن، نابێ لە واقیعێك كە هەزاران چاكە و مەعرووفی تێدا فەرامۆش كراوە، تێوەی ڕامێنن، دەبێ چاكسازیی تێدا بكەن، هەڵبەتە وەك گوتم بابای بڕیاربەدەست

و حوکمڕان دەبێ ئەو خۆی ڕاست بکاتەوە، بەڵام ئەگەر ئەو ڕاست نەبووەوە، دەبێ خەڵك ڕاستی بکاتەوە، دەبێ خەڵك بێ هەڵوێست نەبێ، پێغەمبەری خوا (عليه الصلاة والسلام) فەرموویەتی: (لتأمرون بالمعروف ولتنهون عن المنكر، أو ليوشكنَّ الله أن يعمكم بعقاب) واتە: بەتەئکید دەبێ فەرمان بە چاکە بکەن و ڕێ لە خراپە بگرن، ئەگەرنا نزیکە خوا سزا و تۆڵەیەکی گشتییتان بۆ بنێرێ.

**دانــا: کەواتە ڕاستکردنەوە بەوانە دەکرێ کە خۆیان ڕاستکردووەتەوە و، گۆڕانکاریی بەوانە ئەکرێ کە توانیویانە گۆڕانکاریی لە خۆیاندا بکەن، ئایا ڕاستە بوترێت: کەسێك نەیتوانیبێ گۆڕانکاریی لە خودی خۆیدا بکات ناتوانێ گۆڕانکاریی لە واقیعدا بکات؟**

**مامۆستا:** بەڵێ بەدڵنیایی، من وەك دروشمێك باسمکردوە: (ڕاستکردنەوە بە ڕاستان دەکرێ، پاکسازیی بە پاکان دەکرێ، چاکسازیی بە چاکان دەکرێ) چونکە، (فاقد الشيء لا يعطيه) کەسێك شتێکی نەبێ ناتوانێ بیبەخشێ، ئێستا زۆر خەڵك هەیە لەم وڵاتەی ئێمەدا باسی چاکسازیی دەکات، بەڵام هەر قسەیە، لەو ڕۆژانەی ڕابردوودا کەسێکم بینی کە شارەزایە لە بارودۆخی ئابووریی و ژیان و گوزەران، پیاوێکی نزیکە لە بەرپرسەکانەوە، باسی نەفەرێکی کرد، ئاگادارم هاوسەرەکەی نزیکەی ملیارێکی دۆلار هەیە و بە گەندەڵییش پەیدای کردوە، ئنجا دەیگوت: زۆرم پێ عەجایەبە کە دەیبینم باسی گەندەڵیی دەکات، وەك گوتراوە: قسە فەقیرە هەموو کەس پێی دەوێرێ، بە داخەوە ئێمە وەستای قسان و کۆڵەواری دەستانمان زۆرن!! باشە ئێستا هەرچی لەم وڵاتەدایە دەڵێ: دەبێ یاسا سەروەر بێ، برادەر! یاسا تۆ خۆت لە پێش هەموو کەسەوە پێشێلت کردوە! هەیە بەقسە دەڵێ: خەڵك هەمووی وەك یەکە، دەبێ دادگەریی هەبێ، دەبێ یەکسانیی هەبێ، ئێمە هەموو وەك یەکین، خۆم پێ لەکەس زیاد نیە! برادەر! ئایا بە کردەوە وای؟ دەوروبەرت تەماشا بکە، حیزب و خزمت تەماشا بکە، چۆن دەژین، چیت لێ کردوون! چۆنت پڕکردوون، خەڵکی دیکەش تەماشابکە چۆن قڕ بووە!! بەڕاستیی زۆر ڕاستە کە ڕاستکردنەوە بە ڕاستان دەکرێ پاکسازیی بە پاکان دەکرێ و، چاکسازیی بە چاکان دەکرێ، ئەگەرنا قسە ناچێتە گیرفانی کەسەوە، کوردەواریی خۆمان دەڵێن: بە حەڵوا حەڵوا دەم

شيرين نابێ، هەموو ئەو قسانە كۆبكەيتەوە بايی ئەوە نيە تۆ هەنگاوێكی خێر بنێی، بەتايبەتی ئەوەی بڕياری بەدەستە، ئەوەی شتی پێ چاك دەكرێ، پێی خراپ كراوە و پێيشی چاك دەكرێ، ئەوانە نابێ وەك خەڵكی ديكە قسە بكەن و ڕەخنە بگرن و دروشم و شيعار بەرز بكەنەوە، بابێن هەنگاو بنێن.

**دانا: مامۆستا! ئەگەر بويسترێ ئەو واقيعەی كە ئێستا هەم دەسەڵاتی تيا قۆرخ كراوە، هەم سامانی تيا قۆرخ كراوە، گۆڕانكاريی بەسەر دا بێت، ئنجا بۆ ئەوەی بينەر حاڵی بێ، مەبەستمان كەسێك نيە، حيزبێك نيە، كەسێك نيە، ئەگەر بويسترێ بارودۆخەكە بگۆڕدرێ، پێويستە چی بكەين ئێمە؟ تاك تاكی خەڵك، حيزب و لايەنە سياسيەكان، هەركەسەو بەپێی ئاستی بەرپرسيارێتی خۆی، پێويستە چی بكات؟**

**مامۆستا:** ئەمە پرسيارێكی گەورەيە، ديارە ئەم بارودۆخەی كە ئێستا هەموومان لەگەڵيدا دەستەويەخەين، وەك كابووسێكی قورس وايە بەسەر سنگی هەموو لايەكەوە، بە شەووڕۆژێك پەيدا نەبووە، تاكو بە شەووڕۆژێك لا بچێ و چاك ببێ، من پێموايە هەنگاوی:

**يەكەم:** بۆ ئێمە كە ميللەتێكی مسوڵمانين، ئەوەيە كە هەركامێكمان خوا ببينێ سبحانە و تعالی، بە چاوی عەقڵ و دڵ خوا ببينێ و، قيامەت و لێپرسينەوەی خوا و سزا و پاداشتی خوا بێنێتە بەرچاوی خۆی.

**دووەم:** ئينسان چاو بە بۆچوونەكانی خۆيدا بگێڕێتەوە، چونكە ئەم وەزعە بەوە لار بووە، كە هەندێك كەس پێيان وايە حەقی زياتريان هەيە لە خەڵك، هەندێك كەس پێی وايە كە ئەو حەقی خۆيەتی: ژيانی، كوڕی، كچی، خزمی، حيزبی، جيا بێ لە هی خەڵكی ديكە، ئەو عەقڵيەتە وازلێبێنين، موڵك و حوكمڕانی بە كوفرەوە بەردەوام دەبێ، بەڵام بە زوڵمەوە بەردەوام نابێ، (قد يدوم الملك مع الكفر ولا يدوم مع الظلم)، لە ئەورووپا و ڕۆژئاوا و وڵاتانی دنيا بۆ بەردەوامن، چونكە، بەڵێ ئەهلی كوفرن، بەڵام جۆرێك لە دادگەرييان لەبەينی خۆياندا چەسپاندوە و مرۆڤ وەك مرۆڤ مامەڵەی لەگەڵدا دەكرێت، نەك وەك سەرپێبوون بۆ فڵان حيزب و بۆ فيسار حيزب.

كەواتە: پێش هەموو شتێك هەستكردن بە بەرپرسيارێتى بەرامبەر بە خوا، پاشان ئەو عەقڵيەتە لە مێشكى خۆماندا لابەرين كە كەسێك پێى وابێت خۆى، بنەماڵەكەى، حيزبەكەى، عەشيرەتەكەى، جيايە لە خەڵك و حەقى زياترى هەيە، ئنجا گريمان ئەوكەسە، يان ئەو لايەنە ئەو عەقڵيەتەى لە مێشكى خۆيدا لانەبەرد و، پێيوابوو كە نەخێر هەر جياوازە لە خەڵك، پێويستە خەڵك ئەو عەقڵيەتە لابەرێ، خەڵك ئەو قەناعەتە غەڵەتە لابەرێ، كە پێيوابێ كەمترە لە بەرامبەرەكەى!! چاوى چاوم، فيرعەون كاتێ فيرعەونايەتيى بۆ كرا و گوتى: (أنا ربكم الأعلى)، كە خەڵكێكيش هەبوو بيپەرستن و، بەندايەتيى بۆ بكەن، غولامەتيى بۆ بكەن، ئنجا من ئەگەر فيرعەونم بۆ نەگۆڕدرێ و، عەقڵيەتى فيرعەونم بۆ نەگۆڕدرێ، ئەوكاتە تۆپ لە ساحەى خەڵكدايە، خەڵك دەبێ خۆى پێ كەم و منەتبار نەبێ! بەرپرسى ئەم وڵاتە هاتوە بۆ لام، - ئنجا ئەگەر ئاسايشە، پۆليسە، پێشمەرگەيە، ياخود كارمەندێكى گەورەيە لە فەرمانگەيەكدا- گوتوويەتى: مامۆستا ئەوە ناچارييە، كە من لەو شوێنەم، گوتوومە: تۆ بۆچى پاكانە بۆ خۆت دەكەى! خەڵكى ئەم وڵاتە هەردەبێ ئاسايش بن، يان پێشمەرگە، يان پۆليس، يان كارمەند، يان جووتيار، يان كاسب بن، هەست بە ئيحراج و سەغڵەتيى مەكە، بەس من يەك ئامۆژگارييم بۆت هەيە: ئەو مووچەيەى كە وەريدەگرى، پێتوانەبێ خێرت پێ دەكرێ، ئەگەر لە بەرامبەر خزمەتێكى حەڵاڵدايە، ئەوە پارەكەت لێ حەڵاڵ و زەڵاڵە، بەڵام ئەگەر ئەو مووچەيە كە دەتدرێتێ، پێتوابێ نرخى خۆتە و تۆيان كڕيوە و، دەبێ كە بوو بە دەنگدان، پێچەوانەى قەناعەتى خۆت دەنگ بدەى، ئەو كاتە پارەكەت لێ حەرام دەبێ، چونكە تۆ ئەو پارەيە لە بەرامبەر شتێكى ناشەرعييدا وەريدەگرى.

ئنجا كاكە دانا! ئێمە ئەگەر عەقڵيەتى ئەو كەسەشمان پێ نەگۆڕدرێ، كە پێى وايە لە خەڵك جيايە و، خەڵك و وڵات (عباد وبلاد) بۆ خزمەتى وى دروستكراون، دەبێ ئەو خەڵكە خۆى بگۆڕێ، چونكە بە هۆى ئەو قەناعەتە غەڵەتانوە كە لە عەقڵ و دڵى خەڵكدا هەن، ئەو خەڵكەى كە بە دەورى ئەو وەزعە ناشەرعييانەوەيە، بەهۆى ئەوانەوە باباى گەندەڵيخۆسەپێن، بازاڕەكەى

قه‌ره‌باڵغه‌، كه‌واته‌: ده‌بێ ئینسان ده‌ستكاریی بیروبۆچوون و قه‌ناعه‌ته‌كانی خۆی بكات، هه‌ڵبه‌ته‌ له‌به‌ر ڕۆشنایی شه‌ریعه‌ت و عه‌قڵ و مه‌نتیقدا، پاشان خه‌ڵك ده‌بێ جورئه‌تی هه‌بێ، بوێر بێ، من به‌راستی سه‌رم سوڕماوه‌ له‌ كه‌سێك كه‌ په‌نجا شه‌ست ساڵ به‌ كۆیلایه‌تیی، ده‌ژی و هه‌ست به‌وه‌ ناكات كه‌ مرۆڤه‌، هه‌ست به‌وه‌ ناكات كه‌ به‌شه‌ره‌، هه‌ست به‌وه‌ ناكات كه‌ خاوه‌نی ئیراده‌ی خۆیه‌تی، ده‌نگدان دێته‌پێشێ ده‌ڵێی: بۆچی وا ده‌نگت دا؟ ئاخر بڵێم چی، نانم ده‌بڕن و ..

ده‌وڵه‌مه‌ند له‌م وڵاته‌دا هاتوه‌ بۆ لام گوتوویه‌تی: فلان به‌رپرس تا ئێستا سه‌دا په‌نجای (٥٠٪) واریداته‌كه‌ی من بۆ ئه‌و بووه‌، ئێستا له‌سه‌ری كردووم ده‌ڵێ: ده‌بێ بۆم بكه‌ی به‌ له‌سه‌دا شه‌ست (٦٠٪)، گوتم ئه‌و چه‌ندی پاره‌ داوه‌؟ گوتی: وه‌ڵڵا لاقی له‌سه‌ر لاقی داناوه‌ و له‌ ماڵی خۆیه‌تی، ئنجا ده‌یگوت به‌شه‌رتێك مانگانه‌ واریداتی من ملیۆنێكه‌، گوتم: یانی ئه‌و هه‌موو ملیۆنانه‌ی ده‌ده‌یه‌ به‌ به‌لاش؟ گوتی به‌ڵێ، گوتم: تۆ ئه‌و ژیانه‌ت بۆ چییه‌، تۆ كه‌ وه‌ك مرۆڤێك نه‌ژی، تۆ هه‌ر به‌ پاره‌كه‌ت بووی به‌ كۆیله‌، خوا هه‌موو شتێكی بۆ مرۆڤ دروستكردوه‌، ئێستا تۆ به‌ پاره‌كه‌ی خۆت بووی به‌ كۆیله‌ و، ئه‌و حووتانه‌ ئێوه‌ دروستتان كردوون!! له‌راستییدا من قه‌ناعه‌تم وایه‌ كه‌ وه‌ك چۆن گله‌یی له‌ سته‌مكارێك ده‌كرێت، ده‌بێ گله‌یی له‌و خه‌ڵكه‌ش بكرێ كه‌ ئه‌و سته‌مكاره‌یان به‌سه‌ر خۆیانه‌وه‌ كردوه‌ به‌ سته‌مكار، ئینسان ده‌چێ بۆ مه‌له‌، كه‌س ده‌توانێ له‌ وشكانیی مه‌له‌ بكات؟ هه‌تا حه‌وزێكی ده‌ستنه‌كه‌وێ؟ هیچ فیرعه‌ونێك ناتوانێ بڵێ: من په‌روه‌ردگاری خه‌ڵكم، هه‌تا خه‌ڵكێك ئاماده‌ نه‌بووبێ، قابلیه‌تی چه‌وسێنرانه‌وه‌ ده‌بێ، ئنجا چه‌وسێنه‌ر په‌یدا ده‌بێ.

**دانا: ئایا ئه‌وانه‌ی ده‌سته‌ڵات و سامانێك، قۆرخ ده‌كه‌ن، له‌سه‌ر ئه‌وه‌ خوای دادگه‌ر سزایان ئه‌دات، ئایا ئه‌و كه‌سانه‌ش قبووڵیانه‌ ئه‌و سته‌مه‌یان لێ بكرێ و، بچه‌وسێنرێنه‌وه‌، هه‌مان سزایان هه‌یه‌؟**

**مامۆستا:** به‌ڵێ هه‌مان جۆره‌ سزایان هه‌یه‌، له‌ سوره‌تی (الأعراف)دا خوای په‌روه‌ردگار دوای ئه‌وه‌ی كه‌ باسی ئه‌وانه‌ ده‌كات كه‌ ده‌چنه‌ دۆزه‌خه‌وه‌، ده‌فه‌رموێ:

﴿ حَتَّىٰٓ إِذَا ٱدَّارَكُواْ فِيهَا جَمِيعًا ﴾ [الأعراف : ٣٨]

هەتا كاتێك هەموويان پێكەوە خڕكرانەوە، واتە: سەركردەكان و شوێنكەوتووەكانيان، (قَالَتۡ أُخۡرَىٰهُمۡ لِأُولَىٰهُمۡ ) شوێنكەوتووەكان، بە سەركردەكانيان گوت: (پێشڕەوەكان كە لە پێشيانەوە ڕۆيشتوون)

(رَبَّنَا هَٰٓؤُلَآءِ أَضَلُّونَا فَـَٔاتِهِمۡ عَذَابٗا ضِعۡفٗا مِّنَ ٱلنَّارِۖ ) [الأعراف: ٣٨]

پەروەردگارم! ئا ئەوانە ئێمەيان گومڕا كرد، كە ئێستاش لەپێشمانەوەن، لە دنياشدا ئاوا پێشمان كەوتبوون بە ڕێى هەڵەت و پەڵەت دا، (فَـَٔاتِهِمۡ عَذَابٗا ضِعۡفٗا مِّنَ ٱلنَّارِۖ ) [الأعراف : ٣٨] خوايە سزاى دووقات، يان چەند قاتيان بدەيە لە ئاگرى دۆزەخدا، خوا چى دەفەرموێ؟ (قَالَ لِكُلّٖ ضِعۡفٞ وَلَٰكِن لَّا تَعۡلَمُونَ ) [الأعراف: ٣٨]، فەرمووى: بۆ هەركامتان سزاى چەند قات، يان دووقات هەيە، بەڵام نازانن، ﴿ وَقَالَتۡ أُولَىٰهُمۡ لِأُخۡرَىٰهُمۡ ﴾ [الأعراف: ٣٩] پێشكەوتووەكان، ئەوانەى لە پێشەوەن، واتە سەركردەكان و، لە زلەكان، بە شوێنكەوتووەكانى خۆيان گوت: ﴿ فَمَا كَانَ لَكُمۡ عَلَيۡنَا مِن فَضۡلٖ ﴾ [الأعراف: ٣٩] ئێوەش پلەتان بەسەر ئێمەوە نيە، وەنەبێ ئێمە لە ئێوە زياتر عەزاب بدرێين، وەك چۆن ئێمە عەزابى چەند قاتمان هەيە، ئێوەش عەزابى چەند قاتتان هەيە، ئنجا وەك من لە تەفسيرى (الأعراف) بەرگى شەشى تەفسيرە كورديیەكەم دا بەدرێژى باسم كردوە، توێژەرەوانى قورئان دەڵێن: ئايا حيكمەتى ئەوە چييە؟ كە لەسزادران دا وەك يەكن؟! دەڵێن: وەك چۆن ستەمكارەكان گوناهى خۆيانيان لە ئەستۆيە و، هى ئەو خەڵكەش كە هەڵيانخەڵەتاندوون، ستەملێكراو و چەوسێنراوەكانيش، واتە ئەو چەوسێنراوانەى كە بە ئيرادەى خۆيان بە دواى ستەمكارەكان كەوتوون، نەك كەسێك زوڵمى لێ كرابێ و بێچارە بووبێت، ئەوە نا، بەڵكو ئەو كەسەى كە لەبەر تەماعێك و لەبەر ترس بە دواى ستەمكارێك دەكەوێ و دەورى قەرەباڵغ دەكات، وە لە خزمەتيدايە و بۆى دەبێتە دەهۆڵ كوت، يان بۆى دەبێتە پشتيوان و پاڵپشت، ئا ئەوە، ئەويش گوناحى خۆشى لە ئەستۆدايە و گوناحى ئەو كەسەش كە بەسەر خۆيەوە كردوويەتە چەوسێنەر، چونكە ئەگەر ئەو نەبووايە، ئەو نەبێ و، ئەو نەبێ و،

ئەو نەبێ، ستەمکار چۆن دروست دەبێ؟ فیرعەون کە کاتی خۆی گوتوویەتی: (أنا ربكم الأعلى) بۆچی وای گوتوە؟ ڕەنگە پێشێ بەشێوەیەك لە شێوەکان گوتبێتی: من پەرستراوم، بەڵام کەتەماشای کردوە خەڵك چەپڵەی بۆ لێدەدەن، فیکەی بۆ دەکێش و دەڵێن: قوربان لە خزمەتین، ئنجا گوتوویەتی: مادام ئەو خەڵکە ئامادەبن، دیارە هەروام، قەزافی لە لیبیا دەیگوت: (من أنتم من أنتم، نحن أحق بليبيا) ئێمە شایستەترین بە لیبیا، یانی لیبیای وەك کێڵگەیەك دادەنا کە بۆخۆی خاوەنیەتی، لیبیا مەڕو ماڵە و هەمووی، لە خزمەتیدایە! بەڵێ دوای ئەوە ئەو قەناعەتە دروست دەبێ، کە خەڵك ئامادەیی هەیە لە ژێر ڕکێفی ئەواندا بڕوا.

لەبەرئەوە گۆڕانکاریی و پاکسازیی و چاکسازیی، چ لە هەرێمی کوردستاندا بێ، لەهەر شوێنێکی دنیادا، پەیوەندیی بە هەموو لایەکەوە هەیە، وەك گوتم، پەیوەندیی بەو کەسانەشەوە هەیە کە بارەکەیان لەسەر شانە و ئاگریان لەسەر پشت کراوەتەوە، هەڵبەتە من ئێستا ناڵێم: واقیعی هەرێمی کوردستان، کتومت وەك لیبیای ساڵانی پێشووە، وەك میصری ساڵانی پێشووە، وەك یەمەن و کوێ و کوێیە، من دەزانم کە ئەوەی دەسەڵاتی بەدەستەوەیە لەم هەرێمی کوردستانەی ئێمەدا، ڕەوایەتییەکی لە خەڵك وەرگرتوە، بەڵام ئایا هەر ئەوەندە بەسە کە ڕەوایەتییت لە خەڵك وەرگرتبێت؟ ئەدی نابێ دواییش بە شێوەیەکی ڕەوا حوکم بکەی؟ دادگەرانەش حوکم بکەی؟ ئایا دادگەریی هەیە، ئەدی ئەو هەموو قۆرخکارییە، ئەو هەموو ملیاردلێرانە لە کوێ پەیدابوون؟! ئێمە تا ئێستا کەسابەتی وامان نەبینوە: کابرا بە چوار ساڵ ببێتە ملیاردلێر، کەسابەتی وا کە لە هەرێمی کوردستان هەیە، پێموایە لە هەموو دنیادا بوونی نیە. تەماشای هەر شتێکی دیکە بکەی، لەم هەرێمەدا هەر لارەخوار و نالەباری بینی: نەمانی دامەزراوەکان، پێشێلکردنی یاسا، مامەڵەکردن لەگەڵ خەڵك لەسەر بناغەی حیزبیی و عەشیرەتیی و دەڤەر، نەك لەسەر بنەمای مرۆڤبوون و هاوولاتیی بوون، ناڕوونیی لە فرۆشتنی نەوت و، لە بودجە و لە خێرو بێری ئەم وڵاتەدا، زۆر شت دەتوانین بێنینەوە، کە زۆر بە ڕوونی دیارە ئێمە بارودۆخێکی خراپمان

هه‌یه‌، له‌ ڕووی سیاسی، له‌ ڕووی ئابووریی، له‌ ڕووی ئیداریی، بارودۆخێكی خراپمان له‌م هه‌رێمی كوردستانه‌دا هێناوه‌ته‌ دی، كه‌ ده‌بێ چاكی بكه‌ین و بیگۆڕین و ڕاستی بكه‌ینه‌وه‌.

**دانا: به‌ڵێ، جه‌نابت وه‌ك سیاسییه‌ك، هه‌ر له‌ سه‌ره‌تای ته‌مه‌نی لاوێتیه‌وه‌ ده‌ست و په‌نجه‌ت له‌گه‌ڵ كایه‌ سیاسییه‌كه‌شدا نه‌رم كردوه‌، خوێندنه‌وه‌ت چییه‌ بۆ ئه‌و كه‌سانه‌ی كه‌ به‌جۆرێك له‌ جۆره‌كان به‌ئیراده‌ی خۆیان مل ئه‌ده‌ن به‌ بۆ سته‌مكار و بۆ ئه‌وانه‌ی كه‌ سامان و ده‌سه‌ڵات قۆرخ ئه‌كه‌ن، ئه‌مان هاوكاریان ئه‌بن، ئه‌مان هوتافیان بۆ ئه‌كێشن، ئه‌و جۆره‌ كه‌سانه‌ له‌لای مامۆستا عه‌لی باپیر چۆن دێنه‌ پێش چاو، پێناسه‌ی تۆ، خوێندنه‌وه‌ی تۆ بۆ باری كۆمه‌ڵایه‌تیی ئه‌و جۆره‌ كه‌سانه‌ چۆنه‌؟**

**مامۆستا:** به‌رله‌وه‌ی بێمه‌سه‌ر خستنه‌ڕووی سه‌رنج و هه‌ڵوێستی خۆم، باسی هه‌ڵوێستی قۆڕئان و سوننه‌ت ده‌كه‌م، دیاره‌ من هه‌وڵده‌ده‌م سه‌رنج و هه‌ڵوێسته‌كانی خۆم هه‌موویان له‌ قورئانه‌وه‌ وه‌ربگرم، هه‌روه‌ها له‌ سوننه‌تی پێغه‌مبه‌ر (علیه الصلاة والسلام).

١- خوای په‌روه‌ردگار له‌ سووره‌تی (هود)دا ده‌فه‌رموێ:

﴿ وَلَا تَرْكَنُوٓاْ إِلَى ٱلَّذِينَ ظَلَمُواْ فَتَمَسَّكُمُ ٱلنَّارُ وَمَا لَكُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ مِنْ أَوْلِيَآءَ ثُمَّ لَا تُنصَرُونَ ﴿١١٣﴾ ﴾ [هود : ١١٣]

واته‌: مه‌بنه‌ پاڵپشت و هاوكاری ئه‌وانه‌ی كه‌ سته‌میان كردوه‌، ئه‌گه‌رنا ئاگرتان تووش ده‌بێت.

هه‌ندێك له‌ زانایان وشه‌ی (رَكَنَ)یان به‌ (مال) لێكداوه‌ته‌وه‌، به‌ڵام وه‌ك من ته‌حقیقم كردوه‌: (وَلَا تَرْكَنُوٓاْ ) یانی: پشتیان مه‌گرن و بۆیان مه‌بنه‌ پایه‌، بۆیان مه‌بنه‌ به‌ردی بناغه‌، بۆیان مه‌بنه‌ كۆڵه‌كه‌، واته‌ باری ئه‌وان مه‌خه‌نه‌ سه‌ر شانی خۆتان، نه‌ك ته‌نیا مه‌یلیان به‌لادا مه‌كه‌ن، (فَتَمَسَّكُمُ ٱلنَّارُ ) ئه‌گه‌رنا ئه‌گه‌ر بۆیان ببنه‌ پایه‌ و بناغه‌ و باری ئه‌وان بخه‌نه‌ سه‌ر شانی خۆتان و، ببنه‌ هاوكاریان، ئه‌وه‌ ئاگرتان تووش دێ.

٢- له سووره‌تى (الصافات)دا خواى په‌روه‌ردگار ده‌فه‌رمویٚ:

﴿ ٱحْشُرُوا۟ ٱلَّذِينَ ظَلَمُوا۟ وَأَزْوَٰجَهُمْ وَمَا كَانُوا۟ يَعْبُدُونَ ﴿٢٢﴾ مِن دُونِ ٱللَّهِ فَٱهْدُوهُمْ إِلَىٰ صِرَٰطِ ٱلْجَحِيمِ ﴿٢٣﴾ ﴾ [الصافات : ٢٢- ٢٣]

واته: سته‌مكاران و هاوویٚنه‌كانیان، هاوتاكانیان، چڕبكه‌نه‌وه و ئه‌وه‌ى له جیاتى خوا ده‌یانپه‌رست و، ڕیٚنماییان بكه‌ن به‌ره‌و ئاگرى دۆزه‌خ.

ئه‌وجار ڕوونكردنه‌وه‌ى بیٚمه سه‌ر هه‌ڵویٚست و بۆچوونى خۆم، ئه‌ویش ئه‌وه‌یه كه هه‌م له دنیادا ئه‌و كه‌سه‌ى كه دینى خۆى، ویژدانى خۆى، به دنیاى خه‌ڵك ده‌دات، گوناهبار و عه‌یبداره ئینسان ئه‌گه‌ر دینى به دنیاى خۆشى بدات، هه‌ر زه‌ره‌رمه‌نده، چجاى دینى خۆى و ویژدانى خۆى به دنیاى خه‌ڵك بدات، ئه‌وه له دنیادا عه‌یبداره و، له قیامه‌تیش دا گوناحبار و شه‌رمه‌زاره، له‌به‌رئه‌وه ده‌بیٚ خه‌ڵك زۆر به جیددیى چاو به خۆیدا بگیٚڕیٚته‌وه و، زۆر به‌جیددیى هه‌ست به لیٚپرسینه‌وه‌ى خوا بكه‌ین، ئیٚمه له‌م دنیایه‌دا دانراوین بۆ تاقیكرانه‌وه، پاشان لیٚپرسینه‌وه‌ى میٚژووش هه‌یه، دواییش ئه‌م واقیعه دیاره كه هه‌موومان لیٚى بیٚزارین، به خوا له‌م وڵاته‌دا كیٚ زۆر به‌هره‌مه‌نده، كه به ته‌نیا قسه‌م له‌گه‌ڵدا ده‌كا و قسه‌م له‌گه‌ڵدا كردوه، ئه‌ویش ده‌ڵیٚ: ده‌بیٚ چاكى بكه‌ین، ئه‌م وه‌زعه به‌كه‌ڵك نایه‌ت ده‌بیٚ چاكى بكه‌ین، لاریى و خواریى زۆرى تیٚدایه، سته‌م و ناته‌واویى زۆر، ده‌بیٚ چاكى بكه‌ین، گرنگه ئیٚمه ئه‌و قه‌ناعه‌ته‌مان هه‌بیٚت كه بزانین به‌بیٚ خۆڕاستكردنه‌وه و خۆپاكسازیى و خۆچاكسازییكردن، ناتوانین به‌رده‌وام بین.

ئنجا ئه‌و جۆره كه‌سانه‌ى كه پشتى سته‌م ده‌گرن، ئه‌گه‌ر پیٚیان وابیٚ وه‌ك به‌رزه‌كى بانان بۆى ده‌رده‌چن، له‌به‌رئه‌وه‌ى بیٚ ده‌سه‌ڵاتن، چونكه خوا سبحانه وتعالى له سووره‌تى (سبأ)دا ئه‌وانه‌ى كه شویٚنكه‌وتوون به (الذين ستضعفوا) یان ناو ده‌بات و سه‌ركرده‌كانیش به (الذين استكبروا):

﴿ يَقُولُ ٱلَّذِينَ ٱسْتُضْعِفُوا۟ لِلَّذِينَ ٱسْتَكْبَرُوا۟ ﴾ (سبأ: ٣١)

ئەوانەی كە چەوسێنرابوونەوە بەوانەیان گوت كە خۆیان بەزل گرتبوو، (لَوۡلَآ أَنتُمۡ لَكُنَّا مُؤۡمِنِينَ) [سبأ : ٣١] ئەگەر ئێوە نەبوونایە ئێمە بڕوامان دەهێنا، ئنجا هەرچەند بە چەوسێنراوەش ناویان دێنێ، بەڵام خوا سبحانە وتعالی هەموویان وەك یەك حوكم دەدات و، وشەی (الظالمون) و(الذين كفروا) بۆ هەردووك لایان بەكاردێنێ!

گرنگە ئێمە بزانین وەك بەرزەكی بانان بۆی دەرناچین، لەبەرئەوە كە بێدەسەڵاتین، لەبەرئەوە كە خەڵكی دیكە بەهرەمەندە و ئێمە زەرەرمەندین، ئێمەش مادام بەشێكین و، بووین بە بەشێك لە واقیعێكی خراپ، جگە لەوانەی كە هەڵوێستیان هەیە، هەموویان پشك و بەشیان دەبێ لە سزای دنیایی خوا و، لە سزای قیامەتیی خوای دادگەریش دا.

لە سوورەتی (الأنفال)دا خوا دەفەرموێ: ﴿ وَٱتَّقُواْ فِتۡنَةً لَّا تُصِيبَنَّ ٱلَّذِينَ ظَلَمُواْ مِنكُمۡ خَآصَّةً وَٱعۡلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ شَدِيدُ ٱلۡعِقَابِ ﴾ [الأنفال : ٢٥]

واتە: لە بەڵایەك بترسێن كە تەنیا بەتایبەت تووشی ستەمكارەكانتان نابێت و، بزانن خوا تۆڵە و، سزای توندە، واتە: تەنیا ئەوانە كە ستەمكارن، تووش نابن.

ڕۆژێك ئەبوبەكری صدیق ڕەزای خوای لێ بێت ئەو ئایەتەی خوێندەوە ئایەتی (١٠٥) لە سوورەتی (المائدة) كە دەفەرموێ:

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ عَلَيۡكُمۡ أَنفُسَكُمۡۖ لَا يَضُرُّكُم مَّن ضَلَّ إِذَا ٱهۡتَدَيۡتُمۡۚ إِلَى ٱللَّهِ مَرۡجِعُكُمۡ جَمِيعٗا فَيُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمۡ تَعۡمَلُونَ ١٠٥ ﴾ [المائدة : ١٠٥]

واتە: ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! وریای خۆتان بن، خۆتان (مسوڵمان بن و پابەند بن) ئەگەر ئێوە ڕێی ڕاست بگرن ئەوەی كە گومڕا بووە زیانتان لێ نادات.

ئەبوبەكری صدیق ئەم ئایەتەی خوێندەوە، دوایی فەرمووی: خەڵكینە! ئێوە ئەم ئایەتە دەخوێننەوە بەڵام لە غەیری شوێنی خۆیدا دایدەنێن، بە هەڵە لێی

تێدەگەن، چونكە من گوێم لە پێغەمبەری خوا (عليه الصلاة والسلام) بوو، دەیفەرموو : هەركاتێك خەڵك ستەمی بینی، خراپەی بینی، هەڵوێستیان نەبوو لە بەرامبەریدا، نزیكە خوا سزای هەموویان پێكەوە بدات، كەواتە بەڵێ ئایەتەكە دەفەرموێ: ئەگەر ئێوە ڕێی ڕاست بگرن ئەوانەی گومڕان زیانتان لێ نادەن، بەڵام بەشێك لە ڕێی ڕاست گرتن ئەوەیە دەستی زاڵم بگری، بەشێك لە هیدایەت دران ئەوەیە تۆ لە بەرامبەر ستەمكاردا هەڵوێستت هەبێ، لێرەدا شتێكم بیركەوتەوە: بیستوومە كە هەندێك بەناوی شوێنكەوتنی سەلەفی صاڵحەوە دەڵێن: مانگرتن حەرامە، بیدعەیە، خۆپێشاندان بیدعەیە، ڕێپێوان بیدعەیە، ئایا ئەو قسانەیان لە كوێ هێناوە؟ فەرمایشتی پێغەمبەرە (عليه الصلاة والسلام)، پێغەمبەری خوا دەفەرموێ: (سيد الشهداء حمزة، ورجل قام إلى امام جائر، فأمره ونهاه فقتله)، واتە: گەورەی شەهیدان حەمزەیە و پیاوێك ڕاست دەبێتەوە لە حوكمڕانێكی ستەمكار، فەرمانی پێدەكات و ڕێگریی لێ دەكات و ئەویش دەیكوژێ، ئەوە لەگەڵ حەمزەدا دەیهێنێتە ترازوییەكەو.

لە فەرموودەیەكی دیكەدا دەفەرموێ: (أفضل الجهاد كلمة عدل عند سلطان جائر)، واتە: گەورەترین جیهاد بریتیە لە قسەیەكی دادگەرانە لەلای حوكمڕانێكی ستەمكار! ئەدی ئەوەیان لەكوێ هێناوە: حوكمڕانی لادەر و ستەمكار بۆ ڕاستكردنەوەی، دەبێ: بەدزیی نامەی بۆ بنێری و، نابێ لە ئیعلام باسی بكەی و، نابێ خۆپێشاندان لەدژی بكرێ؟! ئەو قسانە هەموویان ماڵی پووچن و، سەربەخاوەنیانن و حوكمڕانە ستەمكار و میراتییەكان، ڕژێمە دیكتاتۆرەكان، تەرویجی ئەو جۆرە قسانە دەدەن، بۆ ئەوەی خەڵك هەمووی بەناوی دینەوە دەمی خۆی ببەستێ و قەرەقەیی لێ بكا! ئەگەرنا سەلەفی صاڵحەی ئێمە: ئیمام ئەبو حەنیفە سجن دەكرێ، ئیمام ئەحمەد داركاریی دەكرێ، ئیمام شافیعی ڕادەكات، دەچێ بۆ میصر و عێراق جێدێڵێ، ئیمام مالیك لێی دەدەن شانێكی دەخزێ، لەبەرئەوەی پشتگیریی ئەوانە دەكات كە دژی بەنی ئومەمیە و بەنی عەبباس هەڵساون، پێشینی چاكی ئێمە ئاوابوون، بێدەنگنەبوون لەبەرامبەر زوڵم و ستەم و لاداندا، لەبەرئەوە بەناوی شوێنكەوتنی

سەلەفی صالْح و پێشنی چاك و بەناوی دینداریيەوە، ڕەواجپێدانی ئەو جۆرە بیرۆکە و قسانە، بەڕاستی خیانەتکردنە بە پێشینی چاك، پێشینی چاکی ئێمە، پیاوی بە هەلْوێست بوون، کام لە پێشەوایەکانی ئێمە لەبەرامبەر ستەمدا بێدەنگ بووە، لە بەرامبەر خراپەکاریی و لادانی حوکمڕانەکاندا، کە حوکمیشیان بە شەریعەت کردوە، بێدەنگ بووە؟ تاکو ئێمەش وا لە خەلْك بگەیەنین: نەخێر، نابێ هیچ هەلْوێستێکتان هەبێ، ئاخر دنیا پڕ دەبێ لە زولْم و ستەم و خراپە و، لە حەقیقەتدا بێدەنگیی خەلْکە کە ستەم دروست دەکات، نەك ستەم بێدەنگیی دروست بکات!

**دانـــا: مامۆستا! با قسەیەك بکەین لەوانەیە لەدڵی هەندێ لە خەڵکیدا بێ، بەڕاشکاوانە لە خزمەت جەنابتدا و بزانین جەنابیشت وەك کەسی یەکەمی کۆمەڵی ئیسلامیی، تێڕوانینت لەسەر ئەو بۆچوونە چییە؟ ئێستا هەمووومان کۆکین لەسەر ئەوەی ئەم حکوومەتەی لە هەرێمی کوردستاندایە، بەجۆرێك لە جۆرەکان زوڵم لە هاووڵاتیی و فەرمانبەرەکانی خۆی دەکات، ئەو لایەنە سیاسییانەی کە بەشدارن، بەشداریی کۆمەڵی ئیسلامیی ناکاتە ئەوەی کە هاوکاری ئەو ستەمەیە، کە ئەم حکوومەتە ئەیکات؟**

**مامۆستا:** کاك دانا! پێشێ با من ئەوەت بۆ ڕاست بکەمەوە، لەپێشەوەش ئاماژەم پێدا، من دەڵێم: ئەوەی ستەمکاریی سەرەکییە و بەپلەی یەکەم ستەم دەکات، حکوومەت نیە، حکوومەت دێوجامەیەکە بۆ شاردنەوەی بڕیاربەدەستان و ئەوانەی کە ئەمرو نەهییان بەدەستە، ئەوانەن کە ستەم دەکەن، حکوومەت بۆخۆشی یەکێکە لە مەزلوومەکان، چونکە من وەزیرەکان دەبینم، بەڕێوەبەرە گشتییەکان دەبینم، حکوومەتەکە دەبینم قەرزدارە، بەڵام حکوومەتەکە دێوجامەیەکە، ئنجا لە پشت ئەو دێوجامەو پەردەوە، کەسانێك هەن کە بڕیاربەدەستن، هەمەکارەی ئەم وڵاتەن، زوڵم دەکەن، ئەگەر زوڵمە، ئەگەر عەدلە، ئەگەر چاکەیە، ئەگەر خراپەیە، هی ئەوانە بەڕاستی، تەنیا ئەو گلەییە دێتە سەر حکوومەت، کە حکوومەتێکی ئاوا، نابێ قبووڵ بکا حکوومەتایەتیی بکات.

بۆ وەڵامی پرسیارەكەت: ئێمە كاتی خۆی بەشداریی ئەم كابینەی هەشتەمان كرد، بە چەند مەرجێكەوە بەشدار بووین، بۆیەش بەشداربووین كە ئەم كابینەیە كابینەی چاكسازیی بێ، چاكسازیی ڕیشەییش بێ، هەروەها كابینەیەك بێ دامەزراوەكان دروست بكات لەم وڵاتەدا، یاسا سەروەر بكات و، لەسەر بناغەی هاووڵاتییبوون و مرۆڤبوون لەگەڵ خەڵكدا مامەڵە بكات، قۆرخكاریی نەهێڵێ، گەندەڵیی نەهێڵێ، بەڵام هیچكام لەوانە نەبوون، دیارە بڕیارێكی واش من لێرەوە ناتوانم بە تەنیا بیدەم، ئێمە تا ئێستا، وەك سەركردایەتی كۆمەڵی ئیسلامیی تا ئەم لەحزەیەش، مانەوەمان لەو حكوومەتەدا بەو هەموو كەموكوڕییانەشیەوە، بەو هەموو بێچارەییەشیەوە كە هەیەتی، مانەوەمان پێ باشتر بووە.

**دانـــا: پێ باشتر بووە لەبەر خۆتان، یان لەبەر خەڵك؟**

**مامۆستا:** لەبەر بەرژەوەندیی گشتی، چونكە بۆخۆمان چەند ساڵە ئەو بودجەیە كە دەماندرایە بڕدراوە، هی ئێمەش لەگەڵ هی خەڵكێكی دی، هەرچەندە خەڵكێكی دیكە هەر پڕە، بەس ئێمە لە مێژە قڕكراوین، یانی: ئێمە ئەو دوو سێ وەزیرەمان ئەگەر هەبن لە حكوومەتدا یان نەبن، بۆ ئێمەی كۆمەڵی ئیسلامیی، وەك یەك، چونكە ئەوە نیە كە لەبەرامبەر ئەو بەشدارییەدا بەهرەیەك وەربگرین، تەنانەت بودجەیەكی كەمیش هیچ نیە، كەواتە: ئێمە بەرژەوەندیی گشتییە پاڵی پێوە ناوین تا ئێستا، لەمەودواش ئەگەر بزانین هەر ئەو بەرژەوەندییە گشتییە بەوە دێتەدی كە ئێمە بكشێینەوە، ئاوی لێ ناخۆینەوە، لەم ڕۆژانەشدا دیارە قسە دەكرێ لەنێو كادیرەكانی ئێمەدا و لە نێو سەركردایەتییدا ئەو قەزیەیە دەوروژێنرێ و لە ڕاگەیاندنیشدا دیارە قسەی لەسەر كراوە، یانی: مانەوەی ئێمە و كشانەوەی ئێمەش، پێموایە زۆر لە قەزیەكە ناگۆڕێ، تەنیا ئەوە دەبێتە هەڵوێستێكی حیزبیی بۆ خۆمان، ئەگەرنا دەردی ئەم هەرێمە و دەردی ئەم حوكمڕانییە و دەردی ئەم قەوارە سیاسییەی ئێمە، زۆر لەوە قورسترە بە بەشداریی ئێمە، یاخود لێ هاتنەدەری ئێمە، چارەسەر بێ، دەبێ بیری زۆر قووڵتر و فراوانترو جیددیتری لێ بكرێتەوە، ئەگەر فریا بكەوین، هیوادارم فریا

بكەوین بیرێكی باشی لێ بكەینەوە، هیوادارم كاتمان لەدەست نەچووبێ و پاش باران كەپەنەنك نەبێ !!.

**دانــا: ئەی بە بڕوای تۆ بۆچی بەشێك لە شەقام، بەشێك لە هاووڵاتییان، داوا ئەكەن ئەم لایەنانەی دیكە كە هەست ئەكەن قسەكانیان، هەڵوێستەكانیان لە خزمەتی خەڵك و شەقام و جەماوەرە، وەك كۆمەڵی ئیسلامی بە نموونە، بە بڕوای تۆ ئەوان بۆ داوا ئەكەن ئەم لایەنانە بێنەدەرەوە لەم حكوومەتە؟**

**مامۆستا:** ئەوەش بە ڕەهایی نیە، چونكە من ئاگاداری خەڵكم، ئێستاش خەڵكێك پێی وایە كە ئێمە مانەوەمان باشترە، لەبەرئەوەی ئەو خەڵكەمان كە لەو حكوومەتەدا، لەو كابینەیەدا بەشداربوون، چ لە ئاستی وەزیرەكان، چ لە ئاستی بەڕێوەبەری گشتی، چ لە ئاستی قائیمقام و مودیر ناحیە ڕۆڵی باشیان بینیوە و، نموونەیەكی جوانیان پێشان داوە، خەڵكێك هەیە ئێستاش هەر قەناعەتی وایە كە مانەوەمان باشترە، وەك چۆن ڕای دیكەش هەیە كە: نەخێر واباشترە تا زووترە لێی بێینە دەر، ئێمەش بەڕاستی لە لێكۆڵینەوەیداین، وەك گوتم هەركاتێك پێمانوابێ كە بەرژەوەندیی گشتی زیاتر ئەوە دەخوازێ ئێمە لێی بێینە دەر، لە حكوومەت دەكشێینەوە، هەرچەند وەك گوتم: بە لێهاتنەدەری ئێمە، وەزعەكە چاك نابێ، هەروەك بە بەشدارییكردنیشمان نەمانتوانیوە ئەو بارە لارەی ڕاست بكەینەوە، بەداخەوەش دەڵێم كە ئەو مەرجانەی ئێمە لەسەر بناغەیان بەشداریی ئەم كابینەی هەشتەمان كرد، مەرجەكان نەهاتنە دی، بەڵێ بیانوو بە شەڕی داعش و، بڕینی بوودجە و، چی و چی دەگرن، بەڵام دەشگونجا زۆر شت بكرێ، ئەگەر بەرژەوەندیی حیزب و خزم لێ گەڕابایە، دەگونجا زۆر شت بكرێ، كە بە داخەوە نەكران و لە هەموو حاڵاندا، دەردەكەش زۆر لەوە قورسترە كە بەو شتانە چارەسەر بكرێ، بەڵام ئەو كاتە هەڵوێست نواندن ئیشی خۆتە، ئەو كاتە وەك هەڵوێستێكی حیزبیی دەنوێنی، وەك بەرگریی كردن لە سومعە و پێگەی خۆت، ئەگەر پێتوابێ زەرەرمەند دەبی بە زیاتر تێدا مانەوەی.

**دانـــا: بەڵام بە بڕوای مامۆستا عەلی باپیر، هاتنەدەرەوەی هیچ كێشەیەك بۆ هاووڵاتییان چارەسەر ناكات؟**

**مامۆستا:** من پێم وایە نەخێر، هەروەها هی یەككگرتوویش من پێموایە، ئەوانیش بە سێ چوار وەزیر، كشانەوەیان هیچ لە وەزعەكە ناگۆڕێ، ئەوەی كە كاریگەریی دەبێ لەسەر وەزعەكە هەڵوێستی یەكێتییە، لەبەرئەوەی یەكێتی بەشێك لە كوردستانی بەدەستەوەیە و، هێزی هەیە و، هێزی ئاسایش و پۆلیس و بودجە و ئیمكانیەتی ماددییان لەبەردەستە، پەیوەندیەكی سیاسی و ئەو وەزعە مێژووییەی كە خۆیان هەیانە.

هیوادارم بە هەموو لایەك بگەینە ئەوەی كە كارێك نەكەین زەرەری زیاتر بكەین، زەرەرمان زۆر كردوە، كارێك نەكەین زەرەری زیاتر بكەین، چونكە ئەگەر خۆمان بۆ خۆمان نەبین، كەس بۆمان نابێت، ئەوانە زۆر بەهەڵەداچوون كە پێیان وایە ئێران و توركیاو بەغدا و فەڕەنساو ئەمریكا و بەریتانیا دەتوانن، مەداری تۆ ساز بكەن، تۆ بۆ خۆت نەبی، لەنێو خۆتدا تەبا نەبی، لەنێو خۆدا یەككگرتوو نەبی، ئابوورییەكی بەهێزت نەبێ، تەباییەكی چاكت نەبێ، هاوكاریی و ڕێكوپێكیی لەبەینی خۆتدا نەبێ، پەیوەندییەكی دیبلۆماسیی یەككگرتووت نەبێ، مەرحەبا و سەلام و كەلامی ئێران و توركیا و بەغدا و سعوودیە و سووریا و فەڕەنسا و بەریتانیا و ئەمریكا بە تۆ چی؟! بابی فلسێك نیە، ئەگەر بۆ خۆت نەبی، (من لم يكن لنفسه فكيف يكون لغيره) هەركەسێك بۆ خۆی نەبێ، چۆن بۆ خەڵكی دەبێ؟! جا من دەڵێم : (من لم يكن لنفسه فكيف يكون لغيره) كەسێك بۆ خۆی نەبێ خەڵكی دیكە چۆن بۆی دەبێ؟ عەرەب دەڵێن: (ما حَكَّ ظَهْرَكَ مثل ظُفْرِكِ) هیچ شتێك وەك نینۆكی خۆت پشتت ناخورێنێ!.

**دانـــا: بەڵێ، ئەگەر بێینەوە سەر تەوەری ئاڵقەی ئەمجارەمان کە باس لە گۆڕانکارییە، بە بڕوای جەنابت هەم وەك نووسەر و ڕووناکبیرێك، هەم وەکو سیاسییەك، دەسەڵاتداری ناو ئەنێی، حکوومەتی ناوئەنێی، بڕیاربەدەستی ناوئەنێی، پێویستە گۆڕانکاری لە چیدا بکات؟ ئەو شتانە چین کە زۆر زەرورو ئانین گۆڕانکارییان تێدا بکرێ؟**

**مامۆستا:** لە عەقڵیەتی بەڕێوەبردنی وڵاتدا، لە بیرکردنەوەیاندا، لەوەدا کە پێیان وانەبێ جیان لە خەڵك، ئەو عەقڵیەتە کە پێی وایە ئەو وەك کەس، وەك بنەماڵە، وەك عەشیرەت، وەك خوێن و ڕەچەڵەك،وەك حیزب، جیایە لە خەڵك، ئەو عەقڵیەتە فڕێ بدرێ.

**دانـــا: ئەو عەقڵیەتە هەیە؟!**

**مامۆستا:** بەدڵنیایی، ئەدی ئەگەر نیە بۆچی ماڵێك، دوو ماڵ، چەند ماڵێك، عەشیرەتێك، چەند عەشیرەتێك، حیزبێك، چەند حیزبێك، بۆچی دەبێتە هەمەکارەی وڵاتێك، بۆچی هەموو شتێك بۆ خۆی قۆرخ دەکات، لەسەر چ بناغەیەك؟! ئنجا دێنێ بەشێك لەو ئیمتیازە مادديى و مەعنەوییانە تەخشان و پەخشانی پێ دەکات بەسەر خەڵك، وەك گۆشتی خێرێ دەیبەخشێتەوە، لەسەر بناغەی کڕینی سەرپێبوون (ولاء)ی خەڵك! هەنگاوی یەکەم بۆ گۆڕانکاریی دەبێ ئەو عەقڵیەتە بگۆڕدرێ، ئنجا ئەگەر گۆڕدرا باشە، ئەگەر نەگۆڕدرا، ئەوکاتە بەرپرسیارێتیی دەکەوێتە ئەستۆی خەڵك، واتە: ئەگەر ئەو عەقڵیەتە نەیتوانی خۆی بگۆڕێ، ئەو بڕیاربەدەستانە نەیانتوانی جۆری بیرکردنەوەی خۆیان بگۆڕن، کە هیچیان لە خەڵك زیادنیە و ئەوانیش بەشێکن لە خەڵك، ئەو کاتە خەڵك دەبێ بکەوێتە بیری خۆی، تەگبیری خۆی بکات، چونکە شتێك ئەگەر ڕاست نەکرێتەوە، دەبێ هەوڵی لابردنی بدرێ، مەبەستیشم ئەوەنیە کە دەست لەیەخەی یەکدی بنێین، بەڵام شێوازی شارستانیی هەیە؟ خۆپێشاندان هەیە، مانگرتن هەیە، هاوکاریی نەکردنی دامودەزگایەکان هەیە، هەر ئەوە نیە ئیللا یەکدی بەردباران بکەین و، سەنگەر لە یەکدی بگرین، وەك وڵاتان، لە وڵاتان چۆن گۆڕانکاریی دەکرێ؟ ئەو وڵاتانەی کە زۆر لە ئێمە پێشکەوتووترن

لە ڕووى ئيداريى و سياسييەوە چى دەكەن؟ كاتێك كە شتێكيان بە دڵ نەبێ، ماندەگرن، خۆپێشاندان دەكەن، ڕێپێوان دەكەن، ئيمزا كۆدەكەنەوە، چالاكى دەكەن بەشێوازى شارستانييانە، ئەگەرنا من بە هيچ شێوەيەك لەگەڵ پەنابردنە بەر توندوتيژييدا نيم، نە لە لايەن خەڵكەوە، نە لە لايەن هيچ حيزبێكەوە، ئنجا دەڵێم: (ڕاوچى خراپ لە ئاوى لێڵدا ڕاو دەكات)، (دز بازاڕى ئاڵۆزى دەوێ) با وريا بين، خەڵكێك هەيە كە چارەى ئێمەى ناوێ (وەك هەرێم) خەڵكێك هەيە لە دەوروبەرمان لەملاولا، كە دەيانەوێ ببنە دەستى پيس لە نێو ئێمەدا، دەبێ لە خۆمان وريا بين، زەمينە بۆ ئەوانە خۆش نەكەين، بەڵام ئايا دەشگونجێ لەم واقيعە ڕابمێنى و لێى گەڕێى؟ نەخێر، بە تەئكيد ئەوەش ناگونجێ، كەواتە: دەبێ بە شێوازى شارستانييانە، شەرعييانە، هێمنانە، دووربينانە و دڵسۆزانە، هەوڵبدەين ئەو كەموكوڕييانە چارەسەر بكەين.

**دانــا: بە بڕواى جەنابت مەسرەفى دەسەڵاتداران كەمتر نابێ، ئەگەر ئەوەى باسى دەكەى بيگۆڕن، نەك جەماوەر بيگۆڕێ، خوا ئەزانێ چۆن ئەگۆڕێ؟**

**مامۆستا:** مسۆگەر گۆڕانكارييەك كە خەڵك دەيكات، خەرجيى زۆر تێدەچێ، چونكە خەڵك و جەماوەر وەختێك دەست بە شتێك دەكا، سەرەتايەكەى بەدەست خۆيەتى، بەڵام ڕەنگە كۆتاييەكەى بەدست خۆى نەبێ، عاتيفە زاڵ دەبێ بەسەر شتەكاندا، دەستى پيس دێتە نێو قەزيەكەوە، هيچ گومانى تێدا نيە ئەگەر بێت و بڕياربەدەستانى ئەم وڵاتە خۆيان بيرێكى جيدديى بكەنەوە، وەك گوتم ئەو عەقڵيەتە بگۆڕن، كە پێى وايە جيايە لە خەڵك، پێى وايە هەقيەتى هەموو شتێك لەبەردەستى ئەودا بێ و خەڵكى ديكە لێى مەحرووم بێ!! بەڵام ئێمە وەك يەك بەشەرين، وەك يەك هاووڵاتيين، نابێ هيچ كەس خۆى لەئەركى ديكە پێ زياد بێ، جا ئەگەر خەڵك ڕێزێكى زيادەى لە تۆ نا و كارێكى بە تۆ سپارد، لەو چوارچێوەيەدا كە پێيان سپاردووى، ئەوە تۆ كارى خۆت بكە و بەرپرسيارێتى خۆت بكە، بەڵام بڵێى: هەر لە ڕێوە من لە خەڵكى خاوەن حەقترم، هەر لە ڕێوە من هەرچى بم، هەردەبێ حوكمڕان بم، هەمەكارە بم، هەموو شتێك بەدەستى من بێ!! ئەو عەقڵيەتە بەكەڵك نايەت، دەبێ بگۆڕدرێ.

ئنجا بێگومان ئەگەر وەرچەرخان و گۆڕانكاریی بەشێوەیەكی هێمنانە و خۆویستانە بكرێ، خەرجییەكەی زۆر كەمە و زۆر بە ئاسانتر تەواو دەبێ، وەك ئێمە چەندان جار پێشنیارمان كردوە، بۆ زانیاری جەنابیشت و بینەرانیش من كتێبێكم لە ژێر چاپدایە، كە لەم ڕۆژانەدا دەردەچێ "ڕوانینێكی ئیسلامییانە بۆ واقیعی ئێستامان"، كتێبێكە نزیكەی سێسەد لاپەڕە دەبێ، قسەی دڵی خۆم لەو كتێبەدا كردوە، كە ئێمە پێمانوایە ئەم واقیعە دەبێ چی لێ بكرێ، چۆن مامەڵە بكەین، چۆن چاكسازیی و پاكسازیی تێدا بكەین، چۆنی بگۆڕین؟ بە كەمترین خەرجیی و مەسرەف؟!

**دانـا: بەڕێز مامۆستا عەلی باپیر نووسەر و ڕووناكبیر! سوپاس بۆ تۆ كە لەم ئەڵقایەشدا وەڵامی پرسیارەكانی ئێمەت دایەوە.**

**مامۆستا:** سوپاس بۆ ئێوەش.

## ئاڵقەی حەوتەم

بنەمای حەوتەم: بینینی هەڵەو تاوانەکانمان و دانپێدانانیان، یەکەمین هەنگاوی چاکسازییە.


ameer.maktab@yahoo.com

 /AliBapir  /AliBapir  /MediaAmeerOffice

www.alibapir.net

**دانـــا:** بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان، سڵاوتان لێ بێ بینەرانی ئازیز و خۆشەویست، خۆم بە خۆشحاڵ دەزانم خوای پەروەردگار دەرفەتی پێبەخشین، لە ئاڵقەیەکی نوێی بەرنامەی بەداناییدا بە ئێوەی ئازیز و خۆشەویست شاد ببینەوە، لە خزمەت میوانە هەمیشەییەکەمان دا، بەڕێز جەنابی مامۆستا عەلی باپیر نووسەر و ڕووناکبیر.

بێگومان لە شەش ئاڵقەی ڕابردوودا لەسەر کۆمەڵێك چەمك لەگەڵ جەنابیان لە ژێر ناوونیشانی: (بۆ چاککردنی ئەم دۆخەی ئێستا، با گوێ لە قورئان بگرین) نووسیوەتی، قسەمان کرد و ئێستا لە بنەمای حەوتەمداین کە بریتیە لە: (بینینی هەڵەو تاوانەکانمان و دانپێداهێنانیان)دا بزانین ئەم چەمکەی جەنابی مامۆستا ئاماژەی پێکردوە، یانی چی و چ هۆکارێك هەرێمەکەمانی بەم ئاقارەدا بردوە و، چارەسەرکردنەکەی چییە؟

جەنابی مامۆستا سوپاس بۆ ئامادەبوونت.

مامۆستا لەسەر ئەوەی ئاماژەمان پێکرد "دانپێدانانی هەڵەکانمان"، دەپرسم: ئایا هەرێمی کوردستان کە لە ڕووی سیاسی و ئابوورییەوە، بەم ڕۆژگارە گەیشتوە، دەرەنجامی ئەوەیە کە بڕیاربەدەست و دەسەڵاتدار و حوکمڕانانی ئەم هەرێمەی ئێمە، هەڵەکانی خۆیان نابینن و دانیان پێدانانێن؟

**مامۆستا:** بسم الله الرحمن الرحيم، الحمد لله ، وصلى الله تعالى وسلم وبارك على رسول الله، محمد وآله المهتدين بهداه.

سەرەتا پێویستە ئەوە لەلای هەموو لایەك شتێکی سەلمێنراو بێ، کە هەرگیز مرۆڤ بێ هەڵەو کەموکوڕیی نابێ، پێغەمبەری خاتەم موحەممەد (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێت: (كل بني ءَدم خطَّا ء، وخير الخطَّائين التوابون) رواه الترمذي أبوداود، واتە: هەموو وەچەی ئادەم هەڵەکارن، باشترین هەڵەکارانیش ئەوانەن کە دەگەڕێنەوە، پەشێمان بووەوانن.

بەڵێ دەبێ ئەوە حەقیقەتێك بێ لەلای هەموو کەس سەلمێنراو بێ، کە مرۆڤ بێ هەڵەو کەموکوڕیی نابێ.

پاشان جەنابت پرسیارت كرد: ئایا هەڵەی خۆ نەبینینی بەرپرسانی ئەم وڵاتە و، بڕیاربەدەستانی ئەم وڵاتە و، دان نەهێنانیان بە هەڵەو كەموكوڕییەكانیاندا، چ كاریگەرییەكی هەیە لەسەر ئەوەی ئەم بارودۆخە ئاوا ماوەتەوە و تووشی ئەو حاڵەتە چەقبەستوە بووە؟ بێگومان ئەوەی كە ئێستا ئێمە بەدەستیەوە دەستەویەخەین، ئەم بارودۆخە ناهەموارە كە قەیرانێكی ئابووریی، بەڵكو دەروونیی و، كۆمەڵایەتیی و، بارگرژییەكی سیاسی كە لەم وڵاتەدا هەیە، كۆمەڵێك هۆكار بوونەتە هۆی پەیدابوونی ئەم حاڵەتە، بەڵام دیارە من لەوێدا (لەبنەمای حەوتەمدا) باسی چارەسەرم كردوە، كە یەكێك لە هۆكارەكان و ڕێگاكانی چارەسەری ئەم بارودۆخە، بریتیە لە بینینی هەڵەو كەموكوڕییەكان و دان پێداهێنانیان، ئەوەم لەوەوە وەرگرتوە كە ئەگەر ئینسان هەڵە و كەموكوڕیی خۆی بینی، دیارە هیچ كەسێك پێی خۆش نیە عەیبدار بێ، قوڕێك، تۆزێك، پەڵەیەك، بە شوێنێكیەوە بێ، مەمنوونی كەسێك دەبێ ئاگاداری بكاتەوە كە: تۆ ئەو پەڵەیەت بە فڵان شوێنەوە، بە پۆشاكەكەتەوە هەیە، زوو ئەو پەڵەیە لەخۆی دەكاتەوە، بێگومان عەیب و كەموكوڕیی و هەڵە و تاوان و لادان، بۆ ڕووحی هەركەسێك، بۆ ناخی، لە پەڵەی پۆشاك خەتەرناكترن، چونكە پەڵەی پۆشاك بە تۆزە ئاوێك، بە خۆ تەكاندنێك لادەچێ، یان ئەوپەڕی بەرگەكەی لادەبات، بەڵام ئەو هەڵەیەی كە لەسەر ناخ پەیدا دەبێ، لە سەر ڕووح پەیدا دەبێ، دیارە هەم مەترسیی زیاترە و، هەم لاچوونیشی بەزەحمەتترە، بۆیە پێویستە بۆ چارەسەری ئەم بارودۆخە، وەك گوتوومە: هەڵەو كەموكوڕییەكانمان ببینین، خاتری خۆمان نەگرین، لەوەدا كە دان بە هەڵەكانماندا نەهێنین، نەیانبینین، چونكە ئەگەر ئینسان هەڵەو كەموكوڕیی خۆی بینی، بیریش دەكاتەوە لە چارەسەری، بەڵام كە نەیبینی، ئەوە ئەو حاڵەتە حاڵەتێكی زۆر ترسناكە، كە ئینسان نەزانێ، نەشزانی كە نازانێ، نەخۆش بێ و بە نەخۆشییەكەشی نەزانێ، لاشیدابێ و نەشزانێ كە لایداوە، ئەوە لە ڕووی زانیاریی لۆژێك (منطق)ەوە پێی دەگوترێ: نەزانینی ئاوێتە (الجهل المركب)، ئەویش ئەوەیە كە مرۆڤ نەزانێ نەشزانێ كە نازانێ، وەك یەكێك لە حەكیمەكان دەڵێ: چوار جۆرە مرۆڤ هەن، لە ڕووی زانین و نەزانینەوە:

١- باشترینیان ئەوەیە كە دەزانێ و دەشزانێ كە دەزانێ، ئەوە زانایە لێی بپرسن، پرسیاری لێ بكەن بۆ ئەوەی پێتان بڵێ.

٢- دووەمیان دەزانێ بەڵام نازانێ كە دەزانێ، ئەوەش بێ ئاگایەو بێداری بكەنەوە، تۆ زانا و شارەزای! خەڵك شارەزا بكە.

٣- سێیەمیان نازانێ دەشزانێ كە نازانێ، ئەوەش نەزانە و فێری كەن.

٤- چوارەمیان نازانێ و ناشزانێ كە نازانێ، ئنجا پەندەكە بە عەرەبی هاتوە دەڵێ: (هذا أحمق فاجتنبوه)، ئەوە زۆر كەودەنە خۆتانی لێ دووربگرن، چونكە زۆر جێگای مەترسییە، ئنجا من هیوادارم كە بڕیاربەدەستانی ئەم وڵاتەی ئێمە، لەو جۆرە نەبن، لاشیاندابێ و بە لادانی خۆشیان نەزانن، هەڵە و زوڵم و ستەمیشیان هەبێ و، پێشی نەزانن و دانیشی پێدا نەهێنن! هەڵبەتە من ئەوەم هەمووی لەبەر رۆشنایی چەند ئایەتێك و چەند فەرمایشتێكی پێغەمبەردا (علیه الصلاة والسلام) هێناوە، یەكێك لە ئایەتەكان، بەسەرهاتی ئادەم و حەووایە (سەڵات و سەلامی خوایان لەسەر بێ) كە دوای ئەوەی لەو درەختە قەدەغەكراوە دەخۆن، كە خوا بۆی دیاریی كردوون لە بەهەشتدا، لەو باغەی كە تێیدا بوون، چونكە هەندێك لە زانایان دەڵێن ئەوە باغێك بووە لەسەر زەوی، بەهەرحاڵ باغێك بووبێ لەسەر زەوی و هەموو پێداویستییەكی تێدا بووبێ، بەهەشت بووبێ، چونكە (جنة) بە مانای هەردووكیان دێت، گرنگ ئەوەیە یەك درەختی بۆ دیاریی كردوون كە لێی نەخۆن، ئنجا دوای ئەوەی لێی دەخۆن:

﴿ فَلَمَّا ذَاقَا ٱلشَّجَرَةَ بَدَتۡ لَهُمَا سَوۡءَٰتُهُمَا وَطَفِقَا يَخۡصِفَانِ عَلَيۡهِمَا مِن وَرَقِ ٱلۡجَنَّةِۖ وَنَادَىٰهُمَا رَبُّهُمَآ أَلَمۡ أَنۡهَكُمَا عَن تِلۡكُمَا ٱلشَّجَرَةِ وَأَقُل لَّكُمَآ إِنَّ ٱلشَّيۡطَٰنَ لَكُمَا عَدُوّٞ مُّبِينٞ ﴿٢٢﴾ قَالَا رَبَّنَا ظَلَمۡنَآ أَنفُسَنَا وَإِن لَّمۡ تَغۡفِرۡ لَنَا وَتَرۡحَمۡنَا لَنَكُونَنَّ مِنَ ٱلۡخَٰسِرِينَ ﴿٢٣﴾ ﴾ [الأعراف : ٢٢ـ ٢٣]

دەفەرموێ: كاتێك لە درەختەكەیان چێشت، هەردووكیان عەیب و عاری خۆیانیان بۆ دەركەوت و، دستیان كرد بە بەخۆوە لكاندنی گەڵای درەختەكان

بۆ ئەوەی خۆیان داپۆشن، پەروەردگاریان بانگی كردن: ئایا قەدەغەم نەكردبوون لەم درەختە و پێمنەگوتبوون: شەیتان بۆ ئێوە دوژمنێكی ئاشكرایە (فریوتان نەدا، هەڵتان بخەڵەتێنێ و لە میوەی ئەو درەختە دەرخواردتان بدات؟!) ئەوانیش دان پێدادێنن دەڵێن: پەروەردگارمان! ستەممان لەخۆمان كرد، ئەگەر تۆ لێمان نەبووریێ، بەڕاستی پێماندا نەیەت، لە زیانباران دەبین.

لێرەدا باب و دایكی ئێمە ئادەم و حەووا (سەلامی خوایان لەسەر بێ) یەكسەر دان بە هەڵەو كەموكوڕییەكەی خۆیاندا دێنن، لە فەرمایشتی پێغەمبەریشدا هاتوە (علیه الصلاة والسلام) وەك لە (سنن)ی (البیهقی)دا هاتوە دەفەرموێ: (إذا أحب الله عبداً، زهّده في الدنیا وبَصّره بعیوب نفسه) واتە: ئەگەر خوا بەندەیەكی خۆی خۆشویست، وای لێدەكات دنیا بە كەمگر بێ و عەیبی خۆ بینەر بێ، عەیبەكانی خۆی ببینێ و دنیاش بە كەم بگرێ.

كەواتە: ئەمە سەرەتای خۆڕاستكردنەوە و پاكسازیی و چاكسازییە، كە ئینسان كەموكوڕییەكانی خۆی ببینێ و دانیشیان پێدا بێنێ.

**دانـا: زۆر باشە، جەنابت لەو هەڵەو كەموكورتیی و لادانانە، مەبەستت پێی هەڵەولادانی شەرعییە؟ یان لەڕووی بەڕێوەبردنی وڵاتەوەیە؟**

**مامۆستا:** هەموو جۆرە لادانێك هەر ناشەرعییە، هەموو لادانێك، هەموو تاوانێك و، هەموو ستەمێك و، هەموو خراپەیەك، لەگەڵ شەرع دا تێكدەگیرێ، ئنجا یان لەگەڵ دەقێكی شەرعییدا تێكدەگیرێ، بۆ وێنە: شەریعەت فەرمانی كردوە بە دادگەریی:

﴿ إِنَّ ٱللَّهَ يَأْمُرُ بِٱلْعَدْلِ وَٱلْإِحْسَـٰنِ وَإِيتَآيِٕ ذِى ٱلْقُرْبَىٰ وَيَنْهَىٰ عَنِ ٱلْفَحْشَآءِ وَٱلْمُنكَرِ وَٱلْبَغْىِ ۚ يَعِظُكُمْ لَعَلَّكُمْ تَذَكَّرُونَ ﴿٩٠﴾ ﴾ [النحل : ٩٠]

واتە: بێگومان خوا فەرمان دەكات بە دادگەریی و بە چاكەكاری و، بە بەخشین بە نزیكان و، ڕێگریی دەكات لە (ٱلْفَحْشَآءِ) هەر قسەیەكی ناقۆڵاو نەگونجاو

(وَٱلۡمُنكَرِ ) هەر كردەوەیەكی خراپ و لادان و، (وَٱلۡبَغۡيِۚ ) هەر جۆرە دەستدرێژییەك.

یان لەگەڵ ئامانجە شەرعییەكان دا تێكدەگیرێ، بۆ وێنە: پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) هاتوون بۆ ئەوەی بەرژەوەندیی خەڵك بێتە دی، بەرژەوەندیی دنیا و دوارۆژیان، كەواتە: هەركەسێك بەشێوەیەك ڕەفتاری كرد كە پێچەوانەی بەرژەوەندیی خەڵك بوو، ئەوە پێچەوانەی شەریعەت جووڵاوەتەوە، چونكە هەندێك كەس وادەزانێ: ناشەرعیی تەنیا ئەوەیە پێچەوانەی دەقێكی شەرعیی بێ، پێچەوانەی ئایەتێك، فەرمایشتێكی پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام)، بە تەئكید ئەوە ناشەرعییە، بەڵام ئەوەش هەر ناشەرعییە كارێك بكرێ زیان بەخەڵك بگات، یان بەرژەوەندییەكیان بفەوتێ، بۆ وێنە: كەسێك كە پێچەوانەی یاسای هاتوچۆ دەجووڵێتەوە، یان پێچەوانەی یاسای شارەوانیی دەجووڵێتەوە و تەجاوز دەكات، یان پێچەوانەی ڕێنمایی هەر فەرمانگەیەك دەجووڵێتەوە، ئەویش هەرناشەرعییە،بۆچی؟ چونكە دەبێتە هۆی پەیدابوونی پشێووی و ئاڵۆزیی و، دەبێتە هۆی پەیدابوونی ستەم، ستەمیش قەدەغەیە، دەستدرێژیی بۆ سەر مافی ئەوانی دیكە قەدەغەیە، لادان قەدەغەیە و، پەیداكردنی ئاژاوە و پشێووی و ئاڵۆزیی قەدەغەیە، واتە: هەموو ئەو لادان و خراپەكارییانەی كە زیانیان بۆ خەڵك هەیە و، پێچەوانەی بەرژەوەندیی خەڵكن و، پێچەوانەی دادگەریین و، پێچەوانەی راسترەوین، هەموویان ناشەرعیین.

**دانــا: ئەو نموونە قورئانييەى جەنابت باست كرد، ئەوەى ئادەم و حەووا، لە بەرامبەرەكەيدا ئيبليس هەيە، ئەويش بێ فەرمانيى كردوە و بەلاڕێدا ڕۆيشتوە، بەڵام جياوازييەك هەيە لە نێوان ئەم دوو دروستكراوەى خوادا، ئادەم پاساو ناهێنێتەوە و دانيشى پێدا ئەنێت و، داواى لێبوردنيش ئەكات، بەڵام ئيبليس عوزريشى بۆ ئەهێنێتەوە و لە ئەستۆى خۆشى وەدەرى دەخات و ئەيخاتە ئەستۆى لايەنى بەرامبەر، ئەپرسم: ئەگەر ئێمە بەم شێوازە تەعامول بكەين، ئيبليس ئاسا بابايەك عوزر بۆ هەڵە و لادان و كەموكورتييەكانى بهێنێتەوە و بيخاتە ئەستۆى بەرامبەر، ئەمە بەرەو كوێمان ئەبا؟**

**مامۆستا:** من پێموايە زۆر جار لەم هەرێمى كوردستانەى ئێمەدا، بڕياربەدەستانى ئەم وڵاتە وايانكردوە، تەماشا بكە! ئەم وڵاتە بيست و پێنج ساڵە لەلايەن دوو حيزبەوە بەڕێوەدەبردرێت، ئيدارە دەدرێ، لە ڕووى سياسى، لە ڕووى ياسايى، لە ڕووى ئابووريى، لە ڕووى ئيداريى، لە ڕووى عيلاقات و ديبلۆماسيى، لە هەموو ڕوويەكەوە، ئەمرو نەهى بە دەستى ئەو دوو حيزبە بووە، ئێستا ئەم دوو سێ ساڵە، ئەم قەيرانى ئابوورييە پەيدا بوو، من دەزانم نرخى نەوت داشكاوە و دەزانم شەڕى داعش پەيدا بوو و، دەزانم لە بەغداوە بودجە بڕا، بەڵام ئەوەش ئەگەر لێى بكۆڵيەوە، جارێ شەڕى داعش تەنيا لێرە ڕووى نەداوە، بەڵكو بە پلەى يەكەم ڕووى لە بەغداد كردوە، كەچى لەوێ مووچەى خەڵك هەر بەردەوامە، پاشان نەوت هەر لێرە نەشكاوە، لە وڵاتانى ديكەش هەر شكاوە، ئنجا ڕاستييەكەى هەر ئەصڵەن تەنيا پشتبەستن بە نەوت و، بەو پارەيەى كە لە نەوت پەيدا دەبێ، هەر ئەوە بۆ خۆى گرفتێكى گەورەى ئيدارييە! هەروەها تەماشا بكە! ئێمە چەند باجى هەندێك لەو قسە و لێدوانانەمان دا كە دوايى سەدو هەشتا پلە لێيان پاشگەزبوونەوە، باسى سەربەخۆيى دەوڵەت و، دواييش چوونەوە بەغدا! خەڵك سێ ساڵان باجى ئەو لێدوانانەى دا، دواييش هيچيان لێ سەوز نەبوو!! ئنجا عەجايب ئەوەيە كە ئێمە كاتى خۆى دەمانگوت: با دەوڵەتمان هەبێ و بەرەو دەوڵەتى كورديى بچين، بەڵام با پێشەكييەكانى بۆ هەڵچنين، هەندێك دەهۆڵكوتى هەندێك حيزب، لێيان دەكردين بە هەرا، ئەها

فلان كەس دەڵێ: دەوڵەتی كوردیی نابێ و، ئەوە لەبەر ئێران و لەبەر توركیا و، لە بەر عەمر و لەبەر زەیدە! كاكە دەوڵەتی كوردییمان دەوێ، هیچ كەس بە قەدەر ئێمە باسی نەكردوە، من نەك هەر لێرە باسی بكەم، بەڵكو لە تاران و لە ئەنقەرەو لە بەغدا و، لە هەموو شوێنانی دنیا باسمان كردوە، كە نەتەوەی كوردیش وەك هەموو نەتەوەكانی دیكە خاوەنی نیشتمانێكە، مێژوویەكە و، نەتەوەیەكە خاوەنی كلتوورێكە، حەقی خۆشیەتی لە وڵاتی خۆیدا خاوەنی ئیدارە و ئیرادەی خۆی بێ، بەڵام ڕۆیشتن بەرەو ئەو ئامانجە، پێویستیی بە پێشەكییان هەیە، پێویستیی بە زەمینەسازیی هەیە، ئنجا چونكە زەمینەسازییەكەی بۆ نەكرابوو، لێدوانی سێ ساڵ، بە سەفەرێكی چوونەوە بەغدا، هەمووی هەڵوەشایەوە، خەڵكەكە باجەكەی دا هیچیشی لێ سەوز نەبوو.

مەبەستم ئەوەیە كە لە بەغداوە بودجە بڕا، مسۆگەر ئەو لێدوانە ئاگرینانە زۆر كاریگەرییان هەبوو لەسەری دیسان ئەو نەوتی خۆ بۆخۆ فرۆشتنەش كاریگەریی گەورەی هەبوو، باشە بۆ خۆت بیفرۆشە، بەڵام دەبێ بزانین چۆن دەیفرۆشی و پارەكەی كوا؟! هەڵبەتە لەگەڵ قسەی ڕەشبینانە و خراپدا نیم، ئەوانەی كە خۆزگە دەخوازن بە ڕژێمی صەددام بەڕاستیی بێ ئینصافیی و زێدەڕۆییەكی گەورەیە، بەڵام بێزاریی خەڵك و تووڕەیی و نیگەرانیی خەڵكیش، دەبێ حیسابی بۆ بكرێ.

ئنجا كاتێك ئێمە ئەم وڵاتە بەو شێوەیە ئیدارە دەكەین، دەرهاویشتەی خراپی دەبن و، دەرهاویشتەكانی یەخەی خۆمان و میللەتەكەمان دەگرنەوە، هەرچەندە بە داخەوە تێر ئاگای لە برسی نیە، هەندێك لەوانەی پێیانوایە دنیا شامی شەریفە، حیزب و خزمیان پڕكردوە و كردوویاننە ملیاردلێر، یان بەلای كەمەوە ملیۆنلێر، ئیدی هاواری خەڵكی برسی و ڕەش‌ڕووت نابیستن، مەبەستم ئەوەیە كە كاتێك ئێمە بەم شێوەیە ئیدارەی ئەم وڵاتە دەكەین و، بەو شێوە ئیدارە كراوە، لەلایەن ئەو بڕیاربەدەستانەوە، دوایی ئەو دەرهاویشتە خراپانەی لێ پەیدا دەبن، لەجیاتی ئەوەی دانیان پێدابێنن، دەڵێن: ئەوە خەتای شەڕی داعشە، ئەوە لەبەرئەوەیە كە بەغدا بودجەی بڕیوە، ئەوە لەبەر ئەوەیە كە نرخی نەوت دابەزیوە، یانی:

هیچی خەتای خۆمان نیە و، ئێمە هیچ عەیبمان نیە! دەستی چەور بە خەڵك دەسڕێن، فاشیلترین كەس، چ لەسەر ئاستی كەس، چ لەسەر ئاستی حیزب، چ لەسەر ئاستی دەوڵەتان، ئەو كەسەیە كە هەمیشە دەستی چەوری خۆی بەملاولا بسڕێ، ئینسانی سەركەوتوو، حیزبی سەركەوتوو، دەوڵەت و قەوارەی سەركەوتوو، ئەوەیە كە هەڵەكانی خۆی ببینێ و، چارەسەریشیان بكات، ئەوەی خەتای خەڵكە، خەتای خەڵكە، بەڵام ئەوەی خەتای خۆتە، ئاگات لێی بێ، ئێمە كە شیكردنەوە دەكەین، زۆر لەو دەرهاویشتانە خەتای خۆمانن، ئەصڵەن تۆ ئەگەر تەنیا پشت بە نەوت نەبەستی، نرخی نەوت دابەزێ، یاخود هەڵكشێ، زۆر كاریگەری لەسەر تۆ نابێ، ئەگەر تۆ بزانی چۆن ئەم وڵاتە ئیدارە دەكەی، تووشی ئەو هەڵبەز و دابەزانە نابی، ئەگەر پێشتر ئەم وڵاتە بە دامەزراوە بكرایە، حیزب هەمووی قووت نەدابایە و، بنەماڵەش حیزبی قووت نەدابایە، بەڵام: حیزب حكوومەتی قووت داوە و، بنەماڵەش حیزبی قووت داوە! جاوەرە حیسابی خۆتی بۆ بكە، لە ئەنجامی ئەوەدا كە وەزع بەو شێوەیەی لێ دێ، باشترین شت ئەوەیە كە تۆ بێی كەموكوڕییەكان وەك خۆیان ببینی، وەك ئادەم، ئادەم و حەووا ئاسا (علیهما الصلاة والسلام) كەموكوڕییەكانی خۆت ببینی، دانیان پێدا بێنی و، داوای لێبوردنیش بكەی لە خوای پەروەردگار، بەرامبەر ئەوە كە تۆ كەموكوڕییەكان هی خۆتن، خەتای خۆت بووە، بەڵام لە جیاتی دانپێدانان، دەستی چەور بە خەڵكدا بسڕی و، خۆت پیاوچاك دەربێنی، خۆت تەزكیە بكەی و بڵێی: من هیچ عەیبم نیە، بەراستی ئەوە عادەتی ئیبلیسە، هیچ گومانی تێدا نیە، چونكە ئیبلیسیش خوا سبحانەو تعالى فەرمانێكی پێكرد، كە كڕنووش بەرێت بۆ ئادەم، كڕنووشی رێزلێگرتن و سڵاولێكردن، بەڵام دیارە ئەو ئامادەنەبوو كە كڕنووش بەرێ، ئنجا خوا سبحانی وتعالى لێی تووڕەبوو، نەفرینی لێكرد، بەڵام ئیبلیس لەجیاتی ئەوەی داوای لێبوردن بكات، گوتی: چی؟ خوا دەفەرموێ سبحانە وتعالى بۆمان باس دەكات:

﴿ قَالَ لَمْ أَكُن لِّأَسْجُدَ لِبَشَرٍ خَلَقْتَهُۥ مِن صَلْصَٰلٍ مِّنْ حَمَإٍ مَّسْنُونٍ ﴿٣٣﴾ ﴾ [الحجر:٣٣]

ئیبلیس گوتی: من ناگونجێ سەجدە ببەم بۆ بەشەرێك کە لە قوڕێكی وشكی ڕەشهەڵگەڕاوی بۆنكردوو دروستت كردوە.

لە شوێنی دیکە دەڵێ: ﴿ قَالَ أَنَا۠ خَيْرٌ مِّنْهُ خَلَقْتَنِى مِن نَّارٍ وَخَلَقْتَهُۥ مِن طِينٍ ﴿١٢﴾ ﴾ [الأعراف: ١٢]

گوتی: من لەو باشترم، منت لە ئاگر دروستكردوە، ئەوت لە قوڕێ.

كەواتە: ئەوە عادەتی ئیبلیسە كە كەموكوڕیی هەبێ، عەیب هەبێ و دانی پێدانەهێنرێ، نەك هەر ئەوەندە، چونكە ئیبلیس دوایی دەڵێ:

﴿ قَالَ أَرَءَيْتَكَ هَٰذَا ٱلَّذِى كَرَّمْتَ عَلَىَّ ﴾ [الإسراء : ٦٢]

ئا ئەوە دەبینی كە بەسەر مندا هەڵتبژاردوە.

یانی: تۆ شتێكی باشت نەكردوە ئەی خوایە! كە ئەو (ئادەم)ت بەسەر مندا هەڵبژارد و داوات لەمن كردوە ڕێزی لێ بگرم، چونكە من لەو باشترم، واتە فەرمانەكەی تۆ لە جێی خۆیدا نەبوو بۆیە من جێبەجێم نەكرد، بەحساب پاساو دێنێتەوە بۆ هەڵەكەی خۆی، پاساوەكە بەوە دێنێتەوە كە خوایە فەرمانەكەی تۆ لە شوێنی خۆیدا نەبوو.

**دانــا: بەڵام ئەو عوزرە لە قەباحەت خراپتر نیە؟**

**مامۆستا:** بێگومان، لە كوردەواریی خۆماندا وای پێدەڵێن: (عوزر لە قەباحەت خراپترە) واتە: ئینسان هەڵەیەك بكات، دوایی هەڵەكەی بە شتێك پینە بكات، كە پینەكە لە خودی گوناهەكە خراپتر بێ، ئیبلیسیش زۆرچاك ئەوەی بەسەردا دەچەسپێ.

لێرەوەش دەیڵێم: ئەوەی كە بۆخۆم پێم باشە، پێم خێر و چاكەیە، بۆ هەموو كەسێكیشم پێ باشە، ئنجا لە كۆبوونەوەی تایبەتدا لە كۆبوونەوەی دوو قۆڵیی و، چەند قۆڵیی و، لە ژووری داخراو و، لە چاوپێكەوتن و، لە كۆڕ و سیمینارەدا، ئەوەی بۆخۆم بە چاكم زانیوە بۆ بەرامبەرەكانیشم بەچاك زانیوە و

پێم گوتوون كە پێویستە ئێمە واقیعی خۆمان وەك خۆی ببینین، وە دان بە هەڵە و كەموكوڕییەكانماندا بێنین، وە چیدیكە دەستی چەوری خۆمان بە خەڵكدا نەسڕین و، ئامادەییشمان هەبێ كە كەموكوڕییەكانمان چاك بكەین، عەیبەكانی خۆمان هەر بە خۆمان چاك دەبن، عەرەب دەڵێن: (ما حكّ ظهرك مثلُ ظفرك) هیچ شتێك پشتتی نەخوراندووە وەك نینۆكی خۆت.

بۆ خۆمان دەبێ نێوانی خۆمان چاك بكەین، نابێ بە تەمای ئێران و توركیا و بەغدا و ئەمریكا و شەرق و غەرب بی، بێت كەموكوڕییەكانی تۆ چاك بكات، بۆخۆت پەرلەمانت پەك خستوە و دەبێ هەر بۆخۆت كارای بكەیەوە، بۆخۆت حكوومەتەكەت ئیفلیجكردوە و، هەر بۆ خۆت دەبێ چاكی بكەی، بۆخۆت یاسات پێشێلكردوە و، بۆخۆت نەتهێشتوە دامەزراوەكان دروست بن، بۆخۆت كارێكت كردوە خەڵك تووشی نائومیدیی و بەدبینیی ببێ، هەردەبێ بۆخۆت خەڵك دڵخۆش بكەیەوە، ئیدی ئەوە بە كەسی دیكە ناكرێ، ئەوەی بە خۆمان دەكرێ بۆ خۆمان، بە كەسی دیكە ناكرێ بۆ ئێمە.

**دانــا: زۆر باشە مامۆستا، خودی دانپێداهێنان، بەهەڵەءلادانەكان، ئایا نەنگییە یان عەزیمەتە، ئایا ئەوانەی كە هەڵە ئەكەن و دانی پێدانانێن، لەوە ئەترسن كە بەم دانپێدانانە تووشی شكست بێن؟**

**مامۆستا:** بە تێگەیشتنی بەندە، ئینسانی بەهێز هەرگیز لەوە ناترسێ دان بە هەڵەی خۆیدا بێنێ، هەمیشە ئینسانی بێ هێز پێی وایە ئەگەر دانی بە هەڵە و كەموكوڕییەكدا هێنا، پێی دەشكێ، بەڵام ئینسانی بەهێز، دەزانێ كە دان بە هەڵەی خۆیدا هێنان، فەزیلەتە، عەرەب دەڵێن: (الإعتراف بالخطأ فضيلة)، لە پەندی پێشینیاندا هەیە دەڵێ: (نەكەوتن ئازایەتییە، بەڵام هەڵسان دوای كەوتن ئازایەتیی ترە) دیارە كەسانێك وا بیردەكەنەوە (كە بەدان هەڵەداهێنانیان دەشكێنن) كە پێموایە لە دەروونی خۆیاندا هەست بە بێهێزیی دەكەن و پێیان وایە ئەو كەموكوڕییانەی كە هەیانن، ئەگەر دانیان پێدا بێنن، ئەوە لەسەر خۆیانیان دەكەنە ماڵ، نازانن كە هەڵە و كەموكوڕیی كە هەتە، وەك پەڵەیەكی ڕەش

وایە پێتەوە، تۆش دانی پێدانەهێنی، هەر لەسەرت ماڵە، بەڵام تۆ تەماشای خەڵك و جەماوەر بکە، هەست ڕاگرە، ئەگەر کەسێك دان بە هەڵەو کەموکوڕیی خۆیدا بێنێ، دەڵێن: تەواو، (العذر عند كرام الناس مقبول) پۆزش هێنانەوە لەلایەن خەڵکی بەڕێز وەرگیراوە، تۆ کەسێك ناحەقییت بەرامبەر دەکات، دوایی دێتەوە بۆ لات و دەڵێ: من بەرامبەر بە تۆ ناحەقییم کرد، داوای لێبوردنم هەیە، ئینسان ئەگەر چ بڕ ڕێزو حورمەت و کەرامەتی تێدا هەبێ، پێی عەیبە هیچ بڵێ! بەڵام لەم وڵاتەی ئێمەدا: شەڕ کراوە، خوێنڕژاوە، گرفت و کێشە بووە، کەچی زۆر بە کەمیی بینیومە، ئەگەر نەڵێم هەر نەمبینوە لە بڕیاربەدەستانی ئەم وڵاتە، یەکێك دان بە هەڵەی خۆیدا بێنێ، بگرەجاری واش بووە گوتوویانە: ئەوە خەتای خەڵك بووە کە بەشەڕهاتوون! تۆ خۆت قیادەی شەڕەکانت کردوە، تۆ (آمر) بووی، تۆ (ناهي) بووی، ئێستا یانی چی وەك بەرزەکی بانان خۆتی لێ دەبەیە دەر؟! ئەوە بەڕاستیی بێ هێزییە، جوامێریی ئەوەیە ئینسان دان بەهەڵە و کەموکوڕییەکاندا بێنێو وەك خۆی بیانبینێ.

هەڵبەتە لێرەوەش خاڵی وەرچەرخان دەستپێکی گۆڕانکاریی دەستپێدەکات، تۆ تا نەزانی لاری، هەوڵنادەی خۆت ڕاست بکەیەوە، تا نەزانی نەخۆشی، خەمناخۆی بچی بۆ لای پزیشك و خۆت چارەسەر بکەی، بەهەمان شێوەش: تا نەزانی کە کەموکوڕییەکت هەیە، هەوڵنادەی خۆت باش بکەی، پاکسازیی و چاکسازیی بکەی، لە وڵاتەکەدا، کەموکوڕییەکانی ئێمەش لە ئاستی بڕیاربەدەستان و ئیدارەکردنی ئەم وڵاتەدا لەوە چوونە دەرێ و وەکگوتراوە: (بەری خۆر بە بێژنگ ناگیرێ) لەوە چوونەدەرێ بە دان پێدانەهێنان و پێ لێ نەنان، پەردەپۆش بکرێن، بەڵێ: (مانگەشەو پێویستیی بە ئاماژە نیە) شتەکە زۆر ڕوونە، لەم وەزعە بەسەرهاتێکم دێنێتەوە یاد: دەڵێن پادشایەك بووە لە وڵاتێکدا، کەسێکی فێڵبازی لێهەڵکەوتوە، وای پاشا ئیغفاڵ کردوە کە ئەو بەرگی بۆ دەچنێ، پێیدەڵێ: هەموو ڕۆژێ ئەو بەرگەت بۆ دەچنم و، دوایی پاشای ڕووتکردووەتەوە و بەحیساب بەرگەکەی کە بۆی چنیوە لەبەری کردوە، ئیدی گوتوویەتی: قوربان ئەو بەرگەت زۆر جوانە، پادشا گوتوویەتی: ئاخر من ڕووتم!گوتوویەتی: قوربان لەبەر چاوی خۆت وایە، ئەگەرنا هەموو کەس

بەرگەکەت دەبینێ، بەس خۆت نایبینی، ئیدی دوایی وای لە پاشا کردوە بە ڕووتی بچێتە نێو خەڵك و، خەڵکیش زۆر پێیان عەجایب بووە: پاشا عەیب و عاری بە دەرەوەیە و ئەو کەسە فێڵبازەش وای ئیغفاڵ کردوە کە بەرگێکی زۆر جوانی لەبەردایە، جا پادشا بەس بۆ خۆی وایدەزانی کە پۆشتەیە، ئەگینا لەبەرچاوی هەموو خەڵك ڕووت بوو!! هەندێك لە بڕیاربەدەستانی ئەم وڵاتەش بەس بۆ خۆیان پێیان وایە کە عەیبدار نین، ئەگەرنا لەلای هەموو خەڵك کەموکوڕییان هەیە، عەیبدارن، لە ڕێی ڕاست لایانداوە و، شتەکە زۆر ئاشکرایە و، ئەوەش بەرهەمەکەیەتی: وڵاتێك پڕبێ لە نەوت، پڕبێ لە غاز، پڕبێ لە زەوی باش بۆ کشتوکاڵ، وڵاتێك بێ سنووری بەسەر چەند وڵاتێکەوە هەبێ، وڵاتێك بێ بیست و پێنج ساڵ بێ لەبەردەستی خۆتدا بێ، وڵاتێك بێ ئەو هەموو ڕووبارەی تێدا بن، ئاوی شیرینی تێدا بێ، شوێنی ئاژەڵداری هەبێ، شوێنی پیشەسازیی هەبێ، کەچی خەڵکەکەی بەدەست بێ مووچەیی و بەدەست بێ ژیان و گوزەرانییەوە گرفتاربن و، لەولاشەوە چینێکی سیاسی هەبێ کە بووبێتە ملیاردلێر، حیزب و خزم بووبێتە ملیاردلێر، دەجا عەیب ئەوە نەبێ و کەموکوڕیی ئەوە نەبێ، دەبێ چ شتێك کەموکوڕیی بێ؟!.

**دانـا: هەر لەسەر نموونەی ئەو پادشایەی کە باست کرد، حەزدەکەم بۆچوونی تۆ بزانم لە سەر ئەوەی ئایا ئەو بڕیاربەدەستانەی خۆمان نازانن کە هەڵە هەیە، بەهۆی ئەو چواردەور و ئەو ڕاپۆرتانەی کە ئەچێتە بەردەمیان، یان نەخێر، ئەوانیش باش ئەزانن، بەڵام دانی پێدانانێن لەبەر لووتبەرزییان؟**

**مامۆستا:** هەردووکیان هەن، ئەوەی من بۆم دەرکەوتوە، هەردوو حاڵەتەکە هەن: حاڵەتی بەسەهوو بران و ئیخفال کران هەیە و، حاڵەتی نەسەلماندن و دانپێدانەهێنانیش هەیە.

**دانـا: جا ئەبێ بڕیاربەدەست وابێ؟**

**مامۆستا:** نەخێر، نابێ وابێ، بەڵام ئێستا واقیعەکەمان ئاوایە، ئاگادارم کە کەسانێك هەن بە سەهوو براون و ئیغفاڵ کراون و، واقیعەکە وەك خۆی نابینن،

راپۆرتی جۆراوجۆری به موبالەغه و زیادەڕۆیی و درۆو دەلەسەیان بۆ دەچێ، دنیا یان بەجۆرێكی دیكه پێشان دەدەن، هەركەسێك ڕەخنەیەكی دڵسۆزانەیان لێ بگرێ، وایان دەخەنه بەرچاو كه ئەو دوژمن و ناحەزە، هەركەسێك قسەیەك بكات پێچەوانەی سیاسەتی ئەوان بێ، دەڵێن: قوربان ئەوه ناحەزتە، ناڵێن ئەوه دڵسۆزتە، دۆست ئەو كەسەیه دەتگریەنێ، دوژمن ئەو كەسەیه دەتهێنێته پێكەنین، كەچی ئەوان هەر خەڵكیان لێ دەكەنه دوژمن، تاكو زیاتر متمانه بەو دەوروبەره گەندەڵ و پووچەڵ و فشەڵە بكەن!

ئنجا هەركەس قسەیەك بكا پێچەوانەی سیاسەتی وان بێ و ڕەخنەیان لێ بگرێ، دوژمن بێ، كەواتە: هەر ئەو دڵسۆزانەی بۆ ماونەوە، بۆیه با زیاتر دەستیان پێوه بگرن و زیاتر ڕێزیان لێبگر.

بەڵێ ئەو سیخوڕ و ڕاپۆرت نووسانەی دەوری ئەو برِیار بەدەستانه بۆ ئەوەی جێ پێی خۆیان مەحكەمتر بكەن، هەموو دنیایان لێ دەكەنه دوژمن، وایان لێ حاڵی دەكەن كه هەموو دنیا دوژمنیانه، هەركەسێك قسەیەك بكات، هەڵوێستێك بنوێنێ و هەنگاوێك هەڵێنێ، پێچەوانەی سیاسەتی ئەوان بێ، دەڵێن: قوربان! ئەوه لەبەرئەوەیه كه ڕقی له تۆ هەڵدەستێ! بەڵام وێڕای حاڵەتی چەواشەكران و بەسەهووبران، ئەوەش هەر هەیه كه له بەرپرسانی ئەم وڵاتەم بیستوه و دەبیستم كه دەزانن ئاوا ئەم وڵاته بەرێوه ناچێ و دەزانن كەموكوڕیی هەیه، لادان هەیه، ترازان هەیه لەراستەڕێ، بەڵام دەڵێن: له دەستمان چووەته دەر و وا به ئاسانیی بۆمان نایەتەوه، كه پێموایه ئەوەش وانیه و ئەگەر ئیرادەیەكی باش هەبێ، چەندان ساڵه من دەڵێم: دەبێ ئیراده هەبێ، ئیراده ئەگەر هەبوو، ئەگەر ئینسان بەڕاستیی لێی نەوی، ئەوكاته دەربەست نابێ چەند كەسێكی مشەخۆر له دەوروبەری تووڕەبن، چونكه ئەوانه تووڕه دەكات و لالووت دەبن، بەڵام خەڵك و جەماوەرێكی زۆر و، لەسەروو ئەوانەوه و لەپێش ئەوانەوه خوا لەخۆی ڕازی دەكات، با ئەو كۆمەڵه مشەخۆره، كه هەلپەرستن، مشەخۆرن، ئیستغلالی ئەو دەسەڵاته دەكەن كه لێی بخۆن، با ئەوانه له خۆی برەنجێنێ و بتۆرێنێ، بەڵام خەڵكێكی زۆر له خۆی ڕازی دەكات و، خەڵكی زۆر باشتر لەوانەی لێ نزیك دەبنەوه.

هەڵبەته بێ ئیرادەیی و دەستەپاچەیی هەندێك له بەرپرسان وای كردوه، ئەو خەڵكه مشەخۆره ئەوانەی كه هەرجاره له هەوایەك قسه دەكەن، لێیان كۆببنەوە، ئینسانم بینیوه، لەو ئیعلامیی و دەهۆڵ كوت و نووسەرانەی كه لەدەوروبەری هەندێك لەو بەر پرسانەن، من هەڵوێستێكی سیاسییم بووه، لەگەڵ سیاسەتی حیزبەكەی دا گونجاو بووه، تەلەفۆنی بۆ كردووم: مامۆستا! بەڕاستیی جەنابت شاخت وا و باڵت وا!! بەڵام جارێكی دیكه هەڵوێستێكم نواندوه كه پێچەوانەی سیاسەتی حیزبەكەی ئەو بووه، ئەوجورئەتەی نەكردوه تەلەفون بكات، بەڵام وتارێكی لەسەر نووسیوم فڵان كەس هێنده خراپه و ئاوا و ئاوا!! ئنجا ئەو جۆره كەسانەم وا دێنه بەرچاو، دەڵێن: جارێك كەسێك خزمەتی دەسەڵاتدارێكی كردوه، ئەو كاته ئەو دەسەڵاتداره حەزی له تەماته بووه، ئەویش هاتوه به شاخ و باڵی تەماتەدا، تەماته هێنده میوەیەكی بەسووده و شتێكی زۆر خۆشەء...هتد

ئنجا ئەو دەسەڵاتداره ماوەیەك لێ خواردوه و دوایی لێی بێزار بووه و، تەماتەی لەبەرچاو كەوتوه و گوتوویەتی: باینجانم پێخۆشه، ئەوجار ئەو دەهۆڵكوته كەوتووەته سەر مەدحی باینجان، پێداهەڵدانی باینجان و زەمی تەماته! گوتوویانه: تۆ دوێنێ بەسەر تەماتەتدا هەڵدەدا، ئەمڕۆ بەسەر باینجاندا هەڵدەدەی؟! گوتوویەتی: خۆ من خزمەتكاری تەماته و باینجان نیم، خزمەتكاری فڵانەكەسم، كەیفی لەچی بێ، بەوەدا هەڵدەدەم!!.

**دانـا: مامۆستا! دوای چارەكه سەدەیەك له خۆبەڕێوەبەریی و حوكمی خۆكردن لەلایەن دەسەڵاتی كوردییەوە، تا چەند زەرووره به بڕوای جەنابت، ئادەم و حەووائاسا ئیتر بەسه، بڕیاربەدەستانی ئێمه دان بەهەڵەكانیاندا بنێن وه قەرەبووشی بكەنەوە، نەك به پێچەوانەوە ئیبلیس ئاسا، نەك دانی پێدانەنێن، سووربن لەسەری و بیخەنه ئەستۆ و گەردنی كەسانی دیكەش؟!**

**مامۆستا:** من ئەوه دەخەمەوه بیر هەموو لایەك كه زانایان دەڵێن: یەكەمین گوناح له ئاسمان كرا، بەهۆی خۆبەزلگرییەوه بوو و، یەكەم گوناحیش كه لەسەر زەوی كرا، هەر بەهۆی خۆبەزلگرییەوه بوو، ئەوەی ئاسمان ئەوەبوو كه ئیبلیس

کڕنووشی نەبرد بۆ ئادەم، کڕنووشی ڕێزگرتن و خۆی بەزلگرت و گوتی: (أنا خيرٌ منه) الأعراف--، ئەوەی سەرزەوییش ئەوەبوو کە قابیل هابیلی کوشت، لەبەرئەوە کە هەردووکیان خێریان کرد و خێرەکەی هابیل وەرگیرا و هی قابیل وەرنەگیرا:

﴿ وَٱتْلُ عَلَيْهِمْ نَبَأَ ٱبْنَيْ ءَادَمَ بِٱلْحَقِّ إِذْ قَرَّبَا قُرْبَانًا فَتُقُبِّلَ مِنْ أَحَدِهِمَا وَلَمْ يُتَقَبَّلْ مِنَ ٱلْـَٔاخَرِ قَالَ لَأَقْتُلَنَّكَ قَالَ إِنَّمَا يَتَقَبَّلُ ٱللَّهُ مِنَ ٱلْمُتَّقِينَ ﴿٢٧﴾ ﴾ [المائدة : ٢٧]

واتە: بەسەرهاتی دوو کوڕەکەی ئادەمیان بۆ بخوێنەوە کە خێرێکیان کرد، یەکێکیان لێی وەرگیرا، ئەویدیکە لێی وەرنەگیرا، ئەوەی کە لێی وەرنەگیرا گوتی: (دیارە قابیل بوو بە هابیلی گوت) دەتکوژم، ئەویش گوتی خوا تەنیا لە پارێزکاران وەردەگرێ.

ئەویش بەهۆی خۆبەزلگرییەوە، بۆچی دەبێ صەدەقەکەی من وەرنەگیرێ، بەڵام هی بەرانبەرەکەم وەربگیرێ؟!، ئنجا تۆ تەماشا بکە! دوایی سەرئەنجامی ئیبلیس چی بوو و، سەرئەنجامی قابیل چی بوو؟ هەمیشە سەرەنجامی لادان و تاوان لە دنیا و دوارۆژدا، عەیبداریی و گوناهباریيە، شەرمەزارییە، بەڵاو نەهامەتییە، ئێستاش ئەوە واقیعەکەمان لەبەرچاومانە و دەیبینین، لە ئەنجامی ئەو لادان و حسابنەکردنە بۆ دامەزراوەکان و بۆ بەرژەوەندی گشتیی و خولانەوە لەبازنە و خۆ و خزم و حیزب دا و، گوێ نەدان بەخوا و خەڵك!

**دانـــا: ئایا كات ماوە بۆ قەرەبووكردنەوە؟**

**مامۆستا:** دیارە ئێمە بەدەست چییەوە گرفتارین: بێ ئیرادەیی، بەڵێ پێموایە کات ماوە، ئەگەر ئیرادە هەبێ، هەڵبەتە ئینسان تا زووتر بگەڕێتەوە، باشترە و باجی کەمتر دەدات، وەختێك بەهەڵە بەرێدا دەڕوات، هەتا زووتر بگەڕێتەوە مەسرەفی کەمترە، ئاسانتر دێتەوە سەر خەت، ئنجا من پەندێکم داناوە دەڵێم: دان بەهەڵەی خۆدا هێنان، کەم مەسرەفترین شتە. مەسرەفی زۆر کەمی تێدەچێ، کەسێك هەڵەی کردوە، ئەگەر دانی پێدانێنێ زوو دەبڕێتەوە، بەڵام بێنێ ئەو هەڵە

بە هەڵەیەکی دیکە پینە بکات، ئەویش بەیەکی دیکە پینە بکات، هەردەبێ لەسەری بچێ، مەسرەفی زۆر دەکات و بێسوودیشە، من پێموایە بەڵێ ئێستاش کات ماوە، ئێمە تا لەدنیادا بین کات هەر ماوە، بەڵام بە تەئکید ئینسان تا زووتر بگەڕێتەوە دەرهاویشتەی هەڵە و کەموکوڕییەکانی کەمتر دەبن.

**دانـــا: لە ئێستای هەرێمی کوردستاندا بە بڕوای جەنابت ئەبێ کێ دان بە هەڵەی خۆیدا بنێ؟ ئەوانەی کە هەڵەیان کردوە بڕیاربەدەست و حوکمڕانەکانن، یان تاك تاکی کۆمەڵگای کوردیی؟**

**مامۆستا:** تاك تاکی کۆمەڵگای کوردستان، هەرکەسە لە قەدەر خۆی، چونکە هیچ کەس بێ هەڵە نیە، بەڵام تاکێك هەڵەیەك دەکات خۆی باجەکەی دەدات، تاکێك کە نەخۆش دەبێ، ئەگەر خۆی چارەسەر نەکات، بۆ خۆی تووشی نەخۆشیی زیاتر و، دوایی تووشی مەترسیی تێداچوون دەبێ، بەڵام کاتێك کۆمەڵگایەك نەخۆش بێ، هەمووی دەکەوێتە بەر مەترسیی، بەڵێ هیچ کەس فریشتە نییە، هیچ کەس فریشتەی بێ هەڵە و بەفری بێ پەڵە نییە، بەڵام ئەوەی ئەم بارودۆخەی بەم ڕۆژە گەیاندووە شێوەی ئیدارەدانی ئەم وڵاتەیە، ئەو عەقڵیەتەیە کە لە پشت ئەم ئیدارەوەیە، ئەو عەقڵیەتەی ئەم وڵاتەی بەڕێوەبردوە، ئەوە دەبێ ڕاست بێتەوە، چەند جارێکی دیکەش باسی ئەوەمکردوە، کە هەنگاوی یەکەم بریتیە لە ڕاستکردنەوەی ئەو عەقڵیەتە، ئەو عەقڵیەتەی کە پێی وایە ئەو خەڵکە بۆ خزمەتی ئەو دروستکراون، ئەگەر بە قسە نەیڵێ بە کردەوە وا ڕەفتار دەکات، ئەو خەڵکە دەبێ لە خزمەتی ئەودا بێ، وە ئەو وڵاتە هەمووی هی ئەوە، دەبێ هەمووی لە ژێر تەصەڕوف و موڵکیەتی ئەودا بێ، ئەگەر بە قسە نەیڵێ بە کردەوە وا ڕەفتار دەکات، ئەو عەقڵیەتە دەبێ بگۆڕدرێ، ئێمە هەموومان لە ئادەمین، ئادەمیش لە گڵە، هەموومان بەندەی خواین، دەبێ هەموو پێکەوە تەبا بین، ئەوە ڕێی ڕاستە و هەر ئەوەش دەگونجێ بەردەوام بێ، کێ بەرپرسیارێتیی لەم وڵاتەدا زیاترە، بەڕاستی زیاتر چاوەڕوانیی لێ دەکرێ و زیاتر ئەرکیەتی قۆڵی لێ هەڵماڵێ و ئەم بارودۆخە بگۆڕێ، ئنجا ئەویش زیاتر پێی دەکرێ، لەو بەینەدا هەندێك لە ڕێکخراوانی کۆمەڵگای مەدەنیی هاتبوون

بۆ لام، هەر باسی پێنج لایەنەكەیان دەكرد، مامۆستا! پێنج لایەنەكە وا و پێنج لایەنەكە واو بەرپرسیارن و، منیش گوتم: بەڕێزان! پێنج لایەنەكە بەرپرسیارن بۆ چاككردنی هەركەسە بە قەبارەی خۆی، بەڵام جارێ پێنج لایەنەكە بەرپرسیار نین لە تێكدانی ئەم بارودۆخە، دوو لایەن بەرپرسیارن، ئەوانەی كە ئەم وڵاتەیان بەدەستەوە بووە، ئەوە لەلایەك، پاشان ئێستاش پێنج لایەنەكە وەك یەك بەرپرسیار نین بۆ چاككردنەوەی پەرلەمان و چاككردنەوەی حكوومەت و، یەكخستنەوەی ئیدارە و دروستكردنەوەی تەبایی سیاسی و هتد.

لایەنێك هەر ئەوەندەی لەسەرە پێشنیار بكات و ڕەخنە بگرێ و دڵسۆزانە و بەپەرۆشانە، ئەویدیكە بە كردەوە دەتوانێ وەك چۆن پەرداخێك ئاو دەخۆیەوە ئاوا دەتوانێ چاكی بكاتەوە، ئەوەی كە وەك پەرداخێك ئاوخواردنەوە بۆی ئاسانە چاكی بكاتەوە، بەرپرسیارێتیی جۆرێكە، ئەویدیكەش كە هەر دەتوانێ پێشنیار بكات و ڕەخنە بگرێ، بەرپرسیارێتیی جۆرێكی دیكەیە، وەك یەك نین، بەڵام ئەو بڕیاربەدەستانەی كە وڵاتەكەیان تێكداوە، دائیم ئەو بیرۆكەیە ڕەواج پێ دەدەن، ئنجا هەندێك كەس لە خەڵكە مەزڵوومەكەش وەك تووتی دووبارەی دەكاتەوە، بیستوومە هەندێ لایەنیش دەڵێن: هەمووومان بەرپرسیارین، باشە هەمووولایەك بەرپرسیارین، بەڵام تۆ كە لە دانووان ئاویشت بەدەست نیە، بەرپرسیارێتیی تۆ لەقەدەر خۆتە و، ئەویدیكەش لە قەدەر خۆیەتی، بەڵام ئەو بڕیاربەدەستانەی كە غەڵەت و خەتایان زۆرن، دەیانەوێ خەڵك هەمووی لە شەڕێدا شەریك بكەن، دوای ئەوەی لە خێرێ تەریكیان كردوون، دەیانەوێ لە شەڕێدا شەریكیان بكەن، دەڵێن: هەموو لایەكمان بەرپرسیارین وەك یەك! ئاخر ئەوە درۆیەكی زۆر گەورەیە، ئەو كەسەی لەم وڵاتەدا هیچی بەدەست نییە، نەپارەی بەدەستە، نە هێزی بەدەستە، نە پەیوەندییەكانی بەدەستە، نە وڵاتی بەدەستە، نە عەرزی بەدەستە، نە نەوتی بەدەستە، چۆن وەك بابای هەمەكارە و هەمووشت بەدەست، بەرپرسیارە، بەرامبەر بە چاكسازیی تێدا كردنی، ئەم وڵاتە، ئاخر پێی چاك ناكرێ، بۆیە هەركەس لەقەدەر خۆی بەرپرسیارە.

**دانـــا: مامۆستا! له نووسینه‌كانی جه‌نابتدا ئه‌گه‌ر سه‌رنج بدرێت زۆرجار ئه‌م ده‌سته‌واژه‌یه‌ك دووباره ئه‌كه‌یته‌وه، من حه‌زئه‌كه‌م بۆ ئێمه‌ی روون بكه‌یته‌وه مه‌به‌ستت چییه؟ نووسیوته: سه‌رم له بڕیاربه‌ده‌ستانێك سوورماوه كه واقیعی نه‌خۆشی هه‌رێمه‌كه‌یان ئه‌بینن، كه‌چی هیچ هه‌نگاوێكی كرده‌یی بۆ چاره‌سه‌ری نانێن، هه‌رچه‌نده له رواڵه‌تدا ئه‌مه زۆر ڕوونه، به‌ڵام من حه‌زده‌كه‌م بۆ ئێمه و بۆ بینه‌رانی ڕوون بكه‌یته‌وه، مه‌به‌ستت چییه؟**

**مامۆستا:** مه‌به‌ستم ئه‌وه‌یه هه‌ندێك كه‌س كه قسه ده‌كات واقسه ده‌كات: خۆی به خاوه‌نی هه‌رێمی كوردستان بزانێ، به‌تایبه‌تی هه‌ردووك حیزبی حوكمڕان، هه‌روه‌ها هه‌ندێك شه‌خس قسه ده‌كه‌ن وه‌ك ئه‌و خه‌ڵكه هه‌موو ئه‌و به‌رپرسیان بێ! زۆر چاكه (المرء مؤاخذ بإقراره) مرۆڤ به دانپێداهێنانی خۆی ده‌گیرێ، باشه زۆر چاكه، تۆ كه خۆت، حیزبه‌كه‌ت، ماڵه‌كه‌ت، بنه‌ماڵه‌كه‌ت، خزمه‌كانت، ئه‌وانه‌ی ده‌وروبه‌رت، خۆتان به خاوه‌نی وڵاته‌كه ده‌زانن، باشه وه‌رن خاوه‌نداریێتیی بكه‌ن، خاوه‌نداریێتیی كردن ئاوا ده‌بێ؟ مه‌به‌ستم ئه‌وه‌یه كه من ده‌بیستم و ده‌بینم ئه‌و جۆره لاف لێدان و جۆره كه‌ڵكه‌ڵه‌یه كه له كه‌للەدا هه‌یه، دواییش له‌سه‌ر ئه‌رزی واقیع نابینم هیچ هه‌نگاوێكی جیددیی بنرێت، بۆ چاككردنی وه‌زعه‌كه، كه له‌به‌رده‌ستی خۆشیاندایه، هه‌ر تۆزێك ته‌وازوعی ده‌وێ، تۆزێك پێ له نه‌فسی خۆ نانی ده‌وێ، تۆزێك ئازایه‌تی ده‌وێ، ته‌ماشا ده‌كه‌م هه‌ندێك له به‌رپرسانی ئه‌و وڵاتانه دێن بۆ لامان، ئه‌وان بۆخۆیان پێیان عه‌جایبه ده‌ڵێن: زۆرمان پێ سه‌یره ئێوه ساڵێكه په‌رله‌مانتان په‌كخستوه، ده‌ڵێن: هیچ میلله‌تێكمان نه‌بینیوه، وه‌ك ئێوه، میلله‌تێكن له‌سه‌ر نه‌خشه‌ی سیاسیی بوونتان نیه و ده‌تانه‌وێ ده‌وڵه‌تتان هه‌بێ، كه‌چی له وڵاتێكدا هه‌ر بۆ خۆتانن و په‌رله‌مانتان هه‌یه، بۆ خۆتان په‌كتانخستوه، حكوومه‌تتان هه‌یه بۆ خۆتان ئیفلیجتان كردوه، خێر و بێرێكی زۆرتان له‌به‌رده‌سته، هه‌ر بۆ خۆتان خه‌ڵكتان له خۆتان تووڕه كردوه!! به‌ڕاستیی ئه‌م بارودۆخه‌ی ئێستا له هه‌رێمی كوردستاندا ده‌گوزه‌رێ، ئه‌گه‌ر كه‌سێك له ده‌ره‌وه‌ی خۆمانه‌وه ته‌ماشای بكات، زۆر سه‌ری سوڕ ده‌مێنێ، جارێك به‌رپرسێكی ئه‌م وڵاتانه هات گوتی: ده‌زانی ئێوه كه به‌م شێوه‌یه ئه‌م وڵاته به‌ڕێوه

دەبەن، خۆ هەر ئەو پێنج شەش ملیۆنەی لە هەرێمی كوردستاندایە، نایانخەنە ژێر پرسیار، لەبەرچاوی دنیا، گوتم ئەدی چی؟ گوتی: ئێوە چل(٤٠) ملیۆن كورد دەخەنە بەرپرسیارەوە، ئەوە بەرپرسێكی یەكێك لە وڵاتانی دراوسێ بوو، بەرپرسێكی گەورەش بوو، گوتی ئێوە چل ملیۆن كورد دەخەنە ژێر نیشانەی پرسیار، كە ئەو میللەتە شایستەی ئەوە نین خاوەنی ئیرادە و ئیدارەی خۆیان بن، ئا ئەوە بەشێك لە كوردستانیان بەدەستەوەیە، ئەویشیان دوولەت كردوە، نەوتەكەی دەفرۆشن، كەس نازانێ چۆنە و چەندە؟ پەرلەمانەكەیان پەكخستوە، حكوومەتەكەیان ئیفلیج كردوە، پێكەوە قسە ناكەن، گوتم: قسەكەت جوانە، ئنجا ئایا ئەوە جێی سەرسوڕمان نیە؟ كە ئینسان ئاوا لەو وڵاتەی خۆتەوە ڕابمێنێ، ئاوا ئەزموونەكەت مردار بێتەوە لەبەر چاوی خۆت، ئیددیعاشت وابێ، كە لە هەموو كەس بۆی دڵسۆزتری و، لە هەموو كەس بۆی بەخەمتری، كەچی پێشت بكرێ، نەچی هەڵیبستێنیەوە و، تۆزێك ئاوی بە گەروویدا بكەی و، بیبووژێنیەوە!!.

**دانـــا: مامۆستا! ئەوە جێی سەرنج و سەرسوڕمانە ئەو خێروبێر و داهات و سامانە سروشتییەی لە ژێر و لە سەری ئەم خاكەی ئێمە داهەیە، كە دەسەڵاتداران و بڕیاربەدەستان تەنها بۆ خۆیان و چواردەورەكەیانە، بەڵام ئێمە ئەگەر وڵاتانی كەنداو كە نزیكترین وڵاتن لێمانەوە بە نموونە وەربگرین، ئەوان جگە لەوەی بۆ خۆشیان سەرانیان بە هەمان شێوەن، بەڵام میللەتەكەیان قڕ نیە، میللەتەكەشیان لەگەڵیدا لە ئاستێكی باشدان، ئەو ماڵانەی ئەوێ وەك باسی دەكەن، هەمووی خەڵكی فلیپین و ئەندەنووسیا و پاكستان خزمەتكاریانە، بۆچی بڕیاربەدەستانی ئێمە، ئەمە ناكەن، بە بڕوای تۆ، هەم بۆ خۆیان بیخۆن، هەم میللەتەكەش تێر بكەن؟!**

**مامۆستا:** ئەگەر لێیان زانیبایە، جارێ ئەگەر لە قیامەتیان زانیبایە، لە پەیوەندیی لەگەڵ خوا و چاودێریی خوا بەسەر خۆیانەوە، دەبوو وایان كردبایە، ئەگەر لە دنیاشیان زانیبا، هەر دەبوو وایان كردبایە، مەرج نیە ئەوانەی كەنداو، دەوڵەتانی كەنداویش زۆر عەقڵی قیامەتیان بەهێز بێت بەڵكو عەقڵی دنیایان بەهێزە، دەزانن دنیایەكە چۆن بخۆن، دەزانن ئەگەر ئەو خەڵكەش بەشدار نەكەن لەو سفرە

و خوانه، لەو نازو نیعمەته كه له ولاّتەكەیاندا هەیه، ئەگەر بەشداریان نەكەن، نەیانكەنه خاوەن پشك و بەش، دڵسۆز نابن بۆ ولاّتەكە، هەر بۆیەش پێموانیه ئێستا دیاردەی سواڵكردن و دەست له خەڵك پانكردنەوە له ولاّتانی كەنداودا هەبێ، بەڵكو خەڵكەكەیان مەگەر چۆن، ئەگەرنا وەك پادشایان دەژین، وەك چۆن خوای پەروەردگار له سوورەتی (المائدة)دا به بەنی ئیسرائیل دەفەرموێ:

﴿إِذْ جَعَلَ فِيكُمْ أَنْبِيَآءَ وَجَعَلَكُم مُّلُوكًا﴾ [المائدة: ٢٠]

واته: كه خوا پێغەمبەرانی لەنێودا پەیداكردبوون و هەمووتانی كردبوو به پادشا.

یانی: هەمووتانی وەك پادشا دەژیاند، پادشا ئەوەیه خزمەتكاری هەبێ و خەڵكی هەبێ و ئیسراحەت بێ و ئیمكانیەتی هەبێ، ئەوە پاشایەتییە، قسەكەت جوانه، كاتی خۆشی ئێمە بەتەمابووین ئەم هەولێرە بكەین به (دوبەی) بەلاّم نەكرا به دووبەی، كه بەداخەوە بڕیاربەدەستانی ئێمە، یانی ئەوانەی كه خۆیان به خاوەنی كوردستان و كاربەدەستن و شت بەدەستن لەم ولاّتەدا، وایاندەزانی كه ولاّت تەنیا بەوە بەرەوپێش دەچێ باڵەخانەی بەرزمان هەبێ، نا، ولاّت بەوە بەرەوپێش دەچێ، كۆمەڵگا بەوە بەرەوپێش دەچێ، پێش هەموو شتێك، ئەوەی دەچێتە كەللەی خەڵكەوە چییە، نەك ئەوەی دەچێتە گەدەیانەوە و، دەچێتە گیرفانیانەوە، ولاّتانی ڕۆژئاوا خاوەنی كلتوور و فەرهەنگ و فیكرێكی بەرەوپێش چوون، خاوەنی كۆمەڵێك بەهای بەرز و پەسەندن، یانی: مرۆڤەكان بەرەوپێش چوون، بۆیە ژیانەكەیان لەگەڵ خۆیاندا بەرەوپێش دەبەن، تۆ با هەر كۆشكی بەرزو سۆپەرماركێت و خانووی بەرز و ڤیلات هەبێ، بەلاّم ئەگەر لەگەڵ ئەوەدا مرۆڤەكان بەرەوپێشەوە نەچن و بەها بەرزەكان بەرەوپێشەوە نەچن، له ڕووی حوكم و سیاستەوە، له ڕووی ئابوورییەوە، له ڕووی كۆمەلاّیەتییەوە، گەشەكردن و بەرەوپێشچوونی ڕاستەقینەپەیدا نابێ، ئێستا چینە سیاسییەكەی ئێمە، تەبەقەیەكی سیاسییە جیایە له خەڵك، له بورجێكی عاجیی دا دەژی، هەر نازانێ خەڵكی دیكە چۆن دەژیەت، خۆیان جیان، شوێنی چارەسەری نەخۆشەكانیان جیایە، شوێنی خوێندنی منداڵەكانیان جیایە، شوێنی گەشت و

سەیرانیان، لە هەموو شتێك دا لە خەڵك جیان و خۆیان لە میللەت و خەڵك و جەماوەر جیاکردووەتەوە، کەواتە: چۆن بە موعاناتی خەڵك دەزانن؟ بەداخەوە کە ئینسان بارودۆخەکە ئاوا دەبینێ! لێرەشەوە دەڵێم: من پێموایە ئێستاکە شەڕی دژی داعش گەرمە و، خوا پشتیوان بێت داعش لە عێراق و لە سووریا، هەمووی دەپێچرێتەوە، چونکە ئیشیان پێی نەما و داعش کە من پێمابوو کە دروستکراوە، بۆ ناشیرینکردنی ئیسلام و جێبەجێکردنی ئەجێندای هەندێك لە دەوڵەتانی ڕۆژئاوایی و عەرەبی و دەوروبەر و کۆمەڵە خەڵکێك، داعش زانایانە و نەزانانە ئەجێندای هەندێ خەڵکیان جێبەجێ کرد، وە بیانوویان دایە دەستی هەندێ لە دەوڵەتان، ئێستا واپێدەچێت کاریان پێیان نەمابێ، یاخود واپێدەچێ داعش ئێستا بووبنە واقیعێك زەرەریان لە قازانجیان زیاتر بێ، دەیانەوێ بیانپێچنەوە، خوا یاربێ، ئەوەش کۆتایی دێت، بەڵام پرسیاری گەورە ئەوەیە ئێمە لە دوای داعش ئەو بۆشاییە گەورەیەی کە پەیدا دەبێ لە عێراقدا، ئەو شوێنەی کە داعش بەجێی دەهێڵێ، کێ پڕی دەکاتەوە، چۆن پڕ دەبێتەوە؟ هەمووی بەسەر سنووری هەرێمی کوردستانەوەیە؟ دەبێ زۆر دووربینیی بکەین و، من لەمێژیشە گوتوومە: خەڵکێك هەبوو هات قسەی خێری کرد، بۆ ئەوەی ئەو بارگرژییە سیاسییە کۆتایی بێ، گوتم: ڕەجاتان لێدەکەم پێش ئەوەی مەسەلەی داعش یەکلابێتەوە، کە ئاوا و ئاو دەچن و لە کۆڵمان دەبنەوە، باپێش ئەوە خەمێك لە بارودۆخەکەی خۆمان بخۆین، خۆمان ڕێکبخەینەوە، چونکە ئاوا بە پرش و بڵاویی و بێسەرو بەریی و یەکدی نەدواندنەوە، زۆر خراپە، ئاوا بە پەرلەمانێکی پەکخراو و حکومەیێکی ئیفلیجکراو و بارودۆخێکی سیاسی خراپ، ئێمە بەڕەورووی ئەو گۆڕانکاییە ببینەوە، حاڵەتێکی مەترسیدارە! ئەو بۆشاییە کە داعش بە جێی دەهێڵێ، جێی بیرلێکردنەوەیە، لەوانەیە هەندێك شت بێنە پێشمان کە بە هەمووشمان زەحمەت بێ بەرەوڕوویان بوەستینەوە، چ جای ئاوا بەپرژو بڵاویی!!.

**دانـــا:** **زۆر باشە ئەم پرسیارە بە گرنگ دەزانم لە خزمەت جەنابتدا بیكەم، ئەویش ئەوەیە هەر لەسەر دانپێدانان و بە هەڵە بینین، هەیە هەڵەی دەوروبەر و بەرامبەرەكانی ئەبینێ، بەڵام هەمان هەڵە كە كاتێك خۆی ئەیكات نایبینێ، بە نموونە لە ماوەی ڕابردوودا ویسترا لە لایەن حكوومەتی عێراقییەوە جۆرێك لە پەرلەمان پەكبخرێت، بەڵام لە هەرێمی كوردستانەوە بانگەشەی ئەوە كرا، كە ئێمە لەگەڵ حكوومەتێك دا مامەڵە ناكەین كە بیەوێ پەرلەمانەكەی خۆی پەكبخات، بەڵام ئێستا بەدەستی خۆمان دیسان هەمان سیناریۆمان دووبارە كردەوە، پەرلەمانی خۆمانمان بە دەستی خۆمان پەكخستوە، لەسەر ئەمە ئەڵێی چی؟**

**مامۆستا:** لەسەر ئەمە دەڵێم شیعرێكی عەرەبی هەیە دەڵێ: (لا تنه عن خلق وتأتي مثله عارٌ عليك إذا فعلته عظيم)، واتە: ڕێگریی لە ئاكارێك مەكە كە خۆشت ئەنجامی بدەی، ئەگەرنا عەیب و عارێكی گەورە دەكەوێتە سەرت، ئەگەر پەكخستنی پەرلەمانمان لە بەغدا پێ خراپە، دەبێ لێرەش پێمان خراپ بێ، ئەگەر لەوێ پێمان شتێكی باشە، حكوومەتی بەغدا مووچە بدات بە خەڵك، لێرەش دەبێ پێمان چاك بێ، ئەگەر لەوێ پێمان چاكە وەزیرێكی گەندەڵ، وەزیرێك كە كەمتەرخەمیی كردوە، پەلكێشی پەرلەمان بكرێ، لێرەش دەبێ ڕێگا بدەین، ئەگەر لەوێ پێمان چاكە، هیچ كەس لە سەرووی یاساوە نەبێ، لێرەش دەبێ ئەوەمان پێ چاك بێ، ئەگەرنا شتە باشەكانمان بۆ بەغدا پێ چاك بن و، بۆ ئێرەمان نا، دەبێ میللەتی خۆمان ناخۆشتر بوێ، ئەونەرێتە خراپە لەلای ڕۆژئاواییەكان هەیە، جارێك بە هەندێك بەرپرسانی ڕۆژئاواییم گوت: ئێوە دیموكراسی و مافی مرۆڤ و مافی چارەنووس و ئازادیی و ئەوانەتان بۆ خۆتان پێ باشە، بەڵام لە دەرەوەی سنووری خۆتان پێتان باش نین، بە ئەمریكاییەكانم گوت، گوتیان: بەڵگەت چییە؟ گوتم: بەڵگەم ئەوەیە لە دەرەوەی سنووری خۆتان هەزاران مرۆڤ دەكوژرێ، وادەزانن مێشە لەبەین چووە، بەڵام لەلای خۆتان نەفەرێكتان لێ بكوژرێ، دنیاتان لێ كاول دەبێ، ئەدی ئەوانیش هەر مرۆڤ نین؟ لەلای خۆتان دەستاودەستی دەستەڵات دەكرێ، بەڵام لەو وڵاتانەی كە حوكمی میراتیی و حوكمی دیكتاتۆریی

و حوكمی خۆفەڕزكردن و حوكمی عەسكەریی هەیە، باشترین مامەڵەیان لەگەڵدا دەكەن، مادام ئەو شتانەتان بۆ خۆتان پێ خراپن،لەولاش پێتان خراپ بن، با بە خۆیاندا بێنەوە، بەڵام تۆ موحەممەد مورسی لەوێ ڕەوایەتیی لە خەڵك وەردەگرێ، كەچی كودەتای بەسەردا دەكرێ و دەچێتە زیندان، مێشت میوان نیە، دوایی باشترین مامەڵە لەگەڵ عەبدولفەتاح سیسییدا دەكەی، كە عەسكەرێكە و بەكودەتا هاتووەتە سەر حوكم، ئایا ئەوە هاندانی خەڵك نیە بۆ ئەوە كە دیموكراسی پێشێل بكات؟ ئایا ئەوە پێچەوانەی دروشمەكانی خۆتان نیە؟ ئێمەش دەبێ ئاگامان بێ و (كە بانێكە و دوو هەوا) نەبێ و بە دوو ڕبە نەپێوین، هەرچی بۆ خەڵكمان پێ چاكە بۆ خۆشمان پێ چاك بێ و هەرچی بۆ خۆمان پێ چاكە بۆ خەڵكیشمان پێ باش بێ، ئنجا ئەم وەزعەش، بەڵێ كاتیشمان كەم ماوە، بەڵام لەو كاتە كەمەشدا هەر دەگونجێ هەندێك شت قەرەبوو بكەینەوە، هەندێ شت چاك بكەین، ئەگەر چاكی نەكەین و دەستی لێ نەجوولێنین، پێموایە ئێستا دەرد و نەخۆشییەكانمان زۆر بوون و زۆر زیاتریش دەبن، هەر خواش دەزانێ داخۆ لە داهاتوودا چی بەرەورووومان دەبێتەوە! هەڵبەتە ئەو كاتەش ئێمە هەر ئەوەندەمان پێ دەمێنێ بڵێین: نەمانگوت! زۆرمان نەگوت! زۆر ڕەجامان نەكرد، بە میكانیزمی جۆراوجۆر؟ بەڵام بە تەئكید ئەو كاتە خەتایەكە دەكەوێتە ئەستۆی ئەوانەی كە ئێستا دەتوانن بارودۆخەكە بگۆڕن و چاكی بكەن و، چاكی ناكەن.

**دانـــا: زۆر باشە، پشت بەخوای گەورە لە ئەڵقای داهاتوودا باس لە گەڕانەوە بۆ لای خوا ئەكەین، زۆر سوپاس بۆ بەڕێزت كە وەڵامی پرسیارەكانی ئەم ئاڵقەیەمانت دایەوە.**

**مامۆستا:** سوپاس بۆ ئێوەش و سەلامەت بن.

# ئاڵقەی هەشتەم

بنەمای هەشتەم: گەڕانەوە بۆ لای خوا

مایەی دەرووی خێر لێکرانەوەیە.

ameer.maktab@yahoo.com

 /AliBapir  /AliBapir  /MediaAmeerOffice

www.alibapir.net

**دانـــا:** بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان، سڵاوتان لێ بێ بینەرانی ئازیز و خۆشەویستی كەناڵی ئاسمانی پەیام، سوپاس بۆ خوای گەورە لە ئاڵقەیەكی نوێی بەرنامەی بەدانایی دا دەرفەتی پێ بەخشین بە ئێوەی ئازیز و خۆشەویست شاد بووینەوە، لە خزمەت میوانی هەمیشەیی بەرنامەكەمان دا بەڕێز جەنابی مامۆستا عەلی باپیر، نووسەر و ڕووناكبیر.

لەم ئاڵقەیەدا شرۆڤەی بنەمایەك دەكەین كە جەنابی مامۆستا لە نووسینەكانی دا لە ژێر ناوونیشانی "بۆ چاككردنی ئەم دۆخەی هەرێم، با گوێ لە قورئان بگرین" هێناویەتی، كە بریتیە لە: (گەڕانەوە بۆ لای خوا)، بزانین جەنابی مامۆستا مەبەستی لەم چەمكە چییە كە بەكاری هێناوە.

سوپاس مامۆستا كە ئامادەبووی لەم ئەڵقەیەدا.

**مامۆستا:** سوپاس بۆ جەنابیشتان و بەخێرییەوە دووبارە.

**دانـــا:** دیسانەوە با بەو پرسیارەوە دەست پێ بكەمەوە، كە لە چەند ئاڵقەیەكی ئەم بەرنامەیەدا كە هەر كردوومە، بابای زۆر نامولتەزیم كە گوێی لەم بەرنامەیەی ئێمە بێت، ئەڵێ بۆ هەموو شتەكان دەبەستنەوە بە گەڕانەوە بۆ لای خوا و بۆ نوێژ و بۆ مزگەوت و بەم شتانەوە، ئێمە لە شوێنێكی دیكەوە كێشەمان هەیە، لە دۆڵێكی تر لێمان قەوماوە، ئێوە ئەمانبەنەوە بۆ دۆڵێكی تر، جەنابت ئەفەرمووی : بە گەڕانەوەمان بۆ لای خوا ئەم دۆخەی ئێستای هەرێم تووشی بووە، بە جۆرێك لە جۆرەكان چارەسەر دەبێ، چۆن چارەسەر دەبێ؟ مەبەستت چییە؟ ئەو بابایە ئێستا ئەڵێ: ئێمە كەی كێشەمانە بمانەوێ بگەڕێینەوە بۆ لای خوا؟

**مامۆستا:** بسم الله الرحمن الرحيم، الحمد لله، وصلى الله تعالى وسلم وبارك على رسول الله، محمد وآله المهتدين بهداه.

كاكە دانا! (گەڕانەوە بۆ لای خوا) من هەر لەو شوێنەش دا هەر باسم كردوە، كە كتێبێكم لەوبارەوە هەیە بەناوی "گەڕانەوە بۆ لای خوا"، تا ئێستا پێنج جار چاپكراوەتەوە، لەڕاستییدا گەڕانەوە بۆ لای خوا، یانی: گەڕانەوە بۆ لای ئایین

و بەرنامەی خوا، بۆ ژێر سایەی شەریعەتی خوا سبحانه وتعالی، چۆن گرفت و كێشەكانی مرۆڤ وەك تاك، وەك خێزان، وەك كۆمەڵگا، وەكو دەوڵەت، چاك دەبن، كاتێك كه دەگەڕێینەوە بۆ لای خوا، هەموو نەهامەتییەكانی مرۆڤ له دووریی له خواوە پەیدا دەبن، كاتێك مرۆڤ له خوا دوور دەكەوێتەوە، خۆی لێ ون دەبێت، نازانێ چییە؟ وەك خوا دەفەرموێت:

﴿ وَلَا تَكُونُوا۟ كَٱلَّذِينَ نَسُوا۟ ٱللَّهَ فَأَنسَىٰهُمْ أَنفُسَهُمْ ﴾ [الحشر : ١٩]

واتە: وەك ئەوانە مەبن كه خوایان لەبیرچوو، خوا خۆیانی لەبیربردنەوە، كاتێك كه مرۆڤ خوا دەناسێ خۆی دەناسێ و شوێنی خۆی له ئیعرابی بووندا دەزانێ، ڕابردووی خۆی دەبینێ، داهاتووی دەبینێ، ئێستای دەبینێ، بەڵام كاتێك كه له خوا دوور دەكەوێتەوە، دەكەوێتە نێو تاریكاییانەوە، وەك خوا دەفەرموێ:

﴿ أَوَمَن كَانَ مَيْتًا فَأَحْيَيْنَٰهُ وَجَعَلْنَا لَهُۥ نُورًا يَمْشِى بِهِۦ فِى ٱلنَّاسِ كَمَن مَّثَلُهُۥ فِى ٱلظُّلُمَٰتِ لَيْسَ بِخَارِجٍ مِّنْهَا ۚ كَذَٰلِكَ زُيِّنَ لِلْكَٰفِرِينَ مَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴿١٢٢﴾ ﴾

[الأنعام : ١٢٢]

واتە: ئایا كەسێك كه مردووبوو زیندوومان كردەوە (خوای پەروەردگار ئینسانی بێ بڕوا، ئینسانی دوور له خوا بە مردوو دادەنێ و گەڕانەوە بۆ لای خوا و له خوا نزیكبوونەوە، بەزیندووبوونەوە و ژیان دادەنێ) (وَجَعَلْنَا لَهُۥ نُورًا يَمْشِى بِهِۦ فِى ٱلنَّاسِ) ڕووناكییەكمان پێدا، كه لەنێو خەڵكدا پێی بڕوا (ئایا كەسێكی ئاوا) (كَمَن مَّثَلُهُۥ فِى ٱلظُّلُمَٰتِ لَيْسَ بِخَارِجٍ مِّنْهَا) وەك كەسێك وایە له تاریكاییاندایە و ناتوانێ لێیان دەرباز بێ.

دیارە قسەم بۆ خەڵكێكی مسوڵمان و كۆمەڵگایەكی مسوڵمان كردوە...

**دانـــا:** تۆ بۆ هەرێمی كوردستان قسەت كردوە!

**مامۆستا:** بەڵێ، هەرچەندە ئەوە ئەگەر بۆ مرۆڤایەتیش بیكەی هەر ڕاستە، مرۆڤایەتییش ئەو كاتانە خۆشی بەخۆیەوە بینیوە، ئەو كاتانە له دادگەرییەوە

نزیك بووه، له برایهتییهوه، له تهباییهوه نزیك بووه، له صیفهته بهرزهكانهوه نزیك بووه، له ڕهحم و بهزهیی و یهكسانیی و ئازادییهوه، كه له پێغهمبهرانهوه (علیهم الصلاة والسلام) نیزیك بووه و له خواوه نزیك بووه.

ههندێك كهس ڕهنگه وا تهصهوور بكا، كه ئێستا ئهو وڵاتانهی ڕۆژئاوا، كۆمهڵێك بههای جوان و كۆمهڵێك پرهنسیپی باش له ژیانیاندا ههن و پابهندیش نین به دینهوه؟ بهڵام ههركهسێك ئاوا تهماشای ڕۆژئاوا بكا، تهماشایهكی زۆر سهركێڵانهی كردوه، ئهوانهی كه له ئهورووپا ورد دهبنهوه، ههروهها له ڕاپهرینی ئهورووپا و ڕۆژئاوا، له دژی كڵێسا، زۆر چاك دهزانێ كه ئهوانه كاتی خۆی له دژی زوڵم و ستهمێك ڕاپهڕیون، كه له كڵێسادا و پادشادا و دهرهبهگ (أقطاعی)دا بهرجهسته بووبوو، لهو سێ كوچكه شوومهدا، پاپا كه له كڵێسادا بوو، پادشا، پاشان دهرهبهگ، خهڵكی ئهورووپا دژ بهو سێ كوچكه شوومه راپهڕین، دژ بهو زوڵم و ستهمه راپهڕین، بهو قۆرخكارییه راپهڕین كه لهواندا بهرجهسته بوو بوو، بهڵام له ڕاستییدا دژی رووحی ئایین نهبوون، چونكه سهرهتای ڕاپهڕینی ڕۆژئاوا و ڕێنیسانس، وهرچهرخان، زیاتر لهسهر دهستی (مارتن لۆسهر) و (كالڤن) بوو، كه ههردووكیان دوو زانای ئایینی مهسیحیی بوون، كه بزووتنهوهی پرۆستانتییان بهرپاكرد له دژی كڵێسا و مهسیحییهتی كاسۆلیكی كه له كڵێساو پاپادا بهرجهستهبوو بوو، یانی: لهبهرگی دینییدا ئهورووپا ڕاپهڕی لهدژی ئهو بێ دینیی و بێویژدانییهی بهناوی دینهوه دهكرا.

ئنجا ئێستاشی لهگهڵدا بێ ههندێك له حیزبهكان لهوێ، حیزبی ئایینین: بۆ نموونه: حیزبی مهسیحیی دیموكراسی، ئهوهی كه ئێستا له ئهڵمانیا حوكمڕانه، ههروهها ئێستاشی لهگهڵدا بێ، زۆر له وڵاتانی ئهورووپا ڕێز و تهقدیرێكی زۆر بۆ ئایینهكهی خۆیان دادهنێن لهگهڵ ئهو ههموو گۆڕان و دهستكارییكردنهش كه بهسهریدا هاتوه! پاشان ئاكار و بههاكانی مهسیحیهت و یههودییهت و ئیسلام، كه دزهی كردووته نێویان، ئهو بهها بهرزانه زۆر له ژیانی سیاسییاندا، له ژیانی فیكرییاندا، له ژیانی كۆمهڵایهتییاندا، ههن، بهڵێ ئهوانه لهبهر زێده ههستیارییان، بهتایبهتی له فهرهنسا، لهبهر زێده ههستیارییان بهرامبهر به كڵێسا،

ڕه‌نگه‌ نه‌یانه‌وێ دان به‌و صیفه‌ته‌ چاكانه‌ و به‌و به‌ها به‌رزانه‌دا بێنن، كه‌ له‌ ئه‌صڵدا له‌ دین وه‌ریانگرتوون، به‌ڵام حه‌قیقه‌ته‌كه‌ی ئه‌وه‌یه‌ كه‌ باسمانكرد.

پاشان بۆ ئێمه‌ وه‌ك میلله‌تێكی مسوڵمان و كۆمه‌ڵگایه‌كی مسوڵمان، كاتێك ده‌گه‌ڕێینه‌وه‌ لای خوا، یانی چی؟ یانی: ده‌گه‌ڕێینه‌وه‌ بۆ ئه‌و به‌رنامه‌یه‌ی كه‌ خوا دایناوه‌ و به‌ پێغه‌مبه‌ری خاته‌مدا ناردوویه‌تی، ئه‌و به‌رنامه‌یه‌، چونكه‌ به‌رنامه‌ی خوایه‌، نه‌ پیاوسالاریی تێدایه‌ نه‌ ژن سالاریی، نه‌ ده‌وڵه‌مه‌ند سالاریی تێدایه‌ نه‌ فه‌قیر سالاریی، نه‌ ڕه‌ش سالاریی و نه‌ سپی سالاریی، نه‌ عه‌ڕه‌ب سالاریی و نه‌ عه‌جه‌م سالاریی، به‌ڵكو خوا سبحانه‌ وتعالی و شه‌رع سالاریی، شه‌ریعه‌تی خوا فه‌رق له‌ به‌ینی فه‌قیر و ده‌وڵه‌مه‌ند ناكات، له‌و ڕووه‌وه‌ كه‌ هه‌ردووكیان مرۆڤن، نه‌ك له‌و ڕووه‌وه‌ كه‌ ئه‌گه‌ر ده‌وڵه‌مه‌نده‌ به‌ قۆرخكاریی ده‌وڵه‌مه‌ند بووه‌، ئه‌وكاته‌ ده‌ستی ده‌گرێ و لێی ده‌ستێنێته‌وه‌ و ده‌یداته‌وه‌ به‌ فه‌قیره‌كه‌، ئه‌وه‌ جیایه‌، چونكه‌ (من أین لك هذا؟) ئه‌مه‌ت له‌كوێ بوو؟ ئیسلام دایهێناوه‌. به‌ڵام ئه‌گه‌ر دوو كه‌س هه‌لی یه‌كسانیان له‌به‌رده‌مدا هه‌بێ، بۆ كه‌سابه‌ت، بۆ ژیان، ئنجا یه‌كێكیان ته‌مبه‌ڵ بێ و یه‌كێكیان گورج و گۆڵ بێ، گورج و گۆڵه‌كه‌ ده‌وڵه‌مه‌ند بێ و ته‌مبه‌ڵه‌كه‌ش هه‌ژار بكه‌وێ، ئیسلام ناڵێ: ده‌وڵه‌مه‌ند! ئه‌وه‌ بۆچی ده‌وڵه‌مه‌ندی؟؟ چونكه‌ ده‌ڵێ: خۆم زیاتر ماندووكردوه‌ و خواش فه‌رموویه‌تی:

﴿ وَأَن لَّيْسَ لِلْإِنسَانِ إِلَّا مَا سَعَىٰ ﴿٣٩﴾ ﴾ [النجم : ٣٩]

واته‌: مرۆڤ به‌بێ هه‌وڵ و كۆشش هیچ ده‌ستكه‌وتی نابێ. یان دوو كه‌س هه‌لی یه‌كسانیان له‌به‌رده‌ستدا هه‌یه‌ بۆ ئه‌وه‌ی بخوێنن، یه‌كێكیان ده‌خوێنێ و بڕوانامه‌ به‌ده‌ست دێنێ، ئه‌ویدیكه‌ش ناخوێنێ، بێگومان لێره‌دا ئیسلام له‌به‌رئه‌وه‌ هه‌ردووكیان مرۆڤن، ده‌بێ هه‌ردوك یه‌ك مامه‌ڵه‌یان له‌گه‌ڵدا بكرێ! مه‌به‌ستم ئه‌وه‌یه‌ دینی خوا لایه‌نگریی نیه‌ به‌ لای كه‌سدا و فه‌رمانی كردوه‌ به‌دادگوریی له‌نێوان مرۆڤه‌كان دا به‌بێ جیاوازیی، ئنجا كاتێك ده‌گه‌ڕێینه‌وه‌ بۆ ئه‌و شه‌ریعه‌ته‌، ئه‌وه‌ی ئێستا كه‌ ئێمه‌ به‌ده‌ستییه‌وه‌ ده‌ناڵێنین، چییه‌؟

١- بێ عەدالەتییە.

٢- گەندەڵییە، (گەندەڵیی جاری دیكەش گوتوومانە ناوێكی بەئەدەبە لە دزییان ناوە و، لە بەدەستبەسەرداگرتنی واریداتی وڵاتیان ناوە).

٣- هەروەها قۆرخكارییە.

٤- فەرق و جیاییە.

٥- ئینتیمای حیزبیی و ئینتیمای عەشیرەتیی و بنەماڵەیی كردنە سەنگی مەحەكە، لە جیاتی ئەوەی مرۆڤبوون و هاووڵاتیبوون سەنگی مەحەك بێ.



٦- بێ دامەزراوەییە.

٧- پێشێلكردنی یاسایە.

ئەوانە ئێمە بەدەستیانەوە گرفتارین، ئنجا كاتێك دەگەڕێینەوە بۆ شەریعەتی خوا، شەریعەتی خوا لەگەڵ سیستم دایە و دژی پاشاگەردانییە، لەگەڵ یەكسانییدایە و دژی فەرق و جیاییە، لەگەڵ عەدالەتدایە و دژی زوڵمە، لەگەڵ ئەوەدایە مرۆڤ وەك مرۆڤ مامەڵەی لەگەڵدا بكرێ، وەك هاووڵاتیی، ئەگەر مسوڵمانە، ئەگەر كافرە، وەك هاووڵاتیی مامەڵەی لەگەڵدا بكرێ، نەك وەك ئینتیما بۆ فڵان حیزب و بۆ فڵان كەس، وەك مرۆڤ مامەڵەی لەگەڵدا بكرێ، نەك لەبەر ئەوەی پارەی هەیە، زیاتر ڕێزی لێ بگرێ، وە لە سیستمی كاپیتالیزمی دا هەیە، یان لەبەرئەوەی فەقیرە، زیاتر ڕێزی لێ بگرێ، وەك لە بلۆكی سۆشیالیزم دا كاتی خۆی هەبوو: چینی پرۆلیتار فریشتەیە، بورژوا شەیتانە، هەرچی بێت، نا، ئیسلام دەڵێ: نەكەس لەبەرئەوە خراپ دەبێ كە دەوڵەمەندە، نە لەبەرئەوە كە هەژارە، هەروەها عەكسەكەشی هەر ڕاستە: هیچ كەس لەبەرئەوە چاك نیە كە هەژارە، لەبەرئەوەش خراپ نیە كە دەوڵەمەندە، مادام دەوڵەمەندییەكەی بە ڕەنجی شانی خۆی پەیدای كردبێ، جا گەڕانەوەمان بۆ لای خوا، ئەوە چەمك و واتایەكەیەتی.

هەڵبەتە گەڕانەوە بۆ لای خوا، دیسان ئەو چەمکەشی هەر هەیە کە ئینسان کاتێك کە پەیوەندیی باشی لەگەڵ خوادا دەبێ، کاتێ بە ڕاستی خوای خۆش دەوێ، سام و هەیبەتی خوای لەدڵدا دەبێ و، کاتێك کە مل بۆ خوا کەچ دەکات و، کاتێك کە شەرم لە خوا دەکات، ئەو ڕێز و سام و شەرم و هەیبەتەی بەرامبەر بە خوا، وایلێدەکات، کە حەقی ئەوانیدیکە پێشێل نەکات، بەتایبەتی بۆ دەسەڵاتداران، ئەوە هەر زۆر زۆر پێویستە، کوردەواریی خۆمان دەڵێن: لەو کەسە بترسە کە لە خوا ناترسێ.

من جارێك گوێم لێ بوو، ئافرەتێك باسی مافی ئافرەتی دەکرد و باسی ژنسالاریی و پیاوسالاریی، پێشکەشکارەکە گوتی: باشە تۆ پێت وایە بەچی چارەسەر دەبێ؟ گوتی: بەوە چارەسەر دەبێ دین و دەوڵەت لێك جیابکرێتەوە! منیش لەبەرخۆمەوە گوتم: بەدبەخت! ئەو دەوڵەتە دینی تێدا نەماوە بۆیە ئێوە وا بەدبەختن، کەسانێك لێتان بووەنە ڕاوچی خراپ و لە ئاوی لێڵدا ڕاوتان دەکەن و دوایی پوولێکتان پێوە دەنێن! ئەگەر لە خوا بترسێن، ئاوا مامەڵەتان لەگەڵدا دەکەن کە تەنیا وەك ئامرازی ڕابواردن تەماشاتان بکەن، یان وەك مرۆڤ مامەڵەتان لەگەڵدا دەکەن، ئایا کەسێ لە خوا بترسێ، چاوی لە نامووسی خەڵك دەبێ؟! چاوی لە ماڵی خەڵك دەبێ؟! چاوی لە خوێنی خەڵك دەبێ؟! ئایا کێشەکە بەوە چارەسەر دەبێ دین و دەوڵەت لێك جیابێتەوە؟! دین و دەوڵەت لێك جیابوونەوە بۆیە ئەم وڵاتە بەو شێوەیەی لێکراوە، ئەگەر ئەم دەوڵەتە ئەم قەوارە سیاسییە، هەوێنی دینی تێدا هەبێ، بەها بەرزەکانی دینی تێدا بن، ڕەحم و بەزەیی تێدا دەبێت، دادگەریی تێدا دەبێت، ئەو کاتە هیچ کەس ئەوەی لە مێشکدا نابێ بڵێ: ئاسمان کونی تێبووە و عەشیرەتەکەی من، حیزبەکەی من، بنەماڵەکەی منی پێدا هاتووەتە خوار! بۆیەش ئەو خەڵکە هەمووی بۆ خزمەتی من خوڵقاوە!! هیچ کەس ئەو بیرەی نابێت، ئەگەر ئێمە بگەڕێینەوە بۆ لای خوا، ئەگەر ئێمە بەندەی خوا بین، پێکەوە برا دەبین، پێکەوە تەبا دەبین، کەس خۆی لەویدیکە بە زیاد نازانێ!!

**دانـــا: بە عەمەلیی لە ژیانی ڕۆژانەی دەسەڵاتداران و حوكمڕانان و بڕیاربەدەستان كە جەنابت ناوت ناون، ئەم فەڕاغەمان هەیە بە دوو شێواز، هەم لەسەر ئاستی خۆیان نەگەڕاونەتەوە بۆ لای خوا، هەم بە شەرعی خوا حوكم ناكرێ، بۆیە هەرێم وای لێهاتووە؟**

**مامۆستا:** بەڵێ، من هیچ گومانم لەوەدا نیە ئەگەر ئێمە وەك میللەتێكی مسوڵمان، بەتایبەت بڕیاربەدەستانمان (من ئەو وشەیە زیاتر بەكاردێنم، دەزانی بۆچی؟ چونكە هەندێك كەس حوكمڕانە، بەڵام هیچ بڕیاری بەدەست نیە، خۆی نابێ وابێ، لە شوێنان مودیر ناحیە لە سنووری خۆی دا، دەسەڵاتی خۆی هەیە، پارێزگار دەسەڵاتی خۆی هەیە، وەزیر دەسەڵاتی هەیە، بەڵام من لێرە دەبینم وەزیری فەقیر گوێی بەدەستی ناوچە و كۆمیتەوەیە، گوێی بە دەستی لقەوەیە، گوێی بەدەستی مەڵبەندەوەیە، هیچ كارە نیە، من مەعلووماتم هەیە مەسئوول كۆمیتەیەك، مەسئوول لقێك، مەسئول ناوچەیەك لە وەزیرێك توورە دەبێت، نابێ وا بكەی، دەبێ وا بكەی، ئەوە فلانكەسمان نارد، بگرە هی وا هەیە هەر هیچ نیە، هیچ سیمەتێكی حیزبیی و حكززمیی نیە بەڵام لەبەرئەوەی كوڕی فلانە كەسە، ناردوویەتی: ئەو كارەكەمان بۆ بكە! ئەویش دەڵێ: بەڵێ قوربان لە خزمەتداین! ئنجا بۆیە من وشەی بڕیاربەدەست بەكاردێنم، كێ بڕیاری بەدەستە، كێ ئیمكانیەتی بەدەستە، كێ ئەمرونەهی خەڵكی بەدەستە) ئا ئەوانە ئەگەر بۆ خوا سوڵحاوبن، بێگومان لەگەڵ خەڵك دا گونجاو دەبن و، ئەو ئیمكانیەتەی لەم وڵاتەدا هەیە، بە موڵكی شەخسی خۆیان و، بە هی بنەماڵەكەیان و، بە هی حیزبەكەیانی نازانن، بەڵكو بە هی خەڵكی دەزانن، كەسێك بە حوكمی بەرپرسیارێتییەكەشی هەرچەند پارەی لەبەردەستدا بێ، عەرزی لەبەردەستدا بێ، ئیمكانیەتی لەبەردەستدا بێ، خۆی بە خاوەنی نازانێ، بەڵكو دەڵێ: ئەوە ئەمانەتێكە لە دەستی مندا و سپاردەش دەبێ بپارێزرێ و بەخەڵكی شایستەی خۆی بسپێررێ، وەك خوای دادگەر فەرموویەتی:

﴿ إِنَّ ٱللَّهَ يَأْمُرُكُمْ أَن تُؤَدُّوا۟ ٱلْأَمَـٰنَـٰتِ إِلَىٰٓ أَهْلِهَا ﴾ (النساء: ٥٨)

هەڵبەتە لە خواترسان و حیساب بۆ خواكردن و حیساب بۆ قیامەتكردن، بۆ هەموو كەس هەر جوانە، بەڵام بەتایبەتی بۆ بەرپرسان، چونكە ئەگەر كەسێكی ئاسایی، جووتیارێك، كرێكارێك، كارمەندێك، ترسی خوای لەدڵدا هەبێ، ترسی قیامەتی لەدڵدا بێ، فەرق بە حەڵاڵ و حەرام بكات، بۆ خۆی باشە، بۆ چوارچێوەیەكی تەسكی خۆی باشە، بۆ ماڵ و خێزانی، یان ئەوانەی لەو فەرمانگەیە لەگەڵیدان، بەڵام بەرپرسێك، وەزیرێك، مەسئوولێكی حزبیی، مەسئوولێكی ئیداریی ئەم وڵاتە، ئەگەر لە خوا بترسێ، خۆشەویستی خوا و شەرم و سام و هەیبەتی خوای لەدڵدا هەبێ، بۆ خۆی و بۆ وڵاتەكەی باشە، بۆ هەموولایەك باشە.

**دانـــا: ماموستا! ئایا دەگونجێ هەركەس پێشتر بە هۆی لادان و تاوانەوە خراپ بووبێ و، دۆخی هەرێمەكەمانی بە ئێستا گەیاندبێ، بە گەڕانەوە بۆ لای خوای گەورە، چاك ببێتەوە و قەرەبوو بكرێتەوە؟**

**مامۆستا:** خوای پەروەردگار هەمیشە دەرگای قبووڵكردنەوەی بەندەكانی، گەڕانەوەی بەندەكانی، بە كراوەیی بەجێهێشتوە، پێغەمبەری خوا (علیه الصلاة والسلام) لە فەرموودەیەكدا دەفەرموێ: (التوبة تجبُّ ما قبلها) رواه مسلم، واتە: گەڕانەوە بۆ لای خوا، پێش خۆی دەسڕێتەوە.

بەڵێ هەمیشە مرۆڤ دەتوانێ بگەڕێتەوە بۆ لای خوا و هیچ كاتێك ڕێی لێنەبەستراوە، تاكو ژیانی لەبەردا مابێ، لە حەدیسێكدا هاتوە دەفەرموێ: (إن الله تعالى يقبل توبة العبد ما لم يُغَرْغِرْ) واتە: بەدڵنیاییی خوای بەرز گەڕانەوەی بەندەی وەردەگرێ، مادام رووحی نەگەیشتبێتە گەرووی.

واتە: مادام نائومێد نەبووبێ لە ژیان، دیارە ئەم حەقیقەتەش وادەكات كە مرۆڤ هەمیشە بیر بكاتەوە لەوەی بگەڕێتەوە بۆ لای خوا و، هیچ بەربەستێك لەبەردەم خۆیدا نەبینێ، بەڵام لەگەڵ ئەو حەقیقەتەدا ئەوەش هەیە كە مەرج نیە مرۆڤ هەمیشە بتوانێ بگەڕێتەوە، جاری وایە كەسێك لادەدات ئەوەندە دەڕوا بەرەو خراپە، دوایی ڕێی گەڕانەوەی نیە، من زۆر جار ئەو

حاڵەتەم تەشبیهكردوە، بەوەوە كە كەسێك لە قەراغی سەرەوژێرێك كەندەڵانێك، ڕادەوەستێ هەتا دەخلیسكێ، بەدەستی خۆیەتی، بەڵام كە خلیسكا، تازە دەڕوات و ئیستیمراریەت وەردەگرێت، خوا دەزانێ دەچێتە كوێ! ئەو كاتە لێژیی سەرەوژێرەكە دەزانێ دەیگەیەنێتە كوێ، نەك خۆی! خۆی بۆ ناگیرسێتەوە بەڵێ بە تەئكید مرۆڤ هەمیشە دەتوانێ بگەڕێتەوە بۆ لای خوا، بەنسبەت نێوان خۆی و خواوە، بەڵام بە نسبەت خۆیەوە و، لە خودی خۆیدا، خوای كارزان بۆ هەندێك كەس وا پێشان دەدا كە ناتوانن بگەڕێنەوە، لەبەرئەوەی هێندە لەسەر خراپە بەردەوام بوون و ئەوەندە بە خراپەدا ڕۆچوون، كە ڕێی گەڕانەوەیان لە خۆیان گرتوە، ئەگەرنا خوای پەروەردگار ڕێ لە كەس ناگرێ.

**دانا: مەبەستم ئەوەبوو بۆ نموونە: ئەگەر بڕیاربەدەستانی ئێمە چ وەك تاك بۆ لای خوا بگەڕێنەوە، چ وەك تەبیقی شەریعەت بەوجۆرەی كە هەیە، نەك بەهۆی دیموكڕاتی و بەهۆی كۆمەڵێك بابەتەوە بەشێكی لێ حەزف بكەن و هەندێكی لێ هەموار بكەن ئەگەر بگەڕێنەوە بۆ لای خوا بەم جۆرە، ژیانی خەڵك لە رووی دادگەریی و لە ڕووی بژێوییەوە چاك دەبێت؟**

**مامۆستا:** خوای پەروەردگار لە زۆر شوێن لە قورئاندا ئەو ڕاستییەی خستووەتە ڕوو كە ئەگەر خەڵك بۆلای خوا بگەڕێنەوە، حاڵ و باڵیان چاك دەبێ، (دیارە خوا گشتی فەرموویەتی (خەڵك) بەڵام بە تەئكید مەبەستی پێی ئەوانەیە كە ئەمر و نەهی خەڵكیان بەدەستە، ئەگەرنا كەسێك لە زاتی خۆیدا دەگەڕێتەوە، بۆ خۆی باشە، بەڵام وڵاتی پێ چاك دەبێت؟ بە تەئكید نەخێر، یانی ئێمە سەدان عابید دەبینین لە مزگەوتەكاندا، سەدان كەس كە خۆیان یەكلاكردۆتەوە بۆ خواپەرستیی، بۆ دینداریی و عیبادەتی شەخسیی، بەڵام وڵاتیش پڕە لە ناشەرعیی و زوڵم و خراپە، كەواتە: گەڕانەوەی تاكەكان بۆ خۆیان باشە، بەڵام واقیعی پێ ناگۆڕدرێ، بەڵام گەڕانەوەی حوكمڕان و گەڕانەوەی بڕیاربەدەستان، بۆ خۆشیان باشە و بۆ وڵاتەكەش بۆ هەمووی باشە) خوای زانا و توانا لە قورئاندا لە زۆر شوێندا ئاماژەی پێ دەكات، بۆ وێنە لە سوورەتی (الأعراف)دا دەفەرموێ:

﴿ وَلَوْ أَنَّ أَهْلَ ٱلْقُرَىٰٓ ءَامَنُوا۟ وَٱتَّقَوْا۟ لَفَتَحْنَا عَلَيْهِم بَرَكَٰتٍ مِّنَ ٱلسَّمَآءِ وَٱلْأَرْضِ وَلَٰكِن كَذَّبُوا۟ فَأَخَذْنَٰهُم بِمَا كَانُوا۟ يَكْسِبُونَ ﴿٩٦﴾ ﴾ [الأعراف: ٩٦]

واته: ئەگەر خەڵكی ئاوەدانییەكان ئیمانیان هێنابایە و پارێزیان كردبایە، دەروازەكانی ئاسمان و زەویمان لێ دەكردنەوە (خێرو بێری سەرێ و خوارێمان بەسەردا دەڕشتن) بەڵام ئايينی خۆیان بە درۆ دانا، بۆیە بەوەی كە دەیانكرد، گرتمانن (سزامان دان).

ئەوەش ڕاستییەكی گرنگە بزانرێ كە هەندێك لە (واعظ) و ئامۆژگارییكەرەكان، هەندێك لە خەتیب و مامۆستایەكان، وا پێشان دەدەن، كە ڕوو لە دەستەڵاتدار و حوكمڕان و بڕیاربەدەستان ناكەن، هەر ڕوو لە خەڵكی هەژار و نەدار و، ئەو خەڵكەی مزگەوت دەكەن، خەڵكینە! بەهۆی ئەوە كە ئێوە بێ دینن، ئێوە چاك نین، بۆیە حوكمڕانی خراپ بەسەرتانەوەن، ئێوە بگەڕێنەوە بۆ لای خوا، بگەڕێنەوە بۆ لای دینداریی، واقیعەكە دەگۆڕێ! هەندێك لەوانەی كە سەلەفیی ناون و هەندێك لە عالمەكانیش كە هی سعوودیە و هەندێك شوێنی دیكەن، ئەو جۆرە قسانەیان كردوە، كە: خەڵك دەبێ چاك بن جا ئەوجاو حوكمڕانەكان چاك دەبن!

**دانـــا: مامۆستا! تا ئێستا هەر وا دراوە بە گوێی خەڵكدا؟**

**مامۆستا:** بەخوا ئەوە زۆر زۆر پێچەوانەی قورئانە، چونكە خەڵك بەڵێ دەبێ چاك بن، بەڵام بە چاكبوونی تاكەكان، وەزعەكە چاك نابێ، لەكاتێكدا كە فیرعەونێك حوكم دەكات بەسەر میللەتێكدا، دەیچەوسێنێتەوە، بێگاری پێ دەكات، ئەو خەڵكە با لە ماڵی خۆی دا هەر نوێژی چاك بكات، كە فیرعەون حوكمی كرد، هەموویان دەچەوسێنێتەوە! ئەوە لە حەقیقەتدا جۆرێكە لە خۆڵ كردنە چاوی خەڵك، ئەگەرنا خوای كاربەجێ باسی ئەوەی كردوە كە بە هۆی كەمینەیەكی حوكمڕانی خراپەكارەوە كە زوڵم دەكەن، خوا بەڵا بۆ خەڵك دەنێرێ بە گشتی، بەڵام باسی ئەوەی نەفەرمووە، كە بە هۆی گەڕانەوە و دینداریی چەند تاكێكەوە، خوا وەزعیان بۆ چاك بكات! بۆ وێنە: لە سووڕەتی (الأنفال)دا دەفەرموێ:

﴿ وَٱتَّقُواْ فِتۡنَةٗ لَّا تُصِيبَنَّ ٱلَّذِينَ ظَلَمُواْ مِنكُمۡ خَآصَّةٗۖ وَٱعۡلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ شَدِيدُ ٱلۡعِقَابِ ﴾ [الأنفال : ٢٥]

دەفەرموێ: خۆتان لە بەڵایەك بپارێزن کە تەنیا تووشی ستەمکارەکانتان نابێ، بشزانن کە خوا سزای توندە. (کەواتە: ستەمکارەکان دەبنە هۆی ئەوەی بەڵا بێنن و کە بەڵایەکەش هات، تووشی هەموان دێت) کەواتە: بەهۆی کەمینەیەکی ستەمکارەوە، کە خەڵك لەبەرامبەریاندا بێدەنگ و بێ هەڵوێستن، خوا بەڵا دەنێرێ و هەموویان دەگرێتەوە، بەڵام خوا نەیفەرمووە ئەگەر کەسانێك، چەند تاکێك، دینداریی و خواپەرستیی بکەن، خوا دەرووی خێریان لێ دەکاتەوە، نا، لەبەرئەوە دەبێ وریا بین، بەڵێ خەڵك دەبێ چاك بێ، ئنجا یەکێك لە چاکیی خەڵك ئەوەیە کە نەهێڵن زوڵمیان لێ بکرێ، یەکێك لە چاکیی خەڵك ئەوەیە کە نەهێڵن خراپەیان لەگەڵدا بکرێ، پێشتریش باسمان کرد کە ڕۆژێك ئەبوبەکری (صدیق) ڕەزای خوای لێ بێت لەسەر مینبەری پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) وتاری دا، ئەم ئایەتەی خوێندەوە:

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ عَلَيۡكُمۡ أَنفُسَكُمۡۖ لَا يَضُرُّكُم مَّن ضَلَّ إِذَا ٱهۡتَدَيۡتُمۡۚ إِلَى ٱللَّهِ مَرۡجِعُكُمۡ جَمِيعٗا فَيُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمۡ تَعۡمَلُونَ ﴾ [المائدة: ١٠٥]

واتە: ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! وریای خۆتان بن، ئەگەر ئێوە ڕێی ڕاست بگرن، ئەوانەی گومڕان زیانتان لێ نادەن.

دوایی گوتی: ئەی خەڵکینە! ئێوە ئەم ئایەتە دەخوێننەوە، بەڵام بە هەڵە لێی تێدەگەن، من گوێم لە پێغەمبەری خوا (علیه الصلاة والسلام) بووە دەیفەرموو: سوێند بەوەی نەفسی منی بەدەستە، دەبێ دەستیان بگرن و، نەیهێڵن زوڵم و خراپە بکەن، ئەگەرنا نزیکە خوا سزایەکتان بۆ بنێرێ دوایی هەرچەندە لێی بپاڕێنەوە، وەڵامتان نەداتەوە.

ئایەتەکەش کە دەفەرموێ وریای خۆتان بن، بەشێك لە وریای خۆ بوون و ڕێگای ڕاستگرتن ئەوەیە کە تۆ نەهێڵی زوڵمت لێ بکرێ و، نەهێڵی هیچ

كەس خێرەبێری ئەم وڵاتە بخاتە ژێر دەستی خۆی و، حیزب و خزمی لێ پڕ بكات و، خەڵكی دیكەش قڕ بێ، بەشێك لە ڕێی ڕاست گرتن، بەشێك لە تەقوا و بۆ خوا سوڵحان، ئا ئەوەیە كە تۆ بێدەنگ و بێ هەڵوێست نەبی لە بەرامبەر خراپەكاریی و قۆرخكاریی و گەندەڵیی و زوڵمدا!!

**دانـــا: كەواتە ئامۆژگاریی مامۆستا عەلی باپیر بۆ واعیز و بانگخواز و بەشێك لە مامۆستایانی ئایینی، كە زۆر جوان ئاماژەت پێكرد، هەمیشە لە وتارەكانی هەینیدا بەس قسەكەیان ڕووی لەو خەڵكەیە كە دانیشتوە و وەك جەنابت ئەفەرمووی: هیچ كارەن و هیچیان لەم وڵاتە بەدەست نیە، ئەوان لەمەولا ئەبێ چۆن ئامۆژگاریی بكەن؟**

**مامۆستا:** ئەوان دەبێ نوختە بخەنە سەر پیت، هەر كەسە وەك خۆی، بدوێنن، پێغەمبەری خوا (علیه الصلاة والسلام) دەفەرموێ: (إنَّ من أعظم الجهاد، كلمة عدل عند سلطان جائر) رواه الترمذي: واتە گەورەترین جیهاد، قسەیەكی دادگەرانەیە لەلای حوكمڕانێكی ستەمكار، هەروەها دەفەرموێ: (سید الشهداء حمزة، ورجل قام الى إمام جائر فأمره ونهاه فقتله)رواه أبوداود: گەورەی شەهیدان حەمزەیە و، پیاوێكە، دەچێتە ڕیزی حەمزە، كە ڕاست دەبێتەوە لە حوكمڕانێكی ستەمكار فەرمانی پێدەكات و ڕێگریی لێ دەكات و ئەویش دەیكوژێ، ئەوە گەورەی شەهیدانە.

دەبێ خەڵك لە قەدەر خۆی ئامۆژگاریی بكرێ، چاكیی خەڵك، لە بازنەیەكی دیارییكراودا بەرهەمی هەیە، چاكیی حوكمڕانیش لە بازنەیەكی زۆر فراوان دا، هەروەها، خراپەی خەڵك: كەسێك لە ماڵی خۆیدا شەڕاب دەخواتەوە، دزیی دەكات، زینا دەكات، خراپە دەكات، بەزۆریی خۆی باجەكەی دەدات، بەڵام حوكمڕانێك زوڵم دەكات، خراپە دەكات، یاخود ئەگەر شەڕاب بخواتەوە، ئەگەر قومار بكات، ئەگەر ناشەرعیی ڕەواج پێبدات لە وڵاتدا، زیانی گشتی دەبێ، چونكە وەك گوتراوە: (الناس على دين ملوكهم) ئێستا بۆچی لەم وڵاتەی ئێمەدا گوناحكردن وا ئاسان بووە، خواردنەوەی مادده سەرخۆشكەرەكان،

وەك خواردنەوەی کۆلا و بیبسی لێهاتوە، گوناحکردن، دزییکردن، خراپەکردن، بۆچی؟ چونکە خەڵك دەبینن کە لە لای دەسەڵاتدارانەوە ئەو شتانە ڕەواجیان پێ دەدرێ، یان بە لای کەمەوە ڕێیان لێ ناگیرێ.

**دانـــا: مامۆستا! ئەوەی جەنابت ئەیڵێی، بەشێك لە مامۆستایانی ئایینی، بەتایبەت ئەوانەی سەلەفیی مەشرەبن، باس لەوە ئەکەن بەم شێوازە ئاشتی کۆمەڵایەتیی تێك ئەچێت و ئەمە شوێنی خۆی ناگرێت، و لەگەڵ سوننەتی نەبەویی یەکناگرێتەوە؟**

**مامۆستا:** ئاشتی کۆمەڵایەتیی بەوە تێکدەچێ، زوڵم هەبێ و لێی بێدەنگ بی و سەرەنجام بتەقێتەوە، ئەوە ئاشتی کۆمەڵایەتی تێکدەدات، ئاشتی کۆمەڵایەتی بەوە تێکناچێ خەڵك بوێربێ، ئازابێ، ئایا ئاشتیی کۆمەڵایەتیی بە تەتبیقی حەدیسەکانی پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) تێکدەچێ؟ ئەگەر تێکبچێ دیارە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) وایفەرمووە،یانی: ئەو فەرموویەتی تێکیبدەن، کە دەفەرموێ : دەبێ دەستی زاڵم بگری و نەیهێڵی زوڵم بکات، ئەگەرنا خوا بەڵایەکتان بۆ دەنێرێ هەرچەندە چاکەکان بپاڕێنەوە وەڵامیان ناداتەوە.

بەڵێ ئاشتی کۆمەڵایەتیی بەوە تێکناچێ کە فەرمان بە چاکە و نەهی لە خراپە بکرێ، هەڵبەتە فەرمان بە چاکەش، دەبێ بە شێوەیەکی چاك بکرێ و نەهی لە خراپەش بەشێوەیەکی خراپ نەکرێ، من پێموایە هەندێك لە حوکمڕانان و دەسەڵاتداران، ئەگەر کەسانێك هەبن حەقبێژ و سەرڕاست، هەقیان پێ بڵێن، بەڵام نەك بەشێوەی ناشیرینکردن، هەرکەسە بەشێوەی خۆی و لە مەقامی خۆیدا پێی بگوترێ، وازدێنێ لەو خراپییە، ئەدی لە ئەورووپا، خۆ ئەوەنەبێ حوکمڕانە ئەورووپییەکان لە دینداریی و لە خواناسییدا توابنەوە، ئەدی بۆچی خراپە و ستەم ناکەن، یان دەستی لێ هەڵدەگرن؟ چونکە خەڵك زیندووە، خەڵك هەستیارەو بە هەڵوێستە و ڕێگانادات، ئەوە بووەتە کلتوورێك، خەڵك ڕێگانادا حوکمڕان گەندەڵیی بکا و زوڵم خراپە بکا، خەڵك لێی وەدەنگ دێ، کەواتە: ئاشتی کۆمەڵایەتیی بەوە تێکدەچێ خەڵك بخەسێنرێ و بەناوی دینەوە بەنج

بكرێ و غیره‌ت و ئازایه‌تییان تێدا نه‌هێڵرێ، هه‌تا دنیا پڕ ده‌بێ له‌ زوڵم و سته‌م و سه‌ره‌نجام بته‌قێته‌وه‌، ئا به‌وه‌ ئاشتی كۆمه‌ڵایه‌تیی تێكده‌چێ، ئه‌گه‌رنا هه‌ركه‌سێ خراپه‌ی كرد، له‌ به‌رامبه‌ری دا بوه‌ستین و یه‌خه‌ی بگرین و ده‌ستی بگرین، ناڵێم سه‌نگه‌ری لێ بگرین، به‌ڵكو یه‌خه‌ی بگرین و ده‌ستی بگرین و بڵێین: زوڵم مه‌كه‌، ئێمه‌ له‌گه‌ڵت دا نین، ئنجا ئه‌وه‌ به‌ خۆپیشاندان بێته‌ دی، به‌ مانگرتن بێته‌دی، به‌ڵام خۆپێشاندانی شه‌رعییانه‌ و شارستانییانه‌، گرنگ ئه‌وه‌یه‌ حوكمڕان حاڵی بكرێ، كه‌ ئێمه‌ له‌سته‌مكاریی دا له‌گه‌ڵت هاوكار نابین، ده‌ستبارگر نابین، خۆ هه‌ڵوێست وه‌گرتن ته‌نیا ئه‌وه‌ نیه‌، تۆ سه‌نگه‌ر له‌ كابرا بگری!.

**دانـــا: مامۆستا! له‌ ئه‌نجامی فه‌رمانبه‌ریی كردن دا بۆ خوای گه‌وره‌ و پابه‌ندیی به‌ شه‌ریعه‌ته‌كه‌یه‌وه‌، له‌لایه‌ن ده‌سه‌ڵاتدارانه‌وه‌، بڕیاربه‌ده‌ستانه‌وه‌، كۆمه‌ڵگا له‌ چی دوورئه‌كه‌وێته‌وه‌ و له‌ چی سوودمه‌ند ئه‌بێت؟**

**مامۆستا:**

١- بێگومان كاتێك كه‌ له‌ وڵاتێكدا ئه‌وانه‌ی بڕیاربه‌ده‌ستن، حوكمڕانن، پابه‌نده‌بن به‌ شه‌ریعه‌ته‌وه‌، پێش هه‌موو شتێك دادگه‌ریی ده‌چه‌سپێ، خوا سبحانه‌وتعالى له‌ ئایه‌تی ژماره‌ (٢٣)ی (الحدید)دا ده‌فه‌رموێ: هه‌موو پێغه‌مبه‌رانم بۆیه‌ ناردوون خه‌ڵك به‌ دادگه‌ریی به‌ڕێوه‌ بچن:

﴿ لَقَدْ أَرْسَلْنَا رُسُلَنَا بِٱلْبَيِّنَٰتِ وَأَنزَلْنَا مَعَهُمُ ٱلْكِتَٰبَ وَٱلْمِيزَانَ لِيَقُومَ ٱلنَّاسُ بِٱلْقِسْطِ ﴾ الحدید: ٢٥

كاتێك كه‌ حوكمڕانان، بڕیاربه‌ده‌ستان پابه‌ند ده‌بن به‌ شه‌ریعه‌ته‌وه‌، دادگه‌ری ده‌چه‌سپێ، كه‌ دادگه‌ریی چه‌سپا، زوڵم و قۆرخكاریی نامێنێ.

٢- به‌هۆی پابه‌ندیی به‌ شه‌ریعه‌ته‌وه‌، ڕه‌وشته‌ جوان و به‌رزه‌كان، حوكمڕانان به‌تایبه‌تی و خه‌ڵك به‌گشتی خۆیانیان پێ ده‌ڕازێننه‌وه‌ و خۆیاندووره‌گرن له‌ صیفه‌ته‌ په‌ست و نزمه‌كان.

٣- پاشان لە ئەنجامی پیادەکردنی شەریعەتدا کە دادگەریی دەچەسپێ، هێمنیی و تەبایی پەیدا دەبێ، ڕێز و خۆشەویستی خەڵك و جەماوەر بۆ حوکمڕانان پەیدا دەبێ، تەماشا بکە! ئێستا نەك هەر حوکمڕان واتە: ئەوەی لە چوارچێوەی حکوومەتن و شتی تەنفیزییان بەدەستە، خەڵك زۆرجار ڕقی لە پەرلەمانتارانیش هەڵدەستێ، کە لە ڕاستییدا یەکێك لە ئەرکە سەرەکییەکانی پەرلەمان بریتییە لە چاودێریی دەسەڵات و حکومەت، کەچی خەڵك ڕقی لە پەرلەمانیش هەڵدەستێ، بۆچی؟ لەبەرئەوەی دەسەڵات وا وێناکراوە کە ڕەمزی زوڵم و قۆرخکارییە، ئنجا کاتێك خەڵك وا تەماشای دەسەڵات دەکات، خەڵك وا تەماشای حوکمڕانان دەکات، کە دەڵێی دوژمنی بابە کوشتەیەتی و ڕقی لێی هەڵدەستێ، دیارە دەسەڵاتداران و، حوکمڕانانیش هەر بەو چاوە تەماشای خەڵك و جەماوەر دەکەن، مانای وایە لە نێوان حوکمڕانان و خەڵك و جەماوەردا شیوو و دۆڵێکی قووڵ پەیدا بووە، بەڵام کۆمەڵگا ساغ و تەندروستەکان ئەوانەن کە حوکمڕانان تێیدا بەشێکن لە خەڵك و لەنێو خەڵکدان و لە خەڵکن، خەڵکیش دیسان بەشێکە لە دەسەڵات، خەڵکیش قسەی دەڕوا، خەڵکیش گوێی لێدەگیرێ، خەڵکیش کاتێك کە تووڕە دەبێ و خۆپێشاندان دەکات، کاریگەریی چاکی لەسەر دەستەڵات دەبێ، لە وڵاتان کە خۆپێشاندان دەکرێ، دەبێتە هۆی ئەوەی حکوومەتێك بگۆڕێ، مان دەگیرێ، دەبێتە هۆی ئەوەی کە وەزیرێك لابچێ، شتێك دەکرێ دەبێتە هۆی ئەوە کە مووچە زیاد بکرێ و گۆڕانکاریی دەبێ لە وڵاتدا، کەواتە: خەڵکیش دەسەڵاتی بەدەستە، یانی: حاڵەتی تەندروست ئەوەیە خەڵك خاوەنی دەسەڵات بێ، ئایا خەڵك لەڕێی چیدا دەسەڵاتەکەی خۆی، فشارەکەی خۆی بەکاردێنێ، خۆپێشاندان دەکات، ماندەگرێ، ڕێپێوان دەکات، دەنووسێ، ڕەخنە دەگرێ، چاوپێکەوتن دەکات، گردبوونەوە دەکات، کۆدەبێتەوە، کۆڕ دەبەستێ، لە میانەی ئەوەدا خەڵك هەڵوێستەکانی خۆی بەرجەستە دەکات، بەمەستی چاککردنی بارودۆخ بەگشتی یان شتێکی تایبەت، دەسەڵاتدارانیش گوێی بۆ دەگرن، دەڵێن ئایا خۆپیشاندان کراوە؟ بەڵێ، مانگیراوە؟ ڕێپێوان کراوە؟ کۆبوونەوەیەك

كراوە؟ بابزانین داخۆا چی گوتراوە، وتارێك نووسراوە، بابزانین چییان گوتوە و ئەو خەڵكە چیمان پێ دەڵێن، چۆن تەماشای ئێمە دەكەن؟ گوێیان بۆ دەگرن و قسەكانیان لێ وەردەگرن و، سەرەنجام هەموو لایەك بەهرەمەند دەبن.

**دانـــا: پرسیارەكە لێرەدایە، ئەو خەڵكە نوێنەرەكانی ئەوەتان لە پەرلەماندان، ئەو خەڵكە كە لەسەر جادەن ئینتیما و وەلایان هەیە بۆ لایەنە سیاسییەكان، لایەنە سیاسییەكانیش پێكهێنەری حكوومەتن، وەزیریان هەیە، خەڵكیان لەوێیە، ئیتر بۆچی خەڵك بێتە سەر شەقام، كاتێ كە نوێنەری هەیە؟**

**مامۆستا:**

١- ڕاستە خەڵك نوێنەری هەیە لە پەرلەمان دا، بەڵام پەرلەمان پەكخراوە.

٢- خەڵك بەڵێ دەڵێ: لەگەڵ فلان حیزبەم، بەڵام بۆچی لەگەڵیەتی، دەتوانم زۆر بە دڵنیایی بڵێم: سەدا شەستی ئەوانەی لەگەڵ حیزبە حوكمڕانەكانن، بۆ پارە و بۆ معاش و ژیان لەگەڵیانن، ئەدی عاشقی بەرنامە و مەبدەئەكانیان بوون، كاتێك حیزب و حكوومەت تێكەڵ بووەو، هەموو شتێ كەوتووەتە دەست حیزب و شتێكی بچووكتر لە حیزب لە نێو حیزبدا، ئەو خەڵكە ئەگەر لەگەڵی نەبێ، ژیانی نابێ، قوڕبەسەرە، پێی وایە لە زەوی بێبەش دەكرێ، پێی وایە دامەزران، لە مووچە، لە ئیمتیازەكان بێبەش دەكرێ، بۆیە لەگەڵی دایە، كەواتە: ناتوانین بڵێین، ئەو حیزبانە بەڕاستیی نوێنەری ڕاستەقنیەی خەڵكن و، ئەو خەڵكە بەڕاستیی و بەدڵ لەگەڵ ئەو حیزبانەدایە، ئێمەش لەنێو ئەو خەڵكەداین بەدەیان جۆرە خەڵك دێ بۆلامان دەڵێ: ئەگەر ناچاریی نەبێت لەگەڵ ئەو حیزبەدا نابم، بڵێم چی، ناچارم و ژیانم ناڕوات، تۆ ئەگەر ئینتیمای حیزبییت نەبێ، نە تەعین دەكرێی و، نە زەوییت پێ دەدرێ و، نە ئیمتیازێكت پێ دەدرێ، ئنجا نیزیكە زوڵمت لێ بكرێ و نانبڕاو بكرێی و بێبەش بكرێی، لەبەرئەوە بە ناچاریی لەگەڵدام!!.

**دانـــا: ماموٚستا! ئەگەر نموونەی وڵاتانی کەنداو بێنینەوە، بە هەرێمی كوردستان، زۆرجار منیش، وەك جەنابت فەرمووت تێڕائەمێنم، دائەنیشم، ئەپرسم بۆ وا ناكرێ، بۆ وا ئەكرێ، منیش ئەپرسم دەسەڵاتدار، بڕیاربەدەست ئەگەر بیەوێ خەڵك لێی رازی بێ، بەو پارە و سەروەت و سامانەی لەبەردەستیدایە، ئەتوانێ وا بکات بەشەرعیی چەندەها ساڵ خۆی لەسەر حوكم بێ و وڵاتەكەی بەڕێوەبەرێ وەکو وڵاتانی كەنداو، کە میللەتەکەی خۆشیان ژیاندوە و خۆشیان زۆر دەوڵەمەندن، پرسیارەكە ئەوەیە ئێوە لە كۆڕە سیاسییەكانی خۆتاندا لە دیدارە سیاسییەكانتاندا پرسیارت نەكردوە، یان بۆت ڕوون نەبووەتەوە، ئەم بەڕێزانەی ئێمە، بۆ كارێ ناكەن، هەم خۆیان بەشەرعیی بمێننەوە، هەم خۆیان سوودوەربگرن، هەم میللەتەکەش سوودوەربگرێ؟**

**ماموٚستا:** ڕاست دەکەی، شتێکی جوانت باس کرد: ئێستا لە کەنداو، بەگشتی نا، بەڵام هەندێ لە وڵاتانی کەنداو، هەر حوکمڕانەکان مەلیك نین، خەڵکیش مەلیکانە. هاووڵاتیی لەوێ لە هەموو شتێك بەهرەمەندە، لەو خێرو بێرەی کە لەو وڵاتەدا هەیە، بەڵێ ئەو بڕیاربەدەستانە لەڕووی حوکمڕانییەوە بەس خۆیان و خانەوادەیان بەهرەمەندن، کە ئەوەش زوڵمە و حوکمی میراتیی لە ئیسلامدا نیە، حوکمی بنەماڵەیی لە ئیسلامدا هەر نیە، خوا فەرموویەتی:

﴿ وَأَمۡرُهُمۡ شُورَىٰ بَيۡنَهُمۡ وَمِمَّا رَزَقۡنَٰهُمۡ يُنفِقُونَ ﴾ [الشورى: ٣٨]

واتە: بڕواداران کاروباریان لەنێو خۆیان دابەڕاوێژە.. بەڵام ئەوەندەیان عەقڵ بە دنیا شکاوە، تاکو بەردەوام بن و ئەو زوڵمەی خۆیان بۆ بچێتە سەر، ئەو خەڵکەشیان بێ نیاز کردوە، ئەو خەڵکەشیان وا لێکردوە ناچاری سواڵ و صەدەقە نەبێ، هەروەها ئەو خەڵکەشیان وا لێکردوە کە بیرنەکاتەوە لەوەی ئەو حکوومەتە بڕووخێنێ، دەڵێ: منیش بەهرەمەندم، هەمووی کۆشکی هەیە، هەمووی بازرگانیی و سەروەت و سامانی هەیە.

**دانـــا: فلیپینیی و هیندیی لەماڵەکەیدا خزمەت دەکات!**

**ماموٚستا:** بەڵێ ڕاستە، ئنجا پرسیارەکەت جوانە، بۆچی ئەوانەی ئێمە واناکەن؟ وەڵام:

١- بەشێكی لێ نەزانینە.

٢- هەروەها بەشێكی نەدیتكەیی و لەناكاو بەسەر دەوڵەمەندیی و دەستەڵاتدارییدا كەوتنە، كەسێك كە لەناكاو دەبێتە شت، لەناكاو بەسەردا دەكەوێ، خۆی لێ دەگۆڕێ.

٣- هەندێ جاریش بیر دەكەمەوە لەوەی كە ئەو برادەرانە بیر لەوە دەكەنەوە: (إذا أصلحوا سقطوا) ئەگەر چاكسازیی بكەن دەڕووخێن، بۆچی؟ دەزانن كە خەڵك بۆیە لەگەڵیانە لەبەر پارەكە، لەبەرئەو پارە حەرامەی كە لە دەستیاندایە، لەبەرئەو عەرز و بەرزە كە دابەشی دەكەن بە زوڵم، ئەو پلە و پۆستە موفت و بەلاش و ئەو هەموو ئیمتیازە ناشەرعییانەی كە بە خەڵكیان دەدەن، ئنجا دەڵێن: بۆچی ئەو شتانە لەدەستی خۆملن بكەینەوە، ئەگەر ئەو شتانەمان بەدەستەوە نەمێنێ، ئەو خەڵكە عاشقی كوێمان دەبێ، بەرنامە و پرەنسیپ و صیفەتەكانمان زۆر جوانن! ئەگەر ئێمە چاكسازیی بكەین و وڵاتەكە بە دامەزراوە بكرێ و هاووڵاتییبوون سەنگی مەحەك بێ و، ئینتیما بۆ وڵات بناغەی مامەڵە لەگەڵ كران بێ، نەك ئینتیما بۆ حیزب و بنەماڵەو عەشیرەت، ئەو كاتە ئەو خەڵكە پێویستیی بە ئێمە نامێنێ، كە پێویستیی بە ئێمە نەما، لە دەوریشمان نامێنێ، سەرەنجام ئەو وەزعەی كە هەمانە، لێمان تێكدەچێ، واتە: ئەگەر چاكسازیی بكەن دەڕووخێن، ئنجا تۆ سەرنج بدە كەسانێك وەزعیان هێندە خراپ بێ، ئەگەر چاكسازیی بكەن، بڕووخێن و لەبەین بچن! كەسێك نەوێرێ چاكسازیی بكات، بۆ ئەوەی وەزعەكەی بەردەوام بێت و لێی تێك نەچێ!!

**دانـا: مامۆستا! ئەوە جۆرێك لەخۆبایی بوون نیە با پرسیارەكە ئاوا بكەم: لەخۆباییبوون چ لە سیاسەت دا بێ، چ لە بەڕێوەبردن دا بێ، لە هەر بوارێكدا بێ، ئەو كۆمەڵگایە، ئەو وڵاتە، بەرەو كوێ ئەبات؟**

**مامۆستا:** بەڵێ، ئەوە لەخۆبایی بوونە، منگەرایی (أنانیە) خۆپەرستییە، لە سوڕگەی خۆدا خولانەوەیە، لە سۆڕگەی بنەماڵە و عەشیرەت و حیزب دا خولانەوەیە.

ئەو صیفەتە خراپانە لەسەر ئاستی تاكیش، تاكێك كە گیرۆدە دەبێ بە خۆبەزلگریی و لەخۆباییبوونەوە، لەبەین دەچێت، چونكە: (ئەوەی لەبڵندان بڕوانێت، لە نەویان دەكەوێ) دەزانی یانی چی؟ كەسێك لووت لە ئاسمانێ بكات، لەپێش خۆی دەكەوێتە چاڵێكەوە و ناشیبینێ، بەس جار جار بۆ خۆی تەماشایەكی بەردەمی خۆی بكات، ناكەوێتە نێو چاڵەكەوە، ئەوەی لە بڵندان بڕوانێ، لە نەویان دەكەوێ، ئەوە لەسەر ئاستی تاكیش وایە و لەسەر هەر ئاستێكی دیكەش بێت، هەروایە، ئەگەر تەماشای مێژووش بكەی: ئەو وڵاتانەی ئەو دەوڵەتانەی كە لە لووتكەی دەستەڵات و ملهوڕیی و خۆسەپاندندا بوون، چ ئیغریقی كۆن، چ ڕۆمای كۆن، چ میصری كۆن، ئومەویی و عەبباسیی و عوسمانیی، لەوكاتەدا كە وا تەماشای خۆیانیان كردوە: هەمەكارەن و خەڵكیان بە صوغرە و بێگار گرتوە، لەوكاتەدا كۆتاییان پێهاتوە و ڕووخاون، هیچ گومانی تێدا نیە كە ئەمە بۆ هەرێمی كوردستانیش هەر ڕاستە و، بەنسبەت عێراقیشەوە هەر ڕاستە و، بە نسبەت نەتەوەیەكیشەوە ڕاستە و، بەنسبەت كۆی مرۆڤایەتییشەوە هەر ڕاستە، بەڵامئایا ئەوانەی ئێمە كەی بیر دەكەنەوە؟ كەی تۆزێ تەماشای مێژوو دەكەن؟ مێژووی دورنا، هەر مێژووی نزیكی خۆمان، تەماشا بكەن، ئەوە یەمەن، ئەوە توونس، ئەوە میصر، ئەوە لیبیا، ئەوە سووریا، ئەوە صەددام لە عێراق دا، ئەوە شا كاتی خۆی لە ئێران دا.

**دانـا: مامۆستا! ئەڵێن ئەو وڵاتانەی جەنابت بە نموونە باست كردن، كە لە ماوەی چەند ساڵی رابردوودا، چوار پێنج ساڵی رابردوودا بە بەهاری عەرەبییدا تێپەڕبوون، بە جۆرێك لە جۆرەكان وا لە خەڵكی ئەگەیەنن ئەڵێن: ئێستا هەموویان پەشێمانن لەوەی كردوویانە، هەر قەزافیی لەسەر حوكم بووایە، هەر عەلی عەبدوڵڵا ساڵح لە یەمەن لە سەر حوكم بووایە، ئەوەتا ئەوە وەزعی سووریا!!ئایا ئەو قسەیە ڕاستە؟!**

**مامۆستا:** نەخێر، ڕاست نیە كە خەڵك پەشێمان بێ و ئەگەر گریمان پەشێمانییش هەبێ، پەشێمانییەكە ڕاست نیە، چونكە خەڵكی ئەو وڵاتانە بەدەست ئەو حوكمڕانە خۆسەپێنانەوە زۆریان چێشت، هەركام لە قەزافیی و حوسنی موبارەك و زین العابدین و صەدام و كێ و كێ، كەس لێی پەشێمان نیە كە ڕۆیشتوون

ئەوانە، ئاوەو ئاو بچن، ڕاست نیە کەس بۆ شای ئێران پەشیمان بێ، با ڕەخنەشی هەبێ لە حکوومەتی ئێستای ئێران، کەس پەشێمان نیە کەسێك عەقڵی هەبێ و ویژدانی هەبێ و دووربینیەکی هەبێ، پەشێمان نیە بۆ صەددام کە لەبەین چوە، ڕژێمی بەعس کە ڕووخاوە، با ڕەخنەشی هەبێ لە حکوومەتی ئێستای بەغداد و لە هەرێمەکەی خۆشی.

**دانــا: یان ئەتاتورك و تورکیا ئێستا؟**

**مامۆستا:** ئەو دیکتاتۆرانە هەموو میللەت و خەڵکەکەیان لە خۆیاندا خولاصە کردبووەوە، هیچ کەس هیچ نەبوو، بەڵێ ئێستا لو وڵاتانەدا شەڕی نێوخۆ هەیە، کە بێگومان ئەو شەڕانەش تەرەفەکانیان تەنیا خۆیان نین، ئەو جەمسەرگیرییەی نێوان شیعە و سوننەو ئەو ناکۆکیی دەوڵەتانی ئیقلیمیی لەو شەڕانەدا بێ دەخل نیە، لە لیبیاش و لە یەمەنیش و لە سورویاش و لە هەمووی، زۆر زۆر ئاشکرا و روونە، ئەگەر لە سووریا گەڕابان بۆ خەڵکی سووریا، لەمێژنەبوو بەشار ئەسەدیان لەبەین بردبوو؟! ئەگەر ڕووسیا و ئێران لێی گەڕابانایە و دەستیان پێوە نەگرتبایە؟ هەروەها ئەگەر لە خەڵکی یەمەن گەڕابانایە، لەمێژ نەبوو عەلی عەبدوڵڵا صاڵحیان پێچابووەوە، ئایا دوایی زیندوو دەبوونەوە، ئەگەر خەڵکی دیکەیان لەپشتەوە نەبووایە، هەروەها لە لیبیاش؟!.

من پێموایە ئەوەی کە ڕوویداوە، ئەو ڕاپەڕین و گۆڕانکارییە، کە من ناوم لێناوە: بەهاری چەوساوان (ربیع المستضعفین)، چونکە خەڵکی عەلمانیی تێدا بوو، ئیسلامیی تێدا بوو، بەدین و بێ دین هەمووی تێدا بوون، چەوساوان بوون لە دژی چەوسێنەران، من پێموایە ئەوە فێڵێکی گەورەبوو کرا لە ناوچەکەدا، بۆ ئەوەی کە خەڵك تەوبە بکات لە شۆڕش و ڕاپەڕین، لە بەرامبەر ستەمکاراندا، ئنجا ئەگەر تەماشاش بکەی کێ لە پشت لەباربردنی شۆڕشەکانەوەیە: دەوڵەتانی کەنداو، ئەمریکا، جولەکە، ئەو دەوڵەتانەی کە بەرژەوەندییان لەوەدایە دۆخەکە وەك خۆی بمێنێتەوە، کورسییەکانی ژێریان لە بن دەرنەهێنرێ و، حوکمی میراتیی و بنەماڵەیی کە هەیانە لێیان تێکنەچێ، حوکمی تاکیی کە

هەيانه، لێيان تێكنەچێ، ئەمريكا و زلهێزەكانيش بەرژەوەندييەكانيان كه بە هۆى سيسييەوە جێبەجێ دەبن نەك بە هۆى مورسييەوە، بەهۆى عەلى عەبدوڵڵا ساڵح و ئەوانەوە جێبەجێ دەبن، نەك بەهۆى حوكمێكى ديكەوە، بەهۆى بەشار ئەسەدەوە جێبەجێ دەبێ، نەك بەهۆى حوكمى ئيسلاميى كه جێى بەشار ئەسەد بگرێتەوە، بەڵێ ئەوانەبوون كه دەستيان بە تێكدان و لەباربردنى ئەو شۆڕشانه كرد، كەواتە: كه بگوترێ: ئەگەر شۆڕش بكرێ، خراپە، بەڵام بەداخەوە كه زلهێزان، ئەوانەى كه لەگەڵ ئەوەدان دۆخەكه وەك خۆى بمێنێتەوە و ديكتاتۆرەكان حاكم بن، بنەماڵەكان حاكم بن و، خەڵكى ڕەش و ڕووت نەيەتە سەر كار، بەداخەوە ئەوانە بەهێزترن.

**دانـا: كه بەداخەوە ئەوەش دووفاقييەكه كه ئەو زلهێزانه دەيكەن، بۆ گەلى خۆيان ديموكراسى و ئەمريكا چوار ساڵ جارێك هەڵبژاردن ئەكات، هەشت ساڵ، دوو خول زياتر كەس بۆى نيه دووبارەى بكاتەوە، بەڵام ئاوا تەعامول لەگەڵ وڵاتانى سێهەم دا ئەكەن؟**

**مامۆستا:** بەڵێ بەتەئكيد، ئەو دووفاقييە و بانێكه و دوو هەوايە، من جارێك بە بەرپرسێكى ئەورووپييم گوت: ئێوە شتى باشتان بۆ خۆتان دەوێ، خراپيشتان بۆ دەرەوەى خۆتان دەوێ.

**دانـا: مامۆستا! ئاماژەت بە شتێك كرد، فەرمووت: دەسەڵاتداران و بڕياربەدەستانى ئێمە وا حاڵيى بوون، كه ئەگەر گۆڕانكاريى بكەن، يا گۆڕانكارى بكرێ، ئەمان كۆتاييان پێ دێ و خەڵك لێيان بێ نياز ئەبێ، ئايا تۆش كۆكى لەگەڵ ئەوەى كه ئەگەر ئەوان دەست بكەن بە چاكسازيى، كۆتاييان پێ دێ، يان نەخێر بە هەڵە تێگەيەنراون، يان خۆيان تێناگەيەنن؟**

**مامۆستا:** نا، من پێموانيه بەو شێوەيه بێت، بەڵام ئەوان بەشێوەيەك ڕەفتاريان كردوە، كه ئەو خەڵكەى لەدەوريانه، خەڵكێكه بە زەبرى پاره و تەماع بەدەورى خۆيانەوە كۆيان كردووەتەوە، كه ئەوە غەڵەتە، من پێموايه دەبێ شێوەى مامەڵەكردنيان لەگەڵ خەڵكدا بگۆڕن، سياسەتەكەيان بگۆڕن، باوابكەن بۆيه خەڵك لەگەڵيان

بێ، چونکە بڕوای بە مەبدەئو پرەنسیپەکەیانیان هەیە، بڕوای بە هەڵوێستەکانیان هەیە، نەك تەماعی لە گیرفانیاندا هەبێ، دەبێ بەوشێوەیە خۆیان بگۆڕن و، چاکسازیی بکەن، ئەگەرنا ئەو جۆرە عەقلیەتە بەشی هەر سەربەفەتارەت چوونە، درەنگ و زوو، بەڵام بێگومان کەسێك کە چاو بەخۆیدا دەگێڕێتەوە و بۆ لای خوا دەگەڕێتەوە، بۆ لای شەریعەتەکەی خوا دەگەڕێتەوە، بۆ لای حەق و عەدل دەگەڕێتەوە، ئەگەر بەوە زەرەرێکی شەخصییش بکات، هەر قازانجی کردوە، ئەگەر زەرەرێکی حیزبییش بکات، هەر قازانجی کردوە، چونکە کە خەڵك و وڵات قازانجی کرد تۆش قازانجت کردوە، بەڵام بە بارەکەی دیکەیاندا ئەگەر قازانجیش بکات، هەر زەرەری کردوە، چونکە سەرەنجام وڵاتەکەت بە قوڕێدا بردوە، وڵاتەکەت هەموو تێك دەچێت، وڵاتەکەت ئەوەتا ئەو هەموو خێرو بێرەی تێدایە، خەڵکیش چارەگە معاشێکی نیە، ئەو هەموو نەوتە ئەو هەموو غازە، ئەو هەموو ئیمکانییەتە، چی لێهات، چۆن وا بەخێرایی لە ماوەی دە پازدە ساڵدا ئەو هەموو ملیاردێرە پەیدا بوون لەم وڵاتەدا! ئەوە لەسەر حسابی ئەو هەموو خەڵکە ڕەش و ڕووتەیە، جا ئەوە چ جۆرە وڵات بەڕێوەبردنێکە! جا ئایا مانەوە و نەمانەوە بەو شێوەیە چییە؟! ئینسان لەدۆخێکی وادا بمێنێ یان نەمێنێ، سەرۆك بێ یان هیچ کارە بێ، چ تامێکی هەیە، هیچ تامێکی نیە، بۆیە من پێموایە ئەوانە ئەگەر واقیع بینانە بیربکەنەوە و حساب بۆ خوا و بۆ قیامەتی خۆیان بکەن، دەبێ هەرچی زووترە، ئەو شێوە حوکمڕانییە ئەو شێوە هەڵسوکەوتە بگۆڕن با تاڕادەیەك زیانی حیزبیشی تێدا بێ، بەڵام خەڵك و جەماوەر قازانج دەکات، هەروەها خۆشیان، چونکە دوایی دەڵێن: کێ ئەو گۆڕانکارییەی کرد؟ فڵان کەس، فڵان حیزب، دەستی خۆش بێ.

**دانـا: ئێوەش وەك لایەنەکانی تر، قسەیەکتان نامێنێتەوە کە ڕەخنە لەوان بگرن؟**

**مامۆستا:** بەڵێ ڕاستە، بەڕە لەژێر پێی ئەوانەش دەدرێنن، کە بە حەق یان بەناحەق ڕەخنەیان لێ دەگرن.

**دانـا: ماموٚستا! بە حوكمی ئەوەی ئەم ئەڵقەیەمان باس لە گەڕانەوە بوو بۆ لای خوا، دەمەوێت ئەو چەمكە تۆخ بكەینەوە، وەك كۆتا پرسیار دیسان دەپرسمەوە: ئایا ئەگەر خەڵك ئەهلی تاعەت بن، لە كونجی مزگەوتەكاندا و لە ماڵەكانی خۆیاندا، شەوو ڕۆژ خەریكی دینداریی و عیبادەت و نوێژ و ڕۆژووی سوننەت و ئەمانە بن، ئایا وڵات بەمە چاك ئەبێت، لەكاتێكدا بڕیاربەدەست و حوكمڕانەكانی ئەم وڵاتە لەسەر زوڵم و ستەم و نەگەڕانەوە بۆ لای خوای گەورە، بەردەوامن؟**

**ماموٚستا:** پێشتریش باسم كرد، دینداریی و تاعەتی شەخصیی سوودێكی شەخسیی هەیە، بەڵام دینداریی و تاعەتی بە كۆمەڵ، سوودی بە كۆمەڵی هەیە، هەموو ئەو شوێنانەی كە خوای پەروەردگار تێیان دا باسی ئەوە دەكات كە: (ئەگەر بگەڕێنەوە بۆ لای خوا واقیعتان دەگۆڕێ) بە حاڵەتی كۆ باسیان دەكات، بۆ وێنە:

﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُغَيِّرُ مَا بِقَوۡمٍ حَتَّىٰ يُغَيِّرُواْ مَا بِأَنفُسِهِمۡۗ﴾ [الرعد : ١١]

واتە: خوا واقیعی هیچ كۆمەڵگایەك ناگۆڕێ، تاكو ئەوان (واتە: بە كۆمەڵ) دەروونی خۆیان (بیرەكانی خۆیان، خولیاكانی خۆیان، ڕەفتارەكانی خۆیان) نەگۆڕن. بەڵێ گۆڕانی دەستەجەمعیی، گەڕانەوەی دەستەجەمعیی بۆ لای خوا، گۆڕانكاریی لە وڵاتدا پەیدا دەكات، بەڵام گۆڕینی تاكێك، چەند تاكێك لە خودی خۆیان دا چاك دەبن، بۆ خۆیان باشە. هەروەها خوای پەروەردگار لەسەر زمانی پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام)، بەهەمانشێوە باس دەكات، بۆ وێنە نووح بە قەومەكەی دەفەرمووێ:

﴿فَقُلۡتُ ٱسۡتَغۡفِرُواْ رَبَّكُمۡ إِنَّهُۥ كَانَ غَفَّارٗا ١٠ يُرۡسِلِ ٱلسَّمَآءَ عَلَيۡكُم مِّدۡرَارٗا ١١ وَيُمۡدِدۡكُم بِأَمۡوَٰلٖ وَبَنِينَ وَيَجۡعَل لَّكُمۡ جَنَّٰتٖ وَيَجۡعَل لَّكُمۡ أَنۡهَٰرٗا ١٢﴾ [نوح: ١٠ - ١٢]

واتە: پێمگوتن: داوای لێبوردن لە پەروەردگارتان بكەن (واتە: بگەڕێنەوە بۆ لای داوای لێبوردنی لێ بكەن) (يُرۡسِلِ ٱلسَّمَآءَ عَلَيۡكُم مِّدۡرَارٗا) لەسەرێوە بارانی بەخوڕتان بۆ دەبارێنێ، (وَيُمۡدِدۡكُم بِأَمۡوَٰلٖ وَبَنِينَ) هەروەها سامان و كوڕانتان پێدەدات

(وَيَجۡعَل لَّكُمۡ جَنَّٰتٖ وَيَجۡعَل لَّكُمۡ أَنۡهَٰرٗا) هەروەها باغ و بێستان و ڕووبارانی زۆرتان بۆ دەرەخسێنێ. لێرەش نەیفەرمووە: وەرن با تاك تاكتان نوێژ و طاعەت بكا لە ماڵی خۆی دا نا، بەدەستەجەمعیی بگەڕێنەوە بۆ لای خوا، یانی: هەم لە ژیانی تاكیتاندا عیبادەتی شەخسیی جێبەجێ بكەن، هەم بە دەستەجەمعییش لە كۆمەڵگاتاندا یاسایەكانی خوای پەروەردگار جێبەجێ بكەن، زوڵم مەهێڵن، دادگەریی لە شوێن دابنێن، مونكەر مەهێڵن، مەعرووفی لە شوێن بچەسپێنن، فەرق و جیایی مەهێڵن برایەتی و یەكسانیی لە شوێن بچەسپێنن، ئەوكاتە بەتەئكید ئەگەر خەڵكێك بەگشتی گۆڕان بەسەر خۆیدا بێنێ، بەهۆی چەسپاندنی شەریعەتەوە ئەوكاتە خوای میهرەبان واقیعەكەیان بۆ دەگۆڕێ، ئەگەرنا دەبێ ئەو خەیاڵە لە مێشكی خۆمان دەربكەین كە پێمان وابێ ئەگەر تاكەكان، هەر كەس بۆ خۆی طاعەتی شەخسیی زیاد بكات، واقیعەكەمان دەگۆڕێ ! جارێك مامۆستایەك دوای مانگی ڕەمەزان لە وتاری جومعەدا لە خەڵكەكە تووڕە بوو بوو، دەیگوت: خەڵكینە! ئەو هەموو زوڵمە هەیە، ئەو هەموو خراپەیە هەیە، خەتای ئێوەیە! منیش زۆر بەزەییم بە خەڵكەكەدا هات، لەدڵی خۆمدا گوتم: ئەو خەڵكە دەڵێ: تازە ڕەمەزانمان گرتووەو تازە جەژنمان كردو، تەڕاویحمان كردوون و تاعەتمان كردوە، ئێمە چی بكەین ؟ فلان حیزب و فلان حیزب زوڵم دەكا، ئێمە چی بكەین؟ دوای وتارەكە گوتم: مامۆستا ئەرێ لەگەڵ ئەو خەڵكەدا زۆر توند نەبووی و، بەرامبەر خەڵكی دیكەش زۆر نەرمی، نەرمییەكەی ئەولا، دەتەوێ بە توندییەكەی ئەملا قەرەبوو بكەیەوە، گوتی چۆن؟ گوتم: ئەو خەڵكە فەقیرە بڵێ چی، ڕۆژووە دەیگرێ، نوێژە دەیكات، خۆی لە حەڕام دەپارێزێ و بەڕەنجی شانی خۆیان خۆیان دەژیەنن، بەڵام چی بكات هەندێك حووت لەم وڵاتەدا پەیدابوون موڵك و سامانی ئەو خەڵكەیان هەموو قووت داوە، بۆیە ئەو كێشە و قەیرانانە پەیدا بوون، تۆ بۆچی گلەیی لەوان ناكەی، ئەم خەڵكە فەقیرە دەستخۆشییان لێ بكە، كە ئەهلی تاعەت و دینداریی و چاكەن، بەڵام گلەیی ئەوەیان لێ بكە بڵێ بۆچی هەڵوێستتان نیە، ئەگەر ئەو گلەییەیان لێ بكەی، بەڵێ، بەڵام گلەیی ئەوەیان لێ بكەی بڵێی: بۆچی نوێژ و ڕۆژووتان نیە؟ هەیانە، بەڵام بڵێ: ئیسلام تەنیا نوێژ و

ڕۆژووی شەخصیی نیە، دین ئەوەیە كە دەبێ لە ژیانی سیاسییتاندا، لە ژیانی ئابوورییتاندا، بزانە شەریعەت پیادە دەكرێ، پیادە ناكرێ؟ بزانن پەڕلەمانەكەتان چۆنە؟ حكوومەتەكەتان چۆنە؟ بازاڕەكەتان چۆنە؟ ئەوە بڵێی بە خەڵك باشە. دەیگوت : هەر كەسێك گوناحێك بكات، تازە با بەتەمای ڕۆژووی ڕەمەزان نەبێ، گوتم: مامۆستا ئەوەشت غەڵەتە، خوا نەیفەرمووە: گوناحەكان چاكەكان لادەبەن، دەفەرموێ: چاكەكان گوناحەكان دەسڕنەوە:

﴿إِنَّ ٱلْحَسَنَٰتِ يُذْهِبْنَ ٱلسَّيِّـَٔاتِ﴾ (هود: ١١٤ )

بەڵێ هەندێك كەس، هەندێك لە مامۆستایان هەن كە بەعەكسەوە بۆ قەزیەكە دەچن و، وە وای لێ حاڵیی بوون، ئەگەر خەڵك زۆر ئەهلی نوێژ و تاعەت بێ، واتە: دینداریی تایبەتیی و شەخسیی، یەكسەر دنیا دەگۆڕێ و دەبێتە شامی شەریف! هەندێك لە ئەهلی تەصەووف وا بیردەكەنەوەو هەندێك لەوانەش كە ناویان لەخۆیان ناوە: سەلەفیی وا بیر دەكەنەوەو هەندێك لە مامۆستایەكانیش وا بیر دەكەنەوە!! بەڵام دەبێ بزانن داخۆ كێ زوڵم دەكا؟ كێ خراپە دەكا؟ كێ قۆرخكاریی دەكات؟ ئینجا گلەییش لە خەڵك بكەن، بڵێن : بۆچی هەڵوێستتان نیە لە بەرامبەر ئەو زوڵم و قۆرخكاریی و خراپەكارییەدا!!

**دانـــا: مادام لە كۆتا وشەتدا باسی خەڵكت كرد من، كات لەوە زیاتر دەرفەتمان نادا، پشت بە خوای گەورە لە ئاڵقەی داهاتوودا باس لە ڕۆڵی خەڵك و جەماوەر ئەكەین لە چاككردنی واقیعی كۆمەڵگاداو بەرپرسیارێتیی سەرەكی خەڵك و جەماوەر چییە لەو چاككردنەدا، سوپاست دەكەین لەم ئاڵقەیەشدا وەڵامی پرسیارەكانی ئێمەت دایەوە.**

**مامۆستا:** زۆر سوپاس بۆ جەنابیشتان.

# ئاڵقەی نۆیەم

بنەمای نۆیەم: خەڵك و جەماوەر بۆ چاككردنی واقیعی كۆمەڵگا، بەرپرسیارێتیی سەرەكییان لەسەرشانە.

ameer.maktab@yahoo.com

 /AliBapir  /AliBapir  /MediaAmeerOffice

www.alibapir.net

دانـــا: بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان، جوانترین سڵاوتان لێ بێ بینەرانی ئازیز و خۆشەویستی کەناڵی ئاسمانی پەیام، خۆم بەخۆشحاڵ دەزانم خوای پەروەردگار دەرفەتی پێ بەخشینەوە لە ئاڵقەیەکی نوێ لە بەرنامەی بەدانایی دا، لە خزمەت میوانە هەمیشەییەکەمان جەنابی مامۆستا عەلی باپیر نووسەر و رووناکبیردا، بە یەکتری شاد بووینەوە.

بێگومان لەم بەرنامەیەدا باس لە ڕۆڵ و کاریگەریی خەڵك و جەماوەر ئەکەین، لە گۆڕینی ئەو واقیعەی کە خۆیان تیایدا ئەژین.

مامۆستا سڵاوی خوات لێ، دووبارە سوپاس بۆ ئامادەبوونت.

**مامۆستا:** سڵاوی خوا لە جەنابیشت و زۆر بەخێر بێی.

دانـــا: زۆر سوپاس، جەنابی مامۆستا! لەو زنجیرە بابەتەی کە "بۆ چاککردنی دۆخی هەرێم با گوێ لە قورئان بگرین" لە ئاڵقەی نۆدا باس لەوە ئەکەین، خەڵك و جەماوەر بۆ چاککردنی واقیعی کۆمەڵگاکەیان بەرپرسیارێتیی سەرەکییان دەکەوێتە سەر شان، پرسیارەکە لێرەدا ئەوەیە لەکاتێکدا خەڵك و جەماوەر دەنگ ئەدەن لە پرۆسەیەکی دەنگداندا، نوێنەرەکانی خۆیان بۆ ئەنجوومەنی پارێزگا و پەرلەمان و دەنگ بە حیزبەکان دەدەن هەڵیاندەبژێرن،بۆچی ئەبێ بۆ گۆڕینی واقیعی خۆیان، دیسانەوە جەماوەر ئەرکیان لەسەر شان بێ؟

**مامۆستا عەلی باپیر:** بسم الله الرحمن الرحيم، الحمد لله، وصلى الله تعالى وسلم وبارك على رسول الله، محمد وآله وصحبه المهتدين بهداه. ربنا آتينا من لدنك رحمة وهيئ لنا من أمرنا رشدا.

کاکە دانا! بۆ وەڵامی ئەو پرسیارەی جەنابت، پێویستە دوو ڕاستیی گەورە بزانین و یەکەم: لە ئیسلامدا هەروەك لە سیستمی دیموکراسیشدا هەروایە، خاوەنی ئەصڵیی دەسەڵات خەڵکە، واتە خەڵك لە ئەصڵدا خاوەنی دەسەڵاتە و ئەوە خەڵکن دەبێ وڵاتی خۆیان بەڕێوە بەرن، وە ئەوە خەڵکن دەبێ بەو شێوەیەی دەیانەوێ، ژیانی ئابووریی، کۆمەڵایەتیی، سیاسیی خۆیان ڕێکبخەن و ئیدارە بدەن، بەڵگەشمان لەسەر ئەوە زۆرن و پێشتر لەوبارەوە قسەمان کرد،

هه‌روه‌ها له‌و باره‌وه‌ له‌ به‌رگی دووه‌می مه‌وسووعه‌ی: (ئیسلام و ده‌وڵه‌تداریی) دا، كه‌ باسی بنه‌مایه‌كانی سیستمی حوكمڕانیی له‌ ئیسلامدا ده‌كات، به‌درێژی له‌وباره‌وه‌ دواوین، چونكه‌ یه‌كێك له‌ بنه‌مایه‌كان ئه‌وه‌یه‌ كه‌ وه‌ك چۆن خوا سبحانه وتعالى خاوه‌نی حوكمڕانێتی و سه‌روه‌ریی ڕه‌ها (الحاكمية والسيادة المطلقة) یه‌، خه‌ڵكیش خاوه‌نی ده‌سته‌ڵاته‌، واته‌: خه‌ڵك خاوه‌نی به‌رپرسیارێتییه‌و، ده‌ستی كراوه‌یه‌ چۆن شه‌ریعه‌تی خوا سبحانه وتعالى پیاده‌ بكات و، چۆن به‌ر پرسانی خۆی دابنێ و، دوایی چاودێرییان بكات، لێیان بپرسێته‌وه‌، ڕاستیان بكاته‌وه‌، لایان بدات له‌ كاتی پێویستدا، له‌وباره‌وه‌ش به‌ڵگه‌ زۆرن :

**١)** هه‌موو دواندنه‌كانی قورئان یان به‌ (يَا أَيُّهَا النَّاس) ده‌ستپێده‌كه‌ن، ئه‌ی خه‌ڵكینه‌! یان به‌ (يا أيها الإنسان) ئه‌ی مرۆڤ! یان به‌ (يابني يٓدم) ئه‌ی وه‌چه‌ی ئاده‌م ! یاخود به‌ (يا أيها الذين آمنوا) ئه‌ی ئه‌وانه‌ی بڕواتان هێناوه‌! ده‌ستپێده‌كه‌ن. كه‌واته‌ دواندنه‌كانی قورئان، دواندنه‌كانی خوا سبحانه‌وتعالى ڕوو له‌ مرۆڤه‌كان ده‌كه‌ن به‌ گشتی، ڕوو له‌ چینێك ناكه‌ن و، ڕوو له‌ كۆمه‌ڵێكی دیارییكراو ناكه‌ن، له‌ هه‌موو قورئاندا (يا أيها العلماء)ت ده‌ست ناكه‌وێت، (يا أيها المسؤولون) ت ده‌ستناكه‌وێت، (يا أيها المشايخ)ت ده‌ستناكه‌وێت، (يا أيها الرجال، يا أيها النساء) نیه‌، به‌ڵكو (يا أيها الإنسان) (يا أيها الإنسان)، (يا بني آدم) (يا أيها الذين آمنوا) به‌كارهاتوون، كه‌ ئه‌وه‌ نێرو مێ ورد و درشت، ئه‌وه‌ی ده‌ستڕۆیشتووه‌ و ئه‌وه‌ی ده‌ستنه‌ڕۆیشتووه‌، ده‌وڵه‌مه‌ند و هه‌ژار، سپی و ره‌ش، هه‌موویان پێكه‌وه‌ ده‌گرێته‌وه‌، كه‌واته‌: خه‌ڵك و جه‌ماوه‌ر خاوه‌نی ئه‌صڵیی ده‌سه‌ڵاته‌.

**٢)** به‌رپرسان كه‌سانێكن كه‌ خه‌ڵك ئه‌مانه‌تی كاروباری كۆمه‌ڵگا به‌ڕێوه‌بردنیان پێ ده‌سپێرێ، وه‌ك خوا له‌ ئایه‌تی ژماره‌ (٥٨)ی سوره‌تی (النساء)دا ده‌فه‌رموێ:

﴿ إِنَّ ٱللَّهَ يَأْمُرُكُمْ أَن تُؤَدُّوا۟ ٱلْأَمَٰنَٰتِ إِلَىٰٓ أَهْلِهَا وَإِذَا حَكَمْتُم بَيْنَ ٱلنَّاسِ أَن تَحْكُمُوا۟ بِٱلْعَدْلِ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ نِعِمَّا يَعِظُكُم بِهِۦٓ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ سَمِيعًۢا بَصِيرًا ﴿٥٨﴾ ﴾ [النساء : ٥٨]

لێره‌ دیاره‌ نیه‌، خوا نه‌یفه‌رمووه‌: (يا أيها الناس)، (يا أيها الذين آمنوا) به‌ڵام به‌ سیاق ده‌زانین كه‌ مه‌به‌ست پێی كۆمه‌ڵگایه‌، بۆچی نه‌یفه‌رمووه‌: (يا

أيها الذين آمنوا) چونکە ئەو کۆمەڵگایە ئەگەر کۆمەڵگایەکی ئیسلامییە، دەگونجێ نامسوڵمانانیشی تێدا هەبن و نامسوڵمانانیش بەرپرسیارن بەرامبەر بە ئیدارەدانی کۆمەڵگای خۆیان، بەرپرسیاریشن و مافیشیان هەیە کە ئەوانیش بەرپرسانی خۆیان دیاریی بکەن. ئێستاش با سەرنجی ئایەتەکە بدەین (إِنَّ ٱللَّهَ يَأۡمُرُكُمۡ) لێرەدا ڕاناوەکە (کُم) دەچێتەوە بۆ کۆمەڵگا، (إِنَّ ٱللَّهَ يَأۡمُرُكُمۡ) یانی (أيها المجتمع)، ئەی کۆمەڵگا ئەی خەڵکینە، خوا فەرمانتان پێ دەکات! (أَن تُؤَدُّواْ ٱلۡأَمَٰنَٰتِ إِلَىٰٓ أَهۡلِهَا) کە سپاردەکان بگەیەننە خاوەنەکانی خۆیان، خاوەنانی شایستەی خۆیان، (ابن تيميه) ڕەحمەتی خوای لێ بێ، لە کتێبی: (السياسة الشرعية في إصلاح الراعي والرعية)دا، هەروەها زانایانی دیکەش بە گشتی دەڵێن: لێرەدا کە دەفەرموێ: (إِنَّ ٱللَّهَ يَأۡمُرُكُمۡ أَن تُؤَدُّواْ ٱلۡأَمَٰنَٰتِ إِلَىٰٓ أَهۡلِهَا) مەبەست لە (أمانات) سپاردەکانی حوکمڕانییە، بۆچی؟ چونکە لە فەرمایشتی پێغەمبەردا (عليه الصلاة والسلام) هاتووە: ڕۆژێك یەكێك لێی پرسی: "متى الساعة؟" ئاخیر زەمان کەیە؟ {زۆرێك لە خەڵکی (قيامة) و (ساعة) تێکەڵ دەکەن، کە لەڕاستییدا "ساعة" واتە ئاخر زەمان، ئەو کاتەی کە دنیای تێدا کۆتایی دێ، بەڵام "قيامة" واتە کاتی هەڵسانەوە و زیندووبوونەوە و لێپرسینەوە و سزا و پاداشت کە دەستپێدەکات} "قال: اذا متى ضيِّعت الأمانة فانتظر الساعة"، واتە: فەرمووی: هەرکاتێك سپاردە زایە کرا، چاوەڕێی کاتی کۆتایی بن، {چاوەڕێی کاتی کۆتایی هاتنی ئەو کارە ئەو حاڵە بن} "قيل: وما إضاعتها؟" گوترا: زایەبوونی سپاردە چییە؟ "قال: اذا وسِّد الأمر إلى غير أهله، فانتظر الساعة"، فەرمووی: هەرکاتێك کار بە خەڵکی ناشایستەی خۆی سپێردرا، چاوەڕێی کۆتایی ئەو کارە بکە.

وەڵامەکەی پێغەمبەر (عليه الصلاة والسلام) زۆر حەکیمانە بووە، ئەو ئینسانە دیارە دەربارەی ئاخیر زەمان (الساعة الكبرى) پرسیاری کردوە، بەڵام ئەو سەرنجی ڕاکێشاوە بۆ کۆتاییهاتنی هەر کارێك کە بە خەڵکی نائەهل دەسپێردرێ، کۆمەڵگایەك حوکمڕانییەکەی و بەڕێوەبردنی بکەوێتە دەستی خەڵکێکی ناشایستە کۆتایی پێ دێ، ئاخرزەمانی دێ. ئنجا جێی سەرنج

ئەوەیە كە لێرەدا پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) ڕستەی (اذا وُسِّدَ الأمر) یان (أُسْنِدَ الأمرُ) ی كردوە بە تەفسیر بۆ زایەبوونی ئەمانەت، دیارە وشەی (أمر) یش یانی حوكمڕانی و كاروباری سیاسی.

كەواتە: لە ئایەتەكەدا كە دەفەرموێت: (إِنَّ ٱللَّهَ يَأْمُرُكُمْ أَن تُؤَدُّوا۟ ٱلْأَمَـٰنَـٰتِ إِلَىٰٓ أَهْلِهَا) واتە: ئەی كۆمەڵگا! خوا فەرمانتان پێ دەكات سپاردەكان بە خەڵكی شایستەی خۆیان بسپێرن، مەبەست لە (أمانات) بە پلەی یەكەم سپاردەی حوكمڕانیی و بەرپرسیارێتییە، ئینجا ئەو خەڵكە كە ئەمانەتی حوكمڕانیی و بەرپرسیارێتی یان پێ دەسپێردرێ، دەبێ خاوەنی شایستەیی بن، ئینجا ئەو كەسە شیاوانە دەسەڵاتی یاسادانان بن، دەسەڵاتی جێبەجێكردن بن، دەسەڵاتی دادوەری بن، سێ دەسەڵاتەكە یان هەر دامەزراوەیەكی دیكە، بۆ وێنە: سوپا، ئاسایش، پۆلیس، دەبێ كەسانێكی شایستە بدۆزنەوە ئەو ئەركانەیان پێ بسپێرن.

كەواتە: بۆیە خەڵك ـ وەڵامی پرسیارەكەی جەنابت ـ بەرپرسیارن، چونكە ئەوان خاوەنی ئەصڵیی دەستەڵاتن و، وە ئەوان بە چەند مەرجێك ئەو دەستەڵاتەیان سپاردوە بە چەند كەسێك، كە دەبێ چاویش وردبكەنەوەو كەسانی شایستە بن، چونكە ئەگەر بە كەسانی ناشایستەی بسپێرن، ئەركی حوكمڕانیی و بەڕێوەبردن، ئەو كۆمەڵگایە كۆتایی پێدێ، ئەو كۆمەڵە خەڵكە كە ئیدارەدان و بەڕێوەبردنیان بە كۆمەڵە كەسێكی وا ناشایست سپاردوە، كۆتاییان پێ دێ، وەك بینیمان هەندێك لە ڕژێمەكان، هەندێك لە حكومەتەكان، لە عالەمی عەرەبییدا كۆتاییان پێ هات، لەبەرئەوەی بەشێوەیەكی ناشایستە حوكمڕانیی خەڵكیان دەكرد.

**٣)** ئەوە كە بەرپرسان دیاریی دەكرێن و ئەو سپاردەیەیان پێ دەسپێردرێ، چ دەستەڵاتی یاسادانان (پەرلەمان)، چ حكوومەت پەرلەمان نوێنەری خەڵكە بۆ ئەوە یاسای بۆ دابنێ، بۆ ڕێكخستنی ژیانی، حكومەت نوێنەری خەڵكە بۆ ئەوەی ئەو یاسانەی كە لە پەرلەماندا دانراون، جێبەجێیان بكات، هەروەها

دەستەڵاتی دادوەرییش دیسان نوێنەری خەڵكە، بۆ ئەوەی چاودێر بێ بەسەر هەر كام لە دەستەڵاتی یاسادانان و دەستەڵاتی جێبەجێكردنیشەوەو هەوڵبدا دادگەریی بچەسپێنێ،

﴿ وَإِذَا حَكَمْتُم بَيْنَ ٱلنَّاسِ أَن تَحْكُمُواْ بِٱلْعَدْلِ ﴾ (النساء : ٥٨).

كەواتە: هەرسێ دەسەڵاتەكان نوێنەری خەڵكن و وە خەڵكیش خاوەنی ئەصڵیی دەستەڵاتە، بۆیە خەڵك كاتێك لە ڕێی نوێنەرەكانیەوە پەرلەمان پێكدێنێ، وەكو ئێستا كە هەیە، حكوومەت پێكدێنێ، دەستەڵاتی دادوەریی پێكدێنێ، ئەو سێ دەسەڵاتە سەرەكییە: دەسەڵاتی یاسادانان و جێبەجێ كردن و دادوەریی، ئایا بەرپرسیارێتییەكەی تەواو دەبێت؟ نەخێر، دواجار دەبێ چاودێر بێ بەسەر ئەو سێ دەسەڵاتەوە، بزانێ داخۆ ئایا وەك ئەو مەرجانەی كە ئەو لێی بەمەرج گرتوون، ئەو چوار چێوەیەی كە ئەو خەڵكە دایناوە، ئنجا دەستووره، یان عورفە، یان بە ئاشكرازانراوەكانی شەریعەتن، ئایا لەو چوارچێوەیەدا كارەكانی خۆیان دەكەن؟ ئایا كەمتەرخەمیی دەكەن؟ ئایا باش كارەكان جێبەجێ دەكەن؟ دەبێ خەڵك چاودێر بێ، ئەوە كە پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) فەرموویەتی: (كلكم راع وكلكم مسؤول عن رعيته) كەواتە: بەرپرسیارێتیی گشتییەو دەبێ هەموویان چاودێر بن، لەڕاستییدا كۆمەڵگا دەبێ ئاوا زیندوو بێ، هۆشیار بێ، چاودێر بێ بەسەر بەرپرسانیەوەو كە چاودێریش دەبێ بە چاكەكاریش بڵێ: چاكت كردو، بە خراپەكار بڵێ: خراپت كرد، ئنجا دەبێ لە كاتی پێویستدا ئیجرائاتیش بكرێ، ئنجا ئەگەر ئەو بەرپرسە كە لارو خوار دەبێ و ستەم دەكات، هەر ڕاست نەبۆوە، دەبێ لاببرێ.

**دانــا: مامۆستا! زۆرجار ده‌سه‌ڵاتداران و لایه‌نه‌ سیاسییه‌كان به‌شێوازێكی گشتی ئه‌وه‌ به‌ میلله‌ت ده‌فرۆشنه‌وه‌ ده‌وترێت: ئێمه‌ شه‌رعییه‌تمان له‌ گه‌له‌وه‌ وه‌رگرتوه‌ و ئه‌وه‌نده‌ كورسیمان هه‌یه‌ و ئه‌وه‌ گه‌له‌ ئێمه‌ی كردوه‌ به‌ حیزبی براوه‌، ئا ئه‌م چوار ساڵه‌ لێمان گه‌ڕێن به‌رنامه‌ی خۆمان جێبه‌جێ ئه‌كه‌ین، یانی میلله‌ت ئه‌بێ تا چوار ساڵ - یان له‌هه‌ر وڵاتێك چه‌ند ساڵ بێ- بوه‌ستێ، تا ئه‌و ده‌سه‌ڵاته‌ به‌رنامه‌كه‌ی جێبه‌جێ ده‌كات، ئنجا ئایا ئه‌وه‌ ڕاسته‌، یان ئه‌گه‌ر وه‌ك جه‌نابت فه‌رمووت بابای لار هه‌ر ڕاست نه‌بووه‌وه‌، دیسانه‌وه‌ خه‌ڵك و جه‌ماوه‌ر ئه‌ركی له‌سه‌ر شانه‌ كه‌ ئه‌و ده‌سه‌ڵاته‌ بگۆڕن؟!**

**مامۆستا:** مادام خه‌ڵك خاوه‌نی ئه‌صڵیی ده‌سه‌ڵاته‌و ئه‌و ئه‌مانه‌ته‌ی سپاردوه‌ به‌و كۆمه‌ڵه‌ خه‌ڵكه‌، ئه‌گه‌ر په‌رله‌مانه‌، ئه‌گه‌ر حكوومه‌ته‌، ئه‌گه‌ر ده‌سته‌ڵاتی دادوه‌رییه‌ و چاودێریشیان ده‌كات بزانێ: چۆن كاره‌كانی خۆیان به‌ڕێوه‌ ده‌به‌ن ! ئایا به‌رژه‌وه‌ندیی گشتی خه‌ڵك دابین ده‌كه‌ن؟ ئایا ماف و ئازادییه‌كان بۆ خه‌ڵك ده‌سته‌به‌ر ده‌كه‌ن؟ ئایا وه‌ڵامگۆی داخوازییه‌ ڕه‌واكانی خه‌ڵكن؟ ئه‌گه‌ر ئا، ده‌بێ خه‌ڵك هاوكار و پشتگیرییان بێ و دوعای خێریشیان بۆ بكات و هانده‌ریان بێ و ده‌ستبار گریان بێ (وتعاونوا على البر والتقوى) چونكه‌ خه‌ڵك دوژمنی ده‌سه‌ڵات نیه‌، ئه‌و به‌رپرس و حوكمڕانانه‌ی كه‌ خۆی دایناون و ئێستا كه‌ له‌ واقیعی هه‌رێمی كوردستاندا خه‌ڵك و ده‌سه‌ڵات كراون به‌ دوو شتی دژ به‌یه‌ك، له‌ وه‌همی هه‌ندێك كه‌سدا وایه‌، به‌ڵام ئه‌وه‌ ڕاست نیه‌و ده‌سته‌ڵات هه‌ر هی خه‌ڵكه‌، نوێنه‌ری خه‌ڵكه‌، ئه‌گه‌ر ده‌سه‌ڵاتێكی ڕاسته‌قینه‌ بێت، ئه‌وانه‌ی كه‌ ده‌بنه‌ به‌رپرس و حوكمڕان، نابێ خۆیان له‌ خه‌ڵك به‌جیا بزانن، چونكه‌ نوێنه‌ری خه‌ڵكن و خه‌ڵك داینانون و ده‌توانێ لاشیان به‌رێ.

ئنجا ئه‌و خه‌ڵك و كۆمه‌ڵگایه‌ كاتێك كه‌ چاودێریی ئه‌و كاربه‌ده‌ستانه‌ ده‌كات كه‌ كاری پێسپاردوون، ئه‌گه‌ر كه‌وتنه‌ ناكۆكیی و مشتومڕه‌وه‌ ده‌بێ مه‌رجیعیه‌تێك هه‌بێت، ته‌رازوویه‌ك هه‌بێت بۆلای بگه‌ڕێنه‌وه‌، خوای په‌روه‌ردگار له‌ سوره‌تی (النساء)دا دوای ئه‌وه‌ی له‌ ئایه‌تی (٥٨)دا پێمان ده‌فه‌رموێ:

﴿ إِنَّ ٱللَّهَ يَأۡمُرُكُمۡ أَن تُؤَدُّواْ ٱلۡأَمَٰنَٰتِ إِلَىٰٓ أَهۡلِهَا وَإِذَا حَكَمۡتُم بَيۡنَ ٱلنَّاسِ أَن تَحۡكُمُواْ بِٱلۡعَدۡلِۚ ﴾ (النساء: ٥٨)

كە ئەوە بە دەسەڵاتی دادوەریی دەفەرموویێت، یاخود بە كۆی بەرپرسان دەفەرمووێ : (إِنَّ ٱللَّهَ نِعِمَّا يَعِظُكُم بِهِۦٓ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ سَمِيعَۢا بَصِيرًا)، بێگومان خوا ئەوەی ئامۆژگارییتانی پێ دەكات، ئەوە باشترین شتە، خوا بیسەری بینەرە.

دوایی دەفەرموێ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَأَطِيعُواْ ٱلرَّسُولَ وَأُوْلِي ٱلْأَمْرِ مِنكُمْۖ﴾ [النساء : ٥٩]

ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! فەرمانبەریی خوا بكەن و فەرمانبەریی پێغەمبەر بكەن و هی كاربەدەستانێك كە لە خۆتانن، كاربەدەستانێك كە خۆتان داتان ناون و لە خۆتانن، (فَإِن تَنَٰزَعۡتُمۡ فِي شَيۡءٖ) ئنجا ئەگەر لە شتێكدا كەوتنە ناكۆكییەوە، وەك ئەوەی جەنابت دەپرسی : خەڵك و جەماوەر دەڵێن: ئەو دامەزراوەیە: پەرلەمانە، حكوومەتە، دەستەڵاتی دادوەریی یە، هەرچی هەیە، وەك ئێمە دەمانەوێ : بەرژەوەندییەكانی ئێمە دابین ناكات و، گیرۆدە بووە بە گەندەڵیی، بە قۆرخكاریی، دەبێتە مشتومڕ لە نێوانیاندا، چارەسەر چییە؟ (فَإِن تَنَٰزَعۡتُمۡ فِي شَيۡءٖ) ئەگەر لە شتێك دا كەوتنە ناكۆكییەوە، واتە: خەڵك و حوكمڕانان و بەرپرسان (فَرُدُّوهُ إِلَى ٱللَّهِ وَٱلرَّسُولِ) بیگێڕنەوە بۆ لای خوا و پێغەمبەری خوا (علیه الصلاة والسلام)، یانی: بۆ لای قورئان و سوننەت، بۆ لای شەریعەت، مەرجیعیەتی كۆمەڵگایەكی مسوڵمان، بریتیە لە شەریعەت، نەگۆڕەكانی شەریعەت و، چوارچێوەی فراوانی شەریعەت، ئنجا خوا دەفەرموێ: (إِن كُنتُمۡ تُؤۡمِنُونَ بِٱللَّهِ وَٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِۚ) ئەگەر ئێوە بڕواتان بە خوا و بە رۆژی دوایی هەیە.

یانی: ئەگەر بڕوادار بن دەبێ فەرمانبەریی خوا بكەن و، فەرمانبەریی پێغەمبەر بكەن، وە هی كاربەدەستانێك كە لە خۆتانن و، ئەگەر كەوتنە كێشە و مشتومڕیشەوە بیگێڕنەوە بۆ تەرازووی قورئان و سوننەت، دوایی دەفەرموێ: (ذَٰلِكَ خَيۡرٞ وَأَحۡسَنُ تَأۡوِيلًا) [النساء: ٥٩] ئا ئەوە باشترەو سەرئەنجامیشی چاكترە.

ئێستا لەم ڕۆژگارەماندا وایە: پەرلەمان هەڵدەبژێردرێ و، حكوومەت تەشكیل دەكرێ، دەبێ خەڵك وە جەماوەر چاوەڕێ بكەن داخۆ ئەو نوێنەرانەی خەڵك و جەماوەر چۆن مومارەسەری دەسەڵاتەكانی خۆیان دەكەن، ئەگەر بەشێوەیەكی

چاك و ڕێك و ڕاست بوو، ئەوە دەستخۆشیی و دوعای خێر و هاوكاری و دەستبارگرتنیانیان لەسەر پێویستە، بەڵام ئەگەر لایاندا، وەك ئایەتەكە ئاماژەی پێداوە: (فَإِن تَنَٰزَعۡتُمۡ فِي شَيۡءٖ) دەبێ بگەڕێنەوە بۆ لای تەرازووی قورئان و سوننەت، ئنجا ئایا قورئان و سوننەت لەو بارەوە چی دەفەرموون؟ خوا (عزوجل) ئاوای فەرمووە: لە سورەتی (البقرة)دا:

﴿وَإِذِ ٱبۡتَلَىٰٓ إِبۡرَٰهِـۧمَ رَبُّهُۥ بِكَلِمَٰتٖ فَأَتَمَّهُنَّۖ قَالَ إِنِّي جَاعِلُكَ لِلنَّاسِ إِمَامٗاۖ قَالَ وَمِن ذُرِّيَّتِيۖ قَالَ لَا يَنَالُ عَهۡدِي ٱلظَّـٰلِمِينَ﴾ [البقرة: ١٢٤]

واتە: یادبكەوە كاتێك پەروەردگاری ئیبراهیم، ئیبراهیمی بە چەند ئەركێك تاقی كردەوە، ئەویش تەواوی كردن {لە كلّ دەرچوو و هەموو ئەركەكانی جێبەجێ كرد بە ڕێكیی}، (قَالَ إِنِّي جَاعِلُكَ لِلنَّاسِ إِمَامٗاۖ) خوا فەرمووی: من دەمەوێ بتگێڕم بە پێشەوا بۆ خەڵك، (قَالَ وَمِن ذُرِّيَّتِيۖ) گوتی: ئەدی لە وەچەكەم، {ئەوانیش لە دوای من دەبن بە پێشەوا}؟! (قَالَ لَا يَنَالُ عَهۡدِي ٱلظَّـٰلِمِينَ) خوا فەرمووی: پەیمانی من ستەمكاران ناگرێتەوە، واتە: لە وەچەكەت ئەوەی كە دادگەرو ڕێك بێ، ئەوە بەڵێ، بەڵام ئەوەی ڕێك نەبێ و ئەوەی ستەمكار بێ، نایگرێتەوە. زانایانی بواری سیاسەتی شەرعیی ئەم ڕستە قورئانییە، دەكەنە بەڵگە لەسەر ئەوە كە هەركەسێك ستەمكار بێت، دروست نیە بكرێتە بەرپرس، هەروەها دوای ئەوەی كە دەچێتە سەر كورسی حوكمڕانیی، دەستی كرد بە ستەم و لادان و جەور و جەفا، ئەوە لەسەر خەڵك پێویستە كە لایبدات، پێی دەڵێن: وەرە! تۆمان بە مەرجی دادگەربوون داناوە، خوا فەرموویەتی: (وَإِذَا حَكَمۡتُم بَيۡنَ ٱلنَّاسِ أَن تَحۡكُمُواْ بِٱلۡعَدۡلِ) بۆیە ئەو ئەمانەتەمان پێ سپاردووی كە بە دادگەرانە حوكم بكەی، بەڵام تۆ ئێستا زوڵم دەكەی، لەبەرئەوە شایستەی ئەوێ نی، چونكە خوا دەفەرموێ: (لَا يَنَالُ عَهۡدِي ٱلظَّـٰلِمِينَ) پەیمانی من ستەمكاران ناگرێتەوە، هەروەها فەرموویەتی:

﴿أَلَا لَعۡنَةُ ٱللَّهِ عَلَى ٱلظَّـٰلِمِينَ ١٨﴾ [هود: ١٨]

نەفرینی خوا لە ستەمكارانە، ئایا كەسێكیش خوا لەعنەتی لێ كردبێ، بەكەڵكی ئەوە دێ، بەرپرسی خەڵكێكی مسوڵمان بێ ؟ كەواتە: ڕاستە دەبێت لێیان گەڕێن دەورەی خۆیان تەواو بكەن، بەڵام بەمەرجێك لەسەر ڕێی ڕاست بڕۆن، چونكە ئەوەندە بەس نیە كە ڕەوایەتیی وەربگری، دەبێ بەشێوەیەكی ڕەواش حوكمڕانیی بكەی، ڕەوایەتیی وەرگرتن شتێكە، بەڵام پاراستنی ڕەوایەتیی لەخۆدا و بەشێوەیەكی ڕەوا و ڕاست حوكمڕانیی كردنیش، شتێكی دیكەیە، دەبێ ئەویش هەبێت.

**دانـــا: مامۆستا! ئێمە زۆر باسی دەسەڵاتدارانمان كردوە، ئنجا لەبەرئەوەی ئاڵقەی ئەمجارەمان پەیوەستە بە خەڵك و جەماوەرەوە، با پرسیارێكی جیددییش لەسەر خەڵك و جەماوەر بكەین، بە تێڕامانی جەنابت لە چەند ساڵی ڕابردووی هەرێمی كوردستان دا، خەڵك و جەماوەرو هاووڵاتییان، توانیویانە ئەو ئەمانەتە بدەنە دەست خەڵكی شایستەی خۆی كە حوكمدارییان بكات، دەسەڵاتیان بۆ بەڕێوەبەرێت؟**

**مامۆستا:** لە وەڵامدا دەڵێم: نەخێر، نەخێرەكە دوو خەتیشی بەژێردا بێنە، لەڕاستییدا ئەم واقیعەی ئێستا دەیبینین، ئەوە كردەی دەستی ئەو خەڵك و جەماوەرەیە، ئنجا من لێرە یەك شت بڵێم، كە بەرپرسان كەم وایە بیڵێن، ئەویش ئەوەیە كە زۆربەی بەرپرسان لە قەراری دڵی خۆیاندا، ڕەخنەیان زۆرە لە خەڵك و جەماوەر، كە زۆرێك لە خەڵك و جەماوەر، ناڵێین هەموویان، بە زۆر فیتووان هەڵدەپەڕن و، لە كوێوە با هات لەوێوە شەن دەكەن، وەك گوڵەبەڕۆژە وان، بەرژەوەندیی لەكوێ بێ، ڕوو لەوێ دەكەن، یانی خەڵك و جەماوەرێكی بەوشێوەیە زۆرەو، ئەوەش ڕاستییەكەی تاڵە دەبێ بگوترێ، كە كەم لەبەرپرسان دەیڵێن، زۆربەی بەرپرسان دەبینین هەر تەمەللوق و ماستاو بۆ خەڵك دەكەن! بەڵام دەبێ ئێمە وەك ئەو پەندە دەڵێ: (إنَّ رائدَ القومِ لا يكذبُ أهلهُ)، دەمڕاست و پێشڕەوی كۆمەڵێك، خەڵكێك، درۆیان لەگەڵدا ناكات، هەروەها گوتراوە: (صديقُكَ مَنْ صَدَقَكَ، لا مَنْ صَدَّقَكَ) هاوەڵەكەت ئەو كەسەیە كە لەگەڵت ڕاست دەكات، نەك هەر بڵێ: ڕاست دەكەی، دەبێ ئەو ڕاستییە بە خەڵك بگوترێ، كە: ئەی خەڵك و جەماوەری هەرێمی كوردستان و عێراق بەگشتی! ئەوە ئێوەن كە پشكی شێرتان پێ

دەبڕێ، لەكاتێكدا كە كەسانێك دەكەنە حوكمڕان و كاربەدەستی خۆتان، چونكە تەماعتان لەو پارەیەدا هەیە كە لەبەردەستیانە، تەماعتان لەو ئیمتیازە ماددیی و مەعنەوییانەدا هەیە كە پێیانە، نەك متمانە و باوەڕتان ببێ بە كەسایەتییان، بە ئیمان و عەقیدەیان، بە ڕێباز و بەرنامەیان، بە هەڵوێستیان، بەڵكو بۆیە دەنگیان پێ دەدەن، تەماعتان تێیاندا هەیە، تەماعتان لەو پارە و سەروەت و سامان و ئیمتیازە ماددیی و مەعنەوییە ناشەرعییانەدا هەیە، كە پێتان دەدەن، تەخشان و پەخشانی پێ دەكەن!

خەڵكێك لە بەرپرسانی خوارێ و لە خەڵك و جەماوەر، دێن، دیارە ئێمە تێكەڵییمان لەگەڵ خەڵك و جەماوەردا زۆرە، هەیە دەڵێ: من تەزویری زۆرم كردوە بۆ فلان حیزب، هەیە دەڵێ: من دوو سێ معاش وەردەگرم، یان چەند زەوییان پێداوم، بەڵام دەزانم حەلاڵ نیە، ئەدی چی، بۆ وەریدەگری؟ هەیە دەڵێ: ئەوەندە كەسم لە خزمەكانی خۆم تەعین كردوون و، هەبووە ناحەقیش بووە، ئەدی بۆ وات كردوە؟ ئەو بەرپرسەی كە تۆ لەگەڵیدای، كە كەسی وەك تۆ مشەخۆری لەپەنادایە، دڵی بەتۆ خۆشە، بۆیە وڵاتەكەی ئاوای لێ دێ! ڕاستە خەڵك و جەماوەر بەوەندە لێی ناچنە دەر، كە هەر ڕەخنە بگرن لە حوكمڕانان، دەبێ پێش هەڵبژاردنی نوێنەرانیان كە دوایی دەبتە بەرپرسی وڵات، خۆیان باش سەرنج بدەن :

﴿ إِنَّ ٱللَّهَ يَأۡمُرُكُمۡ أَن تُؤَدُّواْ ٱلۡأَمَٰنَٰتِ إِلَىٰٓ أَهۡلِهَا ﴾ دەبێ چاوبگێڕن، بە خەڵكی شایستەی خۆی، ئەركی بەرپرسیارێتیی و حوكمڕانیی بسپێرن، دواییش بەوەندە تەواو نابێ، كە ئەو كەسە شایستەیە، دەبێ بەسەریشیەوە چاودێر بن، دەبێ چاویش بن بەسەریەوەو، فەرمان بە چاكە و نەهی لە خراپەشی لەگەڵدا بكەن و، هەوڵبدەن ڕاستیشی بكەنەوە ئەگەر لار بوو، بگرە ئەگەر پێویستیشی كرد، لاشیبدەن، ئەوە ئەركی خەڵكە، بەڵام كاتێك كە خەڵك هەر لە ڕێوە ئەو ئەركە، ئەو ئەمانەتە زایە دەكات، بە كەسی ناشایستەی دەسپێرێ، پاشانیش بەسەریەوە چاودێر نیە، بەڵكو بۆی دەبێتە دەهۆڵ كوت و ماستاوچیی، دواییش ئامادە نیە دان بە هەڵەی خۆشیدا بێنێ، ئەوە لەڕاستییدا خەڵك و جەماوەر دەبێ زۆرچاك

بزانیّ، وەك بەرزەکی بانان، نە لە دنیا نە لە قیامەت، بۆی دەرناچیّ، با زۆر لەبەرپرسانیش ئەو ڕاستییانە نەڵێن، هەر بڵێن خەڵك و جەماوەر ئاوایە و ئاوا چاکە و شاخی وا و باڵی وا، باشە ئەگەر ئەو خەڵك و جەماوەرە هەمووی هێندە چاکە، هێندە عاقڵە، هێندە ڕەشیدە، ئەو حوکمڕانانە چین؟ چۆن ئەو ئەمانەتەیان بەو کەسانە سپاردوە، کە بە ڕێی غەڵەت و هەڵدێریدا دەبەن؟! کەواتە: بەرپرسیارێتییەکە لەسەر شانی هەمووانە لە دنیا و قیامەتدا.

**دانـــا: مامۆستا! لەکاتێکدا خەڵك و جەماوەریش لێرە و لەویّ بەجۆرێك لە جۆرەکان دەنگی ناڕەزاییەتی و دەنگی مەزلوومییەتی خۆی هەڵئەبڕیّ، ئێستە بەنموونە ئەگەر بیخەینە سەر واقیعی هەرێمی کوردستان، بۆ نموونە: ئێستا لە ناوچەکانی سلێمانی و هەڵەبجە، لە ئیدارەی گەرمیان و ڕاپەرین، خەڵکێك بەجۆرێك لە جۆرەکان، بۆ قووتی خۆی بۆ مووچەی خۆی لەسەر شەقامە، بەڵام لە لایەن دەسەڵاتداران و هەندیّ لەلایەنە سیاسییەکانەوە، تۆمەتیان بۆ دروست دەکریّ، کە ئەمە دەستی سیاسییان لە پشتە و ئەمە.. ئیتر زۆر قسەیان بۆ دروست دەکریّ، سەبارەت بەمە ئەڵێی چی ؟**

**مامۆستا:** لەوبارەوە دەڵێم: لەڕاستییدا خەڵك حەقی خۆیەتی ڕەخنە بگرێت لە دەستەڵات، لە حوکمڕانان و تێیان بگەیەنیّ بەو شێوازەی کە خۆی بە گونجاوی دەزانێت، کە لە کردار و ڕەفتاریان ناڕازییە، ئنجا ئەگەر خۆپێشاندانە، ئەگەر مانگرتنە، ئەگەر نووسینە، ئەگەر وتاردانە، خەڵك مافی خۆیەتی، تۆ یان دەبیّ ئەو ڕێیە پێشانی خەڵك بدەی، ڕێی ڕەخنەگرتن و ڕاستکردنەوەی دەستەڵات و هۆشدارییدان بە دەستەڵات، بەشێوەیەکی مەدەنییانە و شارستانییانە، یان ئەوەتا تۆ ناچاریان دەکەی کە بیر لە شتی دیکە بکەنەوە، بیر لە ڕاپەڕین و کودەتا بکەنەوە، بیر لە یاخیبوونی سەربازیی بکەنەوە، کە ئەوەش بە تەئکید هەم لە رووی شەرعییەوە، شتێکی ڕەوا و دروست نیە، هەم لەڕووی واقیعی ئێستای چ هەرێمی کوردستان چ وڵاتانی ئیسلامییەوە بە گشتی، تەجرەبە کراوە کە پەنابردنە بەر زەبرو هێز بۆ چاککردنی کۆمەڵگا و بۆ ڕاستکردنەوەی بەرپرسان، ئەنجامی زۆر خراپی لێدەکەوێتەوە، هەم بۆ خەڵك و جەماوەرو هەم بۆ دەستەڵات و هەم بۆ کۆی دەوڵەت و قەوارە سیاسییەکەش، بۆیە ئەو جۆرە کەسانەی کە

كاتێك خەڵك داوای مافی دەكات و ڕەخنە دەگرێت و خۆپێشاندان دەكات، بەتایبەت خۆپیشاندانی شارستانییانە و هێمنانە و ژیرانە، خەڵك تۆمەتبار دەكەن، هەڵوێستەكەیانم پێ هەڵەو بێ جێیە، چونكە :

**یەكەم:** دەبوایە ئەوەی كە داوای دەكەن، پێش ئەوەی، ناچاریان بكەن خۆپێشاندان بكەن، ئەو مافانەیان بۆ دابین بكەن، بەعزە بەرپرسێك بەس پێی خۆشە ناوەكەی لەسەر بێ، ئاخر برادەر! ئەو ناونیشانەی لەسەر تۆیە ئەوە كۆمەڵێك شت داخواز دەكات، تۆ دیارە هەر بەوەندە قەناعەتت كردوە، كە ناوەكەت لەسەر بێ و لەسەر كورسییەكەت بی ! ئاخر چوونە سەر ئەو كورسییە و ئەو ناوونیشانە كۆمەڵیك داخوازیی هەن، تۆ لێی وەرە خوارێ، خەڵك كێشەی لەگەڵ تۆ نابێت، حكوومەت مەبە تاكو خەڵك ڕەخنەت لێ نەگرێ، پەرلەمان مەبە تاكو خەڵك داواكاریی لێت نەبێ! بەڵام تۆ ناوونیشانێكی گەورەت لەسەر خۆت هەڵداوە و، دەشتەوێ خەڵك داوات لێ نەكات!

**دووەم:** لە كاتێك دا ماف و پێداویستییەكانی خەڵك دابین نەكران و گەندەڵیی و كەمتەرخەمی كرا، خەڵك وەك داواكردنێكی شارستانییانەی مافێكی سروشتی خۆی خۆپێشاندان دەكات، من لەجێی ئەو بەرپرسانە بم، دێمە سەر تەلەفزیۆن زۆر بوێرانە و ڕاشكاوانە، دەڵێم: خەڵكینە حەقتانە، من داوای لێبوردنم هەیە، بەناوی هەموو ئەو خەڵكەی لەژێر دەسەڵاتی مندان، ئە وبەرپرسانەوە، داوای لێبوردنم هەیە، ئێوە حەقی خۆتانە، مافی ڕەوای خۆتانە، خواش پشتیوان بێ، بە هیممەتی هەموو لایەك، چی پێمان بكرێ، دەیكەین.

**سێیەم:** دەبێ بە جیددیی چاو بگێڕدرێتەوە بە دامەزراوەكان و بە دام ودەزگاكانداو، چاكسازیی ڕیشەیی بكرێ، ناكرێ هەموو ڕۆژێ خەڵك خۆپێشاندان بكات و تۆ داوای لێبوردن بكەی، ئەوەش هەر ناكرێ، بەڵكو دەبێ بزانی داخۆ خەلەل لەكوێوەیە، تاكو چارەسەری بكەی، ئەوە ئەگەر بمانەوێ خاوەنی كۆمەڵگایەكی تەندروست بین، خاوەنی قەوارەیەكی سیاسی ڕێك و پێك بین، دەبێ بەو شێوەیە مامەڵە بكرێ، ئەمما خەڵك قسە بڵێ بە دەستەڵات و دەسەڵات خەڵك و جەماوەر تۆمەتبار بكات، وەك ئایەتەكە دەفەرموێ:

﴿كُلَّمَا دَخَلَتۡ أُمَّةٞ لَّعَنَتۡ أُخۡتَهَاۖ﴾ [الأعراف: ٣٨]

كە لێرەدا خوای پەروەردگار باسی ئەهلی دۆزەخ دەكات، دەفەرموێ: هەر كە كۆمەڵێك چوونە نێو دۆزەخەوە، نەفرین لەوانی دیكە دەكەن، دەڵێن: خەتای ئێوە بوو! ئێمە بەو شێوەیە ناگەین بە هیچ، بەڵكو بەوە دەگەینە ئامانج، كە هەركەسە ئیش و كاری خۆی بكات و ئەركی سەرشانی خۆی جێبەجێ بكات.

**دانـــا: وەك سیاسییەك، وەك نووسەرێك ڕووناكبیرێك، حەزدەكەم ڕای تۆ بزانم لەسەر ئەوە كە هەندێ كەس و هەندێ لایەن بە خۆپیشاندەران دەڵێن (فوچووی)، یان كۆمەڵێ ناوو ناتۆرەی تر، تۆ خۆپیشاندان بە فەوزا ئەبینیت؟**

**مامۆستا:** پێموایە خۆپێشاندان ئەوەی كە دەكرێ و تا ئێستا بینیومانە لەم ڕۆژانەدا، خۆپێشاندانی مامۆستایان بەتایبەتی، مامۆستایانی زانكۆ تاكو مامۆستای بنەڕەتیی، بەڕاستی زۆر شارستانییانە و مەدەنییانە و زۆر ڕێك و پێك دەیبینم، نە هێرشكراوەتەوە سەر بنكە و بارەگای كەس، نە دوكان و بازاڕ سووتێنراوە، نە شتی خراپ كراوە، دەبێ دەستخۆشیی لەو خەڵكە بكرێ، ئەمە نەك ئاژاوەگێڕیی نیە، بەڵكو شێوازێكی شەرعییانە و شارستانییانەیە بۆ داواكردنی مافی خۆت، بۆ هۆشداریی دان بە حوكمڕان و بەرپرسان، كە ئێمە ناڕازیین لە ئێوە، لە ئەدای ئێوە، لە شێوازی حوكمڕانیی ئێوە.

**دانـــا: مامۆستای بەڕێز هەرچەندە باستكرد، بەڵام ئەمەوێ وەكو كورتەیەكیش ئاماژەی پێ بكەیتەوە بۆ ئەوەی كە لەلای خەڵك و جەماوەر بچەسپێ، با بگەڕێینەوە بۆ قورئان و سوننەت، بەرپرسیارێتیی لەنێوان جەماوەر و دەسەڵاتداران دا، لای كامیانە بەزۆریی، كامیان بەرپرسی سەرەكیین؟**

**مامۆستا:** بەرپرسی سەرەكیی خەڵك و جەماوەرە، چونكە حوكمڕان و بەرپرسان نوێنەری خەڵكن، كە دەڵێم: بەرپرسی سەرەكیی، مەبەستم ئەوە نیە ئەگەر وەزعێك خراپ بوو، گلەیی لە خەڵك بكەی، نا، بەڵكو مەبەستم ئەوەیە كە بەرپرسان نابێ پێیان وابێ ئاسمان كونی تێ بووەو ئەوانیش هاتوونەتە خوار! نابێ پێیان

وابێ ڕەوایەتییەكە موڵكی خۆیانە، یاخود بە میرات بۆیان بەجێماوە، دەبێ بزانن ئەوان نوێنەری خەڵكن و كاربەدەستی خەڵكن، خەڵك ئەو كاربەدەستانەی داناوە.

بەڵام ئەدی كاتێك كە دامەزراوەیەك دام ودەزگایەك، یەكێك لە سێ دەسەڵاتەكان، یان هەرسێكیان، هەڵەو پەڵەو كەموكوڕییان تێدەكەوێ، هەر خەڵك و جەماوەر بەرپرسیارە؟ نە و، خەڵك و جەماوەر بەرپرسیارە ئەگەر كەسانێكی ناشایستی كردبێتە بەرپرس، یاخود بە شایستەی زانیبن، بەڵام بەهەڵەدا چووبێ، یاخود با شایستەش بوون لە واقیع دا، بەڵام دوایی لابدەن و خەڵك و جەماوەریش لێی بێدەنگ بێ، لەو كاتەدا خەڵك و جەماوەر بەرپرسیارە و گوناهبارە، بەڵام كاتێك كە خەڵك ڕەخنە دەگرێ، گلەیی دەكات، خۆپیشاندان دەكات، ماندەگرێ، لەو شێوە ئیدارەدانی وڵاتە، یان بەرانبەر بەو دامەزراوە و دەزگایەو، ئەویش هەر بەردەوام دەبێ لەسەر هەڵەكانی خۆی، بە تەئكید لەو حاڵەتەدا هەموو بەرپرسیارێتییەكە لە ئەستۆی ئەو لایەنەدایە كە ئەو كارەی پێسپێردراوەو وەك پێویست جێبەجێی ناكات، خوا سبحانه وتعالى لە سوورەتی (المائدة)دا دەفەرموێ:

﴿ لُعِنَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ مِنۢ بَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ عَلَىٰ لِسَانِ دَاوُۥدَ وَعِيسَى ٱبۡنِ مَرۡيَمَۚ ذَٰلِكَ بِمَا عَصَواْ وَّكَانُواْ يَعۡتَدُونَ ٧٨ كَانُواْ لَا يَتَنَاهَوۡنَ عَن مُّنكَرٖ فَعَلُوهُۚ لَبِئۡسَ مَا كَانُواْ يَفۡعَلُونَ ٧٩ ﴾ [المائدة: ٧٨ـ ٧٩]

واتە: لەسەر زمانی داوود و عیسای كوڕی مەریەم، نەفرین كرا لەوانەی، بێ بڕوابوون لە وەچەی ئیسرائیل (مَرۡيَمَۚ ذَٰلِكَ بِمَا عَصَواْ وَّكَانُواْ يَعۡتَدُونَ) ئەویش بەهۆی ئەوەوە كە سەرپێچییان كرد و سنوورشكێنییان كرد، ئایا سنوورشكێنیی و سەرپێچییەكەیان چی بوو؟ (كَانُواْ لَا يَتَنَاهَوۡنَ عَن مُّنكَرٖ فَعَلُوهُۚ لَبِئۡسَ مَا كَانُواْ يَفۡعَلُونَ) یەكدییان نەدەگێڕایەوە لە خراپەیەك كە ئەنجامیان دەدا، ئەوە خراپترین كردەوە بوو كە دەیانكرد.

واته: ده‌بێ خه‌ڵك ده‌ستی یه‌كدی بگرێ، خه‌ڵك و جه‌ماوه‌ر ده‌ستی حوكمڕان و به‌رپرسان بگرێ له‌ به‌رانبه‌ر خراپه‌و سته‌م دا، بۆیه‌ زۆر جێی سه‌رسوڕمانه‌ ڕه‌خنه‌بگیرێ و تۆمه‌ت و بوختان سازبكرێ ده‌رهه‌ق به‌ خه‌ڵكێك كه‌ له‌تاو ئازاری خۆی، له‌به‌ر برسێتیی خۆی، له‌به‌ر ئیحتیاجیی خۆی، دێته‌ سه‌ر جاده‌، ئاخر چۆن ده‌بێ ڕه‌خنه‌ له‌و ده‌سه‌ڵاته‌ نه‌گیرێ، له‌و حوكمڕان و به‌رپرسانه‌، كه‌ پێداویستییه‌كانی ژیانی ئه‌و خه‌ڵكه‌ دابین ناكه‌ن، یان لانی كه‌م نایه‌ن عوزریان بۆ ناهێننه‌وه‌، بۆیان ڕوون ناكه‌نه‌وه‌و داوای لێبوردنیان لێ ناكه‌ن؟ ئاخر ئینسان ئه‌گه‌ر نه‌یتوانی كارێك بۆ خه‌ڵكێك جێبه‌جێ بكات، ده‌بێ داوای لێبوردنیان لێ بكات، عوزریان بۆ بێنێته‌وه‌، بۆیان ڕوون بكاته‌وه‌، به‌ڵام به‌رپرسانی ئه‌م وڵاته‌، به‌ ئه‌ركی سه‌رشانی خۆیان هه‌ڵناسن، پێداویستییه‌كانی خه‌ڵك دابین ناكه‌ن، كاتێكیش خه‌ڵك ڕه‌خنه‌یان لێ ده‌گیرێ له‌جیاتی ئه‌وه‌ی داوای لێبوردن له‌ خه‌ڵك بكه‌ن و، بۆیان ڕوون بكه‌نه‌وه‌ و ئیقناعیان بكه‌ن و، دڵیان خۆش بكه‌ن، كه‌چی تۆمه‌تباریشیان ده‌كه‌ن، به‌ڕاستی ئه‌وه‌ شتێكی زۆر نامه‌نتیقییه‌و، ده‌رهاویشته‌ی زۆر خراپیشی ده‌بن، لێره‌شه‌وه‌ به‌ هه‌موو لایه‌كی ڕاده‌گه‌یه‌نم زۆر زۆرم پێناخۆشه‌ به‌رپرسێك له‌م وڵاته‌دا، هه‌ركه‌سێك بێت، له‌هه‌ر حیزبێك بێ، هه‌ر ئینتیمایه‌كی سیاسی هه‌بێ، كه‌ قسه‌ی ناخۆش و سه‌قه‌ت ده‌كات.



**دانـــا:** بۆ پێت نـاخـــۆشـــه‌؟

**مامۆستا:** بۆیه‌ پێم ناخۆشه‌، چونكه‌ :

١) قسه‌ی خراپ، قسه‌یه‌ك كه‌ حسابی بۆ نه‌كرابێ، قسه‌یه‌ك كه‌ دڵی خه‌ڵك ناڕه‌حه‌ت بكات، به‌تایبه‌تی خه‌ڵك و جه‌ماوه‌رێكی ڕقهه‌ڵساو، خه‌ڵك و جه‌ماوه‌رێكی بێزار و تووڕه‌، خه‌ڵك و جه‌ماوه‌رێك كه‌ مافه‌كه‌ی خۆی نابینێ و سه‌دو یه‌ك گرفت و كێشه‌ی هه‌یه‌ كه‌چی له‌جیاتی ئه‌وه‌ی دڵی خۆش بكه‌ی و داوای لێبوردنی لێ بكه‌ی، قسه‌شی پێ بڵێی وه‌ نائومێدی بكه‌ی، زۆر زۆر خراپه‌و بۆیه‌ش پێمناخۆشه‌، چونكه‌ ده‌زانم ئه‌و به‌رپرسه‌ خۆی زه‌ره‌ر ده‌كات و، پێمناخۆشه‌ هیچ كه‌س زه‌ره‌ر بكات.

**٢)** ئەو خەڵك و جەماوەرەش زیاتر نائومێد دەبێ و، له ئەنجامی نائومێد بوون و زیاتر بێزاربوونیش دا، وەك من لەو زنجیرە وتارەدا كه با "گوێ له قورئان بگرین"دا باسم كردوە، خەڵك بیر له هەزار شت دەكاتەوە، هەڵبەتە كۆمەڵگایەكانیش كه شیرازەیان تێكچووەو تێكدەچێ، لەئەنجامی ئەوەدایه كه خەڵك ئومێدی نامێنێ به چاكسازیی، ئومێدی نامێنێ به ڕاستبوونەوەی بارودۆخە لارەكان.

**دانـــا: كەوابێ تۆ له سەرەنجامەكەی دەترسی؟**

**مامۆستا:** له سەرەنجامەكەی دەترسێم و هەر پێشمناخۆشە هیچ كەس زەرەر بكات، خوا ئاگادارە من پێمخۆشە هەركەسێك هەر بەرپرسیارێتییەكی لەم وڵاتەدا هەیە، شتێكی غەڵەت نەڵێ، شتێكی غەڵەت نەكات، بۆچی؟! یەكەم تاكو خۆی زەرەر نەكات، چونكه دەبێ ئێمە خێر و چاكەمان بۆ یەكدی بوێ، (الدين النصيحه)رواه المسلم. دینداریی بریتییە له دڵسۆزیی بۆ هەموو لایەك، بۆ هەموو كەس، پێغەمبەرانیش (عليهم الصلاة والسلام) به خەڵكە كافرەكەی خۆیانیان گوتوە:

﴿ وَأَنَا لَكُمْ نَاصِحٌ أَمِينٌ ﴾ (الأعراف: ٦٨)

ئێمەش دەبێ بۆ خەڵكی مسوڵمان و بۆ بەرپرسانێك كه خۆیان به مسوڵمان دەزانن و، لەنێو وڵاتێكی مسوڵماندان، دەبێ دڵسۆزییمان بۆیان هەبێ، دەبێ پەرۆشمان بن و به تەنگیانەوە بین.

پاشان من تەماشا دەكەم ئەو قسە خراپانەی كه دەكرێن له كەناڵەكانی ڕاگەیاندنەوە لەلایەن بەرپرسانەوە، بارودۆخەكە هەر گرژ و ئاڵۆز دەكەن، دوایی تۆ كه جار جار بیرێك دەكەیەوە، قسەیەكی خێر بكەی، هەنگاوێكی خێر بنێی، تەماشا دەكەی وەزعەكە وا ئاڵقێنراوەو وا عاصێ كراوە، ئەوەندە كۆسپ و لەمپەر دانراون، نازانی لەكوێوە دەستی بۆ بەری، نازانی چی بكەی، ڕۆژ به ڕۆژ وەزعەكان ئاڵۆزتر دەبن، خراپتر دەبن، گرژییەكە زیاتر دەبێ، وەك چۆن كەسێك له ئەنجامی سەرمابووندا تووشی گرژبوون (تشنج) دەبێ، كەچی دوایی دەچێ خۆی دەداتە بەر سەرمای زیاتر، هەر یەكجاریی دەمارەكانی سواری

یەكدی دەبن و ئەوەندە گرژ دەبێ هەموو لەشی دادەگیرێ، ئەو كۆمەڵگایەی ئێمەش ڕۆژ بە ڕۆژ بەداخەوە بە هۆی قسەكردنی حساب بۆ نەكراوی هەندێك لە بەرپرسانەوە، ڕۆژ بە ڕۆژ بارگرژیی و ئاڵۆزییەكەی و لێكئاڵانەكەی و عاصێبوونەكەی زیاتر دەبێ.

**دانـــا: پرسیارێك، ئێستا لەوانەیە بینەر لای سەیر بێ كە من ئەم پرسیارە دەكەم: ئەكرێ چەوسێنراوان و خۆبەزلگران، هەردووكیان بە ستەمكار ناوزەد بكەین؟ ئەكرێ بڵێین: هەردووكیان سزایان هەیە؟ ئەگەر ئەم وێنەیە وایە، من حەز دەكەم بۆ من و بۆ بینەرانی ڕوون بكەیتەوە؟!**

**مامۆستا:** بەڵێ، لە قورئاندا خوای دادگەر لە سورەتی (سبأ) لە ئایەتی (٣١) دا هەردووكیانی بە ستەمكار ناو هێناوە، هەم (الذین استضعفوا) هەم (الذین اسكتبروا).

﴿ وَلَوْ تَرَىٰٓ إِذِ ٱلظَّٰلِمُونَ مَوْقُوفُونَ عِندَ رَبِّهِمْ يَرْجِعُ بَعْضُهُمْ إِلَىٰ بَعْضٍ ٱلْقَوْلَ يَقُولُ ٱلَّذِينَ ٱسْتُضْعِفُوا۟ لِلَّذِينَ ٱسْتَكْبَرُوا۟ لَوْلَآ أَنتُمْ لَكُنَّا مُؤْمِنِينَ ﴿٣١﴾ ﴾

(سبأ :٣١).

**دانـــا: چۆن ئەوەش كە زوڵمی لێ دەكرێ، هەر ستەمكارە؟**

**مامۆستا:** لەبەر ئەوەی كە بەهۆی بێ هەڵوێستیی ئەو چەوسێندراوانەوەو بەهۆی بێدەنگییانەوە ئەو ستەمكارییە تەشەنەی كردووە. بۆیەش گوتم: كاتێك خەڵك خۆپیشاندان دەكات، ماندەگرێ، ڕەخنەدەگرێ، ئەوە لە ڕاستییدا مافێكی خۆی مومارەسە دەكات، بەڵكو ئەركێكی سەرشانی خۆی جێبەجێ دەكات بەرامبەر بەو حوكمڕان و دەسەڵاتدارانە كە لایانداوە، ئەدی چۆن ئاگاداریان بكاتەوە؟ ئایا سەنگەریان لێ بگرێ و تەقەیان لێ بكات؟ بەڵێ خوای پەروەردگار هەردووكیانی بە ستەمكار ناوناوە، لەبەرچی؟ ستەمكارەكە ئەوە ستەمكارە، بەڵام ئەدی ستەملێكراوەكە؟ ستەملێكراوەش چونكە بێدەنگیی ئەو زەمینەی خۆش كردوە ئەو ستەمكارە پەیدا ببێ، تۆ تەماشا بكە! لە قورئاندا خوای

باڵاده‌ست زۆر باسی فیرعه‌ون ده‌كات، له‌گه‌ڵ مووسادا (علیه الصلاة والسلام)، بۆچی ئه‌و به‌سه‌رهاته‌ له‌ قورئاندا زۆر دووباره‌ بووه‌ته‌وه‌؟ له‌به‌رئه‌وه‌ی حوكمڕانان كاتێك لا ده‌ده‌ن، كه‌ له‌ڕاستییدا لادانی حوكمڕانان له‌ درێژایی مێژووی به‌شه‌ردا، زۆر دووباره‌ بووه‌ته‌وه‌، واته‌: فیرعه‌ونایه‌تیی زۆره‌، جا خوای كارزان كه‌ باسی مووسا ده‌كات، یانی: هه‌ر كات حوكمڕان ڕێچكه‌ی فیرعه‌ونی گرته‌به‌ر، ده‌بێ كه‌سانێكیش هه‌بن كه‌ هه‌ڵوێستی مووسا بگرنه‌به‌ر، دیاره‌ كوده‌تا و ئینقلابی له‌ فیرعه‌ون نه‌كرد، به‌ڵكو خه‌ڵكی هۆشیار كرده‌وه‌، حه‌قی به‌ فیرعه‌ون گوت، ئه‌گه‌رنا په‌نای نه‌برده‌ به‌ر هێز، هه‌ر گۆچانه‌كه‌ی ده‌ستی پێ بوو، به‌ڵام به‌و گۆچانه‌ و به‌و ده‌سته‌ی ئه‌و خه‌ڵكه‌ی هۆشیار و بێدار كرده‌وه‌ به‌ فیرعه‌ونیشی گوت: چیدیكه‌ ئه‌و خه‌ڵكه‌ مه‌چه‌وسێنه‌وه‌!

﴿ فَأَرْسِلْ مَعَنَا بَنِيٓ إِسْرَٰٓءِيلَ وَلَا تُعَذِّبْهُمْۖ ﴾ [طه : ٤٧]

وه‌چه‌ی ئیسرائیلم له‌گه‌ڵدا بنێره‌و چیدیكه‌ مه‌یانچه‌وسێنه‌وه‌!

خوا بۆ تۆی دروست نه‌كردوون، ئه‌وانه‌ به‌نده‌ی خوان، ڕێز و حورمه‌تیان هه‌یه‌ له‌لای خوای به‌خشه‌رو، تۆش هه‌ر به‌نده‌ی خوای، مه‌یانچه‌وسێنه‌وه‌ و زوڵمیان لێ مه‌كه‌، مه‌به‌ستم ئه‌وه‌یه‌: بێده‌نگییه‌ كه‌ سته‌مكاران دروست ده‌كات، نه‌ك سته‌مكاریی بێده‌نگیی دروست بكات، له‌ ئه‌نجامی ئه‌وه‌دا كه‌ خه‌ڵك بێده‌نگ ده‌بێ، فیرعه‌ون بۆچی گوتی: (أنا ربكم الأعلى)؟ ته‌ماشای كرد ئه‌و خه‌ڵكه‌ ئاماده‌ن بیپه‌رستن!

من زۆر به‌زه‌ییم به‌ به‌رپرسانێكدا دێته‌وه‌ كه‌ ده‌وروبه‌رێكیان هه‌یه‌، هه‌ر ده‌هۆڵیان بۆ ده‌كوتن و چه‌پڵه‌یان بۆ لێده‌ده‌ن، ڕۆژێك دوو ڕه‌خنه‌ی لێ ناگرن، ڕۆژێك سه‌رو دڵی ناگرن، دڵسۆزانه‌ پێی بڵێن: ئه‌وه‌ نابێ، به‌و شێوه‌یه‌ قسه‌ مه‌كه‌، ئاوا مه‌ڕۆ، ئاوا هه‌ڵوێست وه‌رمه‌گره‌، ئه‌وه‌ به‌كه‌ڵك نایه‌ت! به‌ڵكو ته‌ماشا ده‌كه‌ن، ئه‌و چی پێخۆشه‌، وای پێده‌ڵێن، نه‌ك ئه‌و چی بۆ چاكه‌، وای پێ بڵێن، كه‌ ئه‌وه‌ خیانه‌ته‌ به‌رامبه‌ر به‌و به‌رپرسانه‌ ده‌كرێت، ئه‌و حاشیه‌و بیگانه‌یه‌ كه‌ ئاوا مامه‌ڵه‌ له‌گه‌ڵ ئه‌و به‌رپرسه‌دا ده‌كات، خیانه‌تی پێ ده‌كات، ئه‌گه‌ر دڵسۆز

بێت، (صديقُكَ مَنْ صَدَقَكَ، لا مَنْ صَدَّقَك) هاوەڵەكەت ئەو كەسەیە لەگەڵت ڕاست دەكات، نەك هەر بڵێ ڕاست دەكەی، جا فیرعەون كە تەماشای كرد: ئەو خەڵكە هەر چەپڵەی بۆ لێدەدا و، دەهۆڵی بۆ دەكوتێ و، پێی هەڵا دەڵێ، گوتی دیارە من جیام لەوان، بۆیە گوتی:

﴿ أَنَا۠ رَبُّكُمُ ٱلْأَعْلَىٰ ﴾ [النازعات: ٢٤]

هەر وردە وردە پێی لێنا، پێشێ گوتی: من پەروەردگارتانم، دوای گوتی: من پەروەردگاری هەرە بەرزتانم، دوایی بە دەست و پێوەند و دەوروبەرەكەی خۆی گوت:

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلْمَلَأُ مَا عَلِمْتُ لَكُم مِّنْ إِلَٰهٍ غَيْرِى ﴾ [القصص: ٣٨]

ئەی دەست و پێوەند و پیاوماقووڵان، جگە لە خۆم پەرستراوێكی دیكەم بۆ ئێوە پێ شك نایە، هەر من پەرستراوتانم.

هەر وردە وردە پێی لێدەنا، بۆچی؟ چونكە خەڵكەكە وەك عەرەب دەڵێن: (كانوا يُطَبلونَ لهُ ويُزَمرون) هەر دەهۆڵ و زوڕنایان بۆ لێ دەدا و پێیان هەڵا دەگوت، تا لە كەوڵی خۆی دەرچوو. بەڵێ دڵسۆزیی بۆ بەرپرسان، لەلایەن خەڵك و جەماوەرەوە، ئەوەیە كە ئاگاداریان بكەنەوە هۆشدارییان پێ بدەن، ئەگەر وانەكەن، ئەوانیش بەشدارن لەو زوڵم و ستەمەدا، وەك لە سووڕەتی (الأعراف)دا خوای پەنهانزان دەفەرموێ:

﴿ لِكُلٍّ ضِعْفٌ وَلَٰكِن لَّا تَعْلَمُونَ ﴾ [الأعراف: ٣٨]

بۆ هەركامێكتان سزای دووقات هەیە، بەڵام نازانن پێشتریش باسم كرد، سزای دووقات بۆ ستەمكاران و بۆ بەرپرسان ئەوە دیارە: هی خۆشیان و هی ئەو خەڵكەش كە چەوساندوویانەتەوە، ئەدی هی چەوسێنراوەكان؟ ئەوانیش: هی خۆشیان و هی ئەو ملۆزمانەش كە بەهۆی بێدەنگیی ئەوانەوە بەسەریانەوە بوونە ملۆزم و فیرعەون.

**دانــا: ورده ورده له كۆتایی بەرنامەكە نزیك ئەبینەوە، ئەمەوێ بەرنامەكە كۆبكەینەوە، وێنەكە دیسان بخەینەوە سەر هەرێمی كوردستان، كەواتە ئێستا خەڵك و جەماوەر، جەنابی مامۆستا عەلی باپیر، هەم وەك سیاسییەك، هەم وەك رووناكبیرو نووسەرێك، ئامۆژگاریی چییە؟ پێشنیازی چییە بۆ خەڵك و جەماوەر لە ئێستای هەرێمی كوردستاندا، ئەركی سەرشانی خەڵك چییە بەرامبەر بەم دەسەڵاتەی رەخنە لێی هەیە؟!**

**مامۆستا:** پێش هەموو شتێك دەڵێم: ئەرك و بەرپرسیارێتیی خەڵك و جەماوەر ئەوەیە كە دەبێ بگەڕێنەوە بۆ لای خوا سبحانه وتعالی، ئنجا وەك لە (دیداری مێریی)یشدا باسمكرد، گەڕانەوە بۆ لای خوا، یانی: گەڕانەوە بۆ پابەندیی بە شەریعەتی خواوە، بەڵام بۆچی سەرچاوەی ڕاستكردنەوەی باروودخەكان و پاكسازیی تێدا كردنیان و چاكسازیی تێداكردنیان، بریتیە لە گەڕانەوە بۆ لای خواو شەریعەتەكەی ؟ لەبەرئەوەی هەستدەكەم ئەم جەوە سیاسییەی ئێمە زۆر زۆر تێكچووەو خەڵك دابەش بووە، كەسێك كە قسە دەكات سەرنج نادەن ئەو كەسە چی دەڵێ؟ یەكسەر دەڵێ : ئا ئەو قسەیە فلان كەس كردوویەتی، كەواتە: هەمووی پووچ و مەرفووزە، تەماشا ناكات چاكی گوتوە، یان خراپ ؟ یان مادام فلانكەس گوتوویەتی؟ كەواتە هەمووی قبووڵە.

**دانــا: ئەمە خراپە ؟!**

**مامۆستا:** بەڵێ زۆر زۆر خراپە، گوتراوە (أنظر الى ما قيل، ولا تنظر الى مَن قال) تەماشا بكە چی گوتراوە، تەماشا مەكە كێ گوتوویەتی؟ لەوە خراپتر نیە كۆمەڵگا وای لێ بێت دابەش بێت، ببێتە دوو تەرەف، یان ببێتە چەند تەرەفێك، هەمووی دژی یەكدی، ئاخر ماقووڵ نیە هیچكام لەو تەرەفانە بەفری بێ پەڵەو فریشتەی بێ هەڵە بن، هەروەك هیچكامیشیان شەیتان نین، هەمووی هەر مرۆڤە و هەڵەشی هەیە و چاكەشی هەیە و خراپەشی هەیە. لێرەدا مەبەستم ئەوە نیە بڵێم: ئەو خەڵك و جەماوەرش كە مافی پێشێلكراوە و زوڵمی لێ كراوە و دەستدرێژیی كراوەتە سەر، مافەكانی ئەوانیش وەك هی ئەو كەسەن كە بەرپرس و حوكمڕانە! نا، بەڵام مەبەستم ئەوەیە كە لە ڕووی سیاسییەوە خەڵكەكە كە

دابەش بووە، ئەو دابەش بوونەش زۆر شتێكی خراپە، تۆ دەبێ بێنی چاكە لەهەر شوێنێكەوە بێ و، حەق لەهەر شوێنێكەوە بێ، پشتگیریی بكەی، من لە موناسەبەتێكدا گوتم: ئەوە زۆر هەڵەیە كە تۆ بێنی بیكەی بە ماڵی لەسەر خۆت، حیزبێك تا ئاخری خەت لەگەڵی بی، چاك بڕوا و خراپ بڕوا، هەر لەگەڵی بی، ئەوە زۆر خەتەرە، ئەگەر تێبینییتان كردبێ، بەندە وەك خۆم، پاشان خۆم و پاشان وەك كۆمەڵی ئیسلامیی، نەمانكردوە بە پێوەر بزانین فلان حیزب چی دەڵێ؟ هەرچی ئەو گوتی، یان پشتگیریی بكەین یا لێی بێدەنگ بین، نە و، وەك نموونەم هێناوەتەوە، لە دیداری مێریی دا نموونەم هێنایەوە: كودەتا كرا لە توركیا، وانیە، هەندێ لە حیزبەكان زۆریان پێ خۆش بوو، شاگەشكە بوون، ئەوە كودەتا دەكرێ بە سەر ئاكپارتی دا، دەیباشە، ئاكپارتی رەخنەمان لێ هەیە، بەڵام پشتگیریی كودەتا ناكەین، ڕەخنەمان لێی هەیە ئەگەر زوڵم بكات لە كورد، یان زوڵم بكات لە لایەنێكی سیاسیی، بەڵام ئەو ڕەخنەو گلەییەم لێی وام لێناكات كە پشتگیریی كودەتا بكەم، كودەتا یانی پێشێلكردنی ئیرادەی خەڵك، هەندێك لایەنی سیاسیی پێیان ناخۆش بوو، وانیە؟ باشە، ئەو لایەنە سیاسییەی كە پێی ناخۆشە لە توركیا كودەتا بكرێ، ئەگەر راست بكات مەبدەئی بێ، دەبێ لە میصریش پێی ناخۆش بێ، وانیە؟

**دانـــا: وەك چۆن كۆمەڵ لەوێش و لەوێش پێی ناخۆش بوو؟**

**مامۆستا:** ئێمە دژی كودەتا بووین لە میصرو لە توركیاش، یان بۆ نموونە: ئەم وڵاتە تۆپباران دەكرێ، لەلایەن ئێران یان لە لایەن توركیاوە، تۆ نابێ فەرق بكەی، سیادەی ئەم وڵاتە پێشێل دەكرێ، هەركەسێ پێشێلی بكات، پێشێلكردنی سیادەی ئەم وڵاتە گوناحەو زوڵمەو ستەمە، تۆپبارانكردن بە ناحەق زوڵمە و ستەمە، بەڵام تۆ دەبێ بەهانەی ئەو خەڵكەش ببڕی كە بەهۆی ئەوەوە تۆپباران دەكرێ، نابێ بەهانەش بخەیە دەستی خەڵك، من مەبەستم ئەوەیە نابێ بانێكە و دوو هەوا بێ، حەقیقەت ئێمە دەبێ ئاوامان لێ بێ، ئێمە بێنین لەگەڵ حەقدا بین دژی ناحەق بین، ئەو حەقە لەسەر دەستی هەركەسێكدا دەركەوێ.

ئنجا ئەوەی جەنابت گووتت: خەڵك و جەماوەر لە بارودۆخی ئێستا هەرێمی كوردستاندا، ئامۆژگارییت بۆیان چییە؟

١) پێش هەموو شتێك گەڕانەوە بۆ لای خوا، ئنجا كە دەگەڕێنەوە بۆ لای خوا، خوای پەروەردگار و ئیمان و ئیسلام وایان لێدەكات لەگەڵ حەقدا بن، ئەو حەقە لەلای هەركەسێكەوە بێ.

٢) دڵسۆزانە ڕەخنە بگرن لە حوكمڕان و بەرپرسان، نەك كینە لەدڵانە، بەڵكو دڵسۆزانە، بە پەرۆشەوە، پێیان خۆش بێ ڕاست بنەوە، پێیان خۆش بێ چاك بن، من لە هەندێ خەڵك دەبیستم لە هەندێ لە كەناڵەكانەوە قسەی خراپ زۆر دەكەن، ئینسان نابێ ڕێگا بدات، وشەی ناشیرین، ئەو وشانەی كە كاتی خۆی بە ڕژێمی بەعس گوتراون بەكاربێن، من هەرگیز لەگەڵ ئەوەدا نیم، وشەی ناشیرین بە كەس بگوترێ.

**دانـا: بەس هەست ناكەی ئەوە كاردانەوە بێ، چونكە دەسەڵات زۆر جار بێ منەتە و ئەویش وشەی ناشیرین دەڵێ؟**

**مامۆستا:** با، دەزانم، ئەوەی دەسەڵاتیش دەیكات، پێش قسەكانیش پێش كاردانەوەكەی، هەر كارەكەی خراپە كە خەڵك ناچار دەكات ئاوا بكات، بەڵام من دەڵێم: دەبێ خەڵك داوای حەقی خۆی بكات بەشێوەیەكی حەق و، وشەی شایستە بەكاربێنێ، وشەی بەنەزاكەت بەكاربێنێ، بۆ ئەوەی حەقەكەی لەخۆی نەكاتە ناحەق، یاخود هەندێ شتی خراپی دیكە تێكەڵ بەهەقەكەی نەكات، بۆ وێنە: بیكات بە شتی شەخصیی، یان بیكا بە شتی حیزبیی، بیكا بە شتی وا كە دوایی خۆی پێ ناشیرین بێ و، تەرەفە بەرامبەرەكەش وا لێ بكا، كە ئەویش غەڵەت بكات، چونكە بە غەڵەت بەرامبەر بە یەكدیی كردن ناگەینە هیچ.

پاشان جارێكی دیكەش دووبارەی دەكەمەوە با خەڵك و جەماوەر بەوە كە تۆمەتبار دەكرێ و ڕەخنەی لێ دەگیرێ و، نادیدە دەگیرێ و بێباكیی بەرامبەر پێشان دەدرێ، لە داوای مافی خۆی كردن شل نەبێ، ماندوو نەبێ، چونكە

هیچ ڕێیەکی دیکەمان نیە، دەبێ خەڵك و جەماوەر لەسەر حەقی خۆی بەجواب بێ، کە ئەوە نەك هەر ماف، بەڵکو ئەرکی سەرشانیشیەتی، بەڵێ با خەڵك کول نەبێ، بەڵام بەشێوەی شەرعییانە و شارستانییانە، بەشێوەیەکی وا کە حەقەکە لەخۆی نەکاتە ناحەق و، ئەوە ئەرکی خەڵك و جەماوەرە، ئەمما بەرپرسان و حوکمڕانانیش، دەبێ بزانن کە ڕەوایەتییان لەو خەڵکە وەرگرتووە ئەگەر ئەو خەڵکە لێیان ڕازی نەبێ، ڕەوایەتییەکەیان دەکەوێتە ژێر نیشانەی پرسیار، کاتێکیش خەڵك بڕیار بدات، بە گشتی خەڵك بڕیاربدا، ڕەوایەتییان لێ بستێنێتەوە، ئەگەر لەسەر کورسییەکەش بمێننەوە، بە ناڕەوایەتیی لەسەر کورسییەکەیان دەمێننەوەو، لەسەر کورسی مانەوە و لەسەر دەسەڵات مانەوەیەکیش ڕەوایەتیی پێوە نەبێ، هیچ بەرەکەتی نیەو، بۆ دنیا عەیبداریی و بۆ قیامەتیش گوناهبارییە.

**دانــا: بەڕێز مامۆستا عەلی باپیر، نووسەر و رووناکبیر، سوپاس بۆ ئەوەی کە وەڵامی پرسیارەکانی ئەم ئاڵقەیەشت دایەوە، زۆر سوپاست دەکەین.**

**مامۆستا:** سوپاس بۆ جەنابیشت.

# ئاڵقەی دەیەم

بنەمای دەیەم: با پەند لەمێژوو وەربگرین، چونکە یاساکانی خوا (سنن الله) لەژیانی بەشەردا هەمیشەیی و گشتگیرن.


ameer.maktab@yahoo.com

**دانــا:** بەناوی خوای گەورە، سڵاوتان لێ بێ بینەرانی ئازیز! خۆم بەخۆشحاڵ دەزانم لە ئاڵقەیەكی نوێی بەرنامەكەمان بەرنامەی بەدانایی دا، خوای پەروەردگار دەرفەتی پێبەخشینەوە لەگەڵ میوانی هەمیشەیی بەرنامەكەمان جەنابی مامۆستا عەلی باپیر نووسەر و رووناكبیردا بەدیدار شاد بینەوە، لەم ئاڵقەیەدا باس لە پەندوەرگرتن ئەكەین لە گەلان و میللەتانی پێش خۆمان.

مامۆستاگیان! سڵاوی خوات لێ بێت.

**مامۆستا:** سڵاوی خوا لە جەنابیشت كاك دانا.

**دانــا:** لەم ئاڵقەیەدا باس لەوە ئەكەین چۆن ئێمە پەندوەربگرین لە میللەتان و كۆمەڵگاكانی ڕابردوو و ڕووداوەكانی ڕابردووی خۆمان، چونكە یاساكانی خوا لە ژیانی بەشەردا هەمیشەیی و گشتگیرن، وەك جەنابت ئاماژەت پێكردوە، جارێ با لەوەوە دەست پێ بكەین، مەبەست چییە لەوەی كە ئێمە پەندوەربگرین لە ڕابردوومان؟ چ سوودێكی هەیە ئێمە پەند لە ڕابردوو وەربگرین؟

**مامۆستا عەلی باپیر:** الحمد لله، وصلى الله تعالى وسلم وبارك على رسول الله محمد، وعلى آله المهتدين بهداه.

پەندوەرگرتن لە ڕابردوو، واتە لە مێژوو، كاتێك مەیسەر دەبێ، كە لە ژیانی بەشەردا وەك خوا هەواڵی پێداوین كۆمەڵێك یاسا هەبن ئەو یاسایانە چەسپاو و بەردەوام بن، چۆن؟ ئایا چ كاتێك ئینسان دەتوانێ پێشبینی بكات مانگ دەگیرێ، یا خۆر دەگیرێ؟ كاتێك كۆمەڵێك یاسا هەبن، یاسای گەردوونیی و فیزیایی، كە بەپێی ئەو یاسایانە مانگ دەسووڕێتەوە بە دەوری زەویداو بە دەوری خۆیدا، هەروەها هەر كام لە زەوی و خۆر بەشێوەیەكی ڕێك و پێك جووڵە بكەن، یانی ئەگەر هاتباو پاشاگەردانیی بووایە لە بوونەوەردا، هیچ زانایەك نەیدەتوانی پێشبینیی، هیچ ڕووداوێكی گەردوونیی بكات، ئێستا ئێمە كە دەزانین فلان ساڵە مانگ دەگیرێ، فلان ساڵە خۆر دەگیرێ، ئێستا لەو دوو سێ شەوەی ڕابورد، مانگ یەك لەسەر سێی قەبارەی خۆی گەورەتر دیار بوو،

بۆچی؟ چونکە دوورترین مەسافەی مانگ لە زەوییەوە، نزیکەی (٤٦٠،٠٠٠) چوار سەد و شەست هەزار کیلۆمەترە، دوورترین ماوە، کە مانگ بە دەوری زەویدا دەخولێتەوە، کاتێ زۆر دوور دەکەوێتەوە دەگاتە چوارسەد و شەست هەزار کیلۆمەتر، بەڵام نزیکترین ماوەی مانگ لە زەوی، بریتیە لە (٣٤٠،٠٠٠) سێسەدو چل هەزار کیلۆمەتر، واتە: دەوری (١٢٠،٠٠٠) سەدو بیست هەزار کیلۆمەتر نزیکتر کەوتبووەوە، بۆیە یەك لەسەر سێی قەبارەکەی زیادی کردبوو، گەردووناسان دەڵێن : (٣٠-٤٠) سی چل ساڵ جارێك مانگ ئاوا نزیك دەکەوێتەوە لە زەوی، واتە قەبارەکەی گەورەتر پێشان دەدرێت، کە بەتەئکید ئەوە کاریگەریشی هەیە بۆ سەر هەڵکشان و داکشانی دەریاکان هەیە، کە ڕاستەوخۆ پەیوەستن بە هێزی کێشندەی مانگەوە بۆ زەوی، مەبەستم ئەوەیە : ئایا چ کاتێك زانایان دەتوانن پێشبینیی ئەو ڕووداوانە بکەن؟ کاتێك کۆمەڵێ قانوون هەبن بەپێی ئەو قانوونانە دەتوانن پێشبینیی بکەن.

خوا لە ژیانی بەشەردا کۆمەڵێ یاسای داناون، ئەو یاسایانە لە سەردەمی نووحدا (علیه الصلاة والسلام) کە یەکەمین پێغەمبەر بووە، کە بە بەرنامەوە هاتوە بۆ کۆمەڵگایەکی بەشەریی، لە دوای ئادەم (علیه الصلاة والسلام)، لەکاردابوون و لە سەردەمی ئیبڕاهیم و پاشان هوود و صاڵح و شوعەیب و مووسا و عیسا و موحەممەدیش دا (علیهم الصلاة والسلام)، ئەو یاسایانە کە کاتی خۆی خوا دایناون لە ژیانی بەشەردا هەر بەردەوامن، بۆیە ئێستا ئێمە دەتوانین پەند وەربگرین لە بەسەرهاتی ئەوەی بەسەر گەلی نووح هاتوەو، ئەوەی بەسەر گەلی مووسادا هاتوەو، ئەوەی بەسەر گەلی ئیبڕاهیمدا هاتوەو، بۆچی پەندیان لێوەردەگرین؟ چونکە کاتێ کە گەلی نووح هەڵەیەکیان کردوەو تووشی سزایەك بوون، خوا دەفەرموێ: پەندیان لێوەربگرن، یانی ئەگەر ئێوەش هەمان هەڵە بکەن، هەمان سزاش بۆ ئێوە لە ڕێدایە.

**دانــا: مامۆستا! ئایا ناكەوینە هەڵەوە ئەگەر بگەڕێینەوە بۆ مێژوو، بۆ سەردەمی زۆر زۆر لەپێشینەی خۆمان و بەراوردی بكەین بە ئێستا، بۆ پەندوەرگرتن ؟!**

**مامۆستا:** نەخێر، نەخێر، هەڵبەتە ئەمە بە گشتی دەڵێم، بەڵێ ژیانی بەشەر گۆڕانی زۆر بەسەردا هاتوە، لە ڕووە مادديیەكەیەوە، بەڵام لە ڕووی جەوهەرییەوە، بەشەر هەر بەشەرە، مرۆڤ هەر مرۆڤە، مانگ و خۆر هەر مانگ و خۆرن، وەك چۆن مرۆڤی پێش مێژوو، پێویستیی بە تیشكی خۆر و بە هەوا و بە ئاوو خواردن بووە، مرۆڤی ئێستاش پێویستی پێیەتی، بەڵام ئەو كاتە ڕەنگە لە هەندێ لە قۆناغەكانیدا گۆشتی كاڵی خواردبێ، دوایی فێر بووە بیبرژێنێ كە ئاگری دۆزیوەتەوە، هەروەها پێشێ بە دەست خواردوویەتی، دوایی و ئێستا بە چەقۆ و چنگاڵ دەیخوات، بەڵام گرنگ ئەوەیە هەردەبێ بخوات، جا بەدەست دەخوا یان بە چەقۆ و چنگاڵ، گرنگ دەبێ هەر شتێك بخوا، ئەگەر كاتی خۆی لە ئەشكەوتدا ژیانی بەسەر بردوە، دوایی وردە وردە لە بەرد خانووی دروستكردوە، ئێستا بەڵێ لە خشتی سوور و چەندان جۆرە كەرەسەی دیكە دروستی دەكات، بەڵام گرنگ ئەوەیە دەبێ مەئوایەكی هەبێ تێیدا بژی، ئنجا پەند وەرگرتن لە مێژوو، نەبەستراوەتەوە بەوەوە كە ئەوانیش وەك ئێمە ژیابن، واتە لە هەموو وردەكارییەكان دا وەك ئێمە ژیابن، خوای پەروەردگار لە چەند شوێنێ لە قورئاندا باسی پەندوەرگرتن لە مێژوو دەكات، بۆ وێنە :

١) ﴿ فَٱعۡتَبِرُواْ يَٰٓأُوْلِي ٱلۡأَبۡصَٰرِ ﴾ [الحشر: ٢]. واتە: ئەی خاوەن عەقڵان پەند وەربگرن.

٢) ﴿ لَقَدۡ كَانَ فِي قَصَصِهِمۡ عِبۡرَةٞ لِّأُوْلِي ٱلۡأَلۡبَٰبِۗ ﴾ [یوسف: ١١١].

واتە: لە گێڕانەوەی بەسەرهاتی ئەواندا پەند هەیە بۆ خاوەن عەقڵان، ئنجا وەك گوتم پەندەكە كاتێك وەردەگیرێ كە بگونجێ ئەوەی بەسەر ئەوان هاتوە، لەسەر هەڵەكانیان، بەسەر ئێمەش بێت.

٣) خوای كارزان لە سووڕەتی (القصص)دا دەفەرموێ: ﴿ وَمَا كُنَّا مُهۡلِكِي ٱلۡقُرَىٰٓ إِلَّا وَأَهۡلُهَا ظَٰلِمُونَ ﴾ [القصص : ٥٩].

واتە : ئێمە فەوتێنەری ئاوەدانییەكان نەبووین، مەگەر خەڵكەكەیان ستەمكار بووبن.

ئێستاش هەر وایە، ئەگەر كاتی خۆی كۆمەڵگاكان بەهۆی ستەمەوە فەوتاون، ئێستاش هەروایە، بەهۆی قۆرخكارییەوە فەوتاون، ئێستاش هەر دەفەوتێن.

٤) خوا (عزوجل) فەرموویەتی: ﴿ وَإِذَآ أَرَدۡنَآ أَن نُّهۡلِكَ قَرۡيَةً أَمَرۡنَا مُتۡرَفِيهَا فَفَسَقُواْ فِيهَا فَحَقَّ عَلَيۡهَا ٱلۡقَوۡلُ فَدَمَّرۡنَٰهَا تَدۡمِيرٗا ﴿١٦﴾ ﴾ [الإسراء : ١٦].

واتە: ئەگەر ویستمان ئاوەدانییەك لەنێو بەرین، فەرمان دەكەین بە خۆشگوزەرانەكانی (واتە: فەرمانیان پێ دەكەین بە چاكە، بەڵام ئەوان) (فَفَسَقُواْ فِيهَا) خراپەكاریی تێدا دەكەن، لادانی تێدا دەكەن، (فَحَقَّ عَلَيۡهَا ٱلۡقَوۡلُ فَدَمَّرۡنَٰهَا تَدۡمِيرٗا ) قسەی لەسەر پێویست دەبێ (واتە: بڕیاری خوای لەسەر دێتە دی) كاولی دەكەین، ئەمە ئەگەر نەگونجێ ئێستاش بێتەدی، خوای پەروەردگار لە ئایەتەكان دا، پێمان نافەرموێ: تەماشای بەسەرهاتی پێشووەكان بكەن، دەرس و پەند و عیبرەتیان لێ وەربگرن، كەواتە: بێگومان خوێندنەوەی مێژوو و سەرنجدانی ئەزموونی رابردووان، لە شێوەی گوزەرانیان و لە شێوەی حوكمڕانییان، زۆر جێی دەرسە، جێی پەندە، بەڵام خوای زاناو شارەزا هەمیشە پەندوەرگرتنەكە تایبەت دەكات بە عاقڵمەندانەوە:

﴿ فَٱعۡتَبِرُواْ يَٰٓأُوْلِي ٱلۡأَبۡصَٰرِ ﴾ [الحشر: ٢].

﴿ لَقَدۡ كَانَ فِي قَصَصِهِمۡ عِبۡرَةٞ لِّأُوْلِي ٱلۡأَلۡبَٰبِۗ ﴾ [یوسف: ١١١].

چونكە ئینسان ئەگەر سەرنج نەدات، تێوەڕانەمێنێ، عەقڵی بەكارنەهێنێ، با دنیا پڕ بێ لە پەند و ئامۆژگاریی، هیچ سوودی لێ نابینێ.

**دانـــا: ئایا لەبەینبردنی ئاوەدانییەکانی ڕابردوو ئەگەر لە مێژوودا هەڵگەڕانەوە بوو بێ، لافاو بووبێ، هەر جۆرێك بووبێ ئاوەدانییەکان لەبەین برابن، ئێستا ئەکرێ چۆن ئاوەدانییەکان لەبەین بچن جەنابی مامۆستا؟**

**مامۆستا:** ئێستا زانایان دەڵێن بۆ ئوممەتی پێغەمبەری خاتەم موحەممەد (صلی الله علیه وسلم)، خوای زاناو توانا یاسایەکەی گۆڕیوە، چونکە کاتی خۆی هەر پێغەمبەرێك کە هاتوە تەنیا بۆ عەشیرەتێك، بۆ گەلێك، بۆ کۆمەڵگایەك بووە، بۆ کات و شوێنێکی دیاریکراو هاتوە، لەبەرئەوە ئەو خەڵکەی لەو شوێنە بوون، ئەگەر ڕاست نەبووبنەوەو چاك نەبووبن، دوای ئەوەی ئەو پێغەمبەرە (علیه الصلاة والسلام) و ئەوانەی کە لەگەڵی بوون دەربازیان بووە، خوای تۆڵەسێن ئەوانەی دیکەی لەبەین بردوە، بەڵام ئەگەر ئەوانەی لەبەین بردوە لەبەرئەوەی ئەزموونێکی فاشیلیان هەبووە، خەڵکی دیکە هەبووەو ماوەتەوەو ئەزموونێکی دیکەی تازە لە نێو ئەواندا دەستی پێ کردوە، یانی ئەگەر خوای کاربەجێ گەلی نووحی بە تۆفان فەوتاندوە، دوایی گەلی عاد کە هوود پێغەمبەریان بووە، هەبوون، ئنجا کە گەلی عادیشی بە بایەکی بەهێز فەوتاندوە، گەلی ثەموود کە صالح پێغەمبەریان بووە، هەبوون، ئەگەر ئەوانیش فەوتاون بە چریکەیەك، گەلی لووت (علیه الصلاة والسلام) کە خوا ژێرو ژووری کردن، لە دوای ئەوان،... یانی هەر پێغەمبەرە بۆ گەلێکی دیارییکراو بۆ عەشیرەتێکی دیارییکراو نێرراوە، بەڵام پێغەمبەری خاتەم بۆ هەموو بەشەرە، لەبەرئەوە خوا یاسایەکەی گۆڕی، ئەو تێکچوونی کۆمەڵگا و لەبەینچوونی ستەمکاران و کۆتاییهاتنی کۆمەڵگا، ئێستا بەدەستی خۆیانە، واتە بەڵایەکی یاسادڕ (خارق العادە)، بەڵایەکی نائاسایی و ناسروشتیان بۆ نایەت، وەك با و باران و لافاو و چریکە و ئاگرپرژێن و ئەوانە کە بەسەر گەلانی دیکەدا هاتوون، بەڵکو بۆ خۆیان بەدەستی خۆیان، وەك خوا دەفەرموێ:

﴿ يُخْرِبُونَ بُيُوتَهُم بِأَيْدِيهِمْ ﴾ [الحشر: ٢]

بەدەستی خۆیانماڵی خۆیان کاول دەکەن، چونکە ئەگەر خوا سبحانەو تعالی بەڵایەکی گشتی ئێستا بنێرێ بۆ ئۆممەتی پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام)

بۆ هەموو مرۆڤايەتى، كە بە مەفهوومێك بە ئۆممەتى پێغەمبەر (محمد) لە قەڵەم دەدرێت، هەندێك دەڵێن: ئۆممەتى بانگەواز (أمة الدعوة) هەموو مرۆڤايەتى ئێستا لەسەر ميلاكى پێغەمبەرى خاتەمە، (عليه الصلاة والسلام)، لەسەر هەموو تاك تاكى بەشەرە كە ئيمان بە پێغەمبەر خاتەم (محمد) بێنێ، كە ديارە ئەوەش ئەركى مسوڵمانانە كە ئەو بانگەواز و پەيامەى پێغەمبەرى خوا بگەيەنن بە هەموو بەشەر، كەواتە: كە ئەگەر خواى دادگەر لەسەر ئەوە كە ئەو ئۆممەتە لار دەبێ و خراپ دەبێ، لەبەينى بەرێ، كەواتە: هيچ كەس لەسەر زەوى نامێنێ، لەبەرئەوە خوا سبحانه وتعالى ئەم قانون و بنچينەيەى گۆڕى، بەڵێ ئێستاش تسۆنامى و بەڵا و شتى گەورە گەورە بەشێوەى ناوچەيى دەبن، بەڵام پەروەردگار بەڵاى گشتى هەڵگرتوە لەسەر مرۆڤايەتيى، لەبەرئەوەى كە بە قسەى پێغەمبەرى خاتەم (عليه الصلاة والسلام) ناكات، بەڵام لەجێى ئەوە ئەو هەموو ئاگر و ئاسنە بەسەريەكدى دا دەبارێنن، شەڕ و شۆڕ و ئاژاوەو ئەو هەموو خراپەكارييەى كە لە زەويدا هەيە، كە هەمووى دەرهاويشتەى زوڵم و قۆرخكارييە و، دەرهاويشتەى ئەوەيە كە خەڵك لە فيترەتى خوا كە لەسەرى خوڵقاندوە و، لە شەريعەتى خوا كە بۆى ناردوە، هەڵدەگەڕێتەوە.

**دانــا: جەنابى مامۆستا! هەم خەڵك و جەماوەر، هەم دەسەڵاتداران لە هەرێمى كوردستاندا بە تێڕوانينى جەنابت لە ماوەى ڕابردوو لە هەرێمى كوردستاندا، توانيويانە پەند لە مێژووى نزيك و دوورى گەلانى هەم دوور هەم نزيكى ناوچەكەى خۆمان وەربگرن؟**

**مامۆستا:** پێموايە نەخێر، بەداخەوە، يان زۆر بە كەميى پەندمان وەرگرتوە، ئنجا ئێمە هەر پێويست ناكات بچينەوە بۆ ڕابردوو، بچينەوە بۆ پێش ڕاپەڕين، هەڵبەتە ئەگەر بچينەوە بۆ پێش ڕاپەڕين و بۆ زۆر پێش ڕاپەڕينيش، جێى خۆيەتى، چونكە خواى پەروەردگار وەكو چۆن پێمان دەفەرموێ: تەماشاى گەردوون بكەن:

﴿ وَكَأَيِّن مِّنْ ءَايَةٍ فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ يَمُرُّونَ عَلَيْهَا وَهُمْ عَنْهَا مُعْرِضُونَ ﴿١٠٥﴾ ﴾ [يوسف : ١٠٥].

واته: زۆر نیشانه هەن له ئاسمانەكان و زەویدا بەلایاندا ڕەت دەبن، بەڵام سەرنجیان نادەن.

وەك چۆن خوای كارزان ئەوانەی به ئایەت له قەڵەمداوە، پێشمان دەفەرموێ:

﴿ قُلْ سِيرُوا فِي الْأَرْضِ ثُمَّ انظُرُوا كَيْفَ كَانَ عَاقِبَةُ الْمُكَذِّبِينَ ﴾ [الأنعام: ١١]

واته : بڵێ به زەویدا بڕۆن و سەرنج بدەن، واته: هەم به گەشتی كردەیی بگەڕێن شوێنەوارەكانیان ببینن، هی گەلی عادو گەلی ثەموود و گەلی لووط.. یاخود گەشتی فیكریی، مێژوو بخوێننەوە.

ئنجا وەك چۆن خوا فەرمانمان پێ دەكات كه نیشانەكانی خوا له گەردووندا ببینین، پێشمان دەفەرموێ : كه دەستی خوا له ژیانی بەشەردا ببینین، ئەو گەلانەی كه پێغەمبەرانیان به درۆ داناوە و، ئەو گەلانەی كه ستەمیان كردوە و خراپەیان كردووە، شوێنەوارەكانیان سەرنج بدەن، یانی جێی خۆیەتی كه ئاوا بكەین، بەڵام ئەگەر ئێمه زۆر دووریش نەڕۆین، ئەگەر تەماشای پێش ڕاپەرینیش نەكەین، كه رژێمی بەعس چی دەكرد و چۆنی دەكردو دوایی چی بەسەرهات، ئەو صەددامەی كه دەیگوت: (إذا قال صدام قال العراق)، هەرگیز نابێ خەڵك لەبیری بچێتەوە، كه هەموو عێراقی لەخۆیدا خولاصه كردبووەوە: (ئەگەر صەددام گوتی عێراق گوتی) كه ئەوە درۆیەكی زۆر گەورە بوو، چونكه لەو هەموو عێڕاقە ماڵێكی دەستنەكەوت خۆی تێدا حەشار بدات، بەڵكو بۆ خۆی قوڵتێكی هەڵكەندو خۆی تێدا شاردبووەوە، بەڵام ئەگەر ئەوەش نەكەین، هەر لەم مێژووی نزیكی ئەو چەند ساڵەی خۆماندا، له دووهەزار و یازدە (٢٠١١) بەملاوە، پێنج شەش وڵات چییان لێ هات! ئەوانەی دیكەش فریای خۆیان كەوتن، چاكسازییان كرد و، پاشان هەندێ له زلهێزانیش ئیرادەی شووم و خراپەكارییان وەخۆكەوت، كه هەندێ لەو شۆڕشانەیان لەباربردو، خەڵك چاوترساو بوو كه گۆڕانكاریی بكات، ئێمه ئەگەر هەر پەند له دەرودراوسێ و له مێژووی نزیكی خۆشمان وەربگرین، بەشمان دەكات. نابێ هیچكەسیش پێی وابێ كه حەقی ڤیتۆی هەیه له بەرامبەر خوا سبحانه وتعالى و یاساكانی خوا،

خوا سبحانه وتعالى لە قورئاندا وشەی سوننەت بەكاردێنێ بە تاك ﴿ سُنَّةَ ٱللَّهِ فِي ٱلَّذِينَ خَلَوْاْ مِن قَبْلُۚ ﴾ [الأحزاب : ٣٨].

(سُنَّةَ ٱللَّهِ ) یانی قانوونی خوا، یاسای خوا، وشەی (سُنَّةَ ) خوا لە جیاتی قانوون بەكاری دێنێ.

یان دەفەرموێ: ﴿ قَدْ خَلَتْ مِن قَبْلِكُمْ سُنَنٌ فَسِيرُواْ فِي ٱلْأَرْضِ فَٱنظُرُواْ كَيْفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلْمُكَذِّبِينَ ﴿١٣٧﴾ ﴾ [آل عمران : ١٣٧]

لە پێش ئێوەدا یاساكانی خوا ڕابوردوون، بەزەویدا بڕۆن سەرنج بدەن! سەرەنجامی ئەوانەی كە پێغەمبەرانیان بە درۆ داناوە، چۆن بوون! ئنجا ئەوە كە خوا سبحانه وتعالى باسی (سنة) دەكات بەتاك و، باسی (سنن) دەكات بە كۆ، سەرنجی ئێمە ڕادەكێشێ كە ژیانی بەشەر ئەوە نیە وەك شاری بێ ساحێب بێ، بەڵكو بە ئیرادەی خوا بەڕێوەدەچێ و، وە خوا چەند قانوونێكی داناون لە ژیانی بەشەردا :

١) یەكێ لە قانوونەكان ئەوەیە كە بە زوڵم كۆمەڵگاكان كۆتاییان پێ دێ.

٢) یەكێكی دیكە لە قانوونەكان ئەوەیە كە بە دادگەریی وڵات فەراح دەبێ، بەرەكەتی تێ دەكەوێ، وەك گوتراوە: (بالعدل قامت السموات والارض).

٣) یاسایەكی دیكە ئەوەیە كە بناغەی تەبایی نێوان خەڵك بریتیە لە دادگەریی، دەتەوێ خەڵك تەبابێ، یەكڕیز بێ، یەكدی خۆشبوێ، ئەوە بە دادگەریی یەكسانیی پەیدا دەبێ، زۆر كەس باسی تەبایی و برایەتی و یەكڕیزیی دەكات، یان گلەیی لە هەندێ لایەنی سیاسیی دەكات، یان گلەیی لە خەڵك دەكات، بۆچی تەبا نین؟ بەڵام بەبێ دادگەریی، تەبایی پەیدا نابێ، تۆ بڵێی: هی خۆم بۆ خۆم، هی تۆش دەخۆم، چۆن برایەتیی دەبێ، چۆن تەبایی دەبێ؟

ئەگەر تەماشای مێژووی گەلانی پێشوو و، تەماشای مێژووی هاوچەرخیشمان بكەین، دەبینین كاتێ كە هاوسەنگیی لە نێوان چینەكانی

كۆمەڵگادا تێكدەچێ، یانی كەمێك پڕ دەبن و زۆربەش قڕ دەبن، وەك من زۆر جار ئەو زاراوەم بەكارهێناوە، حیزب و خزم پڕ دەبن، خەڵك و جەماوەریش قڕ دەبێ، وڵات تێكدەچێ، ئاشتیی كۆمەڵایەتیی تێكدەچێ. هەڵبەتە ئینسان تۆزێك ویژدانی خۆی بكاتە دادوەر، دڵنیا دەبێ كە قڕیی و چڕیی و چینایەتیی چەند ستەمێكی ناقۆڵاو زەقە! بەڵام با ئاماژە بە چەند ئایەتێكیش بكەین :

١) خوا سبحانه وتعالی دەفەرموێ: ﴿ وَٱلۡأَرۡضَ وَضَعَهَا لِلۡأَنَامِ ١٠ ﴾ [الرحمن: ١٠]. واتە: خوا زەوی بۆ خەڵك داناوە.

٢) له سوورەتی (البقرة)ش دا دەفەرموێ: ﴿ هُوَ ٱلَّذِي خَلَقَ لَكُم مَّا فِي ٱلۡأَرۡضِ جَمِيعًا ﴾ [البقرة : ٢٩]. واتە: ئەوەی لە زەویدایە بۆ هەموانتانی خوڵقاندوە.

٣) له سوورەتی (الجاثية)دا دەفەرموێ: ﴿ وَسَخَّرَ لَكُم مَّا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلۡأَرۡضِ جَمِيعًا مِّنۡهُ ﴾ [الجاثية : ١٣]. واتە : هەرچی لە ئاسمانەكان و زەویدایە، لەلایەن خۆیەوە هەمووی بۆ ئێوە دەستەمۆ كردوە.

ئاخر ئەو بەشەرە، ئەوی دیكەش بەشەرە، هەموو وەك یەك بەشەرن و خوا سبحانەو تعالی مافی ڤیتۆی نەداوە بە كەس و، ئیمتیازی كەسی نەداوە بەسەر ئەویدیكەدا، نە وەك شەخص، نە وەك بنەماڵە، نە وەك عەشیرەت، نە وەك گەل و نەتەوە، هەمووی وەك یەك خوڵقاندوون و، لەسەر ئەم زەوییە دایناون، بژێوی هەموانی خستووەتە نێو ئەم زەوییەوە، كەواتە: چ ڕەوای حەقە شەخصێك، ماڵێك، بنەماڵەیەك، عەشیرەتێك، حیزبێك، نەتەوەیەك، توخمێك، وەك (ئارییی) كە كاتی خۆی هیتلەر و مۆسۆلینی دەیانگوت، بێنێ (یاخود وەك ئێستا ئەورووپا وا گومان دەبات، سپی پێست) خۆی بكات بە كوێخای زەوی و پێی وابێ دەبێ ئەو خێر و بێرە لەبەردەستی ئەودا بێ، ئنجا چەندی پێ خۆشبوو، دەیدا بە خەڵك، ئیرادەی ئەوانی پێ بكڕێ! ئا ئەوە بیكا، نەتەوەیەك بیكا، عەشیرەتێك بیكا، حیزبێك بیكا، بنەماڵەیەك بیكا، شەخصێك بیكا : زوڵمەو ناگونجێ وڵات ئاوا بەڕێوەبچێ .

ئنجا بەداخەوەش هەندێك كەس چاك نازانن ئێستا چ بارودۆخێكە، كاتی خۆی رەنگە ئەو جۆرە زوڵمانە بووبن، سەد ساڵ، دووسەد ساڵ دەوامیان كردوە، ئومەوییەكان نەوەد (٩٠) ساڵێك حوكمیان كردوە، زوڵمیان كردوە و قۆرخكارییان كردوە، دوایی عەبباسییەكان هاتوون سێ سەد چوارسەد (٣٠٠-٤٠٠) ساڵ حوكمیان كردوە، پاشان عوسمانییەكان هاتوون و خەڵكی دیكە هاتوە، بەڵام ئێستا دنیا زۆر گۆڕاوە، ئێستا دنیا هەم لە ڕووی نزیكخستنەوەی ماددەكان (مسافات)ەوە زۆر گۆڕاوە، هەم لە ڕووی ئەوەوە كە خەڵك زۆر هۆشیاربووەتەوەو، وەك دەڵێن دنیا بووەتە لادێیەك، ئێستا خەڵك هۆشیاریی كۆمەڵایەتیی و فیكریی و سیاسیی زیاترە بووە، لەبەرئەوە كەسێك كە بە عەقڵی نەك حەفتاو هەشتایەكان، بە عەقڵی نەوەدەكانیش ئێستا ڕەفتار بكات، مانای وایە بەجێماوە، لە واقیعی كۆمەڵگاكەی خۆی بەجێماوە، (یعیش فی غیر زمانه)، من زۆرجار بە هەندێك لەو مامۆستایانەی كە دەیانەوێ وەڵامە كۆنەكان بۆ پرسیارە تازەكان دابنێن، ئیمامێك، پێشەوایەك، رەزاو رەحمەتی خوایان لێ بێت، هەزار ساڵ لەمەوپێش، هەزار و دوو سەد ساڵ لەمەوپێش ژیاوە، دیارە لەو بوارانەدا كە بواری هەڵسوكەوتەكانە، ئەو بوارانەی كە گۆڕانیان بەسەردا دێت، ئەو كاتە ئەو زانایە ئیجتیهادێكی كردوە بۆچوونێكی هەبووە، مامۆستایەك بیەوێ چارەسەری كێشەی ئێستای پێ بكات، ئەوە من پێی دەڵێم: ئەو كەسە (یعیش في غیر زمانه)، جا ئەوە هەر لە بواری دینداریی فیقهدا نیە، بەڵكو لە بواری كاری سیاسییدا زۆر زەقە، من هەندێ كەس دەبینم، هەندێ قسە دەكات، بەشێوەیەك رەفتار دەكات، بەشێوەیەك بیر دەكاتەوە (یعیش في غیر زمانه)، نازانێ ئەم زەمانە زەمانێكی دیكەیە.

ئەگەر هەر حەق و عەدل و ئەو پرەنسیپانەش تەماشا بكەی، عەدل وایە تۆ چی حەقێك بە خۆتی ڕەوا دەبینی، بە منداڵەكانی خۆتی ڕەوا دەبینی، بە خزمەكانی خۆتی ڕەوا دەبینی، بە دەوروبەری خۆتی ڕەوا دەبینی، بە بەرامبەرەكانیشتی ڕەوا ببینی، ئەوە دادگەرییەو ئاوا وڵات بەرێوە دەچێ،

پێچەوانەی ئەوەش زوڵمە و خوای شارەزا هەواڵی پێداوین كە بەهۆی زوڵمەوە كۆمەڵگایەكان دەفەوتێن.

**دانـا: مامۆستا! بە بڕوای جەنابت هۆكاری چییە ئێمە پەند وەرناگرین لە ڕابردوومان؟ ئایا پەندوەرگرتن لە ڕابردوومان مەسرەفی زۆر تێئەچێ؟ ئایا خۆمان بە زل ئەزانین؟ ئایا خۆمان لەوانەی پێش خۆمان بە عاقڵتر ئەزانین؟ بە بڕوای تۆ هۆكار چییە؟**

**مامۆستا:** هۆكار زۆرن، ئینسان تەنها عەقڵی ڕووت نیە، ئێستا فریشتەكان عیلم و عەقڵی ڕووتن، شەهوەت و ئارەزوو و تووڕەیی و هەڵچوون و ئەو صیفەتە خراپانەیان نین، لەبەرئەوە سەرپێچیی لە فەرمانی خوا ناكەن، چییان پێ بگوترێ، وەك چۆن كۆمپیوتەر چ مەعلووماتێكی بخەیە نێو، دوایی پرسیاری لێ بكە، وەڵامی ڕاستت دەداتەوە، فریشتەش ئاوان، بەڵام مرۆڤ كائینێكی زۆر ئاڵۆزە، مرۆڤ تەنها عەقڵ نیە، مرۆڤ نەفسە، ئارەزووە، كۆمەڵێ غەریزەیە، صیفەتی تووڕەیی هەیە، صیفەتی خۆشویستنی هەیە، ڕق لێ بوونەوەی هەیە.

وەڵامەكەی زۆر ئاشكرایە، بۆیە پەندوەرناگرن، عەقڵی دەیبینێ، بەڵام بەرژەوەندیی لەوەدا نابینێ، بەرژەوەندیی شەخصیی خۆی، یان بنەماڵەی، یان حیزبی، كە وەك ئەو كەس و كۆمەڵە نەكات كە بەهۆی ئەو ستەم و خراپەیەوە، تووشی بەڵا بوون. دیارە ئارەزووی نەفسیش عەقڵ كوێر دەكات، بۆ وێنە: كەسێك كە جگەرە دەكێشێت، هەر دوور نەڕۆین، بەپێی عیلم و عەقڵ دەزانێ جگەرەكێشان زیانی هەیە، بەڵام بۆچی دەیكێشێ؟ من پزیشكم بینیوە شەڕاب دەخوا، كە پێی بڵێی: دكتۆر گیان! تۆش ماددەی سەرخۆشكەر بەكار دێنی؟! تۆ لە خەڵك زۆر باشتر دەزانی ئەوە چ زیانێكی هەیە، دەڵێ: بەڵێ دەزانم، ئەدی بۆچی وادەكەی؟ وەڵامەكەی ئەوەیە: تاقەتی بەخۆی ناشكێ، چونكە ئینسان تەنها عەقڵ نیە، ئینسان وێڕای عەقڵ و ڕووح، نەفس و ئارەزووشە، بۆیەش لە ئیسلامدا زۆر باسی تەزكیەی نەفس كراوە، زۆر باسی ئەوە كراوە، نەفس دەبێ پاك و چاك بكرێ، ئەگەرنا ئەو نەفسە دەبێتە سەرچاوەی زۆر غەڵەت و پەڵەت، بە عەقڵ شت دەزانی، بەڵام نەفست ناهێڵێ بە حوكمی عەقڵ

ڕەفتار بكەی، بەڵكو وات لێ دەكا بە دوای غەریزە و هەواو ئارەزووەكانی خۆت بكەوی، لە حاڵێكدا كە عەقڵیش ڕەفزی دەكات، عیلم رەفزی دەكات، بەڵام نەفست وا ئارەزوو دەكات.

**دانـا: ماموستای بەڕێز! ئەگەر ئێمە، دەسەڵاتداران، خەڵك و جەماوەر بەگشتی، ئەگەر پەندمان وەرنەگرت لە ڕابردووی گەلانی پێش خۆمان، ئەو هەڵانەی ئەوانمان دووبارە كردەوە، ئەكرێ بڵێین: هەمان سزای دنیایی و دواڕۆژیش چاوەڕێمان دەكات؟**

**مامۆستا:** وەك پێشتر باسمكرد: هیچ كەس مافی ڤیتۆی نیە لە بەرامبەر خوا و یاساكانی خوادا، بۆ وێنە كەسێك كە لە ئەمریكا ژەهر بخوات، یان لە ئاسیا، یان لە ئوستوڕالیا، ئەگەر هەمان جۆرە ژەهر بێ و بە هەمان ئەندازە بێ، بە تەئكید، مەگەر جیاوازیی لە پێكهاتەی جەستەییاندا هەبێ، یەكێكیان بەرهەڵستیی (مناعە) بەهێزتر بێت و یەكێكیان كەمتر، ئەگەرنا هەر هەمان شوێنەوار كە لەسەر مرۆڤی ئەمریكیی دادەنێ ئەو ژەهرە خواردنە، لەسەر یەكێكی ئوستوڕالی و، ئاسیاییش دادەنێ.

نموونەیەكی دیكە: كافرێك و مسوڵمانێك بخە نێو ئاوەوە، ئەگەر مەلە نەزانن هەردووكیان دەخنكێن، چونكە بەپێی یاسای خوا، ئەگەر چوویە نێو ئاو، دەبێ مەلە بزانی، ئنجا ئەگەر كافرەكە مەلە بزانێ و مسوڵمانەكە مەلە نەزانێ، كافرەكە دەربازی دەبێ و مسوڵمانەكە دەخنكێ، چونكە مسوڵمانەكە پێچەوانەی یاسای خوا جووڵاوەتەوە، پێچەوانەی یاسای گەردوونیی خوا جووڵاوەتەوە، یاسای قەدەریی خوا، كە تۆ چوویە نێو ئاو دەبێ مەلە بزانی، ئەگەرنا دەخنكێی، ئەگەر ویستت بە شاخێ هەڵگەڕێی، دەبێ شاخەوان بی، ئەگەرنا ناتوانی، یان هەڵدەدێڕێی!

**دانـا: مەبەستت ئەوەیە بڵێی یاسا كەونییەكانی خوا بۆ هەموو لایەكن وەكو یاسا تەشریعییەكان نین؟**

**مامۆستا:** یاسا تەشریعییەكان تەنیا پابەندكەر (مُلْزِم)ن بۆ مسوڵمانان و كەسێك بڕوای بە ئەصڵی دین نەبێ، بە لق و پۆپەكانی دینەوە مولزەم نابێ، بەڵام

یاسا گەردوونییەكان بۆ هەموو كەسێكن و، بۆ هەموو لایەكن، بۆ وردو درشتن، هەڵبەتە یاسا شەرعییەكانیش بۆ هەموو لایەكن، ئەوانەی دێنە نێو ئیسلامەوە، بەڵام كەسێك نەیەتە نێو ئیسلامەوە، دیارە خیتابی شەرعیی ڕووی تێناكات.

جا مەبەستم ئەوەیە ئایا كەسێك كە ئێستا لە هەرێمی كوردستاندا، لە عێراقدا، لەهەر شوێنێكی دنیادا، ئەگەر هەمان شت كە خوا فەرموویەتی: فڵان گەلە لە مێژوودا ئەو تاوانەیان كرد، تووشی ئەو چارەنووسە بوون، تووشی ئەو سەرەنجامە بوون، بەو شێوەیە سزا دران لە دنیاداو، ئەو سزایەش چاوەڕێیان دەكات لە دوارۆژدا، ئایا بۆ خەڵكێكی ئێستای هەرێم و عێراق و كوێ و كوێش، هەر وایە؟! وەڵام: بێگومان هەر وایە، چونكە خوا سبحانه وتعالى یەكێ لە صیفەتەكانی خوا ئەوەیە كە كارزان (حكیم)ەو یەكی دیكە لە صیفەتەكانی خوا ئەوەیە كە دادگەرەو جیاوازیی بە مرۆڤەكان و بە خەڵكەكان ناكات، لە تەفسیری ئەو ئایەتەی دا دەفەرموێ:

﴿ وَمَن لَّمْ يَحْكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُو۟لَـٰٓئِكَ هُمُ ٱلْكَـٰفِرُونَ ﴿٤٤﴾ ﴾ [المائدة: ٤٤].

واتە: هەركەسێ حوكم نەكات بەوەی خوا ناردوویەتە خوار، ئەوانەن بێ بڕوایان.

هاتووە كە یەكێك لەلای (حذيفة بن اليمان) گوتی: حوزەیفەی یەمان گووتی ئەوە مەبەست پێی خاوەن كتێبەكانە، جوولەكە و نەصرانییەكان، ئەوان ئەگەر حوكم بەوە نەكەن كە خوا ناردوویەتە خوار، كافرن، بەڵام ئەوە ئێمەی مسوڵمان ناگرێتەوە! حوزەیفەی كوڕی یەمان (خوا لێی ڕازی بێ) قسەیەكی جوانی كرد: (نعم الإخوة لكم بنوإسرائيل، إذا كان لكم كل حُلْوةٍ و لهم كل مُرّة) گوتی: بەنو ئیسرائیل برای باشن بۆ ئێوە، ئەگەر هەرچی تاڵە بۆ ئەوان بێ و، هەرچی شیرینە بۆ خۆتان بێ! نەخێر وانیە، هەركەسێ حوكم نەكا بەوەی خوا ناردوویەتە خوار، ئەگەر جوولەكە و نەصرانی بێ، ئەگەر مسوڵمان بێ، هەركەسێك بێ، جوولەكەو نەصرانی لە ڕۆژگاری خۆیاندا، ئەوە بێگومان مانای وایە كە حوكمی پێ نەكات و سەرپێچیی لێ بكا و، سەرەنجام لە بازنەی ئەو شەریعەتە

بچێتەدەرێ، ئەوە یەك حوكمیان هەیە هەموویان، بە نسبەت یاسا شەرعییەكە وایەو بە نسبەت یاسا گەردوونیەكانیش بێگومان هەروایە.

تۆ تەماشا بكە ئەگەر لە ئیغریقی كۆندا، كاتێ خۆی لە میزۆپۆتامیا لەم عێراقە، لە میصر، لە هیند، لەهەر شوێنێك، مێژووی بەشەر بخوێنەوە، من زۆر تەماشای مێژووی كۆمەڵگاكان و مێژووی نەتەوەكانم كردوە، هیچ كۆمەڵگایەك هەرەسی نەهێناوە، مەگەر لە حاڵێكدا كە شیرازەی كۆمەڵگا تێكچووبێ بەهۆی زوڵم و ستەمەوەو، بە هۆی زێدەڕۆیی و خۆشگوزەرانییەوە، خۆشگوزەرانیی كەی ڕوودەدات؟ كاتێك كە، چینێك دەست بەسەر هەموو شتێكدا دەگرن و، خەڵكی دیكەی لێ مەحرووم دەكەن، یانی لەهەر شوێنێك لووتكەی بەرزت بینی، شیووی قووڵیش دەبینی.

(مصطفى لطفي منفلوطي) لە موناسەبەتی دیكەشدا باسمكردوە، كتێبێكی هەیە (النظرات)، قسەی جوان جوان دێنێ، دەڵێ: شەوێك، (دیارە لە لووبنان ژیاوە) شەوێك لە بەیرووت چوومە دەرێ، پیاسە بكەم، هەوای باڵی خۆم بدەم، گوێم لە ناڵە ناڵێك بوو، لێی چوومە پێش، فەرموو كاكە چیتە؟ كابرایەك بوو ئەژنۆی بە زگییەوە نووساندبوو، هاواری دەكرد، دەیگوت: سكم دێشێ، زگت بۆ دێشێ؟ گوتی: زۆرم برسییە، دەڵێ: ئەوەندەی كرا، هاوكارییم كرد و لەوی تێپەڕیم، لە گەڕەكەكەی ئەولاش كابرایەكی دیكە لەسەر گازی پشتێ ڕاكشابوو، ورگی لەبای كردبوو، ئەویش هاواری دەكرد، كاكە منیش زگم دێشێ، كاكە بۆ زگت دێشێ؟ گوتی: زۆرم خواردوە، ئنجا دەڵێ: زگ ئێشانی بابای تێر، زەریبەی زگ ئێشانی بابای برسییە، ئەگەر تێرەكە ئەو چوار پارووە زیادەی نەخواردبان، نە بۆ خۆی زگی دێشا، ئەگەر دابای بە برسییەكە، ئەویش زگی نەدەئێشا! هەموو كۆمەڵگایەكانی بەشەر هەر ئاوا تێكچوون، كە هەندێكیان لە تێرییدا زگیان ئێشاوەو هەندێكیان لە برسان، ئێستا لەم وڵاتی ئێمەدا هەیە هێندەی پارە هەیە، وەك بەرپرسێك گوتبووی: ژێرخانەكانیان پڕكردوون لە فەردە دۆلار، هێندەی پارە هەیە نازانێ لە كوێی دانێ! هی واش هەیە نازانێ چۆن ژیانی ڕۆژانەی خۆی بەڕێبكات، من خەڵك زۆر دێ بۆ لام، وەڵڵا هەیە

ئاتاجی ده هەزار دیناره، بۆیه زۆرم پێ عەجایبه، كەسانێك كه خۆیان لەم وڵاتەدا به چینی سیاسیی دەزانن، به مشوورخۆر دەزانن، به خاوەنی خەڵك و وڵات دەزانن، تەماشاش دەكەن خزم و حیزبیان پڕبووه، ملیاردلێرن، ملیۆنلێرن، ژیانیان زۆر جیایه، خەڵكی دیكەش دەبینن!! ئایا تۆ چۆن دەتوانی بڵێی من خاوەندارێتیی ئەو خەڵك و وڵاته دەكەم، چۆن دەتوانی بڵێی: مشوورخۆری ئەو خەڵك و وڵاتەم، چۆن دەتوانی بڵێی: من دڵسۆزی ئەو خەڵك و وڵاتەم؟! ناتوانی، عیلاجی بكه، ئەگەرنا ئاوا بەردەوام نابێ - من زۆر جار گووتوومه: له نەوەدەكاندا وەزعی خەڵك له ئێستا زۆر خراپتر بوو، ئەو مامۆستایانەی ئێستا خۆپێشاندان دەكەن، بەبیرم دێ، له ڕانیه بووم، مامۆستا هاتوه بۆ لام، كه مامۆستای خۆم بووه له سەرەتایی دەرسی پێ گوتووم، كه بینیم دەستیشیم ماچ كردو گوتم: فەرموو مامۆستا له خزمەتدام، گوتی: هاتووم بۆ یەك كیلۆ ڕۆن، گوتم باشه، گوتی: ئەگەر ئاردیشتان هەبێ، دوو سێ كیلۆ ئاردیشم بدەیه، دوو سێ كیلۆ ئارد! خوا ئاگاداره، گوتم: كاكه بێنه، تەنەكه ڕۆنێكی لێ بوو، نیوەی لێ دەرهاتبوو، گوتم: ها مامۆستا ئەوە ببه و، گوتم گونیه ئاردێكیشی بدەنێ با بیبا.

ئەو مامۆستایانه ئەو كاته صەبریان دەگرت، دەزانی بۆچی؟ یەكەم: ئەو كاته بەڕاستی حاڵەتی ئیمانیی و ڕووحیی بەهێزتر بوو له دڵی خەڵكدا، بەداخەوه تەوژمی عەلمانیی ئەو خەڵك و وڵاتەیان وا لێكرد، كه بەرەو عەلمانییەت و بەرەو سووڕانەوه له خولگەی غەریزەكان دا بڕوات، خەڵك وای لێهات بەها ئیمانییەكانی زۆر له دڵدا كز بوون. دوو: خەڵك و جەماوەر ئەو كاته تەماشای دەكرد بەرپرسەكانی وەك خۆی دەبینی، بەرپرسەكانیش ژیانیان زۆر جیا نەبوو له خەڵك، ئەو بەرپرسانه هیچی گاڕانه سەیارەی نەبوو، ڤیللایان نەبوو، گوێت لێیه عەزیزەكەم! سێیەم: خەڵك ئومێدی هەبوو دەیگوت: إن شاء الله پەرلەمان دادەنێین، حكوومەت بنیاد دەنێین، ئنجا وڵاتێكمان دەبێ، بەرەو قەوارەیەكی سیاسی سەركەوتوو دەچین! ئێستا پەرلەمانت هەیەو پەكتخستوه، حكوومەتت هەیه و ئیفلیجت كردوه، دەسەڵاتی دادوەرییت هەیه و حسابی بۆ ناكەی، بۆیه

خەڵك ئەمەل و ئومێدی نەماوە، جا مەبەستم ئەوەیە كە ئێمە ئەگەر چارەسەری نەكەین، بارودۆخەكە ئاوا بەردەوام بێ، مێژوو شاهیدە، كە ئەم وەزعەی ئێمە ناتوانێ بەردەوام بێ، مێژوو پێمان دەڵێ: فریای خۆتان بكەون، ئەگەرنا ناتوانن چیدیكە بەردەوام بن.

**دانــا: زۆر باشە، بگەڕێینەوە سەر قورئان، جارێكی تر، تا چ ئەندازەیەك پانتایی پەندو عیبرەت لە قورئاندا خوای گەورە گرنگیی پێداوە بۆ ئینسانەكان؟**

**مامۆستا:** ئەوەندە بەسە كە دوو لەسەر سێی قورئان بەسەرهاتە، بۆ بەسەرهاتیش خوا بە گشتی دەفەرموێ:

﴿ لَقَدْ كَانَ فِي قَصَصِهِمْ عِبْرَةٌ لِّأُوْلِي ٱلْأَلْبَٰبِ ۗ مَا كَانَ حَدِيثًا يُفْتَرَىٰ ﴾ [یوسف: ١١١].

واتە: لە بەسەرهاتیاندا {لە بەسەرهاتی پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) و گەلەكانیاندا} پەند هەیە بۆ خاوەن عەقڵان، قسەیەك نیە هەڵبەسترابێ، {بەڵكو فەرمایشتی خوایە} ئایا بۆچی خوا سبحانە وتعالی دوو لەسەر سێی قورئانی تەرخان كردووە، كە پانتاییەكی زۆرە بۆ بەسەرهاتی پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام)؟ ئەوە هەڵهێنجانی خۆمە، وەك لە تەفسیری سووڕەتی (یوسف)یشدا باسمكردوە: من پێموایە ژیانی بەشەر زۆربەی ڕۆیوە، كەمێكی ماوە، واتە لەو كاتەوە كە قورئان هاتووەتە خوار، ڕەنگە دوو لەسەر سێی ژیانی بەشەر تێپەڕی بێ، وەك لە هەندێ فەرمایشتی پێغەمبەریشدا (علیە الصلاة والسلام) ئاماژەی پێ دەكات، كە دوو لەسەر سێی (٣/٢)ی ژیانی بەشەر تێپەڕی بێ، یەك لەسەر سێی (٣/١)ی مابێ، جا ئەو دوو لەسەر سێیە، خوای پەروەردگار خستوویەتە نێو قورئانەوە، خستوویەتە نێو دوو لەسەر سێی قورئانەوە، كە تۆ بێنی تەماشای بكەی و پەندی لێ وەربگری، چونكە ئەوە قسەیەكی مەشهوورە دەڵێ: (التأریخ یعید نفسه) مێژوو خۆی دووبارە دەكاتەوە، زۆرجار وایە، تەماشا بكە بنەماڵەی ئومەوییی، ئومەوییەكان نزیكەی نەوەد ساڵێك حوكمیان كرد، لە ساڵی چلەوە كە معاویە بوو بە گەورەی مسوڵمانان، لە دوای چوار خەلیفە ڕاشیدەكان، تاكو

سەدو سی و دوو (١٣٢ ك)، نەوەدو دوو (٩٢) ساڵ، بۆچی هەر ئەوەندە؟! چونكە:

**١)** ئەو ماڵە بنەماڵەی ئومەویی ناویان لە غەیرە عەرەب نابوو (موالی)، یانی: وەك كۆیلە و شت تەماشایان دەكردن.

**٢)** لەجیاتی ئەوەی كە خەڵك سەرگەرم بكەن بە قورئان و سوننەتەوە، سەرگەرمیان دەكردن بە شیعری جاهیلییەوە، كە مونافەسەی (قَیسی) و (یمانی) پەیدا بوو، مونافەسەی تیرە عەرەبەكان پەیدا بوو، مونافەسەی بەینی عەرەب و نەتەوەكانی دیكە پەیدا بوو، لە ئەنجامی ئەوەدا كە تەنیا كاریان بۆ بنەماڵەكەی خۆیان دەكرد، زۆر نەیانتوانی دەوام بكەن.

عەباسییەكان لە دوای ئەوان هاتن، لە سەدو سی و دوو (١٣٢ ك)ەوە، (أبو عباس السفاح)ەوە تاكو جەعفەری مەنصوور، تاكو ساڵی شەش سەد و پەنجاو شەش (٦٥٦ ك )، یانی هی ئەوان زیاتری دەوام كرد، چونكە پەندیان وەرگرتبوو لە ئومەوییەكان و تۆزێ فراوانتر بیریان دەكردەوە، غەیرە عەرەبیشیان هێنابووە نێو كارەكانەوە، مەبەستم ئەوەیە چ تەماشای مێژووی خۆمان بكەین، وەك مێژووی مسوڵمانان، چ تەماشای واقیعی هاوچەرخمان بكەین، هەمووی پێمان دەڵێ: ئەوانەی كە لە قاوغ و قەپێلكی تەسكدا دەژین و، وە ئەوانەی كە بۆ ئامانجی بچووك دەژین، كەم بڕ دەكەن، بۆیە وا باشە ئینسان خۆی وا لێبكات، ئامانجی گشتی هەبێ و، وە بە یەك چاو تەماشای خەڵك بكات، بەتایبەت ئێمە كە میللەتێكی مەزڵوومین، لەسەر نەخشەی سیاسیی بوونمان نیە، زۆرمان زوڵم لێكراوە، بەڵام ئێستا كە ئێمە لەم بەشەی كوردستاندا، باشووری كوردستان، هەرێمێكمان بنیات ناوە، گلەیی لە كێ بكەین، كە وەزعمان بەوشێوەیەیە، پەرلەمانی خۆمان پەك دەخەین، حكوومەت ئیفلیج دەكەین، پێكەوە مەدار ناكەین، پێكەوە گرژین، هەركامێك وەك دوژمنی بابە كوشتە تەماشای ئەوی دیكە دەكات، گلەیی لە كێ بكەین؟ گلەیی لە ئێران بكەین، ئێران دێ ناوبژیوانیمان دەكات، گلەیی لە توركیا بكەین، بەهەمان شێوە دێن ئامۆژگارییمان دەكەن،

گلەیی لە بەغدا بکەین، گلەیی لە کێ بکەین، جگە لە خۆمان، بۆیە جێی خۆیەتی هەرچی زووترە، لەو خەوە بەخەبەر بێین، ئەگەرنا بەڕاستی کاتێك دەبینین کە زۆر هەلمان لەدەست داون، من ناڵێم دنیا ژێرەوژوور دەبێ، هەتا ئاخر زەمان، ونیا ژێرەوژوور نابێ، بەڵام پێموایە لە ڕابردوودا زۆر هەلمان لەدەست داون و ئەگەر بە عەقڵێکی ستراتیژیی و بە تەباییانە لەسەر بناغەی دادگەریی ئەم هەرێمەمان بەڕێوە ببردایە، ئێستا ئێمە هەرێمێکی ئاوا قەرزدار و بێ ژێرخانی ئابووریی و بێ هێزو سوپایەکی دامەزراوەیی نەدەبووین، کە پێویستیمان بەوە بێ هاوپەیمانان هەمیشە بە تەیارەکانیان هاوکاریمان بکەن و هەمیشە چەکمان بۆ بنێرن، هەموو شتێکی خۆمانمان دەبوو، هەر دوور نەڕۆین وڵاتێکی وەك مالیزیا کە من لە ساڵی ٢٠١١ چووم، گوتیان: لە ماوەی دە ساڵدا (مەهاتیر موحەممەد) نەخشەیەکی ئابووریی دە ساڵەی دانا بە یارمەتی خەڵکی شارەزا و کۆمپانیاکان، ئەم وڵاتەی بنیات نا، ئێمەش ئەوە دوای بیست و پێنج ساڵ هەر دەڵێین ساواین! لە حەقیقەتدا قەزیەکە ئەوەیە ئێمە مەحکوومی بەرژەوەندییە بچووکەکانی خۆمانین، مەحکوومی بەرژەوەندییە تەسکەکانی خۆمانین، بۆیە ناتوانین بەرژەوەندییە گشتی و گەورەکان بێنینە دی.

**دانـــا: مامۆستا دەگوترێت: ئەگەر پەند لە خەڵك وەرنەگرین دەبینە پەند بۆ خەڵکی داهاتوو، ڕای تۆ لەو بارەوە؟!**

**مامۆستا:** زۆرم پێ ڕاستە، ئایا ئێستا ئێمە نەبووبینە پەند؟ من پێموایە تاڕادەیەکی زۆر بووینە پەند، هەر تەماشا بکە، پەرلەمانەکەی بەغدا کە ئێمە گاڵتەمان بە بەغدا دەکرد، من جارێك باسی ئەوەم کردبوو، کە ئەگەر ئێمەش بتوانین وەك بەغدا بکەین، خەڵکێك لێرەوە، هەندێ دەهۆڵ کوت، (بەداخەوە هەندێ ڕاگەیاندنکاری دەهۆڵ کوت هەن، کە وەك کابرا تەماشا دەکەن: داخۆ بەرپرسەکەیان چی دەوێ؟ تەماشا ناکەن داخۆ ڕاستیی و عەدل لەکوێیە، ڕۆژێك بە سپییدا هەڵا دەڵێن، ڕۆژێك بە ڕەشدا هەڵا دەڵێن) گوتبوویان: تەماشا فڵانەکەس دەڵێ: بەغدا لە هەرێم پێشکەوتوو ترە! ئایا ئێستا دەرنەکەوت؟ لەوێ پەرلەمانەکە لەگەڵ ئەو هەموو کێشە و بگرە و بەردە و بارودۆخی ئەمنیی

ناتەواو و كێشمەكێشی مەزهەبیی و تائیفیی و دەستێوەردانی دەوڵەتان، بەڵام پەرلەمانەكەیان ماوەو توانیشی متمانە وەربگرێتەوە لە هەندێك وەزیر، ئێمەش پەرلەمانەكەمان نەك هەر نەیتوانی لە ماوەی بیست و پێنج ساڵی ڕابردوودا وەزیرێك بانگ بكات و لێپرسینەوەی لەگەڵدا بكات، بەڵكو ئەوەتا پەكخیش خرا و ئیفلیجیش كرا! بێگومان تاڕاددەیەك ئێمە بووینە پەند، بەڵام پێموایە زیاتریش دەبینە پەند، ئەگەر پەند وەرنەگرین، بە ئومێدی ئەوە كە هەم لە كەموكوڕییەكانی خۆمان پەند وەربگرین، هەم لە مێژوو پەند وەربگرین، لە مێژووی دوورو لە مێژووی هاوچەرخیشمان پەند وەربگرین، بۆ ئەوەی بەختەوەر بین گوتراوە: (السعید من اتَّعظ بغیره) بەختەوەر كەسێكە پەند لە غەیری خۆی وەردەگرێ، بەڵام بەدبەخت ئەو كەسەیە كە غەیری خۆی پەندی لێ وەربگرێ.

**دانـــا: بەڕێز مامۆستا عەلی باپیر نووسەر و ڕووناكبیر! سوپاس بۆ ئەوەی كە دووبارە لەم ئاڵقەیەشدا وەڵامی پرسیارەكانی ئێمەت دایەوە.**

**مامۆستا عەلی باپیر:** سوپاس بۆ جەنابیشت كاك دانا، سەلامەت بی.

# ئاڵقەی یازدەیەم

بنەمای یازدەیەم: پاکسازیی بە پاکان و، چاکسازیی بەچاکان و، ڕاستکردنەوە بەڕاستان دەکرێ.


ameer.maktab@yahoo.com

 /AliBapir  /AliBapir  /MediaAmeerOffice

www.alibapir.net

**دانـــا:** بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان، سڵاوتان لێ بێ بینەرانی ئازیز و خۆشەویست! خۆم بە خۆشحاڵ ئەزانم خوای پەروەردگار دەرفەتی پێبەخشینەوە لە ئاڵقەیەكی نوێ لە بەرنامەكەتان بەرنامەی بەدانایی لەگەڵ میوانی هەمیشەیی ئەم بەرنامەیەمان، زۆر بەڕێز و خۆشەویست مامۆستا عەلی باپیر نووسەر و رووناكبیردا، بەئێوەی ئازیز و خۆشەویست شاد ئەبینەوە.



مامۆستاگیان سڵاوی خوات لێ.

**مامۆستا:** سڵاوی خوا لە ئێوەش بێ بەخێر بێن.

**دانـا:** مامۆستا! لە درێژەی بەرنامەكەماندا لەو بابەتەی جەنابت لەسەر دۆخی هەرێمی كوردستان نووسیوتە، دە ئاڵقەمان تۆمار كردوون و، دە بابەتمان شرۆڤە كردوون، پشت بەخوای گەورە ئەمڕۆ لە ئاڵقەی یازدە داین و باس لە بنەمایەكی دیكە دەكەین، كە جەنابت ئاماژەت پێ كردوە (پاكسازیی بە پاكان و چاكسازیی بە چاكان و ڕاستكردنەوە بە راستان دەكرێ) لەوە ئەچێ بابایەك كە ئەمە بخوێنێتەوە یان بینەرێك كە گوێی لەمە بێت، جۆرێك لە پەند لە نەغمەیەكی شیعریی گوێ لێ بێ، چونكە دارشتنێكی جوانی بۆ كراوە، لەبەرئەوەی جەنابت نووسەری ئەم دەقەیت، حەزەكەم تێمان بگەیەنی مەبەست چییە لەوەی پاكسازیی بە پاكان ئەكرێ، چاكسازیی بە چاكان ئەكرێ؟

**مامۆستا:** الحمد لله، وصلى الله تعالى وسلم وبارك على رسول الله محمد، وآله المهتدين بهداه، من الصحب والأزواج والقرابة والتابعين لهم بإحسان الى يوم اللقاء.

ئەو بنەمایە كە من ئەو ناوونیشانەم بۆ داناوە، مەبەستم پێی ئەوەیە كە وەك بچینەیەكی لۆژیكیی دەڵێ: (فاقد الشي و لا يعگيه) كەسێك شتێكی نەبێ ناتوانێ لێی ببەخشێ، یان بیبەخشێ، گومانی تێدا نیە كە واقیعێك كە بویستێ پاكسازیی تێدا بكرێ، واتە بژار بكرێ لەو كەموكوڕیی و لەو ناهەمواریيانەی كە تێی كەوتوون، پاكسازیی مەبەست پێی ئەوەیە، ئنجا پاكسازیی دیارە وشەیەكی مانا فراوانە، گشتگیرە لە ڕووی فیكرییەوە، لە

ڕووی ڕه‌وشتییه‌وه‌، له‌ ڕووی ئابوورییه‌وه‌، له‌ ڕووی كۆمه‌ڵایه‌تی، له‌ ڕووی سیاسیی، له‌هه‌ر ڕوویه‌كه‌وه‌، كه‌موكوڕیی، ناڕێكیی ده‌كه‌وێته‌ شتێكه‌وه‌، ئه‌گه‌ر بویسترێت پاكسازیی تێدا بكرێت، پێویسته‌ ئه‌و شتانه‌ تێدا نه‌هێڵرێت و لێیان بژار بكرێ، دواتر مه‌به‌ست له‌ چاكسازیی ئه‌وه‌یه‌ دوای بژاركردن، ئنجا ڕازاندنه‌وه‌ دێته‌ پێش، ئه‌وه‌ش زانایانی ته‌زكیه‌ی نه‌فس ئه‌و زاراوه‌یه‌یان بۆ داناوه‌ (التخلية من الرذائل والتحلية بالفظائل) بژاركردن له‌ صیفه‌ته‌ نزم و خراپه‌كان و، ڕازاندنه‌وه‌ به‌ صیفه‌ته‌ به‌رز و په‌سه‌نده‌كان.

ئێمه‌ ئه‌گه‌ر بمانه‌وێ له‌م هه‌رێمی كوردستانه‌دا، یان له‌ هه‌ر واقیعێكی دیكه‌دا، هه‌ڵسین به‌ پرۆسه‌ی پاكسازیی، واته‌ هه‌ڵسین به‌ بژاركردنی كۆمه‌ڵگاكه‌مان، واقیعه‌ سیاسییه‌كه‌مان، له‌و كه‌موكوڕییانه‌ی كه‌ تێی كه‌وتوون، كه‌ بێگومان مه‌به‌ست له‌و كه‌موكوڕییانه‌ له‌سه‌ر ئاستی هه‌رێمه‌كه‌، به‌تایبه‌ت له‌ ڕووی حوكمڕانییه‌وه‌، زوڵمه‌، مه‌به‌ست نه‌بوونی دامه‌زراوه‌كانه‌، یان پێشێلكردن و په‌ككستنی دامه‌زراوه‌كانه‌، مه‌به‌ست پێشێلكردنی یاسایه‌، مه‌به‌ست ئه‌وه‌یه‌ به‌جۆرێك مامه‌ڵه‌ له‌گه‌ڵ خه‌ڵكدا بكرێ، كه‌ پاشخانی فیكریی و سیاسییان تێدا بخوێنرێته‌وه‌، له‌جیاتی ئه‌وه‌ی مرۆڤبوونیان و هاووڵاتییبوونیان بكرێته‌ پێوه‌ر و سه‌نگی مه‌حه‌ك، مه‌به‌ست ئه‌و قۆرخكارییه‌یه‌ كه‌ هه‌یه‌، مه‌به‌ست گه‌نده‌ڵییه‌ كه‌ هه‌یه‌، ئه‌گه‌ر بویسترێ پاكسازیی بكرێ و، چاكسازیشی تێدا بكرێ، چاكسازیش واته‌: پێچه‌وانه‌ی ئه‌وانه‌ بچه‌سپێنرێ، ببێته‌ وڵاتی دامه‌زراوه‌كان، یاسای تێدا سه‌روه‌ر بێ و، هاووڵاتیببون و مرۆڤبوون سه‌نگی مه‌حه‌ك بێ و، دادگه‌ریی بچه‌سپێ، یه‌كسانی هه‌بێ بۆ هه‌موو لایه‌ك، هه‌له‌كان و ده‌رفه‌ته‌كان بۆ هه‌مووان وه‌ك یه‌ك ده‌سته‌به‌ر بكرێن.

پاشان ئه‌و وشه‌یه‌ی دیشمان كه‌ به‌كارهێناوه‌: (ڕاستكردنه‌وه‌ به‌ ڕاستان ده‌كرێ)، ڕاستكردنه‌وه‌ش هه‌موو لایه‌ك ده‌گرێته‌وه‌، شتێك كه‌ خواره‌، ده‌بێ ڕاستبكرێته‌وه‌، مه‌به‌ست ئه‌وه‌یه‌ ئه‌گه‌ر كه‌سێك له‌ خودی خۆیدا پاك نه‌بێ و، وه‌ چاك نه‌بێ و ڕاست نه‌بێ، به‌ ته‌ئكید هه‌روه‌ك چۆن كه‌سێك كه‌ پاره‌ی نه‌بێ، ناتوانێ پاره‌ بدا به‌ خه‌ڵك، كه‌سێك كه‌ سێوی پێ نه‌بێ، ناتوانێ سێو بدات به‌ خه‌ڵكی، به‌هه‌مان

شێوە، كەسێ كە لە خودی خۆیدا، كەس وەك شەخص، وەك حیزب، وەك لایەن، هەركەسێ، ئەگەر پاك نەبێ، پاكسازیی پێ ناكرێ، چاك نەبێ چاكسازیی پێ ناكرێ، ڕاست نەبێ ڕاستكردنەوەی پێ ناكرێ، ئەوە شتێكی مەنتیقییە، ئەوەش من لە چەند ئایەتێكی قورئان وەرمگرتوە:

**١)** بۆ وێنە لە سوورەتی (یونس)دا لە باسی تێك گیران و مشتومڕی نێوان مووسا (علیه الصلاة والسلام) و فیرعەون دا، كە فیرعەون جادووگەرەكانی بۆ دێنێ، لەو سیاقەدا ئەو ڕستەیە هاتوە، كە دەفەرموێ: (إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُصۡلِحُ عَمَلَ ٱلۡمُفۡسِدِينَ) [یونس: ٨١]، واتە: بێگومان خوا كاری تێكدەران چاك ناكات، لەو سیاقەدا كە دەفەرموێ:

﴿وَقَالَ فِرۡعَوۡنُ ٱئۡتُونِي بِكُلِّ سَٰحِرٍ عَلِيمٖ ٧٩ فَلَمَّا جَآءَ ٱلسَّحَرَةُ قَالَ لَهُم مُّوسَىٰٓ أَلۡقُواْ مَآ أَنتُم مُّلۡقُونَ ٨٠ فَلَمَّآ أَلۡقَوۡاْ قَالَ مُوسَىٰ مَا جِئۡتُم بِهِ ٱلسِّحۡرُۖ إِنَّ ٱللَّهَ سَيُبۡطِلُهُۥٓۖ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُصۡلِحُ عَمَلَ ٱلۡمُفۡسِدِينَ ٨١ وَيُحِقُّ ٱللَّهُ ٱلۡحَقَّ بِكَلِمَٰتِهِۦ وَلَوۡ كَرِهَ ٱلۡمُجۡرِمُونَ ٨٢﴾ [یونس: ٧٩-٨٢]

ئایەتەكان ئاوا دەفەرموون: فیرعەون گوتی: هەموو جادووگەرێكی زانا و شارەزام بۆ بێنن، كاتێك جادووگەرەكان هاتن، مووسا پێی فەرموون: ئەوەی كە پێتانە فڕێی دەن (دیارە جادووەكەی ئەوان ئەوەبووە كە گۆچان و پەت و گوریسیان پێ بوون، فڕێیان دەدان، لەبەر چاوی خەڵك دەبوون بە مار و ئەژدیها) كاتێ كە فڕێیان دان مووسا فەرمووی: ئەو جادووەی كە كردتان، خوا هەڵیدەوەشێنێتەوە، دەیپوچێنێتەوە، (إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُصۡلِحُ عَمَلَ ٱلۡمُفۡسِدِينَ) بێگومان خوا كاری تێكدەران، خراپەكاران چاك ناكات، واتە بێ بەرهەم دەبێ، بێ ئاكام دەبێ.

ئنجا من مەبەستم ئەوەیە كە هەندێ كەس بانگەشەی ئەوە دەكات كە چاكسازیی دەكەین، پاكسازیی دەكەین، بارودۆخەكە ڕاست دەكەینەوە، بەڵام كاتێك ئەوە دەكرێ كە ئەو كەسە ئەو لایەنە، پێشێ بەو پرۆسەیە هەڵسابن لە خودی خۆیاندا، چونكە هەمیشە كردەوەی ئینسان بەرهەمی كەسایەتی ئینسانە،

كردەوەی لایەنێك بەرهەمی كەسایەتی و جۆر و چۆنیەتی ئەو لایەنەیە، ئەو لایەنە ئەگەر لە خودی خۆیدا پاك نەبێ، چۆن پاكسازیی دەكات، واتە: چۆن پاكیی بچەسپێنێ ئەگەر نەیبێ، چۆن چاكیی بچەسپێنێ، ئەگەر خۆی نەیبێ، چۆن بارودۆخێكی لار ڕاست دەكاتەوە، ئەگەر خۆی ڕاست نەبێ.

٢) ئایەتێكی دیكە كە من لەوێدا هێناومە، دەفەرموێ: ﴿ وَٱللَّهُ لَا يَهۡدِي ٱلۡقَوۡمَ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴾ [البقرة : ٢٥٨]. واتە: خوا ستەمكاران ناخاتە سەر ڕێی ڕاست.

لێرەدا ڕستەی (لَا يَهۡدِي ) بە مانای (ڕێنمایی ناكات)، بەڵكو یانی: (خوا ستەمكاران ناخاتە سەر ڕێی ڕاست) چونكە خوا سبحانه وتعالى وەك ناردنی ڕێنمایی بۆ هەموانی ناردوە، بۆ هەموو لایەك بەبێ جیاوازیی، بەڵام كێن ئەوانەی لە ڕێنمایی خوا، لە هیدایەتی خوا بەهرەمەند دەبن، ئەوانەی كە دەستیان نەچووبێتە زوڵمەوە، كەسێك كە دەستی دەچێتە زوڵمەوە، ناكەوێتە سەر ڕێی راست، ئنجا جاری وا هەیە پێی نازانێ بەڕێیە ڕاستەكە، نایبینێ، بەڵكو ڕاست بە چەوت دەبینێ، چەوتیش بە ڕاست، ئینسان بینینەكەی تێكدەچێ، تێڕوانینەكەی تێكدەچێ، جاری واش هەیە دەیزانێ، بەس نایتوانێ، چۆن؟ دەزانێ كە دەبێ بەو شێوەیە بێت و ئاوا وڵات بەرەوپێشێ دەچێت و، ئاوا بۆ هەموو لایەك باشە، بەڵام ئەو بەرژەوەندییە ناشەرعییەكانی، بەستراونەوە بە لادان و ستەمەوە، بەبێ دادییەوە، ئەگەر بێت و لادان و ستەم و بێدادیی نەمێنێ، ئەو ڕاوچییە خراپە ڕاوەكەی پێ ناكرێ، ڕاوچیی خراپ لە ئاوی لێڵدا ڕاو دەكات، دز بازاڕی ئاڵۆزی دەوێ.



٣) ئایەتێكی دیكە، دەفەرموێ:

﴿ وَٱللَّهُ لَا يَهۡدِي ٱلۡقَوۡمَ ٱلۡفَٰسِقِينَ ﴾ [المائدة: ١٠٨]

خوا كۆمەڵی لاڕێیان ناخاتە سەر ڕێی راست، یان ڕێنماییان ناكات، بەڵام ڕاستتر وایە مانای یەكەمی لێ وەربگرین: نایانخاتە سەر ڕێی راست. چونكە (فِسق) بە مانای (خروج)ە، (الفاسقين) یانی: (الخارجين عن الصراط، عن

الطريق)، له حوكمی عەقڵ دەرچوون، له حوكمی شەرع دەرچوون، له حوكمی فیگرەت دەرچوون، له حوكمی لۆژیك دەرچوون.

بەڵێ ئەگەر بمانەوێ به جیددیی بیر لەوە بكەینەوە ئەم بارودۆخە چاك بكەین، ئەو كاراكتەرانەی كه ئەوەیان له مێشكدا هەیە، ئەوەیان له بەرنامەدا هەیە، پێشێ دەبێ چاو به خۆیاندا بگێڕنەوە، بڕیار بەدەستانی ئەم وڵاتە، دەبێ چاوێك به خۆیان و حیزب و خزم و دەروبەریان دا بگێڕنەوە، ئەوان و دەوروبەرەكەی ئەوان، بارودۆخەكەیان تێكداوە، زۆر جار بیگانەی خراپ و دەوروبەری خراپیش له قەدەر ئەو كەسەن له دەورنی، دیسان لەوەشدا نابێ به سەهوودا بچین، زۆر جاران دەگووترێ: ئەو بەرپرسە، ئەو بڕیاربەدەستە، زۆر زۆر ئینسانی باشە، بەس حەیفێ دەوروبەرەكەی خراپە! هەرگیز وانییە، (الطيور على أشكالها تقع) (الجنس إلى الجنس يميل) ئەگەر ئینسان خۆی باش بێ، دەوروبەریشی باش دەبێ، تۆ تەماشا بكە موگناتیس چی كێش دەكات بۆ لای خۆی؟ له جینسی خۆی، ئایا تەختە و نایلۆن و پووشكە و كاو چیلكە كێش دەكات؟ نەخێر، بەڵكو دەبێ شتەكە له توخمی خۆی بێ، له جنسی خۆی بێ، فافۆن جەزب دەكات؟ نەخێر، بەدڵنیاییی هەركەسە له شێوەی خۆی دەوروبەر بۆ خۆی پەیدا دەكات.

بەڵێ جاری وا هەیە ئەو كەسە ئەو بەرپەرسە ئەو بڕیاربەدەستە، مەرج نیە ئەوەندە خراپ بێ، خەڵكێكی خراپ دەوری لێ دەدا خراپتری دەكەن، بەڵام بۆ خۆشی سووچی تێیدا هەیە، وەك گوتراوە: كاتی خۆی له سەردەمی عومەری كوڕی عەبدولعەزیز دا ڕەحمەتی خوای لێ بێت پێنجەمین خەلیفەی ڕاشید كه پیاوێكی زۆر صاڵح بووە، له بەنی ئومەییە، زانایان گوتوویانە: (عمر بن عبدالعزيز نجيب بني أميه) یانی باشترینی بەنی ئومەییەیە، ئنجا له سەردەمی ئەودا: خەڵك دەیانپرسی: چەندەت قورئان لەبەر كردوە؟ شەونوێژت چۆنە؟ ڕۆژووی سوننەتت چۆنە؟ صیلەی ڕەحمت؟ زانستت چەندە وەدەست هێناوە؟ چیت كردوە له كاری چاك؟ باس باسی ئەوەبوو له كۆڕ و مەجلیسەكاندا، له سەردەمی عومەری كوڕی عەبدولعەزیز، چونكە بۆ خۆی خەریكی ئەوەبوو، بەڵام له سەردەمی سولەیمانی كوڕی عەبدولمەلیك و وەلیدی كوڕی سولەیمان

و ئەوانی دیكەدا، باس باسی خانووبەرە بوو، باس باسی بازرگانیی بوو، باس باسی ماڵ و سامان بوو، باسی ئەو شتانە بوو، باسی دنیا بوو، ئنجا یەكێ لە زانایان دەڵێ: (الحاكم سوقٌ یروج فیها ما یَروُج عنده) یانی: چ شتێك لە لای پادشا و حوكمڕان ڕەواجی هەبێ، ئەو شتە لە دەوروبەری ئەو ڕەواجی دەبێ، وەك بازاڕ وایە، بۆیە نابێ خۆمان هەڵخەڵەتێنین، هەر بڕیاربەدەستێك دەوروبەری بە بیگانەیەكی خراپ تەنرابوو، دەبێ نیشانەی پرسیار بخەیە سەر خۆیشی، ئەدی بۆچی خەڵكی باش بەلای خۆتدا كێش ناكەی، خەڵكی دڵسۆز، خەڵكی پاك؟ ئەم كۆمەڵگایەی ئێمە، چ لە چینی سیاسییدا، چ لە چینی خوێندەواران و ڕۆشنبیرانیدا، چ لە چینی ئیدارییەكانیدا، خەڵكی باش هەر هەیە، ئەگەر ئەو ئینسانە بۆ خۆی باش بێ، لە شێوەی خۆی خەڵك بەلای خۆیدا كێش دەكات و، وە ئەگەر خراپیش بێ، هەر لە شێوەی خۆی.

**دانـا: ئەگەر لەو ئایەتانەوە كە جەنابت ئاماژەت پێ كردن، ئەم قسەیە بكەین: زۆر جار دوعا ئەكرێ، خوایەگیان! ئەم وەزعەمان بۆ چاك بكەی، خوایە كاربەدەستان چاك بن، خوایە چی. كۆمەڵێ دوعا بەرز ئەكرێتەوە بۆ لای خوای پەروەردگار، خەڵك ئەڵێ: باشە بۆچی خوای پەروەردگار ئەم وەزعەمان بۆ ناگۆڕێ؟ ئایا خوای گەورە شتێك دەستكاریی ناكات و ناگۆڕێ كە بەرهەمی خۆمانە و خۆمان لاماندا‌وە؟!**

**مامۆستا:** (دوعا) ئەویش مەرجی خۆی هەیە، شێوازی شەرعییانەی هەیە:

**یەكەم:** هەركەسێ دوعایەك بكات، پێچەوانەی یاساكانی خوا بێ، ئەو دوعایە لەجێی خۆیدا نیەو گیرا نابێ، وەك كوردەواریی خۆمان دەڵێن: قسە بكە جێ بگرێ، ڕبە بپێوە سەر بگرێ، نابێ قسەیەك بكەی بێ جێ بێ، بۆ وێنە: لە زستانێدا بڵێی: خوایە! با سەرما نەبێت، یان لە هاویندا بڵێی: خوایە! با گەرما نەبێت، ئاخر یاسای خوا وایە هاوین گەرمە و زستان ساردە، یان خۆت بخەیە نێو ئاوێ، بەبێ ئەوەی مەلە بزانی، ئنجا بڵێی: خوایە! نەخنكێم، مەلەش نازانم، بەڵام دەربازم بكە، ئەوە مەگەر وەك شتێكی یاسادڕ (خارق العادة)، ئەگەرنا

بەپێی قانوونی خوا بێ، ئەوەی مەلە نەزانێ، لە ئاودا دەخنكێ، كافر بێ، یا مسوڵمان بێ، ئەوەی مەلەش بزانێ، مەگەر چۆن ئەگەرنا دەربازی دەبێ، چونكە بەپێی یاسای خوا، كە چوویە نێو ئاوێ دەبێ مەلە بزانی.

واتە: نابێ دوعایەك بكرێ، داوایەك لە خوا بكرێ، پێچەوانەی یاساكانی خوا بێت، كەسێك كە تەمبەڵ تەمبەڵ لێی دانیشتوەو دەستەو ئەژنۆ، لە واقیعێكەوە رادەمێنێ، ئنجا دەپارێتەوە: خوایە! چاكی بكەی، بۆچی خوا كرێكاری تۆیە؟ ئەدی خوا تۆی دروست نەكردوە بۆ كارو چالاكیی؟ وەك فەرموویەتی:

﴿ وَقُلِ ٱعۡمَلُواْ فَسَيَرَى ٱللَّهُ عَمَلَكُمۡ وَرَسُولُهُۥ وَٱلۡمُؤۡمِنُونَۖ ﴾ [التوبة : ١٠٥]

واتە: بلێ كار بكەن، بجووڵێن، خوا كردەوەكەتان دەبینێ و پێغەمبەرەكە و بڕوادارانیش.

دەبێ كار بكرێ و هەوڵ بدرێ، كۆشش بكرێ، ئەوە یاسای خوایە دەفەرموێ:

﴿ وَأَن لَّيۡسَ لِلۡإِنسَٰنِ إِلَّا مَا سَعَىٰ ﴿٣٩﴾ ﴾ [النجم : ٣٩]

واتە: هیچ بەرهەمێك بۆ مرۆڤ نیە، مەگەر هەوڵ بدات و كۆشش بكات.

ئنجا تەماشا بكە! لێرە فەرموویەتی: ( وَأَن لَّيۡسَ لِلۡإِنسَٰنِ )، نەیفەرمووە: (للمسلِمِ) یان (للمؤمِنِ)، مرۆڤ بەگشتی كافر بێ یا مسوڵمان بێ، بەئەندازەی ئەوە كە هەوڵ دەدات و كۆشش دەكات بەرهەمی دێتە دەست.

وەك لە سوورەتی (الإسراء)دا دەفەرموێ: ﴿ مَّن كَانَ يُرِيدُ ٱلۡعَاجِلَةَ عَجَّلۡنَا لَهُۥ فِيهَا مَا نَشَآءُ لِمَن نُّرِيدُ ثُمَّ جَعَلۡنَا لَهُۥ جَهَنَّمَ يَصۡلَىٰهَا مَذۡمُومٗا مَّدۡحُورٗا ﴿١٨﴾ وَمَنۡ أَرَادَ ٱلۡأٓخِرَةَ وَسَعَىٰ لَهَا سَعۡيَهَا وَهُوَ مُؤۡمِنٞ فَأُوْلَٰٓئِكَ كَانَ سَعۡيُهُم مَّشۡكُورٗا ﴿١٩﴾ كُلّٗا نُّمِدُّ هَٰٓؤُلَآءِ وَهَٰٓؤُلَآءِ مِنۡ عَطَآءِ رَبِّكَۚ وَمَا كَانَ عَطَآءُ رَبِّكَ مَحۡظُورًا ﴿٢٠﴾ ﴾ [الإسراء: ١٨ـ ٢٠].

سەرەتا خوا باسی ئەهلی دنیا دەكات، دەفەرموێ: هەركەسێك دنیای بوێ،

بەو ئەندازەیەی بە چاكی بزانین، بۆ هەركەسێك پێی دەدەین، بەڵام دوایی دۆزەخی بۆ دەرەخسێنین بەسەركۆنەكراویی دەچێتە نێوی. دوایی دەفەرموێ: هەركەسێك دوارۆژی بوێ و هەوڵیشی بۆ بداو بڕواداریش بێ، ئەوانە هەوڵەكەیان سوپاسكراوە دوایی دەفەرموێ: ( كُلًّا نُّمِدُّ ) هەردووك لایان ئەهلی دنیا و ئەهلی دوارۆژ، ئیمداد دەكەین، یانی: هاوكارییان دەكەین، پێیان دەدەین، (مِنْ عَطَآءِ رَبِّكَ ) لە بەخششی پەروەردگارت، (وَمَا كَانَ عَطَآءُ رَبِّكَ مَحْظُورًا ) بەخششی پەروەردگارت قەدەغە نیە، واتە لە كافرانیش قەدەغە نیە، كافریش هەوڵبدات، بەرهەمی دەستگیر دەبێت، مسوڵمانیش هەوڵ نەدات، هیچی دەستگیر نابێ. بەڵێ دوعا كۆمەڵێك مەرجی هەن، یەكێك لە مەرجەكانی ئەوەیە نابێ شتێك داوا بكرێ پێچەوانەی یاساكانی خوا بێ.

**دووەم:** نابێ دوعا بكرێتە بەدیل بۆ هەوڵدان، تەماشای پێغەمبەری خاتەم بكە موحەممەد (صەڵات و سەلامی خوای لەسەر بێ)، بۆ وێنە: كۆچ دەكات لە مەككەوە بۆ مەدینە، تەماشای شێوەی كۆچكردنەكەی بكە! هەرچی هۆكار هەیە و بە فیكری بەشەردا دێ، پێغەمبەری خوا (علیه الصلاة والسلام) دابینی كردوون:

١) دوو وڵاخی بۆ خۆی و بۆ ئەبوبەكر كڕیون و نەخشەی داناوە، كا و ئالیكیان بدەنێ و حازر بن.



٢) بە شەو لە ماڵ دەردەچێ.

٣) پاشان دەچێتە ئەشكەوتێكەوە كە پێچەوانەی ئەو ئاڕاستەیەیە كە بۆی دەچێت، ئەو دەبێ بۆ لای ڕۆژهەڵات و باكوور بچێ، كە مەدینە لەوێیە، كەچی ئەو دەچێتە ئەشكەوتی (پور)ەوە كە لە باشووری مەككەیە، یانی پێچەوانەی ئەو ئاڕاستەیەی كە بۆی دەچێ، چونكە ئەوان دەچن لەولا دەگەڕێن، گومانیان وایە بەرەو مەدینە چووبێ، بەڵام ئەو دەچێ بەرەو ئاراستەیەكی پێچەوانە.

٤) سێ شەو و ڕۆژ لەوێدا دەمێنێتەوە.

٥) ئەسمآ خواردنیان بۆ دێنێ و عەبدوڵڵای كوڕی ئەبوبەكر مەڕەكان دەلەوەڕێنێ بۆ ئەوەی شوێن پێی ئەسمآ بسڕێتەوە!

٦) كەسێك بەكرێ دەگرێ بۆ ئەوەی ببێتە دەلیلیان، عەبدوڵڵای كوڕی ئورەیقیگ كە موشریك بووە،كە دیارە مسوڵمانێكی شارەزای دەستنەكەوتوە، هاوبەش بۆ خوا دانەر بووە، بەڵام شارەزا بووە، دیارە جێی متمانەشیان بووە، ئەوە بە دەلیل دەگرێ، نەك مسوڵمانێكی نەشارەزا، ئاخر مسوڵمانێكی نەشارەزا چ سوودی هەیە؟ كافرێكی شارەزا پسپۆڕ، لێی بەهرەمەند دەبی.

لە هەموو حاڵەتەكاندا پێغەمبەری خوا (علیه الصلاة والسلام) هۆكارەكانی هەرچی دەستی پێگەیشتووە، هەمووی دابینكردوون، ئنجا دوایی دوعای كردوە، كەواتە: دوعا دەبێ لە شوێنی خۆیدا بێ.

**دانـــا:** **خەڵكی ئێمە زۆر دوعا ئەكا و گیرا نابێ، دوایی ئەڵێن: خوا بەدم دوعاكانمانەوە نایەت!**

**مامۆستا:** لەبەرئەوەی كە دوعاكانمان لەجێی خۆیاندا نین، دوعا زۆر كەس دەیكا بە بەدیل بۆ هەوڵدان، هەرچەندە باسەكەمان ئەوە نیە، بەڵام تێبینیم هەیە لەسەر زۆر لە دوعای مامۆستایان، ئەو دوعا دوورو درێژانەی كە دەكرێن، نەك هەر هی ئێرە، هەر لە سعوودیەوە پێدا وەرە، كە من پێم وایە لە ئەنجامی ئەوەدا كە زۆر لە زاناو مەلایەكانی سعوودیە و بواریان نادرێ ئەركی فەرمان بە چاكە و ڕێگریی لە خراپە، ئەركی قسەی حەق گوتن ئەنجام بدەن، هەروەها ڕێ بە خەڵك نادرێ خۆپیشاندان بكات، مان بگرێ، ڕەخنە بگرێ، بۆیە ئەوان هەموو هێزی خۆیان خستووەتە نێو دوعا، لێرەش ئەو مامۆستایانەی خۆشمان زۆریان لاسایی ئەوێ دەكەنەوە، ئەگەرنا دوعای نیو سەعاتیی، لە ئیسلامدا نیە، ئەوە تەماشای قورئان بكە! هیچ پێغەمبەرێك نییە (علیه الصلاة والسلام) نەبووە نیو سەعات هەرچی داواكاریی دنیاو قیامەت هەیە بیهێنێ خڕی بكاتەوە لەو مەقامەدا! دوعاكانی پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام)، هیچیان لە چەند دێڕێك تێناپەڕن، ئەوپەڕی با لاپەڕەیەك بێ، بەڵام تۆ بێنی سێ چارەگ،

نیو سەعات، بەتایبەتی لە قنووتی ڕەمەزاندا، خەڵك ڕابگری! من بۆ خۆم لە سعوودیە نوێژم كردوە، ئەو ساڵە كە بۆ كۆبوونەوەی مەككە چووین لە ٢٠٠٦ دا، كۆبوونەوەیەك بوو بۆ چارەسەری كێشەی گائیفی عێراق و نوێنەرانی هەموو لایەنەكان چووبوون، ئێمەش چوو بووین، سێ چارەگ، نیو سەعات دوعا بكرێ، هەرچی بە فیكر و تەصەووری بەشەردا دێ بیهێنی، خوایە! ئەوەمان بۆ بكە و ئەوەمان بۆ بكە، یان لێرە هەندێك لە مامۆستایەكان دووعا دەكەن: خوایە! هەرچی ئافرەتە و شووی پێنەكراوە، شووی بۆ پەیدا بكەی، هەرچی پیاوە و ژنی نەهێناوە، ژنی بۆ پەیدا بكەی، هەرچی كرێچییە خانووی بۆ دابین بكەی، هەرچی قەرزرداره قەرزی بۆ بدەیەوە، هەركەس منداڵی نیە، منداڵی بدەیە، هەرچی نەخۆشە چاكی بكەیەوە، كە ئەگەر ئەو دوعایانە قبووڵ بن، دەبێ هەموو دكتۆرەكان عیادەكانیان دابخەن! ئەو دوعایانە هەموویان بێ جێن! یان چۆن دەگونجێ هەر كەس منداڵی نیە، منداڵی پەیدا بێ؟! خوای پەروەردگار بەدەقی ئایەت دەفەرموێ:

﴿وَيَجۡعَلُ مَن يَشَآءُ عَقِيمًاۚ﴾ [الشورى: ٥٠]

هی وا هەیە نەزۆكە، پێغەمبەری خوا (علیه الصلاة والسلام) هەرگیز دوعای وای نەكردووە.

هەروەها خوایە! هەرچی كافرە لەبەینی بەری، منداڵەكانیان هەتیو بكەی، ژنەكانیان بێوەژن بكەی، ماڵەكانیان كاول بكەی! كە ئەگەر دەوڵەتێكی ئیسلامیی هەبێ و دنیا دابگرێ، هەر فریای ئەوە دەكەوێ هەتیو بەخێو بكات و بێوەژنان بحەوێنێتەوە، ئەوە كەی دوعایە؟!

**دانـا: مەبەستی من ئەوە بوو كە خەڵك ئەیەوێ خۆی لە ڕاستە شەقامەكە لابدات و خوای گەورە بیهێنێتەوە سەر ڕێ!**

**مامۆستا:** منیش مەبەستم ئەوەبوو بەو موناسەبەتەوە ئەوە باس بكەم، كە بەڕاستیی زۆر لە خەگیبهكان زۆر جۆرە دوعای بێ جێ دەكەن، دەمەوێ ئەوانە هۆشیار

ببنەوە، كە ئەو جۆرە دوعایانە هیچیان شەرعیی نین، خوایە! هەرچی كافرە بیفەوتێنە، كوا شتی وا هەیە! خوا دەفەرموێ:

﴿ هُوَ ٱلَّذِي خَلَقَكُمْ فَمِنكُمْ كَافِرٌ وَمِنكُم مُّؤْمِنٌ ﴾ [التغابن: ٢]

كافر و مسوڵمان دەبێ هەبن، كە خوا بە یەكدییان تاقی دەكاتەوە، ﴿ وَلَوْ يَشَآءُ ٱللَّهُ لَٱنتَصَرَ مِنْهُمْ وَلَٰكِن لِّيَبْلُوَاْ بَعْضَكُم بِبَعْضٍ ﴾ [محمد: ٤]

خوا دەیتوانی، كە كافران لەبەین بەرێ، بەڵام دەیەوێ بەیەكدی تاقیان بكاتەوە.

ئنجا سوننەتی خوا لەژیانی مرۆڤ دا وایە : پارەدار دەبێ، قەرزدار دەبێ، نەخۆش دەبێ، ساغ دەبێ، چاك دەبێ، خراپ دەبێ، بەڵام دەیەوێ بۆ خۆی هیچ نەكات و خوا هەموو شتەكانی بۆ بكات، ئەدی خوا تۆی بۆچی دروست كردوە؟

**دانــا: مامۆستا! تێبینیم كردووە لەوەی كە جەنابت جۆرێك لە قۆناغ بەندییت ڕەچاو كردووە: سەرەتا پاكسازیی دوایی چاكسازیی دوایی ڕاستكردنەوە، دەمەوێ بزانم ئەمە هەروا بە ڕێكەوت وایە، یان بە مەبەست ئاوا قۆناغ بەندییت كردوە؟**

**مامۆستا:** ئەگەر تێبینیت كردبێ جەنابیشت و بینەران و بیسەرانی بەڕێزیش، من لە كۆی كتێب و بەرهەم و وتارو كۆڕ و چالاكییە فیكرییەكانمدا، ڕەچاوی ڕیزبەندیی عەقڵی و مەنتیقیی دەكەم، واتە شتەكان چۆن لە دنیای واقیعدا هەن، هەوڵدەدەم ئاوا ڕیزبەندیی مەنتیقیی و پلە پلەیی ڕەچاو بكەم، بۆ وێنە كەسێ بیەوێ زەوییەك داچێنێ و بیكاتە كشتوكاڵ، چی دەكات؟ دیارە پێشێ دەچێ ئەگەر گاشە بەردی گەورەی تێدا بن، ئەگەر شتێكی نەگونجاوی تێدا بێ، كە نەگونجێ لەگەڵ كشتوكاڵ دا، لایدەبات و هەڵیدەوێژێرێ، هەڵوێژاردن یانی: بژار كردن، ئەمجار دێنێ دەیكێڵێ، دوایی دەیچێنێ، یانی: هەمیشە بژار كردن و پاكسازیی لە پێش چاكسازییەوەیە، ئنجا وشەی ڕاستكردنەوەشمان داناوە، هەرچەندە هەردووكیان دەگرێتەوە، بەڵام جاری وا هەیە ئێمە دەتوانین

بڵێین: ئەم وڵاتەی ئێمە پۆخڵ كراوە، پیس كراوە، بە زوڵم و ستەم و بێ دادیی و بێسەرەوبەرەیی و دەبێ پاكسازیی تێدا بكەین، لەجێی مونكەر و خراپە، شتی پەسەندو چاك دابنێین.

دەشگونجێ بەشێوەیەكی دیكە تەعبیری لێ بكەین و بڵێین: ئەم حاڵەت و بارودۆخەی ئێمە، لارە، وەك چۆن كەسێك بارێك دەخاتە سەر پشتی وڵاخێك، لار دەبێ، دەبێ ڕاست بكرێتەوە، یان كەسێك بەڕێیەكی لاردا دەڕوات، ڕێیەكەی هەڵە دەكات، دەبێ راستی بكەیەوەو بیهێنیەوە سەر ڕێ، دەگونجێ ئاواش تەعبیری لێ بكەین، بۆیە گوتوومە: ڕاستكردنەوە بەڕاستان دەكرێ. ئنجا وەك پێشتریش باسم كرد: لە ڕووی تەزكیەی نەفسیشەوە، دەبێ لەپێشدا (تخلیە) هەبێ ئەمجار (تحلیە) هەبێ، دەبێ پێشێ بژاركردن هەبێ، دوایی ڕازاندنەوە دەبێ، یانی: كەسێك ئەگەر گیرۆدە بووبێ بە ناشەرعییانەوە، لە ژیانی تایبەتی خۆیدا، گیرۆدە بووبێ بە غەڵەت و پەڵەت و كەموكوڕیی و گوناحەوە، دەبێ چی بكا؟ هەر یەكسەر دەست دەكات بە تاعەت؟ نەخێر، جارێ پێشێ دەبێ واز لە خراپەكان بێنێ، ئنجا دوایی دەست بە چاكان بكات. زانایان دەڵێن: (گەڕانەوە بۆ لای خوا) هەنگاوی یەكەم: بریتیە لەوە كە دەست هەڵبگرێ لەو گوناحانەی تا ئێستا كردوونی، ئەوە بژاركردنەكەیە.

هەنگاوی دووەم: ئەوەیە كە پەشێمان بێتەوە لەوەی كە كردوویەتی.

هەنگاوی سێیەم: ئەوەیە كە بڕیاربدات نەگەڕێتەوە سەریان و لێیان پەشێمان بێ بە دڵ، بە كردەوەش نەچێتەوە سەریان.

دوایی پێچەوانەی ئەوانە بكات، پێچەوانەی ئەو كردەوانەی كە تا ئێستا كردوونی، ئەو گوناح و تاوانانە، پێچەوانەی ئەوانە ڕەچاو بكات كە دینداریی و طاعەتە.

**دانـا: لەوەئەچێ ئێستا یەكێ بپرسێ: مامۆستا عەلی باپیر! ئێستا كە ئەوترێ: ئەو زەوییە پاككراوەتەوە لە مین، كەواتە بە مین پیس بووە، یان زەوییەكی كشتوكاڵیی بژاری هەبووە!**

**مامۆستا:** یاخود گاشە بەردی گەورە گەورەی لێ بوون، كە لەنێو زەوییەكاندا كۆمەڵە بەردێك خڕدەكرێنەوە سەر یەك، جوتیار ناتوانێ بیانباتە دوور، ناچار لەوێدا كۆیان دەكاتەوە، چونكە هەتا بەردەكان هەبن، ڕێ لە كشتوكاڵ دەگرن.

**دانـا: ژینگەی سیاسی و ئابووریی و كۆمەڵایەتیی و ئیدارەدانی ئەم وڵاتەی ئێمە، بە چی پیس بووە، وا جەنابت دەڵێی دەبێ پاك بكرێتەوە و بە پاكانیش پاك ئەكرێتەوە؟**

**مامۆستا:** پێموایە ئەم وڵاتەی ئێمە خوا خێروبێرێكی زۆری تێهاویشتوە، بەم دوا دواییانە زانرا نەوت هەیە لە هەرێمی كوردستاندا، پێشتر وا دەزانرا تەنیا لە كەركووك هەیە، بەڵكو ئێستا دەركەوتوە كە غازیش هەیەو، ڕەنگە دوایی دەركەوێ كە شتی دیكەشی تێدایە.

هەروەها ئەم وڵاتەی ئێمە، وڵاتێكی كشتوكاڵییە، ئاوی شیرینمان هەیە، چونكە لە هەندێ شوێنان دەبێ ئاوی سوێر بپاڵێون، ئنجا ئاوی شیرینیان دەست دەكەوێ، ئێمە ئەو هەموو كانی و سەرچاوانەو ئەو زێی گەورە و زێی گچكەمان هەن، كە بەنداوییان لەسەر دروست كراون و، كە دەگونجێ زۆر بەنداوی دیكەش دروست بكرێن و حكوومەتی هەرێم پرۆژەی لەوبارەوە هەبوون، بەڵام زۆریان نیوەچڵ بەجێماون.

پاشان وڵاتەكەمان زەوییەكەی بە كەڵكی كشتوكاڵ دێ، زۆر لە وڵاتان زەوییەكەیان شۆرەگە، سوێرە، یان زووركەڵێنە هیچی لێ سەوز نابێ، هیچی لێ ناڕوێ.

ئنجا ئەم وڵاتەمان جێگای ئاژەڵدارییە.

هەروەها شوێنی پیشەسازیی و كارگە و كارخانەیە، واتە: ئەم وڵاتەی ئێمە، خێرو بێری زۆری تێدایە، بەڵام ئەدی بۆچی ئێستا بەو شێوەیەیە؟ ئێستا خەڵك

موحتاجى مووچەى ئاساييە، كە هەندێك لە وڵاتان پاشەكەوت (إحتياطي) زۆريان داناوە، هەر دەستى لێ نادەن، بە سەدان مليار دۆلاريان داناوە، كە بە پارەى خۆيان بەوەندە مەزندە دەكرێ، داياننناوە، پاشەكەوت بۆ جيلەكانى دى كە دێن. زۆر وڵات هەيە نەوتى هەيە، نايفرۆشێ، پشتى بە شتى ديكە بەستوە، مەبەستم ئەوەيە كە ئەو هەموو خێرو بێرە، بۆچى بەهرەى لێوەرنەگيراوە؟ لەڕاستييدا لەبەرئەوەى بەدەستى ئەمينەوە نيەو، لەبەرئەوەى كە گەندەڵيى تێدا دەكرێ و قۆرخكاريى تێدايەو زوڵم و ستەم هەيە، تەماشا بكە! زۆرجار باسكراوەو ئێمەش دووبارەى دەكەينەوە: لە هەرێم دا چەند كەسێك هەن لەدواى ڕاپەڕينەوە دەستيان كردوە بە كۆكردنەوەى سەروەت و سامان، واتە لەدواىساڵى (١٩٩١) ەوە، چونكە لە وڵاتان دەوڵەمەندانى ئەستوور هەن، بەڵام باب و باپيريشى دەوڵەمەند بوون، بازرگانێكى گەورە بوون، مليارلێر بوون، بەڵام ئێمە هەندێكمان هەن، وەك كارگ چۆن هەڵدەتۆقێ لە دواى ڕێژنە بارانێك، (ئاخر بۆ زانيارييت! لە دواى ڕێژنە بارانێكى بە قووەت كارگ لە هەندێ شوێن هەڵدەتۆقێت) ئاوا وەك كارگ هەڵتۆقيون و بوونە ملياردلێر، هەيە چەند مليارى هەيە. نەفەر دەناسم، هەڵبەتە من بە دواى عەيبى خەڵكدا ناگەڕێم، داخۆ لە كوێى بوو، چۆن بوو، چۆن نەبوو، بەڵام خەڵك باسى يەكدى دەكات، نەفەر دەناسم گوتوويانە: ئەو كەسە كاتى خۆى دواى ڕاپەڕين هاتوە هەندێ پارەى لە من قەرز كردوە، هيچى نەبووە، ئێستا شارێكى بنياتناوە، حەوت سەد، هەشت سەد خانوو، بە نرخى زۆر گران، فرۆشتوونى و بۆتە ملياردلێر! ئنجا مسۆگەر ئەو هەموو مليادرلێرانە كە دروست دەبن، بە واريداتى ئەم وڵاتە دروست دەبن، لە كوێيان هێنا؟ نەچوون لە ئێران و توركيا كەسابەت بكەن، لە ئەورووپا يان لە دەوڵەتانى عەرەبيى! هەر لەم وڵاتەدا ئەو هەموو سەروەت و سامانەى وەسەريەك ناوە، يانى: هى ئەو خەڵكەيە، هى ئەو جەماوەرەيە، ئنجا وەك زانايەك دەڵێت: لە هەر شوێنێك چياى زۆر بەرز و سەركەشت بينى، شيوى زۆر قووڵيش دەبينى، ئەو مليادرلێرانە كە من زۆرجار ئەو زاراوەم بەكارهێناوە: (حيزب و خزم) دوو حيزبى حوكمڕان و خزمانى ئەو ماڵانە كە ئەو حيزبانە بەڕێوە دەبەن، مليادرلێرەكان لەوێن، لەوێدا بۆيان بگەڕێ، ڕەنگە يەكێ بڵێ فلانكەس سەربەخۆيە، نەخێر بە

سەرەداوێك هەر دەچێتەوە ئەوێ، حەتمەن جۆرێ لە هاوبەشیی و شەریکایەتی هەیە لەگەڵ یەکێ لەو بڕیاربەدەستانە، لێی بکۆڵەوە وایە، ئەگەرنا لەکوێی هێنا؟ ئەدی بۆچی خەڵکی دیکە، هەرچەند دەکات خۆی پێ ناژیەت؟!

**دانــا: ببوورە مەبەستت لە شاخەکە ئەوەیە، کە هەرکاتێ بینیت ملیاردلێری ئەوەندە گەورە هەبوو، فەقیری زۆر زۆریش هەیە؟**

**مامۆستا:** بەڵێ، بەڵێ، لە هەر چ شوێنێك کۆشك (کاخ) هەبوو، کۆختە (کوخ)یش هەیە، وەك جارێکی دیکەش باسی ئەوەم کرد، کە (مصطفی لگفی منفلوگی) بەلای دوو کەسدا دەچێ، هەردووکیان زگیان دێشێت یەکێکیان لە تێریان و زۆری خواردوە، زگی هەڵساوە، ئەویدیش لە برسان، ئنجا خۆ ئەگەر زۆرخۆرەکەو ئەو زیادەی نەخواردایە، زگی نەدەهێشا و بەشەکەی کە زگی پێ دێشێ، دایبنایە بۆ هەژارەکە، ئەویش زگی نەدەهێشا، ئەم کۆمەڵگایەی ئێمەش ئێستا وای لێهاتوە.

پرسیت: ژینگەکە بە چی پیس بووە؟ لەڕاستییدا بەوە پیس بووە کە ئەم وڵاتە دادگەریی تێدا ڕەچاو نەکراوە، یەکسانیی تێدا ڕەچاو نەکراوە، مرۆڤبوون و هاووڵاتییبوونی تێدا بە پێوەر نەگیراوە، ئەگەر دامەزراوەکان هەبن، بۆ هەموو کەس وەك یەك دەبن، تەماشا بکە، تۆ سوپایەکت هەیە، بۆچی دەڵێن: دەبێ هێزی ئاسایش و پۆلیس و پێشمەرگە، لە دامەزراوەیەکی نیشتمانییدا خۆ ببیننەوە، حیکمەتەکەی چییە؟ حیکمەتەکەی ئەوەیە ئەو کاتە هەموو کەس دەتوانێ پێشمەرگە بێ، هەموو کەس دەتوانێ ئاسایش بێ، هەموو کەس دەتوانێ ببێتە پۆلیس، هەموو کەس دەتوانێ ببێتە پلەدار، لە پێشمەرگایەتییدا و لە ئاسایشدا و لە جۆرەکانی شورتەو پۆلیس و لە کارەکانی دیکەدا، بەڵام ئێستا وایە؟! نەخێر وانیەو ئەوە دیارە، ئەگەر کار دامەزراوەیی بێ، ئایا هەموو کەس دەتوانێ ببێتە بەڕێوەبەری قوتابخانە، بەڕێوەبەری خەستەخانە، بەڕێوەبەری فلان فەرمانگە، ئێستا وایە؟ ئێستا لە دەڤەری زەرد بەس ئەوانە دەبنە بەرپرسی فەرمانگەکان کە سەر بە حیزبی زەردن و، لە دەڤەری سەوزیش تەنیا ئەوانە دەبنە بەرپرسی فەرمانگەکان، کە سەر بە حیزبی سەوزن! ئایا ئەو خەڵکەی دیکە بەشەر نیە؟!

كەواتە: تۆ مرۆڤبوونت نەكردوە بە پێوەر بۆ مامەڵە لەگەڵ خەڵكدا، ئەدی ئەو خەڵكەی دیكە هاوولاتیی نیە؟ تۆ هاوولاتییبوونت نەكردووەتە پێوەر، نەتكردووەتە سەنگی مەحەك، بەڵكو حیزبیی بوون، بەڵكو جاری وا هەیە بچووكتر لە حیزبی بوون، سەر بە بنەماڵە بوون و، سەر بە ماڵ بوون و سەر بە كەس بوونت، كردوە بە پێوەر و سەنگی مەحەك، ئەم وڵاتە بەڵێ پۆخڵ بووە، بەهۆی ئەوەوە كە:

١) دامەزراوەكانی تێدا پەك دەخرێن و پێشێل دەكرێن، بێ نێوەرۆك دەكرێن.

٢) یاسای تێدا پێشێل دەكرێ.

٣) هاوولاتییبوونی تێدا ناكرێ بە پێوەر بۆ مامەڵەكردن لەگەڵ خەڵكدا.

٤) وە هەلەكان لەبەردەم خەڵكدا یەكسان نین.

٥) چینە سیاسییەكە دەبێتە بازرگان، یاخود دەبێتە شەریكە بازرگان! ئیبنوخەلدوون دەڵێ: هەر وڵاتێك حوكمڕانەكانی بوونە بازرگان، كاول دەبێ، چونكە حوكمڕان وەختێك دەبێتە بازرگان، قووەتە سیاسییەكەی و قووەتە ئیدارییەكەیشی دەخاتە گەڕ، سەرەنجام ڕێی كەسابەت لە خەڵك دەگرێ.

زۆر كەس لەم وڵاتەدا داد و فیغانیەتی، دەڵێ: یان دەبێ یەكێك لەو كاربەدەستانە، لەو حوكمڕانانە (هەندێك لەو بەرپرسانە، ناڵێم هەموویان، هەموویان وەك یەك نین) بیكەمە هاوبەش و شەریك لە كەسابەتەكەمدا، یاخود ڕێی كەسابەتم نادەن، كابرا دەیەوێ كارگەیەك دابمەزرێنێ، بەڵام نەیانكاتە شەریك، ڕێی نادەن، خەڵكم پێ شك دێ لە (ئوردون)ەوە هاتووە بە ئەسڵ كوردە، گوتی: ویستم بێم لێرە پرۆژەیەكی گەورەی دروستكردنی پردو ڕێ و بان دابمەزرێنم، بەڵام بەرپرسەكان گوتیان دەبێ شەریك بین، سەدا ئەوەندەی بۆ ئێمە بێت، منیش گوتم كاكە نایكەم!

خەڵكی دیكەم پێ شك دێ، دەڵێ: گوتووم: دێم كارگەیەكی فلان شتە دادەنێم كە ئەو كەلوپەلانە ئێستا لە ئێران و لە توركیاو لە كوێ و كوێوە

دەیانهێنن، با ئێمە خۆمان لێرە بەرهەمی بێنین، گوتیان: باشە، بەڵام دەبێ لەسەدا سی (٣٠٪)ی بۆ ئێمە بێ! گوتم: ئاخر خۆم هیچم بۆ نامێنێتەوە! هەر ئەوەیە دایمەنێ! ئایا ئەوە پۆخەڵیی نیە؟ ئەو هەموو سەروەت و سامانە، كەسانێك بە حەڕامیی پێی ببنە ملیاردلێر، لەجیاتی ئەوەی ئەو پارە و سامانە لە خەزێنەی حكوومەت دا بێ، لەسەر میلاكی حكوومەتەكەت بێ، ئێستا حكوومەت قەرزدارە، میللەت بێ مووچەیە، بەڵام حیزب و خزم و ئەوانە كە لە دەوری حیزب و خزمن، ملیاردلێرن، ئەمە حاڵەتێكی زۆر ناسروشتییە، حاڵەتێكی زۆر ناشەرعیی و نائاساییە، بەڵێ وەزعەكە لارەو دەبێ ڕاست بكرێتەوە، بەڵام بە كێ ڕاست دەكرێتەوە؟ ئایا بەوانەی كە خۆیان لارن، بەوان ڕاست دەكرێتەوە؟ نەخێر.

**دانـــا: ئایا ئەوە جۆرێك لە ڕەشبینیی دروست ناكات، ئەوانەی كە كۆمەڵگایان پیس و پۆخەڵ كردوە، خراپیان كردوە و لاریان كردوە، تازە بەوان چاك ناكرێ، ئەگەر خۆیان چاك نەكەن و خۆیان پاك نەكەن، ئەوانیش ئێستا دەسەڵاتدارن، چی بكەین؟**

**مامۆستا:** من یەكێك لەو مەبەستانەی كە هەمە ئەوەیە دەمەوێ خەڵك واقیعەكە وەك خۆی ببینێ، من بەلامەوە گرنگ نیە داخۆ خەڵك ڕەشبین دەبێ، من عادەتم نیە قسەی خۆش و بۆش بۆ خەڵك بكەم، نامەوێ خەڵك هەڵخەڵەتێنم، نامەوێ كڵاو لەسەری خەڵك بنێم، نامەوێ خەڵك بخافڵێنم، بڵێم: دنیا شامی شەریفە، إن شاء الله چاكی دەكەین، باش دەبێ، ان شاء الله ئەو بڕیاربەدەستانە كە تا ئێستا وەزعەكەیان تێكداوە، مەرحەمەتیان دەجووڵێ، نا مەرج نیە، بەڵام ئایا ئەگەر مەرحەمەتیان نەجووڵا، كە خۆیان ڕاست نەكردەوە، چی چاوەڕێیان دەكا؟ ئەوە چاوەڕێیان دەكات كە بەسەر خەڵكی دیكەدا هاتوە:

﴿فَٱعۡتَبِرُواْ یَـٰٓأُوْلِی ٱلۡأَبۡصَـٰرِ ۝٢﴾ (الحشر: ٢)

ئەی خاوەن عەقڵان پەندوەربگرن، پێمخۆشە خەڵك واقیعەكە وەك خۆی ببینێ، واقیعێك كە ڕەش بێ، هەر بە ڕەش دەبینرێ، ئاخر واقیعەكە بۆ خۆی ڕەشە، كاتێك تۆ تەماشای بكەی، هەر ڕەشی دەبینی، ئەدی دەتەوێ لەلات سەوز

و سوور بكەم، فێڵت لێ بكەم، قەت عادەتی من وا نیە، ئایا هەر لەبەرئەوەی تۆ تۆزێك دڵخۆش بی پێچەوانەی هەق قسەت بۆ بكەم؟ زۆر جار لە كۆڕ و مەجلیس كە دادەنیشین، خەڵك هەر چاوەڕێی قسەیەكی خۆشە، مامۆستا! مژدەیەكی خۆش، دەڵێم: جارێ مژدەی خۆش نیە، ئەدی مامۆستا! وەزعەكە كەی چاك دەبێ؟ بۆچی چاكی ناكەن؟ دەڵێم: ئێمە پێشنیارمان بەدەستە و پرۆژە و نەخشەڕێگامان پێشكەشكردوە، بەڵام وەرنەگیراوە، باشە مامۆستا! دۆخەكە چاك نابێت؟ دەڵێم: نەخێر، بە تەما مەبن وا بە ئاسانیی چاك ببێ، دەگونجێ چاك ببێ، ناڵێم موستەحیلە، بەڵام چونكە ئەوانەی بڕیاربەدەستن لەم وڵاتەدا، بەهرەمەندن لەم بارودۆخە ناهەموارە، حیزب و خزمیان لێی بەهرەمەندە و، پارووپان كەوتووەتە ڕۆن، دەربەستی خەڵكی دیكەش نین، بۆیی چاكبوون ئاسان نیە، بڕیار بەدەستان ئەگەر فریا بكەون بێنەوە سەر هۆش، كاتێك دێنەوە سەر هۆش، مەترسیی گەورە لەسەر چارەنووسیان بێ، ئەو كاتە ڕەنگە وەهۆش خۆ بێنەوە، بەڵام ئەو كاتیش ڕەنگە كات بەسەرچوو بێ!!.

**دانـا: مامۆستا! پرسیارێكی تر دێتە ئاراوە، كەسانێك كە خۆیان و دەوروبەریان ئەوەی كە جەنابت ناوی ئەنێی (حیزب و خزم) تا بینەقاقایان لە زوڵم و ستەم و گەندەڵی و نادادییدا نوقووم بووبێ، تروسكایی ئەمەلی ئەوەیان لێ ئەكرێ، كە ڕاست ببنەوە و پاك ببنەوە و چاك بین؟**

**مامۆستا:** زۆر زەحمەتە، پێشتر ئایەتەكانم هێنان:

١) ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُصۡلِحُ عَمَلَ ٱلۡمُفۡسِدِينَ ﴿٨١﴾ ﴾ [يونس: ٨١]

ئەوە یاسای خوایە. بێگومان خوا كاری تێكدەران چاك ناكات، چاكی ناكات.

٢) ﴿ وَٱللَّهُ لَا يَهۡدِي ٱلۡقَوۡمَ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٢٥٨﴾ ﴾ [البقرة : ٢٥٨].

٣) ﴿ وَٱللَّهُ لَا يَهۡدِي ٱلۡقَوۡمَ ٱلۡفَٰسِقِينَ ﴿١٠٨﴾ ﴾ [المائدة: ١٠٨].

جا مەگەر وەرچەرخانێكی چاوەڕوان نەكراو، وەك شتێكی یاسادڕ (خارق العادە) بەسەریان بێ، ئەگەرنا خەڵك نابێ بە دیار ئەوەوە دابنیشێ، دەبێ عاقڵمەندانی

ئەم وڵاتە، دڵسۆزانی ئەم وڵاتە، مەزڵوومانی ئەم وڵاتە، بەشخوراوانی ئەم وڵاتە، بەجیددیی لەبیری ئەوەدا بن، کە باشە ئەو بڕیاربەدەستانە، ئەوە ڕەحمیان نەجووڵا، ئەوە هەر ئیرادەیان نەکرد، تۆ دەبێ هەر دابنیشی دەستەوئەژنۆ، دەستەوئەژنۆ دانیشتن، تێوەڕامانی ئەم واقیعە لەڕاستییدا، مەوقیفێکی ناشەرعییە، چونکە وەك چەند جارێکی دیکەش هێنامان پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) فەرموویەتی: (كلا والله، لتأمرنَّ بالمعروف، ولتنهون عن المنكر، أو ليوشكن الله أن يعمكم بعقاب، ثم تدعونه فلا يستجاب لكم)، واتە: نەخێر سودێند بە خوا، دەبێ فەرمان بکەن بە چاکە، ڕێ بگرن لە خراپە، ئەگەرنا نزیکە خوا سزایەکتان بۆ بنێرێ دوایی هەرچەند لێی دەپاڕێنەوە، وەڵامتان نەدرێتەوە.

**دانـــا: کوردوتەنی: تەڕو وشك پێکەوە دەسووتێ!**

**مامۆستا:** هەمووی پێکەوە دەسووتێ، لێرەدا مەبەستم ئەوە نیە خەڵك هان بدەم بۆ ئیشی خراپ، بەڵام ئەوەش زۆر شتێکی باشە، خەڵك بزانێ کە دەبێ خۆی ئەم وڵاتە چاك بکات، خۆی دەستی ستەمکاران بگرێت، بەرۆکیان بگرێ، یەخەیان بگرێ، بڵێ: بەسە دەست هەڵبگرە لە زوڵم، ئەگەر خۆشت دەفەوتێنی، ئێمەش دەفەوتێنی، وەك فەرمایشتەکەی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) کە باسی کەشتییەکە دەکات کە دەفەرموێ: (ئەوانەی کە فەرمان دەکەن بە چاکە و ڕێگری دەکەن لە خراپەو، ئەوانەش کە خراپە دەکەن، وەك کۆمەڵێك وان سواری کەشتییەك بوون، هەموویان لە کەشتییەکەدان، ئەگەر ئەوانەی کە لە قاتی بنەوەی کەشتییەکەدان، بڵێن: هەموو جارێ ئێمە ناتوانین بچینە سەرێ ئاوێ بێنین، (چونکە کەشتی وا هەیە شەش حەوت قاتە) هەر لە بنەوە کونی دەکەین بۆ ئەوەی ئاومان بۆ بێتە ژوورێ بۆ پێداویستییەکانمان، ئەگەر خەڵکەکە لێیان گەڕێن ئەوانەی بنەوە کەشتییەکە کون بکەن، ئەوانەی بنەوە دەخنکێن و ئەوانەی سەرێش دەخنکێن، ئەگەر دەستیشیان بگرن هەموویان دەرباز دەبن)[1]. دەبێ ئەوانەش کە وڵاتیان ئاوا بەو دەردە بردوە، دەستیان بگیرێ و

---

(١) دەقی فەرموودەکە (بخاري و مسلم) هێناویانە.

ڕاست بكرێنەوەو، ئەوەش بەرپرسیارێتییەكی دنیایی و قیامەتییە، مەبەستیشم ئاژاوەو ئاڵۆزیی نیە، زۆر شێواز هەن، ئێستا ئەو وڵاتانەی ئەورووپا وەك لە زۆر شتدا بەرەوپێشچوون، لە مەسەلەی ڕاستكردنەوەی حوكمڕانان و كاربەدەستاندا، شێوازی زۆر مەدەنییانە و شارستانییانە، كە زۆر موافیقی شەرعیشییە، زۆریان پەیدا كردوون و بەرهەم هێناون، كە ئێمە دەتوانین لەوەش لێیان بەهرەمەند بین و، وە ڕێك لەگەڵ شەرعیشدا دەگونجێ، لەگەڵ ئەو ئایەت و حەدیسانەدا كە فەرمان بە ئیمانداران دەكەن: فەرمان بە چاكە بكەن و ڕێگری لە خراپە بكەن.

**دانـا: زۆر باشە كاتم نەماوە، بەس یەك دوو پرسیار ماون، ئەگەر بە گوشراویی قسەیان لەسەر بكەین: جۆرە كەسانێك هەن، قسەو شیعاریان زۆر جوانە، یانی كە لە قسە و شیعاریان ڕائەمێنی تەسلیمیان ئەبی، بەڵام كردەوەیان پێچەوانەی شیعارو دروشم و قسەیانە، ڕای تۆ لەوبارەوە چییە؟**

**مامۆستا:** ئەوە كوردەواریی خۆمان پێی دەڵێن: (دەنگی دەهۆڵ لە دوور خۆشە)، یان دەڵێن: (دووركوژی نزیك خەسار)، یان: (ڕواڵەت جوانی نێوەڕۆك وێران)، ڕای من ئەوەیە كە زۆر ناشیرینە ئینسان شتی چاك بڵێ، بەڵام كردەوەی خراپ بكات، چونكە خوای پەروەردگار ڕەخنە لە دوو جۆر كەس دەگرێ لەوبارەوە، كە قسەیان جوانە، بەڵام كردەوەیان خراپە:

**١)** جوولەكەكان وەك دەفەرموێ: ﴿ أَتَأْمُرُونَ ٱلنَّاسَ بِٱلْبِرِّ وَتَنسَوْنَ أَنفُسَكُمْ وَأَنتُمْ تَتْلُونَ ٱلْكِتَٰبَ ۚ أَفَلَا تَعْقِلُونَ ﴿٤٤﴾ ﴾ [البقرة : ٤٤]

واتە: ئایا عەقڵتان نیە، بە خەڵكی دەڵێن: چاكە بكەن، كەچی خۆتان خراپە دەكەن؟

**٢)** هەروەها هەندێ لە زانایان دەڵێن مەبەست پێ مونافیقەكانن، یاخود دڵ نەخۆشەكانن، كەدەفەرموێ:

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لِمَ تَقُولُونَ مَا لَا تَفْعَلُونَ ﴿٢﴾ كَبُرَ مَقْتًا عِندَ ٱللَّهِ أَن تَقُولُوا۟ مَا لَا تَفْعَلُونَ ﴿٣﴾ ﴾ [الصف: ٢- ٣].

واته: ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! بۆچی قسەیەك دەكەن كردەوەی پێناكەن! قسەكردنی بێ كردارتان گەورەترین گوناهە لەلای خوا.

ئنجا ئەو جۆرە كەسانە پێشێ خۆیان دەبێ بزانن، كە ئەوە بەڕاستی نوقسانییە و عەیبێكی زۆر گەورەیە، پاشان خەڵك و جەماوەریش دەبێ بزانێ، كە هەركەسێ قسەی كرد، سەرنج بدات! ئایا مۆر بە قسەكانیەوە هەیە، ئەگەر قسەكانی مۆری كردەوەیان پێوەیە، با لێی وەرگرێ، ئەگەرنا، با وریا بێ بە قسە خۆشەكانی، بە قسەی خۆش و بۆش هەڵنەخەڵەتێن، كە بەداخەوە خەڵكێكی زۆر لە ماوەی بیست و پێنج ساڵی ڕابردوودا، بە دروشم و شیعاری بێ كردار و، قسەی بێ كردەوە هەڵخەڵەتاوە، بە بەڵێنی بێ بناغە هەڵخەڵەتاوەو، بە ڕێیەكدا ڕۆیشتوە كە تێیدا بێ.

**دانــا: وەك دوا پرسیار حەز دەكەم ڕای تۆ لەبارەی ئەوەوە بزانم، قسەیەك هەیە وەكو پەندیشە، ئەوترێت: (ئاشی نەزانە و خوا ئەیگێڕێ)، ڕاستە ئاشی نەزانەو خوا ئەیگێڕێ، یان ئاشی خوایە و نەزان ئەیگێڕێ؟**

**مامۆستا:** ئاشی نەزان، كاول دەبێ، خوای كاربەجێ عادەتی نیە كە كاری تێكدەران چاك بكات، كاری ستەمكاران چاك بكات، بیانخاتە سەر ڕێ، ئەوە ئەصڵ و ئەساسی نیە، ئاشی نەزان بە نەزانیی دەگەڕێ و، كاولیش دەبێ، ئنجا هەموو شتێ هی خوایە، وەك موڵك، بەڵام هەرگیز نیە، خوای پەروەردگار لە جیاتی نەزانان بێ كارێك بكات، بەڵكو خوا یاساكان (سنن)ی داناون و كەسێك شارەزای قانوونەكانی خوا نەبێ و، پابەند نەبێ بە قانوونەكانی خواوە، سەری بە فەتارەت دەچێ، ئاشی نەزان كاول دەبێ، نە خوا دەیگێڕێ و نە بە خۆشی دەگەڕێ.

**دانــا: زۆر سوپاس مامۆستا عەلی باپیر نووسەر و ڕووناكبیر! كە وەڵامی پرسیارەكانی ئەم ئاڵقەیەی ئێمەت دایەوە.**

**مامۆستا:** سەلامەت بی سوپاس بۆ ئێوەش.

# ئاڵقەی دوازدەیەم

## بنەمای دوازدەیەم: خۆبەزلگران نەمانیان و، چەوسێنراوان مافەکانیان لە پەیامی پێغەمبەران دا دەبینن

ameer.maktab@yahoo.com

**دانـــا:** بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان، سڵاوتان لێ بێ بینەرانی ئازیز و خۆشەویست، خۆم بە خۆشحاڵ ئەزانم لە ئاڵقەیەكی نوێدا خوای پەروەردگار دەرفەتی پێبەخشین لە خزمەت ئێوە و میوانە هەمیشەییەكەمان، مامۆستا عەلی باپیر نووسەر و رووناكبیر، لەم ئاڵقەیەدا بە ئێوەی ئازیز و خۆشەویست بە ئێوە شاد ببینەوە و چەمكێك لە چەمكەكانی دیكەی بابەتەكەی مامۆستا عەلی باپیر لەسەر چاككردنی دۆخی هەرێم كە نووسیویەتی "با گوێ لە قورئان بگرین" شرۆڤە بكەین.

مامۆستا! سوپاست دەكەین كە كاتت پێ بەخشین، لەم ئاڵقەیەشدا لە خزمەت جەنابتدا بین.

**مامۆستا:** سوپاس بۆ جەنابیشتان، بەخێریش بێن خۆت و ستافەكەت.

**دانـــا:** مامۆستا! یەكێكی دیكە لەو بنەمایانەی كە جەنابت بەپێویستت زانیون بۆ چاككردنی ئەم دۆخە، ئەوەیە كە دەفەرمووی: (خۆ بەزلگران نەمانیان و، چەوسێنراوان مافەكانیان، لە پەیامی پێغەمبەراندا دەبینن) مەبەستت چییە، ئەم ڕستەیەت بە چ مەبەستێك هێناوە؟

**مامۆستا:** الحمد لله، وصلى الله تعالى وبارك على رسول الله محمد، وآله وصحبه المهتدين بهداه.

مەبەستم ئەوەیە كە ئەگەر تەماشای قورئان بكەین، دیارە ئەم بنەمایەو ئەو بیست و پێنج بنەمایە هەموویان لە ژێر ناوونیشانی: "بۆ چارەسەركردنی بارودۆخی هەرێم، با گوێ لە قورئان بگرین" تێكڕایان لە قورئانەوە هێناومن، ئەگەر تەماشای قورئان بكەین دەتوانین بڵێین: دوو لەسەر سێی پانتایی قورئان بۆ بەسەرهاتی پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) و گەلەكانیان تەرخان كراوە، ئنجا لێرەوە دەمەوێ شتێك بڵێم: ئەویش ئەوەیە كە هەندێ لە زانایان دەڵێن: ژیانی بەشەر وا پێدەچێت زۆربەی رۆیبێ و كەمێكی مابێ، دەڵێن بۆیە خوا سبحانە وتعالى ئەوەی كە لە ژیانی بەشەر ڕۆیشتووە، كە دەگونجێ دوو لەسەر سێ (٣/٢)ی تەمەنی بەشەر لەسەر زەوی تێپەڕی بێ و، كاتێك كە قورئان هاتووەتە خوار، لەو كاتەوە، یەك لەسەر سێی (٣/١)ی مابێ، بۆیە خوا

(سبحانەو تعالى ) دوو لەسەر سێی پانتایی قورئانی تەرخانكردوە بۆ باسی ئەوە كە ڕۆیشتوە.

**دانـــا: بۆ چ مەبەستێك؟**

**مامۆستا:** بێگومان بۆ پەندلێوەرگرتن، تاكو ئەو یەك لەسەر سێیەی ژیانی بەشەر كە ماوە، ئەو دوو لەسەر سێیەی كە ڕابردوە، بیكاتە قوتابخانە و بیكاتە جێی دەرس و پەند و عیبرەت:

﴿ لَقَدْ كَانَ فِي قَصَصِهِمْ عِبْرَةٌ لِّأُوْلِي ٱلْأَلْبَٰبِ ﴾ [یوسف: ١١١]

ئنجا كە تۆ تەماشای ژیانی پێغەمبەران (سەڵات و سەلامی خوایان لەسەر بێ ) دەكەی، چی دەبینی؟ هیچ پێغەمبەرێك نیە لە نووحەوە سەڵات و سەلامی خوای لەسەر بێ كە بە (أبو البشر الثاني) دووەمین بابی مرۆڤایەتیی دادەنرێ و، وە یەكەمین پێغەمبەری خاوەن ئوممەت بووە، چونكە ئادەم و شیپ و ئیدریس و پێغەمبەرانی دیكە (علیهم السلام) كە هاتوون وا پێدەچێ، بەشەر ئەو كاتە هێندە نەبووبێ ببێتە ئوممەتێك، بەڵام لە نووحەوە (علیه الصلاة والسلام) كە لە صەحیحی بوخارییشدا هاتوە یەكەمین ڕەوانەكراو (رسول) بووە، یەكەمین ڕەسوول بووە، كە بۆ ئوممەتێك نێردراوە، لە نووحەوە (علیه الصلاة والسلام) تا دەگاتە پێغەمبەری خاتەم، بەبێ هەڵاواردن، هەموویان خۆبەزلگرەكان، چەوسێنەرەكان دژیان بوون، ئاستەنگ بوون لە بەردەمیاندا، بەرۆكیان گرتوون، شەڕیان پێ فرۆشتوون، گێچەڵیان بە پێغەمبەران كردوە، ئەدی كێ لەگەڵ پێغەمبەراندا (علیهم الصلاة والسلام) بووە؟ چەوساوە و بێدەست و كەساس و بێ كەس و ستەمدیدەكان.

**دانـــا: ئەمە بە جۆرێك لە خاڵی لاوازی ناگیرێ لە پەیامی پێغەمبەران، كە دائیمەن فەقیر و هەژار و چەوساوەیان لەگەڵدا بوون، دەوڵەمەند و دەسەڵاتداریان لەگەڵ نەبوون؟**

**مامۆستا:** نا، نا، ئەگەر تەماشای ئەو ناوونیشانە بكەی كە من دامناوە، حیكمەتەكەت بۆ دەركەوێت، نهێنییەكەی دەردەكەوێ:

ستەمكاران و زۆرداران نەمانی خۆیان بینیوە لە پەیامی پێغەمبەراندا، بۆیە دژیان بوون و، بەرگرییان كردوە لە بوونی خۆیان، زانیویانە ئەگەر ئەو پەیام و بەرنامەیەی پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) بچەسپێ، ئەوان ئەو ڕاوە خراپەیان لێ تێكدەچێ، ئەو بازاڕە ئاڵۆزە نامێنێ، كە ئەوان دزیی تێدا بكەن، ئەدی چەوساوان چییان تێدا بەدیكردوە؟ ئەوان ماف و بوونی خۆیان لە پەیامی پێغەمبەراندا بینیوە، بۆیە شوێنیان كەوتوون، بەڵام ئەوە وەك حاڵەتی گشتی، ئەگەرنا هەشبوون لە چینی خۆشگوزەران و پارەدار و ساماندار‌بوون، جاری وا بووە پێغەمبەرانیش لە سامانداران تاكو تەرایەكیان وەگەڵ كەوتوون و هاتوونە نێو كۆمەڵی پێغەمبەرانەوە (علیهم الصلاة والسلام)، بەڵام كەمبوون، بۆ وێنە: عەبدوڕەحمانی كوڕی عەوف و، ئەبوبەكری صددیق و، عوسمانی كوڕی عەففان، خوا لە هەموو هاوەڵان ڕازی بێ، ئەوانە چینی ساماندار بوون، هاتوون بوونە شوێنكەوتەی پێغەمبەری خاتەم (علیه الصلاة والسلام)، بەڵام زۆربەی هەر زۆری هاوەڵان ڕەش و ڕووتەكان بوون، هی پێغەمبەرانی دیكەش هەر وا، بۆ وێنە: مووسا (علیه الصلاة والسلام) (مؤمن آل فرعون) لە بنەماڵەی فیرعەوندا، لە فیرعەون هەڵدەگەڕێتەوە:

﴿ وَقَالَ رَجُلٌ مُّؤْمِنٌ مِّنْ ءَالِ فِرْعَوْنَ يَكْتُمُ إِيمَـٰنَهُۥٓ أَتَقْتُلُونَ رَجُلًا أَن يَقُولَ رَبِّىَ ٱللَّهُ وَقَدْ جَآءَكُم بِٱلْبَيِّنَـٰتِ مِن رَّبِّكُمْ ﴾ [غافر: ٢٨]

واتە: پیاوێكی بڕوادار كە ئیمانەكەی خۆی دەشاردەوە لە نێو دارو دەستەی فیرعەوندا گوتی: لە بەرپرسان و لە نزیكانی فیرعەون بووە، بەڵگەی ئەوەش: ئەو هەموو موناقەشە و مشتومڕە دەكات، كە لە سووڕەتی (غافر)دا هاتوە، لە نۆزدە (١٩) ئایەتدا، خوای پەروەردگار دیالۆگێك دێنێ لە نێوان ئەو پیاوە بڕواداره و فیرعەوندا، هەڵبەتە فیرعەون ڕێ بە هەموو كەس نادات، بێتە كۆڕ و مەجلیسیەوەو موناقەشەی لەگەڵدا بكات، دیارە كەسێكی پایەدارو خاوەن پێگە بووە لە لای فیرعەون، هاتووە بووەتە شوێنكەوتەی مووسا (علیه الصلاة والسلام)، تاك تەرایەك بوون، بەڵام زۆربەی هەرە زۆریان ئەوانە بوون كە خوای

پەروەردگار لە ژێر ناوونیشانی: چوسێنراو (مستضعفین)دا هێناونی، بۆ وێنە: لە بەسەرهاتی نووحدا (علیه الصلاة والسلام)، خوای پەروەردگار دەفەرمویّ:

﴿ لَقَدْ أَرْسَلْنَا نُوحًا إِلَىٰ قَوْمِهِۦ فَقَالَ يَـٰقَوْمِ ٱعْبُدُوا۟ ٱللَّهَ مَا لَكُم مِّنْ إِلَـٰهٍ غَيْرُهُۥٓ ... ﴾

[الأعراف : ٥٩]

دوایی دەفەرمووێ: ﴿ فَقَالَ ٱلْمَلَأُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ مِن قَوْمِهِۦ مَا نَرَىٰكَ إِلَّا بَشَرًا مِّثْلَنَا وَمَا نَرَىٰكَ ٱتَّبَعَكَ إِلَّا ٱلَّذِينَ هُمْ أَرَاذِلُنَا بَادِىَ ٱلرَّأْىِ ﴾ [هود : ٢٧].

واتە: ئەو دەسترۆیشتووانەی بێبڕوابوون لە گەلەی گوتیان: {وشەی (ملأ) دەڵێ (مَنْ يملئون العيون مهابةً والقلوب هيبة)، (ملأ) ئەوانەن كە چاوی خەڵك پڕ دەكەن لە سام و، دڵیان پڕ دەكەن لە ترس، واتە دەسترۆیشتووان، قسەرۆیشتووان، بڕیاربەدەستان، خاوەن دەسەڵات و خاوەن سامانەكان، (ملأ) ئەوانەن كە بەدەوری حوكمڕانەكانەوە بوون، دەستوپێوەندەكانیان} (مَا نَرَىٰكَ إِلَّا بَشَرًا مِّثْلَنَا ) تۆ نابینین جگە لەوەی كە مرۆڤێكی وەك خۆمانی.

هەمیشە دوژمنانی پێغەمبەران سەڵات و سەلامی خوا لەسەر پێغەمبەران بێ، مرۆڤبوون و بەشەربوونی پێغەمبەرانیان بە نوقسانیی زانیوە، تۆش هەر بەشەرێكی وەك ئێمەی، چونكە لە هەمبانەی خۆیاندا گوێزیان ژماردووە، ئایا لەبەرئەوەی مرۆڤە و بەشەرە، مانای وایە شایستەی ئەوە نییە ببێتە پێغەمبەر؟ خوا پەیامی بۆ بنێرێ؟ بەڵام لە هەمبانەی خۆیاندا گوێزیان ژماردووە، تەماشای خۆیانیان كردوە، لە جڵێتاوی لە گوناح و تاواندا ڕۆچوون، نغرۆ بوون، گوتوویانە: ئنجا مرۆڤێكی وەك ئێمە كوا لێی دەوەشێتەوە، ببێتە نوێنەری خوا؟! نەیانزانیوە پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) خاوەن كەسایەتییەكی دیكەن، خاوەن حاڵەتێكی دیكەن، خاوەن مەقامێكی بەرزن، لە ڕووی ئیمانیی و ڕووحییەوە! جا دەڵێن: تۆش هەر بەشەرێكی وەك خۆمان، (وَمَا نَرَىٰكَ ٱتَّبَعَكَ إِلَّا ٱلَّذِينَ هُمْ أَرَاذِلُنَا ) ناشبینین كەس شوێنت كەوتبێ، جگە لەوانەی سادەوڕووكەش بین هەرچیی و پەرچیین لەنێو ئێمەدا.

(أَرَاذِل) كۆی (أَرذَل)، یانی: كەسێكی سادە، كەسێكی بێ دەست، بە كوردیی كەسی هیچ و پووچ، بێ كەسایەتیی، بێ توانا، بەڵام ئەوە قسەی زلەزلەكانە بە شوێنكەوتووانی پێغەمبەرانیان (علیهم الصلاة والسلام) گوتوە، ئەگەرنا ڕاست ناكەن، چونكە هەمیشە ئەوانە ناووناتۆریان بۆ ئەهلی هەق هەڵبەستوە، ئەدی بە پێغەمبەرانیشیان نەگوتوە: كاهین و شێت و جادووگەر، بێگومان پێغەمبەرانیش دوور بوون لەو سیفەتانە! بە شوێنكەوتووەكانیشان دەڵێن: (أَرَاذِل) واتە هەرچیی و پەرچیی و هیچ لەبارا نەبوو و دەستنەڕۆیشتوو!

ئنجا من ویستوومە بڵێم: بەدرێژایی مێژوو ئەوانەی كە بەشێوەی ستەمكارانە حوكمڕانییان كردوە دەوروبەریان كەسانێك بوون، كە لەسەر شێوەی خۆیانن، ئنجا ئەوانە بۆیە دژی پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) بوون، چونكە ئەگەر پەیامی پێغەمبەران بچەسپێ، دەڵێ: هەمووتان بران و دەبێ پێكەوە تەبا بن، كەس لە كەس زیاتر بەشی بە نیعمەتەكانی خواوە نیەو، هەمووتان دەبێ بە تەبایی بژین، نابێ كەس خۆی بەسەر كەسدا هەڵكێشێ، ئنجا بێگومان لەو سەودایەدا زۆردارەكان زەرەر دەكەن، بۆیە دژیان بوون، ئەدی كێ لەگەڵ پێغەمبەراندا (علیهم الصلاة والسلام) بووە؟ ئەوانەی كە مافەكانی خۆیان لەلای ئەوان بینیوەتەوە.

لێرەشدا ویستوومە بڵێم: كەواتە با حوكمڕانان لە هەرێمدا لە عێراقدا لە هەر شوێنێكی دنیادا، دڵخۆش نەبن بەوەی كە چینێك لە مشەخۆران و سامان كۆكەرەوان، كە پێڕی ماستاوچیانن و چەپڵەیان بۆ لێدەدەن، پێیان دڵخۆش نەبن، ئەوانە بە درێژایی مێژوو دژی ئەو دادگەرییە بوون كە پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) هێناویانەو، دژی ئەو خوابەیەكگرتنە بوون كە پێغەمبەران هێناویانە، چونكە شیرك زەمینە خۆش دەكات بۆ فیرعەونەكان بڵێن: ئێمەش پەرستراوو پەروەردگارین، بەڵام خواپەرستیی و خوابەیەكگرتن، ڕێگا دەگرێ لەوەی كە مرۆڤەكان هیچكامییان خۆی بەسەر ئەوانی دیدا هەڵكێشێ، دەڵێن هەموو براین و دەبێ پێكەوە تەبابین، هەموو بەندەی خواین، هەموو یەكسانین، چەوساوەكانیش كە تەماشایان كردوە ئەو پێغەمبەرانە (علیهم الصلاة والسلام)،

ئەوەی كە هێناویانە ئەو پەیام و بەرنامەیە، لە قازانجی ئەوانە، بۆیە شوێنیان كەوتوون، هەڵبەتە ئەوانیش بەزۆریی كەمینە بوون، چونكە بەداخەوە زۆربەی ڕەش و ڕووتەكانیش، ستەمكارەكان هەڵیانخەڵەتاندوون، چەواشەیان كردوون، پێغەمبەرانیان (علیهم الصلاة والسلام) و پەیامی پێغەمبەرانیان، بەشێوەیەكی دیكە پیشان داون، بۆ وێنە: فیرعەون چی دەڵێ؟ كاتێك مووسا دەچێت، مووسا بۆچی دەچێ؟ دەچێ بەنی ئیسرائیل دەرباز بكات:

﴿ فَأَرۡسِلۡ مَعَنَا بَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ وَلَا تُعَذِّبۡهُمۡۖ ﴾ [طه : ٤٧]

بەنی ئیسرائیلم لەگەڵ بنێرە و مەیانچەوسێنەوە، كەچی فیرعەون دەڵێ چی؟

﴿إِنِّيٓ أَخَافُ أَن يُبَدِّلَ دِينَكُمۡ أَوۡ أَن يُظۡهِرَ فِي ٱلۡأَرۡضِ ٱلۡفَسَادَ ﴾ [غافر : ٢٦]

من دەترسم دینەكەتان لێ تێكبداو خراپەكاریی لە زەویدا بكات، دەترسێم مووسا دینەكەتان لێ تێك بدات، بەرنامەكەتان لێ تێك بدات و خراپەكاریی و ئاشووب لەزەویدا بەرپا بكات، یانی: ئەوەی فیرعەون دەیكا كە نێرەوەزەكانی بەنی ئیسرائیلی سەردەبڕین و مێینەكانی دەهێشتنەوە، ئەوە خراپەكاریی نیە، ئەوەی كە فیرعەون دەیكرد ئەو سیستەمە كە خۆی بە پەروەردگار و پەرستراویان دەزانی، دەترسێ مووسا ئەو دینەیان لێ تێك بدات، هەڵبەتە ئەگەر پەیامی مووسا بچەسپێ، ئەو دینە فیرعەونییە تێكدەچێ، ئنجا بڵاو ناكاتەوە لە زەویدا، بەڵام ئەو تێكدانەی هەیە، لایدەبات، ئەوە كە فیرعەون نێرینەكانی گەلی مووسا سەربڕێ و مێیینەكان بهێڵێتەوە، ئەو وەزعە تێكدەدات.

**دانـــا: مامۆستا! پرسیارێكی گرنگ دێتە پێشەوە ئەویش ئەوەیە كە دەسەڵاتداران و بڕیاربەدەستان ئەگەر خەڵكێكی مشەخۆر و وەك خۆیان خۆبەزلزان و زاڵمیان لەدەور كۆببێتەوە، بەڵام بۆچی چینێكی زۆری ڕەش و ڕووت و ستەملێكراویش دوایان دەكەوێ، هەر لەم هەرێمی كوردستانەدا، ئەگەر وێنەكە وا لێ بكەین: چەند ساڵە ئەم حیزبانەی هەرێمی كوردستان هەر ئەو خەڵكە ڕەش و ڕووتە ئەمانی كردوە بە حیزبی ڕەقەم یەك و ڕەقەم دوو، ئەمە بۆچی؟ یانی ئیستیفادەی خەڵكە ڕەش و رووتەكە لە چیدایە دوای ئەوان كەوتوون؟**

**مامۆستا:** سەرەتا دەمەوێ سەرنجی تۆو بینەران و بیسەران بۆ مەسەلەیەکی گرینگ ڕابکێشم: دەسەڵات دەبێ ڕەوایەتیی لە خەڵك وەربگرێ، بەڵام ئایا ئەوەندە بەسە کە ڕەوایەتیی لە خەڵك وەربگرێ و تەواو، نە و، دەبێ وەك چۆن ڕەوایەتیی لە خەڵك وەردەگرێ، دوایی بەشێوەیەکی ڕەواش حوکمڕانیی بکات، کە زۆرجار نەك هەر لێرە، لە زۆر شوێنی دنیا ڕەوایەتی لە خەڵك وەرگیراوە، بەڵام دوایی بەشێوەیەکی ناڕەوا حوکمڕانیی کراوە، بۆیەش لە شەریعەتی ئیسلام دەبێ خەڵك چاو بن بەسەر حوکمڕانەوە، دوای ئەوەی ڕەوایەتییان پێدا و هەڵیانبژارد، ئەگەر لای دا، دەبێ خەڵك چاوبن بەسەریەوەو ڕاستی بکەنەوە، ئەگەر ڕاست نەبووەوە دەبێ لای بەرن، زانایانی ئیسلام ئاوایان گوتوە، تۆ تەماشا مەکە ئێستا لە لایەن هەندێك لەو دەوڵەتانەوە کە حوکمی بنەماڵەیی و خێڵەکیی و میراتیی هەیە، ئەو فیکرەیە ڕەواج پێ دەدەن کە دەسەڵاتدار و حوکمڕان هەرچی کرد، تۆ دەبێ بێدەنگ بی، مەگەر ئەوپەڕی بە گوێیدا بچرپێنی بڵێی: ئەوە گوناهە و غەڵەتە! ئەوە ئەصڵ و ئەساسی نیە، ئەدی حوسەینی کوڕی عەلی خوای لێیان ڕازی بێ، لە دین تێنەگەیشتوە کە لە یەزید و لە بەنی ئومەمەیە ڕادەپەڕێ، ئەدی عەبدوڕەحمانی کوڕی ئەشعەث، لە دین تێنەگەیشتوە کە خۆی و ژمارەیەکی زۆر لە زانایان لە بەنی ئومەمەیە ڕادەپەڕن، ئەدی زەیدی کوڕی عەلی، کوڕی حوسەینی کوڕی عەلی، خوا لێیان ڕازی بێ، لە دین تێنەگەیشتووە، کە ڕادەپەڕێ، زۆری دیکەش لە زانایان، هەتا ئەبو حەنیفە پشتگیریان بووە، هی ئەو ڕاپەڕینانە، مالیك پشتگیریان بووە!! ئنجا وەك لە مەوسووعەی: (الإسلام كما يتجلّى في كتاب الله) لە بەرگی حەوتەم دا، لە چاپی یەکەمیدا، چونکە لە چاپی دووەمیدا دەبێتە کتێبی یاز دەیەم، باسمکردوە کە زۆر جێی سەرسوڕمانە، هەندێك لە زانایانی ئیسلام ئەو ڕاپەڕینانەی کە کراون، لە دژی ستەمکاران، ئەگەر سەرکەوتوو نەبوو بن، گوتوویانە: ئەوە ناشەرعیی بوون، بۆ وێنە: حوسەینی کوڕی عەلی، ئیبنولعەرەبی مالیکیی، خاوەنی (العواصم من القواصم) کە کتێبێکی هەیە بە ناوی: (أحكام القرآن)

و زانایەكی باشیشە، بەڵام لەو هەڵوێستەیدا نەپێكاوە، وەك من لەو كتێبەی خۆمدا باسمكردوە و قسەكەیشیم هێناوە، كە مانایەكەی ئاوایە (لقد قتل حسين بسيف جَدِّه)، حوسەین بە شمشێری باپیری خۆی كوژرا، ئنجا حەدیسێك دێنێ كە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: (هەركەسێك لە حوكمڕان ڕاپەڕی، هەركەسێك بێ، بیكوژن، ئەگەر ویستی ڕیزتان تێكبدات)[1]: ئایا حوسەین لە حوكمڕانێكی ڕەشید ڕاپەڕیوە، فەرمایشتەكەی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) مەبەستی پێی ئەوەیە؟ حوسەین ڕاپەڕیوە لە حوكمڕانێك كە لایداوە، كە (الذهبي) لە كتێبەكەی خۆیدا (سِيَرُ أعلام النبلاء) لە باسی یەزیددا دەڵێ: (كانَ ناصِبياً غليظاً جلفاً)، دوایی دەڵێ: (هۆی مردنەكەی یەزید ئەوەبوو، كە سەرخۆش بوو ڕەقصی كرد، كەوت و سەری بە كوڵەگەیەك، یای بە شتێكی ڕەق كەوت و مرد)، یانی یەزید بە سەرخۆشیی مردوە، ئنجا حوسەین لەوە ڕاپەڕیوە! بەڵام ئیبنولعەرەبی و هاووێنەكانی، ئەوەی وا بیر دەكاتەوە، بەرگریی لە حوكمی میراتیی و بنەماڵەیی دەكەن، كە لە دەوڵەتانی كەنداودا حوكمە میراتییەكان زۆرن، بۆیەش ڕەواج بەو بیرۆكەیە دەدەن، چونكە لە قازانجیانە، بەڵام بەدڵنیایی ئەوە وێڕای ناشەرعیبوونی، شتێكی نامەنتیقیشە كە تۆ ڕەخنە لە حوسەین و عەبدوڕەحمانی كوڕی ئەشعەث و عەبدوڵڵای كوڕی زوبێر بگری (ئاخر ئەویش لە بەنی ئومەیە ڕاپەڕی و هەشت نۆ ساڵ خیلافەی ڕاگەیاند)، ڕەخنە لەوانە بگری چونكە شكستیان هێناوە، بەڵام ئەبو عەباسی سەففاح، ئەبو جەعفەری مەنصوور، چونكە سەركەوتوون، بڵێی: حوكمەكەی ئەوان شەرعییە، كەی ئیسلام وایە، كەی ئیسلام ماكیاڤیلییانەیە كە هەرچی بڵێی سەركەوت، بارەكەڵڵای بۆ بكێشێ و، ئەوەی ژێریش كەوت، با لەسەر حەقیش بێ، بڵێی: ئەوە خەتای كردوە، ئەصڵەن ئەوە شتێكی نامۆیە لە ئیسلامدا، بەڵێ هەندێك لە زانایانی ئیسلام گوتوویانە، بەڵام من پێموایە كەوتوونە ژێر كاریگەریی ئەو واقیعە سیاسییەی كە تێیدا ژیاون.

ئنجا با بێینەوە سەر ئەصڵی بابەتەكەی خۆمان.

---

(١) (من خرج يريد شق عصاكم فاقتلوه كائنا من كان) رواه ...

**دانـــا:** پرسيم: بۆچی ئەو هەموو ڕەش و ڕووتە دوايان كەوتوون؟

**مامۆستا:** منيش دەمويست هۆكاری ئەوەت بۆ باس بكەم! تەماشا بكە لە باسی حوسەيندا كە دەچێ و لە كەربەلا ئەو ڕووبەڕووبوونەوەيە دەبێ، (عباس محمود عقاد) لە كتێبێكيدا بەناوی: (أبناء الرسول في كربلاء)، تەعبيرێكی جوان دێنێ، دەڵێ: ئەو سوپايەی كە دەوری حوسەينی دا، دە هەزار كەس بوون، بە سەركردايەتی عومەری كوڕی سەعدی كوڕی ئەبی وەققاص، كە لە لايەن والی ئەو كاتە عوبەيديلای كوڕی زياد، والی كووفەوە نێررابوو، والی يەزيد بوو، يەزيد بۆ خۆی لە شام بوو، ئەو سوپا دە هەزار كەسيیە دەوری حوسەين و ئەو پەنجا شەست كەسە دەگرێ كە لەگەڵتی، پەنجا شەست كەس لە خزمانی و لە خەڵكی ديكە، دەڵێن: دەبێ يان ئێستا بەيعەت بدەی بە يەزيد، لەسەر دەستی ئێمە، يان ئامادەی جەنگ بی، حوسەين دەڵێ: ئێوە خۆتان نامەتان بۆ ناردووم، خەڵكی كووفە، شەست هەزار ئيمزای پێوەيە، يان لەگەڵ ئيمزاكەی خۆتاندا ڕاستبكەن، هاوكارم بن، هەتا ئەو حوكمڕانييە لارەی كە يەزيد دەيكات، كۆتايی پێ بێنين، يان ئەگەر ئەوەش ناكەن، لەگەڵ ئيمزاكانی خۆتاندا ڕاست ناكەن، لێمگەڕێن دەچمەوە بۆ مەدينە، من بەدەم ئيمزای ئێوەوە هاتم، گوتم ئەگەر نەچم گوناهبار دەبم، ئەو خەڵكە دەڵێن: تۆ قيادەمان بكە و فەرمان بە چاكە و نەهی لە خراپە دەكەين، ئەگەر لێمگەڕێن دەچمەوە بۆ مەدينە.

ئەگەر ئەوەش هەر ناكەن لێمگەڕێن دەچم بۆ شارێك لە شارەكانی مسوڵمانان، چونكە ئەگەر من بۆ خۆم بچم بۆ لای يەزيد پێی عەيبە بەمن بڵێ: بەيعەتم پێ بدە. دەڵێن: نەخێر يان بەيعەت دەدەی، يان دەبێ ئامادەی جەنگ بی، ئنجا (عباس محمود عقاد) دەڵێ: ئەو سووپا دە هەزار نەفەرييە، دەيانزانی حوسەين لەسەر هەقە، (كانت قلوبهم مع حسين وُسيوفهم مع يزيد)، دڵيان لەگەڵ حوسەين بوو، شمشێرەكانيشيان لەگەڵ يەزيد بوو!! بەشەر تەنيا عەقڵ نيە، هەرچی عەقڵ پەسەندی كرد، وا بكات، بەشەر، ڕووحە، عەقڵە، ئارەزووی نەفسە، كۆمەڵێ غەريزەی جەستەييە، بەشەر كائينێكی زۆر ئاڵۆزە، بۆيە ئەم خەڵكی هەرێمی كوردستانی ئێمەش، لەڕاستييدا زۆری دەزانێ كە نابێ ئاوا بێ، بەڵام ئارەزووی

نەفس و بەرژەوەندییە ناشەرعییەكانیان وا دەخوازێت! باشە كە دەزان ناهەق و ستەمە، بۆچی هەر لەگەڵیدای؟ دەڵێ: ئاخر بڵێین چی! ژیانەكەمان ناسووڕێ ئاوا نەبێ، ژیانم بەوەوە پەیوەیستە، لەڕاستییدا بەدەست خۆوە گرتنی سەروەت و سامان بەشێوەیەكی ناشەرعیی، كاریگەرییەكی گەورەی لەسەر بێدەنگیی و بێهەڵوێستیی خەڵكێكی زۆر هەیە لەبەرانبەر ستەم دا. لەوانەیە هەندێ خەڵك بڵێ: ئەرێ ئەو بڕیاربەدەستانەی ئەم وڵاتە بۆچی چاكی ناكەن، ئایا نازانن؟ با، دەزانن بەڵام ئەگەر ئەو پارە حەرامەیان بەدەستەوە نەبێ و هەندێك خەڵك لە پەنای خۆیاندا نەكەنە ملیاردلێر و ئەویدیكەش ئاوا مووچەیەكی نەمر ئەییان پێ نەدەن، ئەدی ئەو حوكمڕانییەیان چۆن پێ بەڕێوەدەچێ؟ لەكاتێكدا كە لە دڵی خەڵكدا نین، لەكاتێكدا كە هێندە شتی باشیان نیە، خەڵك ئیقناع بكەن، دەبێ:

١) پارەیەكیان بەدەستەوە بێ، خەڵكی پێ ڕازی بكەن، دەمی خەڵكی پێ شیرین بكەن، سەروەت و سامان، تەماع وەبەرنانی خەڵك و زار چەوركردنیان.



٢) ترساندن و تۆقاندن.

٣) چەواشەكردن.

ئەو سێ هۆكارە، تەماشای مێژووی پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) بكەن، هەمیشە ئەو سێ كوچكەیە هەبووە، بەدەستی نەیارانی پێغەمبەرانەوە، بەدەستی ئەوانەوە كە بەشێوەیەكی ناڕەوا حوكمڕانییان كردوە:

١- دەسەڵات.

٢- سەروەت و سامان.

٣- ڕاگەیاندن بۆ چەواشەكردنی خەڵك، كە زانایان دەڵێن: فیرعەون ڕەمز و هێمای ئیستیبداد و دەسەڵاتی سیاسییە.

قاڕوون ڕەمز و هێمای سەروەت و سامانی ناشەرعییە.

هامانیش ڕەمز و هێمای چەواشەکاریی و ڕاگەیاندنی فریودەرانەیە کە خەڵك لە خشتە دەبات و چەواشەیان دەکات.

**دانـا: ئایا ئەم جۆرە رەفتارەی دەسەڵاتدار و حوکمڕانەکان بەو سێ ئامرازەی کە گوتت بەرامبەر بە خەڵکی بەکاردێنن، جۆرێك نیە لە تیرۆر و تۆقاندن؟**

**مامۆستا:** وشەی: تیرۆر و تۆقاندن زاراوەیەکە داهێنراوە، ئەو ڕەفتارەی حوکمڕانە خۆسەپێنەکان ترساندنی تێدایە، بەڵام تیرۆر جیایە، وشەی تیرۆر ئێستا وەك زاراوەیەك بەکاردێ و هەرکەسێك ڕقی لەکەسێك بوو، دەڵێ: ئەوە تیرۆرستەو، وە هەرکەسێك ڕقی لە جۆرە کردەوەیەك بوو، دەڵێ: ئەوە تیرۆرە، من لەگەڵ ئەوەدا نیم، من پێموایە دەبێ شت وەك خۆی ناوی بنێی، گرنگ ئەوەیە، ئەوە: برسیی کردنی خەڵکە، چەواشەکردنی خەڵکە، ترساندنی خەڵکە، ترس و برس و چەواشە، وەك گوتم: ئەو جۆرە حیزب و ڕژێمانە ئەگەر گریمان ڕەوایەتییشیان لەخەڵك وەرگرتبێ بۆ حوکمڕانییەکەیان، بەڵام دوایی بەشێوەیەکی ڕەوا حوکمڕانییان نەکردوە، بەدرێژایی مێژوو هەروا بووە، بۆیە ئێمە لەم هەرێمی کوردستانەدا، بۆ ئەوەی کەسانێك یەکسەر تۆمەتبارمان نەکەن بەوەی کە فلانکەس حوکمڕانانی کوردستانی یەکسەر لەجێی فیرعەونی داناون و خەڵکەکەشەی لەجێی بەنی ئیسرائیل داناوە، نا وا ناڵێم، بەڵام دەڵێم: دەبێ کاتێ کە ئێمە قورئان دەخوێنینەوە، بەسەرهاتی فیرعەون دەخوێنینەوە، لەگەڵ گەلەکەی، لەگەڵ بەنی ئیسرائیلدا، بەسەرهاتی نووح (عليه الصلاة والسلام) لەگەڵ زلەزلانی گەلەکەی و ئەو دەست و دایەرە و دەست و پێوەندەی کە بەدەوریانەوە بوون، دەبێ دەرسیان لێوەربگرین، بەتایبەت ئێمە کە گەلێکی ڕەش و ڕووتین، ئەم هەرێمەش کە ماوەی چارەگە سەدەیەك زیاترە لەسەر پێی خۆی وەستاوە، دەبێ بزانرێ کە هی هەموو لایەکەو بە ڕەنج و خەبات و بەرخۆدانی هەموو لایەك بەرهەم هاتوە، نە هی ماڵێکە، نە هی حیزبێکە، نە هی کەسێکە، نە هی لایەکە، هی هەموو لایەکە، هەموو کەسیش حەقیەتی لە خێرو بێری ئەم وڵاتەدا بەشدار بێ، هەروەك چۆن هەمووشی دەبێ کە مەترسییەك ڕوو دەکاتە ئەم وڵاتە، هەمووی شان بداتە بەری، بەڵام (الغرم بالغرم) یانی وەك چۆن هەمووی بەرپرسیارە بەرامبەر

بە هێمنیی و سەلامەتیی و پاراستنی ئەم هەرێمە، بەهەمانشێوەش هەمووشی دەبێ بەهرەمەند بێ، نەك چەند ماڵێك و دوو حیزب، یان زیاتر، یانی نابێ وابێ، ئەوە شتێكی زۆر ناسروشتییەو، كە هەموو ئەو كۆمەڵگایانەی بەو شێوەیە ئیدارە كراون، كە: دەستەڵات و سامان و ڕاگەیاندن لەدەستی چینێكدا قۆرخكراون، سەرەنجامیان سەربەفەتارەت چوون بووە، تۆ تەماشا بكە! ڕاگەیاندنەكان ئێستا بەدەستی كێن، ئەو كەناڵانەی كە زۆر بە سەخاوەتەوە مەسرەف دەكەن، ئێوە خۆتان لە تۆڕی میدیایی كۆمەڵن، لە كەناڵی پەیام ئیش دەكەن، بۆ خۆتان دەزانن چەند وەردەگرن، نابیستن كە هاوەڵە ڕاگەیاندنكارەكانتان لەهەندێك لە كەناڵەكان، ڕەنگە دە قاتی ئێوە وەربگرن: سی وەرەقە و چل وەرەقە و پەنجا وەرەقە، ئەوە ئەگەر پارەی نەوت و گەندەڵیی نەبێ، لەكوێی بوو؟ ئەدی بۆچی ئێمە نیمانە كە هەر دەستبارێكی چاكیش بۆ ئەندامەكانی خۆمان بگرین؟ كەواتە: تەنیا سەروەت و سامان قۆرخ نەكراوەو، تەنیا دەستەڵاتی سیاسیی قۆرخ نەكراوە، تەنیا دەسەڵاتی سەربازیی و قۆرخ نەكراوە، بەڵكو ڕاگەیاندنیش قۆرخكراوە، ئاخر ئەو كەناڵەی كە بە تەكنیكێكی نوێتر و، بە كادری تێرو تەسەلترو بە پارە و سامانی زیاتر بەڕێوە دەبرێ، بە تەئكید دەنگی زیاتر دەڕوات، شاشەكەشی جوانترە و وێنەكەشی بەرچاوترە، بەڵام ئەو پارەیەی لە كوێ هێنا؟ پارەی ئەو خەڵك و وڵاتەیە، بۆچیش بەكاردەهێنرێتەوە؟ بۆ چەواشەكردنی ئەو خەڵكە.

**دانـا: مامۆستا! مادام تۆ باسی هەرێمی كوردستان دەكەی، بێگومان زۆرێك لە نموونەكان دەبێ لەسەر هەرێمی كوردستان بێنینەوە، ئێستا لەوانەیە یەكێك بپرسێ: باشە خۆ نە پێغەمبەرێك ئێستا هاتوە، وە نە دینێكی نوێش هاتوە تاوەكو ئەم دەسەڵاتدارانەی ئێمە، وەك ئەوەی كە باس ئەكرێ،خۆیانی لێ بەدوور بگرن و نەمانی خۆیان لەوەدا ببیننەوە، بۆیە تەسلیم نابن بە واقیعەكە، هۆی چییە ئەم دەسەڵاتدار و حوكمڕان و كاربەدەستانەی ئێمە، ئەو چاكسازییە ناكەن ؟**

**مامۆستا:** ئاخر پێغەمبەری خاتەم موحەممەد (صلی الله علیه وسلم)، تەنیا بۆ نیوەدوورگەی عەرەبی و بۆ چواردە سەدە لەمەوپێش ڕەوانە نەكراوە، خوای پەروەردگار دەفەرموێ:

﴿ وَمَآ أَرۡسَلۡنَٰكَ إِلَّا كَآفَّةٗ لِّلنَّاسِ بَشِيرٗا وَنَذِيرٗا ﴾ [سبأ : ٢٨]

هەروەها دەفەرموێ: ﴿ قُلۡ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِنِّي رَسُولُ ٱللَّهِ إِلَيۡكُمۡ جَمِيعًا ﴾ [الأعراف : ١٥٨]

بڵێ ئەی خەڵکینە! من پێغەمبەری خوام، ڕەوانەکراوی خوام، بۆ هەمووتان بە تێکرا.

ئنجا پێغەمبەری خاتەم موحەممەد (علیه الصلاة والسلام) بۆ خۆی دەفەرموێ: (بعثت إلى الأحمر والأسود)[1] متفق علیه، دیارە کە پێغەمبەری خوا (علیه الصلاة والسلام) کۆتایی پێغەمبەرانەو، پەیامەکەشی کۆتا پەیامی خوایە بۆ خەڵکی سەرزەوی: بە کورد و عەرەب و عەجەم و، بە هەموو ڕەنگ و زمانەکانەوە، بۆیە ئێستاش شوێنکەوتووانی پەیامەکەی پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام)، بەرنامەکەی پێغەمبەر بەشێوەیەکی ڕاستەقینە، کێن؟! ئەوانەن کەهەست بە ستەمدیدەیی و بەشخوراویی دەکەن و، پێیان وایە کە بەهۆی ئەو پەیام و بەرنامەیەوە ئەو بارەیان لەسەر شان و مل لادەچێ و ئیعتیباریان بۆ دەگەڕێتەوە، پێیان وایە کە مافە زەوتکراوەکانیان بەهۆی چەسپانی ئەو پەیامەوە، بۆ دابین دەبن و، پێش ئەوەش: پێیان وایە بەهۆی شوێنکەوتنی ئەو پەیامەوە لەدوا ڕۆژدا سەرفراز دەبن و، لەلای خوا ڕووسوور و بەختەوەر دەبن و، وە لە تاقیکردنەوەی ژیانی دنیا دەردەچن، بەڵام دین تەنیا بۆ قیامەت نەهاتوە، دین هاتوە کە خەڵك بەختەوەر بکات لە دواڕۆژدا، سەربەرز و سەرفرازیان بکات لە لای خوا، بەڵام هاتوە لە دنیاشدا ئازاد و سەربەستیان بکات، ژیانی دنیایان بۆ ڕێك بخات، هاتوە کە زوڵم و ستەمیان لەسەر لابەرێ، هاتوە کە دادگەرییان لەبەیندا بچەسپێنێ، ئنجا لەڕاستییدا فیرعەون و تاغووتەکان، حوکمڕانە زۆردارەکان، لەسەر قیامەت لەگەڵ پێغەمبەراندا تێکنەگیراون، لەسەر ئەوە کە بڵێن: دەمانەوێ بچینە بەهەشت و پێغەمبەرانیش بڵێن: نەخێر ئێوە ناچنە بەهەشت! لەسەر ئەوە نەبووە، لەسەر بەهەشت و جەهەننم نەبووە، لەسەر کاروباری

---

(١) واتە: بۆ لای سپی پێست و ڕەش پێست (تێکڕای خەڵك) نێرراوم.

دنیا له‌گه‌ڵیان تێكگیراون، فیرعه‌ون بۆچی له‌گه‌ڵ مووسادا تێكده‌گیرێ، له‌به‌رئه‌وه‌ی مووسا ده‌ڵێ:

﴿فَأَرْسِلْ مَعَنَا بَنِيٓ إِسْرَٰٓءِيلَ وَلَا تُعَذِّبْهُمْ﴾ [طه : ٤٧]

به‌نو ئیسرائیلم له‌گه‌ڵدا بنێره‌ و مه‌یانچه‌وسێنه‌وه‌، چیدیكه‌ سۆغره‌ و بێگاریان پێ مه‌كه‌! فیرعه‌ونیش ده‌یه‌وێ بیانهێڵێته‌وه‌ سۆغره‌ و بێگاریان پێ بكات، له‌سه‌ر ئه‌وه‌ تێكگیراون.

هه‌روه‌ها هه‌موو حوكمڕان و هه‌موو زۆرداره‌كانی دیكه‌ كه‌ له‌گه‌ڵ پێغه‌مبه‌ران دا (علیهم الصلاة والسلام) تێكگیراون له‌سه‌ر دنیا بووه‌، پێغه‌مبه‌ران هاتوون، دنیای خه‌ڵك چاك بكه‌ن، دنیاكه‌ وا لێ بكه‌ن هی هه‌موویان بێ، هه‌موویان به‌ یه‌كسانیی ئازادیی و به‌ سه‌ربه‌ستیی ئه‌و ژیانه‌ی دنیا بگوزه‌رێنن، هه‌موویان به‌نده‌ی خوا بن و پێكه‌وه‌ ته‌با بن، دیاره‌ ئێستاش په‌یامه‌كه‌ی پێغه‌مبه‌ر (علیه الصلاة والسلام) هه‌ر هه‌یه‌ و ئه‌و په‌یام و به‌رنامه‌یه‌ هه‌موو به‌شه‌ر، پێیه‌وه‌ پابه‌ندكراوه‌ كه‌ ده‌بێ شوێنی بكه‌ون، هه‌ر كه‌س ئه‌و په‌یامه‌ی پێ بگات و پێی ئاشنا بێ، ئه‌گه‌ر شوێنی نه‌كه‌وێ، ئه‌و كاته‌ لاده‌رو گومڕاو گوناهباره‌، به‌ڵام ئه‌وه‌ی پێی نه‌گه‌یبێ:

﴿وَمَا كُنَّا مُعَذِّبِينَ حَتَّىٰ نَبْعَثَ رَسُولًا ﴿١٥﴾﴾ (الإسراء: ١٥)

ئه‌وه‌ حوكمێكی دیكه‌ی هه‌یه‌، كه‌واته‌: ئێستاش به‌هه‌مان شێوه‌: هه‌ر حوكمڕانێك له‌ هه‌رێمی كوردستان و له‌ عێراق له‌ وڵاتانی دیكه‌ی ئیسلامیی دا، مادام له‌ نێو كۆمه‌ڵگایه‌كی مسوڵماندایه‌ و ده‌زانێ ئه‌و خه‌ڵكه‌ دینێكیان هه‌یه‌ به‌ناوی ئیسلام، ده‌بێ ته‌ماشا بكا: ئه‌و دینه‌ی ئیسلام كه‌ هی ئه‌و خه‌ڵكه‌یه‌، ئه‌و خه‌ڵكه‌ی كه‌ ئه‌و حوكمڕانیانه‌، با بزانێ داخۆ چی ده‌ڵێ؟ زۆر جێی پرسیاره‌، چینه‌ سیاسییه‌كه‌ی ئێمه‌، هه‌ڵبه‌ت مه‌رج نیه‌ هه‌ر هه‌رێمی كوردستان وابێ، زۆربه‌ی ده‌وڵه‌تانی عه‌ره‌بیش هه‌ر وان، زۆر جێی پرسیاره‌ كه‌چی بۆ ده‌بێ له‌ دینی كۆمه‌ڵگاكه‌یان شارده‌زا نه‌بن؟!

**دانــا: ئەدی مامۆستا! بۆچی پرسیارەكە ئاوا نەكەین، بۆچی جێی پرسیار نەبێ: میللەتێكی مسوڵمان كەسێ بكاتە كاربەدەستی خۆی، كە لە دینەكەی شارەزا نەبێ؟**

**مامۆستا:** ئەوەش دەبێ، ئەوەش وایەو ڕاستە هەردوولای هەیە، بەڵام ئێستا ئێمە قسە دەكەین لەسەر حوكمڕان و لەسەر خۆبەزلگران و لەسەر چەوساوان، دەڵێین: ئەگەر لە خەڵكێك بوەشێتەوە كە خوا نەناسێ و مسوڵمان نەبێ، بێ دین بێ و، بە ئیسلام ئاشنا نەبێ، لێیبوەشێتەوە لە ڕووی سیاسییەوە، ئیستیبدادو خۆسەپاندن بكاتە پیشەو، لە ڕووی سەروەت و سامانەوە، ئیستیغلالی ئابووریی بكاتە پیشە، كەمینەیەك سەروەت و سامان لە دەستی خۆیدا قۆرخ بكات و، وە لە ڕووی ڕاگەیاندنەوە چەواشەكاریی بكاتە پیشە، ئەگەر ئەوە لە خەڵكێك كە ناموسڵمان و، بێدینە، لە وڵاتانی كافرستان، بوەشێتەوە، هەرگیز شیاوی وڵاتێكی مسوڵماننشین نیە، لە چینێكی سیاسی ناوەشێتەوە كە خۆی بە ڕۆڵەی ئەو وڵات و خەڵكە دەزانێ، كە خەڵكێكی موسڵمانە، كە هەموو شتێك بۆ خۆی قۆرخ بكات، برادەر، بۆچی پێت وایە دەسەڵاتی سیاسی هی تۆیە، كراسێكە و بەبەری تۆ دووراوە، ئەو سەروەت و سامانە، بۆچی تەنیا بە هی خۆت و حزب و خزمەكەتی دەزانی؟ بۆچی دەتەوێ ئەو سەروەت و سامانەی كە ماكینەی هۆیەكانی ڕاگەیاندنی پێ دەگەڕێ لەبەردەستی تۆدا بێ؟ ئەدی بۆچی ئاوڕ لە خەڵكی دیكە نادەیەوە، ئەدی تۆ ناڵێی: بڕوام بە ئازادیی بیروڕا هەیە، ئەوە چ ئازادییەكی كەبیروڕایە كە غەیری خۆت سامانێكی پێ نەبێ، هۆیەكانی پێ وەگەڕخات و دوو قسە بكات! وەك لە كتێبەكەی خۆمدا: (چەند مەسەلەیەكی باوی سەردەم)دا باسمكردوە كە ئەو جۆرە ئازادییە وەك ئەو ئازادییەیە كە كاتی خۆی بلۆكی سۆشیالیزم (بلۆكی ڕۆژهەڵات) ئەو ڕەخنەیەی دەگرت لە بلۆكی ڕۆژئاوا (كاپیتالیزم) ڕەخنەكەشیان لەجێی خۆیدایە، دەڵێن: ئەو ئازادیی و یەكسانییەی لە ڕۆژئاوا هەیە، وەك یەكسانیی و ئازادیی وەك هی دارستان وایە، فەرموون هەمووتان ئازادن، بەڵام پاڵەوانێك بە كێشی چوارسەد كیلۆ بێنی، لەگەڵ كەسێكی ڕیوەڵەی زەعیفی پەنجا كیلۆیی دا بڵێی: ئازادن!! ئەوە چ ئازادییەكە، كە دادگەریی و یەكسانیی تێدا

نیه، چونكه ئەو دووە هاوكووفی یەكدی نین، ئەوە چ ئازادییەكە تۆ بڵێی: له دارستان دا، شێر و ئاسك ئازادن، هەردیارە كە شێرەكە ئاسكەكە دەخوات، بێگومان ئەو جۆرە ئازادییە كە بەداخەوە لە ڕۆژئاواوە دەویسترێ، بەسەر دنیادا فەرز بكرێ، ئازادیی نیە، بەڵكو بەرەڵلاییە، ستەم و نادادییە، نا یەكسانییە، ئێستا بەتایبەت جوولەكە، زۆر لە هۆیەكانی ڕاگەیاندنی دنیا لەبەردەستی ئەواندان و، ساماندارەكان زۆر لە هۆكانی ڕاگەیاندن لەبەردەستی ئەواندان و لە ڕێی هۆیەكانی ڕاگەیاندنەوە، جۆری بیركردنەوەی خەڵك دروست دەكرێت، عەقڵیەتی خەڵك كاری تێدەكرێ، خەڵك چەواشە دەكرێ، ڕەشیان لەلا سپیی دەكەن، سپییان لەلا ڕەش دەكەن، ئنجا ئەوە ئەگەر لە خەڵكێكی نامسوڵمان بوەشێتەوە، لەبەرئەوەی دینیان نیەو كە دینیشی نەبوو ڕەحم و ویژدان نابێ، بەڵام نەدەبوو و نابێ نە خەڵك و جەماوەرێكی مسوڵمان بەوە ڕازی بێ و نابێ چینێكی سیاسی كە خۆیان بە مسوڵمان دەزانن، ئەوە لە خۆیان بوەشێننەوە.

**دانـا: مامۆستای بەڕێز! فەرمووت: تێكگیرانی پێغەمبەران و پەیامی پێغەمبەران لەگەڵ بەرانبەرەكانیان دا، لەسەر قیامەت نەبووە،بەڵكو لەسەر بەڕێوەبردنی ژیانی دنیا بووە، كەواتە: ئێستا زۆرێك لە عەلمانییەكان كە لێزانانە و زۆرزانانە باسی لەوە دەكەن: دین ئەبێ لە بەینی تاك و خوادا بێت و، لە مزگەوتدا بێت و نابێ دەستوەردان لە سیاسەتدا بكات، دیارە مەبەستیانە دین دووربخەنەوە لە كایەكانی ژیان، بۆ ئەوەی ئەوان بە ئارەزووی خۆیان ئیشیان تیا بكەن، ئایا كۆكی لەگەڵ ئەو قسەیەدا ؟!**

**مامۆستا:** بەڵێ وایە، با یەك شتت پێ بڵێم، بە بینەران و بیسەرانی بەڕێزیش، خوا سبحانه و تعالى لە ئایەتی ژمارە بیست و پێنجی سوورەتی (الأنبياء)دا و لە ئایەتی ژمارەی بیست و پێنجی سوورەتی (الحديد)دا، هەردووكیان ئایەتی (٢٥)، (٢٥)، باسی ئامانجی سەرەكیی نێررانی پێغەمبەران دەكات.

١) لە ئایەتی ژمارە (٢٥)ی سورەتی (الأنبياء)دا دەفەرمووێ: ﴿ وَمَآ أَرۡسَلۡنَا مِن قَبۡلِكَ مِن رَّسُولٍ إِلَّا نُوحِيٓ إِلَيۡهِ أَنَّهُۥ لَآ إِلَٰهَ إِلَّآ أَنَا۠ فَٱعۡبُدُونِ ﴿٢٥﴾ ﴾

[الأنبياء: ٢٥]

دیاره دوێنراو (مخاطب)، پێغەمبەری خاتەمه موحەممەد (صلى الله عليه وسلم)، دەفەرموێ: لەپێش تۆدا هیچ پێغەمبەرێكمان ڕەوان نەكردوە، مەگەر بۆمان بۆمان سروش كردووه كه به خەڵك بڵێ: جگه له خوا هیچ پەرستراو نین، تەنیا بەندایەتیی بۆ من بكەن.

واته: هەموو پێغەمبەران هاتوون بۆ ئەوەی كه خەڵك خواپەرست بێ، تەنیا خواپەرست بێ، خوا بەیەكگر بێ، تەنیا بەندایەتی بۆ خوا بكات.

**٢)** له ئایەتی (٢٥)ی سووڕەتی (الحديد)دا دەفەرموێ: ﴿لَقَدْ أَرْسَلْنَا رُسُلَنَا بِالْبَيِّنَاتِ وَأَنزَلْنَا مَعَهُمُ الْكِتَابَ وَالْمِيزَانَ لِيَقُومَ النَّاسُ بِالْقِسْطِ﴾

[الحديد: ٢٥]

واته: هەموو پێغەمبەرانمان (عليهم الصلاة والسلام)، به بەڵگه ڕوون و ئاشكرایەكانەوه ناردوون و، كتێب و تەرازووشمان پێدا ناردوون، تاكو خەڵك به دادگەریی بەڕێوه بچێ، كەواته! هەموو پێغەمبەران هاتوون بۆ چەسپاندنی خوا بەیەكگرتن (توحيد)، تەنیا خواپەرستن، وەك پەیوەندیی نێوان مرۆڤەكان و خواو، وه چەسپاندنی دادگەریی وەك پەیوەندیی نێوان مرۆڤەكان خۆیان و خۆیان، پێغەمبەران (عليهم الصلاة والسلام) هاتوون كه بەهۆی خوا بەیەكگرتنەوه دادگەریی بچەسپێنن، كەی خەڵك دادگەریی له نێودا دەچەسپێ؟ كاتێك كه خوا بەیەكگر بێ، تەنها خواپەرست بێ، بەڵام بۆچی فیرعەون و تاغووتەكان زۆر دژی تەوحید و خوا بەیەكگرتن بوون، بۆچی ڕەواجیان به شیرك داوه؟ چونكه ئەگەر شیرك هەبێ، پەرستنی حوكمڕانانی ستەمكارو خۆسەپێنیش دەبێ، شیرك یانی چی؟ هاوبەش بۆ خوا دانان، حوكمڕانی خۆسەپێنیش دەڵێ: ئنجا مادام هاوبەش بۆ خوا دادەنێی، منیش هاوبەشی خوام، منیش بپەرستن وەك چۆن خوا دەپەرستن، بەڵام ئەگەر خوا بەیەكگرتن هەبێ، یانی: تەنیا خوا شایستەی پەرسترانه، تەنیا خوا شایستەی بەندایەتی بۆ كرانه، بۆیه خوا بەیەكگرتن (توحيد) بناغەی دادگەرییەو، شیرك بناغەی زوڵم و ستەمه.

ئنجا کە عەلمانییەکانیش وا دەڵێن، پێش هەموو شتێ کار تێکراون بە فیکری رۆژئاوا، شوێنکەوتووانی ئایینی نەصرانین، چونکە ئایینی نەصرانیی دوای ئەوەی تێکدراو و شێوێنراوە، کراوە بە دینێکی تاکیی، چوار ئینجیلەکان بخوێنەوە، نامەکانی بۆڵص و ئەوانی دیکە بخوێنەوە، تەنیا باسی ئامۆژگاریی و ڕووحیی و ئەخلاقیی و پەیوەندیی نێوان تاك و خوا سبحانە و تعالی دەکەن، بۆیە ئەگەر حوکمڕانیی و سیاسەت لە نەصرانییەت بپچڕێنێت، زوڵم لە نەصرانییەت ناکەی، چونکە نەصرانییەت شەریعەتی هەر نیە، نەصرانییەت تێیدا نیە، چۆن وڵات ئیدارە بکرێت، باسی جەنگ و ئاشتی تێدا نیە، باسی سزایەکانی تێدا نیە، باسی چەسپاندنی دادگەریی تێدا نیە، بەڵام ئیسلام کاتێك کە حوکمڕانیی و دەوڵەتی لێ دوور دەخەیەوە، زوڵمی لێ دەکەی، شەریعەتەکەی پەك دەخەی، چونکە ئیسلام شەریعەتی هەیە، ئیسلام هەر عەقیدە نیە وەك ئایینی نەصرانیی، ئیسلام عەقیدەیەو شەریعەتە، ئەگەر عەقیدەکەی تەنیا تاك بتوانێ مامەڵەی پێ لەگەڵ خوادا بکات، بەڵام شەریعەتەکەی دەبێ کۆمەڵگا بەڕێوەی بەرێ و، ژیانی تاکیی و خێزانیی و سیاسی خۆی پێ ڕێکبخات، کە تەماشای قورئان دەکەی وەك چۆن باسی نوێژو ڕۆژوو و زەکات و حەج و ئیمان و عەقیدە و خۆپاراستن لە گوناحە گەورەکان و ئەوانە دەکات، باسی ئەوەش دەکات، دەبێ دادگەریی بچەسپێت، دەبێ وڵات ئاوا بەڕێوەبچێت، حوکمڕان دەبێ ئاوا بە دادگەریی حوکم بکات، خەڵك دەبێ بەو شێوەیە پێکەوە مامەڵە بکەن، باسی چارەسەری کێشەی ئابووریی هەیە، باسی پەیوەندیی نێوان دەوڵەتان هەیە، باسی جەنگ و ئاشتیی هەیە، باسی چۆنیەتی ئیدارەکردنی کۆمەڵگا هەیە. بۆیە من جارێکی کە ئەو پرسیارەم لێ کرا: کە تۆ ڕات چییە دەربارەی لێکدابڕینی دین و دەوڵەت؟ گوتم: دەبێ بڵێی: کام دین؟ ئەگەر دینی نەصرانیی بێ، هەر بۆ خۆی، دینی نەصرانیی دەوڵەتی پێ بەڕێوەناچێ، ئامۆژگاریی ڕووحییە، دوای ئەوەی کە تەحریف کراوە، ئەگەرنا هیچ پێغەمبەرێك نەهاتوە مەگەر بۆ ئەوە کە ژیانی خەڵك ڕێك بخات، بەڵام عیسا دوای خۆی کە دینەکەیان گۆڕی، ئێستا ئەو ئینجیلانەی کە لەبەردەستدا هەن، کە خوا یەك ئینجیلی ناردوە، ئێستا ئەوان چوار ئینجیلیان هەن، ئەو چوار ئینجیلە هەمووی ئامۆژگاریی ڕووحییە،

کەواتە: دەبێ بڵێی: کام دین؟ نەك دین بە موتڵەقیی، دینی مەسیحیی هەر بۆ خۆی شەریعەتی نیە، بۆیە دەوڵەتی پێ بەڕێوە ناچێ، بەڵام دینی ئیسلام سێزدە سەدە ئیسلام دەوڵەتی بەڕێوەبردوە، هەر لە سەردەمی پێغەمبەرەوە (علیە الصلاة والسلام) و خەلیفە ڕاشیدەکان، تاکو دوا ئاڵقەی دەوڵەتی ئیسلامیی (دەوڵەتی عوسمانیی) کە لە ساڵی (١٩٢٤) لەسەر دەستی کەمال ئەتاتۆرك کۆتایی پێ هات، بۆ ماوەی سێزدە سەدە مسوڵمانان لە ژێر سایەی دەوڵەتی ئیسلامییدا خۆیان بینیوەتەوە، ئیسلام حوکمی کردوون، ئیسلام شەریعەتی هەیە، قورئان و سوننەتی پێغەمبەر (علیە الصلاة والسلام) هەموو حەڵاڵ و حەڕام و ئەمر و نەهییە بنەڕەتییەکانی کە ژیانی بەشەر پێویستیی پێیان هەیە، دیارییان کردوون.

**دانـــا: کەواتە: ئەوان بە مەبەست وا دەڵێن، بۆ ئەوەی ئەو بازاڕە شێواوەی دروست بووە، لێیان تێك نەچێ، بۆیە ئەو قسەیە دەکەن؟!**

**مامۆستا:** بەڵێ، بێگومان، ڕۆژێ گوێم لە ئافرەتێك بوو، قسەی دەکرد لەسەر کەناڵێکی ڕاگەیاندن، باسی ئافرەتان و مافی ئافرەتان و مەزڵوومیەتی ئافرەتان دەکراو چۆن مافی ئافرەتان دابین بکرێ؟ ئەویش گوتی: هەنگاوی یەکەم: دەبێ دین لە دەوڵەت جیا بکرێتەوە، منیش لە دڵی خۆمدا گوتم: خوشکی خۆم! دینیان لە دەوڵەت جیا کردووەتەوە، بۆیە تۆ بەو دەردە چووی، ئەو دەوڵەتە دینی تێدا نیە، دینی چی جیا بکەنەوە؟! ئەوە نیە دینی لێ جیاکراوەتەوە، بۆیە تۆ بەو دەردە چوویی، بۆیە ئەوانەی کە لە ئاوی لێڵدا ڕاوێ دەکەن، کەسانێك کە ئەوەی بۆیان هەڵکەوێ، پێ ی ڕادەبوێرن و دوایی فڕێی دەدەن! ئایا دەبێ ئێستا وابزانرێ کە ئەم دەوڵەت و حوکمڕانییەی ئێمە بە دین بەڕێوەدەبردرێ!! خۆ تۆزە دینێکی کە تێیدا مابێ، ئەویش لە دڵ و هەناوی ئەو خەڵکەدایەو، هەندێ لە بەرپرسان کە ڕەحم و ویژدانێکیان هەیە بەهۆی ئەو تۆزە دینداریيەوەیە لە دڵی ئەو خەڵکەدایەو، ئەگەر ئەوەندەش نەمێنێ، ئێمە وەك ئەورووپا و ڕۆژئاواش نین کە لە ڕووی کاروباری دنیاییەوە، حاڵی خۆمان باش ڕێکخستبێ، چونکە یەکێ بۆی هەیە بپرسێ: ئەدی لە ڕۆژئاوا خۆ ئیسلام حوکم ناکات بۆچی

لەوێ تارادەیەك دادگەریی هەیە؟ دەڵێین: ئەوان هەندێك بەهایان هەن، ئەو بەهایانەیان، هەندێکی بە ئەزموون پێی گەیشتوون و ڕەنگە زۆریشیان لە دینەکەیانەوە سەرچاوەیان گرتبێ، پاشان لە فیترەت و عەقڵی سەلیمەوە، بەڵام ئێمە نە بە فیترەت و عەقڵی سەلیم کار دەکەین، نە بە دینەکەش کار دەکەین، بۆیە وەزعمان زۆر خراپی لێ هاتوە، ئەگەرنا لە ڕۆژئاوا کۆمەڵێ شتی باشیان هەیە، بەڵام ئەو شتە باشانەی ئەوان لە ئیسلامی خۆماندا هەمووی ڕەگ و ڕیشەی هەیە و کاتی خۆی زۆری مومارەسە کراوە، لە درێژەی سێزدە سەدەی تەمەنی دەوڵەتی ئیسلامیسدا.

**دانـا: مامۆستا! لە کۆتایی بەرنامەکەمان داین، جەنابت لەم تەوەرەیەدا چەند دێڕێکت نووسیون، حەزدەکەم بۆت بخوێنمەوە و جا وەك پرسیارێك، فەرمووتە: (نیشانە و بەڵگەیەکی گەورە و بنەڕەتیی، ڕەسەنایەتیی هەر تەوژم و کۆڕ و کۆمەڵێکی ئیسلامیی، ئەوەیە کە هەمیشە دادکۆکیکاری کەرامەت و ئازادیی و مافەکانی خەڵکی سادە و بەشخووراو و چەوساوە بێ و لەسەنگەری ستەملێکراواندا بێ، لە بەرامبەر و دژی ستەمکاران بێ) چۆن ئەم بۆچوونە بۆ بیسەرێك بۆ بینەرێك، بۆ خەڵکی کوردستان بە کرداری ڕوون ئەکەیتەوە، جەنابت کە لە ڕووە سیاسییەکەیەوە ئەمیری حیزبێکی کاریگەریی لەم کوردستانەداو کە ئەمیری کۆمەڵی ئیسلامییت، ئایا کۆمەڵی ئیسلامی توانیویەتی لە بەرەی خەڵکی چەوساوە و ستەمدیدەدابێ؟!**

**مامۆستا:** بێگومان ئێمە نابێ خۆمان وا بڵێین، دەبێ بزانین خەڵك چۆنمان دەبینێ؟ من پێموایە کە: بەڵێ، ئنجا بۆ زانیارییت ماوەی پێشوو شاندی پارتی دیموکراتی کوردستان هاتن بۆ لامان، زۆر جەختم لەسەر شتێك کردەوە، گوتم: پێمخۆشە زۆر چاك بزانن کە ئێمە وەك کۆمەڵی ئیسلامیی لە یەك مەسافە وەستاوین و لەڕاستییدا لە خۆمانی ناوەشێنینەوە: شوێنکەوتە و لاساکەرەوەی کەس بین و، بە خۆشمانی ڕەوا نابینین هیچ کەسیش لاسامان بکاتەوە و کوێرانە شوێنمان بکەوێ، هەروەها گوتم: پێمخۆشە زۆر چاك بزانن کە هەڵوێستەکانی ئێمە هەڵقولاوی قەناعەتەکانی ئێمەن، قەناعەتەکانیشمان هەڵقولاوی ئەو ئیمان و عەقیدەیەن، ئەو دینداریی و مسوڵمانەتییەن کە ئێمە پێیەوە پابەندین.

پێموایه ئەگەر له خەڵك و جەماوەری هەرێمی كوردستان بپرسی: وەڵامی پرسیارەكەت ئاسانه، خۆش نیه خۆمان بڵێین شانمان وا و باڵمان وا، بەڵام من دەمەوێ خەڵك بزانێ كه هەڵوێستەكانی ئێمه بەو جۆرەت و، باجیشمان داوە لەسەر هەڵوێستەكانمان و ئامادەین باجی زیاتریش بدەین، كاتی خۆی لەسەرەتای ئەو هەڵوێست وەرگرتنەمانەوە من شتێكم گوت، گووتم: كێو بجووڵێ ئێمە ناجووڵێین، بۆچی ناجووڵێین؟ چونكه ئیماندار خۆی به خوا فرۆشتوە، خوا سبحانه وتعالی كه دەفەرموێ: خوا

﴿ أَلَا لَعْنَةُ ٱللَّهِ عَلَى ٱلظَّـٰلِمِينَ ۝١٨ ﴾ [هود: ١٨]

ئاگاداربن! نەفرینی خوا لەستەمكاران، من چۆن له ستەمكاران نزیك دەبمەوە، هەر كەسێ به ستەمكاری بزانم: زەردە، بۆرە، مۆرە، سەوزە، سوورە، ڕەشه، هەرچی ببێ، هەر ڕەنگێكی ببێ، من حەقم نیه، من حەقی كردەوەكەیم هەیه، نەك حەقی حیزبەكەی، نەك حەقی ڕەنگەكەی، حەقی كردەوەكەیم هەیه: (انظر الی ما قیل، ولا تنظر الی مَن قال) تەماشا بكه چی گوتراوە، تەماشا مەكه كێ گوتوویەتی؟ هەربۆیەش ئەگەر خەڵك ئینصافی هەبێ، ان شاء الله ئینصافیش هەر هەیه، خەڵك تەماشا دەكات: كودەتا دەكرێ له توركیا، كودەتا بەسەر ئیرادەی خەڵكدا، بەسەر ڕەوایەتییدا، ئێمه دژیینی، وەك به شاندی پارتیشم گوت، گوتم: بەڵام ئێوە بەس دژی كودەتایەكەی توركیا بوون، بەڵام له میصریش كودەتا كرا بەسەر ئیرادەی خەڵك و جەماوەر و بەسەر ڕەوایەتییدا به قازانجی سیسی و لەدژی موحەممەد مورسی، بەڵام ئێوە دژی نەبوون، بەڵام ئێمه دژی ئەو كودەتایەی ئەوێش بووین، چونكه (بانێكه و دوو هەوا) و (كیل بمكیالین) ناكەین، ئێمه دژی كودەتاین، بەسەر ئیرادەی خەڵكدا، بەسەر ڕەوایەتییەكدا كه خەڵك دەیدا به هەر كەسێك، دەبێ ئەو ڕەوایەتییه پارێزراو بێ، له میصر بكرێ، یان له توركیا بكرێ، عەلمانیی بیكەن دژی عەلمانیی، یاخود عەلمانیی بیكەن دژی ئیسلامیی، یان ئیسلامیی بیكەن دژی عەلمانیی!هەروەها تەماشا بكه! ئێمه توركیا تۆپبارانی وڵات دەكات، ئێرانیش تۆپباران دەكات، حیزبێك دژی تۆپبارانەكەی توركیایه، بەڵام بەرامبەر

هی ئێران بێدەنگە، حیزبێکی دیکەش دژی تۆپبارانەکەی ئێرانە، بەڵام بەرامبەر بە هی تورکیا بێدەنگە، ئێمە لە هەردووکیان وەدەنگ هاتووین، نوری مالیکی ئینحیراف دەکات دەڵێین دەبێ متمانەی لێ وەربگیرێتەوە، بەشار ئەسەد زوڵم لە خەڵکی سووریا دەکات، دەڵێین: ئەوە دیکتاتۆرە و دەبێ لە بەین بچێ، حەقم نیە داخۆ ئێران دەڵێ چی؟ تورکیا دەڵێ چی؟ تووران دەڵێ چی؟ جوولەکە زوڵم لە فەلەستینییەکان دەکات، دەڵێین: ئەوە قەوارەیەکی خۆسەپێنە، زوڵم و ستەم دەکات، بۆچی؟ چونکە فەلەستینییەکان خاکی خۆیانە لێیان داگیرکراوە، هەقم نیە داخۆ ئەمریکا دەڵێ چی؟ ئەمریکا با ئاوی سارد بخواتەوە، ئەگەر سبەینێ مسوڵمانێکیش، ئیسلامییەکیش زوڵم لە عەلمانیی بکات، هەر ئەوە هەڵوێستمان دەبێ، زوڵم هەر زوڵمە، ئیسلامیی بیکا لە عەلمانیی، عەلمانیی بیکا لە ئیسلامیی، کافر بیکا لە مسوڵمان، مسوڵمان بیکا لە کافر، زوڵم هەر زوڵمە، ئێمە بەڕاستیی هەوڵمانداوە ئاوا لەگەڵ مەبدەئەکانی خۆمان، لەگەڵ ئەو مەبدەئانەی کە قورئان و، سوننەتی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەیانفەرموون، چ لەسەر ئاستی سیاسەتی نێو خۆمان، چ لەسەر ئاستی هەڵوێستەکانی دەرەکیی، ئاوا بین، بۆیە ئێمە پێمانوایە لە بەرەو سەنگەری خەڵك و جەماوەر و چەوساوان داین و، دژی ستەمکارانین.

ئنجا ئێمە ئێستا ڕەنگە هی وامان هەبێ بڵێ: وەڵڵا ئێمە مەحرووومین، مەزلوومین، پارەمان نیە،نەوت نافرۆشین، بەڵام خەڵکی دیکە ڕەنگە هەرکەسە بەشێوەیەك شتی خۆی ڕێکخستبێ، ڕاستە، بەڵام بۆچی ئەگەر ئێمە نەوتیشمان بکەوێتە دەست، ئاوای لێ دەکەین؟! بۆچی ئەگەر دامەزراندن و زەوی و زاریش بەدەست ئێمە بێ، دەبێ ئاوای دابەش بکەین؟! بە تەئکید وای لێ ناکەین.

هەروەها ئەوانەش کە زوڵمیان لێ کردووین، دەبێ تەماشایان بکەین، من حەقم نیە دوێنێ زوڵمی کردوە، ئەو کەسە مادام حەقی هەبێ، دەبێ حەقەکەی پێ بدرێ، زوڵمەکەی بەجێی خۆی، حەقەکەشیی بەجێی خۆی، بەهەرحاڵ ئێمە هەوڵمانداوە کە لەگەڵ قسەکانی خۆماندا ڕاستبکەین و، هەرکەسێ شارەزای ئێمەبێ، دەزانێ کە هەوڵ دەدەین، قسەی زارمان تەعبیر بکات لە قەناعەتی نێو

دڵمان، كردەوەكەشمان مۆرێك بێ بە قسەكانمانەوە بێ، چونكە ئەوە كە ئینسان، دڵ و زمانی لەیەك جیا بێ، قسە و كردەوەی لێك جیا بێ، حاڵەتێكی نەخۆشییە كە لە شەریعەتدا پێی دەگوترێ: نیفاق، خوای پەروەردگار ئێمە و هەموو لایەك بپارێزێ لە حاڵەتی نیفاق و دووانەتیی و دووفلیقانەیی.

**دانـا: زۆرباشە مامۆستا! كاتم هیچ نەما، چەند پرسیارێكی گرنگ هەبوون إن شاء الله هەڵیان ئەگرین بۆ ئاڵقەی داهاتووی بەرنامەكە، ئەگەر خوای گەورە دەرفەتی پێ بەخشین هەرچەندە ئەبوایە ئەم پرسیارە لە سەرەتای ئاڵقەكانی ئەم بەرنامەیەوە بمانكردایە، ئەویش ئەوەیە كە فەرمووت: بۆ چاككردنی ئەم دۆخەی هەرێم، با گوێ لە قورئان بگرین، لەوانەیە بپرسێ ئەدی بۆچی گوێ لە فەرموودەكانی پێغەمبەریش نەگرین؟ إن شاء الله ئەوە دەخەینە ئاڵقەی داهاتوو، لە ئاڵقەی سێزدەیەم دا وەڵامی وەربگرینەوە.**

**مامۆستا:** باشە ئەوەندە دەڵێم: سوننەتی پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) بریتیە لە پراكتیزەكردن و جێبەجێكردنی قورئان لەسەر ئەرزی واقیع و، لەڕاستییدا سوننەتی پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام)، ئەو چۆنیەتیی و ڕێبازەیە كە پێغەمبەری خوا، ئیسلامی پێ بەڕێوەبردوە، كە ئەویش هەر جێبەجێكردنی قورئانە، بەڵام بە شییكردنەوە و ڕوونكردنەوەوە، وەك خوا دەفەرموێ:

﴿وَأَنزَلْنَآ إِلَيْكَ ٱلذِّكْرَ لِتُبَيِّنَ لِلنَّاسِ مَا نُزِّلَ إِلَيْهِمْ﴾ [النحل : ٤٤]

إن شاء الله لە ئاڵقەی داهاتوودا زیاتر تیشكی دەخەینە سەر.

**دانا: هەروەها لە ئاڵقەی (١٣) دا باسی ئەوە دەكەین كە (تێكدان ئاسانە و بە كەمێك دەكرێ، بەڵام بنیاتنان قورسە و پێویستی بە زۆرینەیە ئیشی لەسەر بكات).**

**بەڕێز مامۆستا عەلی باپیر ئەمیری كۆمەڵی ئیسلامی، نووسەر و ڕووناكبیر! بەوەی كە لەم ئاڵقەیەدا ئامادە بوویت و وەڵامی پرسیارەكانی ئێمەت دایەوە، زۆر سوپاست دەكەین.**

**مامۆستا عەلی باپیر:** سوپاس بۆ ئێوەش و، دووبارە بەخێر بێن.

# ئاڵقەی سێزدەیەم

بنەمای سێزدەیەم: تێکدان ئاسانە و بەکەمێکیش دەکرێ، بەڵام بنیاتنان قورسە و بە زۆران نەبێ ناکرێ.

ameer.maktab@yahoo.com

دانـا: بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان، سڵاوتان لێ بێ بینەرانی ئازیز و خۆشەویست! خۆم بە خۆشحاڵ ئەزانم خوای پەروەردگار دەرفەتی پێبەخشین لە ئاڵقەیەكی نوێی بەرنامەی بەدانایی لە خزمەت میوانە هەمیشەیی بەرنامەكەماندا: جەنابی مامۆستا عەلی باپیر نووسەر و ڕووناكبیر، بە ئێوەی ئازیز و خۆشەویست شاد ئەبینەوە، ئاڵقەی ئەمجارەی بەرنامەكەمان بەدەر لەو بابەتە كە لەسەری ئەڕۆین "بۆ چاككردنی ئەم دۆخەی هەرێم با گوێ لە قورئان بگرین"، لەبەرئەوەی لایەنە ئیسلامییەكان بە گەرم و گوڕیی لە كەناڵەكانی میدیاوە دەرئەكەون، كە ئێستا لێك نزیكبوونەوە و كۆبوونەوە و سەردان و كۆمەڵێك بابەت ئەوترێ لەسەر نزیكبوونەوەی لایەنە ئیسلامییەكان، بەدەرفەتمان زانی ئەم ئاڵقەیە تایبەت بكەین بە لێكنزیكبوونەوەی لایەنە ئیسلامییەكان، هەروەها چەند پرسیارێك لەسەر كۆی لایەنە ئیسلامییەكان هەم لە ڕابردوو و هەم لە ئێستا، هەم بۆ داهاتووی كاریان.

مامۆستاگیان! سڵاوی خوات لێ بێت.

**مامۆستا:** سڵاوی خوا لە ئێوەش بێ كاكە دانا، بەخێریش بێن سەرچاو.

دانـا: زۆر سوپاس، مامۆستاگیان! هەروەك ئاماژەم پێكرد لە پێشەكییەكەدا ئەویش ئەوەیە كە ئەبینرێ لایەنە ئیسلامییەكان، بەتایبەت سێ سەركردە باڵاكەی ئەو سێ لایەنە ئیسلامیەی هەرێمی كوردستان (كۆمەڵی ئیسلامیی، یەكگرتووی ئیسلامیی، بزووتنەوەی ئیسلامیی) بە گەرموگوڕی لە كۆبوونەوەدان، كاتێك جەنابت سەردانی ناوچەیەك ئەكەی، سەردانی بارەگاكانی جگە لە كۆمەڵ، بزووتنەوە و یەكگرتووش ئەكەی، بەهەمانشێوە مامۆستا سەڵاحەددینیش، بێگومان ئەمە دڵخۆشییەكی زۆری دروستكردوە هەم لەلای هاووڵاتییان، هەم لەلای لایەنگرانی سێ لایەنەكە، بەڵام بەدەریش نیە لە ڕەخنە و تێبینی و گلەیی، لەو سۆنگەیەوە من كۆمەڵێك پرسیارم ئامادەكردوە لە خزمەت جەنابتدا، بۆ ئەوەی بینەران لەلایان ڕوون بێت.

ئەگەر بگەڕێینەوە بۆ سەرەتا پێش ڕاپەڕین، بۆ خەباتی شاخ و چەكداریی لە هەرێمی كوردستان، لایەنە ئیسلامییەكان، بە بڕوای جەنابت بۆچی دواكەوتن لەوەی لە دژی ستەمكاری بەعس خەباتی چەكداریی دەست پێ بكەن وەك ئەزانین

**كۆمەڵێك پارت و لایەنی عەلمانی ـ سیكۆلار پێش ئیسلامییەكان دەستیان دایە چەك و چوونە شاخ، ئیسلامییەكان بڕوایان بەو جۆرە خەباتە نەبوو، یان هۆكاری چی بوو دواكەوتن؟**

**مامۆستا:** بسم الله الرحمن الرحیم، الحمد لله، وصلی الله تعالی وسلم وبارك علی رسول الله، محمد وآله المهتدین بهداه. ربنا آتینا من لدنك رحمة وهيءلنا من أمرنا رشدا.

كاكە دانا بەنیسبەت دواكەوتنی ئیسلامییەكان، یاخود دواكەوتنی خەڵكی موسڵمان كە خەباتی نەتەوەیی و نیشتیمانیی خۆی بكات بە نەفەسێكی ئیسلامییانەو لە ژێر بەیداغی ئیسلامدا، ئەوە هۆكاری زۆرن، بۆچی وابووە؟ بەڵام ئەوە حەقیقەتێكە نكوولْیی لێ ناكرێ، بەڵام ئێمەش پێش ئەوەی سەرنجی پێش راپەڕین بدەین، واتە: لە حەفتایەكان بەم لاوە، یاخود لە شەستەكان بەم لاوە، كە بوونی نەفەسێكی ئیسلامیی لە خەباتی رزگارییخوازی گەلی كورد لە هەموو بەشەكانی كوردستان لە هەر چوار پارچەكەی دا، زۆر كز بووە، خەفە بووە، ئەگەر بۆ ڕابردووتر بڕۆین، دەبینین كە هەموو ئەوانەی خەباتی نەتەوایەتیی و نیشتیمانییان كردوە، هەموو ئەوانەی كە بەرگرییان كردوە لە خاك و خەڵكەكەی خۆیان، كەسایەتیی ئیسلامیی بوون، هەر لە شێخ عوبەیدوڵڵای نەهریی لەساڵی (١٨٨٠) دا و، پێش ئەوەش و دوای ئەوەش، دوایی شێخ عەبدولقادری شەمزینان، كە كوڕیەتی، پاشان شێخ سەعیدی پیران، دوایی شێخ عەبدولسەلام، پاشان یەزدانشێر لە كوردستانی ڕۆژهەڵات، دوایی سمایل خانی شكاك، ئنجا شێخ مەحموودی حەفید، دواتر قازی موحەممەدو، مەلا موستەفا، هەموو ئەوانە یان مەلا بوون، یان شێخی تەریقەت بوون، یاخود سەرۆك عەشیرەتێكی بەدەستنوێژ بوون، بەڵام دوایی خەباتی ڕزگاریخوازیی كورد، مۆركێكی عەلمانیی وەرگرت لە چلەكان و پەنجایەكان بەملاوە، ئەگەرنا پێشتر قازی موحەممەد كە یەكەمین كۆماری كوردستانی دامەزراند لە موهاباد، مەلایەك بووە، قازییش بووە، هەر بە بنەماڵەش قازیی بوون، شێخ مەحموودی حەفید ئەوە دیارە هەر بە بنەماڵە شێخ بوون، ئەهلی عیلم بوون، كە دەبێتەوە

بە نەوەی كاك ئەحمەدی شێخ، ڕەحمەتی خوایان لێ بێت لە هەموویان،ئنجا مەلا موستەفاو شێخ عەبدولسەلامی برای، كە ئەوانیش هەر ئەهلی تەریقەت بوون و شارەزایی ئاینییان هەبووە، شێخ عوبەیدیللای نەهریی هەر پیاوێكی زۆر بەرجەستەی تەریقەتی نەقشیی بووە، لە باكووری كوردستان، كەواتە: دوایی شەپۆلی سیكۆلاریزمی ڕووی كردە خەباتی ڕزگاریخوازیی نەتەوەی كورد، زیاتر بە باری چەپگەرایی و ڕووكردنە ڕۆژهەڵات، ڕووكردنە یەكێتی سۆڤیەت.

هەڵبەتە دوای ئەوەش كە تەوژمی عەلمانیی بوو بە سەرمەشقی خەباتی ڕزگاریخوازی گەلی كوردستان، ئەهلی دین و مەلا و شێخ و خەڵكی دیندارو پابەند بە ئیسلامەوە هەر بوون، بەڵام ڕابەرایەتیی و قیادە لەدەست ئەواندا نەماو كەوتە دەست كەسانێكی سیكۆلار، ئنجا ئەوە وەك گوتم، هۆكاری زۆری هەن:

هۆكاری یەكەم: یەكێك لە هۆكارەكان كە هۆكاری بنەڕەتییەو ئەوەش حەقیقەتێكی تاڵە، بریتیە لەوە كە خەڵكەكە بە گشتی باش لە ئیسلام تێنەگەیشتودە، تێگەیشتنێكی كەم و كورت و بەرتەسكی هەبووە بۆ ئیسلام، زانیویەتی كە خوا سبحانە وتعالى نوێژی لەسەر فەرز كردوە، پێنج فەرزەی نوێژ، ڕۆژووی مانگی ڕەمەزان، زەكاتدان، حەج و عومرە، خۆپاراستن لە گوناحەكان، وەك حاڵەتی شەخصیی خۆی، ئەوپەڕەكەی وەك حاڵەتی باری كەسێتیی، بەڵام نەیزانیوە واتە: بە گشتیی خەڵك نەیزانیوە، كە ئەو ئیسلامەی لەسەری پێویستكردوە كە دەبێ ئیمانی هەبێ، دەبێ عیبادەتی هەبێ بۆ خواو، دەبێ پابەند بێ بە حەڵاڵ و حەرامی خواوە لە ژیانی تاكی و خێزانیی خۆیدا، بەهەمانشێوەش لەسەری فەرز كردووە كە دەبێ لە ژیانی سیاسیی و كۆمەڵایەتییشیدا و بۆ خەبات و بەرخۆدانیشی، هەر بگەڕێتەوە بۆ قورئان و سوننەت و شەریعەت، یانی هۆكاری سەرەكیی ئەو هەڵە تێگەیشتنە لە ئیسلام و جوزئیی تێگەیشتن لە ئیسلامە بووە، هەمیشەش هەڵوێستی ئینسان بەپێی جۆری تێگەیشتنیەتی، كەسێ كە پێی وابێ ئیسلام تەنیا نوێژ و ڕۆژوویەكی شەخصییە، هەر ئەوەندە جێبەجێ دەكات، كەسێ كە پێی وابێ كە ئیسلام تەنیا زیكر و فیكرێكی ڕووحییە، هەر ئەوەندە جێبەجێ دەكات، ئەویدیكە كە پێی

وایە ئیسلام تەنیا لایەنی بانگەواز و پەروەردەیە، هەرئەوەندە جێبەجێ دەکات، بەڵام ئەگەر بزانێ وێڕای ئەوانە، ئیسلام بریتییە لە خەمخواردن لە کۆمەڵگای خۆشت، لە نەتەوەی خۆشت، بەرگرییکردن لە نیشتمانی خۆشت و، وەك چۆن لە قورئاندا باسی نوێژ و ڕۆژوو و تاعەتی شەخصیی کراوە، باسی چەسپاندنی دادگەریش کراوە، باسی فەرمان بە چاکە و ڕێگرتن لە خراپەش کراوە، باسی بەرپەرچدانەوەی ستەمکارانیش کراوە، خوا فەرزی کردوە:

١) ﴿ وَقَٰتِلُوا۟ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ ٱلَّذِينَ يُقَٰتِلُونَكُمْ ﴾ [البقرة : ١٩٠]، واتە: لەڕێی خوادا لە دژی ئەوانە بجەنگن، کە لەدژتان دەجەنگن.

٢) ﴿ٱلشَّهْرُ ٱلْحَرَامُ بِٱلشَّهْرِ ٱلْحَرَامِ وَٱلْحُرُمَٰتُ قِصَاصٌ ۚ فَمَنِ ٱعْتَدَىٰ عَلَيْكُمْ فَٱعْتَدُوا۟ عَلَيْهِ بِمِثْلِ مَا ٱعْتَدَىٰ عَلَيْكُمْ ۚ ﴾ [البقرة: ١٩٤].

بێگومان ئەو ڕاستییانە، ئەو ڕەهەندانە لە ئیسلام، زۆر باش لە دڵ و مێشکی خەڵکی کورددا درەوشاوە نەبوون، تاکو خۆیان بە بەرپرسیار بزانن بەرامبەر بە جێبەجێکردنی ئەو لایەنانەی ئیسلامیش.

هۆکاری دووەم: پاشان ئەو شەپۆلە ماددییگەریی و دژی ئیسلام و دژی دینییە کە لە یەکێتی سۆڤیەتەوە سەرچاوەی گرت، کاریگەریی سەلبیی هەبوو لەسەر هەموو جیهانی ئیسلامیی و، لەنێویشیدا نیشتمانی کورد، تەماشا دەکەی کاتی خۆی جەمال عەبدولناصر ئیدیعای سۆشیالیزمی دەکرد، تەنانەت ڕژێمی بەعس: لە عێراق و لە سووریا: دروشمی (وحدە حریە اشتراکیە)ی بەرز کردبۆوە، هەروەها گەلێك حیزب و لایەنی دیکەش، ئەگەر واش نەبووبن، مارکسی و چەپییش نەبوو بن، هەوڵیانداوە بۆیەیەکەی چەپیی لە خۆیان بدەن، ئەو کاتە مارکسیزم مۆدێلی ئەو ڕۆژگارە بوو، ئەوەش دیسان کاریگەریی هەبوو.

بە کورتیی و بە کوردیی: دەبێ ئێمەی مسوڵمان دان بە کەمتەرخەمیی خۆماندا بێنین، کە ئەوە خەتای ئێمە بوو، ئەگەرنا ئیسلامەکەمان، ئەو ئیسلامەی کە شێخ عوبەیدیللای نەهریی لێی حاڵی بوو بوو، کە شێخ عوبەیدیللای نەهریی نەتەوایەتسی دەکرد، بەڵام بە نەفەسی ئیسلامیی و دیندارانە دەیکرد، هەروەها

شێخ سەعیدی پیران، كە لە ساڵی ١٩٢٥ دا ئیعدام كرا، شێخ سەعیدی پیران دوو ئامانجی هەبوو، هەم دیفاع لە گەل و نیشتیمانەكەی خۆی هەم هێنانەوەی خیلافەتی ئیسلامیی، كە ئەوكاتە كەمال ئەتاتوورك كۆتایی بە دەوڵەتی خیلافەت هێنابوو، ئنجا ئەوانە چۆن حاڵیی بووبوون و ئەو حاڵیی بوونە پاڵی پێوەنابوون كە خەباتی نەتەوایەتیی و نیشتیمانیی بەنەفەسی ئیسلامییانە بكەن، خەڵكەكەی دیكەش ئەگەر وەك ئەوان حاڵیی ببووایە، هەمان هەڵوێستی دەبوو.

**دانــا: كەواتە وەك جەنابت فەرمووت، ڕاستییەكی تاڵە دەبێ دانی پێدا بنێین؟**

**مامۆستا:** بەڵێ ڕاستییەكی تاڵەو دەبێ دانی پێدا بنێین، من دەمەوێ كە دان بەوەدا بێنین تاكوخەتای ئیسلام نەگرین، من دەڵێم: ئەو ئیسلامەی كە وایكرد: شێخ عوبەیدیللای نەهری ڕەحمەتی خوای لێ بێت و سمایل خانی شكاك و شێخ سەعیدی پیران و شێخ عەبدولسەلام و قازی موحەممەد و شێخ مەحموود و ئەو گەورە پیاوانە، ببنە پێشڕەو و سەرمەشقی خەڵكەكەی خۆیان، بۆ خەبات و بەرخۆدانی نەتەوەیی و نیشتیمانیی، ئەو ئیسلامە هەر ئەو ئیسلامە بوو، كە دوایی بە داخەوە بەهۆی هەڵە تێگەیشتن و، بە هۆی كەوتنە ژێر كاریگەریی فیكری نامۆ و بێگانە، بەتایبەتی چەپگەرایی، خەڵكەكە خۆی بە بەرپرسیار نەزانی، بۆیە مەلاو مامۆستایەكان هەبوون لە خەباتی ڕزگاریخوازییدا، بەڵام وەك پێشڕەو نەبوون و، وەك شوێنكەوتوویەك هەبوون، وەك بەشدارێك هەبوون، كە دەبوایە ئەوان ئاڵا بەدەست بوونایە.

**دانــا: مامۆستا! لەسەرەتای هەشتایەكان بەملاوە لە سەرتاسەری هەرێمی كوردستان دا، لە قەراغ و لە هەورامانات و لە هەولێر و لە پشدەر و لەملاولا مامۆستایان و گەنجانی وەك جەنابتان هەبوون كاتێك كە ڕەوتی ئیسلامیی چەكدارییش دێتە ئاراوە، ئەبینین بەراورد بە لایەنە سیكۆلارەكان كەمتر خەڵك لە دەوریان كۆئەبێتەوەو كەمتر كاریگەرییان هەیە، ئەدی ئەمەیان هۆكاری چییە؟**

**مامۆستا:** دیارە ئەو كەسەی پێشتر خەبات دەكات و دەوری خۆی دەبینێت، زووترو زیاتر دەوری خۆی قەرەباڵغ دەكات و، خەڵك بە فیكری ئاشنا دەبێ،

بە خەباتەکەی ئاشنا دەبێ و، بە هەڵوێستەکانی ئاشنا دەبێ و، زۆرێك لە خەڵك هاوسۆزیی بۆ دروست دەبێ لەگەڵی و، قوربانییدان دەكات لە ژێر ئەو بەیداغەداو، خەبات دەكات، كە بۆ هەندێكیان بەشداریی لەو حیزبانەدا بووەتە میرات، كەسێ بابی، مامی، برای، خزمی، كوژراوە لەو حیزبەدا، پێش هاندەری فیكریی و ئیدۆلۆژی هاندەریی عاتیفیی بۆ دروست دەبێ. كەسێكیش كە لەژێر بەیداغێكی غەیرە ئیسلامییدا خەباتی كردوە، خەباتەكە شتێكی ڕەوایە، ئێمە زۆرجار گوتوومانە، زۆر كەس دەعوایەكەی حەقە، بەڵام ئەو ڕێگایەی بۆ هێنانەدی ئەو دەعوایە گرتوویەتەبەر، ناحەقە، ڕێبازەكەی و شێوازەكەی ناحەقە، ئەگەرنا خۆی شتێكی حەق و ڕەوا بووە، ئیدی ئەوان پێشكەوتوون، دوایی تەوژمی ئیسلامیی كەوتووەتە دواو، ئەوەش كاریگەریی بووە لەوەدا كە خەڵك زیاتر بەوانەی پێشێ ئاشنا بێ، ئنجا وەك گوتم: لەگەڵدا بوونی هەندێ خەڵك بۆ ئەو حیزبە عەلمانییانە، بووەتە میراتێك.

**دانـا: بەڵام ڕەخنەیەكی دیكە لە ئیسلامییەكانی ئەوكاتە هەتا نەوەدەكان و سەرەتای دووهەزارەكانیش، كە وەك ڕەخنەیەكی جیددیی لە ئیسلامییەكان ئەگیرێ، ئەوەنیە بە بڕوای تۆ كەگوتاری لایەنە ئیسلامییەكان كەمتر بەلای نەتەوەیی و نیشتمانیی دا بووەو زیاتر بەلای ئۆممەتی ئیسلامیی و دەوڵەتی گەورەی ئیسلامیی دا بووە؟!.**

**مامۆستا:** ڕەنگە بۆ هەندێكیان وابێ، بەڵام هەمیشە گشتاندن، سەری لە هەڵەوە دەردەچێ، ئیسلامییەكان وا و، عەلمانییەكان وا و، ڕۆژئاوا وا و، دنیا وا، ئەوە هەڵەیەو، پۆلێنكردن ڕاستە، خوای پەروەردگار لە باسی خاوەن كتێبەكاندا دەفەرموێ:

﴿ لَيۡسُواْ سَوَآءٗۗ ﴾ [آل عمران : ١١٣]، واتە: وەك یەك نین،

دەفەرموێ: ﴿ وَمِنۡ أَهۡلِ ٱلۡكِتَٰبِ مَنۡ إِن تَأۡمَنۡهُ بِقِنطَارٖ يُؤَدِّهِۦٓ إِلَيۡكَ وَمِنۡهُم مَّنۡ إِن تَأۡمَنۡهُ بِدِينَارٖ لَّا يُؤَدِّهِۦٓ إِلَيۡكَ إِلَّا مَا دُمۡتَ عَلَيۡهِ قَآئِمٗاۗ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمۡ قَالُواْ لَيۡسَ عَلَيۡنَا فِي ٱلۡأُمِّيِّـۧنَ سَبِيلٞ ﴾ [آل عمران : ٧٥]

دەفەرمویَ: لە خاوەن كتێبەكان هەیە ئەگەر قینتارێك (واتە: پڕ پێستێك) زێڕ و پارەی پێ بسپێری، دەتداتەوە، هەشیانە دینارێكی پێ بسپێری، مەگەر هەر چاوت لەسەری بێ، ئەگەرنا ناتداتەوە، لەبەرئەوەی دەڵێن: ئێمە ماڵی ئوممییەكان، (واتە: غەیری جوولەكە) بشخۆین زەرەری نیەو، حەڵاڵە بۆمان.

خوای دادگەر پۆلێنیان دەكات و دەفەرمویَ: وەك یەك نین. ئیسلامییەكانیش ئەو كاتە هەموویان وانەبوون وانەبوون، كە جەنابت ئاماژەت پێكرد.

**دانــا: مامۆستا! زۆر بە ڕاشكاویی، دوو ڕەئی هەبوون: ڕای ئەوانەی پێیان دەگوترا: ئیخوان و ئەوەی پێی دەگوترا جیهاد.**

**مامۆستا:** ڕاستە، ئێستا من بۆت باس دەكەم: بەڵام باجاریَ مەسەلەیەكی گرنگ بخەمە ڕوو: من قەناعەتم وایە لەهەر شوێنێكدا، دەبێ خەڵكی ئەو شوێنە، خۆیان بە تێگەیشتنی خۆیان لە قورئان و سوننەت (لە ئیسلام) هەوڵبدەن وەڵامی پرسیارەكانی ڕۆژگاری خۆیان بدەنەوە، ئەگەر خەباتی ڕزگاریخوازیی نەتەوەیی بكەن، ئەگەر بیانەویَ ژیانی خێزانیی ڕێكبخەن، گرفتە كۆمەڵایەتییەكانیان چارەسەر بكەن، گرفتە ئابوورییەكانیان چارەسەر بكەن، بەڵێ عەقڵی خەڵكیی لێی بەهرەمەند بی باشە، بەڵام بەشت ناكات، چونكە ئەو واقیعەی تۆ تێیدا دەژیت، جیایەو، ئەو پرسیارانەی تۆ لەگەڵیاندا ڕووبەڕوو دەبیەوە، ڕەنگە یەكەمجار بێ، بەو تام و بۆیە و بەو شێوەیە ئەو پرسیارانە بۆ تۆ بێنە پێش، كەواتە: دەبێ ئیجتیهادێكی تازەیان بۆ بكەی، جا قوتابخانەی (إخوان المسلمین) لەسەر ئاستی زۆرێك لەوڵاتان كاریگەریی باش و زۆری بووەو، بەهۆیەوە ژمارەیەكی زۆر لە مسوڵمانان، هۆشیار بووەتەوە، خوا پاداشتیان بداتەوە، بەڵام لە عێراقدا لە ساڵی حەفتاوە بڕیاردراوە كاری ڕێكخراوەیی كاری حیزبیی بوەستێنرێت، ئەوە شتێكی ئاشكرایەو هەموو كەس دەیزانیَ، ئەو كاتە وەك خەڵكێكی پرژو بڵاو، بوون، كە دیارە ئەم هەرێمی كوردستانی ئێمەشی لیَ بەدەر نەبووە، من ئەوكاتە لە سلێمانیی بووم، پێنج ساڵ لە سلێمانیی بووم، لە ساڵی حەفتاو شەش (١٩٧٦) تا هەشتا (١٩٨٠)،

لە ماوەی ئەو پێنج ساڵەدا، كە من لە تافی لاوێتیدا بووم، تازە پێدەگەیشتم، زۆریش دەگەڕام و چاوم ورد دەكردەوە، كەسێكم نەبینی لە سلێمانی، هامۆشۆی هەڵەبجەشم كردوە و هەولێریش و شوێنەكانی دیكەش، كەسێكم نەبینیوە بەناوی ئیخوان قسە لەگەڵ مندا بكات، یان بڵێ: شتێكی وا هەیە، وەك كەسایەتیی هەبوون، بەڵام وەك لێیان قەدەغە كرابوو كاری ڕێكخراوەیی بكەن، بەڵام ئایا دوایی هەروا بوون؟ نا.

بەڵام لە كۆتایی حەفتاكاندا، من خۆم لە سلێمانی بووم، بزووتنەوەی پەیوەندیی ئیسلامیی چەكەرەی دا، یەكێك لە هاندەرە سەرەكییەكانی بریتی بوو لە بەرگرییكردن لە مەزڵوومیەتی ئەو خەڵك و وڵاتە، دوای ئەوەی كە شۆڕشی ئەیلوول هەرەسی هێناو، ئاشبەتاڵ كرا، یەكێتی دروست بووبووەوە لە ساڵی حەفتاو شەشەوە، دیارە پارتیش ویستی خۆی كۆبكاتەوە، بە سەركردایەتیی كاتیی: (قیادەی موەققەتە)وە، بزووتنەوەی سۆشیالست و، پاسۆك، هەبوون، ئێمەش ئەو خەڵكەی كە تێگەیشتنێكمان هەبوو لە ئیسلام، من تازە دەگەیشتمێ، لەگەڵ خەڵكێكی دیكە لە ئێمە بەتەمەنتر بوون، لە سلێمانیی و لە هەڵەبجە و ڕانیەو دوایی لە هەولێریش پەیدا بوون و لە شوێنەكانی دیكەش، كەوتینە بیری ئەوەی كە پێویستە ڕێكخراوێكی ئیسلامیی هەبێت، پێویستە لە ژێر بەیداغێكی ئیسلامییدا ئەو خەباتی نەتەوایەتیی و نیشتمانییە بكرێ، من زۆرجار گوتوومە: دەبوایە یەكەمین فیشەك كە دەتەقێنرێ، ڕووبەڕووی هەر داگیركەرێكی كوردستان بە (بسم الله الرحمن الرحیم)ەوە تەقێنرابایەو، بەدەستی بەدەستنوێژەوە تەقێنرابایە، هیچ كەس شایستەتر و لەپێشتر نیە بۆ بەرگرییكردن لە خاك و خەڵكی خۆی، لە خەڵكی ئیسلامیی لە كەسانێك كە بەڕێی قورئاندا بەڕێی سوننەتی پێغەمبەردا (صلی الله علیه وسلم) هەنگاو دەنێن.

بۆیە بەو گشتاندنە كە ئیسلامییەكان بیریان لەوە نەكردووەتەوە، یاخود هەر بیریان لە ئۆممەت كردۆتەوە، ڕاست نیە، هەرچەندە مسوڵمان دەبێ بیر لە ئۆممەتیش بكاتەوە:

﴿ إِنَّ هَٰذِهِۦٓ أُمَّتُكُمۡ أُمَّةٗ وَٰحِدَةٗ ﴾ [الأنبياء : ٩٢]

بەڵام ئەوە دەبێتە خەیاڵ پڵاو، تۆ جارێ هیچت بۆ خۆت پێ نەكرێ بەتەمابی هەموو ئۆممەت بحەسێنیەوە! (فَمَن لم يكن لِنفسهِ، فكيفَ يكونُ لغيرِهِ) تۆ ئەگەر بۆ خۆت شتێكت لەدەست نەیەت، سوودێ بەخۆت نەگەیەنی، چۆن سوود بەخەڵكی دیكە دەگەیەنی؟ بۆ زانیاریی جەنابت: من لە ساڵی (١٩٨٤) كتێبی سۆزی نەتەوایەتیی) كە تا ئێستا سێ چوار جار چاپكراوەتەوە، ئەو كتێبەم نووسی، لەو كتێبەدا باسمكردوە، كە وەك چۆن پاكستان هەیە، ئەفغانستان هەیە، عەرەبستان هەیە، توركومانستان هەیە، كوردستانێكیش هەیەو، وەكو چۆن ئەو گەلانە بۆیان هەیە قەوارەی سیاسییان هەبێ، خاوەنی ئیدارە و ئیرادەی خۆیان بن، گەلی كوردیش هەمان مافی هەیە، بەبێ كەموكوڕیی، دوایی هەر ئەوە نەبوو كتێب بنووسین و بەشێوەی تیۆریی، خەباتی نیشتیمانیی بكەین بە نەفەسی ئیسلامیەوە، بەڵكو بەكردەوەش، ئەوەبوو كە (بزووتنەوەی پەیوەندیی ئیسلامیی) پێكهات، كە باڵی چەكدارییەكەی بەناوی (لەشكری قورئان) پێكهات و، وە مەفرەزە سەرەتاییەكانی لە ناوچەكانی خۆشناوەتیی و ناوچەكانی قەرەداغ و ناوچەكانی هەڵەبجە و هەورامان و پێنجوێن دا، هەبوون، دواتر ئەوەبوو بزووتنەوەیی ناوەكەی گۆڕا بۆ (بزووتنەوەی ئیسلامی) وە ناوچەكانی دیكەشی گرتەوە، هەڵبەتە من وەك ڕێكخستن هەر بووم پێشێ، بەڵام ئەوەبوو لەساڵی (١٩٨٧)دا ئێمەش جێمان پێ لێژبوو، من چەند مانگێك بە خۆ حەشاردان مامەوە، دوای ئەوەی لە گوندی (گەڵووی ماخۆبزنان) هەڵقەنام، پاشان چووینە دەرو بازنەی ئەو خەباتە چەكدارییەی كە (بزووتنەوەی پەیوەندیی ئیسلامیی) دەستی پێكردبوو بەناوی بزووتنەوەی ئیسلامییەوە فراوانتر بوو، وە ئەو كاتە ئەوەی كە چەكەكانمان ئاراستە دەكرد، ڕژێمی بەعس بوو.

**دانـــا: بەڵام نەیشارینەوە، دیسانەوە كۆی بزووتنەوەی ئیسلامی ئەوكات، بمانەوێ و نەمانەوێ كەمتەرخەمیی لە گوتاردا هەر هەبووە؟**

**مامۆستا:** منیش ناڵێم نەبووە، جارێ ئەصڵەن بۆچی دەبێ مامۆستایەك بە ڕیشی سپییەوە دەست بە خەبات بكات؟ ناڵێم: پێشتر هیچ نەكراوە، بەڵام ئەو خەباتە چەكدارییە بۆچی دەبێ هێندە درەنگ دەست پێبكات؟ با ڕاستییەكەت

پێ بڵێم ئەو حاڵەتە ئیسلامییە، ئەو بووژانەوە ئیسلامییە لە تەمەنی ئێمەو ماناندایە، لە تەمەنی ئێمەو مانانەوە دەستی پێكردووە، ئەگەر تەماشا بكەی خەڵكی دیكە پێش ئێمە چەند جیلێكی بەڕێ كردبوو! حیزبی شیوعی لە ساڵی (١٩٤٣)دا دامەزراوە، پارتی لە (١٩٤٦)دا دامەزراوە، كە دیارە یەكێتی نیشتمانییش هەر ئیمتیدادی پارتی بووە، هەر لەسەر كەلاوەی شۆڕشی ئەیلوول، یەكێتی نیشتمانی دروست بوودتەوە، وەك جێگرەوە و بۆشایی پڕكەرەوەی ئەو خەباتە كە هەرەسی هێنا و كۆتایی پێهاتوە، دوایی دووبارە ئەوانیش بە نەوعێكی دیكە تێهەڵچوونەوە، كەواتە: ئەو جیلەی پێش ئێمە، بە مامۆستایانەوە، بە خەڵك و جەماوەرەوە، كەمتەرخەم بوون، من ئەو كاتە ئەو پەندەم دانابوو، جار جار پەندی كوردی دادەنێم بۆ خۆم، دەمگوت: (كاری ئیسلامیی دەبێ ڕیشی تێدا سپی بكەی، نەك بەڕیشی سپی دەست پێ بكەی) حەقیقەت ئێمە هەندێك مامۆستایانی بەڕێز هەبوون، هەندێك خەڵك هەبوون، تەمەنێكیان هەبوو، لێیان نەدەزانی، لەیادمە ئێمە لە بناری قەندیل كاری ڕاگەیاندنمان زۆر گرنگیی پێ دەدا، دەرسمان هەبوو، وتارمان هەبوو، كاسێتەكانمان بڵاو دەكردەوە، ئێستاش خەڵكێكی زۆر لە هەولێر و لە زۆر لە شوێنەكان دەڵێن: ئێمە بە فلان وتارەی تۆ هۆشیار بووینەوە، بۆ وێنە: من سێ وتارم دابوون بەناوونیشانی (دیاردەی جاشەتیی)، وەك قسەیەكی خۆش دەیگێڕمەوە: دوای ڕاپەڕین من لەم هەولێرە لە ماڵێك دەعوەت بووم، هەندێك فەرماندەی هێزە چەكدارەكانی سەردەمی ڕژێم (ئەو وشەیە با بەكارنەهێنین) هەبوون، كە ناویشیان گۆڕدراو ناویان لێ نرا چەكدارە شۆڕشگێڕەكان، گوتیان با لاپەڕەی سپییان لەگەڵ هەڵدەینەوە، چونكە هەندێكیان دەوری باشیان بینیوە، مەجلیسێك بوو دەعوەت بووین، گوتیان: مامۆستا! وتارێكی تۆ هەبوو ئێمە گوێمان لێ دەگرت، بەڵام بە پەنهانیی چونكە چەكداری ڕژێم بووین، بەس گوێمان لەو وتارەی تۆ دەگرت زۆر پێی سەرسام بووین و قسەكەت زۆر ڕاست و حەق بوو هەرچەندە دژی ئێمەش بوو، منیش گوتم: كام وتارە؟! گوتیان: بەناوی (دیاردەی جاشایەتیی)، ئەوە ڕاستە، بەس سێ سەعات بوو، كام قسەیە؟ گوتیان: ئەو قسەیەت كەدەڵێی: كوڕینە! جاشیش بەتەمای چوونە بەهەشتێیە، چما بەهەشت تەویلەیە جاشانی تێبكەی؟!

ئێمەش دەمانگوت وەڵڵا ڕاستە ناوەكەمان هێندە خراپە بەكەڵكی هیچ كوێ لە بەهەشتێ نایە!

مەبەستم ئەوەیە كە ئێمە ئەوكاتە ئەوەمان دەكرد، نامیلكەمان چاپ دەكرد بەو شێوازە سەرەتاییە، بە (ڕۆنیۆ)، هەندێك لە مامۆستایان كە ئێمە لە بەرامبەر رژێمدا بووین، چەند جار شەڕمان تووش دەبوو، خەڵكمان لێ دەكوژراو لەوانمان دەكوشت، لە قەڵاتووكان و لە شوێنەكانی دی، مامۆستایانێك هەبوون ماڵیان لە شارەكان قووڵایی لە ئێران بوو، دەیانگوت: فڵانكەس هەر خەریكی وتاردان و كتێب نووسینە! گوتم: باشە ئەدی ئەو خەڵكە نابێ شتێكی لێ حاڵی بكەین، ئاخر ئێمە دەورمان زۆر قەرەباڵغ نیەو خەڵك نامانناسێ، خەڵك لێمان حاڵی نیە، با تۆزێك خۆمان و بەرنامەمان لە خەڵك حاڵی بكەین! ئنجا ئەگەر شەڕیش بێ ئەوەتا لەنێو مقەڕو لەنێو پێشمەرگەداین، ئێمە ماڵ و منداڵ لەنێو پێشمەرگە بووین! بەڵێ لە جیلی پێش ئێمەدا كەمتەرخەمیی كرابوو، ئەگەرنا ئەو كارە ئیسلامییە دەبووایە ڕیشی تێدا سپی بكرێ، ئنجا چاك لێی تێدەگەی.

**دانا: مامۆستا! ئێستاش بەجۆرێك لە جۆرەكان بەگشتی نا، بەڵام ئێستاش لەلای بەشێك لە هاووڵاتییان، زۆرێك لە خەڵك و ئیسلامییەكان نەیانتوانیوە یان نەیانكردوە كە كوردستانیی بوون و نیشتمان پەروەریی خۆیان بۆ خەڵك بسەلمێنن، وائەزانن ئێستاش ئیسلامییەكان ئەگەر بێنە سەر تەخت و كوردستان بە دەوڵەتی گەورەی عەرەبیی و حكوومەتی ئیسلامییەوە ئەبەستنەوە، ئەمەوێ بزانم هۆكاری ئەمەی ئێستا چییە لەم سەردەمەدا، بۆچی ئەم تێگەیشتنە هەیە لە ٢٠١٧دا؟!**

**مامۆستا:** بەهەرحاڵ كەمتەرخەمیی خۆمان لەوەدایە كە وەك پێویست كارمان لەسەر ئەوە نەكردووە، بەڵام ئەوە ناگونجێ بگشتێنرێ، من بە ناچاری دەبێ باسی بكەم، ئەگەرنا پێمخۆش نیە باسی شتی خۆم بكەم.

**١)** (سۆزی نەتەوایەتیی و بیری ناسیۆنالیزم لە ڕوانگەی ئیسلامەوە) لەساڵی (١٩٨٤) نووسیومە.

**٢)** (كوردستان بۆ وێران بوو و چۆن ئاوەدان دەبێتەوە؟) لە ساڵی (١٩٨٩) نووسیومە.

٣) كتێبی (چارەسەری كێشەی كورد له نێوان ئیمان و پەرلەماندا) له ساڵی (١٩٩٢)دا له گەرمەی هەڵبژاردنەكانی خولی یەكەمی پەرلەمان دا، نووسیومه.

٤) له ساڵی (١٩٩١) سیمینارێكم له پاكستان هەبوو به زمانی عەرەبیی و ئەوكات بڵاوكرایەوە، ئێستاش دەقەكەی ماوە، هەروەها لەهەر كوێ كەلێن بووبێت و بوار بووبێ، قسەی خۆمانمان لەوبارەوە كردوە، كەواته: نابێ ئەوە بگشتێنرێ، كه تەوژمی له بارەی كێشەی كوردەوە قسەو هەڵوێستیان نەبووە.

بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا دەڵێم: كۆی ئیسلامییەكان كەمتەرخەمییمان هەبووە لەو بارەوە، بەڵام قەزیەش هەر ئەوەندە نیەو هەندێ كەسیش ئەگەر تۆ بێنی قورئانی بۆ لەملی بكەی تازە بڕیاری خۆی داوەو ئەو قسانه هەر دەبن، ئەگەرنا، خۆش نیه پیاو هەندێ شت بڵێ، ئێمه لەگەڵ خەڵكی دیكەش بووین كه چووین بۆ توركیا و چووین بۆ ئێران و له شوێنی دیكەش سەرنجی هەڵوێسته سیاسییەكانی خەڵكی دیكەش دەدەین، وەك پێشتریش باسم كرد: لەم هەرێمی كوردستانەدا، هەندێك لایەنی سیاسی ئەگەر ئێران تۆپباران بكات، لێی وەدەنگ دێ و ڕەخنەی لێ دەگرێ، بەڵام ئەگەر توركیا تۆپباران بكات، خۆی دەكاته كەڕەی شەربەت، هێندێك لایەنی دیكەش، ئەگەر توركیا تۆپباران بكات، وەدەنگ دێ، بەڵام ئەگەر ئێران تۆپباران بكات، خۆی لێ بێدەنگ دەكات، بەڵام ئێمه له هەردووكیان وەدەنگ دێین، ئەوە ئاشكراش دیارە، ئێمه تەماشا ناكەین داخۆ ئێران دەڵێ چی؟ توركیا دەڵێ چی؟ سووریا دەڵێ چی؟ بەغدا دەڵێ چی؟ ئەمریكا دەڵێ چی؟ ئێمه تەماشا دەكەین خەڵك و میللەتەكەی خۆمان حەقەكەی لەكوێیە، كەچی ئێستاش لەگەڵدا بێ، خەڵك ئەو قسه دووبارە دەكاتەوە ئەرێ ئێوە لەگەڵ ئێرانن؟ ئێوە لەگەڵ توركیان؟ ئێوە لەگەڵ سعوودیەن؟بەڵام ئەو قسانه قسەی بۆشن، تۆ تەماشای هەڵوێسته كردەییەكەم بكه، داخۆ چەندێ له قازانجی گەلی كوردە و چەندی له قازانجی توركیایه و ئێرانه و سعوودیه و ئەمریكاو كوێ كوێیه؟پەندێكی كوردیی هەیه دەڵێ : {كەسێك به تۆبزیی بینێری بۆ مازووان، (مازووچنین) له دارێ هەڵ نارِوانێ} یانی: تەماشای درەختەكه ناكات و دەڵێ: هیچی پێوە نەبوو، هەندێ كەس هەر

یەكسەر بڕیاری داوە هیچ چاكەی تۆ نەبینێ، ئەگەرنا هەڵوێستەكانی ئێمە، ئەدەبیاتی ئێمە، زۆر ڕوونن ڕەنگە من یەكەم بەرپرسی سیاسی كورد بووبم كاتی خۆی نامیلكەیەكم نووسی: گوتم حیزب بەعس حیزبێكی كافرە، ئەوە هیچ زاڵمە، بەڵام بەگشتی حیزبێكی كافرو دژی ئیسلامە[1]، كەچی وەك گوتم: هەندێك كەس هەر لەسەر قسەكانی خۆی بەردەوامە.

ئنجا ئایا ئێمە ئەگەر دەسەڵاتمان هەبێ چی دەكەین و چۆن دەكەین؟ ئێمە ئەگەر دەسەڵاتمان ببێ ئەوە دەكەین كە خوا دەفەرموێ، خوا چی دەفەرموێ؟ خوای پەروەردگار دەفەرموێ:

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِنَّا خَلَقْنَٰكُم مِّن ذَكَرٍ وَأُنثَىٰ وَجَعَلْنَٰكُمْ شُعُوبًا وَقَبَآئِلَ لِتَعَارَفُوٓا۟ ۚ إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِندَ ٱللَّهِ أَتْقَىٰكُمْ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٌ ﴿١٣﴾ ﴾ [الحجرات : ١٣]

من ئەو ئایەتەم لە توركیا خوێندووەتەوەو شەرحم كردووە لە كۆڕێكی گشتییدا، لە ساڵی (٢٠١٢)دا، (چارەسەری كێشەی كورد چۆن دەكرێ؟)، هەروەها لە پاكستان كاتی خۆی لە ساڵی (١٩٩١)دا خوێندوومەتەوەو شەرح كردووە لە كۆڕێكدا بەناوونیشانی: (القضية الكوردية جذورها وكيفية معالجتها)، هەروەها لە بەیرووت كۆنفراسێك بوو، بابەتێكم نارد لەوێ خوێندرایەوە، بەڵێ ئێمە هەڵوێستی خۆمان نەشاردۆتەوەو ئەوەی گوتووشمانە كردوومانە و پراكتیزەمان كردووە، لەسەر ئەوەش باجمان داوە، ئێمە ئەگەر دەسەڵاتمان ببێ، دەڵێین خوا دەفەرموێ: ئەی خەڵكینە! ئێوەمان لە نێر و مێیەك دروستكردوە، دوایی گێڕاومانن و بۆ چەند گەل و تیرەیەك تاكو پێك ئاشنا بن. دەڵێین گەلی عەرەب! ئێوە گەلێكی مسوڵمانانن و بیست و دوو دەوڵەتتان هەیە، ئەرێ گەلی فارس ئێوەش دراوسێمانن و ئێوەش بەلای كەمەوە دەوڵەتێكتان هەیە، وە دەست دەخەنە نێو كاروباری دەوڵەتانی دیكەش، وەك بۆخۆتان دەڵێن چوار پایتەختی دیكەشتان لەژێر دەستدان! گەلی تورك تۆش دەوڵەتێكت هەیە بەلای كەمەوە

---

(١) بەگشتی یانی نەك تاك تاكی ئەو حیزبە، چونكە هەبووە بە لاسایی كردنەوەی كوێرانە شوێنی كەوتووە. هەبووە لە ترسان و بە ناچاریی و، هەبووە لە برسان و ....هتد.

و شتی دیكەشتان هەر هەیە! ئەرێ باشە ئەو دراوسێ كوردەتان، ئەوەی كە بۆ خۆتان بەڕەوای دەبینن و بۆ خۆتان پێتان چاكە، بۆ ئێمەشتان پێ چاك بێ، چونكە خوا سبحانە وتعالى ئەو مافەی داوە بەهەموو گەلەكان: (وَجَعَلْنَٰكُمْ شُعُوبًا وَقَبَآئِلَ) وەك لە كتێبی: (سۆزی نەتەوایەتیی)دا كە سی و سێ ساڵ لەمەوپێش نووسیومە، لەوێدا گوتوومە: بەپێی ئەم ئایەتە، عەرەب چەندە حەقی هەیە دەوڵەتی هەبێ، فارس، تورك، وە هەر گەلێكی دیكە، ئەفغان، پاكستان، كوێ، كوێ، كوردیش ئەوەندە حەقی هەیە، چونكە بەدەقی ئەم ئایەتە: (وَجَعَلْنَٰكُمْ شُعُوبًا وَقَبَآئِلَ) ئەو خوایەی كە عەرەبی كردوە بە نەتەوەیەك و فارس بە نەتەوەیەك و، تورك بە نەتەوەیەك و، ...هتد، كوردیشی كردوە بە نەتەوەیەك و، وەك چۆن ئەفغانستان هەیە و، توركستان و عەرەبستان و هندستان، هەن، كوردستانیش هەیە، ئەدی بۆچی لەو گەلە كوردەی دراوسێتان ناگەڕێن، ئەویش بۆ خۆی ئیرادەو ئیدارەی خۆی بەدەست خۆی بێ، بەو شێوەیە خۆی بەڕێوەبەرێ كە خۆی پێی چاكە، ئەگەر پێیان وابێ ئیسلامەتیی ڕێ لەوە دەگرێ، دەبووایە ئیسلامەتیی ڕێی لە ئێوە گرتبایە! ئنجا بۆچی دەڵێین: دادگەریی ڕەها لەكاتێكدا دەچەسپێ كە شەریعەتی خوا حاكم بێ، چونكە خوا سبحانە وتعالى پەروەردگاری هەموو لایەكەو، پێویستیشی بە كەس نیە ئینحیازی بەلادا بكات، ڕقیشی لە كەس نیە ستەمی لێ بكات، بەڵام سیستمە بەشەرییەكان، ئەگەر چینی پرۆلیتار دایدەنێ، بە زیانی چینی بۆرژووایە، چینی بۆرژووا دایبنێ، بە زیانی چینی پرۆلیتارە، عەرەب دایبنێ، بە زیانی میللەتەكانی دیكەیە، گەلێكی دیكە دایبنێ، بە زیانی ئەوانی دیكەیە، بەڵام شەریعەتی خوا، ئایینی خوا، بەرنامەی خوا، هی خوایە سبحانە وتعالى و خوا لایەنگریی نیە بەلای هیچكام لە نەتەوەكاندا، هەموویان خۆی دروستی كردوون و وەك یەكیش ڕێزی لێ ناون، وەك یەكیش مافی بوون و ژینی پێداون، بۆیە ئەگەر ئێمە دەسەڵاتمان هەبێ، ئاوا دەكەین، كە قورئان دەفەرموێ، بۆیە با لە پشت پەردەی ڕەشەوە تەماشای یەكدی نەكەین، ئنجا هەڵوێستەكانی ئێستامان، سیاسەتی داهاتوویشمان دیاریی دەكەن، بۆ كەسێ كە ئینصافی هەبێ، كەسێكیش كە هەر كەیفی لە ڕەخنەگرتن و یاخود گومانی خراپ پێ

بردن و له پشت پەردەی ڕەشەوە تەماشاكردن، بێ، ئەوە بە ئێمە چارەسەر ناكرێ.

**دانا: ماموٚستا! با ئەم پرسیارە تایبەت بە كۆمەڵی ئیسلامیی لە جەنابت بكەم: كۆمەڵی ئیسلامیی درێذكراوەی هیچ قوتابخانەو فیكر و ڕەوتێكی دەرەوەی هەرێمی كوردستانە؟ یان نەخێر، كوردی پەتیی خۆمانە و زادەی ئەم بارودۆخ و هەلومەرجە سیاسیی و كۆمەڵایەتییەی هەرێمی كوردستانە؟**

**ماموٚستا:** دیارە كۆمەڵی ئیسلامیی درێذكراوەی بزووتنەوەی ئیسلامییە، هەروەها بزووتنەوەی یەكبوونی ئیسلامیی، چونكە بزووتنەوەی یەكبوونی ئیسلامییش لەهەر دووك بزووتنەوەی ئیسلامیی و بزووتنەوەی ڕاپەڕینی ئیسلامی پێكهات، لە ساڵی (١٩٩٩)دا و، پێشتر ئەویش درێذكراوەی بزووتنەوەی پەیوەندیی ئیسلامیی بوو، كە وەك باسمكرد، ئەو بزووتنەوەی پەیوەندیی ئیسلامییە داهێنەرەكەی خەڵكێك بووین، من لە هەموویان تەمەنم كەمتر بوو، با هەندێكیان ناو بێنم: ١) ماموٚستا عەبدوڕەحمانی نەوڕەسیی، كە ئێستا لە ژیاندایە، ٢) كاك كامیلی حاجی عەلی، ٣) كاك حەسەن حەمەخالید، ٤) كاك كەمال دۆڵپەمۆیی، ئەوانە لەو كەسانە بوون كە من لە سەرەتاوە پێكەوە دادەنیشتین وئێستاكەش لە ژیاندان، ٥) شێخ عەبدوڕەحمانی سەرگەڵوو هەزار ڕەحمەتی خوای لێ بێ، كە لەسەر دەستی من هاتە نێو بزووتنەوەی پەیوەندیی ئیسلامیی لە سلێمانی، لە ماڵی خۆیان لەگەڵی دانیشتم، ٦) ماموٚستا شێخ عەبدوللەتیفی واژەیی، دووەمین ڕابەری گشتی بزووتنەوەی پەیوەندیی ئیسلامیی لە دوای ماموٚستا شێخ موحەممەدی بەرزنجیی، ٧) ماموٚستا شێخ موحەممەدی بەرزنجیی، ٨) ماموٚستا مەلا موحەممەدی مەلا بەها، بابی ماموٚستا صەڵاح، كە لە هەڵەبجە لە ماڵی ئەوان، ئەوبوو، كاك كامیلی حاجی عەلی و، كاك حەسەنی حەمەخالید و، ماموٚستا عەبدوڕەحمانی نۆڕسیی، لە ساڵی (١٩٨٣)دا كە پێش ئەوەی بزووتنەوەی پەیوەندیی ئیسلامیی باڵی چەكداریی بۆ دروست ببێت (لەشكری قورئان)، كۆبوونەوەمان كردووە.

كەواتە: ئێمە وەك كۆمەڵی ئیسلامیی هەڵقوڵاوی واقیعی ئەم وڵات و خەڵكەی خۆمانین، ئنجا وە من ئەوەش بەڕاست دەزانم كە لە هەر شوێنێك

بویستریٚ دین بكرێته كاڵای باڵای ژین، بویستریٚ كارو پرۆژەیەكی ئیسلامیی ڕاستەقینە هەبیٚ، دەبیٚ ئەو كارو پرۆژەی ئیسلامیی یە، لە خزمەت خاك و وڵات و خەڵكی خۆیدا بیٚ و بەرلەوەی بیر لە خەڵكی دیكە بكاتەوە، بیر لە شوێنی خۆی بكاتەوە، ئێمەش وەك پێغەمبەری خاتەم (علیه الصلاة والسلام) دەكەین، ڕووحمان بە قوربانی بیٚ، پێغەمبەری خاتەم چی كرد؟ لە حاڵێكدا كە خوا بۆ هەمموو جیهانییانی ناردوە:

﴿ وَمَآ أَرۡسَلۡنَٰكَ إِلَّا رَحۡمَةٗ لِّلۡعَٰلَمِينَ ١٠٧ ﴾ [الأنبياء : ١٠٧]

بەڵام ئایا پێغەمبەری خاتەم (علیه الصلاة والسلام) پێشیٚ خەمی لە گەلی عەرەب نەخوارد؟ ﴿ وَإِنَّهُۥ لَذِكۡرٞ لَّكَ وَلِقَوۡمِكَۖ ﴾ [الزخرف: ٤٤]، بەڵكو پێش قەومەكەی خەمی لە خزم و عەشیرەتەكەی خوارد، ﴿ وَأَنذِرۡ عَشِيرَتَكَ ٱلۡأَقۡرَبِينَ ٢١٤ ﴾ [الشعراء: ٢١٤].

چونكە واقیعییانە مامەڵەی كرد ئەگەر ئەو كاتە فەرموبای : ئەو دەوڵەتە نابیٚ پەیوەندیی بە عەرەبەوە هەبیٚ و، ئەوس و خەزرەج و قورەیش و بەنی هاشم و بەنی ئومەیە، نا، یەكسەر دەبیٚ بڵێین: دەوڵەتی هەمموو دنیا!! شتێكی ناواقیعیی دەبوو، پێغەمبەر (صلى الله علیه وسلم) ئەو دەوڵەتەی دروستی كرد لە نیوەدوورگەی عەرەبی دابوو، دوایی لەسەردەمی خەلیفە ڕاشیدەكاندا جێنشینە سەرڕاستەكانی - خوا لێیان ڕازی بیٚ - پەلی هاویشت بۆ شوێنەكانی دیكە، كەواتە: ئێمەش هەروەك پێغەمبەری خاتەم (علیه الصلاة والسلام)، شتێكمان لەدەست بیٚ، سەرەتا بۆ دەوروبەری خۆمانە (الأقربون أولى بالمعروف)، دوایی ئەگەر خوا توانای زیاتری پێداین، دنیا پڕە لە مسوڵمان و دەبیٚ لەگەڵ ئەوانیشدا ڕاوێژو گفت و گۆبكەین، بەڵام لەسەر حیسابی گەلەكەی خۆمان نا، لەسەر حیسابی نەتەوەكەی خۆمان نا.

جارێك بەرپرسێكی حیزبی شیوعیی، با ناویشی بێنم، چونكە لە یادداشتەكانیشمدا ناوم هێناوە: مامۆستا بەهائەددین نووریی، ئێستاش ماوە،

خوا عاقیبەتی خێر بكات، لە بارەگای دوكتۆر فوئاد مەعصووم، كە ئێستا سەرۆك كۆماری عێراقە، لە بەرگەڵوو ئێمە میوانی دكتۆر فوئاد مەعصووم بووین، مامۆستا بەهائەد نووریش هات دین نووری هات بۆ ئەوێ، كە زانی ئێمە بزووتنەوەی ئیسلامیین شاندەكەمان مامۆستا مەحموودی ئازادیی بوو، مامۆستا ئەبوبەكری صدیقی بوو، مامۆستا مەلا عەبدوڵڵای جیهاد بوو، من بووم ئێمە دانیشتبووین لە مەجلیسەكەدا، دیارە خەڵكێكی دیكەشمان لەگەڵدا بوو، لە برایانی پێشمەرگە، خۆشمان هەر پێشمەرگە بووین، مامۆستا گوتی: یەك ئامۆژگارییتان دەكەم! خزمەتی بێگانە مەكەن، ئاگاتان لێ بێ دەستی بێگانە مەكێشن بۆ وڵاتی خۆتان! نازانم مەبەستی پێی ئێران بوو پێی كوێ بوو؟ منیش لێی گەڕام تا قسەكانی تەواو كردن لە یادداشتەكانم دا بە تەفصیلْ باسمكردوە، زەردەخەنەیەكم كرد و گوتم: مامۆستای بەڕێز! زۆر سوپاسی ئامۆژگارییەكەت دەكەم ئێمە هەر نەبێ پەند لە حیزبی شیوعیی وەردەگرین، گوتی چۆن؟ گوتم وەڵڵا بیستوومانە حیزبی شیوعیی كە لە مۆسكۆ بەفر دەباری، لێرە چەتریان هەڵدەدا! هەروەها هەر نەبێ پەند لە حیزبی توودە وەردەگرین، گوتی: حیزبی توودە چییان كردوە؟ گوتم حزبی توودە دكتۆر موحەممەد موصەددەق لە شا ڕاپەڕی، ویستی نەوتی ئێران خۆماڵی (تأمیم) بكا، یەكێتی سۆڤیەت زەختی لە موحەممەد موصەددەق كرد، چونكە بە زەرەری بوو و پشتگیریی شای كرد، حیزبی توودەش پشتیگریی هەڵوێستەكەی یەكێتی سۆڤێتیان كرد، بە زەرەری گەلەكەی خۆیان، بۆیە خەڵك لە حیزبی توودە تەكینەوە، گوتم: هەر نەبێ ئێمە دەرس لە ئێوە وەردەگرین، خەمت نەبێ ئێمە بەپێی دینەكەی خۆمان خزمەتی خەڵك و وڵاتی خۆمان دەكەین، ئەوە بە ئەركی سەرشانی خۆمان دەزانین، ئنجا دوای خەڵك و وڵاتەكەی خۆمان، ئەگەر بۆمان كرا ئاوڕێك لە خەڵكی دیكەش دەدەینەوە!! جا من پێموایە هەر كار و پرۆژەیەكی ئیسلامیی، دەبێ هەڵقوڵاوی ئەو واقیعە بێ و دەبێ بۆ ئەو خەڵك و كۆمەڵگایە بێ، كە لە نێوی دایە، پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) وایانكردوەو ئێمەش بەرێی واندا دەڕۆین.

دانـــا: مامۆستا! كاتم زۆر كەم ماوە و، ژمارەیەك پرسیاریش ماون، لەگەڵ ئەوەی پارتە سیكۆلارەكان لە نەوەدو یەك بەملاوە سەركەوتوو نەبوون، لە حوكمڕانیی و وڵات بەڕێوەبردندا، بەڵام لایەنە ئیسلامییەكان، نەبوونەتە جێی ئومێدی خەڵكی و هاووڵاتییان بەگشتی، یانی ئەگەر من نموونەیەك بهێنمەوە، ئێمە لە كەناڵی ئاسمانیی پەیام لە بەرنامەی بەخشین، ئافرەت و خوشكی بەڕێز دێت پارە ئەدا پارەیەكی زۆریش پۆشتەش نیە، خەڵكیش دێ لەوە ئەچێ ئەصڵەن نوێژیش نەكات، ئیسلامیش نیە، پیاوێك دێت پارە ئەدا بە بەخشین، بەڵام هەمان ئەو دادەیە و ئەو كاكەیە لێی بپرسین: لەوانەیە نیە ئامادە نەبێ دەنگ بدا بە ئێمە، بۆچی؟ لە ڕووی سیاسییەوە متمانەی بە ئێمە نیە كە باش وڵاتی بۆ بەڕێوەبەرین، هۆكاری ئەمە چییە؟

**مامۆستا:** هۆكاری ئەمە (وەك گوتم: هەرگیز خۆمانی لێ نابەمە دەرێ) ئێمە وەك ئیسلامییەكان، كەموكوڕیی و كرچ‌ءكاڵییمان هەیە، بەڵام ئایا خەڵكیش بەشێك لە خەتای ناكەوێتە ئەستۆ، كە لە جیاتی ئەوەی بە دوای قەناعەتی خۆی بكەوێ، بەدوای گیرفانی خۆی دەكەوێ؟! زۆر لە خەڵكیش هەیە دەڵێ، دەزانم ئێوە لەسەر حەقن، پێمخۆشە دەنگتان پێ بدەم، بەڵام فەصلْم دەكەن، معاشەكەم دەبڕن، نانەكەم دەبڕن! باشە تۆ ئەو حیزبەی كە نان و قووتی تۆی خستووەتە دەستی خۆی، ئەو زوڵمەی لە تۆ كردوە، ئاخر نان نانی خوایە، عەبد عەبدی خوایە، ڕزق ڕزقی خوایە، بۆچی لەدەستی حیزبێكدا بێ، ئەو واقیعە دەبێ تۆ بیگۆڕی، بۆچی نانەكە لەدەستی ئەو نەیەتەدەر، بێتە دەستی كەسێكی دیكەوە، كە هی هەموان بێت، با لەدەستی حكوومەتدا بێت، لەدەستی دەمەزراوە ڕەوایەتیی پێدراوەكان دا بێ، كەواتە: خەڵكیش نیشانەی پرسیاری لەسەرە، خەڵكێكی زۆر هەیە هەر ڕەخنە دەگرێ و گلەیی دەكات: چۆن وادەبێ! وڵات وا بەڕێوە ناچێ ! ڕاستە وا بەڕێوەناچێ، كارێكی زۆر سەقەتە، ئەم وڵاتە دابەش بكرێ بۆ دوو دەڤەری جیا و، دوو ڕەنگی جیای لێ بدرێ و بەپێی ئینتیمای حیزبیی و سیاسیی مامەڵە لەگەڵ خەڵكدا بكرێ، نەك بەپێی ئینتیمایان بۆ نیشتمان، وەك هەموو جارێ دەڵێم: دەبێ مرۆڤ بوون و هاووڵاتییبوون پێوەر بێ، بۆ مامەڵە لەگەڵ خەڵكدا، ئەگەر بڕیار بەدەستان

ڕاست دەكەن لەگەڵ شیعارەكانییاندا، كە هەمووی باسی مافی مرۆڤ دەكات، بێگومان ئەو مرۆڤە كە ئینتیمای نیە بۆ حیزبەكەی تۆ، ئەویش مرۆڤە، هەموویان باسی هاووڵاتییبوون دەكەن، ئەو هاووڵاتییە كە ئینتیمای نیە بۆ حیزبەكەی تۆ، ئەویش هاووڵاتییە، بۆچی وەك مرۆڤ، وەك بەشەر مامەڵەی لەگەڵدا ناكەی؟ باشە خەڵك ئەگەر ڕاست دەكەن نارازیین و ڕەخنە دەگرن، بۆچی هەڵوێستیان نیە؟! ئەوە ئێمەش كرچ و كاڵ بووین، بەڵام با هەڵوێستیان هەبێ لە بەرامبەر زوڵم دا، لە بەرامبەر ئەو ئیدارە خراپەدا.

ئنجا بۆ پرسیاری خەڵك بۆچی متمانەی پێمان نیە؟ نا، متمانەی هەیە، بەڵام دەزانێ پارەت نیە، ئەویش بەداخەوە ئەوەندە مەبدەئیی نیە لەگەڵ مەبدەئەكانی خۆیدا بێ، ئەویش لەگەڵ گیرفانەكەی خۆیدایە، ئەگەر هەرچی خەتایە لە ملی خۆمانی بكەین، زوڵم لە خۆمان دەكەین، دەڵێم: نە با زوڵم بۆ خۆمان بكەین، نە زوڵم لە خۆمان بكەین، زوڵم بۆ خۆمان دەكەین، ئەگەر بڵێین: هیچ كەمتەرخەمییمان نیە، ئەگەر بڵێین ئێمە پاش نەكەوتووین لە خەباتی نەتەوایەتیی، ئەگەر بڵێین: ئەو جیلەی پێش ئێمە، ئەو مامۆستایانە زۆر شارەزا بوون، ئەگەر زۆر شارەزا بوون، بۆچی بەدوای حیزبێكی عەلمانیی دەكەوتن، بۆچی بۆخۆیان پێش خەڵك و جەماوەر نەدەكەوتن؟ بۆچی وەك شێخ عوبەیدیللا و شێخ سەعیدی پیران و شێخ عەبدوسەلام و قازی موحەممەد و شێخ مەحموود و ئەوانەیان نەدەكرد، بۆچی دەبوونە بەشێك لە حیزبێك كە بەڕێی غەیری خوادا دەڕوا؟ كەواتە: زوڵم بۆ خۆمان نەكەین.

بەڵام با زوڵمیش لە خۆمان نەكەین، ئەو بەشەش كە خەتای خەڵكیە، هەر بیخەینە سەر ملی خۆمان.

**دانــا:** **زۆر باشە، ئەم لایەنە ئیسلامییانە کە ئێستا ئاوا کۆبوونەتەوە، ئاخر کۆبوونەوە لە بارەگای ئەنجوومەنی سیاسی کۆمەڵی ئیسلامیی دا بوو و، هەر سێ بەڕێزتان و ئەندامانی ئەنجوومەنی سیاسی و سەرکردایەتی ئەو سێ لایەنەش حزووریان هەبوو، بێگومان تەوەری بەرنامەکە لەسەر ئەوە بوو، بەڵام ئەو بابەتەش پێویست بوو، ئێستا ئێوە نابێ گوتارتان بگۆڕن، بۆ داهاتوو، بۆ ئەوەی ئەو خەڵکەی کە ئەوەتا بڕیاری داوە قەناعەتتان پێ نەکات، ئەوەی کە بە گومانە لە ئیسلامییەکان، متمانەو بەرچاوڕوونیی بۆ پەیدابێ؟!**

**مامۆستا:** پرسیار نابێ بە گشتی بکرێ، باسی خۆمانم بۆ کردی، کۆمەڵی ئیسلامیی، پێویست بەوە ناکا، خیتابی خۆی بۆچی بگۆڕێ؟ هەروابووین، قسەی ئێمە هەمووی بریتی بووە لە بەرگریی کردن لە مافی خەڵك، ئنجا ئێمە لە خەباتی نیشتمانییدا بەشداربووین، بە کردەوە بەشداربووین، خەباتی شاخمان هەیە، ئەگەر کەسانێك ئەوکاتە پێیان وابوو، غەڵەتە، ئێمە شانازیی پێوە دەکەین، شانازیی پێوە دەکەین، کە بەرگرییمان کردوە لە نیشتیمانی خۆمان و، وڵاتی خۆمان، دژی ڕژێمی بەعس، ئەوە کارێکی زۆر جوامێرانە و سەربەرزانە بووە کە ئێمە کردوومانە.

دوایی لە ڕاپەڕیندا، پاشان لە هەڵبژاردنەکاندا، ئنجا کاتێك کە لە بەغدا بووین، لە تورکیا، لە ئێران، لە هەر شوێنێك بووبین، ئێمە باسی مەزڵوومیەتی میللەتی خۆمان و حەق و مافەکانیمان کردوە، نەك هەر خەڵکی هەرێمی کوردستان، ئێمە لە تورکیا باسی مافی خەڵکی باکووری کوردستانمان کردوە، جارێك لەگەڵ هەندێ لە بەرپرسان وەك ئەحمەد داوود ئۆغلۆ کۆبووینەوە لە ئەستەمبووڵ، گوتم: بە یەك وشە چارەسەری کێشەی کورد لە تورکیا دەبێ، گوتیان: چۆن؟ گوێ قولاّغ بوون ئێمەش شاندی باڵای ئەنجوومەنی پارتە سیاسییەکان بووین، نوێنەرانی پێنج شەش لایەن، گوتم: کوردێك و تورکێك، جیاوازییان نەبێ، لە بەرگدا، لە زماندا، لە پۆستی سیاسییدا .. هتد.

کەواتە: ئەوە کە وتار بگۆڕدرێ، ئێمە گوتارەکەمان چۆنمان هێناوە، ئاوا لەسەری بەردەوام دەبین، چونکە وتارەکەمان بەردەوام هەڵقولاّوی شەریعەت بووەو لەبەرژەوەندیی خەڵك دا بووە.

**دانــا: باشە شێوازى گەياندنى بە هاووڵاتييان بگۆڕن، كە خەڵك تێ بگەيەنرێ؟**

**مامۆستا:** ئەوە ڕاستە پێموايە ئێمەى ئيسلاميى، هەركامێك لە ئێمە لە زاتى خۆيدا، گرنگە لە ڕووى فيكرييەوە، لە ڕووى ڕووحييەوە، لە ڕووى ڕەوشت و ڕەفتارەوە، پاشان لە ڕووى هەڵوێستى سياسييەوە، دەبێ ڕيشەيى كار لەسەر خۆمان بكەين، چونكە بۆ وێنە:

١- لە ڕووى فيكرييەوە: لايەنێك كە دەڵێ: ئيسلامييم دەبێ بەڕاستيى ئيسلاميى بێ، هەموو شتێكى بەپێى شەرع بێ، نەك يەك باسى توندڕەويى بكا، يەك باسى نەرمڕەويى بكات، با هەمووومان باسى شەرعڕەويى بكەين، شەرع لە هەندێ شوێن دەڵێ: توندبە، سبەينێ داعش بێ ئەگەر ئەو هێزى پێشمەرگە كە هەيە نەتوانێ بەرگرى بكات يان هێزێكى ديكە دواى داعش بێ، تۆ لەوكاتەدا دەبێ نەرمڕەو بى؟! نا، شەرعڕەوبە بە شەرعى خوا، جارى وا هەيە دەڵێ: نەرم بە، جارى وا هەيە دەڵێ: توندبە، جارى وا هەيە دەڵێ: خۆش بڕۆ، جارى وا هەيە دەڵێ: لەسەرە خۆ بە، جارى واش هەيە دەڵێ: ڕاوەستە، ئێمە دەبێ پابەند بين بە شەريعەتەوە، نەك هەركەسە و جۆرە شيعارێكى بۆ خۆى بەرزكردبێتەوە و تاكو قيامەتێ پێيەوە پابەند بێ، دەبێ ئێمە هەموو شتێ بگێڕينەوە بۆ وەحى، بۆ قورئان و سوننەت، چونكە فيكرى بەشەر گۆڕانى بەسەردا دێ، ئيجتيهادەكان گۆڕانيان بەسەردا دێ.

٢- لە ڕووى ڕووحييەوە دەبێ دڵسۆزييمان هەبێ بۆ خوا و بۆ ئيسلام، بۆ خزمەتى خەڵك و وڵات و، كارەكەشمان ڕێك پەيوەست بێ بەم واقيعەى ئێرەوە.

٣- لە ڕووى هەڵسو كەوت و ڕەوشت و ئاكارى كۆمەڵايەتيمانەوە، دەبێ بەو شێوەيە بێ، كە لە مسوڵمانان و لە ئەهلى ئيسلام دەوەشێتەوە.

٤- لە هەڵوێستى سياسييشماندا، من داوام كرد، كە دەبێ بكەينە قيبلەنووما، دەبێ تەماشا بكەين: چى لە خزمەتى خەڵك و جەماوەردايە، بەتايبەت لە خزمەت چينى چەوساوەدا؟ چونكە هەموو پێغەمبەران (عليهم الصلاة والسلام)، خۆبەزلگرەكان و خۆشگوزەرانەكان و خۆسەپێنەكان دژيان بوون و،

چه‌وساوه‌كان له‌گه‌ڵیان بوون، ئا ئه‌وه‌ قیبله‌نوومایه‌كی زۆر گرنگه‌، ده‌بێ هه‌ڵوێسته‌ سیاسییه‌كه‌ت له‌ خزمه‌تی خه‌ڵك و جه‌ماوه‌ر به‌ گشتی و به‌تایبه‌ت چینی چه‌وساوه‌ و به‌شخووراودابێ، كه‌ داوای مافه‌ڕه‌واكانی خۆی ده‌كات، كه‌ وه‌ك هاووڵاتیی پله‌ دوو و سێ ته‌ماشای ده‌كرێ، ده‌بێ له‌گه‌ڵ ئه‌وانه‌دا بی، ئه‌گه‌ر وا بووی، ئه‌وكاته‌ تۆ له‌سه‌ر ڕێی پێغه‌مبه‌رانی (علیهم الصلاة والسلام)، ئه‌وكاته‌ ئه‌و كار و پرۆژه‌ ئیسلامییه‌ جه‌وهه‌رو نێوه‌ڕۆكێكی ده‌بێ كه‌ شایسته‌ی ئه‌وه‌بێ خه‌ڵك متمانه‌ی پێ بكا و لێی كۆبێته‌وه‌و بتوانێ ئه‌و ئامانجانه‌ بۆ خه‌ڵك بێنێته‌ دی، كه‌ خوای په‌روه‌ردگار پێغه‌مبه‌رانی (علیهم الصلاة والسلام) بۆ ناردوون، كه‌ له‌ چه‌سپاندنی دادگه‌رییدا كورت هه‌ڵدێن، چونكه‌ خوا ده‌فه‌رمویٚ: هه‌موو پێغه‌مبه‌رانمان بۆیه‌ ناردوه‌:

﴿لِيَقُومَ ٱلنَّاسُ بِٱلْقِسْطِ﴾ [الحديد: ٢٥]، تاكو خه‌ڵك به‌ دادگه‌ریی به‌ڕێوه‌بچێ.

**دانـا: مامۆستای به‌ڕێز! له‌ كۆتایی به‌رنامه‌كه‌مدام، به‌ڵام پرسیارێكی گرنگ هه‌یه‌: هه‌م ئه‌م به‌رنامه‌یه‌ هه‌م شاشه‌ی كه‌ناڵی ئاسمانی په‌یام هه‌م بینه‌رانی په‌یام من وا هه‌ست ده‌كه‌م ناتوانێ شتێكی نوێ كه‌ نه‌وترابێت خه‌ڵك وا تێگه‌یشتوه‌ هه‌فته‌ی ئاینده‌ نا ئاینده‌تر، ئه‌م سێ حیزبه‌ ئه‌بنه‌ یه‌ك و یه‌ك عه‌له‌م و یه‌ك باره‌گا و یه‌ك قیاده‌مان ئه‌بێت و، هه‌موو شتێك ته‌واو كۆتایی هاتوه‌! به‌ كورتیی چی گوزه‌را و ئێوه‌ ئه‌تانه‌وێ چی بكه‌ن؟ گه‌شتوون به‌ چی؟!**

**مامۆستا:** كۆمه‌ڵی ئیسلامیی هه‌میشه‌ ده‌ستپێشخه‌ره‌ بۆ یه‌كگرتن، به‌ڵام یه‌كگرتن پێویستیی به‌ زه‌مینه‌سازی ده‌كات، پێویستیی به‌ زه‌مینه‌سازیی فیكریی و ڕووحیی ده‌كات، ته‌قوایی و ڕووحیی و عیبادیی و، پێویستیی به‌ زه‌مینه‌سازیی ڕه‌وشتیی و ئاكاریی ده‌كات و، پێویستیی به‌ یه‌كخستنی هه‌ڵوێستی سیاسیی ده‌كات، به‌وه‌ كه‌ هه‌ڵوێستی پێغه‌مبه‌ران (علیهم الصلاة والسلام) بكه‌ینه‌ سه‌نگی مه‌حه‌ك، چۆن بوون؟ له‌گه‌ڵ كێ بوون، چۆن مامه‌ڵه‌یان كردوه‌ له‌گه‌ڵ كۆمه‌ڵگادا، له‌گه‌ڵ خۆبه‌زلگراندا؟ چۆن بوون له‌گه‌ڵ چه‌وساواندا؟ ئه‌وه‌ زۆر زۆر گرنگه‌، من ته‌ماشای هه‌موو قورئان ده‌كه‌م خوای په‌روه‌ردگار هه‌ڕه‌شه‌ له‌

ستەمكاران و خۆبەزلگران و خۆشگوزەرانان، دەكات، هەميشەش خواى دادگەر بەرگريى دەكات لە چەوساوان:

﴿ وَنُرِيدُ أَن نَّمُنَّ عَلَى ٱلَّذِينَ ٱسْتُضْعِفُواْ ﴾ [القصص: ٥]، پێموايە ئەوەى وا دەكات كە ئێمە لێك نزيك بين، دەبێ ئەو زەمينەسازييە بكرێ.

ئەوەى تاكو ئێستا كراوە، ئەوەيە كە ئێمە قسەمان لەوبارەوە كردوە، بەڵام بڕيارە كۆبوونەوەى ديكەش بكرێ، بەس من لە كۆبوونەوەكەشدا زۆر جەختم لەسەر ئەوە كردەوە كە ئەگەر بمانەوێ ئەوە بكەين، دەبێ زەمينەى بۆ خۆش بكەين، ئەگەرنا ناگونجێ بەهۆى هەڵوێستێكى سياسييەوە، هەركەسە بچێتەوە لايەك! يان با هەركەسە لە شوێنى خۆى بێ، بەڵام دڵمان بەرامبەر يەك هێندە گەورە بێ، ئەخلاقمان بەرامبەر يەكدى هێندە گەورە بێ، تەحەممولى جياوازييەكانى يەكدى بكەين، هەندێ كەس وا تەصەوور دەكات كە تۆ ئەگەر نەبووى بە يەك حيزب، (وەك كۆمەڵى ئيسلاميى ئێمە هەميشە گوتوومانە: با ببين بە يەك، بەڵام خۆ چەپڵە بە دەستێك لێنادرێ) ئەوەمان بۆ نەگونجا ماناى وايە برايەتيى ناكەين؟ جارێك باسم كرد، گوتم: ئەگەر وابێ دەبێ ئەبو حەنيفە و ماليك و شافيعى و ئەحمەد و جەعفەرى صاددق و داوودى زاهيرى و زەيد و ئەوانەش هەموو پێكەوە ناكۆك بووبن، نا، جۆرى تێگەيشتنيان جياوازە، بەس ئەوەى گرنگە دڵەكانمان صاف و ساغ بن، گرنگ ئەوەيە پێكەوە هاوكار و تەبا بين، وەك زۆر لە حيزبە كوردييەكان يەك نين، بەڵام پێكەوە هاوكار دەبن لەسەر شتى چارەنووسساز.

**دانـــا: مامۆستا! دواى كۆبوونەوەكەى سلێمانيى، كۆتا ڕۆژەكانى ساڵى ٢٠١٦ ئەوە ڕاگەيەنرا كە لە هەفتەى ئايندەدا شتى زۆر نوێ ئەبيستن!**

**مامۆستا:** ئەو كەسەى واى گوتوە، دەبێ بڵێين: لە كوێت هێنا؟ ئێمە خۆمان لەو كۆبوونەوانەدا بووين و شتى زۆر نوێم پێ شك نايەت!

**دانـــا: كەسێكی بەشدار لە كۆبوونەوەكە وای گوتوە.**

**مامۆستا:** ئەوە قسەی خۆیەتی، ئەوەی ئاگادارم و دەزانین چۆنە، ئەوە پێویستی بە زەمینەسازیی دەكات، بۆ وێنە: باسی هەڵبژاردن دەكرێ، تۆ جارێ نازانی داخۆ هەڵبژاردن دەكرێ، یان ناكرێ، ئێمە هەر عادەتمان وابووە، چەند جارێك داوای یەك لیستیمان كردووە، جارێك داوامان كرد لە یەكگرتووی ئیسلامیی با بە لیستێك دابەزین، گوتیان: با ڕاپرسیی بكەین بە ئەندامان، ئەوان ڕاپرسییان كرد، ئێمەش ڕاپرسییمان كرد، ئەو كاتە نەمانگوتوە، بەس ئێستا دەیڵێم: ئێمە ڕاپرسیمان كرد، زۆربەی ئەندامانی ئێمە ڕایان هەبوو بۆ یەك لیستیی، بەڵام هی ئەوان رایان نەبوو و نەگونجا! ئنجا مامۆستا صەلاحەددین زۆر چاك دەزانێ، مامۆستا موحەممەد فەرەجیش دەزانێ، من چوم داوام لێكردوون، ڕەجام لێكردوون، وەرن با زەمینەسازیی بكەین بۆ یەكگرتن، بەس كە نەكراوە، ئایا مانای وایە برایەتییمان نابێ؟ نا، برایەتیی دەبێ هەر هەبێ لە هەموو حاڵاندا، وەك گوتم: ئەو ئیمامانەش ڕەحمەتی خوایان لێ بێت، هەركەسە بۆچوونێكی جیاوازی هەبووە، بەڵام باشترین پەیوەندییان پێكەوە هەبووە.

**دانـــا: مامۆستا! دواجار ئێوە بڕیار ئەدەن، ئەو سێ كەسی ئەو سێ لایەنە؟ یان ئەگەر گەیشتە ئەوەی وەك ئێستا فەرمووت، ڕاپرسیی بە ئەندامان دەكەن؟**

**مامۆستا:** نا، پێویستە ئەندامانیش ئاگاداربن و ڕایان هەبێ، ئێمە وەك كۆمەڵی ئیسلامیی واین، یەكگرتووی ئیسلامیش هەروایە، نازانم لە بزووتنەوەدا چۆنە، بەڵام ئێمە وەك كۆمەڵی ئیسلامیی، یەكگرتووی ئیسلامیی، ئەوەی من ئاگادارم، بۆ هەر شتێكی گرنگ دەگەڕێینەوە بۆ ئەندامانی خۆمان، بۆ وێنە: ئەگەر یەك بگرین، بەلای كەمەوە دەبێ كۆنفرانس ببەستین، ئەگەر كۆنگرەش نەبەستین، ئێمە وەك كۆمەڵی ئیسلامیی و لە نێو یەكگرتووش هەر وایە.

پاشان ئەگەر باسی هەڵبژاردن بكرێ، جارێ دەبێ بزانین داخوا هەڵبژاردنەكە چۆن دەبێ، دواییش دەبێ ڕاپرسی بكەین، داخۆ ئەندامانمان چی دەڵێن، دەبینی وا بەرژەوەندییە هەر كەسە بە لیستی خۆی دابەزێ، ئاوا باشتر دەنگ

كۆدەبێتەوە، بەڵام دوایی بیكەین بە یەك فراكسیۆن، من پێموایە ئەگەر دڵمان ساغ و صاف بكەین بۆ خوا و بۆ ئیسلام، بۆ خزمەتی ئەم خەڵك و وڵاتەو موزایەدەی حیزبیی و شتی بچووك بچووك نەكەینە پەرچ لە بەردەممانداو، باش ئەندامانی خۆمان ئامۆژگاریی بكەین، كە باش برایەتیی بكەن، ساغ و صاف بن پێكەوە، لە ڕووی ڕووحیی، لە ڕووی ئاكاریی، لە ڕووی فیكرییەوە، كاری زیاتر بكەین، ئنجا ئەگەر لە هەڵوێستی سیاسی، لە شتێكدا نەگەیشتینە یەك قیامەتمان لێ نەیەت، قەیدێ ناكات، تۆ وات پێ چاكە، من وام پێ چاكەو، تەماشا دەكەین داخۆ ئایندە ڕاستیی بۆچوونی كاممان ئیسپات دەكات؟ ئەگەر ئاوا پێكەوە مامەڵە بكەین، ئەگەر یەكگرتنمان بوو، ئەوە باشتر، ئەگەر نەشبوو، دەتوانین باشترین برایەتیی و هاوكارییمان پێكەوە هەبێ.

**دانـــا: بەیەك دێڕ ئامۆژگارییت چییە بۆ ئەندامان و لایەنگرانی بەتایبەت كۆمەڵی ئیسلامیی و یەكگرتووی ئیسلامیی و بزووتنەوەی ئیسلامییش، لەسەر ئەوەی كە ئێستا لەنێو خەڵكدا ئاوا قسە ئەكەن لەبەرئەوەی هەندێكیان زانیارییان نیە، بەس هەر پێیان خۆشە ئێوە لەسەرەوە كۆبوونەتەوە و دڵیان گەرمە، بەوەی كە بەم نزیكانە و بەم حەفتانەو بەم مانگانە، هەموو شتێ كۆتایی دێ، دەڵێی چی؟**

**مامۆستا:** ئاخر تۆ شتێك بڵێی و دوایی وا نەبێ، دەكاتە قسەی خۆش و بۆش، من هەرگیز عادەتم نیە قسەی خۆش و بۆش بكەم، نە بۆ ئەندامانی حیزبەكەی خۆم كە كۆمەڵی ئیسلامییە، نە بۆ ئیسلامییەكان، وە نە بۆ خەڵك و جەماوەر، دەمەوێ ئەوەی حەقە و ڕاستە و ئەوەی لە واقیعدایە، ئەوە بڵێین، ئامۆژگارییم ئەوەیە كە ئەو شتانە بە عاتیفە وەرنەگرین، بەڵكو بە عەقڵ و مەنتیق تەماشایان بكەین، پاشان مەسەلەی كار پێكەوە كردن، پەیوەندیی تەنیا بە ئیرادەی لایەنێكەوە نیە، ئەگەر پەیوەندیی تەنیا بە ئیرادەی لایەكەوە هەبووایە لە ڕابردوودا، لە مێژبوو ئەم واقیعە دەگۆڕدرا، بەڵام پەیوەندیی بە هەموو لایەكانەوە هەیە، پاشان قەزیەش هەر ئەوەندە نیە، ئیرادەی چاكت هەبێ، بەڵكو دەبێ ئامادەسازییشی بۆ بكرێ، بەشێك لەو زەمینە سازیی یە: دەبێ دەست و دەممان و دڵ و دەروونمان و ڕەوشت و ئاكارمان پێكەوە، چاك و چاك بێ، ئنجا دڵسۆزییمان بۆ یەك و

دڵسۆزییمان بۆ ئەو خەڵك و وڵاتە، پاشان شێوەی پەیوەندییەكانمان لەگەڵ ئەو لایەنە سیاسییانەدا، لەگەڵ ئەو خەڵكە كەلەگەڵمان لە ساحەكەدان، هەروەها لەسەر ئاستی دەوڵەتان، لەسەر ئاستی لایەنە سیاسییەكان، دەبێ بەجددیی ڕاوێژی لێ بكەین، چۆن حەق و مەصڵەحەتە، چۆن لە قازانجی ئەم خەڵك و وڵاتەدایە، بەو شێوەیە بكەین، ئەوە هەمووی دەبێ چاوی پێدا بگێڕدرێتەوە، ئا ئەوانە زەمینە خۆش دەكەن كە ئێمە ئەگەر بۆمان گونجا، یەكبگرین، ئەگەر بۆشمان نەگونجا، با باشترین برابین پێكەوە.

**دانـــا: بەڕێز مامۆستا عەلی باپیر نووسەر و ڕووناكبیر! سوپاس بۆ ئەوەی كە وەڵامی پرسیارەكانی ئێمەت دایەوە بەراستی ژمارەیەك پرسیاری دیكە هەبوون، بەڵام دانیشتن لە خزمەت جەنابتاندا و قسە گرنگەكانی جەنابتان نەیهێشت ئەو پرسیارانە بكەین، ان شاء الله بۆ دەرفەتێكی تر.**

**مامۆستا:** ئومێدم وایە بەو وڵامانەی كە داومنەوە، ئەو پرسیارانەی دیكەش كەم وزۆر، وەڵام درابنەوە.

**دانـــا: بینەرانی ئازیز و خۆشەویست! بەم شێوەیە هاتینە كۆتایی ئاڵقەی ئەمجارەی بەرنامەكەمان تا ئاڵقەیەكی نوێ، هەموو لایەك بە خوای گەورە ئەسپێرین، كوردستان ئاوەدان بۆ هەموو لایەك، خواتان لەگەڵ.**

# ئاڵقەی چواردەیەم

بنەمای سێزدەیەم: تێکدان ئاسانە و بەکەمێکیش دەکرێ، بەڵام بنیاتنان قورسە و بەزۆران نەبێ ناکرێ.


ameer.maktab@yahoo.com

 /AliBapir  /AliBapir  /MediaAmeerOffice

www.alibapir.net

دانـا: بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان، سڵاوتان لێ بێ بینەرانی ئازیز و خۆشەویست! خۆم بە خۆشحاڵ ئەزانم خوای پەروەردگار دەرفەتی پێبەخشین لە ئاڵقەیەکی نوێی بەرنامەی بەدانایی دا، لە خزمەت میوانە هەمیشەیی بەرنامەکەمان جەنابی مامۆستا عەلی باپیر نووسەر و ڕووناکبیر، بە ئێوەی ئازیز و خۆشەویست شاد ببینەوە، بێگومان لە ئاڵقەی ڕابردوودا باسمان کرد لە مێژوویەکی کورتی لایەنە ئیسلامییەکان و هەروەها لێکنزیکبوونەوە و ئەو قۆناغانەی کە پێویستەکات کە ببڕدرێ بۆ لێکنزیکبوونەوە، لەم ئاڵقەیەدا دەچینەوە سەر ئەو زنجیرە بابەتەی کە جەنابی مامۆستا لە ڕۆژانی رابردوودا نووسیویەتی "بۆ چاککردنی ئەم دۆخەی هەرێم، با گوێ لە قورئان بگرین"، ئەمجارە باس لەوە ئەکەین کە تێکدان ئاسانە، دەگونجێ بە کەمینەیەك یان بە کەسێکیش بکرێ، بەڵام بنیاتنان و دروستکردن ئەرکێکی قورسە، دەبێ بە دەستەجەمعیی بکرێت.

مامۆستاگیان! سڵاوی خوات لێ بێت.

**مامۆستا:** سڵاوی خوا لە جەنابیشت و لە بینەران و لە بیسەرانی بەڕێزیش.

دانـا: مامۆستا! ئەگەر یادی جەنابتی بخەمەوە، ئاڵقەی پێشوو نا پێشووتر، لە کۆتاییەکەیدا پرسیارێکم کرد وتم لە ئاڵقەی داهاتوودا ئەو پرسیارەت لێ دەکەم "بۆ چاککردنی ئەم دۆخەی هەرێم گوێ لە قورئان بگرین"، گوتم ئەدی "گوێ لە فەرموودەکانی پێغەمبەری خوا نەگرین (صلى الله عليه وسلم)؟ شتێکت لێ باس کرد، گوتم: لە ئاڵقەی داهاتوودا ان شاء الله باسی دەکەین، جا من حەزدەکەم بزانم تۆ بۆچی تایتڵەکەت هەروا داناوە بەس گوێ لە قورئان بگرین؟

**مامۆستا:** الحمد لله، وصلى الله تعالى وبارك على رسول الله، محمد وآله المهتدين بهداه، من الصحب والأزواج والقرابة والتابعين لهم باحسان الى يوم اللقاء.

پێغەمبەری خاتەم موحەممەد (صلى الله عليه وسلم) کە تەشریفی هات بۆ نێو خەڵك و جەماوەر بە صیفەتی دوا پێغەمبەری خوا، تەنها قورئانی پێ بوو، قورئانی پێ بوو، وەك وەحی خوای پەروەردگار، وەك خوا سبحانه وتعالى لە کۆتایی سوورەتی (شورى)دا دەفەرموێت:

﴿ وَكَذَٰلِكَ أَوْحَيْنَآ إِلَيْكَ رُوحًا مِّنْ أَمْرِنَاۚ مَا كُنتَ تَدْرِى مَا ٱلْكِتَٰبُ وَلَا ٱلْإِيمَٰنُ وَلَٰكِن جَعَلْنَٰهُ نُورًا نَّهْدِى بِهِۦ مَن نَّشَآءُ مِنْ عِبَادِنَاۚ وَإِنَّكَ لَتَهْدِىٓ إِلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ ﴿٥٢﴾ صِرَٰطِ ٱللَّهِ ٱلَّذِى لَهُۥ مَا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِى ٱلْأَرْضِۗ أَلَآ إِلَى ٱللَّهِ تَصِيرُ ٱلْأُمُورُ ﴿٥٣﴾ ﴾

(الشورى : ٥٢ ـ ٥٣)

دیاره‌ خوا سبحانه‌ وتعالى پێغه‌مبه‌ری خاته‌م ده‌دوێنێ (علیه الصلاة والسلام) دوای ئه‌وه‌ی له‌ ئایه‌تی پێش ئه‌و دوو ئایه‌ته‌دا باسی چۆنیه‌تی ناردنی وه‌حی ده‌كات:

﴿ وَمَا كَانَ لِبَشَرٍ أَن يُكَلِّمَهُ ٱللَّهُ إِلَّا وَحْيًا أَوْ مِن وَرَآئِ حِجَابٍ أَوْ يُرْسِلَ رَسُولًا فَيُوحِىَ بِإِذْنِهِۦ مَا يَشَآءُۚ إِنَّهُۥ عَلِىٌّ حَكِيمٌ ﴿٥١﴾ ﴾ (الشورى : ٥١)

دوای ئه‌وه‌ی باسی ئه‌وه‌ ده‌كات، ڕێكاره‌كانی ناردنی وه‌حی، چه‌ندن و چۆنن؟ ئه‌مجار ده‌فه‌رموێ: (وَكَذَٰلِكَ)، واته‌: وه‌ك چۆن وه‌حییمان ناردوه‌، په‌یام و به‌رنامه‌مان ناردوه‌ بۆ پێغه‌مبه‌رانی پێش تۆ (علیهم الصلاة والسلام) [أَوْحَيْنَآ إِلَيْكَ رُوحًا مِّنْ أَمْرِنَاۚ] هه‌ر به‌و شێوه‌یه‌ش ڕووحێكمان له‌لایه‌ن خۆمانه‌وه‌ بۆ لای تۆ ناردوه‌.

قورئان ناوده‌نێ (روح)، دوایی ده‌فه‌رموێ: [مَا كُنتَ تَدْرِى مَا ٱلْكِتَٰبُ وَلَا ٱلْإِيمَٰنُ] پێش ئه‌م رووحه‌، پێش ئه‌م قورئانه‌، تۆ نه‌تده‌زانی نه‌ كتێب چییه‌، (واته‌: به‌رنامه‌ چییه‌؟) نه‌ ئیمانیش چییه‌، [وَلَٰكِن جَعَلْنَٰهُ نُورًا]، به‌ڵام ئێمه‌ ئه‌و ڕووحه‌ ئه‌و قورئانه‌مان كرد به‌ ڕووناكیی، ناوی لێ ده‌نێ (نور)، واته‌: رۆشنایی، [نَّهْدِى بِهِۦ مَن نَّشَآءُ مِنْ عِبَادِنَا] هه‌ركام له‌ به‌نده‌كان كه‌ بمانه‌وێ ڕێنمایی ده‌كه‌ین، [وَإِنَّكَ لَتَهْدِىٓ إِلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ] بێگومان تۆش خه‌ڵك ڕێنمایی ده‌كه‌ی، خه‌ڵك ده‌خه‌یه‌ سه‌ر ڕاسته‌شه‌قام، واته‌: كه‌ پێشتر پێش ئه‌وه‌ی قورئانت بۆ بێت، خۆشت به‌و ڕێیه‌ت نه‌زانیوه‌: ﴿ وَوَجَدَكَ ضَآلًّا فَهَدَىٰ ﴿٧﴾ ﴾ (الضحى: ٧)خۆشت نه‌تزانیوه‌ به‌رنامه‌ چییه‌ و ئیمان چییه‌؟ ئێستا به‌هۆی ئه‌م قورئانه‌وه‌ خه‌ڵكیش

فێری ئیمان دەكەی و خەڵكیش دەخەیە سەر بەرنامەی ژیان و دەخەیە سەر ڕاستەشەقامی خوا سبحانه وتعالی.

برای خۆشەویستم! مەسەلەی قورئان و سوننەت، وەك من لەو مەوسووعەیەی كە لە سجنیشدا نووسیومە، باسمكردوە، دوایی لە كتێبێكیشدا بەناوی (شوێنكەوتنی سوننەتی پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) لە نێوان كەمتەرخەمیی و زیادەڕۆیی)دا[1]، باسمكردوە، زۆر كەس وا دەزانێ قورئان و سوونەت وەكو دووتای تەرازوویەك وان، هەم قورئان، هەم سوننەت بەقەدەر یەكن!!

**دانـــا: جـــا بۆ وا نیـــە؟!**

**مامۆستا:** نەخێر، لەڕاستییدا سوننەت شتێكی جیا نیە لە قورئان و، قورئانیش شتێكی جیا نیە لە سوننەت، واتە دوو شت نین، یەك شتن، چۆن؟ خوا قورئانی بۆ پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) ناردووە، پێغەمبەری خوا بەو قورئانە حەرەكەتی كردوە، قورئانی بۆ خەڵك خوێندووەتەوە، ئایا چیدیكەی پێ بووە؟ هەر قورئان بووە، بەو قورئانە هاوەڵانی بەڕێزی هۆشیاركردووەتەوە، عەقڵی هۆشیاركردوونەوەو، دڵی بێداركردوونەوە، پاشان پەروەردەی كردوون، تێی گەیاندوون و پێی گەیاندوون، كۆمەڵێكی لێ پەروەردە كردوون، دوایی ئەو كۆمەڵە لە نێو ئەو كۆمەڵگایەی لەنێویدا ژیان، گەیشتنە بنبەست و نەیانتوانی كارێ بكەن خۆیان بكەن بە قەوارەیەكی سیاسیی، كە خوای پەروەردگاریش پێغەمبەری خاتەمی (علیه الصلاة والسلام)ی، هەروەها هەموو پێغەمبەرانی دیكەی بۆیە ناردوون كە كۆمەڵگا بگۆڕن، پاكسازیی تێدا بكەن، چاكسازیی تێدا بكەن، ڕاستی بكەنەوە، ئنجا كە لە مەككە گەیشتنە بنبەست، كۆچیان كرد بۆ مەدینە، دوای ئەوەی كە پێغەمبەری خوا (علیه الصلاة والسلام) پەیمانی یەكەمی عەقەبە و پەیمانی دووەمی عەقەبەی لەگەڵ نوێنەرانی ئەوس و خەزرەجدا بەست، ئەوەی كە پێی دەگوترێ: گرێبەستی كۆمەڵایەتیی، كۆچی

---

(١) لە چاپی دووەمی دا دەستكاریی زۆرم كردووەو ناوەكەیشم گۆڕیوە بۆ: (پێناسەو گرنگیی و پێویستی ڕێبازی پێغەمبەری خوا - صلى الله عليه وسلم-)

کرد بۆ مەدینەو لەوێ قەوارەی سیاسیی دروست کرد، کەواتە: پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام)، چ بۆ لایەنی بووناسیی (جیهانبینی) چ بۆ لایەنی ئیمان و عەقیدە، چ بۆ لایەنی عیبادەت، چ بۆ لایەنی ئەخلاق و ڕەوشت، چ بۆ لایەنی خەباتی سیاسیی، بەس قورئانی پێ بووە، ئەدی سوننەت یانی چی؟ سوننەت یانی: قورئان بە بەرجەستەکراویی، قورئان بە جێبەجێکراوی، قورئان حەقیقەتێکی موتڵەقە لە ڕووی تیۆریی و فیکرییەوە، بەڵام سوننەت بریتیە لە جێبەجێکردنی ئەو حەقیقەتە موتڵەقە لەسەر ئەرزی واقیع.

**دانـا: هەڵەیە بڵێین: سوننەت تەفسیری پێغەمبەرە بۆ قورئان؟**

**مامۆستا:** بەتەئکید، پێغەمبەری خوا (علیه الصلاة والسلام) دانەنیشتوە، بۆ وێنە: سوورەتی (البقرة)مان بۆ تەفسیر بکا، لە هەموو سوورەتی (البقرة) ڕەنگە پێنج شەش ئایەتی ڕوون کردبنەوە، کە ئەویش بۆ هاوەڵان جێی ئیشکال بوون، لە سوورەتی (الأنعام)دا یەك ئایەتم پێ شك دێ کە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) وەك لە تەفسیرە کوردییەکەمدا باسمکردوە، کە وشەیەك تێیدا بۆ هاوەڵان جێی ئیشکال بووە، پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) بۆی ڕوونکردوونەوە، کە ئەو وشەیە مەبەستەکەی ئەوە نیەو مەبەستەکەی ئاوەیە، ئەو ئایەتەی کە دەفەرموێ:

﴿ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَلَمْ يَلْبِسُوٓاْ إِيمَٰنَهُم بِظُلْمٍ أُوْلَٰٓئِكَ لَهُمُ ٱلْأَمْنُ وَهُم مُّهْتَدُونَ ﴿٨٢﴾ ﴾

(الأنعام : ٨٢)

واتە: ئەوانەی ئیمانیان هێناوە و ئیمانەکەشیان لەگەڵ زوڵمدا تێکەڵ نەکردوە، ئا ئەوانە جێی دڵنیایین، دڵنیاییان بۆ هەیە و، ئەوانە ڕێی ڕاستیان گرتوە.

هاوەڵان هاتنە خزمەت پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام)، گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا! ئەوەمان بۆ جێبەجێ نابێ و ئەوەمان لە تاقەتدا نیە، فەرمووی کامە؟ گوتیان: ئەوە نیە خوا دەفەرموێ: ئەوانەی ئیمانیان هێناوە و ئیمانەکەشیان تێکەڵ بە زوڵم نەکردوە، وشەی (ظلم) بە مانای گوناح دێ بە گشتی و، وە بە

مانای دەستدرێژیی کردن بۆ سەر مافی ئەوانی دیکەش دێ، ئەوان وای لێ حاڵیی بوون، کە مەبەست گوناحە بەگشتی، گوتیان: (وأينا لم يظلم؟) کامە لە ئێمە زوڵمی نەکردوە؟ ئنجا ئەگەر بە مەرجێك ئێمە دڵنیا بین لە سزای خوا، کە دەبێ هیچ گوناحێکمان نەکردبێ، هیچمان دەرناچین، هەموومان گوناحمان هەرکردوە، پێغەمبەر (عليه الصلاة والسلام) فەرمووی: (ليس بذلكم) مەبەست لەو وشەیەی (ظلم) ئا ئەو چەمك و تێگەیشتنەی ئێوە نیە، ئایا گوێتان لێ نەبووە، عەبدە ساڵحەکە (لقمان) چی دەفەرموێ :

﴿ وَإِذْ قَالَ لُقْمَٰنُ لِٱبْنِهِۦ وَهُوَ يَعِظُهُۥ يَٰبُنَيَّ لَا تُشْرِكْ بِٱللَّهِ ۖ إِنَّ ٱلشِّرْكَ لَظُلْمٌ عَظِيمٌ ﴿١٣﴾ ﴾ (لقمان: ١٣)

واتە: یادبکەوە کاتێك لوقمان ئامۆژگاریی کوڕەکەی کرد، گوتی: ڕۆڵەگیان! هاوبەش بۆ خوا دامەنێ، بێگومان هاوبەش بۆ خوا دانان ستەمێکی گەورەیە، ئنجا فەرمووی لێرەدا کە خوا دەفەرموێ: ئیمانیان هێناوە و زوڵمیان تێکەڵ بە ئیمانەکەیان نەکردوە، واتە (شرك)یان تێکەڵ بە ئیمانەکەیان نەکردوە، ئیمان ئەگەر شیرکی تێکەڵ بوو، هەڵدەوەشێتەوە، مەبەست ئەوەیە.

پێغەمبەری خوا (عليه الصلاة والسلام) ئاوا ئەگەر وشەیەکی وا، ڕستەیەك، ئایەتێك کە هاوەڵان باش لێی تێنەگەیبن، ئەگەرنا دانەنیشتوە قورئانمان بۆ تەفسیر بکات، ئەگەرنا ئێستا ئێمە (تفسير النبوي للقرآن الكريم)مان لەبەردەستدا دەبوو، ئەدی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) چی کردوە؟ وەڵامەکەی ئەوەیە کە خوای کاربەجێ لە سوورەتی (النحل)دا، ئەم ڕستەیەی فەرمووە:

﴿ وَأَنزَلْنَآ إِلَيْكَ ٱلذِّكْرَ لِتُبَيِّنَ لِلنَّاسِ مَا نُزِّلَ إِلَيْهِمْ ﴾ (النحل: ٤٤)

زیکرمان بۆ لای تۆ ناردووەتە خوار، تاکو ئەوەی بۆ خەڵك دابەزێنراوە بۆیان ڕوون بکەیەوە، یانی چی؟ یانی: پێشانیان بدەی ئەم قورئانە چۆن جێبەجێ دەکرێ، ئەم قورئانە چۆن بەرجەستە دەکرێ لەسەر ئەرزی واقیع؟

ئنجا ئایا ئێمەش مەبەستمان لێرەدا ئەوەیە كە وەك ئەوانەی پێیان دەگوترێ: (قورئانیی). وەحیی و پەیامی خوا تەنیا قورئانەو له قورئان دا كورت هەڵاتووە؟! لەراستییدا ئەو ناوە لەوان خەسارە، چونكە ئەوەی قورئانیی بێت و بەڕاستی شوێن قورئان بكەوێ، قورئان پێی دەفەرمووێ: دەبێ دوای پێغەمبەری خاتەم بكەوی (علیه الصلاة والسلام)، قورئان پێی دەفەرموێ: دەبێ بە شوێن پێی پێغەمبەری خاتەمدا هەنگاو بە هەنگاو بڕۆی، ئەدی قورئان نافەرموێ:

﴿ وَمَآ ءَاتَىٰكُمُ ٱلرَّسُولُ فَخُذُوهُ وَمَا نَهَىٰكُمْ عَنْهُ فَٱنتَهُوا۟ ﴾ (الحشر : ٧)

هەرچی پێغەمبەر پێتان دەدات لێی وەربگرن و، هەرچی ئەو ڕێتان لێ دەگرێ، لێ دوور بكەونەوە؟ ئەدی قورئان نافەرموێ:

﴿ لَقَدْ كَانَ لَكُمْ فِيهِمْ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ ﴾ (الممتحنه: ٦)

بێگومان لە پێغەمبەری خوادا سەرمەشقییەكی باش هەیە بۆ ئێوە؟

ئەدی قورئان پێمان نافەرموێ: ﴿ مَّن يُطِعِ ٱلرَّسُولَ فَقَدْ أَطَاعَ ٱللَّهَ وَمَن تَوَلَّىٰ فَمَآ أَرْسَلْنَٰكَ عَلَيْهِمْ حَفِيظًا ﴿٨٠﴾ ﴾ (النساء : ٨٠)

هەركەسێ فەرمانبەریی پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) بكات فەرمانبەریی خوای كردوەو، هەركەسێ پشتی هەڵكرد، تۆمان نەناردوە كە پارێزەر بی بەسەریەوە؟

كەواتە: ئەوەی كە پێیان دەگوترێ: قورئانیی، وەك گوتم: ئەو ناوەیان لێ خەسارە.

بەڵێ پێغەمبەری خاتەم (علیه الصلاة والسلام) تەنیا قورئانی جێبەجێ كردوە، بەڵام نەك بەو واتایە كە وەحیی تەنها لە قورئاندا هەبێ، چونكە پێغەمبەری خوا (علیه الصلاة والسلام) وەك بناغەی دینداریی قورئانی بەدەستەوە بووە، بەڵام وێڕای قورئانیش، وەحیی دیكەش هەبووە:

١- جا چ بۆ جێبەجێكردنی قورئان، كە دەبێ چۆنی جێبەجێ بكات.

٢- چ بۆ ئەوەی كه هاوەڵان هەندێ شتیان لێ ئیشكال بووەو، ئەویش ڕەنگه هەندێ شتی بۆ ڕوون نەبووبێ، خوای پەروەردگار بەهۆی وەحییەكی دیكەوە، بۆی ڕوونكردووەتەوە.

٣- چ هەندێ شت كه له قورئاندا نەهاتوە، بەڵام ئایەتەكانی قورئان خوازیاری ئەو چەمكەشن، خوازیاری ئەو حوكمەشن، ئەوانەش له سوننەتدا هەن، بۆ وێنە: (به وێنه هێنانەوە شتەكه باشتر ڕوون دەبێتەوە) :

١) پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) نوێژی فێری هاوەڵان كردوە، كاتەكانی پێنج نوێژەكان و،كه پێنج نوێژن، یەكیان دوو ڕكاته كه نوێژی بەیانییەو، ئەوانی دیكه چوار ڕكاتیین، كه خەوتنان و عەسر و نیوەڕۆن و، یەكیان سێ ڕكاته، كه شێوانه، جبریل هاتوە، وەك له صەحیحی بوخارییدا هاتووەو له صەحیحی موسلیمیشدا هاتوە، جبریل (علیه الصلاة والسلام) هاتووەته خوار، بۆ پێنج كاتەكان نوێژی به پێغەمبەری خاتەم كردوە، دووجار پێنج فەرزەكانی پێ كردون، بۆ كاتەكەیان، كاتێكیان كه كاتی بژارده (إختیار)ی پێ دەڵێن، ئەو كاتەی كه خێری زیاترەو، كاتێكیان كاتی (جواز)ی پێ دەڵێن، بۆ هەر پێنج فەرزەكان دوو جار هەر پێنج نوێژەكەی پێ كردوون، پاشان جبریل (علیه الصلاة والسلام) ورد ورد پێی فەرمووە كه دەبێ چەند ڕكات بن و چۆن بن!

٢) پێغەمبەریش (علیه الصلاة والسلام) بەلای كەمەوە دوو جار لەسەر مینبەر - وەك له صەحیحی بوخارییدا هاتوە - نوێژی بۆ هاوەڵان كردوەو فەرموویەتی تەماشام بكەن، دوایی فەرموویەتی (وصلّوا كما رأيتموني أصلي) نوێژ بكەن وەك چۆن منتان بینی نوێژم كرد، بۆ ئەوەی لەبەر چاویان بێ ڕكووع چۆن بەرێ؟ سەجده چۆن بەرێ؟ تەحییات، ڕاوەستان، (قیام) هەمووی.

٣) هەروەها خواپەرستییەكانی حەج (مناسك الحج) و ڕۆژووگرتن و ئەركەكانی دیكه، پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) ئەوەی كه بۆی ڕوون بووبێ، بۆی ڕوون بووەو، ئەوەی بۆی ڕوون نەبووبێ، جبریل هاتوە بۆی ڕوونكردووەتەوە، بۆ وێنه: له صەحیحی بوخارییدا هاتوە، له عومەری كوڕی خەتتابەوە گێڕدراوەتەوە

- خوا لێی ڕازی بێ - دەڵێ: ئێمە لە خزمەت پێغەمبەر بووین (علیه الصلاة والسلام) كابرایەكی ئەعرابیی (واتە عەرەبێكی خێڵەكی) هاتە خزمەتی، بەرگێكی لەبەردا بوو، كە بۆنی خۆشی لێدابوو، (دیارە بۆنە خۆشەكەی پێوە دیار بوو و بۆنیشی هاتوە) گوتی ئەی پێغەمبەری خوا! من عومرەم كردوەو ئێستا دەمەوێ حەج بكەم، چی بكەم؟ (هەر بەم بەرگەوە ئیحرام ببەستم، چۆن بكەم؟) دەڵێ: پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) بێ دەنگ بوو، ماوەیەك پێچوو زانیمان كە پێغەمبەری خوا وەحیی بۆ هات، ئنجا كە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) وەحیی بۆ دەهات، دەكەوتە حاڵەتێكی نائاسایی، بۆیە ئێمە شتێكمان پێدا دەدا، (پەڕۆیەك قوماشێكیان بەسەر دەموچاوی موبارەكیدا داوە، دایكمان عائیشە دەڵێ لە ڕۆژی ساردی زستاندا كە پێغەمبەری (علیه الصلاة والسلام) وەحیی بۆ دەهات، زەنگوڵ زەنگوڵ ئارەقە بەناوچەوانیدا دەهات، ئەوەندە نارەحەت دەبوو) ئنجا كە وەحییەكە تەواو بوو، فەرموی: چی لێهات ئەوەی پرسیارەكەی كرد؟ (دیارە جبریل وەحیی بۆ هێناوە لەو كاتەدا، دیارە لە قورئان دا پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) پێی شك نەهاتوە وەڵامی ئەو پرسیارە، هەبێ) بانگیان كردەوە، فەرمووی: ئەو بەرگەت بۆنەكەی لێ بشۆ، دوایی وەك چۆن عومرەت كردوە، ئاوا حەجەكەشت بكە.

چونكە ئینسان كە ئیحرام دەبەستێ، نابێ بۆنی خۆشی لەخۆی دابێ، بۆیەش فەرموویەتی: بۆنەكەی بشۆ، چونكە ڕەنگی دیاربووەو بۆنەكەشی زۆر ڕۆیشتوە.

لە فەرمایشتی پێغەمبەردا (علیه الصلاة والسلام) هاتووە وەك شافیعی لە (الرسالە) كەی خۆیدا دەیهێنێ، فەرموویەتی: (نفث روح القدوس في رُوُعي، أن نفساً لن تموت حتى تستكمل رزقها وأجلها)، (روح القدس) واتە: جبریل، خستیە دڵمەوە، (وەحیی بۆ ناردم) كە هیچ نەفسێك نامرێ، تاكو بژێویەكەی بۆی دیاریی كراوە تەواوی نەكاو تاكو ڕۆژەكانی تەمەنی خۆشی تەواو نەكات.

٤) هەروەها پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) دەفەرموێ: (لا يُجْمَعُ بين المرأة وعمَّتِها، والمرأة وخالَتِها) رواه البخاری ومسلم، نابێ ئافرەت لەگەڵ خوشكی بابی و، خوشكی دایكی (لە ژێر نیكاحی پیاوێك دا) كۆببنەوە.

ئەگەر پیاوێك خێزانەكەی مرد، بۆی هەیە پوورەكەی بەهاوسەربگرێ (بە كوردیی ئێمە بە خوشكی بابیش هەر دەڵێین پوور، بە خوشكی دایكیش هەر دەڵێین پوور، بە عەرەبی دەڵێن (عمە و خالە) خوشكی باب و خوشكی دایك) بەڵام بۆی نیە پێكەوە كۆیان بكاتەوە.

**٥)** عەبدوڵلای كوڕی عەبباس دەڵێ: (نهی رسولُ الله (صلى الله عليه وسلم) عن أكل الحمر الأهلية) متفق عليه. پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) قەدەغەی كردوە كە گۆشتی كەری ماڵیی بخورێ.

**٦)** هەروەها (نهى رسول الله (صلى الله عليه وسلم) عن أكل كل ذي ناب من السباع، وكل ذي مخلب من الطير) ئەوەش لە صەحیحی بوخاریی و موسلیمدا هاتوە، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) قەدەغەی كردوە هەر دڕندەیەكی خاوەن كەڵبە ( وەك پڵنگ و شێر و گورگ و چەقەڵ و ئەوانە گۆشتەكەیان بخورێ) و هەر پەڕندەیەكی خاوەن نینۆك، چڕنووك، نابێ گۆشتیان بخورێ، كەواتە: ئەوەش كە پێغەمبەر (عليه الصلاة والسلام) فەرموویەتی، هەر دەچێتەوە نێو ئەوەی كە قورئان فەرموویەتی.

**٧)** هەروەها پێغەمبەر (عليه الصلاة والسلام) بۆی ڕوونكردینەوە: ئایەتەكانی جەنگ و جیهاد، هەركامیان كەی بەكاردێ، ئێمە بەچەند قۆناغێك باسی جەنگ و جیهادمان هەیە، لەو بوارەدا چۆن مامەڵە دەكەین؟ هەروەها مامەڵەكردن لەگەڵ كۆمەڵگاو، لەگەڵ دەوروبەردا.

گەلێ شتی دیكەش پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بۆی جێبەجێ كردووین و خوای بەرزیش دەفەرموێ:

﴿ لَقَدْ كَانَ لَكُمْ فِيهِمْ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ ﴾ (الممتحنه: ٦)

لە پێغەمبەری خوادا سەرمەشقییەكی باش هەیە بۆ ئێوە. واتە: بەهۆی ڕێبازی پێغەمبەرەوە (عليه الصلاة والسلام) تۆ دەزانی قورئان چۆن جێبەجێ دەكرێ؟ ئا ئەوەتە مەبەست لە ڕوونكردنەوەكەی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بۆ قورئان.

**دانــا: مامۆستا! باسی قورئانییەكانت كرد، بەڵام لە بەرامبەر ئەوەدا ئایا جەنابت هەست بەوە ناكەی هەندێك لە مسوڵمانان، بە حیسابی خۆیان بەهۆی بەرگرییەكی سەرسەختیان لە فەرمایشتەكانی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)، زۆر جار سوننەت دەخەنە ئاست قورئان و بگرە ئەگەر تێنەپەڕێنم، لەوانەیە فەرموودەكان پێش قورئانیش بخەن!**

**مامۆستا:** بەڵێ، لە هەندێ كتێباندا بینیومە، لە هەندێ كتێبی ئەوانەدا كە (أهل الحدیث والأثر)یان پێ دەڵێن، كە بەداخەوە بە بیانووی شوێنكەوتنی ڕێبازی پێغەمبەرەوە (صلی الله علیه وسلم) نكووڵیی دەكەن لە بەكارهێنانی عەقڵ، كە ئەمەیان تێپەڕاندنەو ئەویدیكەش بەزایەدان بوو.

ئەوە كە تۆ بڵێی: ئیكتیفا دەكەین بە قورئان، ئاخر قورئان پێت دەڵێ: دەبێ بە دوای ڕێبازی پێغەمبەر بكەوی (صلی الله علیه وسلم) و بەبێ شوێننەكەوتنی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) ئەصڵەن قورئانت پێ جێبەجێ ناكرێ، نازانی چۆن جێبەجێ دەكرێ، ناڵێم: تێی ناگەی، چونكە خوای زاناو توانا لە چەند شوێنان دەفەرموێ:

﴿ الٓر ۚ تِلْكَ ءَايَـٰتُ ٱلْكِتَـٰبِ وَقُرْءَانٍ مُّبِينٍ ﴿١﴾ ﴾ (الحجر: ١)

﴿ تِلْكَ ءَايَـٰتُ ٱلْكِتَـٰبِ ٱلْمُبِينِ ﴿٢﴾ ﴾ (الشعراء: ٢)

﴿ وَلَقَدْ يَسَّرْنَا ٱلْقُرْءَانَ لِلذِّكْرِ ﴾ (القمر : ١٧)

قورئان ڕوونە بۆ خەڵكی خۆی، بۆ كەسێك شارەزای زمانی عەرەبی بێ، ڕوونە، بەڵام كە ڕوونیشە مانای وانیە هیچ كەس دەگاتە ئەوپەڕی، بەڵام قورئان بە گشتی ڕوونە، ئەدی ڕوونكردنەوەكەی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)، چییە؟! مەبەست پێی چۆنیەتی جێبەجێكردنەكەیەتی، بەكورتی: ئەوانەی كە دەڵێن ئیكتیفا دەكەین بە قورئان، ئەوانە كورتی دێنن، ئەوانەش كە دەچن، سوننەت دێننە ئاست قورئان، ئەوانەش تێدەپەڕێنن، چونكە بەلای كەمەوە قورئان دوو پلەو ئیمتیازی بنەڕەتیی بەسەر سوننەتەوە هەن، وێڕای ئەوە كە

فەرموودەی خوای بەرزو بێ وێنەیە: یەکەم: قورئان هەمووی موتەواتیرەو، بە تەواتور بە ئێمە گەیشتوە، بەڵام سوننەت، هەموو زانایان لەسەر ئەوە یەکدەنگن، کە سوننەت موتەواتیری هەیە و ئاحادی هەیە، ئنجا موتەواتیری عەمەلیی هەیەو، موتەواتیری بێژەیی (لفظي) هەیە، هەندێ لە زانایان دەڵێن: بەس یەك حەدیپی موتەواتیری (لفظي) هەیە ئەویش ئەو حەدیپەیە کە دەفەرموێ: (مَنْ كَذَب عليّ متعمِّداً فليتبوأ مقعده من النار)، کە ئەوە هەموو ئەهلی حەدیپ هێناویانە، واتە: هەرکەسێ بە ئانقەست درۆ بە زمانی منەوە بکات، با شوێنی خۆی لە ئاگردا دابنێ، هەندێکیش دەڵێن: نەخێر چەندان فەرموودەی دیکەی موتەواتیرمان هەن، بەڵام فەرموودەی موتەواتیری عەمەلییمان زۆرن، یانی: پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) چۆن نوێژی کردوە؟ چۆن ڕۆژووی گرتوە؟ چۆن هەڵسوکەوتی خێزانیی کردوە؟ چۆن جەنگی کردوە؟ چۆن سەفەری کردوە؟ ئەوە زۆر زۆرە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا بەتەئکید سوننەت هەر دەبێتەوە بە دووبەش:

أ- موتەواتیر، کە بەشی کەمیەتی.

ب- ئاحاد، کە زۆرینەیەتیی و ئەوەیە نەگەیبێتە ڕاددەی تەواتور، زانایان دەڵێن: ئاحاد گومانی زاڵ (ظن راجع) بۆ ئینسان دروست دەکات، هەڵبەتە هەندێکیان دەڵێن: جاری وا هەیە ڕەنگە یەقینیش دروست بکات، بەڵام بەهەرحاڵ، ئەوەی کە بە تەواتور بە تۆ گەیشتبێ، جیایە لەوەی کە نەفەرێك بە تۆی گەیاندبێ، کەواتە: هەر لە ڕووی سەنەدەکەیانەوە، قورئان و سوونەت لێك جیان.

**٢)** هەرچی کە پێویستە وەك لە پێشەکی مەوسووعەی (الاسلام كما يتجلى فی كتاب الله)دا، هەرچی پێویستە بۆ دینداریی، من پێموایە خوای پەروەردگار لە قورئاندا بەیانی کردوە، بەڵام دیارە پێغەمبەریش (عليه الصلاة والسلام) هەندێ شت کە بە پێویستی زانیوە زیاتر ڕوونی کردووەتەوە، یاخود چۆنیەتی جێبەجێکردنەکەی.

کەواتە: ناگونجێ قورئان و سوونەت بخرێنە دوو تای تەرازوو یەکەوە.

ئنجا لەڕاستییدا جەوهەری سوننەتیش هەر بریتیە لە قورئان، بۆیەش دەڵێم: سوننەت جیا نیە لە قورئان، کاکڵە و جەوهەری سوننەت بریتیە لە قورئان، بریتیە لە جێبەجێکردنی قورئان، سوننەتیش قورئانە، بەڵام بە تەتبیقکراویی و جێبەجێکراویی، بۆیە کە هەندێك دەڵێن: (السنة حاكمة على القرآن، وليس القرآن حاكماً على السنة) ئەوە هەر حاڵیی نەبوون، چۆن سوننەت حاکمە بەسەر قورئان، وەحیی موتڵەقی خوای پەروەردگاردا؟! ئاخر پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بەس قورئانی پێ بووەو پێغەمبەر (عليه الصلاة والسلام) ئەوەندە سوور بووە لەسەر مسوڵمانان کە باش لە قورئان تێبگەن و باش کارلێکی لەگەڵدا بکەن، قەدەغەی کردوون لەوەی سوننەت بنووسنەوە، بۆ کەسانێك کە تێیرا نەبینیبن، خەلیفە راشیدەکانیش هەر لەسەر ئەو ڕێیە ڕۆیشتن، ئەوانیش قەدەغەیان دەکرد سوننەت بنووسرێتەوە، هەتا دوایی لە سەردەمی عومەری کوڕی عەبدولعەزیزدا واتە: ساڵی نەوەدو نۆ (٩٩)ی کۆچییدا، دەستکرا بە تەدوینی سوننەت، هەڵبەتە کەم و زۆر نووسرابووەوە، بەڵام بەڕەسمیی تەبەننیی نەکرابوو، هەروەها لە سینەی هاوەڵاندا هەبوو، بەڵام بەڕەسمیی نەنووسرابۆوە وەك قورئان خراوەتە نێوان دوو بەرگەوە، سوننەتیش بنووسرێتەوە.

**دانــا: زۆر باشە بێینەوە سەر تەوەری بەرنامەکەمان، کە تێکدان ئاسانە و بەکەمینەیەك ئەکرێ، دروستکردن و بنیاتنانیش قورسە و بە زۆرینە نەبێ ناکرێ، من ئەمەوێ بزانم مەبەستت لە تێکدان چییە؟ هەروەها مەبەستت لە بنیاتنان چییە؟ کێ ئەیەوێ چی تێکبدات؟ کێ ئەیەوێ چی دروست بکات؟**

**مامۆستا:** ئەو قسەیەم لەو سیاقەدا کردوە کە باسی ئەوە دەکەین: چۆن گرفت و کێشەکانی ئەم هەرێمی کوردستانی خۆمان چارەسەر بکەین؟ چۆن پاکسازیی و چاکسازیی تێدا ئەنجام بدەین و، چۆن دەتوانین بەسەر ئەو قەیران و کێشانەدا زاڵ بین، کە لەگەڵیاندا دەستەویەخەین؟ لەو سیاقەدا ئەو قسەیەم کردوە، کەواتە: مەبەستم لە تێکدان واتە، تێکدانی ئەم وڵاتە کە لە ڕووی سیاسییەوە تێکدراوە، لەجیاتی تەبایی سیاسیی، ئێستا بارگژیی سیاسیی هەیە، لە ڕووی ئابوورییەوە تێکدراوە قۆرخکاریی و چینایەتیی هەیە، قڕیی و پڕیی هەیە، لە

ڕووی كۆمەڵایەتییەوە، تێكدراوە كە خەڵكانێ ژیانیان زۆر جیایە لەوانی دیكە، لە هەموو ڕوویەكەوە، منداڵیان لە شوێنی دیكە دەخوێنن، چارەسەریان لە شوێن و جۆری دیكەیە، ژیانی ڕۆژانەیان بەجۆرێكی دیكەیە، هەروەها لە ڕووی گوتاری سیاسییمانەوە، تێكدراوە، كە هەركەسە بە شێوەی خۆی مامەڵە دەكات لەگەڵ ئێران لەگەڵ توركیا، لەگەڵ بەغداد، لەگەڵ ئەم لا لەگەڵ ئەولا، مەبەستم لە تێكدان، ئا ئەو حاڵەتانەیە.

**دانــا: مامۆستا! بۆ هەمووی فەرمووت تێكدراوە، ئەمە تۆزێ وردە، تێكدراوە، یان تێكچووە؟ ئێمە خۆمان تێكمان داوە، یان فاكتەرەكانی دەرەوەی خۆمان، بوونەتە هۆكار بۆ ئەوەی تێك بچێ؟**

**مامۆستا:** پێموایە خۆمان تێكمانداوە، ئایا پەرلەمان، ئێران و توركیا هاتن پەكیانخست، یان خۆمان؟ بە بڕیاری حیزبیی؟ حكوومەت كێ ئیفلیجی كرد؟ دەسەڵاتی دادوەریی لەگەڵ ڕێزم بۆ ئەو دادوەرە بەڕێزانەی كە زۆر سوورن لەسەر ئەوەی كە شت بە یاسا بكرێ و، زوڵم لەكەس نەكرێ و، بەسەر كەسدا باز نەدرێ، دەسەڵاتی دادوەریی، كێ بێ دەستەڵات و دەستەپاچەی كردووە لە بەرامبەر هەندێ تاواندا كە بە نوێژی نیوەڕۆ دەكرێن، بەتایبەتی ڕۆژنامەنووسێك لەسەر چوار قسەی حەق، یان خەڵكێكی دیكە بێ تاوان دەكوژرێ، لە ماڵەكەی خۆیدا، بەرپرسی ئاسایش بەرپرسی پۆلیس، نازانن، كێ دەسەڵاتی دادوەریی و ئیددیعای عام و ئەو دامودەزگایانە وا لێدەكات دەستەپاچە بن، هەر خۆمانین، كەواتە بەڵێ هێزە دەرەكییەكانیش كەسانێكی ناحەزیش هەن، پێیان خۆشە تۆ بەم شێوەیە بن، یاخود ئەوانیش هەن، ئەگەر تۆ ئاوەكەت لێڵت كرد، ئەوانیش دێن ڕاوی تێدا دەكەن، بەڵام خۆت بەرپرسیاری یەكەمی.

**دانــا: مەبەستت هەموو لایەنە سیاسییەكانە، هەر پێنج لایەنەكە تێكتانداوە؟**

**مامۆستا:** نەخێر مەبەستم ئەوەنییەو، ئەو قسەیەش یەكێك لەو وەهمانەیە كە زۆر دووبارە دەبێتەوە: هەر چوار لایەنەكە خەتابارن، هەر پێنج لایەنەكە خەتابارن، ئەوە قسەیەكی بێ مانایە، ئەو كەسەی كە بڕیاری بەدەستە، ئەمری بەدەستە،

نەهی بەدەستە، پارەی بەدەستە، بازرگانیی بەدەستە، پەیوەندییە سیاسییەكانی بەدەستە، هێزی بەدەستە، ئا ئەوە بەرپرسیارە، كەسێك كە هیچی بەدەست نیە، ئاخر بەرپرسیارێتییەكەی لەكوێدایە؟ نا، قەت شتێك ناڵێم پێچەوانەی واقیع بێ، جارێك گوێم لە مەلایەك بوو، كە مامۆستایان دەبێ زۆر زمانیان پاك بێ، وەنەبێ من زۆر مەجالم هەبێ، موتابەعەی هەر مەلایەك بكەم كە وتار دەدا، بەڵام لە فەیسبووك گرتەیەكیان لێ وەرگرتبوو پیشانیان دام، دیاربوو قسەكەی زۆر عەجایب بوو، باسی هەموو ئەو لایەنە سیاسییانە دەكات بەناوی ناشیرین، دیارە من پێشێ ئامۆژگاریی ئەو مەلایە و هەر مەلایەكی دیكەش دەكەم هەر مامۆستایەكی دیكە، كە دەچنە سەر مینبەری پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەبێ هەوڵ بدات لە قەدەر ئەو كەسە بێ، كە چووەتە شوێنەكەی، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) هەرگیز وشەی ناشیرینی بەدەمدا نەهاتوە، زۆر بە نەزاكەت بووە، زۆر بەرێز و حورمەت بووە، ئنجا ئەگەر كەسێك هەڵەیەكی كردبێ، چۆن خەڵكی ئاگادار كردۆتەوە لەو هەڵەیە؟ فەرموویەتی: (ما بال أقوام يفعلون كذا وكذا) یان (يقولون كذا وكذا)، بۆچی هەندێ كەس ئاواو ئاوا دەكەن، یان: ئاواو ئاوا دەڵێن! بۆ ئەوەی بابای خەتاكار نەناسرێ و ناوی نەزرێ و تەشهیری بێ نەكرێ.

**دانـا: پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) قسەی سووكی بەكەس نەوتوە؟**

**مامۆستا:** قسەی سووكی بە كەس نەگوتوە، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێ: (ليس المؤمن بالطعان ولا اللعان ولا الفاحش ولا البذي)، ئیماندار چ جای مامۆستا و كەسێك كە خۆی بە پێشەوا و زانا دەزانێ كە هەركەسێك وابێ، نە زانایەو نە پێشەوایە، خەڵك چی لێوەربگرێ، جنێوی لێوە فێر بێ؟ كەلیماتی ناشیرینی لێ فێر بێ؟ بێ ئینصافی لێ فێر بێ كە هەموو لایەنە سیاسییەكان وەك یەك تەماشا دەكات؟ ئاخر كاكە مەلا ئەوەت لە كوێ هێنا؟ وایە، ئەدی تۆ نازانی خەڵك هەیە لەم وڵاتەدا، لەوەتەی ئەم هەرێمە دروست بووە، مەحرووم و مەزڵوومە، وەك هاووڵاتی پلە دوو و سێ مامەڵەی لەگەڵدا دەكرێ؟ ئەدی تۆ نازانی حیزب و خزم دەكرێتە ملیاردلێر لەسەر حیسابی

جەماوەر و ئەو خەڵكە ڕەش و رووتە؟ چۆن هەموویان وەك یەك تەماشا بكرێن؟!
پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێ: ئیمانداری ئاسایی، تانەلێدەر و لەعنەتكەر و جنێوفرۆش و زمانشڕ نییە، ئەدی ئەگەر جێگری پێغەمبەر بێ (صلى الله عليه وسلم)، خۆی بەجێگر بزانێ، خۆی بە میراتگر بزانێ، كاكە مەلا دەبێ تۆ لەقەدەر پێغەمبەری خوا بی، بەئەندازەی ئەوە كە وەك پێغەمبەر دەچی و بەڕێی ئەودا دەچی، شایستەتە پێت بگوترێ: جێگر و میراتگری پێغەمبەری (صلى الله عليه وسلم)، ئەگەرنا بە قسەی ڕووت و ناوونیشان و مێزەرو جبە، نابیە هیچ! بێگومان ئەو جۆرە قسانە و ئەو جۆرە مامەڵەیە، ئەو جۆرە كەسانە دەخاتە ژێر نیشانەی پرسیار، مامۆستایانیش بە گشتی دەخاتە ژێر نیشانەی پرسیار، ئاخر هی وا هەیە مەلایەكی خراپ دەبینێ، خەتیبێك، كە ئاوا بەو شێوەیە قسە دەكات، لە هەموویان دەكەوێتە گومان، كە ئەوەش ئینصاف نیە، مەڕ بەپێی خۆی، بزن بەپێی خۆی.

**دانـــا: ئەوەی تێكتان داوە، هەر پێنج لایەنەكە تێكتان داوە؟**

**مامۆستا:** وەك باسمكرد، لەڕاستییدا وانیە، ئەو كەسە تێكیداوە، كە بڕیاری بەدەستە، كە كاری بەدەستە، ئەو كەسە كە هێزی بەدەستە، ئابووریی ئەم وڵاتەی بەدەستە، نەوت دەفرۆشێ، پەیوەندییە سیاسییەكانی بەدەستە، ئەو كەسانە بەرپرسن..

**دانـــا: ئەدی ئەوانی ترتان لەچی بەرپرسن؟**

**مامۆستا:** ئەوەی دیكە بەئەندازەی ئەوە بەرپرسیارە، ئەگەر لە حیزبەكەی خۆیدا ڕێك نەبێ، دادگەر نەبێ.



**دانـــا: ئەدی لە حكوومەتی كوردستان دا ؟**

**مامۆستا:** ئەوەش كە لە حكوومەتدایە بەقەدەر ئەو وەزارەتە كە بەشدارە، بەرپرسیارە ئەگەر لە چوارچێوەی وەزارەتەكەی خۆیدا، ڕۆڵی خۆی ببینێ، خزمەتی خەڵك بكات مانای وایە خوا و خەڵكی لەخۆی ڕازی كرد، ئەوە شتێكی باشی

كردوه، نابێ وەزارەتەكەی دیكە، كە خەڵك گلەیی لێی هەیە، بێنێ بیخاتە سەر ئەوی دیكەش، بەڵكو هەركەسە بەپێی خۆی، ئێمە دەبێ فێری ئینصاف بین، (الإنصاف خیر الأوصاف)، وەزارەتێك كاری باش دەكات، وەزیرێ كاری باش دەكا، بەڕێوەبەرێكی گشتی كاری باش دەكا، ئەوی دیكە كاری خراپ دەكا، شتێكی زۆر بێ مانایە بڵێی: هەموویان وەك یەكن، مەلایەك قسەی سەقەت و خراپ دەكات، بڵێی: مەلایەكان هەموویان قسەی سەقەت دەكەن، نا، ئەوەیان كە قسەی سەقەت دەكات، قسەكەی سەقەتە و ماڵی قەڵب سەر بە خاوەنیەتی، ئەوەش قسەی باش دەكا، قسەی باش دەكا، هەر كارمەندێك، هەر وەزیرێك، هەر حیزبێك، دەبێ وەك خۆی هەڵبسەنگێنرێ، نە حیزبەكان هەموویان وەك یەكن، نە وەزیرەكان هەموویان وەك یەكن، نە پەرلەمانتارەكان هەموویان وەك یەكن، نە مەلایەكان هەموویان وەك یەكن، چاكی هەموو توێژەكان چاكە و، خراپی هەموو توێژەكان خراپە، دایكمان عائیشە خوا لێی رازی بێ، قسەیەكی جوانی هەیە لەوبارەوە، دەڵێ: (الشعرُ قَولٌ، حَسَنُهُ حَسَنٌ وقَبیحُهُ قَبیحٌ)، شیعر قسەیەكە چاكەكەی چاكە و خراپەكەی خراپە، مرۆڤەكانیش مرۆڤن، ئەوانەیان كە باشن، باشن و، ئەوانەش كە خراپن، خراپن، نابێ تۆ خراپ و باش هەموویان پێكەوە حەشر بكەی و، بەهۆی خراپەكانەوە چاكەكانیش باجەكە بدەن.

**دانـا: مامۆستا! حاشا لە ڕووی جەنابت و بینەران كە ئێستا بینەر و بیسەری بەرنامەكەن، بەڵام ئێستا بەشێك لە شەقام و لایەنەكانی تر، ئەوەی كە جەنابت ئەفەرمووی بەرپرسی سەرەكییە، بە دز ناوی ئەبا، لایەنەكانی تر بە شەریكی دز، ناو ئەبا.**

**مامۆستا:** باسمكرد، پێمخۆش نەبوو شتەكە بە زەقیی بڵێم، باسمكرد، كە ئەوە قسەیەكی بێ مانایە، ئنجا ئەو كەسە كە وا دەڵێ و، خەڵك تۆمەتبار دەكا، دیارە لە هەمبانەی خۆیدا گوێز دەژمێرێ، دەبێ بۆ خۆی جۆرێك لە شەراكەتی لەگەڵ ئەو دزانە هەبێ، ئەگەرنا چۆنت زانی، هاتووی لێ بكۆڵیەوە، خوای پەروەردگار دەفەرمووێ:

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا ضَرَبۡتُمۡ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ فَتَبَيَّنُواْ ﴾ [النساء : ٩٤]

ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! ئەگەر لە ڕێی خوادا دەرچوون (بۆ بانگەواز یان بۆ جەنگ و جیهاد) چاوڕوونبكەنەوە. نابێ هەر لە خۆوە خەڵك تۆمەتبار بكەی، خوای دادگەر دەفەرموێ:

﴿ إِن جَآءَكُمۡ فَاسِقُۢ بِنَبَإٖ فَتَبَيَّنُوٓاْ ﴾ [الحجرات : ٦]

ئەگەر فاسقێ هەواڵێكی بۆ هێنان، روونی بكەنەوە، خوێندراویشەتەوە: (فَتَثَبَّتُوا)، یانی: دەبێ چەسپاو بی، نابێ هەر لە خۆڕا قسە بكەی، ئەوەش بۆ هەموو كەس هەر وایە، دەبێ تۆ چاووڕوونبكەیەوە، بەرپێی خۆت ببینی، ئەو كەسە كە وا دەڵێ دەبێ بەر لەوەی ئەو قسە زلە بكات: یەك بەیەك لەو حیزبانە بكۆڵێتەوە، بودجەیان چەندە؟ چۆنیان كردوە؟ چییان بەدەستە؟ ...هتد. ئەگەرنا قسەكەی نەزانانەو نەفامانەیەو ئەوەیە دەڵێ: (ماڵی قەڵب سەر بە خاوەنیەتی) ئەو مەلایە كە ئەو قسەیە دەكات، ئەو ڕاگەیاندنكارەی ئەو قسەیە دەكات، ئەو سیاسییەی ئەو قسەیە دەكات، دەزانی ئەوە خزمەت بەكێ دەكات؟ ئەوە خزمەت بەو كەسانە دەكات، كە دزیی دەكەن و گەندەڵیی دەكەن، ئەوان ئەو قسەیان پێ خۆشە، هەر بۆیەش تۆ تەماشا بكە! جاری وایە مەلایەك لەسەر قسەیەك دەكوژرێ، فەصڵ دەكرێ! هێرشی دەكرێتە سەر! ئەدی بۆچی مەلایەكی ئاوا كەس لە بەرپرسان و بڕیار بەدەستان هیچی پێ ناڵێ؟! چونكە دزە گەورەكان، گەندەڵكارەكان، قۆرخكارەكان، دەڵێن: كاكە مەلا (.....) ئێمەشی یەكسانكردەوە لەگەڵ ئەو خەڵكەی دیكەدا، كە دەزانن بێ خەتان، پاكن، بۆیە هیچ كاردانەوەیان نیە بۆ ئەوان، كاردانەوەیان هەیە بۆ خەڵكی دی، بەڵام كارادنەوەیان نیە بۆ وی، چونكە دەڵێن: ئەو قسەیە بە قازانجی خۆمانە، بۆیە من لێرەوە دەیڵێم: ئەو جۆرە گشتاندنەو ئەو جۆرە تێوەردانەی خەڵك بەناحەق لە زوڵم، لە گەندەڵیی، كە دەستی تێیدا نیە، ئەوە بە قازانجی ئەو بارودۆخە لارە تەواو دەبێ، بۆیەش بێدەنگیی دەكرێ لە بەرامبەر ئەو جۆرە قسانەدا، من پەرۆشی ئەو جۆرە مەلایانەشمە، چونكە كەسێك قسەی وا دەكات، ئنجا ئەگەر

بانگخوازێكە، ئەگەر مەلایەكە، ئەگەر ڕاگەیاندنكارێكە، ئەگەر سیاسییەكە، ئەو كەسەی كە قسەی بێ ئینصافانە دەكات، نیشانەی پرسیار دەخاتە سەر خۆی و، خۆشیی گوناهبار دەكات و خۆیشی عەیبدار دەكات.

**دانــا: مامۆستا! فەرمووت: ئەم بارودۆخە لە ڕووی ئابووریی، سیاسی، كۆمەڵایەتیی، حوكمڕانیی یەوە، تێكدراوە، ئەپرسم: پیاوی عاقڵ، بڕیاربەدەستی عاقڵ بۆچی بارودۆخ لە خۆی تێك ئەدات، هۆكاری چییە تێكی ئەدات؟**

**مامۆستا:** جارێ با من ئەم ئایەتە موبارەكەت بۆ بخوێنمەوە، كە باسی ئەوە دەكات: چۆن كەمێك دەگونجێ بارودۆخێك تێك بدات:

﴿ وَٱتَّقُواْ فِتۡنَةٗ لَّا تُصِيبَنَّ ٱلَّذِينَ ظَلَمُواْ مِنكُمۡ خَآصَّةٗۖ وَٱعۡلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ شَدِيدُ ٱلۡعِقَابِ ٢٥ ﴾ [الأنفال: ٢٥]

خوا دەفەرموێ: خۆتان لە ئاژاوەیەك بپارێزن، لە بەڵایەك بپارێزن، كە تەنیا تووشی ستەمكارەكانتان نایەت و، بزانن كە خوا تۆڵەی توندە.

ئایا مەبەست چییە؟ ئێستا ئەم وڵاتە چەند كەس لێی بەهرەمەندە لەو گەندەڵییە، چەند كەس لەو زوڵم و ستەمە، چەند كەس لەو تێكدانی دامەزراوەكان، چەند كەس لێی بەهرەمەندە، كەسانێكی كەمینەن بە تەئكید، بەڵام زۆرینە لێی زەرەرمەندە، خوا بەزۆرینەكە دەفەرموێ: خۆتان بپارێزن ئەی خەڵكەكە! لە بەڵایەك كە تەنیا تووشی ئەوانەتان نایەت كە خراپەیان كردوە، بەڵكو هەمووتان باجەكەی پێكەوە دەدەن، كوردەواریی خۆمان دەڵێن: (ئەگەر ئاگر بەربووە لێرەوارێك تەڕو وشكی پێكەوە دەسووتێ) هەمووی پێكەوە باجەكە دەدات.

**دانــا: وتم پیاوی عاقڵ بۆ تێكی ئەدا، یانی سوودەكەی لە چیدایە؟**

**مامۆستا:** بێمە سەر وەڵامی پرسیارەكەت: دەزانی سوودی ئەو بڕیار بەدەستانە لە تێكدانی ئەم دۆخە ئیسفادەكەی لەچیدایە؟ پەندی كوردیی زۆر باش باشمان

هەن، پەند باشییەكەی لەوەدایە، یەك بار مەعنات بۆ كۆدەكاتەوە لە چەند وشەیەكی كورتدا، پێشینان دەڵێن : (ڕاوچی خراپ لە ئاوی لێڵدا ڕاو دەكات) هێندە كارامە نیە ئاوەكە ڕوون بێ، ماسییەكان ببینن، ئنجا ڕاویان بكات، پێی خۆشە ئاوەكە لێڵ بێ و ماسییەكان نەبینن، ئەوجار ئەو زەفەریان پێ دەبات، یان دەڵێن: (دز بازاڕی ئاڵۆزی دەوێ) كەسێك بیەوێ دزی بكا، ئەگەر بازاڕەكە ئاڵۆز نەبێ، هێمن و ئارام بێ، دزیی بكا دیارە، بەڵام ئەگەر بوو بە پاشاگەردانیی ئەوەش لە پەنایەك بۆ خۆی دەستدەداتێ!

دەبێ ئێمە لەوە هۆشیارتر و وریاتر بین و بزانین كە ئەو شێوە ئیدارەدانی ئەم وڵاتە، ئەوە نەبووە تەنیا نەزانیی لە پشتەوە بێ، بەڵێ من دەزانم: گەلی كورد كە نەهێڵراوە، زۆر لە مێژە نەهێڵراوە خاوەنی قەوارەی سیاسی خۆی بێ، لە هەموو بەشەكانی كوردستان دا، دەزانم ئەزموونی حوكمڕانییمان، بێ هێزە، بەڵام ئێمە ئەوە بیست و پێنج ساڵە ئەم قەوارە سیاسییەمان هەیە، ئەو بەڕێزانە هەر فێر نەبوون! بەتایبەت كە زۆربەشیان لەو وڵاتانی ڕۆژئاوا بوون، كە پێیان هەڵا دەڵێن: شاخیان وا و باڵیان وا و، ڕاست و چەپیان، كە ڕاستە لە زۆر ڕووەوە، ئەدی بۆ لێیانەوە فێر نەبوون؟ كەواتە: مەسەلەكە هەر نەزانیی نیە، ئینسان دوو هێزی هەن:

أ- هێزی زانین.

ب- هێزی توانین.

حاڵیی بوون و تێدا بوونە حاڵ وەك زۆر جار لە كتێبەكانی خۆمدا باسی دەكەم، ئینسان بەوەندە چاك نابێ بزانێ، بەڵكو دەبێ زانینەكەی بگۆڕێ بۆ توانین، هەر بەوەندە چاك نابین، حاڵیی بین، بەڵكو دەبێ لە خۆشماندا بیكەینە حاڵ، بەڵام بۆچی نایكەن بە حاڵ؟ وەك بابایەك كە جگەرە دەكێشێ، دەزانێ كە زیانی لێ دەدا، بەڵام بۆچی دەیكێشێ؟ نەفس و ئارەزووی بەسەریدا زاڵە، ئەگەر بە عەقڵ و مەنتیق ئیش بكا، نابێ بیكێشێ، بەڵام نەفس و ئارەزووی بەسەریدا زاڵە، كەسێك شەڕاب دەخواتەوە، كەسێك كە مادده سەرخۆشكەرەكانی

دیکە بەکار دێنێ - تریاك و هێرۆیین - دەزانێ دایدەڕزێنێ، بەڵام بۆچی؟ ئارەزووی نەفس بەسەریدا زاڵەو بە عەقڵ و مەنتیق بەڕێوە ناچێ، من پێموایە ئەو جۆرە کەسانە بەرژەوەندیی تەسکی حیزبیی، بەرژەوەندیی تاکیی، بەسەریاندا زاڵەو، کوێری کردوون لە بەرامبەر خوا و خەڵکدا، ئنجا ئەم وەزعە بۆ ئەوان عەیبی تێدا نیە، ئێستا خەڵك خۆپێشاندان ناکەن، نارەزایی دەرنابڕن؟ کەسانێك هەن، مێش میوانیان نیە، بۆچی؟ وەزعەکە بۆ ئەوان عەیبی تێدا نیە، چ ئەوانەی بڕیاربەدەستن، چ ئەوانەی لەو بڕیاربەدەستانە بەهرەمەندن، ئاخر خەڵکێکیش تێیان ورووکاوە، خەڵکێکیان لەخۆوە ئاڵاندوە، لێیان بەهرەمەندن، دەڵێ: ئەو خەڵکە بۆچی وا دەکا؟ دەڵێن: کاتی خۆی لە جەزائیر خەڵك خۆپێشاندانی کردوەو برسی بووە، هاوسەری ئەو کابرا فەرەنسییە کە لەوێ بووە، ئەو کاتە جەزائیر موستەعمەرەی فەرەنسا بووە، خێزانەکەی گوتوویەتی: ئەوە چییە ئەو خەڵکە بۆچی خۆپێشاندان دەکەن؟ گوتوویانە: نانیان نیە، برسییانە، گوتوویەتی: ئنجا نانیان نیە، با پاقلاوەی بخۆن، با پاقلاوە بخۆن، ئاخر کابرا نانی نەبێ، پاقلاوەی لە کوێ بوو، بۆیە دەڵێ: (تێر ئاگای لە برسی نییە) ئنجا ئەوەی بڕیاربەدەستە و چەند ملیاری وەسەریەك ناوە، ئەوە هیچ، خەڵکێکیش هەیە لەوانەوە ئاڵاوە، لە خۆیانەوە ئاڵاندوە، ئەوانیش شتێکیان دەدەنێ، ئەویش دەڵێ: ئەو خەڵکە هار بووە، بۆچی خۆپێشاندان دەکات! چینی مامۆستایان پڕ بەدڵ بەزەییمان پێیاندا دێتەوە، ئەو مامۆستایانە هەموو ڕۆژێ بەو سەرمای زستانە، لەسەر ئەو جادەو شەقامانەن، داوای موچە و معاش و ژیانی خۆیان دەکەن، نابێ کارێکی وا بکەین دەرس بە قوتابییەکانمان بڵێن؟ ئینسان نابێ ڕەحم و ویژدانی هەبێ، ئەوانەی وەبیر بێتەوە، برادەر! تۆ هەر حیزب و خزمەکەی خۆت تۆزێ هەڵگووشە، چەند ملیارێکیان لێوەربگرەوە، زۆر لە مامۆستایەکان و لە کارمەندەکان و لە هەموو ئەوانە زیاددەبێ، کە خزمەتی ئەو خەڵکە دەکەن! بۆچی وا ناکەن؟ وەك گوتم: بەرژەوەندییە تاکییەکەیە، بەرژەوەندییە حیزبییەکەیە، ناهێڵی پاشان نەترسان لە خوا و لە قیامەت، بێ باك بوون و بێ منەت بوون لە لێپرسینەوەی خوا، لەخۆ ئەمین بوونیش، بەرانبەر ترسی خەڵك، دەڵێن: خەڵك با هەر خۆپێشاندان بکات! ئاخر برادەر! دەبێ بیری

لێ بكەیەوە بە وردیی، ئەو خۆپێشاندانە، ئەو مانگرتنە، ئەو تووڕەیی و بێزارییە، ئەو خەڵكە دوعا دەكات، دەپاڕێتەوە، پاشان تۆ دەبێ تەماشای دەوروبەری خۆت بكەی، هەر لە خۆپێشاندان و ناڕەزایی و مانگرتنەوە، دەگۆڕێ بۆ شتی دی! زۆر جار گوتوومە، با خەڵك نائومێد نەكەین، نائومێدیی هەموو شتێ بە مرۆڤ دەكات، ئەوانەی كە خۆیان دەكوژن، مەبەستم لە داعش و ماعش و ئەوانە نیە، هەر خەڵكی دیكە كە خۆیان دەكوژن، دەستی دەچێتە ڕووحی خۆی، لەبەرئەوەی نائومێد بووە، گەیشتووەتە بنبەست، نائومێدیی زۆر خراپە، با خەڵك نائومێد نەكرێ، با چیدیكە ئەو بەرژەوەندییە تەسكیە ناشەرعییانە، لێمان نەبنە چاوپێچكێك واقیعەكە نەبینین و، وە واقیعەكەمان لێ بشارنەوە، چونكە بێگومان ئێمە بەرپرسیارین، بەرامبەر بە خوا و بەرامبەر بە خەڵكی خۆمان، بە تەئكید خەڵكیش دوای ئەوەی دەگاتە نائومێدیی و دەگاتە بنبەست، بیر لە هەر شتێكی دیكە دەكاتەوە، كە پێی وابێ بە مافەكانی خۆی دەگەیەنێ.

**دانـا: مامۆستا! ئەگەر كەمینەیەك لە كۆمەڵگایەكدا خەریكی تێكدان بن، كێ و چۆن دەستی ئەو كەمینەیە بگیرێ؟**

**مامۆستا:** خوای پەروەردگار لە قورئاندا زۆر باسی فەرمان بە چاكە و نەهی لە خراپەی كردوە، بۆ وێنە: لە سوورەتی (التوبة)دا فەرمانكردن بە شتە پەسەندەكان و، ڕێگریی كردن لە شتە ناپەسەندەكان، دەكات بە صیفەتی هەموو ئیمانداران، پیاو و ئافرەتەوە، بەبێ هەڵاواردن:

﴿ وَٱلۡمُؤۡمِنُونَ وَٱلۡمُؤۡمِنَٰتُ بَعۡضُهُمۡ أَوۡلِيَآءُ بَعۡضٖۚ يَأۡمُرُونَ بِٱلۡمَعۡرُوفِ وَيَنۡهَوۡنَ عَنِ ٱلۡمُنكَرِ وَيُقِيمُونَ ٱلصَّلَوٰةَ وَيُؤۡتُونَ ٱلزَّكَوٰةَ وَيُطِيعُونَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥٓۚ أُوْلَٰٓئِكَ سَيَرۡحَمُهُمُ ٱللَّهُۗ إِنَّ ٱللَّهَ عَزِيزٌ حَكِيمٞ ٧١ ﴾ [التوبة : ٧١]

واتە: پیاوانی بڕوادار و ئافرەتانی بڕوادار، هەندێكیان دۆست و پشتیوانی هەندێكیانن، هەندێكیان مشوورخۆری هەندێكیانن، (چی دەكەن؟) فەرمان بە هەرچی شتی پەسەندە دەكەن، {(المعروف) (أل)ی (تعریف)ی لەسەرە، كە

لێرەدا مانای (جنس)ی چاكەیە، هەرچی شتی پەسەندە، چ پەیوەندیی بە لایەنی عەقیدەوە هەیە، چ لایەنی فیكرەوە، چ لایەنی ڕەوشتەوە، چ لایەنی خێزانیی، چ لایەنی ئابووری، چ لایەنی سیاسیی، چ لایەنی كۆمەڵایەتیی یەوە هەبێ هەمووی دەگرێتەوە}و ڕێگریی دەكەن لەهەرچی شتی ناپەسندە (ئەویش دیسان لە هەموو بوارەكاندا ) و نوێژ بەرپا دەكەن و زەكات دەدەن {كەواتە: وەك چۆن نوێژ و زەكاتیان لەسەر فەرزە لەسەر موسڵمانان، فەرمانكردن بە چاكە و ڕێگرتن لە خراپەشیان لەسەر فەرزە}.

(وَيُطِيعُونَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥٓۚ ) فەرمانبەریی خوا و پێغەمبەری خواش دەكەن.

(أُوْلَٰٓئِكَ سَيَرۡحَمُهُمُ ٱللَّهُۗ ) ئا ئەوانە خوا بەزەیی پێیدا دێ، ئەوەی وانەبێ، خوا بەزەیی پێیدا نایەت. (ان الله عزیز حكیم) بەدڵنیایی خوا زاڵی كارزانە.

**دانـــا: بەچ میكانیزمێك؟ بە چ شێوازێك ئەو ئەمرو نەهییە بكرێ؟**

**مامۆستا:** بەوەی كە تەماشای ئەم ڕۆژگارە بكرێ، تەماشای ئەو بەشەرە بكرێ، تەنیا ئێمە لەم سەرزەوییە ناژین، ئەو هەموو وڵاتانەی دنیا، ئەوان وەختێك لە دەسەڵاتداران و حوكمڕانەكانی خۆیان توورە دەبن، چیی دەكەن؟ وەختێك لێیان نارازیی دەبن، چی دەكەن؟ ناڵێن: شێوازی شارستانیی! ئەو شێوازی شارستانیی ئا ئەوەیە كە خوای زاناو شارەزا فەرمانی پێ دەكات، فەرمان بە چاكە و ڕێگریی لە خراپە: خۆپێشاندانە، مانگرتنە، نووسینە، كۆبوونەوەیە، گردبوونەوەیە، كاری ڕاگەیاندن، سیمینار بەستنە، هەمووی دەگرێتەوە، بەڵام ئیسلام لەگەڵ ئەوەدا نیە، لەگەڵ تێكدانی هێمنی و ئاسایشدا نیە،چونكە هەر خەڵكەكە بۆ خۆیان زەرەرمەند دەبن، پێش هەموو كەس،هەروەها لەگەڵ ئەوەدا نیە كە دەستدرێژیی بكرێتە سەر موڵك و ماڵی تایبەتی یان گشتی، چونكە بارودۆخ بەوە چاك نابێ، بەڵام خەڵك حەقی خۆیەتی وەك لەو وڵاتانە دەیبینین، بەشێوازی هێمنانە نارەزایی دەربڕێ، بەڵام لێرەدا جێی سەرنج ئەوەیە كە لە وڵاتان،بیستوومە دەڵێن منداڵێك لە حەدیقەیەك گوڵێكی پچڕاندوە، وەزیرێك كە تایبەت بووە بەو كارەوە، دەستی لە كار كێشاوەتەوە، گوتوویەتی: دیارە نەمتوانیوە

ئەو خەڵكە تێ بگەیەنم! خۆپیشاندان دەكرێ حكومەت هەڵدەوەشێتەوە لەو وڵاتانە، خۆپیشاندان دەكرێ، هەر زۆر بە ئاسانیی، وەزیر دەستلەكار دەكێشێتەوە، ئێمەش مێش میوانیان نیە!!

**دانـــا: باشە ئەو خەڵكە چی بكا؟ ئەو ڕێكارە مەدەنییەش ئەگرێتە بەر، چی بكا دوای ئەوە؟**

**مامۆستا:** من هەر ئەوەندە دەڵێم: كە ئەو جۆرە مامەڵە كردنە لەگەڵ تووڕەیی خەڵك، لەگەڵ خۆپیشاندان، لەگەڵ مانگرتنی خەڵك، لەگەڵ ئەو ناڕەزایی دەربڕینانە شارستانییانەی خەڵك، ئەو جۆرە مامەڵەكردنە كەمتەرخەمییانە، ئەو ساردو سڕیی و بێ خەمییە، وا دەكات لە خەڵك كە بیر لە شتی دیكەی ناشارستانیی بكاتەوە، من وام دێتە بەرچاو، ئەوە میصر و، ئەوە یەمەن و، ئەوە لیبیا و، ئەوە سووریا و، ئەوە توونس و، ئەوە وڵاتانی دیكەش ئەوەشمان لەبەر چاو بێ، شتێكی هێندە دوور نیە، هەر لەو واقیعی چەند ساڵی ڕابردووی خۆمان دا بینیمان، لە سووریا خەڵك خۆپیشاندانی دەكرد، پێشێ داواكارییەكانیان زۆر سادە بوون، دوایی كە جوابیان نەدرایەوە، ئەوجار لێیان هەستان، دوایی كە بە توندیی لەگەڵیان ڕووبەڕووبوونەوە، بوو بەو قەسابخانەیەی كە ئێستا خۆمان دەیبینین، بۆیە وەك (السعید من اتَّعظ بغیره) بەختەوەر كەسێك پەند لە غەیری خۆی وەربگرێ، نەوەك بەڵا تاكو بەسەر خۆی نەیەت، بەخەبەر نەیەت، ئومێدم وایە كە بڕیاربەدەستانی ئەم وڵاتە، ناڵێم پێنج حیزب و چەند حیزب، بڕیاربەدەستانی ئەم وڵاتە، ئەوانەی كە سیاسەت و ئابووریی ئەم وڵاتەیان بەدەستە، هێزی ئەم وڵاتەیان بەدەستە، دیبلۆماسیەت و پەیوەندییەكانی ئەم وڵاتەیان بەدەستە، خۆیان بە خاوەنی (عباد و بلاد) دەزانن، كە واش نیە، نە لەڕووی عەقڵیی و نە لە ڕووی شەرعییەوە، هەر كەسە خاوەنی خۆیەتی و، هەر كەسەش بەقەدەر خۆی خاوەنی ئەو نازو نیعەمەتەیە كە خوا بۆی دروستكردوە، ئەوانە كە خۆیان ئاوا بیردەكەنەوە، با بەدەم داواكاریی خەڵكەوە بێن، ئنجا مامۆستایانن، كارمەندانن، كرێكارانن، جووتیارانن، گەنجەكانن، ئافرەتانن، هەموو چین و توێژەكان، ئەدی تۆ بەرپرسی كێی، تۆ خۆت بە كێ وە هەڵدەكێشێ، بەو خەڵكەوە ئەم هەرێمی

كوردستانە، هەرێمە، بە مامۆستایەكەیەوە، بە كارمەندەكەیەوە، بە قوتابییەكەیەوە و، بە گەنجەكەیەوە و بەپیرەكەیەوە و، بەبێ كارەكەی و بەوانەوە، ئێمە ئەم هەرێمەین، ئەدی نابێ بیر لەوە بكەینەوە، كە ئەو خەڵكە لە خۆمان ڕازی بكەین، پێش ئەوانیش خوای پەروەردگار لە خۆمان ڕازی بكەین، بۆئەوەی ئەوان بیر نەكەنەوە لە شتێك، كە دوایی بە زیانی هەمووو لایەك تەواو دەبێ و، ئەوەی لێی بەهرەمەندە، تەنیا دوژمنان و ناحەزانی ئەم خەڵك و وڵاتەن؟!

**دانـــا: وەك هەمووو جارێك جەنابت ئەفەرمووی، كورتەی قسان: پەند وەربگرین، نەك ببینە پەند بۆ خەڵكی تر.**

**مامۆستا:** ئومێدم وایە كە ئێمە لەوانەبین، كە پەند لە غەیری خۆیان وەردەگرن نەك غەیری خۆیان پەندیان لێوەرگرن.

**دانـــا: بەڵێ، زۆر بەڕێز مامۆستا عەلی باپیر نووسەر و ڕووناكبیر! سوپاس بۆ ئەوەی كە وەڵامی پرسیارەكانی ئەم ئاڵقەیەی ئێمەت دایەوە.**

**مامۆستا:** سوپاس بۆ ئێوەش، خۆشحاڵ بووم، دووبارە بەخێر بێن.

**دانـــا: سوپاس، ئازیزان و خۆشەویستان تا ئاڵقەیەكی نوێی بەرنامەی بەدانایی، هەمووو لایەك بەخوای گەورە ئەسپێرم، كوردستانێكی ئاوەدان و ئارام بۆ هەمووو لایەك، خواتان لەگەڵ.**

# ئاڵقەی پــازدەیەم

## بنەمای چواردەیەم: هۆكاری بنەڕەتیی سەركەوتن و شكستمان، خۆمانین، نەك دەوروبەری خۆمان.

ameer.maktab@yahoo.com

 /AliBapir  /AliBapir  /MediaAmeerOffice

www.alibapir.net

دانــا: بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان، سڵاوتان لێ بێ بینەرانی ئازیز و خۆشەویستی كەناڵی ئاسمانی پەیام! خۆم بە خۆشحاڵ ئەزانم خوای پەروەردگار دەرفەتی پێبەخشینەوە، لە ئاڵقەیەكی نوێی بەرنامەكەتان، بەرنامەی بەدانایی دا لە خزمەت میوانە هەمیشەییەكەمان بەڕێز مامۆستا عەلی باپیر نووسەر و ڕووناكبیر، بە ئێوەی ئازیز و خۆشەویست شاد ببینەوە.

بێگومان لەم ئاڵقەیەدا دەچینە سەر شرۆڤەكردنی یەكێكی تر لەو چەمكانەی كە بەڕێز مامۆستا عەلی باپیر لەو بابەتەی خۆیدا بەناوونیشانی: (بۆ چاككردنی ئەم دۆخەی هەرێم، با گوێ لە قورئان بگرین)، لە بنەمای چوارەدەدا ئاماژە بەوە ئەكا: {هۆكاری بنەڕەتیی سەركەوتن و شكستمان، خۆمانین، نەك دەوروبەرمان} بزانین جەنابی مامۆستا لە چ ڕوانگەیەكەوە ئەم چەمكەی نووسیوە و مەبەستی چییە لەم چەمكە؟

بەڕێز مامۆستا سڵاوی خوات لێ بێ! سوپاس بۆ ئەوەی كە دەرفەتت پێ بەخشین، لەم ئاڵقەیەدا بە خزمەتت بگەینەوە.

**مامـۆسـتا:** سـڵاوی خـوا لە ئێوەش بێ كاك دانا، هەم جەنابت، هەم هاوكارانت، بەخێربێن سەرچاو.

دانــا: زۆر سوپـاست دەكەین مامۆسـتا، جەنابی مامۆسـتا لەسەر ئـەو چەمـكەی ئاماژەت پێكردوە، هۆكاری بنەڕەتیی هەم سەركەوتن و هەم شكستەكان، خۆمانین، نەك دەوروبەر، حەز دەكەم ئێمە و بینەران بەرچاوڕۆشن بكەی، مەبەستت چییە لەم چەمكە؟

**مامۆستا:** الحمد لله، وصلى الله تعالى وسلم وبارك على رسول الله محمد وآله المهتدين بهداه، ربنا آتينا من لدنك رحمة وهيء لنا من أمرنا رشدا.

خوای پەروەردگار وەك چۆن چەند یاسایەكی شەرعیی بۆ ناردووین لە كتێبی خۆیدا، لە قورئانی بەرز و بەپێزدا، چەند یاسایەكی گەردوونییشی داناون لە ژیانی بەشەردا، كە بوونەوەر و مرۆڤ و هەموو دروستكراوەكانیان

پێ بەڕێوەدەچن، وشەی (یاسا گەردوونییەكان) (القوانین الكونیة) خوا سبحانە وتعالی بە (سنة) ناوی هێناوە، كۆیەكەشی (سنن)ە، لە چەند شوێن لە قورئاندا خوا سبحانە وتعالی باسی (سنة) خۆی و (سنن)ی خۆی كردوە لە ژیانی بەشەر و لە كۆمەڵگایەكاندا، بۆ وێنە:

١- خوا دەفەرموێ: ﴿ سُنَّةَ ٱللَّهِ فِي ٱلَّذِينَ خَلَوۡاْ مِن قَبۡلُۚ ﴾ [الأحزاب: ٣٨]

واتە: ئەوە یاسای خوایە لەو كۆمەڵگایانەدا كە پێشتر ڕابردوون.

٢- هەروەها خوا دەفەرموێ: ﴿ قَدۡ خَلَتۡ مِن قَبۡلِكُمۡ سُنَنٞ فَسِيرُواْ فِي ٱلۡأَرۡضِ فَٱنظُرُواْ كَيۡفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلۡمُكَذِّبِينَ ١٣٧ ﴾ [آل عمران: ١٣٧]

لە پێش ئێوەدا چەند یاسایەك تێپەڕیون، (واتە: چەند یاسایەكی خوا جاری بوون، جێبەجێ بوون، لە ژیانی بەشەردا، لە كۆمەڵگایەكاندا) بە زەویدا بڕۆن (مێژوو بخوێننەوە، یاخود شوێنەواری پێشینەكان ببینن)، سەرنج بدەن بزانن ئەوانەی كە پێغەمبەرانی خوایان بە درۆ دانا، سەرەنجامیان چۆن بوون!

یەكێك لە یاسا گەردوونییەكانیش ئەو بنەمایەیە كە من كردوومە بە بنەمای چواردەیەم لەو بیست و پێنج بنەما قورئانییە كە هەڵم هێنجاون، كە پێموایە ئەگەربێتو ئەو بیست و پێنج بنەمایە، كە ژمارەیەكن لە بنەما قورئانییەكان، ئێمە ڕەچاویان بكەین، دەتوانین كۆمەڵگای خۆمان وە واقیعی خۆمان بە هەرێمەوە، بە عێراقەوە، لەو واقیعە نەخوازراوەی كە تێی كەوتوە، دەربازی بكەین، ئەویش بریتیە لەوە كە ئێمە چ بۆ دەربازبوون لە كەموكوڕییەكان و لە بارودۆخێكی نەخوازاراو و نەگونجاو و، گۆڕان بەسەر خۆدا هێنان، دەبێ بگەڕێینەوە بۆ خۆمان، چ كاتێك كە تووشی بەڵاو گرفتێك دێین، دیسان پێویستە بگەڕێینەوە بۆ خۆمان و خەتای خۆمان بگرین، ئەوەش كە من كردوومە بە بنەمای چواردەیەم، نەك هەر مەفهووم و واتای، بەڵكو (منگوق) بێژراوی ژمارەیەك لە ئایەتەكانی خوایە، كە خوا سبحانە وتعالی لە قورئاندا بەیانی كردوە و، وەك یاسایەكی خۆی.

جیاوازیی نێوان یاسا شەرعییەکان و یاسا گەردوونییەکانیش ئەوەیە، کە یاسا شەرعییەکان بە ئیرادەی مرۆڤەکان دەچەسپن، بۆ وێنە: خوا سبحانە وتعالی دەفەرموێ: سوودخۆریی قەدەغەیە، زینا قەدەغەیە، قەتڵ قەدەغەیە، دزیی و ڕێگریی قەدەغەن، نوێژ واجبە، دادگەریی واجبە، دڵسۆزیی بۆ خەڵك واجبە، ڕەحم و بەزەیی لەگەڵ خەڵکدا واجبە، ئنجا ئەوانە چ قەدەغەکان، چ واجبەکان بە ئیرادەی مرۆڤەکان دێنەدی، بەڵام یاسا گەردوونییەکان پەیوەندییان بە ئیرادەی مرۆڤەکانەوە نیەو بەبێ ئیرادەی مرۆرڤەکان لەکاردان واتە: خوای کارزان وای داناون، بۆ وێنە: گەردیلە کە لەو سێ پێکهاتە سەرەکییەی خۆی پێکهاتوە: نیوتۆن و پرۆتۆن لە نێوکی گەردیلەداو، ئەلیکترۆن لە سوڕگەکەی دا، کە بە دەوری نێوکەکەیدا دەخولێتەوە، خوای باڵادەست چەند یاسایەکی بۆ گەردیلە داناون، هەروەها دروستکراوەکانی دیکەش تا دەگاتە کەهکەشانەکان و گەلە کەهکەشانەکان، کە ژمارەیەك کەهکەشان شتێکی گەورەتر لە خۆیان پێکدێنن، هەموو ئەوانە بەپێی یاسا گەردوونییەکانی خوا بەڕێوە دەچن، بەبێ ئەوەی کە ئیرادەی مرۆڤ دەستی تێیاندا هەبێ.

هەروەها یەکێ لە یاسا گەردوونییەکانی خوا لە ژیانی بەشەردا ئەوەیە، کە مرۆڤەکان بەهۆی خۆیانەوە تووشی خێر دێن، یان تووشی شەڕ دێن، بەڵێ جاری وا هەیە هۆکارە دەرەکییەکانیش کاریگەرییان هەیە، بەڵام هۆکارە دەرەکییەکانیش کە کاریگەرییان هەیە، چ بە باری ئەرێنیی دا، چ بە باری نەرێنییدا هەر هۆکارە خۆدییەکان زەمینەیان بۆ خۆش دەکەن، بۆ وێنە: نەخۆش بوونی مرۆڤ، دیارە حاڵەتێکی نەخوازراوە و نەگونجاوە، ئینسان تووشی بێت، هەر جۆرە نەخۆشییەك بێت، بۆ نمونە: نەخۆشی سەرمابوون، ئەو نەخۆشییانەی لە سەرمابوون، پەیدا دەبن هەڵامەت و کۆکە پاشان دەبێتە ئیلتیهابی سینگ و قوڕگ، لە چی پەیدا دەبێ؟ بە تەئکید نەخۆشییەکە چ ڤایرۆسیی بێت، چ هۆکارەکەی بەکتریا و میکرۆب بێ، کاتێك ئەو ڤایرۆس و بەکتریایە، زەفەر بە مرۆڤ دەبات، کە جەستەی مرۆڤ ئامادەیی پەیدا بکات، بێ هێزییەکی تێدا هەبێ، ئەگەرنا ڤایرۆسەکان هەر هەن، میکرۆبەکان هەر هەن، بە بەڵگەی

ئەوە كە دوو كەس لە شوێنێكدان بەیەكەوە لە یەك شوێن، یەكێكیان تووشی ئەو نەخۆشییە دێ، ئەودیكەیان تووش نایەت، لەبەرئەوەی ئەویدیكەیان كە تووش نەهاتوە، جەستەی هێزی بەرگریی و بەرهەڵستیی زیاترە، كەواتە: هۆكارە دەرەكییەكە كاریگەریی هەیە، بەڵام ئەوەی كە زەمینەخۆش دەكات بۆ هۆكارە دەرەكییەكەش دیسان هۆكارە نێوخۆییەكانن، جەستە لەنێو خۆیدا.

ئنجا ئەگەر شتەكە بگەوازینەوە بۆ واقیعی سیاسیی و كۆمەڵایەتیی و ئابووریی ئێستای هەرێمی كوردستان، خوا سبحانە وتعالی لە زۆر ئایەتدا، ئاماژە بەو یاسا گەردوونییەی خۆی دەكات، بۆ وێنە:

١) دەفەرموێ: ﴿ وَمَآ أَصَٰبَكُم مِّن مُّصِيبَةٍ فَبِمَا كَسَبَتْ أَيْدِيكُمْ وَيَعْفُوا۟ عَن كَثِيرٍ ﴿٣٠﴾ ﴾ [الشورى : ٣٠].

واتە: هەر بەڵایەكتان تووش بێ، بەهۆی كردەی دەستی خۆتانە، زۆرجاریش چاوپۆشییتان لێ دەكات، واتە: زۆرجاریش ئەو یاسایە ناچەسپێ و خوا لوتفتان لەگەڵ دەكات، ئنجا ئەو یاسایەش كە ناچەسپێ دیارە پەرچێكی دێتە بەرێ.

٢) ئەویش دیسان هەر بەپێی یاسایەكی دیكەی گەردوونیی خوا دەفەرموێ:
﴿ ظَهَرَ ٱلْفَسَادُ فِى ٱلْبَرِّ وَٱلْبَحْرِ بِمَا كَسَبَتْ أَيْدِى ٱلنَّاسِ لِيُذِيقَهُم بَعْضَ ٱلَّذِى عَمِلُوا۟ لَعَلَّهُمْ يَرْجِعُونَ ﴿٤١﴾ ﴾ [الروم : ٤١].

{وشەی (فساد) یانی تێكچوون، تێكچوون و خراپەكاریی هەموو بوارەكان دەگرێتەوە، بواری سیاسیی، ئابووریی، كۆمەڵایەتیی، فیكریی، ئەخلاقیی} واتە: تێكچوون وشكانیی و دەریای داگرت، هەموو لایەكی گرتەوە، بەهۆی كردەی دەستی خەڵكەوە، بۆ ئەوەی بەشێك لە دەرەنجامی كردەوە خراپەكانی خۆیانیان پێ بچێژێ بەڵكو بگەڕێنەوە.

٣- هەروەها لە سوورەتی (آل عمران)دا دەربارەی ڕووداوەكانی جەنگی ئوحود، خوا سبحانە و تعالى دەفەرمویٚ:

﴿ أَوَلَمَّآ أَصَٰبَتۡكُم مُّصِيبَةٞ قَدۡ أَصَبۡتُم مِّثۡلَيۡهَا قُلۡتُمۡ أَنَّىٰ هَٰذَاۖ قُلۡ هُوَ مِنۡ عِندِ أَنفُسِكُمۡۗ إِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٞ ١٦٥ ﴾ [آل عمران: ١٦٥]

واته: ئایا ئێوه كه بەڵایەكتان بەسەرهات و پێشتر دووقاتی ئەوەتان تووشی دوژمن كردبوو، (چ بەڵایەكیان بەسەردا هات لە جەنگی ئوحوددا؟ شەست و پێنج یاخود حەفتا كەسیان لیٚ شەهید بوو، كۆمەڵێكیشیان لیٚ بریندار بوون، لەنێویاندا پێغەمبەری خوا (علیه الصلاة والسلام)، دیارە هاوەڵان خوا لێیان ڕازی بیٚ، سەریان سوڕماوە) گوتتان: ئەوە لەكوێوەو چۆن و بۆچی تێشكاین؟! كە دەفەرمووێ: دووقاتی ئەوەتان تووشی دوژمن كردبوو، یانی: لە جەنگی بەدردا: حەفتاتان لیٚ كوشتبوون و حەفتاشتان لیٚ بەدیل گرتبوون، بەڵام مسوڵمانان یەك دیلیشیان نەبوو، لە جەنگی ئوحوددا، ئەوەی هەبوو هەموویان شەهید بووبوون، هیچیان ئامادەنەبوون تەسلیم بن، (قُلۡتُمۡ أَنَّىٰ هَٰذَاۖ)، ئەوە لە كوێوە بوو؟ وشەی (أَنَّى) هەم بە مانای (من أین) لە كوێوە هات، هەم بە مانای (كیف) واتە: چۆن ئەوەمان بەسەرهات، هەم مانای كەی (متى)ش دیٚ، بەڵام لێرەدا ئەو واتایە ناگونجیٚ، یانی: چۆن ئەوەمان بەسەرهات، لە كوێوە بەسەرمان هات؟! (قُلۡ هُوَ مِنۡ عِندِ أَنفُسِكُمۡۗ) بڵیٚ لە لایەن خۆتانەوە ئەو بەڵایەتان بەسەرهات، واتە دوژمن كە زەفەری پیٚ بردن، بەهۆی كەلێن و درزەكانی خۆتانەوە بوو، ئەویش بەهۆی ئەوەوە بوو كە پێغەمبەری خوا (علیه الصلاة والسلام) وەك جاری دیكەش باسمان كردووە، پەنجا لە هاوەڵانی لەسەر چیایەك دانان، كە پێی دەگوتریٚ: (جبل الرماه)، لە دامێن چیای ئوحوددایە، پێشیفەرموون: ئەگەر ئێمە سەركەوتین، یان ژێركەوتین، شوێنی خۆتان چۆڵ مەكەن، بەڵام ئەوان بەرپرسەكەیان كە ناوی عەبدوڵڵا بوو، فەرمانی ئەویان شكاندو سەرپێچییان لە فەرمانی پێغەمبەریش (علیه الصلاة والسلام) كردو شوێنەكەیان چۆڵ كرد، چل كەسیان هاتنە خوارەوە، دوژمن كە بەوەیان زانی هێرشیان كرد، پەلاماریان دا و ئەو دە كەسەیان كوشت و، دواییش پشتیان لە مسوڵمانان ستاندو، وە سەرەنجام مسوڵمانان شكستیان بەملدا هات.

ئنجا وەك گوتم ئەوە یاسایەكی گەردوونییەو سوننەتێكی خوایە، كە ئێمە دەبێ بۆ نشووستییەكان و نەهامەتییەكان و بەڵا و نارەحەتییەكان، بگەڕێینەوە بۆ خۆمان و، دەستی چەور بە خەڵك دا نەسڕین، هەمیشە مرۆڤی بەهێز، كۆمەڵگای بەهێز، ئەوەیە كە بوێرانە دان بە كەموكوڕییەكانی خۆیدا بێنێ، ئینسانی ئازا، دان بە كەموكوڕییەكانی خۆیدا دێنێ، كۆمەڵگای ئازا و تەندروست، دان بە كەموكوڕیی خۆیدا دێنێ، هەڵەكانی خۆی دەبینێ، بەڵام خەڵكی بێ هێز، پێی وایە ئەگەر دانی بە هەڵەكەی خۆیدا هێنا، كۆتایی پێ دێ، ئەوەندە هەست بە لاوازیی دەكات، پێی وایە ئەگەر گوتی هەڵەم كردوە لەبەرچاوی خەڵك دەكەوێ! هەروەها كۆمەڵگای بێ هێز هەمیشە ئەستۆپاكیی خۆی ڕادەگەیەنێ و دەستی چەوری خۆی بەملاولا دەسڕێ! بەڵام خوای پەروەردگار ئاوامان پێ دەفەرموێ: كە ئێمە هەم بۆ خۆ چاككردن، دەبێ هەر بگەڕێینەوە بۆ خۆمان و لە خۆمانەوە پاكسازیی و چاكسازیی سەرچاوە دەگرێ، هەم بۆ بەڵا بەسەرهاتن، دیسان دەبێ چاو بە خۆماندا بگێڕینەوەو بزانین كە بەهۆی خۆمانەوە، بەڵامان بەسەرهاتوە، ئنجا چ ڕاستەوخۆ لە خۆمان هەڵقوڵیبێ، چ لەنێو خۆمان دا زەمینەی ئەو بەڵایەمان ڕەخساند بێ و، دواتر لە دەرەوەش هۆكارە دەرەكییەكان ئەو بەڵایەیان بەسەر هێنابین.

**دانـــا : مامۆستا! ئەگەر بگەڕێینەوە بۆ شەرع، هەرچەند بابەتەكەی ئێمە، لەسەر ئەوە نیە، بەڵام زۆرجار باسكراوە كە هەر شتێك خوای پەروەردگار پێی ڕازی نەبێ، ئەو شتە نایەتە دی و، وە ناگاتە ئەنجام، كەواتە: ئەم بارودۆخەی ئێستای ئێمە لە هەرێمی كوردستان دا، خوای پەروەردگار ڕازیە بەوەی ئەم خەڵك و حوكمڕانییەی ئێمە وای لێهاتوە، بەو مانایە كە ئەم لەسەرووی قودرەتی ئێمەیە، ئێمە بمانەوێ و نەمانەوێ خوای پەروەردگار ئەمەی پێ باشە بۆ ئەم میللەتە؟**

**مامۆستا:** پێویستە سەرەتا ئەو ڕاستییە بزانین كە: خوا سبحانە وتعالی ویستی هەیە و ڕەزامەندیی هەیە.

**دانـــا: جـــیاوازن؟**

مامۆستا: بەڵێ، ویستی خوا، گشتگیرە، بۆ هەموو کەس و بۆ هەموو شتێك، هیچ شتێك ناتوانێ لە ژێر ڕكێفی ویستی خوا بچێتە دەر، هەموو شتێ لە ژێر ڕكێفی ویستی ڕەهای خوای زاناو تواناداپە، ویستی خوا، ئیرادەی خوا، زانایان دەڵێن: وەك ئاسمان وایە، ئێستا تۆ لە ژێر سایەی ئاسمان دا، بەرەو ڕاست بڕۆی، یان بەرەو چەپ بڕۆی، بەرەو سەر، یان بەرەو خوار، چاك بكەی، خراپ بكەی، هەر لە ژێر سایەی ئاسماندای، ویستی خوا، وەك ئاسمان وایە، بەڵام ڕەزامەندیی خوا، جاری وا هەیە لەگەڵ ویستی خوادا تێك دەكاتەوەو جووت دەبن، جاری واش هەیە لەیەك جیا دەبنەوە، تەماشا بكە! خوای پەروەردگار دەفەرموێ:

﴿وَلَا يَرْضَىٰ لِعِبَادِهِ ٱلْكُفْرَ ۖ وَإِن تَشْكُرُوا۟ يَرْضَهُ لَكُمْ ۗ﴾ [الزمر: ٧]

واتە: خوا كوفر (سپڵەیی) بۆ بەندەكانی پەسەند نیە، (بەڵام هەندێ لە بەندەكانی كافر دەبن، كەواتە: بەبێ ئەوەی كە خوا پێی خۆش بێ، هەندێ لە بەندەكان كوفر هەڵدەبژێرن) بەڵام ئەگەر سوپاسگوزاریی بكەن بۆ خوا، بۆ ئێوەی پێ چاكە.

ئنجا ئێمە چۆن بزانین لە كوێ ڕەزامەندیی خوا لەگەڵ ویستی خوادایە؟ بە هۆی ئاوێنەی شەریعەتەوە، هەرچی خوا، لە شەریعەتەكەی دا پەسەندی كردبێ، دیارە لێی ڕازییە، بۆ وێنە: خوا دەفەرموێ:

﴿ٱلْقُرْبَىٰ وَيَنْهَىٰ عَنِ ٱلْفَحْشَآءِ وَٱلْمُنكَرِ﴾ [المائدة : ٣]

واتە: ئیسلامم بە بەرنامە بۆ پەسەندكردوون، كەواتە: هەرچی ئیسلام فەرمانی پێ دەكا، هەرچی ئیسلام بە چاكی دەزانێ، دیارە ڕەزامەندیی خوای لەسەرە.

هەروەها خوا فەرموویەتی: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ يَأْمُرُ بِٱلْعَدْلِ وَٱلْإِحْسَـٰنِ وَإِيتَآئِ ذِى ٱلْقُرْبَىٰ﴾ [النحل : ٩٠]

واته‌: بێگومان خوا فه‌رمان ده‌كات به‌ داد گه‌ریی و چاكه‌كاریی و به‌خشین به‌ نزیكان، (وَيَنْهَىٰ عَنِ ٱلْفَحْشَآءِ وَٱلْمُنكَرِ وَٱلْبَغْيِ ) [النحل : ٩٠] هه‌روه‌ها رێگریی ده‌كات له‌ قسه‌ و كرده‌وه‌ی ناقۆلاّو كرداری خراپ و ده‌ستدرێژیی، (يَعِظُكُمْ لَعَلَّكُمْ تَذَكَّرُونَ ) [النحل: ٩٠] ئاوا ئامۆژگارییتان ده‌كات، به‌ڵكو په‌ند وه‌ربگرن.

بەڵێ: ئێمه‌ به‌هۆی ئاوێنه‌ی شه‌ریعه‌ته‌وه‌، ده‌زانین ره‌زامه‌ندیی خوا له‌سه‌ر كام له‌ شته‌كانه‌، ئه‌گه‌رنا هیچ شتێك به‌بێ ویستی خوا نابێ، بۆ وێنه‌: كه‌سێ كه‌سێك ده‌كوژێ، یان نوێژێك ده‌كات، یان هاوكاریی لێقه‌وماوێك ده‌كات، هه‌ر سێكیان به‌ ویستی خوان، به‌ڵام ره‌زامه‌ندیی خوا، له‌سه‌ر نوێذكردنه‌كه‌ هه‌یه‌و له‌سه‌ر هاوكارییكردنه‌كه‌ هه‌یه‌، به‌ڵام له‌سه‌ر كوشتنه‌كه‌و، له‌سه‌ر زیان پێگه‌یاندن و ده‌ستدرێژییه‌كه‌ نیه‌، به‌ چی ده‌زانین؟ به‌پێی ئاوێنه‌ی شه‌ریعه‌ت.

**دانــا: كه‌واته‌ چی به‌و كه‌سانه‌ ده‌ڵێی: كه‌ وا تێگه‌یه‌نراون: ئه‌م دۆخه‌ خوای گه‌وره‌ وای لێ كردوه‌و هه‌ر ئه‌بێ چاوه‌ڕێ بین، خوای گه‌وره‌ش چاكی كات؟**

**مامۆستا:** ئێستا عه‌رزت ده‌كه‌م، ئه‌وه‌ هه‌م تۆزێ حه‌قی تێدایه‌، هه‌م ناحه‌قیشی تێدایه‌، حه‌قه‌كه‌ ئه‌وه‌یه‌ كه‌ هه‌ركاتێك كۆمه‌ڵگایه‌ك، به‌پێی یاسا گه‌ردوونییه‌كانی خوا، به‌رێوه‌نه‌چوو و، پێچه‌وانه‌ی یاسا گه‌ردوونییه‌كانی خواوه‌ جووڵانه‌وه‌، واته‌: خۆیان دا به‌ر به‌رداشی یاسا گه‌ردوونییه‌كان، خوا فه‌رمان ده‌كات به‌ عه‌دل و، ئه‌وان زوڵمیان كرده‌ پیشه‌، خوا فه‌رمان ده‌كات به‌ یه‌كگرتن و، ئه‌وان په‌رته‌وازه‌ بوون، به‌ ته‌ئكید باجی زوڵم و باجی په‌رته‌وازه‌یی ده‌ده‌ن، ئه‌وه‌ش شتێكی حه‌تمییه‌، به‌ڵام ئایا ئه‌وه‌ مانای وایه‌ كه‌ خوا به‌سه‌ریدا فه‌رزكردوون؟ نه‌خێر، خوا فه‌رزی نه‌كردوه‌، به‌ڵام خوا وه‌ك چۆن بۆ گه‌ردیله‌، یاسای داناوه‌، بۆ كه‌هكه‌شانه‌كان یاسای داناوه‌، بۆ ئه‌م گۆی زه‌وییه‌، هه‌ر بیست و چوار سه‌عات جارێك به‌ ده‌وری خۆیدا خولێك ده‌خوا، بۆ ئه‌وه‌ی شه‌و و رۆژ په‌یدا بن، یاسای داناوه‌، به‌هه‌مان شێوه‌: بۆ ژیانی به‌شه‌ریش یاسای داناوه‌، بۆ وێنه‌ ئه‌و كۆمه‌ڵگایانه‌ی كه‌ له‌ نێو خۆیاندا داد گه‌ریی ده‌چه‌سپێنن، یه‌كسانیی و ئازادیی، سه‌قامگیر ده‌كه‌ن رێزی

یه‌كدی ده‌گرن، په‌رۆش و به‌زه‌ییان به‌رامبه‌ر یه‌كدی هه‌یه‌، مافه‌كانی یه‌كدی پێشێل ناكه‌ن، ئه‌و كۆمه‌ڵگایانه‌ ته‌ندروست و ساغ و سه‌لیم ده‌بن، به‌خته‌وه‌ر ده‌بن له‌ دنیادا، مسوڵمان بن، یان كافر بن، ئه‌وانه‌ به‌خته‌وه‌ر ده‌بن، ڕێكءپێك ده‌بن و، وه‌ دوور ده‌بن له‌ فه‌وزا و له‌ پاشاگه‌ردانیی و، له‌و نه‌هامه‌تییانه‌ی كه‌ له‌ پێچه‌وانه‌ی ئه‌و شتانه‌وه‌ په‌یدا ده‌بن.

ئه‌مما ئه‌گه‌ر به‌پێچه‌وانه‌وه‌ ڕه‌فتار بكه‌ن و له‌ جیاتی دادگه‌ریی، سته‌م و فه‌رق و جه‌ور بكه‌نه‌ پیشه‌، له‌ جیاتی یه‌كرِیزیی، په‌رته‌وازه‌یی بكه‌نه‌ پیشه‌، له‌ جیاتی به‌زه‌یی به‌یه‌كدا هاتن، ڕق و كینه‌یان هه‌بێ به‌رامبه‌ر یه‌كدی، له‌جیاتی یه‌كسانیی، قۆرخكاریی و گه‌نده‌ڵییان هه‌بێ و، له‌ جیاتی چاكه‌، خراپه‌، ئه‌وكاته‌ باجی كرده‌وه‌كانی خۆیان ده‌ده‌ن، جا ئه‌وه‌ به‌پێی یاسای خوایه‌، به‌ڵام خوای په‌روه‌ردگار مرۆڤه‌كانی مه‌جبوور نه‌كردوه‌: زوڵم و خراپه‌ و تێكدان بكه‌ن، تاكو سه‌ره‌نجام باجه‌كه‌ی بده‌ن، به‌ڵكو ئازادی كردوون، ده‌یانتوانی له‌جیاتی ئه‌وه‌ی زوڵم بكه‌نه‌ پیشه‌ و، سه‌ره‌نجام ئه‌و یاسایه‌یان به‌سه‌ردا بچه‌سپێ، كه‌ خوا ده‌فه‌رموێ:

﴿ وَكَمْ قَصَمْنَا مِن قَرْيَةٍ كَانَتْ ظَالِمَةً ﴾ [الأنبياء: ١١].

واته‌: زۆر ئاوه‌دانییمان له‌به‌ین بردوون، پشتمان شكاندوون، كه‌ سته‌مكار بوون، له‌جیاتی ئه‌وه‌ی ئه‌و یاسایه‌یان به‌سه‌ردا بچه‌سپێ، كه‌ خوا له‌و ئایه‌ته‌دا باسی یاسایه‌كی گه‌ردوونیی خۆی ده‌كات، ده‌یانتوانی ئه‌و ئاكاره‌ی دیكه‌ بكه‌نه‌ پیشه‌، كه‌ خوا ده‌فه‌رموێ:

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ كُونُواْ قَوَّٰمِينَ بِٱلْقِسْطِ ﴾ [النساء : ١٣٥].

واته‌: ئه‌ی ئه‌وانه‌ی بڕواتان هێناوه‌! زۆر داده‌ریی به‌ڕێوه‌به‌رن. یان كه‌ ده‌فه‌رموێ: ﴿ وَإِذَا قُلْتُمْ فَٱعْدِلُواْ ﴾ [الأنعام : ١٥٢].

واته‌: هه‌ر كات قسه‌تان كرد دادگه‌رانه‌ بیكه‌ن، ئه‌و كاته‌ له‌جیاتی ئه‌وه‌ی باجی سته‌م بده‌ن، به‌هره‌مه‌ند ده‌بوون له‌ دادگه‌ریی.

ئنجا مرۆڤەكان بەدەست خۆيانە داخۆ ڕوو لە كام لە ياسا گەردوونييەكان دەكەن: ڕوو لەو ياسا گەردوونييانە دەكەن، كە لێيان بەهرەمەند دەبن، ياخود ئەو ياسا گەردوونييانە بەسەر خۆياندا دەچەسپێنن، كە لێيان زەرەرمەند دەبن، بەدەست خۆيانە، بەڵام دوايي كە ياسا گەردوونييەكانيان بەسەر خۆياندا چەسپاند، ئەو كاتە لە ئيرادەى خۆيان دەچێتە دەر، يانى وەك چۆن، كەسێك بڵێن: ئەوە ژەهرە ئاگات لێ بێ مەيخۆ! ئەويش بچێ بيخواتەوە، بێگومان هەتا دەيخواتەوە، بەدەست خۆيەتى، بەڵام كە خوارديەوە، تازە ئەوە دەرەنجامێكى حەتميى بەدوادا دێ، كە بريتيە لەوەى ئەو ژەهرە كاريگەريى دەبێ لە جەستەيدا، ئايا دواى ئەوەى ژەهرەكە دەخواتەوە، دەتوانێ كاريگەريى خراپى ئەو ژەهرە لە جەستەى دا نەهێڵێ؟ نەخێر، مەگەر چارەسەرێك بەكاربێنێ، ئەگەرنا تازە دەبێ باجەكەى بدات، بەڵام ئايا مەجبوور بوو وا بكات، يان بەدەست خۆى بوو؟ بەدڵنياييى بەدەست خۆى بوو، ئايا بۆچى خۆ خواى پەروەردگار ئەو ياسا گەردوونييانەى خۆى، بۆ ئێمە ڕوون دەكاتەوە؟ تاكو ئێمە بزانين ئەگەر بەپێى ياساكانى خوا بەڕێوەبچين، قەدەرە چاكەكان هەڵبژێرين، دەرەنجامى چاكمان دەست دەكەوێ و، ئەگەر قەدەرە خراپەكان هەڵبژێرين، دەرەنجامى خراپمان دەبێ.

لێرەدا پێويستە وێنەيەك بێنمەوە: لە (صحيح البخاري)دا هاتووە: كاتى خۆى خەليفەى دووەم عومەرى كوڕى خەتاب خوا لێى ڕازى بێ، دەيەوێ بچێ بۆ شام، دەگاتە شوێنێ بەناوى (سَرْغ) لەوێ هەواڵى بۆ دێ كە لە شام گاعوون بڵاوبووەتەوە، ( كەوا پێدەچێ دەردێ بووبێ هەركەسێ تووشى بووە، كەم وابووە دەربازى بێ، خەڵكێكى زۆرى پێ فەوتاوە) ڕاوێژ دەكات بە هاوەڵان، دەڵێ: ڕاتان چييە؟ گاعوون لە شام بڵاوبووەتەوەو ئێمەش دەمانەوێ بچين بۆ شام، بچين يان نەچين؟ ديارە دەبنە دوو ڕا، هەندێكيان دەڵێن: با بچين، هەندێكيان دەڵێن: با نەچين، دوايي خۆى دەڵێ: نەچوونەكەم پێ باشترە، ئەبو عوبەيدەى كوڕى جەڕراح خوا لێى ڕازى بێ دەڵێ: "أفراراً من قدر الله يا عمر؟" ئايا عومەر لە قەدەرى خوا ڕادەكەى؟ عومەر دەڵێ: "نعم، أَفِرُّوا من قدر الله إلى قدر الله، لو غيرك قالها يا أبا عبيدة، لجعلته نكالاً للناس"، دەڵێ بەڵێ لە قەدەرى

خوا ڕادەكەم بۆ قەدەری خوا، ئەی ئەبو عوبەیدە! ئەگەر جگە لە تۆ ئەو قسەی كردبایە، (ئەبو عوبەیدە زۆر پیاوێكی گەورە بووە، پێغەمبەر (عليه الصلاة والسلام) ناوی لێناوە: "أمين هذه الأمة" ئەمینداری ئوممەتی ئیسلام) دەمكردە پەند بۆ خەڵكی، واتە: بەجۆرێك سزام دەدا، خەڵك پێی تەمبێ بێ و جارێكی دیكە قسەی وا غەڵەت نەكات، دوایی وێنەی بۆ هێنایەوەو، گوتی: ئەی ئەبو عوبەیدە! تۆ ڕانەمەڕێكت پێیە، دوو قەدپاڵ هەن، یان دوو شیوو هەن، یەكێكیان پڕە لە لەوەڕو گیاو گژ، ئەویدیكەش شیوێكی قاقڕو دێمەكارە و هیچ لەوەڕی لێ نیە، لە هەركامیان بیلەوەڕێنی، بە قەدەری خوا نایانلەوەڕێنی؟! ئەگەر لەو شیوەدابێ كە لەوەڕ و زەمەند و گیاو گۆڵی لێیە، ڕانە مەڕەكە تێر دەخوات و قازانج دەكات، (ئەگەر لەوێ بیلەوەڕێنی قازانج دەكەی، و بە قەدەری خواش لەوەڕاندووتە) ئەگەر بیشیبەیە شیوە دێمەكار و بێ لەوەڕەكەش، هەر بە قەدەری خوایە، بەڵام زەرەرت كردووە.

ئێمە دەبێ قەدەرە چاكەكان هەڵبژێرین، شێخ عەبدولقادری گەیلانیی ڕەحمەتی خوای لێ بێت، قسەیەكی جوانی هەیە، دەڵێ: دەبێ قەدەرەكانی خوا بە قەدەرەكانی خوا دەفع بكەین، ئێستا تۆ بە قەدەری خوا نەخۆش دەبی، هەر بە قەدەری خواش عیلاج دەكەی، بە قەدەری خوا تووشی شكست دەبی، هەر بە قەدەری خوایش دەتوانی هەڵسیەوە، هەر بە قەدەری خوایە، ئەگەر كۆمەڵگایەك لە نێو خۆیاندا دادگەریی بەڕێوە بەرن و، پێكەوە ڕێك و چاك بن، بەپێچەوانەوەشەوە: ئەگەر پەرتەوازە و ناكۆك و ستەمكارو ناڕێكیش بن، هەر بە قەدەری خوایە، یانی: هەر بە ئیرادەی خوایە، بەڵام بە تەئكید ڕەزامەندیی خوا لەگەڵ بەرژەوەندیی خەڵكدایە، لەگەڵ خێر و خۆشیی خەڵكدایە، لەگەڵ بەختەوەریی خەڵكدایەو، تووڕەیی و سزا و جەزرەبەی خواش، لەگەڵ ئەوەدا كە خەڵك زەرەر بكا و نارەحەت بێ و تووشی خراپە ببێ، ئەوە خوا پێی ناخۆشە و لەسەر ئەوە سزاشیان دەدا، لەسەر ئەویدیكەش: پاداشتیان دەداتەوە، هەردووكیشیان بە ئیرادەی خواو بە قەدەری خوان، بەڵام بە تەئكید ڕەزامەندیی خوا، هەمیشە لەگەڵ چاكە و بەرژەوەندییەكاندایە.

**دانـا: كەواتە مامۆستا! من واتێگەیشتم كە بەڵاو ناڕەحەتییەكان كە بەسەر تاك یان كۆمەڵگادا دێن، دەرەنجامی كردەوەو ئیشەكانی خۆیەتی، بۆیە بەسەریدا دێت، من ئەپرسم: ئەم خەڵكەی لە هەرێمی كوردستاندایە چی كردوە وا گەیشتوە بەم دەرئەنجامە خراپەی كە لە هەموو ڕووەكانەوە كە لە بەرنامەكانی پێشوودا جەنابت زۆر بە جوانیی ئاماژەت پێكردوون، لە هەموو ڕووەكانەوە ئێمە تووشی قەیران بووین؟**

**مامۆستا:** دەتوانین زۆر شت باسبكەین، جارێ پێش هەموو شتێك ئێمە ئەوە بۆ بیست و شەش ساڵ دەچێت لەم بەشەی كوردستاندا، كە باشووری كوردستانی پێ دەڵێن، هەرێمێكمان هەیە، ئێمە دەستمان كراوە بووە لە ماوەی ئەو چارەكە سەدەیەی ڕابردوودا، كە چۆن وڵاتی خۆمان بەڕێوە دەبەین، بەڕێوەی بەرین، بەڵام بەداخەوە ئەو ئازادییە، ئەو دەستكراوەییە، ئەو سەربەستییە، ئەو خێر و شەڕ لەدەستهاتنە، كە ئەوە بۆ خۆی نیعمەتێكی گەورەیە، كۆمەڵگایەك ئیرادە و ئیدارەی خۆی بەدەس خۆی بێت، هیچ شتێكی لەسەر فەرز نەكرێت، بەداخەوە ئێمە سوودمان لەو دەرفەتە باش وەرنەگرت و، لەو نیعمەتەی خوا، باش بەهرەمەند نەبووین.

**دانـا: ئێمە كێ؟ میللەت یان بڕیاربەدەستان؟**

**مامۆستا:** ئێستا بۆت باس دەكەم: ئێمە وەك هەرێمی كوردستان، بەڵام ئەركێك كە بڕیاربەدەستان دەبوو بە جیددیی خەمی لێ بخۆن:

**یەكەم:** سیستمێكی حوكمڕانی ڕاست و ڕەشید، بەداخەوە ئەوەمان نیە، وەك دروشم و شیعار، ڕەنگە هەمان بێ، باسی دیموكراسی دەكرێ، باسی مافی مرۆڤ دەكرێ، باسی دەستاودەستی دەسەڵات دەكرێ، بەڵام كە تەماشای واقیعەكە دەكەی، لەسەر ئەرزی واقیع، پێچەوانەیە، لەجیاتی دیموكراسی، حوكمی بنەماڵەیی هەیە، حوكمی تاكیی هەیە، حوكمی میراتیی هەیە، قۆرخكاریی بۆ دەسەڵات هەیە، ئنجا لەجیاتی دادگەریی كۆمەڵایەتیی و، دادگەریی ئابووریی، پێچەوانەی ئەوە هەیە: قڕیی و پڕیی هەیە، چینایەتیی

هەیە، كەواتە: بڕیار بەدەستان نەیانتوانی سیستمێكی حوكمڕانیی ڕەشید و ڕاست و ڕێك بنیات بنێن، كەسیش دەستی نەگرتبوون، ئەگەر پێشتر خەتای عەرەب و فارس و توركی دراوسێمان گرتبێ، لەماوەی ئەو بیست و شەش ساڵی ڕابردو لەم هەرێمی كوردستانەدا، بۆمان نیە خەتای كەس بگرین، ئەگەر چاكەمان كردبێ، خۆمان كردوومانەو خراپەشمان بەسەر خۆمان هێنابێ، خۆمان بەسەر خۆمان هێناومانە، كە واقیعەكەمان دیارە هەموومان لێی بێزارین، خراپەی زۆرمان بەسەر خۆمان هێناوە.

**دووەم:** لە ماوەی ڕابردوودا بڕیاربەدەستانی ئەم وڵاتە، ئیرادەیان نەبووە كە ئەم وڵاتە بە دامەزراوە بكەن، چەند ساڵە هێزی پێشمەرگە و ئاسایش و پۆلیسمان هەیە، بەڵام فەرمان لە حیزب وەردەگرن.

ئنجا چ هێزی چەكدارمان بە ئاسایشەوە، بە پۆلیسەوە، بە پێشمەرگەوە، چ دامەزراوەی پەرلەمان، چ دامەزراوەی حكوومەت، چ دامەزراوەی دەسەڵاتی دادوەریی، ئەوەندە دەستیان تێوەردراوە بۆ بەرژەوەندیی تاكیی و بنەماڵەیی و حیزبیی، ئەو دامەزراوانە، یان پەكخراون، یان لە نێوەڕۆكی خۆیان خاڵیی كراونەوە.

**سێیەم:** هەر كۆمەڵگایەك، هەر كۆمەڵە خەڵكێك یاسا و ڕێسایەك نەبێ، هەموویان بۆی ملكەچ بن، هەمیشە سەریان لە پاشاگەردانییەوە دەردەچێ، ئێمە زۆر باسی یاسا سەروەریی دەكەین، بەڵام لە واقیعدا ئێمە (بەرپرسان و بڕیار بەدەستان) یاسا پێشێل دەكەین، هەر لە یاسای هاتوچۆوە بگرە، هەتا هەموو یاساكانی دی، یاسامان نەماوە سەروگوێلاكی نەشكابێ و پێشێل نەكرابێ لەم وڵاتەدا.

**چوارەم:** زۆر باسی یەكسانیی دەكرێ، باسی مافی هاووڵاتیبوون و مافی مرۆڤ دەكرێ، بەڵام لەم وڵاتەی ئێمەدا مرۆڤ بوون و هاووڵاتیبوون بە پێوەر نەگیراون، بۆ مامەڵە لەگەڵ تاكەكاندا، بەڵكو ئینتیمای حیزبیی و بنەماڵەیی و ئینتیما بۆ هۆز و دەڤەر و ...هتد، ئەوە واقیعێكە و دەیبینین، كەواتە: ئێمە (واتە: حوكمڕان و بڕیار بەدەستان) ئا ئەوانەمان كردووەو زۆر شتی دیكەش.

**دانــا: با بپرسم خەڵك ئەصڵەن خەتای هەیە؟**



**مامۆستا:** بێگومان خەتای هەیە.

**دانــا: لە چیدایە؟**

**مامۆستا:** خوا سبحانە وتعالی كە دەفەرموێ:

﴿ وَمَآ أَصَٰبَكُم مِّن مُّصِيبَةٖ فَبِمَا كَسَبَتۡ أَيۡدِيكُمۡ ﴾ [الشورى : ٣٠]

واتە: هەر بەڵایەكتان بەسەردێ، كردەی دەستی خۆتانە، خوا سبحانە وتعالی بە گشتی فەرموویەتی و، لەگەڵ كۆمەڵگادا دەدوێ: ئەی كۆمەڵگا! بەڵات بەسەر هاتووەو كۆمەڵێ بڕیاربەدەست، چینێكی سیاسی ئەو بەڵایەی بەسەر تۆ هێناوە، نەیهێشتوە تۆ خاوەنی سیستمێكی حوكمڕانیی ڕەشید بی، نەیهێشتوە خاوەنی دامەزراوەكان بی، نەیهێشتوە یاسا لە ژیانی تۆدا سەروەر بێ، نەیهێشتوە دەستاودەستی دەسەڵات بكرێ، نەیهێشتوە مرۆڤبوون و هاووڵاتییبوون بەپێوەر بگیرێ، بڕیاربەدەستانێك كە ئەوەیان بە تۆ كردوە و تۆش هەر لەگەڵیاندابووی و لەگەڵیاندا ڕۆیشتووی، ئەو بەڵایە بەسەرتان هاتوە، كردەی دەستی خۆتانە، ئەی خەڵك و جەماوەر!

بەڵام لە سووڕەتی (الأنفال)دا خوا سبحانە وتعالی هەر زۆر بە ڕوون و ڕاشكاویی بە كۆمەڵگا دەفەرموێ:

﴿ وَٱتَّقُواْ فِتۡنَةٗ لَّا تُصِيبَنَّ ٱلَّذِينَ ظَلَمُواْ مِنكُمۡ خَآصَّةٗۖ وَٱعۡلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ شَدِيدُ ٱلۡعِقَابِ ٢٥ ﴾ [الأنفال: ٢٥]

لە بەڵایەك بترسێن كە تەنیا تووشی ئەوانەتان نایەت كە ستەمیان كردوە، یانی بڕیاربەدەستە ستەمكارەكان، تەنیا تووشی ئەوان نایەت، بەڵایەكە بە گشتی دێت، ئنجا خوا كە دەفەرموێ: لە بەڵایەك بترسێن كە تەنیا تووشی ستەمكارەكانتان نایەت، دوێنراو لێرەدا خەڵك و جەماوەرە، یانی: ئەی خەڵك و جەماوەر! ئەگەر لە ستەمكارەكانتانەوە ڕابمێنن، چ جای ئۆباڵیان بۆ بكێشن

و چەپڵەیان بۆ لێدەن و ماستاویان بۆ بكەن، ئەگەر هەر لێشیان بێدەنگ بن، بەڵایەكتان بەسەر دێ، كە تەنیا تووشی ستەمكارەكان نایەت، بەڵكو هەمووتان پێكەوە دەگرێتەوە.

زۆر كەس جۆرێك لە ماستاو بۆ جەماوەر و خەڵك دەكات، بۆ ئەوەی عاتیفەی خەڵك بە لای خۆیدا بكێشێ، دەڵێت: خەڵك و جەماوەر هیچ عەیبی نیە، میللەت زۆر زۆر چاكە! بەڵام من دەڵێم: خەڵك و جەماوەر مەزڵوومە، بەڵام خۆشی دەستی هەیە لەو مەزڵوومیەتەدا كە بەسەری هاتوە، ئەویش بریتییە لە بێدەنگیی بەرامبەر بە ستەمكار، زۆر جوان گوتراوە: "ستەم نیە بێدەنگیی دروست دەكات، بێدەنگییە ستەم دروست دەكات"، زۆر قسەیەكی ڕاستە، فیرعەون كەی گوتی: (أنا ربكم الأعلى)؟ هەر لە سەرەتاوە فیرعەون وای نەگوت، تەماشای كرد ئەو هەرچی دەكا، ئەو خەڵكە هەر چەپڵەی بۆ لێدەدا، تەماشای كرد ئەو هەرچی دەكا ئەو خەڵكە دەڵێ: بەڵێ قوربان و دەستی بۆ لەسەر سنگ دادەنێن، ئنجا گوتی: مادام وابێ، هەر لە منیان كەمە، پەرستراوێكیان دەوێ و ئەویش منم:

﴿ وَقَالَ فِرْعَوْنُ يَٰٓأَيُّهَا ٱلْمَلَأُ مَا عَلِمْتُ لَكُم مِّنْ إِلَٰهٍ غَيْرِى ﴾ [القصص: ٣٨]

فیرعەون گوتی: ئەی دەست و پێوەندەكانم، دەوروبەرم، پیاوماقووڵان، جگە لە خۆم بۆ ئێوە پەرستراوێكی دیكەم پێ شك نایەت، هەر بۆ خۆم پەرستراوتانم! دیارە لە خەڵكەكەی ڕادیوە، بە بەڵگەی ئەوە كە خوا دەفەرموێ:

﴿ فَٱسْتَخَفَّ قَوْمَهُۥ فَأَطَاعُوهُ ۚ إِنَّهُمْ كَانُوا۟ قَوْمًا فَٰسِقِينَ ﴿٥٤﴾ ﴾ [الزخرف : ٥٤]

( فَٱسْتَخَفَّ ) زانایان دوو واتایان بۆ لێكداوەتەوە، لە ڕووی ڕێزمانی عەرەبییەوە، دوو واتایان هەڵدەگرێ:

١- (أي وجدهم خفيفي العقول) يان (خففي الأوزان)، تەماشای كرد عەقڵ سووكن، سووكەڵەی دەهاتنە بەرچاو.

٢- ( فاستخف أي جعلهم أخفاء ) يان (جعلهم خفيفي العقول)، سووكی كردن، عەقڵی سووك كردن، واتە چەواشەی كردن، بێ كێشی كردن و فەرمانی بەسەردا

کردن، ئەوانیش بە قسەیان کرد، هەرکامێکیان بێ و هەرچۆن بێ، کەواتە: خەڵك شەریك و برا بەشە، خەڵك بە گشتی، ئنجا ئەوەش ڕاستە ئەوەش کە گوتراوە: (کما تکونوا یولَّی علیکم) ئێوە چۆن بن، ئاواش حوکمڕانییتان بەسەردا دەکرێ، وڵاتانی ڕۆژئاوا تەماشاکە بکە، هیچ کەسێك هەیە دوای تێپەڕینی چوار ساڵەکەی خۆی، بڵێ: واز لە کورسییەکەم ناهێنم و بیانوو بێنێتەوە، کەس هەیە؟ بیستووتە شتی وا؟ هەر ئەصڵەن شێتی دەکەن، هەر بە دارێوەی هەڵدەگێڕن، دەڵێن: ئەوە تۆ شێت بووی! ڕەنگە یەکسەر بیبەن بۆ خەستەخانە!

**دانـــا: ئاخر کە بەدیلی نەبێ ئەو کەسە، ئێستا جەنابت ئەمیری کۆمەڵی ئیسلامییت، کە بەدیلت نەبێ، تۆ بڵێی ئەوە من کاتم تەواو بوو و کۆنگرەیە یا برایەك بێتە پێشەوە، کەسێك بێتە پێشەوە، کەس نەیەتە پێشەوە، ئەکرێ تۆ شوێنەکە چۆڵ بکەیت؟**

**مامۆستا:** ئەگەر لە کۆمەڵی ئیسلامیدا بڕیارێك هەبێت دوای چوار ساڵ، دوای دەورەیەك، دوای دوو دەورە، ئەگەر بڵێن: بەدیل نیە، ئەوە پێش هەموو کەس زوعفە بۆ ئەو کەسەی کە بەرپرسی کەسی یەکەم وازبێنێ، دەبێ وازبێنێ، ئنجا یەکەمی ئەو خەڵکەیە، یانی چی بەدیل نیە؟ بۆ پیاو قاتبوون (قَحطُ الرجال)ە؟، بۆچی بۆ ئەو نەفەرە، ئەگەر عەلی باپیرە، ئەگەر عەمرە، زەیدە، لە هەر ئاستێك دایە، دنیای بە ئیجارە گرتوە، ئایا بۆ بۆی بڕیاردراوە کە عومری نووحی هەبێ، ئەدی نابێ حسابی ئەوە بکا، ئەویش دەمرێ، وەك ئەو خەڵکە؟!

**دانـــا: کەواتە ئەوە بەڵگە نیە؟**

**مامۆستا:** نەخێر ئەوە هیچ نیە، بێمەوە سەر ئەسڵی مەبەست: دەڵێم: خەڵك و جەماوەر بەشدارن لەو بەڵاو کارەساتانەدا کە بەسەریان دێن، چونکە هەر لەگەڵ وەزعە لارەکاندا، دەڕۆن و لێی بێدەنگن.

دەڵێن: ئەوە نیە خەڵك خۆپێشاندان دەکات! دەزانم، خۆپێشاندانیش دەکرێ، نارەزاییش دەردەبڕدرێ، بەڵام کە ئەوە دەکرێ، ئەوەش دەکرێ، کاتێك کە ئەو حیزبانە دەکەونە، هەڵبژاردنەوە هەر ئەو خەڵکەی کە خۆپێشاندانی کردوە، هەر ئەویش تەزویر دەکات، فرتوفێڵ دەکات، پاشان خەڵکێکی زۆر مووچەی حەڕام

وەردەگرێ، ساڵەهای ساڵەی وەریدەگرێ، دوای ئەوەی کە مووچە حەرامەکەی لێ دەبڕن، ئەوجار نارەزایی لێ بەرز دەبێتەوە، ئەدی چەند ساڵە لە کوێ بووی، ئەدی نەتدەزانی دوو مووچە و سێ مووچەت لێ حەڵاڵ نیە! نەتدەزانی سێ چوار جار بەهرەمەند بوون، زەوی وەرگرتن، لەسەر حسابی ڕەش و ڕووتێکە کە سەد مەتر دووجای دەستناکەوێ! ئەدی چۆن وا بەبێ دەنگیی خواردووتە! ئێستا کە پارە حەرامەکەت لێ براوە، ئێستا کەوتوویە نارەزایی دەربڕین، ئەدی پێشتر بۆ نارازیی نەبووی؟ لەبەرئەوەی بەرژەوەندیی خۆت تێکچووە! ئێستاش ڕەنگە پارە حەرامەکەت بۆ بگێڕنەوە، بێدەنگت بکەن! کەواتە: خەڵك و جەماوەریش بەرپرسیارە، هیچ گومانی تێدا نیەو بەپێی مەنتیقی قورئان وایەو، بەپێی مەنتیقی عەقڵ و لۆژیك وایەو، وە بەپێی یاساکانی کۆمەڵناسیی وایە، و وەك گوتم: لە ئەوروپا و ڕۆژئاوا، کەسێك هەیە ئەو شتەی لەم جیهانی ئیسلامیی و موسڵمان نشینەدا دەکرێ، ئەو حوکمی میراتیی و بنەماڵەیی یە، کەس هەیە لەوێ شتێکی وا بکات؟! ئەگەر شتێکی وا بکات خەڵکەکە زۆریان پێ عەجایب دەبێ! بەڵام تەماشا دەکەی ئەو خەڵك و جەماوەرەی ئێمە وا ڕاهێنراوە، وا بارهێنراوە، وای قەناعەت بەخۆ هێناوە کە هەرچی بکرێ، پێویستە هەر ڕازی بێ، بۆیە خوای پەروەردگاریش دەفەرموێ: بەڵایەك بەهۆی ستەمکارەکانتانەوە بەسەرتان دێ، خۆتانی لێ بپارێزن، ئەگەرنا بەڵایەکە کە دێ، هەمووتان دەگرێتەوە.

**دانـــا: زۆر باشە مامۆستا! ئێستا ئەوەی ڕۆیی ڕۆی، بەتایبەت بۆ خەڵك و جەماوەر، ئەگەر پرسیارەکە ئەوە بێ بەڕێزت وەك سیاسییەك، وەك ڕۆشنبیرێك، وەك ڕووناکبیرێك، ئامۆژگارییت بۆ خەڵك و جەماوەر چییە لە ئێستا بە دواوە، بڕیاری چی بدەن، بۆ ئەوەی ئەم زوڵم و قۆرخکاریی و ستەمەی لەسەریانە لابچێ، بە کەمترین زەرەر؟**

**مامۆستا:** کاك دانا! هەندێ کەموکوڕیی هەیە کە ڕوو دەکاتە کۆمەڵگایەك دوایی وا بە ئاسانیی چاك نابێت، بۆیە عەرەب جوانیان گوتوە: "درهم وقاية خير من قنطار علاج"، درهەمێك لە پارێز بدەی، چاکترە لەوەی پڕی پێستێك زێڕ لە

چارەسەر بدەی، بەڵکو جاری وا هەیە پڕی چەند پێستیش پارە دەدەی، بەڵام ئەو کەمتەرخەمییە کە لە پاریزکردندا کراوە، دەبێ باجەکەی خۆتی هەر لەسەر بدەی، یانی وەك حەقیقەتێك دەبێ ئەوە بزانین، کە ئەم وەزعە وەك گوتراوە "شبَّ علیه الصغیر وشاب علیه الکبیر" منداڵ تێیدا بووەتە گەنج و، بەساڵداچوو تێیدا پیر بووە، چارەگە سەدەیەك ئەم وڵاتەمان بەشێوەیەکی سەقەت بەڕێوە، ئنجا عەجایب ئەوەیە برادەرانی عەلمانیی جار جار قەڵسیش دەبن لە هەندێ قسەی من، کە دڵسۆزانە دەڵێم: (عەلمانیانی بڕیاربەدەست) ناڵێم عەلمانیی دیکەی بێ چارەی هیچ بەدەستی مەزڵوومی بەشخووراوی ماف پێشێلکراو، لەگەڵ ئەوانم نیە، چونکە ئەوانیش مەزڵوومن، بەڵام عەلمانییە بڕیاربەدەستەکان، خەتابارن، ناشڵێم: هەرچی عەلمانیی بڕیاربەدەستە هەمووی وەك یەکە! خەڵکی دڵسۆزیان هەیە ویستوویەتی کارێك چاك بکات، بەڵام شەپۆلی خراپەکاریی و گەندەڵییەکە، هێندە بەتین بووە، ئەوانەی دیکە کەویستی چاکسازییان بووبێ، ویژدانێکی زیندوویان بوو بێ، هیچ کاریگەرییەکی ئەوتۆی نەبووە، ئنجا کە دەڵێم: ئەو وڵاتە بەدەستی تەوژمی عەلمانیی بڕیاربەدەست تێکدراوەو خراپ کراوە، بە گشتی قسە دەکەم، ئیدی کێ چەندی پێ دەبڕێ و ئەویدیکە چەندی پێ دەبڕێ، ئەوە بابەتێکی دیکەیە.

کەواتە: پێموایە ئەم وەزعە بەسێنایی چارەسەر نابێت، هەندێك زەرەرمان کردوون تازە بۆمان قەرەبوو نابنەوە، بۆ وێنە:

١- ناوچە دابڕێنراوەکان، کەرکووك و شوێنەکانی دیکە.

٢- دەبووایە ئێستا ژێرخانێکی ئابوورییمان هەبووایە.

٣- دەبوو ئەگەر هێزی چەکدارمان بە ئاسایش و پۆلیس و پێشمەرگە و زێرەڤانیی و. هتد بە دامەزراوە کردبایە.

٤- دەبووایە خاوەنی یەك گووتاری سیاسیی و خاوەنی یەك هەڵوێستی سیاسی و یەك جۆرە مامەڵەبوونیایە لەگەڵ وڵاتانی دراوسێ، لەگەڵ بەغدا، لەگەڵ دنیادا، کێ دەستی گرتبووین؟ کەس، ئنجا ئێستا کە ئەوەمان نەکردوە لە بیست

و پێنج ساڵی ڕابردوودا، باجمان لەسەری داوە ئاسانیش نیە بۆمان بێتە سەر خەت، بۆمان بێتە سەر سكە، هەڵبەتە ئەگەر ئیرادەمان هەبێت دەتوانین، بەڵام ئاسان نیە، ئامۆژگاریی من چییە؟ ئامۆژگاریی من ئەوەیە كە هەركامێك لە ئێمە، پێش هەموو شتێك چاودێریی خوای پەروەردگار بەسەر خۆیەوە ببینێ و، ئەو حەقیقەتە بزانێ كە ڕۆژێك دێ دەچێتەوە لای خوا و لێی دەپرسرێتەوە، لەوێش واستەو واستەكاریی نیەو، خزمایەتیی و حیزبایەتیی نیە، هەركەسە خۆی وەك خوا دەفەرموێ:

﴿ وَكُلُّهُمْ ءَاتِيهِ يَوْمَ ٱلْقِيَـٰمَةِ فَرْدًا ﴿٩٥﴾ ﴾ [مريم : ٩٥]

هەندێ كەس ڕەنگە سەری لە هەندێ هەڵوێستی ئێمە سوڕبمێنێ! ئەدی ئێوە نازانن ئەو هەڵوێستە بنوێنن، باجی لەسەر دەدەن و، فڵان حیزب تووڕە دەبێ و، فڵان كەس ناڕازیی دەبێ و، ئیحتیمالی هەیە واتان بەسەربێ؟ با زۆر چاكی دەزانین، ئێمەش دەزانین دنیا چ باسە، ئەدی بۆچی وا دەكەن؟ لەبەرئەوەی سەرچاوەی فیكریی ئێمە نازانن، بۆیە ناهەقیان نیە سەریان سور بمێنێ! نازانن بۆیە ئەوە دەڵێم، چونكە حیساب بۆ ئەوە دەكەم دەچمەوە خزمەت خوا، دەفەرمووێ: تۆ لەنێو ئەو خەڵك و كۆمەڵگایەدا بووی، ئەوانەت دەبینی زوڵمیان دەكرد، دەتبینی كە حوكمڕانییەكی سەقەتیان دەكرد، خەڵكت دەبینی چۆن بەشی خورابوو، وڵاتت دەزانی چۆن بە قوڕێ گیرابوو، بۆچی قسەیەكت نەكرد؟ بۆچی هەڵوێستێكت نەبوو؟ بۆچی هەنگاوێكت نەنا؟ ئێمە حیسابی ئەوە دەكەین! ئنجا ئێمە بازرگان نین، تەماشا بكەین چەند قازانج دەكەین، ئەگەر وابكەین و وابكەین، یان چەند زەرەر دەكەین! ئێمە خاوەن مەبدەئین، مەبدئەكەش هی خۆمان نیە بۆ خۆمان دروستمان كردبێ، وەك لاستیك بكێشین و كورتی بكەینەوە و درێژی كەین، مەبدەئەكان لە خواوە بۆمان دابەزیون، لە وەحی خواوە بۆمان نازڵ بوون، بۆ نموونە: خوا كە دەفەرموێ:

﴿أَلَا لَعْنَةُ ٱللَّهِ عَلَى ٱلظَّـٰلِمِينَ ﴾ [هود: ١٨]

ئاگاداربن! نەفرینی خوا لە ستەمكاران، بە من هیچ ناكرێ، من ناتوانم لەگەڵ ستەمكاردا بم، پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) كە دەفەرموێ: (اتقوا دعوة المظلوم فإنه ليس بينها وبين الله حجاب) رواه البخاري. خۆتان لە دوعای مەزڵووم بپارێزن، لە نێوان دوعای مەزڵووم و خوادا پەردە نیە، من ناتوانم لەگەڵ مەزڵوومدا نەبم، ناتوانم دژی ستەم نەبم، نەك بە قسە و بە شیعار، بەڵكو بە كردارو، دەبێ باجیش بدەم لەسەر ئەوەو، هیچ شتێكیش ناكەمە پاساوی ئەوەی لەگەڵ ستەمكاردا بم، هیچ شتێكیش ناكەم بیانووی ئەوەی پشت لە مەزڵووم بكەم، ئەگەر وا بكەم، قازانج دەكەم، ئەگەر وا بكەم باج دەدەم، خەڵكم دەگیرێ و، هەڕەشەم لێ دەكرێ و، نانم دەبڕدرێ! ئەوانە هیچ نین، ئەگەر مەبدەئەكانت لە خۆت خۆشتر دەوێن (بەتایبەتی ئێمە وەك ئیسلامیی، وەك دیندار، وەكو كەسانێك كە بڕوامان بە قیامەت هەیە) ئەگەر مەبدەئەكانت، دینەكەت، پرانسیپەكانی شەریعەتت لە خۆت خۆشتر بوێن، نابێ گوێ بدەیە ئەو وردە شتانەی كە لەسەر ئەوەی پابەند دەبی بە پرانسیپەكانی شەریعەتەوە، بەسەرت دێن، ئامۆژگاریی من بۆ تاك تاكی خەڵك و جەماوەر، ئەوەیە كە خاوەنی ویژدانێكی زیندوو بن، باعەقڵێكی هۆشیارو دڵێكی بێدارمان هەبێ، قسەی خۆمان لە شوێنی خۆیدا بكەین، هەنگاوی پێویست لە شوێنی پێویستدا بنێین، بەڵام حیقد و بوغزیشەوە ئینتیلاق نەكەین، با بەزەییمان بە زاڵمیشدا بێتەوە كە زوڵم دەكات، چونكە زوڵمەكەی سەری خۆشی دەخوا و سەری كۆمەڵگاكەشی دەخوا، پێشموایە ئەگەر ئەو خەڵكە هەمووی، ئەوەی كە موسڵمان و نوێژكەرە، بەس نوێژكەرەكان، بەس ڕۆژووگر و نوێژكەرەكان، خاوەنی هەڵوێست بن، خاوەنی عەقڵێكی هۆشیار و دڵێكی بێدار بن و بەپێی عەقیدەكەیان، بەپێی ئەلیف و بێی شەریعەتەكەیان مامەڵە بكەن؟ دونیایەكە زۆر دەگۆڕێ، ئەو كاتە پێمواییە ئەوەی بڕیاربەدەستە و چاوی لە زوڵم و ستەمە و دەوروبەرەكەیان، ئەوانە كە تەماشا دەكەن، ئەو خەڵك و جەماوەرە ڕازیی نابێ و ئیرادەیەكی جیددیی هەیەو قبووڵ ناكا، بەبێ ئەوەی كەس سەنگەر بگرێ و تەقە بكا، وەك لەو وڵاتانەدا كە خەڵك و جەماوەر هەڵوێستی وەرگرت، بڕیار بەدەستان، وازیان لە ستەمكاریی خۆیان هێنا و، وازیان لە ئەو شێوە حوكمڕانییە سەقەتە هێنا، كە ساڵەهای ساڵ

بوو لەسەر خەڵكەكە فەرز كرابوو، لە چركەساتێكدا كە خەڵك ویژدانی بێدار بووەوە، ئەو شێوە حوكمڕانییە نەیتوانی چیدیكە درێژە بە بوونی خۆی بدات، ئنجا من پێموایە ئەگەر خەڵك ئەوە بكات، خەڵك بەڕاستی خاوەنی هەڵوێست بێ، ئەو كاتە ئەو بڕیاربەدەستانەی كە ئەم وڵاتەیان بەدەستەوەیە، یان ئەوەتا دەگەڕێنەوە سەر ئەوەی كە خەڵك و جەماوەر دەیانەوێ و پێش ئەوەش خوای پەروەردگار فەرمانی پێكردوە، یان ئەوەتا لەگەڵ ئیرادەی جەماوەردا ڕووبەڕوو دەبنەوە، هەركەسێكیش لەگەڵ ئیرادەو وزەی لە بننەهاتووی خەڵك و جەماوەردا ڕووبەڕوو ببێتەوە، بە تەئكید هەر شكستی پێ دەبرێ، مێژوو وامان پێ دەڵێ.

**دانـــا: مامۆستا! كەواتە بە بڕوای جەنابت خۆدزینەوەیە ئەگەر ئێمە بڵێین: هۆكاری ئەم قەیرانانە، چەند شتێكی بۆ نموونە: دابەزینی نرخی نەوت، شەڕی داعش، بڕینی بوودجە، ئەمانەی كە دەرەكیین بڕیاربەدەستان وەك بیانوو دەیهێننەوە، ئەمە خۆدزینەوەیە بە بڕوای تۆ؟**

**مامۆستا:** بەڵێ بە خۆدزینەوەی دەزانم، چونكە ئەو هۆكارانە لە وڵاتانی دیكەش هەبوون، شەڕی داعش هەر ئێرەی نەگرتووەتەوە، بەغداشی گرتبۆوە، ئەدی بۆچی لە بەغدا مووچە هەر دەدرێ؟ ئەصڵەن ئەوەی كە لە بەغدا و لە پارێزگاكانی دیكە گوزەراوە، بەتایبەت لە بەغدا و دەوروبەری، ئێمە لەچاو ئەوە لێرە لە هێمنیی و ئاسایشێكی زۆردا بووین، ئەدی بۆچی ئەوەی كە بەسەر ئێمە هات، ئەو شڵەژانە بەسەر ئەوان نەهات، لە حاڵێكدا لەلای ئێمە دنیا شامی شەریف بوو، لە ڕووی هێمنیی و ئاسایشەوە، كە بۆ ئەوەش دەبێ دەستخۆشیی بكرێ لەوانەی كە لە پشت ئەو پاراستنی هێمنیی و ئاسایشەوەن، پێشمەرگەیە، پۆلیسە، ئاسایشە هەركەسێك هەیە، بەڵام مەبەستم ئەوەیە بۆچی ئەو شڵەژان و ئەو حاڵ تێكچوونەی كە بەسەر ئێمەدا هات، بەسەر ئەواندا نەهات؟ كەواتە: ئەوە نابێ بكرێتە بیانوو.

پاشان ئایا هەندێك لە هۆكارەكانی پەیدابوونی ئەوانە: بۆ وێنە بڕانی بوودجە لە بەغداوە، خۆمان دەستمان تێیدا نەبووە؟ ئەدی خۆمان نەمانگوت: سەربەخۆیی

ئابووریی، ئێستا كه ئابوورییەكەمان سەربەخۆ بوو، تەنیا چارەگە مووچەی تێ دەبێ! بەڵێ خەڵك و جەماوەر بە تەئكید دەبێ هەست بە بەرپرسیارێتیی لەبەرانبەر خودا بكەن و ئەركی سەرشانی خۆیان جێبەجێ بكەن، بڕیاربەدەستانیش چیدیكە بیانوو بەو شتانە نەهێننەوە، چیدی خۆیان لە واقیعەكە نەدزنەوە، بەڵێ ئەو شتانەش كاریگەرییان هەبووە، بەڵام ئەگەر خۆمان واقیع بین و دووربین و خاوەنی ئیرادەی خۆمان بین، ئەگەر ئێمە تەنیا پشتمان بە نەوت نەبەستبایە، كشتووكاڵێكی خۆمان هەبووایە، پیشەسازییمان هەبووایە، لەسەر پێی خۆمان وەستابایین، بەو جۆرەی دیتمان، شپرزو بێحاڵ نەدەبووین!

**دانـــا: بەڵێ، مامۆستا! كاتم هیچ نەماوە و ئەمەوێ ئەم دەرەفەتە بقۆزمەوە و پرسیارێ بكەم، بە زەروری ئەزانم لێرەو لەوێ لە ماوەی ڕابردوودا لە شەقام و بەشێك لە میدیاكانەوە، ئێوەش وەك كۆمەڵی ئیسلامیی، هەرچەندە جەنابت ئەمەت بەرپەرچداوەتەوە كەنابێ بوترێ پێنج حیزبەكە لە هەموو شتێكدا وەك یەكن، بەڵام هاوڕێكانی خۆتان، باسیان لەوە كرد كە ئێوە هەمووتان شەریكن لە جۆرێك لەم دەسەڵاتەی كە هەیە و، لەم نەوت و پارەیەدا، من حەزەكەم زۆر بە كورتیی هەڵوێستی تۆ، قسەی تۆ لەسەر ئەوەی ئێوەش شەریكی كێڵگەی نەوت و كۆمپانیای وەهمیی نەوت بن، ئەكرێ بزانم؟**

**مامۆستا:** جاری دیكەش بە موناسەبەتی دیكە، وەڵامی ئەو قسانەم داوەتەوە، دەڵێم: ئەوە عەرز و ئەوە گەز، مەیدان مشكان نەیانكێڵاوە، فەرموون، ئایا خەڵك بیرە نەوتی هەبێ، پارە و سامانی هەبێ، دەشاردرێتەوە؟! ئەمڕۆ چی دەشاردرێتەوە؟! بۆیە هەندێ كەس كە ئەو قسانە دەكا، پێموایە زیاتر ڕێزی خۆیان بگرن باشە، ئینسان كە ڕێزی خۆی بگرێ، درۆ ناكات، شتێك نالێ، كە بۆی نەچەسپێ، شتێك نالێ كە وا نەبێت.

ئنجا بە نسبەت ئەوەوە كە هەر پێنج لایەنەكە بەرپرسیارن، ئەوەش قسەیەكی بێ جێیە! دەڵێم: بابی ئەوەندە كە بڕیارت بەدەستە تەحەممولی بەرپرسیارێتیی دەكەی، پێم عەجایبە خەڵكێك هەیە وا دەڵێ، بەڵام تۆ وەرە كەسێك بۆ خۆی

مەزڵووم بێ لەم وڵاتەدا، بەشخووراو بێ، پێ دا دراو و لێدراو بێ، كەچی بڵێ: بەرپرسیارم!!



**دانـــا: بۆچـــی وا ئـەڵـێ؟**

**مامۆستا:** دەبێ لێی بپرسی: بۆچی وا دەڵێی؟ كە تۆ مەزڵوومی هیچ بەدەست نیت، تۆ خەڵكت دەكوژن، خەڵكت دەگرن، نانت دەبڕن، هیچت لەدەست نایەت، بۆچی شتێك دەخەیە سەر شانی خۆت، كە وا نیە، هەموو كەس دەزانێ تۆ هیچت بەدەست نیە، بەوە پێی گەورە دەبی؟ ئەگەر پێت وایە پێی گەورە دەبی، خەڵك دەڵێ: مادام بەرپرسیارییت هەیە فەرموو، دۆخەكە چاك بكە! ئاخر تۆ بەرپرسیاری كوێی؟ تۆ هەر فریای ئەوە كەوتووی دەست بخەیە سەر گوێلاكی خۆت، دا نەتكوتن، نەتكووژن، دەرتنەكەن! من پێموایە ئەو قسانە نابێ بكرێن، چونكە پێچەوانەی ئەو واقیعەن، كە تێیدا دەژین ئیدی پاساویان هەر شتێك بێ، هەڵبەتە ئەو بڕیاربەدەستانەش كە ئەم وڵاتەیان بەشێوەیەكی سەقەت ئیدارە كردوە، زۆریان پێخۆشە، پێیان خۆشە شەریكیان زۆر بن، ئەها فلان كەسیش گوتی: ئەها ئەوانەش هەموویان شەریكمانن! كاتێ من لە خێردا تەریكم، بۆچی دەبێ لە شەڕدا شەریك بم، كاتێ كە من بۆ بەڕێوەبردنی ئەم وڵاتە، پرسە خەسووانەشم پێ نەكراوە و، هیچم بەدەست نەبووە، بۆچی دەبێ شەریك و برا بەش بم؟!.

**دانـــا: كەواتە مامۆستا عەلی باپیر! هەموو بیرە نەوت و كۆمپانیایەكی وەهمی لەم دەستەڵاتەدا ڕەت ئەكاتەوە، كە هەتانبێ؟**

**مامۆستا:** من پێموایە ئەوە تۆمەتێكە هێندە ناهێنی ڕەتیشی بكەمەوە، هەر پێم عەیبە ڕەتیشی بكەمەوە، ئەوە قسەیەكی بێ جێیە، چونكە وەك گوتم: لەم دنیایەدا ئێستا هیچ شتێك ناشاردرێتەوە، ئەوانەی كە حیزب و خزم دەكەنە ملیاردلێر و، ئەوانەی ژێر زەمینەكان لەپارە پڕدەكەن و ئەوانەی بانقەكان دەئاخنن و، ئەوانەی گەڕەك و دوورگەو كەشتی دەكڕن و دیارن و، هی ئێمەش ئەوە

دیارە وەك سلێمانەیی دەڵێن: كیچ لە گیرفانماندا سەوزەڵە خانم دەڵێ، هەركەس دەیەوێ كە لە واقیعی ئێمە تێ بگا، با بێ تەماشامان بكات!!.

**دانـــا: بەڕێز مامۆستا عەلی باپیر، نووسەر و ڕووناكبیر! سوپاس بۆ ئەوەی كە وەڵامی پرسیارەكانی ئەم ئەڵقەیەی ئێمەشت دایەوە.**

**مامۆستا:** سوپاس بۆ جەنابیشتان.

**دانـــا: زۆر سوپاست دەكەم، بینەرانی ئازیز و خۆشەویست! سوپاس بۆ ئێوەش كە تا ئەم كاتە بینەری بەرنامەكەی ئێمە بوون، تا ئاڵقەیەكی نوێ، هەموو لایەك بە خوای گەورە ئەسپێرین، كوردستانێكی ئاوەدان و ئارام بۆ هەموو لایەك، خواتان لەگەڵ.**

# ئاڵقەی شازدەیەم

بنەمای پازدەیەم: خەرجیی بەرەنگاربوونەوەی ستەم و خراپە، زۆرکەمترە لەباجی بەردەوامبوون لەسەر ملکەچکردن بۆ ستەم و خراپە.

ameer.maktab@yahoo.com

/AliBapir /AliBapir /MediaAmeerOffice

www.alibapir.net

دانـــا: بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان، سڵاوتان لێ بێ بینەرانی ئازیز و خۆشەویستی کەناڵی ئاسمانی پەیام! خۆم بە خۆشحاڵ ئەزانم خوای پەروەردگار دەرفەتی پێبەخشیمەوە لە ئاڵقەیەکی نوێی بەرنامەکەتان بەرنامەی بەدانایی دا، لە خزمەت میوانە هەمیشەییەکەم: بەڕێز مامۆستا عەلی باپیر نووسەر و ڕووناکبیردا، بە ئێوەی ئازیز و خۆشەویست شاد ئەبین، بێگومان هەر لە درێژەی ئەو زنجیرە بابەتەی لە ژێر ناوونیشانی "بۆ چاککردنی ئەم دۆخەی هەرێمی کوردستان، با گوێ لە قورئان بگرین" لەم ئاڵقەیەدا دەچینە خزمەت بنەمای پازدە کە مامۆستا عەلی باپیر بەم شێوازە دایڕشتوە: "خەرجی بەرەنگاربوونەوەی ستەم و خراپە، زۆر کەمترە لە باجی بەردەوام بوون لەسەر ملکەچکردن بۆ ستەم و خراپە"، بزانین جەنابیان لە کوێوە ئەمەی هەڵهێنجاوەو مەبەستی چییە لەم دەستەواژەیە؟

مامۆستاگیان سڵاوی خوات لێ بێ، دووبارە سوپاس بۆ ئەوە کە دەرفەتت پێ بەخشین لەم ئەڵقەیەشدا پرسیارەکانی خۆمان ئاراستەی جەنابت بکەین.

**ممۆستا:** سڵاوی خوا لە ئێوەش بێ کاك دانا، خۆشحاڵم بە دیدارتان.

دانـــا: مامۆستاگیان! باس لەوە ئەکەین خەرجیی بەرەنگاربوونەوەی زوڵم و ستەم و خراپە، زۆر کەمترە لەوەی کەبۆی ملکەچ بین، بەردەوام بین لەسەر ئەوە، مەبەستت چییە لەم دەستەواژەیە، وەك لە ئاڵقەکانی پێشووتریشدا فەرمووتە، جەنابت ئەم بنەمایانەو ئەم چەمکانەت لە قوڕئانەوە هەڵهێنجاوە، بەڵام مەبەستت چییە؟

**مامۆستا:** بسم الله الرحمن الرحيم، الحمد لله، وصلى الله تعالى وبارك على رسول الله محمد، وآله المهتدين بهداه.

مەبەستم لەو ناوونیشانەی کردوومە بە بنەمای پازدەیەم: لەو بنەما قورئانییانەی کە پێموایە ئەگەر ئێمە ڕەچاویان بکەین، چ لە هەرێمی کوردستان دا و، لەسەر ئاستی عێراق، لەسەر ئاستی هەر کۆمەڵگایەکی دیکە، دەتوانین بەرەی خۆمان لە ئاو دەربێنین و خۆمان لەم نەهامەتیی و نارەحەتییانە کە تێیان کەوتووین دەربازبکەین، مەبەستم لەم بنەمایە چەمك و واتای چەند ئایەتێکە،

یەكێ لەوانە، ئەو ئایەتە موبارەكەیە كە لە سوورەتی (الأعراف)دا خوای پەروەردگار دەفەرموێ:

﴿ قَالَ مُوسَىٰ لِقَوْمِهِ اسْتَعِينُوا بِاللَّهِ وَاصْبِرُوا ۖ إِنَّ الْأَرْضَ لِلَّهِ يُورِثُهَا مَن يَشَاءُ مِنْ عِبَادِهِ ۖ وَالْعَاقِبَةُ لِلْمُتَّقِينَ ﴿١٢٨﴾ قَالُوا أُوذِينَا مِن قَبْلِ أَن تَأْتِيَنَا وَمِن بَعْدِ مَا جِئْتَنَا ۚ قَالَ عَسَىٰ رَبُّكُمْ أَن يُهْلِكَ عَدُوَّكُمْ وَيَسْتَخْلِفَكُمْ فِي الْأَرْضِ فَيَنظُرَ كَيْفَ تَعْمَلُونَ ﴿١٢٩﴾ ﴾ [الأعراف: ١٢٨- ١٢٩]

خوا سبحانە وتعالى دەفەرموێ: كاتێك مووسا بە گەلەكەی خۆی گوت: پەنا بە خوا بگرن، پشت بە خوا ببەستن و خۆڕاگر بن، سەرزەمین هی خوایە، دەیكاتە میراتی هەركامێك لە بەندەكانی كە بیەوێ، سەرەنجامیش بۆ پارێزكارانە (گەلەكەیشی وەڵامی دەدەنەوە واتە: بەنوئیسرائیل) گوتیان: ئێمە هەر ئازار و ئەشكەنجە دەدراین، پێش ئەوەی بێی بۆ نێومان و هەروەهادوای ئەوەش كە هاتووی بۆ نێومان (واتە: ئەو بارەی لەسەر پشتمان بووە، هەر لەسەر پشتمانە، لە پەنددا هاتوە دەڵێ: (بە حوشتریان گوت: موژدەت لێ بێ بەچكەت بووە، گوتی ئنجا بە من چی، بارێك كە لەسەر پشتمە، هەر لەسەر پشتمە) یانی: پێشتر بە دەستی فیرعەون و دارودەستەكەی، ئازار و ئەشكەنجە دەدراین و، دوای ئەوەی تۆش هاتووی، ئەو ئازار و ئەشكەنجەیە، هەر بەردەوامە) مووسا فەرمووی: زۆر نزیكە پەروەردگارتان دوژمنتان بفەوتێنێ و، ئێوەش بكاتە جێنشین لە زەویدا (واتە: سەرزەمینی میصر و شام و دەوروبەریان) ئەوجار خوا سەرنج دەدا داخۆ چۆن ڕەفتار دەكەن؟!

لێرەدا مووسا (علیه الصلاة والسلام)، بە گەلەكەی دەڵێ: خۆڕاگر بن و ئەهلی تەقوا بن و، پشت بە خوا ببەستن، پەنا بەخوا بگرن و خۆڕاگر بن، واتە: تەسلیمی ئیرادەی فیرعەون مەبن، خۆڕاگر بن، لەسەر بەرهەڵستیی، دیارە بەرهەڵستییەكەی بەنو ئیسرائیل بۆ فیرعەون و دارودەستەكەی بەرهەڵستییەكی سەنگەرگرتن نەبووە، تەنیا ئەوە بووە تەسلیم نەبوون، واتە: بەرهەڵستییەكی سەلبیی.

واتە: تۆش بەنسبەت حوكمڕانە ستەمكارەكەی ڕۆژگاری خۆتەوە، سەنگەری لێ مەگرە، بەڵام تەسلیمی مەبە، خۆڕاگر بە، چاوت لەو ئیمتیاز و خێر و بێر و تەخشان و پەخشان و نازو نیعمەت و ئیمتیازە ناشەرعییانە نەبێ، كە پێت دەدا، لە بەرانبەر كڕینی ئیرادەت دا، نادیدەی بگرە و چاوپۆشیی لێ بكە، خۆڕاگربن لەسەر هەژاریی و نەداریی، قەناعەت بكەن بە كەمێكی حەڵاڵ، چاوتان لە زۆری حەڕام نەبێ، پشتیش بە خوا ببەستن، چونكە سەرەنجام سەرزەمین هی خوایە، واتە دنیا شاری بێ خاوەن نیە، خوا خاوەنیەتی و، سەرزەمین خوا دەیكاتە میراتی ئەو كەسانەی كە بۆخوا سوڵحاون و سەرەنجام بۆ پارێزكارانە، لێرەدا مووسا (علیه الصلاة والسلام) دەیەوێ بە گەلەكەی بفەرموێ، واتاو چەمكە ئاشكرایەكەی ئاوایە: كە ئێوە لە بەرهەڵستییكردنی فیرعەون و سیاسەتەكانیدا، بە تەئكید دەبێ خەرجی بدەن، دەبێ باج بدەن، بەڵام ئەو باجە زۆر شەرا فەتمەندانەتر و سەربەرزانەترە، ئنجائەو تێچووە زۆریش كەمترە، لەو تێچووەی كە دەیدەن بە هۆی تەسلیمبوونتانەوە بە ئیرادەی فیرعەون و، بەردەوامبوونتان لەسەر كۆیلایەتیی و ژێردەستەیی و، لەسەر ئەوەی هەرچی پێتان بڵێن، لام و جیم نەكەن! بەڵام ئێوە بەرهەڵستی بكەن، لێی هەڵگەڕێنەوە، لێی یاخیی بن، بەقسەی مەكەن.

دەگونجێ گەلێك ئایەتی دیكەو گەلێك دەقی سوننەت، لەوبارەوە بە بەڵگە بهێنرێنەوە، عەقڵ و مەنتیقیش ئەوە دەگەیەنن، هەمیشە تێچووی بەرهەڵستیی ستەم، لە تێچووی بەردەوامبوون لەبن باری ستەمدا، كەمترە، زۆر لە گەلان، زۆر لە كۆمەڵگایەكان، كاتێك لە ستەم لە خراپە ڕادەپەڕن، قۆڵی لێ هەڵدەماڵن، بەڵێ قوربانیی دەدەن، بەڵام زۆری پێ ناچێ، خوا دەربازیان دەكات، بەڵام كۆمەڵگای وا هەبووە، چەند پشتی براونەوە، لە بن باری ستەمدا، حوكمێكی میراتیی بەسەرەوە بووە، باب هاتوە و كوڕ هاتوە و نەوە هاتوە و هی دیكە هاتون و هەر بەردەوام بووە، وەك بەنو ئومەییەو بەنو عەبباس و ئالی عوسمان و، زۆر لە دەسەڵاتدارانی ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا و ئێستاشی لەگەڵدا بێ، قەززافی چل و دوو (٤٢)ساڵ حوكمی كرد لە لیبیا، ئەو خەڵكە هەر صەبری گرتبوو

لەبن باری ستەمدا، سی و دوو (٣٢) ساڵەی حوكمی حوسنی موبارەك و سی و ئەوەندە ساڵەی زەین العابدین بن عەلی و بیست و ئەوەندە ساڵەی عەلی عەبدوڵلا صالح لە یەمەن، هەر خوا دەزانێ چی كراوە و چی گوزەراوە! دیارە مردن هەر ئەوە نیە كە ئینسان مردنێكی جەستەیی و فیزییكی بمرێ، زۆرجار ئینسان بەشێوەی مەعنەویی دەمرێ، ئایا كۆمەڵگایەك خاوەنی دەربڕین و قسەی خۆی نەبێ، خاوەن ئیرادەی خۆی نەبێ، ژیانی خۆی بەدەست خۆی نەبێت، خاوەنی دیارییكردنی چارەنووسی خۆی نەبێت، فەرقی چییە لەگەڵ مردن؟ لەڕاستییدا ئەوە مردووی بەشی زیندووخۆرە، ئنجا تۆ تەماشا بكە! ئەو گەلانەی ڕاپەڕیون، چەند مانگێكی پێچووە، یان ئەوپەڕی ساڵێكی پێ چووە، جگە لە ڕژێمی سووریا، كە ئەگەر هەر رژێمی سووریا و خەڵكی سووریا بوونایە، لە مێژبوو گۆڕبەگۆڕ بوو بوو (بەشار ئەسەد و ڕژێمەكەی) ئنجا وای بە حاڵی دەوڵەتێك، بەرژەوەندیی لە مانەوەی دیكتاتۆرێكدا بێت و، وای بە حاڵی دەوڵەتێك، ڕژێمێك كە بەرژەوەندیی لەوەدا بێ، كە وڵاتێك كاول بكرێ، میللەتێك بێ چارە و خەڵتانی خوێن بكرێت، وای بە حاڵی ئەو دەوڵەتە، ئەگەر ئێرانە، ئەگەر ڕوسیایە، مەبەستم ئەوەیە جگە لەو، ئەوانی دیكە نەیانتوانی، بەرگەی ئیرادەی خەڵك و جەماوەری ڕاپەڕیو بگرن، چل و دوو ساڵ خەڵكی لیبیا چەوساوە بوون، بەڵام چەند مانگێك بەرهەڵستییان كرد، چەند مانگێك مقاوەمەیان كرد، دەربازیان بوو، چەندان ساڵ خەڵكی توونس و خەڵكی میصر و خەڵكی یەمەن چەوساوە بوون، وە خەڵكی دیكەش لە شوێنی دیكە هەن، دەچەوسێنرێنەوە، بەڵام هەمووی چەند ڕۆژێك و چەند مانگێك بەرهەڵستییان كردبایە، ڕزگاریان دەبوو، كەواتە: بەرهەڵستیی كردنی ستەم تێچووەكەی زۆر كەمترە، لە تێچووی صەبر لەسەرگرتنی و خۆلەژێر باری دا نەجووڵاندنی، ئنجا ئەوەی كە دەیڵێم: هەم ئایەتەكانی قورئان دەیگەیەنن، هەم واقیعی مێژووی ڕابردوو و هاوچەرخیش، ئەوەمان پێ دەڵێ، كە هەمیشە تێچووی ڕاوەستان لە بەرامبەری ستەمدا، زۆر كەمترە لە تێچووی تەسلیمبوون بە ستەم، تێچووی تەسلیمبوون بە ستەم، ڕەنگە چەندان پشت (أجیال) بخایەنێ!

**دانـــا: کەواتە: لە قسەکەی جەنابتدا وا دەرئەکەوێ، کە ئەویتریش هەر تێچووی هەیە، بەڵام تێچووەکەی کەمترە!**

**مامۆستا:** بەڵێ، هەرواشم گوتوە، گوتوومە: خەرجیی و تێچووی بەرهەڵستیی ستەم، زۆر کەمترە لە تێچووی ملکەچکردن بۆ ستەم و خۆبەدەستەوەدانی ستەم.

**دانـــا: مامۆستا! باست لە صەبر و خۆڕاگریی کرد، ئا ئەمە بینەر و بیسەر و هاووڵاتییان با بە هەڵە لێی تێنەگەن، صەبر بگرن لەسەر ئەم بارودۆخەی کە هەیە و بڵێن إن شاء الله خوای گەورە بۆمان چاك ئەكات، یان لەسەر چی بگرن؟**

**مامۆستا:** نا، صەبر لەسەر ئەوە بگرن کەتەسلیمیی واقیعێکی گەندەڵ و خراپ نەبن، لەگەڵیدا نەڕۆن، پشتگیریی نەکەن، لێی بێدەنگ نەبن، چاوەڕوانییان لە پارە حەرامەکەی نەبێت، لە ئیمتیازە ناشەرعییەکانی نەبێ، کە پێیان دەدا، لە بەرامبەر بێدەنگکردنیاندا، ئەو مافی بێدەنگیی (حق السكوت)ە بە حەرام بزانن، (حق السكوت) دەزانی مانای چییە؟ یانی: کەسێك ئەندازەیەك شتێك دەدا بە کەسێك، لە بەرامبەر ئەوەدا کە بێدەنگ بێت!

کەواتە: مەبەستم ئەوە نیە کە لە بن باری ستەمدا خۆڕاگر بن، بەڵکو لە بەرامبەر ستەمدا خۆڕاگر بن، کە پێموایە لە بەرامبەر ستەمدا خۆڕاگرتن، ئەو صەبرەیە کە قورئان فەرمانی پێ کردوە، تەماشا بکە! خوا سبحانه وتعالى چۆن باسی ڕووبەڕووبوونەوەی گەلی بەنی ئیسرائیل لەگەڵ فیرعەوندا، دەکات، دەفەرموێ:

﴿ إِنَّ فِرْعَوْنَ عَلَا فِي الْأَرْضِ وَجَعَلَ أَهْلَهَا شِيَعًا يَسْتَضْعِفُ طَائِفَةً مِّنْهُمْ يُذَبِّحُ أَبْنَاءَهُمْ وَيَسْتَحْيِي نِسَاءَهُمْ ۚ إِنَّهُ كَانَ مِنَ الْمُفْسِدِينَ ﴿٤﴾ ﴾ [القصص: ٤].

واتە: فیرعەون لە زەویدا خۆی بەرز کردەوە (واتە: بەبێ ڕەوایەتیی وەرگرتن لە خەڵك، خۆی کردە کوێخا، خۆی کردە حوکمڕان بەسەریانەوەو خۆی فەرز کرد) و خەڵکەکەی بەش بەش کرد، هەندێکی دەچەوساندنەوە، نێرەوەزەکانی

سەردەبڕین و مێینەکانی دەهێشتنەوە، بەڕاستیی (فیرعەون) لە خراپەکاران و تێکدەران، بوو.

بەڵام ئایا خوا ئاوای لێدەگەڕێ!

ئەوجار خوا باسی یاسایەکی گەردوونیی خۆی دەکات:

﴿ وَنُرِيدُ أَن نَّمُنَّ عَلَى ٱلَّذِينَ ٱسْتُضْعِفُوا۟ فِى ٱلْأَرْضِ وَنَجْعَلَهُمْ أَئِمَّةً وَنَجْعَلَهُمُ ٱلْوَٰرِثِينَ ﴿٥﴾ ﴾ [القصص: ٥]

ئێمەش دەمانەوێ چاکە لەگەڵ ئەوانەدا بکەین (منەت بخەینە سەر شانی ئەوانەی) کە لە زەویدا دەچەوسێنرێنەوەو بیانکەینە میراتگرو، بیانکەینە حوکمڕان لە شوێنی ئەو ستەمکارانە.

واتە: ئیرادەی خوا لەگەڵ ئەوەدایەو یەکێك لە یاسا گەردوونییەکانی خوا، وایە کە ستەمکاران سەریان بە فەتارەت بچێ و، چەوساوان دەبێ دەرباز بن، بەڵام هەر لە خۆڕا؟ نا، بەڵکو چەوساوانێك کە ڕادەپەڕن و یەخەی ستەمکار دەگرن، چیدیکە لە بنباری ستەمدا صەبر ناگرن، بەڵکو لە جیاتی ئەوەی لە بن باری ستەمدا صەبر بگرن، لە بەرامبەر ستەمدا صەبر دەگرن، ئنجا صەبرگرتنەکەش ئەوەنیە خەڵکەکە سەنگەرێ بگرێ، هەرگیز خەڵك هان نادەم بۆ توندوتیژیی، بەڵام خەڵك هاندەدەم بۆ خۆڕاگریی، بۆ خاوەن ئیرادەی خۆ بوون، بۆ مرۆڤبوون، بۆ ئازابوون، بۆ ئازادبوون، بۆ ئەوە کە ئەو پێنج و دوو ڕۆژەی دنیا، سەربەرزانە بگوزەرێنن، کاتێك دەچنەوە خزمەت خوا و خزمەت پێغەمبەری خوا (علیه الصلاة والسلام) ئەگەر مسوڵمانن بزان بە چ چاوڕوویەکەوە دەچنەوە، ئەگەر مسوڵمانیش نین، بزانن کە مێژوو بۆیان دەنووسێت، تەماشا بکە! میللەتان کە ڕاپەڕیون لە ڕۆژهەڵات لە ڕۆژئاوا، ئەوانەی کە ڕاپەڕیون لەدژی ستەم، ناویان زۆر بە شێوەیەکی پڕشنگدار تۆمارکراوە، ئەوانەش کە تەسلیمبوون، فڕێدراونە زبڵدانی مێژووەوە، کەس باس و خواسیان ناکات، ئینسان یەك مردن قەرزدارە، کەسێك کە لە شەڕدا دەکوژرێ، لە سینگی بدرێ، یا لە پشتی بدرێ، لە کاتی

هێرشبردندا لێی بدرێ، یان لە کاتی هەڵاتندا، مردن هەر یەك تامی هەیە، شاعیرێك دەڵێ:

إذا كـنـت ذا أمـــر مـــروم
فلا تقنع بمــا دون النجـوم
فطعم الموت في أمر حـقير
كطعم الموت في امر عظيم
ويرى الجبناء أن الجبن حزم
وتلك خديعة الطـبع اللئيـم

واتە: مەبەستم ئەوەیە کە بەداخەوە: زۆربەی خەڵکی بە وەهم خۆی ترساندوە، زۆربەی خەڵکی بە وەهم خۆی فەقیر کردوە، زۆربەی خەڵکی بە وەهم هەر بە خەیاڵ هەر لە خۆوە دەست و پێی خۆی بەستوەو خۆی پەکخستوە، خۆی لە پەلوپۆ خستوە، وەك گوتم و جارێکی دیکەش دووبارەی دەکەمەوە: پێم وایە بارودۆخی هەرێمی کوردستان ئەوە هەڵناگرێ و پێشم ڕاست و دروست نیە، لە نێوان خۆماندا دەست بخەینە یەخەی یەکدی، دەست بخەینە خوێنی یەکدی، ئیبنولئەسیر لە (الكامل في التأريخ)دا دەڵێ: دوا حوکمڕانی بنەماڵەی عەبباسییەکان: (المستنصر بالله) لە بەغدا، سوپای هۆلاکۆ دەوری بەغدای گرتبوو، بەچی بێدار بووەوە کە دەوری بەغدا گیراوە؟ ڕاپۆرت نووس و ئەوانە کە نانیان لەسەر غەیبەت کردن و جاسووسیی و سیخووڕیی یە، کە ئێستاش ئەوە هەر هەیە، ئەوانەی نانیان لەسەر ئەوەیە دەیانگوت: قوربانی دنیا زۆر ئارامەو وەزعەکە زۆر چاکە! بەچی بێداربووەوە؟ یەکێك لە کەنیزەکەکانی سەمای بۆ دەکرد، تیرێك لە پەنجەرەوە هاتە ژوور، بەر کەنیزەکەکە کەوت و لە خوێنی خۆیدا گەوزا، کەوتە ئەرز،گوتی ئەوە چی بوو؟ گوتیان: ئەوە تیر بوو، گوتی: تیری کێ بوو؟ گوتیان: تیری تەتەر و مەغۆلەکانە، بۆچی بەغدا ئابلۆوقە دراوە؟!

پێموایە ئەوەی بە قسەی عاقڵانی دڵسۆز و دووربین نەکات، بە قسەی ئەو کەسانە نەکا، کە ڕاست و ساغن لەگەڵ ئەم وڵاتەدا و، خۆ دوور دەگرن

لە ماستاوو کردن و خۆبردنە پێش، ئەوەی بە قسەی ئەوانە نەکات و، بە قسەی ڕاپۆرتنووس و دەهۆڵکوتان و ئەوانە بکات کە دنیا پێچەوانە پێشانی بڕیاربەدەستان دەدەن، کاتێك بەخەبەر دێ کە کار لەکار ترازاوە!

ئومێدم وایە ئێمە هەموو لایەك خۆمان لەوە بپارێزین، کە گرێی دەستان بخەینە ددانان، ئەگەرنا لەگەڵ ئەوەدام، خەڵك و جەماوەر بە گشتی، حوکمڕان و بڕیاربەدەستەکانی خۆی حاڵیی بکات، لە هەست و نەستی، لە هەڵوێستی، لە قەناعەتی و، دیزە بە دەرخۆنەی لێ نەکات، چونکە ئەوە نادڵسۆزییە بۆ بڕیاربەدەستان و حوکمڕانان، کە تۆ قەناعەتی دڵی خۆت بەوان نەڵێی، چونکە خەڵك زۆر دێ بۆ لای من، لێرە لە هەولێر و لە بادینان و لە سلێمانیی و شارەزوورو دەڤەری گەرمیان و بیتوێن و پشدەر و کەرکووك و ...هتد. لە هەموو شوێنان خەڵك زۆر بێزار و توورە و ناڕازییە، لە هەموو توێژەکان: خەڵکی سیاسیی هەیە، خەڵکی حیزبیی هەیە، خەڵکی کارمەند هەیە، خەڵکی بازرگان هەیە، ئەهلی کەسابەت هەیە، ڕێکخراوەکان هەیە، لە هەموو چین و توێژەکان، خەڵك دێ بۆ لای ئێمە، ئێمە دەرگامان بە ڕووی خەڵکدا والآیە و دانەخستوە، پێیان دەڵێم: واباشە ئەو ناڕەزایی و بێزاریی و گلەییە بگاتە گوێی هەموو خەڵك، بەداخەوەش دەڵێم: زۆر لە بڕیاربەدەستان و حوکمڕانەکانیش لە بورجی عاجییدا دەژین، لە نێو خەڵکدا نین و، وە لەڕێی ئەو ڕاپۆرتانەوە کە پێیان دەگەن، ئەوانەی کە دنیا بە جۆرێکی دیکە دەخەنە بەرچاو، لەو ڕێیەوە، دەنگوباسیان پێ دەگات، کە چ باسە؟ کە ئەوەش زۆری پێچەوانەی ئەو واقیعەیە کە هەیە، ئەوان پێچەوانەی واقیعەکەیان دەخەنە بەرچاو، سەرەنجام بە سەهوویان دەبەن.

**دانــا: مامۆستا! قسەیەکی جەنابت سەرنجی ڕاکێشام، فەرمووت: ئەگەر بمانەوێ بەرەمان لە ئاوێ دەربێنین، مەبەستت چییە، ئایا ئێستا لە هەرێمی کوردستان دا خەڵکی ئێمە، بەرەی کەوتووەتە ئاوێ؟**

**مامۆستا:** پێموایە نەك هەر بەرە، بەڵکو کەلوپەل و شمەکەکەمان، هەمووی کەوتووەتە نێو ئاوێ، وەبیرم دێ ماڵمان لە ڕانیە بوو، لافاو هات، قەت لەبیرم ناچێ ئەو بیرەوەرییە، بابم توتنەوان بوو، کشتوکاڵمان دەکرد، تەماتە و پیازمان

دەكرد، فەردە تووتنەكانمان تەڕ بوو بوون، كە دیارە بەكەڵك نەهاتن، كەلوپەلیشمان هەمووی تەڕ بوو، زاد و زەخیرەشمان هەمووی تەڕ بوو، باڵایەك، نیو باڵا پیاو، ئاو هاتبووە نێو ماڵەكەمانەوە، بە پەلەپڕوزە بەسەر دیواری دراوسێكەماندا دەرباز بووین، بە سەربانداو، ئەگەرنا ئێمەش نیزیك بوو بخنكێین.

بەڵێ و پێموایە نەك هەر بەرەمان تەڕ بووە، وەك ماڵەكەی ئێمە، بەڵكو كەلوپەل و زادو زەخیرەشمان هەمووی تەڕ بووەو، وەزعمان زۆر خراپە ئەوەی كە من تێیدەگەم، خوایە وا نەبێ و من بەهەڵەدا چووبم، بەڵام ئەو خەڵكە كە دێن بۆ لای ئێمە، ئەو خەڵكە خۆپیشاندان دەكەن، ئەو خەڵكە كە شت دەنووسن و، ئەو خەڵكە كە دڵسۆزانە هاوار دەكەن، دەگونجێ هەموو بەهەڵەدا چووبن، بە سەهوو چووبن؟! ئیدی ئەوە واقیعێكە و دەچێتە چاومانەوە دەیبینین، ئێ باشە هەر نەبێ نەبێ، ئەوەتا دیارە چارەگە مووچەكەش تەواو نادرێ، ئەوە دیارە، وانیە؟ ئەوە هەر دیارە كە خەرجیی زۆر كەم كراوەتەوە لە زۆر لە دامودەزگاكان دا، وانیە؟ بەرپرسانی حكوومەت پێیان گوتووم، پێنج هەزار (٥٠٠٠) پرۆژە، پەكیان كەوتوە لە هەرێمی كوردستاندا، كە هەیە لەسەدا حەفتا (٧٠٪)ی هەشتای تەواو بووە، بە واریدات و بوودجە و ماڵی ئەم خەڵك و وڵاتە سەدا حەفتا و هەشتای پرۆژەی وا هەیە، چەند ملیۆن دۆلارێكی تێچووە، ئێستا ئەگەر تەواو نەكرێ، ئەوە هەمووی لێی دەچیە خەسارێ! كەواتە: وەزعەكەمان خراپە ئینسان دەبێ بە خۆزگەو خەون و خەیاڵ، خۆی هەڵنەخەڵەتێنێ، واقیعەكە دەچێتە چاوی هەموو لایەكمانەوە:

١) ئێمە لە ڕووی سیاسییەوە، لایەنە سیاسییەكان پێكەوە قسەیان نیە، ئەوە دیارەو بارگرژییەكی سیاسیی باش هەیە.

٢) لە ڕووی ئابوورییەوە ئەوە دیارە وەزعمان چۆنە، باسمان كرد، چارەكە مووچە و پەكخستنی ئەو پرۆژانە.

٣) لە ڕووی كۆمەڵایەتییەوە، جۆرێك لە لێك دووركەوتنەوە و دابڕان لەنێوان توێژو پێكهاتەكانی كۆمەڵگادا هەیە.

٤) لە ڕووی دبلۆماسیەتەوە، بەڵێ مامەڵەمان لەگەڵدا دەكرێ، بەڵام پێموایە ئەو مامەڵەیە لەبەر چاوی كاڵی ئێمە نیە، چونكە پێشتریش ئێمە هەر هەبووین، ئەدی ئەو سەرۆك و بەرپرسانە، بۆچی نەدەهاتن و مەرحەبایان نەدەكردین، با بە هۆی شەڕی داعشەوە خۆمان هەڵنەخەڵەتێنین.

٥) پاشان ئێمە چوار دامەزراوەمان هەن كە قەوارەی سیاسی ئەم هەرێمەیان پێكهێناوە:

أ- دامەزراوەی پەرلەمان، كە پەكمانخستوە.

ب- دامەزراوەی حكوومەت كە ئیفلیجمانكردوە.

ج- دامەزراوەی دەسەڵاتی دادوەریی.

د- دامەزراوەی سەرۆكایەتیی هەرێمیشمان هەیە، كە ماوەی یاسایی بەسەرچووە.

ئەدی چیمان سەلامەت ماوەتەوە؟ لە ڕاپۆرتێكدا بینیم دەڵێ: تەنیا بیست و شەش لەسەدای دامودەزگاكانی حكوومەت لەم وڵاتەدا، سەلامەت ماون لەكارنەخراون، هەرچۆن بێ واقیعەكە وەك گوتم، دەچێتە چاوی هەموو كەسێكەوە، لە ڕووی ئابووریی، لە ڕووی سیاسی لە ڕووی كۆمەڵایەتیی، لە ڕووی دامەزراوەیی یەوەو ئێمە وەزعمان خراپە، ئەگەربێتو واقیعەكە وەك خۆی نەبینین وە ئیرادەیەكی باش نەخەینە گەڕ، بە تەئكید لەوەی كە ئێستا هەین، بەرەو خراپتریش دەچین.

**دانـــا: فەرمووت: ئێمەی لایەنە سیاسییەكان قسەمان نییە بەیەكەوە، حەز دەكەم منیش و بینەرانیش بزانین، ئێوە لەسەر چی و بۆچی قسەتان نیە بەیەكەوە؟ لەسەر ئیمتیازاتی كەسیی و حیزبیی خۆتانە؟ یان لەسەر خەڵكی ڕەش و ڕووت و خەڵك و جەماوەرە؟**

**مامۆستا:** ئەوە دەبێ تۆزێ ورد بكرێتەوە، جارێ ئێمە خۆمان، خۆم وەك عەلی باپیر و كۆمەڵی ئیسلامییش بە گشتی، ئێمە بڕیارمان وایە خۆمان لەكەس دانابڕێین، قسەش لە كەس نابڕین، بەڵام قسە بە گشتی دەكرێ، هەموو جارێ

نابێ بڵێی: عەمر وا و زەید وا، بە گشتی قسە دەکرێ، من دەڵێم: لایەنە سیاسییەکان لە هەرێمی کوردستاندا، بارگرژیی و قسە پێکەوە نەکردن و پێکەوە ڕاوێژ نەکردنیان لەبەیندا هەیە و، ئەوەش واقیعێکە و دیارە، ئەمما بۆچی وایە؟ وەك گوتم: ئێمە خۆمان هەر لە شوێنی خۆمانین، قسەشمان لەگەڵ کەس نەبڕیوەتەوەو، دەرگاشمان بە ڕووی کەسەوە دانەخستوە، ئەگەر کەسێکیش قسە لەگەڵ ئێمەدا نەکاو، دەرگامان بە ڕوودا دابخات، بۆ خۆی دەزانێ و، بێ منەتیشین، هەندێ جاریش هەندێ پڕوپاگەندە دەکرێن: فلان کەس داوای کردوە: فلان کەس ببینێ! ئەو قسانە عەیبە بکرێن، جارێ ئەگەر گریمان کەسێك دڵسۆزانە بشیەوێ کەسێك ببینێ و وەزعەکە چاك بکات، هیچ عەیب نیە، بەڵام لە دەرگای کەسمان نەداوەو، لە کەسیش تووڕە نین، بەو واتایە کە وەك شەخص کەسێك لە کەس تووڕە بین، یان بڕیارمان هەبێ قسە لەگەڵ خەڵك دا نەکەین، چونکە ئێمە زۆر جاران گلەییمان لە خەڵکی دیکە کردوە، کاکە پێکەوە دابنیشن، نابێ قسە لەیەك ببڕنەوە! کەواتە: شتێك لە خەڵك بە عەیبی بگرم، بۆ خۆم دووبارەی ناکەمەوە، بەڵام ئێمە لە شوێنی خۆمانین، مەبەستم ئەوەیە.

**دانـــا: ئەدی بۆچی نێوانتان ئاڵۆز بووە؟**

**مامۆستا:** بەڵێ، ئێستا باسی دەکەم: کاتێك کە حیزبێك پەرلەمان پەك دەخات، سەرۆکی پەڕلەمان دەردەکات، حکوومەت ئیفلیج دەکات، خەڵك دەردەکات لە پایتەختی کوردستان، کە ئەو حیزبەش پارتی دیموکڕاتی کوردستانە، ئایا ئێمە دەکرێ بێدەنگ بین؟ ناکرێ بێدەنگ بین، ئەوەش مانای وانیە کە من دەڵێم: نابێ پارتی هەبێ و ڕەفزی دەکەم و، قسەی لەگەڵ ناکەم، نا، بەس دەڵێم: پارتی! ئەو هەڵوێستەت غەڵەتە، شتی باشت باشە، شتی خراپیشت خراپە، ئنجا ئەگەر گۆڕانە ئەو حیزبە، ئەگەر یەکێتییە، ئەگەر کۆمەڵە، ئێمەش شتمان هەیە هەڵەیە، من بۆ خۆم شتم کردوە، هەڵەیە گوتوومە: دانی پێدا دێنم ئەوەم هەڵەیە، نەدەبوو وام کردبایە، نەدەبوو وام گوتبایە، کەسێ یادداشتەکانم بخوێنێتەوە، دەزانێ، شتم گوتووەو شتم کردووە، ئێستا دەزانم هەڵەبووەو ئەگەر ئێستابایە، نەمدەکرد، یان نەمدەگوت.

**دانـــا: زەرەرت کردوە لەو دان پێداهێنانەدا؟**

**مامۆستا:** من بە زەرەری نازانم، وەك پێشتریش باسمکرد پێموایە خەڵکی زەعیف لەوە دەترسێ دان بە هەڵەی خۆیدا بێنێ، بۆچی وات قەرار داوە تۆ مەعصووم بی؟ بۆ تۆ بینات لەسەر ئەوە کردوە کە تۆ پارێزراو بی لە هەڵە؟ بێجگە لە فریشتەکان هیچ کەس لە هەڵە پارێزراو نیە، پێغەمبەرانیش صەڵات و سەلامی خوایان لەسەر بێ، کە دەڵێین: لە هەڵە پارێزراون، واتە لە هەڵەی ئانقەست، لە گوناحی بە ئەنقەست، ئەمما لە هەڵەی ئیجتیهادیی، تا پێغەمبەری خاتەم موحەممەد (علیه الصلاة والسلام) سەروەری پێغەمبەرانە، ئەدی خوای میهرەبان چەند جاران ڕەخنەی لێ گرتوە لە قورئاندا، بۆ نمونە:

١) ﴿ عَفَا ٱللَّهُ عَنكَ لِمَ أَذِنتَ لَهُمۡ ﴾ [التوبة : ٤٣].

واتە: خوا لێت ببورێ بۆچی ئیزنتدان، مونافیقەکان دڵنەخۆشەکان کە هاتن گوتیان با نەیەین بۆ جەنگی تەبووك، بۆچی مۆڵەتت دان؟ نەدەبوو وات کردبایە.

٢) ﴿ مَا كَانَ لِنَبِيٍّ أَن يَكُونَ لَهُۥٓ أَسۡرَىٰ ﴾ [الأنفال: ٦٧].

واتە: هیچ پێغەمبەرێك بۆی نیە دیلان بگرێ.

نەك مەبەست ئەوەبێ دەبوو دیلان بکوژێ! لە بەرگی حەوتەمی تەفسیرەکەمدا (تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز) ڕوونمکردۆتەوە. ئەوە نیە کە خوا لە ڕەخنە لە پێغەمبەر بگرێ: بۆچی دیلەکانت نەکوشت؟ نە و، یانی بۆچی بە دیلتان گرتن؟ دەبوو بە دیلت نەگرتبانایە، لە بەرامبەر ئەوەداو لە تەماعی ئەوەدا کە دوایی فیدییەیان لێوەربگرن، چونکە جارێ دوژمن خۆی بە شان و شەوکەت دەزانی، دەبوو لە پەلەپۆتان خستبان، نەك بە تەماعی ئەوەی کە دوایی خۆیان دەکڕنەوە، بە دیلیان بگرن، نەك خوا رەخنە بگرێ لە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) بۆچی دیلتان نەکوشتن؟ دیل کوشتن لە ئیسلامدا نیە.

٣) ﴿ عَبَسَ وَتَوَلَّىٰٓ ۝١ أَن جَآءَهُ ٱلۡأَعۡمَىٰ ۝٢ ﴾ [عبس : ١ـ ٢]

واته: ڕووی خۆی گرژ کرد و خۆی وەرسووڕاند کە پیاوە کوێرەکە هات بۆ لای.

خوا ڕەخنە لە پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) دەگرێ، هەروەها لە چەندان هەڵوێستی دیکەدا، کەواتە پێغەمبەرانیش صەڵات و سەلامی خویان لەسەر بێ، لە هەڵەی ئیجتیهادیی، لە بۆچوونێکدا کە پێیان وابووبێ واباشە، پارێزراو نەبوون لە هەڵە، بەڵام شتێك زانیبێتیان کە گوناحە نەیانکردوە، لەوە پارێزراو بوون، هیچ گوناحێکیان نەکردوە کە زانیبێتیان گوناحە، بەڵام جاری وا هەیە نەیانپێکاوە، ئنجا ئەگەر پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) وابووبن ئێمەو مانان، چی!!

**دانـــا: مامۆستا! ویستم ئەوە بپرسم، ئێوە کە نێوانتان بە جۆرێ لە جۆرەکان ساردیی تێکەوتوە، بۆ نموونە کۆمەڵی ئیسلامی سکرتێری پەرلەمانەکەی رێگری لێ ناکرێ، وەزیرەکانی لە حکومەتەکەدا بەشدارن، بەڵام بەینتان هەر بەو شێوازەی جاران باش نەماوە، ئەمە لەسەر خەڵکی تر و مەزڵوومی ترە یان چی؟**

**مامۆستا:** نا، ویستم ئەوەت بۆ تەواو بکەم، کۆمەڵی ئیسلامیی و پێشموایە هەموو کەسێکی دیکەش پێویستە هەڵوێستەکانی پەیوەندییان بە کاردانەوەی خەڵکەوە نەبێت و،دەرەنجامی خۆ تێکبەستن لەگەڵ خەڵکێك دا نەبێت، مەگەر ئیتیفاقێکیان هەبێ، دوو لایەن ئیتیفاقیشیان پێکەوە هەبێ، دەبێ کە هەڵەی کرد بڵێی: تۆ لەوەدا هەڵەی و من لەگەڵ ئەو هەڵەیەدانیم، زۆرجار گوتوومە: لایەنە سیاسییەکان لە هەرێمی کوردستاندا، یەکێ لە هەڵە کوشندەکانیان ئەوەیە کە کەسێك دۆستایەتیی حیزبێك دەکات، هەتا کۆتایی خەت لە گەڵیەتی، چاك بکات و خراپ بکات، راست بڕوات و چەوت بڕوا، هەر لەگەڵیەتی، نا، تۆ دەبێ بڵێی: هەتا لەسەر حەقی، لەگەڵتم، هەتا چاك بڵێی و چاك بکەی لەگەڵتم، بەڵام لە خراپەدا لەگەڵت نیم، ئەوە ڕاستە، دەبێ ئێمە لە حەقدا پشتی یەکدی بگرین و، لە ناحەقدا دەستی یەکدی بگرین و نەك پشتی یەکدی بگرین، دەستی یەکدی بگرین و نەهێڵین بەرێی ناحەقدا بڕوا، ئەوەیە دڵسۆزیی بۆ یەکدی، ئەوە دڵسۆزی نیە لایەنێك حیزبێك بڕیاری داوە لەگەڵ ئەو حیزبەدا بڕوا، چاك بکا

و خراپ بکات، هەر لەگەڵیدا بێت، دوایی پینەو پەرۆشی بۆ بکات، ئنجا هی وامان هەیە وەك دەڵێ: (کاسە لە چێشتێ گەرمتر) لایەنم بینیوە دان بەهەڵەی خۆیدا دێنێ، ئەوی دیکە دەڵێ: نەخێر قوربان هەڵەت نەکردوە، وەك شێخ و دەروێشەکەی لێ دێ، دەروێشێك گوتی: شێخم بینیوە فڕیوە، گوتیان: شێخ جەنابت فڕیوی؟ گوتی نەوەڵڵا نە فڕیویم و نە دەشفڕم، گوتیان: دەروێش فلان کەس وا دەڵێ، دوایی گوتیان: دەروێش! جەنابی شێخ دەڵێ نەفڕیوم و تواناشم نیە بفڕم، گوتی: شێخ سەهووی کرد، هەر فڕیوە!! هەڵە هەڵەیە و تەواو.

ئنجا نابێ هیچ تەماعی لە هیچ کەسدا هەبێ، کە لە هەڵەدا پشتگیری بکات، دڵسۆزیی ئێمە بۆ هەر کەسێك و دڵسۆزیی هەرکەسێك بۆ ئێمە، ئەوەیە کە لە هەڵەدا یەکدی ڕاست بکەینەوە هەڵەیە.

**دانا: کەواتە: کۆمەڵی ئیسلامیی کە پەیوەندیی لەگەڵ بەشێك لە لایەنە سیاسییەکان ساردبووەتەوە، لەسەر ئیمتیازە تایبەتییەکانی حیزبەکە نیە، بەڵکو لەسەر کۆی خەڵك و جەماوەر و سیستمی حوکمڕانییە؟**

**مامۆستا:** با من تەعبیرەکەت بۆ ڕاست بکەمەوە: بڵێ: کۆمەڵی ئیسلامیی کە هەندێك لە لایەنە سیاسییەکان پەیوەندییان لەگەڵی ساردبۆتەوە، چونکە ئێمە بڕیارمان نەداوە پەیوەندییمان لەگەڵ کەسدا سارد بێ، ئێمە لە جێی خۆمانین، بەڵام خەڵکێك بڕیاری داوە لەبەرئەوەی تۆ بە دڵی ئەو نیت، پەیوەندیی سارد بێ جارێك حیزبێك هاتن بۆ لامان، گوتم: گوێتان لێ بێ! ئەگەر دەتانەوێ پەیوەندییتان لەگەڵ ئێمە هەبێ، دەبێ ئێمەتان وەك خۆمان قبووڵ بێ، نەك وەك خۆتان دەتانەوێ، ئێمەش ئێوەمان وەك خۆتان دەوێ، نەك وەك ئەوەی ئێمە دەمانەوێ! پێموایە لەسەر ئاستی تاکیش هەروایە، من لە کۆمەڵی ئیسلامییدا، تەماعی ئەوەم نیە، کە تێکڕای تاکەکانی کۆمەڵی ئیسلامیی بە خوشکان و برایانەوە، لەوردو درشت دا وەك من بیر بکەنەوە، من چیم پێ چاك بێ، پێیان چاك بێ، نا، دەبێ ئەوانم وەك خۆیان قبووڵ بێ، ئەوانیش دەبێ منیان وەك خۆم قبووڵ بێ، بەڵام دەبێ لەسەر شتە بنەڕەتییەکان پێکەوە بین، بەڵام هەرکەسە دەبێ پەراوێزێکی بۆ بهێڵدرێتەوە، بۆ تایبەتمەندییەکانی.

ئنجا بەڕاستیی ئێمە پەیوەندییمان لەگەڵ کەس سارد نیە، بەڵام خەڵکێك کە پەیوەندیی لەگەڵ ئێمەدا ساردە، لەبەر هەڵوێستەکانمانە، لەبەرئەوە نیە کە ئێمە چاوەڕوانییەکمان لە کەس هەبێ، بەڵام ئێمە خێروبێر و واریداتی ئەم وڵاتە بە موڵکی تایبەتی کەس نازانین.

با شتێکی خۆشت بۆ بگێڕمەوە: جارێك برادەرانی گۆڕان هاتن بۆ لامان، تازە نانیان بڕابوو، لە ساڵانی زوودا، گوتیان: براوە و نانبڕان زۆر ناخۆشە و خەڵکێکمان فەصڵ کراوە، گوتم، زۆر لەسەر دڵتان قورسە؟ گوتیان: بەڵێ، گوتم: ئێوە تازە نانتان بڕاوە، ئێمە بیست و ئەوەندە ساڵەیە لەم وڵاتەدا نانمان دەبڕدرێ، گوتیان: بەڵێ، گوتم: ئێستا بۆتان دەرکەوتوە نانبڕان زۆر ناخۆشە! گوتم: ئێوە هەر ڕەخنەتان لە نانبڕانەکە هەیە؟ گوتیان: بەڵێ، گوتم پێموایە قۆناغێکی دیکە بچنە ئەولاتر، گوتیان: چۆن؟ گوتم: نانەکە بۆچی بەدەست حیزبێکە، بیبڕێ، نان نانی خوایە، عەبد عەبدی خوایە و زەوی زەوی خوایە، نان بۆچی بەدەستی حیزبێك بێ؟ یان بەدەستی چەند کەسێك بێ؟ بە کەیفی خۆی، بیدا بەو و نەیدا بەو؟ نان نانی خوایە، ئەصڵەن ئێمە دەبێ شەڕ لەسەر ئەوە نەکەین، نانمان بۆچی دەبڕدرێ! قۆناغێك بچینە پێشتر: نانەکە بۆچی بەدەستی ئەوبێ؟ ئەگەر وڵات بەدامەزراوە بکرێ، ئەگەر مرۆڤبوون و هاووڵاتییبوون بە پێوەر بگیرێ، نان بەدەستی کەس نابێ، نان بەدەستی دامەزراوەکان دەبێ، دامەزراوەکانیش دەبێ هەموو هاووڵاتیانیان پێ وەك یەك بن، ئەوکاتە ئەوەی کە ئێستا دەیبینین، بەتایبەتی لە کاتی هەڵبژاردنەکاندا، کە خەڵکێك شتی بەسەردا ئیملا دەکرێ، نامێنێ. خەڵك هەیە لە هەندێ لە ناوچەکانی هەرێمی کوردستان هاتوە بۆ لام گوتوویەتی: من فڵانە حیزب پێی گوتووم: ئەوەندە دەنگەمان لە ئێوە دەوێ، بۆ نمونە: شەست (٦٠) دەنگمان لە خۆت و خزمانت دەوێ، پەنجاو نۆ (٥٩) بێ نامانەوێ! ئایا ئەوە کوردایەتییە یان کۆیلایەتییە؟ من پێموایە کوردایەتیی و نیشتمانپەروەریی ئەوەیە کە ئینسان خاوەنی ئیرادە و ویستی خۆی بێ، ئنجا ئەگەر (تاکەکان خاوەنی ئیرادەی خۆیان نەبن، چۆن میللەتێك خاوەنی ئیرادەی خۆی دەبێ؟! ئایا ئەو میللەتە، ئەو کۆمەڵگایە هەر

لەو تاكانە پێكنایەت؟ تۆ ئەگەر تاكەكان بەو جۆرە بێ جەوهەر بكەی، ئیرادەیان وردو خاش بكەی، وایان لێ بكەی كە بەدەست خۆیان نەبێ چ دەنگێك بدەن، چ رەئییەك دەربڕن، چ بۆچوونێكیان هەبێ، میللەتەكە چۆن بێ ئیرادە نابێ؟!

بە كورتی: كۆمەڵی ئیسلامیی ئیمتیازی تایبەتی هەرنەبوون و، هەڵوێستی ئێمەش پەیوەندیی بە وورده شتانەوە نیە، بەڵام بێگومان هەمووڵایەك مافمان هەیە لە واریداتی هەرێم داو ئەوەی وارش دەكات ئەو ڕەوش و ڕووتە، ئەو خەڵكە بەشی بخورێ، ئەو حیزب و خزمەیە كە دەكرێتە ملیاردلێر، ئەو ملیاردلێرانەن بەشی ئەو ڕەش و ڕووتانەن دەبرن.

**دانــا: مامۆستا! با بێینەوە سەر تەوەری بابەتەكە، كێ بەرەنگاری ستەم ببێتەوەو، چۆن بەرەنگاری ببێتەوە؟ بۆ نموونە: ئێوەی لایەنە سیاسییەكان، چۆن بەرەنگاری ئەبنەوە؟**

**مامۆستا:** هەموو لایەنەكان لەسەریان پێویستە، بەرەنگاری ستەم و ناشەرعیی ببنەوە، خوای دادگەر دەفەرموێ:

﴿ وَٱلْمُؤْمِنُونَ وَٱلْمُؤْمِنَٰتُ بَعْضُهُمْ أَوْلِيَآءُ بَعْضٍۚ يَأْمُرُونَ بِٱلْمَعْرُوفِ وَيَنْهَوْنَ عَنِ ٱلْمُنكَرِ ﴾ [التوبة: ٧١]

واتە: پیاوانی بڕوادار و ئافرەتانی بڕوادار، دۆست و پشتیوانی یەكدین، فەرمان بە چاكە دەكەن و ڕێ لە خراپە دەگرن.

هەروەها دەفەرموێ: ﴿ وَلْتَكُن مِّنكُمْ أُمَّةٌ يَدْعُونَ إِلَى ٱلْخَيْرِ وَيَأْمُرُونَ بِٱلْمَعْرُوفِ وَيَنْهَوْنَ عَنِ ٱلْمُنكَرِۚ وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُفْلِحُونَ ﴿١٠٤﴾ ﴾ [آل عمران: ١٠٤]

كەواتە: ئێمە دەبێ هەموومان بە كۆ، دژی (منكر) بین، كە شیرك و زوڵم گەورەترین (منكر)ن، شیرك وەك نێوان مرۆڤەكان و خواو، زوڵم وەك پەیوەندیی نێوان مرۆڤەكان خۆیان و خۆیان، هەروەك (توحید) گەورەترین (معروف)ە، وەك پەیوەندیی نێوان مرۆڤەكان و خوا، كە دەبێ تەنیا خوا بپەرسترێ، دادگەرییش گەورەترین (معروف)ە وەك پەیوەندیی نێوان مرۆڤەكان خۆیان و خۆیان.

بەڵێ: هەموو لایەك مولزەمین بەوەی كە فەرمان بكەین بە شتە پەسەندەكان و، ڕێگریی بكەین لە شتە ناپەسەندەكان، بەڵام بە تەئكید هەركەسە بەپێی خۆی، بۆیە پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) دەفەرموێ: (مَنْ رأى منكم منكراً فليغيِّره بيده، فإن لم يستطيع فبلسانه، فإن لم يستطيع فَبقلبهِ، وليس وراء ذلك مثقالَ حبة خردل إيمان) رواه مسلم، واتە: هەركامێك لە ئێوە ناشەرعییەكی بینی، با بە دەست، بە هێز بیگۆڕێ، (مادام دەستی دەڕوا دەبێ بە دەست بیگۆڕێ)، ئەگەر نەیتوانی بەدەست بیگۆڕێ، با بە زمان، (بە قسە بە نووسین بە تەعبیر) هەیە ئەوەشی لە تواناداا نیە، (نە قسەی لە تواناداىە نە نووسینی لە تواناداىە)، ئەوەیان با بە ئیرادە و بە دڵ، دژی ناشەرعیی بێ، تۆ ئەگەر بە ئیرادە و بە دڵ لەگەڵ مونكەردا نەبی، ئەگەر دڵەكەت ڕاست بكات، قالبەكەشت پەلكێش دەكات، هەندێ كەس ئەوە بە كەم دەزانێ، نا، جارێ توانای هەر ئەوەندەیە، كەسێك كە نە بڕیاربەدەستە، تاكو بەدەست بیگۆڕێ، نە نووسەر و وتاربێژ و شارەزایە، تاكو بە زمان بیگۆڕێ، دەمێنێتەوە چی؟ با بە دڵ پێیناخۆش بێ، چونكە كە بە دڵ پێیناخۆش بێ، لەگەڵیدا نابێ، كە لەگەڵیدا نەبوو، خۆی لێ دابڕی، ئەوەش هەڵوێست وەرگرتنە، دوایی پێغەمبەر دەفەرموێ (علیه الصلاة والسلام) لە دوای ئەوە هێندەی دەنكە خەرتەلەیەك ئیمان نیە، كەواتە: هەموو لایەك مولزەمین، بەڵام بەبەرهەڵستیی ستەم و لادان هەركەسە بەپێی خۆی.

**دانـــا: ئێستە كۆمەڵی ئیسلامی لە كام قۆناغیاندایە؟**

**مامۆستا:** پێموایە خەڵك و جەماوەری ئێمە لە هەرێمی كوردستان دا، ئەو شایەدییەمان بۆ دەدا، كە كۆمەڵی ئیسلامیی باجی داوە لەسەر هەڵوێستەكانی و، كۆمەڵی ئیسلامی هەر ڕۆژە قسەیەك ناكات، سەرڕاستانە و بەرچاوڕوونانە هەنگاو دەنێ، ئنجا كۆمەڵی ئیسلامیی بڕیاری نەداوە هەتا سەر لەگەڵ كەس بێ، یان تاكو سەر دژی كەس بێ، ئێمە تا سەر دژی ستەمین، دژی خراپەین و تا سەر لەگەڵ دادگەریی و چاكە و لەگەڵ مەصڵەحەتداین، لە هەر كەسێك و لەهەر لایەكەوە بێ، هەركەسێ قسەیەكی باش بكات لەم وڵاتەدا، ئەگەر بۆمان بكرێ، یەكسەر پشتگیریی دەكەین و، هەركەسێ هەنگاوێكی خراپ بنێ،

شتێكی خراپ بكات، ئەگەر بۆمان بگونجێ، بزانین لە تواناماندایەو، خراپی لێ نەخوێنرێتەوە، دەڵێین: ئەوەت خراپە، جاری واش هەیە ئینسان خۆدەپارێزێ لە هەندێ قسە و هەڵوێست لە بەرامبەر قسەی لار و كاری چەوت دا، نەوەك بەرژەوەندیی نەهێنێتە دی و، وە زیانی زیاتری لێ بكەوێتەوە.

**دانـــا: مامۆستا عەلی باپیر و كۆمەڵی ئیسلامیی، ئەو قسانەی لە كەناڵەكانی میدیاوە ئەیكەن، ئەو دڵسۆزییانەی ئەیڵێن، لە كۆبوونەوە دوو قۆڵیی و پێنج قۆڵی و چەند قۆڵییەكانیشدا، ئێوەی بەرپرسەكان هەمان ئەو قسانە وەك دڵسۆزییەك بەوانیش دەڵێن؟!**

**مامۆستا:** بێگومان ئەوەی كە لەنێو خەڵك دەیڵێین، لە كۆبوونەوەی تایبەت دا زیاتری دەڵێین، چونكە لەوێ باشتر جێ دەگرێ، ئەو كەسانەش بینیومانن و دەیانبینین و دێن بۆ لامان و سەردانیان دەكەین و، دەزانن.

ئنجا پێموایە هەركەسێك هەڵوێست و هەنگاوەكانی لە ئیمان و عەقیدەی ئیسلامییەوە سەرچاوە بگرن، ناتوانێ لەگەڵ خەڵكدا ڕاست و ساغ نەبێ و، ناشتوانێ بۆ خەڵك دڵسۆز نەبێ، چونكە خوا سبحانه وتعالى سەروكاری لەگەڵ دڵ و دەروونی مرۆڤدا هەیە، پێش ئەوەی سەروكاری لەگەڵ سەرو سیمایدا هەبێ، پێغەمبەر (عليه الصلاة والسلام) دەفەرموێ: (إنَّ اللهَ لا ينظر إلى صُوركم وأموالكم، وَلكنْ ينظر إلى قلوبكم وأعمالكم)، واتە: تەماشای دیمەن و سەروەت و سامانتان ناكات، تەماشای دڵ و دەروون و كردەوەتان دەكات، كەسێك بەڕاستیی ئیمانی بەوە هەبێ، كە خوا دڵ و دەروونی دەبینێ و، فریشتەكان هەست و نەستی دەروونیش تۆمار دەكەن، پێش قسە و تەعبیرەكانی زمانی، بە تەئكید ناتوانێ لەگەڵ خەڵكدا ڕاست و ساغ نەبێ، ئێمەش (إن شاء الله) لەگەڵ خەڵكدا ڕاست و ساغین، دڵسۆزین بۆ هەموویان، ئەوكەسەش كە ڕەخنەی لێ دەگرین، هەر لە دڵسۆزییدا ڕەخنەی لێ دەگرین، چونكە پێموایە لەم وڵاتەدا كێ زیاتر بڕیاری بەدەستە، كێ زیاتر كاری بەدەستە، تاكو ئەو باشتر بێ، بۆ خەڵك باشترە، ئێمە هەرگیز خەونمان بەوەوە نەبینیوە كە

له ئەنجامی مونافەسەی حیزبیدا حەزبكەین كەسێك هەڵه بكات، بۆ ئەوەی ئێمه قازانج بكەین، نا، دەڵێین: یاخوا چاك بن و، قازانج بكەین، وەك جارێك پیرۆزباییم له كەسێك كرد، لەم وڵاتەدا كه پۆستێكی بەرزی وەرگرت، گوتم: هیوادارم سەركەوتوو بی و دوعای خێرت بۆ دەكەین، پێمانخۆشه سەركەوتوو بی، دەزانی بۆچی؟ گوتی: دەزانم پێتان خۆشه، گوتم: لەبەرئەوەی له سەركەوتنت هەموو لایەك بەهرەمەندین و، له فەشەلهێنانت هەموو لایەك زەرەرمەندین، جا پێمانخۆشه هەموومان قازانج بكەین، نەك زەرەر!!.

**دانـــا: مامۆستا! بڕیاربەدەستان وا لێكی ئەدەنەوە ئەگەر دادگەریی كۆمەڵایەتی بچەسپێنن، ئەگەر ڕووبەڕووی گەندەڵیی ببنەوە، ئەوان بە پێچەوانەی بنەمایەكەی تۆوە، ئەوان ئەڵێن: زەرەرمان زیاترە، لەبەرئەوەی كە ئەو خەڵك و ئەو حەشاماتەی لە دەوریان كۆبوونەتەوە و لێیان موستەفید بوون، دواجار لەدەستیان دەچێ، خوێندنەوەی تۆ چۆنە؟**

**مامۆستا:** ڕاستە، ئەوانیش وا نەڵێن، من دەڵێم: زۆرجار وایە، بۆیە واباشە ئینسان ڕاست بڕوات، ئەوەی خوار و چەوت بێ، قازانجی له خوار و چەوتییدا هەبێ، زۆر خراپە بۆ دنیاو قیامەتی، بۆیە ئەو جۆرە كەسانە ئەو پەندەیان بەسەردا دەچەسپێ كە دەڵێ : (دز بازاڕی ئاڵۆزی دەوێ)، (ڕاوچی خراپ له ئاوی لێڵدا ڕاو دەكات) ڕاستە ئەوە هەیە، بەڵام پێموایە بۆ ئەوەی ئەو پەندانەیان بەسەردا نەچەسپێ، ئەو قانوونەیان بەسەردا نەچەسپێ كە له ئەنجامی ڕاستبوونەوەیاندا، دەوریان چۆڵ بێ، له ئەنجامی ڕاستبوونەوەیاندا، یانی: ڕاستبوونەوەی وەزعەكەدا، كە ئەو ئیمتیازە ناشەرعییانەیان لەدەست دەبێتەوە و، خەڵكەكەش بۆ ئیمتیازە ناشەرعییەكان له دەوریان بووە، ئەو كاتەش ئەو پەندەیان بەسەردا دەچەسپێ، كە له هەولێرێ دەیلێن: (هەتا گندۆر گندۆر بوون، خزم زۆر بوون، گندۆر هاتنە قڕانێ، خزمان هاتنە بڕانێ)، بەڵێ بۆ ئەوەی دووچاری حاڵێكی وا نەبن، پێویستە له بناغەوە كاری خۆیان ڕاست بكەنەوەو ئاوەكەیان لەسەرچاوەوە ڕوون بكەنەوە، واتە: با تۆ گندۆرەی حەرامت پێ نەبن، بۆ ئەوەی خەڵك بە هۆی گندۆرە حەرامەكانەوە لێت كۆنەبێتەوە، با شتی چاكت پێ بێ

و، خەڵك بە هۆی شتی چاکەوە، بەهۆی ڕاستیی و ساغیی تۆوە، لەگەڵتدا بێ، نەك بەهۆی پارەی حەڕام و ئیمتیازی حەڕام و چەواشەکاریی و، بەهۆی شتی خراپەوە، تاکو دوایی کە دەستت لە خراپەکە هەڵگرت، دەستت لەو ئیمتیازە ناشەرعییانە هەڵگرت، خەڵکەکە بڕوا، چونکە هیچ تەماعیان لەگەڵ تۆدا نامێنێ، با وا بێ، هەمیشە خەڵك تەماعی چاکەی لە تۆدا هەبێ، هەرگیز وانەبێ، خەڵکی تەماعی خراپەی لەتۆدا هەبێ، تاکو کە خراپەکەت نەما، پارە حەڕامەکەت نەما، خەڵکەکەت بڕۆن!

**دانـا: مامۆستا! کاتم نەماوە، ناچارم دواپرسیارت لێ بکەم: بێگومان بەرهەڵستییکردنی ستەم بە گوێرەی حاڵەت و هەلومەرجە جیاوازەکان شێوازی تایبەت بە خۆی هەیە، بەبڕوای بەڕێزت لە ئێستای بارودۆخی هەرێمی کوردستاندا، باشترین شێواز بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی ئەم ستەمە چییە؟**

**مامۆستا:** پێشتر باسمانکرد لە ئاڵقەکانی رابردوودا و ئێستاش دووبارەی دەکەمەوە، پێویستە ئێمە بارودۆخی ناوچەکەو جیهان و خۆمان وەك هەرێمی کوردستان، باش سەرنج بدەین، هەندێ کەس هەروا عاتیفییانە قسە دەکات و، زۆر گوێ ناداتێ، دوایی ئەوەی دەیڵێ، یان ئەوەی دەیکا، دوایی چی لێ سەوز دەبێ؟ پێموایە دەبێ واقیع و هەل و مەرجەکەمان ورد تەماشا بکەین، بەڵام ورد خوێندنەوەمان بۆ واقیعەکە، بەو واتایە نییە کە ئەمە لە بەرامبەر ستەم و ناشەرعیی و لارییدا بێدەنگ بین، پێموایە ئەوە نادڵسۆزییە بەرامبەر ئەو کەسانە کە ستەم و بێدادییەکە دەکەن، پێویستە ئەو فەرمایشتەی پێغەمبەرمان (علیه الصلاة والسلام) لەبەرچاو بێ کە دەفەرمووێ: (أنصر أخاكَ ظالماً أو مظلوماً) متفق علیه. واتە: یارمەتیی برایەکەت بدە، چ ستەمکار بێ، چ ستەملێکراو، دیارە گوتیان: ئەگەر ستەمکار بێ چۆن؟ فەرمووی: دەستی بگرن.

پێموایە باشترین شێوازێك کە لەم هەلومەرجەدا ئێمە بیگرینەبەر بۆ ڕاستکردنەوەی ئەم بارودۆخە، وەك خەڵك و جەماوەر، ئەوەیە کە خەڵك، بڕیاربەدەستان و حوکمڕانان حاڵیبکەن، جوان جوان تێیان بگەیەنن، کە لەگەڵیاندا

نین و لەگەڵیاندا نابن، لەگەڵیاندا بەڕێدا ناڕۆن و چیدیکە بە (با) ی وان شەنێ ناکەن!

**دانـا: مەبەستت صندوقەکانی هەڵبژاردنن؟**

**مامۆستا:** صندووقەکانی دەنگدانیش و غەیری صندووقیش، من پێموایە هەڵوێست نواندنەکە پێش دنیا هی قیامەتیشە، ئەگەر ئەو حیزب و لایەنە، ئەو بڕیاربەدەستانە حاڵیی بن، کە ئەو خەڵکە ویژدانێکی زیندوویان هەیەو، هەڵوێست وەردەگرن، ئەوانیش چاو بەخۆیان دا دەگێڕنەوەو هەڵوێستیان دەگۆڕن، تەماشا بکە! جادووگەرەکانی فیرعەون، کاتێ کە ئیمان دەچێتە نێو دڵیانەوەو، خوا دەناسن و خۆیان دەناسن، پێشێ چاوەڕێی خەڵات و بەرات دەکەن لە فیرعەون:

﴿ أَئِنَّ لَنَا لَأَجْرًا إِن كُنَّا نَحْنُ ٱلْغَٰلِبِينَ ﴿٤١﴾ ﴾ [الشعراء : ٤١]

ئایا پاداشتمان دەدەیە، کرێمان دەدەیە، ئەگەر زاڵ بووین؟ بەڵام دوای ئەوەی کە خوا دەناسن و خۆیان دەناسن، هەرچەندە فیرعەون هەڕەشەی مەرگیان لێ دەکات، بەڵام پێی دەڵێن:

﴿ فَٱقْضِ مَآ أَنتَ قَاضٍ ﴾ [طه : ٧٢]

هەرچی لەدەستتهاتوە، بیکە، پێموایە خەڵك دەبێ هەڵوێست وەربگرێ، خەڵك پێویستە بە ویژدانێکی زیندووەوە ڕەفتار و مامەڵە بکات، بڕیاربەدەستان و حوکمڕانان ئاگادار بکات و، تێبگەیەنێ کە لەگەڵیاندا نابێ، هەڵبەتە ئەوەش باجدانی دەوێت، ئنجا عەجایب ئەوەیە خەڵکێك پێی خۆشە و واقیع بگۆڕێ و دنیا چاك بێ، بەڵام ئەوەی ئارەقە بکات!! شتی وا هەرگیز نابێ.

پاشان بڕیاربەدەستانی ئەم وڵاتەش دەبێ بزانن، کە ئەگەر خەڵکیش هەڵوێستی نەبێ، سەرەنجام ئەو زوڵمە سەری خۆشیان و خەڵك و جەماوەرەکەشیان و هەرێمەکەشیان دەخوات، ئەو حەقیقەتەیان دەبێ لەبەرچاو بێ، ئێمە نە لە میصر بەهێزترین، نە لە توونس دەوڵەمەندترین، نە لە لیبیا دەوڵەمەندترین، نە لە یەمەن، نە لە سووریا، نە لە کوێ، نە لە کوێ، نە لە یەکێتی سۆڤێتی پێشوو،

نە لە ئێرانی سەردەمی شا، دەبێ زۆرچاك بزانین كە: ئێمەش یاسایەكانی خوا بەسەرماندا دەچەسپن، بڕیاربەدەستان پێویستە موراهەنە لەسەر ئەوە نەكەن، هەر خەڵك بێدەنگ بكەن و خەڵك بترسێنن و، خەڵك ناچاربكەن بێ هەڵوێست بێ، چونكە بێ هەڵوێست بوونی خەڵك، وەك جۆرێك لە تەخدیركردن و بێ هۆشكردنی حوكمڕانان وایە، دەڵێن مادام خەڵك بێدەنگە، دیارە وەزعەكەمان زۆر باشەو سەرەنجام تۆپەكە بەسەر هەموویاندا دەتەقێ، ئومێدم وایە كە لەجیاتی ئەوە، حكومڕانان و بڕیاربەدەستان، وەك عومەر خوا لێ ڕازی بێ، بكەن، دەیگوت: (لا خيرَ فيكم إنْ لَم تَقولوها، وَلا خَيرَ فينا لم نَسمعها) ئێوە خێرتان پێوە نیە ئەگەر نەیلێن، ئەگەر ڕەخنە نەگرن، ئێمەش خێرمان پێوە نیە، ئەگەر وەرینەگرین.

نازانم ئەو بڕیاربەدەستانە و حوكمڕانانەی ئەم وڵاتە، بۆچی كەیفیان بە خەڵكی دەستەمۆ دێ، بە خەڵكی بێ قسە دێ؟ بە خەڵكی بێ هەڵوێست دێ، ئاخر ئەوانە بە كەڵكی هیچ نایەن، بۆچی كەسێك كە ڕەخنە دەگرێ دڵسۆزانە، دەست دەخاتە سەر نەخۆشییەكان، بۆ پێی قەڵسن؟ نازانی ئەوە دڵسۆزتە! (دۆست ئەو كەسەیە دەتگریەنێ، دوژمن ئەو كەسەیە دەتخاتە پێكەنین).

**دانــا: پەیوەندیی بەوەوە نیە كە نە ئەمان عومەرن و، نە ئەو خەڵكەی ئێستاش هەیە، ئەو خەڵكەی بەردەستی عومەر نین؟**

**مامۆستا:** ڕاستە، بەڵام من باسی ئەوە دەكەم، با ئێمە چاو لەوان بكەین: حوكمڕانان چاو لە عومەر بكەن و، خەڵك و جەماوەریش چاو لەو خەڵك و جەماوەرە بكەن، كە لەسەردەمی ئەو حوكمە ڕەشیدەدا بوو، لەسەردەمی ئەودا بوو.

ئنجا بڕۆوە بۆ ئەوروپا، بۆ ڕۆژئاوا، بۆ ئەوەی نەڵێن: هەر دەمانبەنەوە بۆ مێژووی ئیسلام، فەرموو تەماشای ڕۆژئاوا بكە! لەوێ هیچ حوكمڕانێك دەتوانێ وەك ئێرە ئاوا حوكم بكات؟ هیچ وەزیرێك دەتوانێ؟ هیچ مودیر عامێك دەتوانێ بەو شێوەیە بكات؟ هیچ حیزبێكت دیوە وەك ئەو حیزبانەی ئێرە، هیچ

حیزبێکت دیوە لە حکوومەت دەوڵەمەندتر بێت؟ شتی وا هەیە، نەفەرت دیوە لە حیزب و لە حکوومەت دەوڵەمەندتر بێت، چەندان ملیاری هەبێ؟ شتی وا نیە، لە هیچ شوێنێکی دنیادا بەو شێوەیە نیە، ئەگەر هەشبێ، خەڵك بەشێوەی یاسایی خۆی کەسابەتی کردوە و ماڵی بەدەست هێناوە، نەك دەست بەسەر موڵك و ماڵی وڵات و میللەتدا بگرێ، بۆیە ئەگەر تەماشای مێژووی ئیسلام ناکەین، با تەماشای واقیعی دەوروبەرمان و ئەو وڵاتانە بکەین کە شارستانییانە و ڕێك و پێك وڵاتی خۆیان بەڕێوە دەبەن و، وەزعی خۆیان ئیدارە دەدەن و، با هەوڵدەین پەند لە خەڵك وەرگرین، نەك ببینە پەندی خەڵکی.

**دانـا: بەڕێز مامۆستا عەلی باپیر نووسەر و ڕووناکبیر! زۆر سوپاسی بەڕێزت دەکەین هەموو جارێك لە کاتی بەنرخی جەنابت ئەگرین و، جەنابت هەمیشە وەڵامی پرسیارەکانی ئێمە دەدەیتەوە.**

**مامۆستا:** منیش سوپاسی ئێوە دەکەم و دووبارە بەخێر بێن.

**دانـا: زۆر سوپاس، بینەرانی بەڕێز! سوپاس بۆ ئەوەی تا ئێستا ماونەوە بەدیار ئێمەوە، تا ئاڵقەیەکی تر بەخوای بەخشندەی میهرەبانتان دەسپێرم خواتان لەگەڵ.**

## ئاڵقەی حەڤدەیەم

بنەمای شازدەیەم: ویستی خوای دادگەر پشتیوانی چەوساوانە و دژی ستەمکار و چەوسێنەرانە.

بنەمای حەڤدەیەم: با لەسەر بناغەی دڵسۆزیی و ساغیی و ڕاستیی (النُّصْـح والإخـلاص والصـدق) بۆیەكدی، پێكەوە مامەڵە بكەین، نەك بەگرێ و گۆڵی دەروونییەوە.

دانـــا: بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان، سڵاوتان لێ بێ بینەرانی ئازیز و خۆشەویستی كەناڵی ئاسمانی پەیام، خۆم بە خۆشحاڵ ئەزانم خوای پەروەردگار دەرفەتی پێبەخشینەوە لە ئاڵقەیەكی نوێی بەرنامەكەتان بەرنامەی بەدانایی دا، لە خزمەت میوانە هەمیشەییەكەمان مامۆستا عەلی باپیر نووسەر و رووناكبیردا، بە ئێوەی ئازیز و خۆشەویست شاد ئەبینەوە، بێگومان مامۆستا، لە ماوەی ڕابردوودا لەسەر بارودۆخی هەرێمی كوردستان لە ژێر ناوونیشانی "بۆ چاككردنی ئەم دۆخەی هەرێمی كوردستان، با گوێ لە قورئان بگرین"، ژمارەیەك بنەمای پێویست بە واقیعی ئێستای هەرێمی كوردستان لە قوڕئانەوە هەڵیهێنجاون، بۆ هەموو لایەكی خستە ڕوو، ئێمەش لە بەرنامەكانی ڕابردوودا تاكو بنەمای پازدە لە خزمەت جەنابی مامۆستا باسمان لێوە كردن، ئێستا لە بنەمای شانزەدا بەناوونیشانی "ویستی خوای دادگەر، پشتیوانی چەوساوانە و، دژی ستەمكار و چەوسێنەرانە" لە خزمەت مامۆستادا ئەبین.

مامۆستاگیان! سڵاوی خوات لێ بێ.

**مامۆستا:** سڵاوی خوا لە جەنابیشت بێ كاك دانا، خۆشحاڵم بە دیدارتان.

دانـــا: سوپاست دەكەم، مامۆستا! لە بنەمای شازدەدا بووین، لەسەر ئەو بابەتەی لەسەر هەرێمی كوردستان نووسیویتە و، باس لەوە ئەكەی "ویستی خوای دادگەر پشتیوانی چەوساوانە و دژی ستەمكار و چەوسێنەرانە"، مەبەستت لەم دەستەواژەیە، لەم چەمكە چییە ؟

**مامۆستا:** بسم الله الرحمن الرحیم، الحمد لله، وصلى الله تعالى وبارك على رسول الله محمد وآله المهتدین بهداه.

زۆرجاری دیكەش باسمكردوە كە خوا سبحانە وتعالى وەك چۆن یاسا گەردوونییەكانی داناون، بۆ بوون (وجود) بە گشتی، لە گەردیلەوە تا كەهكەشان و، بێسەرەو بەرەیی، بێ یاسایی، لە دروستكراوەكانی خوادا نیە وەك لە سوورەتی (الملك)دا دەفەرموێ:

﴿ مَّا تَرَىٰ فِي خَلْقِ ٱلرَّحْمَٰنِ مِن تَفَٰوُتٍۢ فَٱرْجِعِ ٱلْبَصَرَ هَلْ تَرَىٰ مِن فُطُورٍۢ ﴿٣﴾ ثُمَّ ٱرْجِعِ ٱلْبَصَرَ كَرَّتَيْنِ يَنقَلِبْ إِلَيْكَ ٱلْبَصَرُ خَاسِئًا وَهُوَ حَسِيرٌۭ ﴿٤﴾ ﴾ [الملك : ٣- ٤]

دەفەرموێ: لە دروستکراوی خوای خاوەن بەزەییدا، نارێکیی نابینی، جار لە دوای جار سەرنج بدە، چاو بگێڕە، ئایا هیچ کەلێن نارێکیی دەبینی؟ دوایی بەردەوام سەرنج بدە، سەرەنجام چاوت دەگەڕێتەوە لات بە ماندوێتیی و بە هیچ دەستگیر نەبوویی، واتە: هیچ نارێکییەکی دەست ناکەوێ.

خوا سبحانەو تعالی بوون (وجود)ی بە سیستم (نَظم) داناوەولەنێو ئەو وجوودەشدا مرۆڤ هەیە، کە مرۆڤیش بەپێی ئەوەی لە ئایەتەکان وەردەگیرێ، لە خوا سبحانە وتعالی بێتە خوار، مرۆڤە، چونکە خوا سبحانە وتعالی کە ویستی وابوو، جێنشینێك لەسەر زەوی دابنێ، دیارە مرۆڤی بەو جێنشینە دانا، ئنجا لە ئایەتی ژمارە حەوتی سوورەتی (هود)یش وەردەگیرێ، کە هەموو (بوون) بەسەرو خوارییەوە، بە ئاسمان و زەوییەوە، پەیوەستە بە جێنشینبوونی مرۆڤ لەسەر زەوی، وەك خوا فەرموویەتی: {وهو الذيی .... احسن....} (هود:٧)، ئنجا ئەگەر خوا سبحانە وتعالی لە گەردیلەوە تا کەهکەشان، بۆ هەموو (بوون)، یاسای دانابێ، سیستمی دانابێ، ناگونجێ مرۆڤ کە ناوازەترین دروستکراوەی خوایە، جێنشینی خوایە لەسەر زەوی، خوا سبحانە وتعالی کۆمەڵێك یاسای گەردوونیی لە ژیانی مرۆڤیشدا دانەنابن، بە تەئکید کۆمەڵێك یاساش لە ژیانی مرۆڤدا لە کاردان کە خوا ناوی لێناون (سُنَنْ)، کە کۆی (سنه)وە سوننەتیش واتە: قانوون: خوا فەرموویەتی:

﴿ قَدْ خَلَتْ مِن قَبْلِكُمْ سُنَنٌ فَسِيرُواْ فِي ٱلْأَرْضِ فَٱنظُرُواْ كَيْفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلْمُكَذِّبِينَ ﴿١٣٧﴾ ﴾ [آل عمران: ١٣٧].

کەواتە: ئەو یاسایانەی خوا کە لەژیانی میللەتانی ڕابردوودا، هاتوونە دی و بەسەریاندا چەسپاون بەسەر ئێوەشدا دەچەسپن، بۆیە ئێوە پەند لەوان وەربگرن، تاکو ئەوەی بەسەر ئەوان هات، بەسەر ئێوە نەیەت.

ئنجا یەکێك لەو یاسایانەی خوا کە لە ژیانی بەشەردا داینا ون ئەوەیە کە من کردوومە بە سەردێڕی بنەمایەی شازدەیەم : "ویستی خوا لەگەڵ چەوسێنراواندایە و، دژی چەوسێنەران و ستەمکارانە"، ئەوەم لە چی وەرگرتوە؟

ئەوە لە ئایەتێك لە سەرەتای سوورەتی (القصص)دا، کە خوا سبحانە و تعالی باسی فیرعەون دەکات و، باسی مووسا (علیه الصلاة والسلام) دەکات، هەروەها گەلی مووسا کە (بو إسرائیل)ەو فیرعەون دەیچەوساندنەوە، ئایەتەکان ئاوا دەست پێدەکەن:

﴿بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ طسٓمٓ ١ تِلۡكَ ءَايَٰتُ ٱلۡكِتَٰبِ ٱلۡمُبِينِ ٢ نَتۡلُواْ عَلَيۡكَ مِن نَّبَإِ مُوسَىٰ وَفِرۡعَوۡنَ بِٱلۡحَقِّ لِقَوۡمٖ يُؤۡمِنُونَ ٣ إِنَّ فِرۡعَوۡنَ عَلَا فِي ٱلۡأَرۡضِ وَجَعَلَ أَهۡلَهَا شِيَعٗا يَسۡتَضۡعِفُ طَآئِفَةٗ مِّنۡهُمۡ يُذَبِّحُ أَبۡنَآءَهُمۡ وَيَسۡتَحۡيِۦ نِسَآءَهُمۡۚ إِنَّهُۥ كَانَ مِنَ ٱلۡمُفۡسِدِينَ ٤ وَنُرِيدُ أَن نَّمُنَّ عَلَى ٱلَّذِينَ ٱسۡتُضۡعِفُواْ فِي ٱلۡأَرۡضِ وَنَجۡعَلَهُمۡ أَئِمَّةٗ وَنَجۡعَلَهُمُ ٱلۡوَٰرِثِينَ ٥ وَنُمَكِّنَ لَهُمۡ فِي ٱلۡأَرۡضِ وَنُرِيَ فِرۡعَوۡنَ وَهَٰمَٰنَ وَجُنُودَهُمَا مِنۡهُم مَّا كَانُواْ يَحۡذَرُونَ ٦﴾ (القصص: ١ - ٦)

دوای ئەوەی خوا سبحانە وتعالی باسی قورئان دەکاو، باسی ئەوە دەکات کە بەسەرهاتی مووسا و فیرعەون بەسەر تۆدا دەخوێنینەوە {ئەی موحەممەد! (علیه الصلاة والسلام)} باس دەکات دەفەرموێ: ( إِنَّ فِرۡعَوۡنَ عَلَا فِي ٱلۡأَرۡضِ وَجَعَلَ أَهۡلَهَا شِيَعٗا ) فیرعەون لەسەر زەمیندا دەسەڵاتی ڕانا، واتە: خۆی بەرزکردەوە بە ناحەق و خەڵکەکەشی بەش بەش کرد، (يَسۡتَضۡعِفُ طَآئِفَةٗ مِّنۡهُمۡ ) کۆمەڵێکی لێ دەچەوساندنەوە، چۆنی دەچەوساندنەوە؟ (يُذَبِّحُ أَبۡنَآءَهُمۡ وَيَسۡتَحۡيِۦ نِسَآءَهُمۡۚ ) نێرینەکانی سەردەبڕین و مێینەکانی دەهێشتەوە، (إِنَّهُۥ كَانَ مِنَ ٱلۡمُفۡسِدِينَ ) بێگومان فیرعەون لە تێکدەران بوو، لە خراپەکاران بوو، بەڵام ئایا دنیا شاری بێ خاوەنە؟ فیرعەون و فیرعەونەکان بە کەیفی خۆیان تەراتێنی تێدا بکەن، ئەو مرۆڤانەی کە خوا دروستی کردوون، ئازاد بن و، خاوەنی ئیرادە و خاوەنی خۆیان بن، ئاوا فیرعەونەکان ئیرادەیان لێ زەوت بکەن و، بیانخەنە ژێر ڕکێفی خۆیانەوە، ئایا خوا ئاوا لێ دەگەڕێ، تێوەرادەمێنێ؟ نەخێر، ( وَنُرِيدُ أَن نَّمُنَّ عَلَى ٱلَّذِينَ ٱسۡتُضۡعِفُواْ فِي ٱلۡأَرۡضِ ).

لێرەدا یەكێك لە ڕووەكانی ئیعجازی قورئان كە گشتگیریی و شیاوییەتی بۆ هەموو چاخ و ڕۆژگارەكان، دەردەكەوێ خوا سبحانەو تعالى باسی بەسەرهاتی كۆمەڵێكی دیارییكراو دەكات، كە بەنو ئیسرائیلە و، بەدەست پادشا و حوكمڕانێكی ستەمكارەوە گرفتار بوون، كە فیرعەونە، بەڵام نافەرموێ: (ونريدُ أن نَمُنَّ على بني إسرائيلَ)!، بەڵكو دەفەرمووێ: ﴿ وَنُرِيدُ أَن نَّمُنَّ عَلَى ٱلَّذِينَ ٱسْتُضْعِفُواْ فِى ٱلْأَرْضِ ﴾ دەمانەوێ چاكە بكەین لەگەڵ ئەوانەی لە زەوییدا چەوسێنراونەوە، دەچەوسێندرێنەوە، تاكو بەنو ئیسرائیلیش بگرێتەوە، بەدەستی فیرعەون چەوساونەوەو، غەیری بەنی ئیسرائیلیش بگرێتەوە، كە لە پێش فیرعەوندا و، لە دوای فیرعەونیش، دەچەوسێنرێنەوە بە دەستی فیرعەون صیفەتەكان.

ئنجا خوا دەفەرموێ: ﴿ وَنَجْعَلَهُمْ أَئِمَّةً وَنَجْعَلَهُمُ ٱلْوَٰرِثِينَ ﴾، وە دەفەرمووێ بیانكەین بە پێشەوا و حوكمڕان و بیانكەینە میراتگریش ﴿ وَنُمَكِّنَ لَهُمْ فِى ٱلْأَرْضِ ﴾، هەروەها باڵادەستیان بكەین و پێیان بچەسێنین لە زەویدا.

لێرەدا خوا وشەی (إرادة) بەكاردێنێ، (وَنُرِيدُ)، وشەی (إرادة) واتە: ویستن، بەڵام بە سەرنجدانی ئایەتەكانی قورئان، بۆمان دەردەكەوێ كە خوا عزوجل ئیرادەی تەشریعیی هەیە و ئیرادەی تەكوینیی هەیە، یاخود ئیرادەی ئەمریی هەیە و، ئیرادەی قەدەریی هەیە، ئیرادەی تەشریعیی بۆ وێنە: خوا سبحانەو تعالى لە سوورەتی (البقرة)دا دەفەرموێ:

﴿ يُرِيدُ ٱللَّهُ بِكُمُ ٱلْيُسْرَ وَلَا يُرِيدُ بِكُمُ ٱلْعُسْرَ ﴾ [البقرة : ١٨٥]

خوا ئاسانیی بۆتان دەوێ و، ڕەحمەت و قوورسیی لێتان ناوێ، لێرەدا ئەو ئیرادەیە ئیرادەی تەشریعییە، چونكە باسی ئەوە دەكات كە ئەگەر بە سەفەر چوون، یان نەخۆش بوون، ڕۆژووی مانگی ڕەمەزان مەگرن، بەڵام كە گەڕانەوە چەند ڕۆژووتان خواردوون ئەوەندە بگرنەوە، دوایی لەو سیاقەدا دەفەرموێ:

﴿ يُرِيدُ ٱللَّهُ بِكُمُ ٱلْيُسْرَ وَلَا يُرِيدُ بِكُمُ ٱلْعُسْرَ ﴾ [البقرة: ١٨٥]

كەواتە: مەبەست لێرەدا ئیرادەی تەشریعییە، یانی خوا لە شەریعەتی خۆیدا، ئاسانیی لێتان ویستوەو قورسیی و زەحمەتیی لێتان نەویستوە، ئنجا چۆن لێرەدا دەزانین كە ئیرادەی تەشریعیی مەبەستە؟ چونكە ئەگەر ئیرادەی تەكوینیی بووایە، دەبوو هیچ كەس تووشی هیچ سەغڵەتییەك نەبووایە، بەڵام خەڵك لە واقیع دا تووشی سەغڵەتیی دێ، بەڵام لە دینداریدا تووشی سەغڵەتیی نایە، شەریعەت خەڵك عاصیێ ناكات، بەڵام خەڵك لە ژیان دا تووشی زەحمەتیی دێ، ئەگەر مەبەست ئیرادەی تەكوینیی بووایە، دەبوو هیچ كەس لە ژیاندا تووشی سەغڵەتیی و نارەحەتیی نەیەت، بەڵام نا، لە دیندا تووشی گرفتاریی و سەغڵەتی نایەن، واتە: بە ویستی تەشریعیی، ویستوویەتی زەحمەتتان نەخاتە سەر.

بەڵام ئەو ئایەتەی سوورەتی (القصص): ( وَنُرِيدُ أَن نَّمُنَّ عَلَى ٱلَّذِينَ ٱسْتُضْعِفُوا۟ فِى ٱلْأَرْضِ ) دەزانین كە مەبەست پێی ئیرادەی تەكوینییە، ئیرادەی قەدەرییە، نەك ئیرادەی ئەمریی و شەرعیی، بەچی دەزانین؟ بەوە دەزانین كە خوا باسی واقیعێكی مێژوویی دەكات، دواییش ئەو واقیعە مێژووییە، وەك خوا باسی كردوە هاتۆتە دی، بەنو ئیسرائیل لە چنگی فیرعەون دەربازیان بووە، دواییش كە دەفەرموێ: (وَنُرِىَ فِرْعَوْنَ وَهَـٰمَـٰنَ وَجُنُودَهُمَا مِنْهُم مَّا كَانُوا۟ يَحْذَرُونَ )، تاكو پێشانی فیرعەون و هامان و سەربازەكانیان بدەین، لە لایەن بەنی ئیسرائیلەوە، ئەوەی كە لێی دەترسان، خوا چی پێشان دان؟ ئەوەی پێشان دان كە نغرۆی كردن لە دەریای سووردا، ئەوەی پێشاندان كە لەبەین چوون و، بەنو ئیسرائیل بوونە خاوەنی ئیرادە و ئیدارەی خۆیان و دەربازیان بوو لە دەستی فیرعەون و، لە دەشتی سینا، ژیانێكی ئازادانەیان گوزەراند، كەواتە: ئەوەی كە خوا فەرموویەتی، لە واقیعدا هاتۆتە دی، ئەوە وەك ئەو ئەزموونەی بەنی ئیسرائیل، ئنجا ئەگەر تەماشای مێژووش بكەین، هەروای دەبینین، چونكە ئەو ئیرادە تەكوینییەی خوا تەنیا بۆ بەنی ئیسرائیل لە ئارادا نەبوو، بۆ هەموو میللەتانی دیكەی چەوساوەش هەیە، چەندان میللەتی چەوساوە دەرباز بوون لە چنگی زۆردارەكان، گەلی كورد ڕاپەڕی، گەلی تورك، گەلی ئەفغان بێ،

هیندەكان كاتی خۆی غاندیی پێشیان كەوت، ئەمریكییەكان كە ڕاپەڕین لە دژی بەریتانیای مەزن، كاتی خۆی ئەمریكییەكان زۆر شۆڕشیان كرد، تاكو دەربازیان بوو لە چنگی بەریتانیا، كردبوویان بە موستەعمەرەی خۆیان، وەك چۆن هیندەكان موستەعمەرەی بەریتانیا بوون.

یانی: كە ئێمە تەماشای واقیعی مێژووی بەشەر دەكەین، دەبینین خوا لە پشت چەوساوانەوەیەو لە دژی چەوسێنەران و زۆردارانە، ئەوە هەم ئەم ئایەتە دەیگەیەنێ، هەم واقیعی مێژوویی بەشەر، ئەوەی لێ دەخوێنرێتەوە كە خوا لەگەڵ چەوسێنراواندایەو دژی چەوسێنەران و زۆردارانە.

**دانـا: ئایا ئەمەشی لێ ئەخوێنرێتەوە، بڵێین: ئەوانەی كە چەوسێنراونەتەوە، با دانیشن و چاوەڕێ بكەن، تاكو خوای گەورە دەروویەكیان لێ ئەكاتەوە چونكە خوا لە پشتی ئەوانە، ئەمڕۆ نا سبەی، ئاخری ئەوان سەرئەخات؟**

**مامۆستا:** پرسیارێكی بەجێت كرد، یاساكانی خوا، یاسا گەردونییەكانی خوا كە جێبەجێ دەبن، مانای وانیە كە لە دەرەوەی ئیرادەی مرۆڤەكان جێبەجێ دەبن، یانی: مرۆڤەكان دەبێ قەدەرە چاكەكانی خوا، هەڵبژێرن، مرۆڤەكان دەبێ یاساكانی خوا بدۆزنەوە، بەپێی یاسایەكانی خوا بەڕێوە بچن، بۆ وێنە: بەپێی یاسای خوا (جارێكی دیكەش باسمكردوە) مرۆڤ ئەگەر مەلە نەزانێ، لە ئاودا دەخنكێت، بەڵام دوای ئەوەی بەپێی ئەو یاسایەی خوا ڕەفتار دەكات كە بریتیە لە مەلەكردن لە ئاودا، دەتوانێ بەپێی ئەو یاسایەی خوا لە ئاو دەرباز بێت.

یاخود مرۆڤ كاتی خۆی زۆر هەوڵیداوە بفڕێت، چاوی لە باڵندە كردوە، باسی عەبباسی كوڕی فەڕناس و كێ و كێ دەكەن، بەڵام لە هەوڵەكانیاندا شكستیان هێناوە، كەچی دواجار مرۆڤ توانی بفڕێ، بەڵام نەك بۆ خۆی بە تەنیا، بەڵكو بە پەڕەشووت و، بە باڵۆن و، دوایی بە فڕۆكە، كەواتە: مانای وایە كە یاسا گەردوونییەكانی خوا لە ژیانی بەشەردا، لە دەرەوەی ئیرادەی بەشەرەكان، كار دەكەن، بەڵام گرنگ ئەوەیە ئەو یاسایە مرۆڤ بیدۆزێتەوە.

بۆ وێنە: یەکێکی دیکە لە یاساکانی خوا لە ژیانی بەشەردا، ئەوەیە کە بە یەکڕیزیی خەڵك سەردەکەوێ و، بە پەرتەوازەیی تێکدەشکێ، وەك دەفەرموێ:

﴿ وَلَا تَنَٰزَعُواْ فَتَفۡشَلُواْ وَتَذۡهَبَ رِيحُكُمۡۖ ﴾ [الأنفال: ٤٦]

واتە: ناکۆك مەبەن ئەگەرنا فەشەل دێنن، ئەوە یاسایەکی خوایە، هەروەها پێچەوانەکەی ئەوەیە کە ئەگەر یەکبگرن، سەردەکەون، بۆیە خوا فەرموویەتی:

﴿ وَٱعۡتَصِمُواْ بِحَبۡلِ ٱللَّهِ جَمِيعٗا وَلَا تَفَرَّقُواْۚ ﴾ [آل عمران : ١٠٣]

مەبەستم ئەوەیە بەتایبەت ئەو یاسایەی کە خوا لە پشت چەوساوانەوەیە، ویستی خوا لە پشت چەوساوانەوەیە، مانای وانیە کەواتە با مرۆڤەکان دەستەوئەژنۆ دابنیشن، چونکە بۆچی مرۆڤ لە هیچ شتێکی دیکەدا وا ناکات؟ بۆ وێنە: بەپێی یاسای خوا، ئاو تینوێتیی مرۆڤ دەشکێنێ، بەڵام کەست بینیوە: دابنیشێ، بڵێ: بەپێی یاسای خوا، مرۆڤ بە ئاو تینوێتیی دەشکێ، ناشیخۆمەوە؟ نەخێر دەبێ ئاو پەیداکەی و بیخۆیەوە، ئەوجار تینوێتییت دەشکێ، ئەوە قانوونی خوایە.

هەروەها بەپێی یاسای خوا: خوا هەر دەردێکی داناوە، چارەسەر و دەرمانێکیشی بۆ داناوە، بەڵام ئایا دەرمانەکە هەر لە خۆڕا دێ، نا، دەبێ بچی بیدۆزییەوە: (ما أنزل الله من داء إلا وأنزل له دواءً، ألا فتداووا) پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێ: خوا هیچ دەردێکی دانەناوە، مەگەر چارەسەر و دەرمانێکی بۆ داناوە، چارەسەر بەکاربێنن.

هەروەها یاسایەکانی دیکەی خوا کە لە ژیانی بەشەردا دایناون، بەشێکیان لە میانی ئیرادە و ویستی مرۆڤەکاندا، جێبەجێ دەبن، بەڵام هەندێکیان پەیوەندییان بە ویستی مرۆڤەکانەوە نیە، بۆ وێنە: قەد و قیافەی ئێمە، ڕەنگمان، زمانمان، هەندێ لە صیفەتەکانمان، کە لە ڕێی کرۆمۆسۆمەکانەوە، بۆمان نقڵ دەبن، یان ئەو ژینگەیەی کە تێیدا بووین، ئەوانە لە دەرەوەی ئیرادەی ئێمەن، سزاو پاداشتیش هەر لەسەر ئەوانە نیە، بەڵام ئەوانەی کە پەیوەستن بە ویستی خۆمانەوە سزاش ڕوویان تێدەکات و، پاداشتیش ڕوویان تێدەکات.

بۆ وێنه: میللەتێك ئەگەر لەخۆڕا دەست بە ئەژنۆیاندا بەربداتەوە و ملكەچ بكات بۆ زوڵم، ئەوە خوای دادگەر لە سووڕەتی (النساء)دا باس دەكات:

﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ تَوَفَّىٰهُمُ ٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ ظَالِمِيٓ أَنفُسِهِمۡ قَالُواْ فِيمَ كُنتُمۡۖ قَالُواْ كُنَّا مُسۡتَضۡعَفِينَ فِي ٱلۡأَرۡضِۚ قَالُوٓاْ أَلَمۡ تَكُنۡ أَرۡضُ ٱللَّهِ وَٰسِعَةٗ فَتُهَاجِرُواْ فِيهَاۚ فَأُوْلَٰٓئِكَ مَأۡوَىٰهُمۡ جَهَنَّمُۖ وَسَآءَتۡ مَصِيرًا ﴿٩٧﴾ إِلَّا ٱلۡمُسۡتَضۡعَفِينَ مِنَ ٱلرِّجَالِ وَٱلنِّسَآءِ وَٱلۡوِلۡدَٰنِ لَا يَسۡتَطِيعُونَ حِيلَةٗ وَلَا يَهۡتَدُونَ سَبِيلٗا ﴿٩٨﴾ فَأُوْلَٰٓئِكَ عَسَى ٱللَّهُ أَن يَعۡفُوَ عَنۡهُمۡۚ وَكَانَ ٱللَّهُ عَفُوًّا غَفُورٗا ﴿٩٩﴾ ﴾ [النساء : ٩٧- ٩٩]

واته: ئەوانەی كە فریشتەكان گیانیان دەكێشان، كاتێك كە ستەمیان لە خۆیان كردبوو، گوتیان: ئێوە چیتان بوو؟ گوتیان: چەوسێنراوە بووین لە زەویدا، بێدەسەڵات و بێ دەرەتان بووین، گوتیان: ئەدی سەرزەوی خوا فراوان نەبوو، كۆچ بكەن؟ ئەوانە جێگایان دۆزەخە و خراپترین سەرەنجامیش ئەوێیە.

دوایی خوا سبحانەو تعالی، ئەوانە دیارە توانیویانە كۆچ بكەن و لە توانایاندا هەبووە، بەڵام هەندێكی دیكە لەو حوكمە هەڵداوێرێ: جگە لە چەوسێندراوان لە پیاوان و ئافرەتان و منداڵان، ئەوانە كە هیچ توانایەكیان نیە و، هیچ ڕێیەكت پێنازانن، ئەوانە نزیكە خوا لێیان ببووریٚ، و خواش بەخشندەی لێبوردەیە، كەواتە: ئەگەر میللەتێك دەست بەخۆدا بەرداتەوەو مل بۆ ستەم كەچبكات، ئەوە هەر بەپێی یاسای خوا، وەك چۆن كەلاكێك كە لەوێ دەكەوێ، داڵ و لاشخۆرەكان دێن، دەیخۆن، میللەتانی مردووش هەروان! یەكێ لە زانایان كە باسی هێرشی خاچپەرستەكان لە ڕۆژئاواوە و، تەتەر و مەغۆل لە ڕۆژهەڵاتەوە دەكات، دەڵێ: جیهانی ئیسلامیی وەك جەنازەیەك وابوو، بۆیە لاشخۆرەكانی دنیا لە شەرق و غەربەوە هاتن تێی بەربوون! بەڵێ هەركەسێ دەست بەخۆیدا بەرداتەوە، كەسێك هەردەبێ بیچەوسێنێتەوە، بەڵام كەسێك كە خۆی گورجبكاتەوە، وەك جارێكی دیكەش باسمانكردوە، نێچیری تووك نەرم هەموو دڕندەیەك تاڵییەتی، بیخوا و زەفەری پێ دەبات، بەڵام ژیاندارێك كە دڕكی پێوە بێت، ئەو دڕندەیە سەدو یەك حیساب دەكات، پێش ئەوەی، پەلاماری بدات.

**دانـــا: مامۆستا! تا چەند ئەم دەستەواژەیە، ئەم بنەمایەی کە بەڕێزت ئاماژەت پێ کردوە، پەیوەندیی بە لایەنی دینداریی مرۆڤەکانەوە هەیە، بۆ نموونە: ئایا ئەگەر کۆمەڵێك، گەلێك زۆر دیندارو مسوڵمان و ڕوو لە خوا بن، خوای گەورە لەبەر دینداریەکەیان، دواجار هەر پشتیان ئەگرێ؟ یان نەخێر ئەم بنەمایە لەبەرئەوەی یاسایەکی کەونییە، پەیوەندیی نیە بە دینداریەوەو مرۆڤ ئەگەر دینداریش نەبێ، یاسا دنیاییەکان بگرێتەبەر، خوای گەورە پشت و پەنای ئەبێ لەبن باری ستەم قوتاری دەکات؟!**

**مامۆستا:** ئەمە پەیوەندی بە دینداری و بێ دینییەوە نیە، تەماشا بکە! وەك تەندروستیی کافر خەم لە جەستەی خۆی بخوات و، خزمەتی جەستەی خۆی بکات و، لە شتی زیانبەخش بیپارێزێ و وەرزشی پێ بکات، بیجوڵێنێ و، پاکی ڕابگرێ، ساغ دەبێ، بەڵام نوێژکەرێکی زۆر نوێژکەر و ڕۆژووگرێکی زۆر چاك، خەم لە جەستەی نەخوات و ئیهمالی بکات، کەمتەرخەمیی بکات، نەخۆش دەکەوێ، بۆیە پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) بە موسڵمانان دەفەرموێ: (إن لجسدك عليك حقاً) (رواه البخاري)، جەستەت حەقی لەسەرتە، دیارە هەندێ لە مسوڵمان کەمتەرخەم بوون و حەقی جەستەیان نەداوە، بۆیە وایفەرمووە. هەڵبەتە عیبادەتی شەخصیی مرۆڤ بۆ خۆی باشەو لە خراپە دەیپارێزێ، لە خراپە و لە گوناە و تاوان، هەروەها بۆ قیامەتی باشە، بەڵام واقیعی پێ ناگۆڕدرێ، ئنجا بۆیەش گوتم: عیبادەتی شەخصیی، چونکە دینداریی ئەوەیە، کە تۆ بە کۆی دینەوە پابەند بی، هەم لە ڕووی جیهانبینییەوە، هەم لە ڕووی ئیمان و عەقیدەوە، لە ڕووی عیبادەتەوە، لە ڕووی ئەخلاق و ڕەوشتەوە، لە ڕووی هەڵسوکەوتی خێزانیی، کۆمەڵایەتیی، سیاسیی یەوە. دینداریی واتە: پابەندیی بە دینەوە، لە هەموو ڕووەکانەوە، ئەگەر کۆمەڵگایەك بە ڕاستیی بە دینەوە پابەند بن لە هەموو ڕوویەکەوە، ئەو کاتە بە تەئکید ناچەوسێنرێنەوە، ڕێگا نادەن کەس بیانچەوسێنێتەوە، هەر لە ڕێوە، نەك لەبەرئەوەی دینداریی دەکەن، خوا دەرفەتیان بدات و دەربازیان بکات، بەڵکو هەر لەڕێوە ناچەوسێنرێنەوە، کەس ناتوانێ ستەمیان لێ بکات، هیچ کەس ناتوانێ بیانخاتە ژێر ڕکێفی خۆیەوە،

ئەگەرنا بە مەفهوومە تەسكەكەی دینداریی، وەك عیبادەتی شەخصیی، ئەوكاتە كە تەتەر و مەغۆل هاتن، هەندێك لە پەیڕەوانی ڕێبازەكانی تەصەووف، هەندێك لە شێخەكانی تەصەووف، لێیانگێڕدراوەتەوە كە گووتوویانە: ئەوە بەڵای خوایە هات، ئەو تەتەر و مەغۆلە كە دێن لە ڕۆژهەڵاتەوە، ئەوە بەڵای خوایە هات، ملی بۆ نەویكەن و بێدەنگ بن، چونكە ئەوە قەدەری خوایە هاتوەو ناگەڕێتەوە!! ئایا ئیسلام وای گوتوە؟! ئیسلام دەفەرموێ: ئەگەر قەدەرێكی خراپی خوا هات، ئەوەی بۆ تۆ خراپە، ئەگەر قەدرێك كە زیان بە تۆ دەگەیەنێ، هات، بۆ وێنە: دوژمنێكت بۆ دێ، دڕندەیەك ڕووت تێ دەكات، لە كوێی ئیسلامدا هەیە بڵێ: بۆ دوژمنەكەت ڕاوەستە، بۆ دڕندەكە دابنیشە بابیخوات؟ یان ئەگەر لافاوێك هات، خۆتی بۆ ڕاگرە، بوەستە با لافاوەكە بتبات؟ شتی وا نیە لە ئیسلامدا، بەڵكو دەبێ لە قەدەری خراپ ڕابكەی، بۆ قەدەری چاك، وەك عومەر خوا لێی ڕازی بێ بە ئەبوعوبەیدەی كوڕی جەڕراحی گوت، لەكاتێكدا كە لە مەدینەوە سەفەری كرد بچێ بۆ شام، بیستی كە لە شام تاعوون بڵاو بۆتەوە (كەپێشتر بەسەرهاتەكەمان هێناو لە (صحيح البخاری)دا هاتووە).

مەبەستم ئەوەیە كە هەرچی مرۆڤ دەیكا، بە قەدری خوایە، بەڵام تۆ دەبێ هەوڵ بدەی قەدەرە باشەكان هەڵبژێری، هەمووی بەپێی یاساكان (سنن) ی خوایە، بەڵام تۆ دەبێ هەوڵبدەی قانوونەكانی خوا بدۆزیەوەو، وە بەپێی ئەو یاسایانەی خوا كە لە ژیانی بەشەردا لە ئارادان، تۆ كارێكی وا بكەی بەرژەوەندییەكانی دنیا و دواڕۆژت دابین بكەی و، خۆت لە زەرەر و زیانەكان بپارێزی.

**دانــا: زۆر باشە، مامۆستا! دەچینە سەر بنەمای حەڤدەی بابەتەکەی جەنابت کە دەڵێی "با لەسەر بناغەی دڵسۆزیی و ساغیی و ڕاستیی بۆ یەکدی، پێکەوە مامەڵە بکەین، نەك بە گرێ و گۆڵی دەروونییەوە" جەنابت لە بابەتەکەدا ئاماژەت پێکردوە کە بەشێك لەو قەیرانانەی ئێستا لە هەرێمی کوردستاندا بوونیان هەیە، پەیوەندییان بەمەوە هەیە، هەست ئەکرێت ئەم بنەمایەت زیاتر ئاراستەی بڕیار بەدەستان و سیاسییەکان و ئەوانەیە کە شتێکیان بەدەستە، لەم هەرێمەدا، نەك خەڵك و جەماوەر بەشێوازێکی گشتی، ڕاستە وایە، مەبەست ئەوەیە یان نا؟**

**مامۆستا:** بەڵێ: مەبەستم ئەوەیە، بەڵام بێگومان خەڵك و جەماوەریش ئەو کانگایەو ئەو سەرچاوەیەن کە بەرپرسان و بڕیاربەدەستان لێیانەوە پەیدا دەبن، کوردەواریی خۆمان دەڵێن: (کاریتە لە کفرێ هەڵناکەوێ) (کفر) جۆرە درەختێکی بچووکە کەم بەرز دەبێتەوە، کاتی خۆی خەڵکی زیاتر بۆ دارو پەردو بۆ دارەڕا، بەکاریان هێناوە، ئنجا ڕووەکی (کفر) کاریتە لێی هەڵناکەوێ، (کاریتە)ش ئەوەیە کە بە خانوویدا دێڵن[1]، یانی خەڵك و جەماوەر چۆن بێ، ئەو بەرپرس و حوکمڕان و بڕیاربەدەستانەش کە لێی هەڵدەکەون، لە قەدەر خۆبینی و بە زۆریی وایە لێکدەوەشێنەوە، کۆمەڵگایەکە چۆنە، بەرپرسەکانیشی بەوشێوەیە دەبن و بەرپرسەکان چۆن بوون کۆمەڵگایەکەش لەقەدەر خۆی.

بەڵام ڕاستە ئەو بنەمایە زیاتر مەبەستم پێی خەڵکی بڕیاربەدەست و بەرپرسە، ئەویش لەبەر ئەوەی، پێموایە سیاسەت و حوکمڕانیی و کاری حیزبیی، ئەگەر لایەنی مەعنەوی تێدا نەبوو، لایەنی مەعنەویی واتە: خوا پێ مەبەستبوون، هەستکردن بە چاودێریی خوا، حیسابکردن بۆ ڕۆژی دوایی، هەروەها ڕوو لەخواکردن، نوێژو ڕۆژووگرتن، تاعەت، ئەخلاق و ئاکار و ڕەوشتی جوان، وەك ڕاستگۆیی، دڵسۆزیی دادگەریی، ئەوەی بۆ خۆت پێت خۆشە، بۆ خەڵکیش پێت خۆش بێ، ئەوەی بۆ خۆت پێتناخۆشە، بۆ خەڵکیش پێت ناخۆش بێ، تا کۆتایی هەموو ئەو ڕەوشتە جوانانە، من پێموایە کاری سیاسیی، ئەگەر ئەو

---

(١) کاریتە دارێکی قایم و پتەو و درێژە، دەیخەنە سەر دوولای دیواری ژوورێك و، دارەکانی دیکە کە گچکەترە، دەیخەنە سەری، لەکاتی (دادەڕێ)دا.

لایه‌نه‌ مه‌عنه‌وییه‌ی لێ دابڕنرێ، خراپی لێ ده‌قه‌ومێ، چونكه‌ كاری سیاسی به‌زۆریی وایه‌، ئه‌گه‌ر چاك بێ، قازانجه‌كه‌ ته‌نیا بۆ سیاسه‌تمه‌داره‌كه‌ نیه‌، ئه‌گه‌ر خراپیش بێ، خراپییه‌كه‌ش ته‌نیا بۆ خۆی نیه‌، له‌هه‌ردووك حاڵان دا شه‌ڕ یان خێر، هه‌موو خه‌ڵكی ده‌گرێته‌وه‌، بۆیه‌ زۆر گرنگه‌ كه‌ كاری سیاسیی به‌ ڕه‌وشت و به‌ها به‌رزه‌كانه‌وه‌ بكرێ و، له‌گه‌ڵ ئه‌واندا ئاوێته‌ بكرێ، زۆرم بینیوه‌ خه‌ڵكی سیاسیی و به‌رپرس پێكه‌وه‌ داده‌نیشێ،له‌ ڕوودا هیچ عه‌یبیان نیه‌، به‌ده‌م یه‌كدییه‌وه‌ پێده‌كه‌نن، قسه‌ی خۆش ده‌كه‌ن، نوكته‌ش ده‌گێڕنه‌وه‌، به‌ڵام هه‌ر كه‌ ڕوویان له‌ یه‌ك وه‌رگێڕا، ده‌رفه‌تیان بینی، یه‌كدی ده‌شكێنن، زه‌می یه‌كدی ده‌كه‌ن، عه‌یب و عاری یه‌كدی باس ده‌كه‌ن!! ئایا ئه‌وه‌ به‌رهه‌می لێك ترازانی سیاسه‌ت و ڕه‌وشت و لایه‌نی مه‌عنه‌ویی نیه‌؟!

**دانـــا: به‌ڵام ئه‌صڵی سیاسه‌ت وانیه‌؟**

**مامۆستا:** نه‌خێر، وانیه‌، مه‌گه‌ر سیاسه‌تی میكیاڤیللی وابێ، مه‌گه‌ر سیاسه‌تی عه‌لمانیی وابێ، مه‌گه‌ر سیاسه‌تێكی دوور له‌ دین و به‌ها به‌رزه‌كان، وابێ، به‌ڵام من پێموایه‌ سیاسه‌تی ڕێك و ڕاست، سیاسه‌تی ڕه‌شید و سه‌رڕاستانه‌، ئه‌وه‌یه‌ كه‌ وه‌ك گوتوومه‌: له‌گه‌ڵ یه‌كدا دڵسۆز بین، ڕاست بین و ساغیش بین، له‌گه‌ڵ یه‌كدا دڵسۆز بین، واته‌: چیت بۆ خۆت پێ چاكه‌، بۆ ئه‌ویشت پێ چاك بێ، به‌ته‌نگییه‌وه‌ بی، په‌رۆشت بێ، هه‌روه‌ها وه‌ك چۆن بۆ خۆت پێتناخۆشه‌، هه‌ڵه‌یه‌ك بكه‌ی، پێتناخۆش بێ به‌رامبه‌ره‌كه‌شت هه‌ڵه‌ بكا، نه‌ك بڵێی وه‌ڵڵا با به‌رامبه‌ره‌كه‌م هه‌ڵه‌ بكا، بۆ ئه‌وه‌ی من قازانج بكه‌م، یان با به‌رامبه‌ره‌كه‌م ناشیرین بێ، بۆ ئه‌وه‌ی خۆم جوان بم، نا، ده‌بێ وابیربكه‌یه‌وه‌، ئه‌گه‌ر به‌رامبه‌ره‌كه‌م ناشیرین بێ، منیش ناشیرین ده‌بم، ئه‌گه‌ر ئه‌و هه‌ڵه‌ بكا، منیش باجه‌كه‌ی ده‌ده‌م، وه‌ك جارێكی دیكه‌ش باسمكردوه‌ له‌ بۆنه‌یه‌كدا به‌رپرسێكی ئه‌م وڵاته‌ پۆستێكی گرنگی وه‌رگرتبوو، منیش چووم پیرۆزباییم لێ كردو گوتم: هیوادارم سه‌ركه‌وتووبی و زۆرم پێخۆشه‌ سه‌ركه‌وتوو بی، ده‌زانی بۆچی؟ ئه‌ویش گوتی: ده‌زانم جه‌نابت پێتخۆشه‌، ئاخر بۆیه‌ پێمخۆشه‌ سه‌ركه‌وتوو بی، چونكه‌ له‌ سه‌ركه‌وتنت، هه‌موو لایه‌ك به‌هره‌مه‌ندین، له‌ فه‌شه‌لیشت هه‌موو لایه‌ك زه‌ره‌رمه‌ندین، ئنجا من

پێمخۆشە هەموو لایەکمان قازانج بکەین، نەك پێکەوە بچینە خەسارێ! ئەوەش بە ئەزموونی ژیانی خۆم بۆم دەرکەوتوە، ئاسان نیە ئینسان ڕاست و ساغ و دڵسۆز بێ، لەگەڵ ئەوانەی کە لەگەڵتدا لە مەیدانی کاری سیاسییدا کار دەکەن و، جۆرێك لە کێبەرکێی سیاسی و مونافەسەی سیاسییش لە بەیندا هەبێ، دەبێ زۆر چاك بۆ بەرژەوەندیی گشتی خۆت یەکلایی کردبێتەوەو، زۆر سەیتەرەت بەسەر غەریزە و حەز و ویستە شەخسیی و تایبەتەکانت دا هەبێ و، کۆنترۆڵت کردبن، ئنجا دەتوانی بێیە نێو فەزای فراوانی دەوڵەتداریی و نیشتمانپەروەریی و خەڵك دۆستیی بەگشتی و، ئەوەی بۆ خۆت پێتخۆشە، بۆ ئەوانیشت پێ خۆش بێ و، ئەوەی بۆخۆت پێتناخۆشە، بۆ ئەوانیش پێتناخۆش بێ، کە ئەوە پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) دەیکا بە بنەما مەرجی دینداریی، پێغەمبەری خاتەم (علیه الصلاة والسلام) دەفەرموێ: (لا يؤمن أحدكم حتى يحب لأخيه ما يحب لنفسه) متفق عليه، واتە: یەکێك لە ئێوە بە بڕوادار لە قەڵەم نادرێ، تاکو چی بۆ خۆی حەزی لێیە، بۆ برایەکەشی حەزی لێ نەبێ. (بۆ برایەکەی حەزی لێ نەبێ)، نەیفەرمووە: (أخيه المسلم)، لە شەرحی صەحیحی موسلیم (المُفْهِم في شرح صحيح مسلم)دا نووسەر لە شەرحی ئەم حەدیسەدا دەڵێ: کە دەفەرموێ: (لا يؤمن أحدكم حتى يحب لأخيه ما يحب لنفسه: أي لأخيه الإنسان) نەك (لأخيه المسلم)، واتە دەبێ تۆ چیت بۆ خۆت پێ خۆشە، بۆ برای مرۆڤیشت پێت خۆشبێ، جا ئەگەر مسوڵمانە، یاخود نامسوڵمانە، ئەو مرۆڤەش براتە لە مرۆڤایەتییدا، لە ئادەم و حەووادا دەبنەوە بە برا، یا بەلای کەمەوە لە نیشتمان و زماندا دەبنەوە بە برا، دەبێ چی بۆ خۆت حەزت لێیە، بۆ ئەویشت حەز لێ بێ، بەپێچەوانەشەوە: چیت بۆ خۆت پێناخۆشە، بۆ ئەویشت پێناخۆش بێ، ئەگەر بۆ خۆت پێناخۆشە، شکست بێنی، بۆ ئەویشت پێناخۆش بێ، ئەگەر بۆ خۆت پێتناخۆشە ناشیرین بی، دەبێ بۆ ئەویشت پێ ناخۆش بێ، ئنجا با گەلێك بەو ڕووحیەتەوە پێکەوە مامەڵە بکەن داخۆ کاریان چەند بەهێزو پێز دەبێ! ئەوە لە کوێ و ئەوە لە کوێ: حیزبێك بۆ ئەوەی حیزبێکی دیکە بشکێنێ، پێی خۆش بێ کەسێك نوێنەرایەتیی بکا، فەشەل بێنێ، یاخود زەعیف بێ.

**دانـــا: سیاسه‌ت وا ئه‌كرێ مامۆستا؟**

**مامۆستا:** پێموایه‌ به‌ڵێ، سیاسه‌تی ڕاست، سیاسه‌تی قورئانیی، سیاسه‌تێك كه‌ هه‌وێنی ئیمان و ئه‌خلاقی تێدا بێ، ئاوا ده‌كرێ، كه‌ تۆ چیت بۆ خۆت پێخۆشه‌، ئه‌وه‌شت بۆ به‌رانبه‌ره‌كانت پێخۆش بێ، ئێمه‌ له‌ خوا به‌زیاد بێ، وامانكردووه‌و واش ده‌كه‌ین، من له‌گه‌ڵ هه‌ركه‌سێك دانیشتووم له‌م وڵاته‌دا، چی به‌ چاك و به‌رژه‌وه‌ندییم زانیوه‌ دڵسۆزانه‌ پێم گوتوه‌، به‌ خه‌ڵكی خۆشمانم گوتوه‌: له‌گه‌ڵ هه‌ر كه‌سێك داده‌نیشن، په‌رله‌مانتارمان هه‌ن، وه‌زیرمان هه‌ن، خه‌ڵكمان هه‌یه‌، گوتوومه‌: له‌گه‌ڵ هه‌ر كه‌سێك داده‌نیشی، هه‌ركه‌سێ ڕاوێژت پێ ده‌كات، چی بۆ خۆت پێ چاكه‌، ئه‌وه‌ی پێ بڵێ با قازانج بكات و بیگێڕه‌وه‌ له‌ هه‌ڵه‌ و كه‌موكوڕیی، چونكه‌ ئه‌وه‌یه‌ كه‌ پێغه‌مبه‌ر (علیه الصلاة والسلام) ده‌فه‌رموێ : (الدین النصیحة) رواه مسلم، واته‌: زۆرێك واده‌زانن (دین) لێره‌دا به‌ مانای ئیسلامه‌، نا، (دین) لێره‌دا یانی دینداریی (تَدین)، دینداریی بریتیه‌ له‌ دڵسۆزیی، دیسان زۆر كه‌س وشه‌ی (نصیحة)ش به‌ ئامۆژگاریی ده‌زانێت، واده‌زانێ (نصیحة) یانی: ئامۆژگاریی، ئێمه‌ له‌ كوردیدا وشه‌ی نه‌صیحه‌ت به‌ مانای ئامۆژگاریی به‌كاردێنین، به‌ڵام له‌ فه‌رمایشته‌كه‌دا مانای ئامۆژگاریی نیه‌، چونكه‌ هه‌ر ته‌ماشای فه‌رمایشته‌كه‌ بكه‌ی ده‌زانی: (الدین النصیحه، قلنا: لمن قال لله ولرسوله ولكتابه ولأئمه المسلمین وعامتهم) ئه‌و نه‌صیحه‌ته‌ ده‌بێ ئاڕاسته‌ی پێنج لایان بكرێ: نه‌صیحه‌ت بۆ خواو بۆ كتێبی خواو بۆ پێغه‌مبه‌ری خواو بۆ حوكمڕانانی مسوڵمانان و بۆ خه‌ڵك به‌ گشتی، ئنجا ئامۆژگاریی خوا و ئامۆژگاریی قورئان چۆن ده‌كرێ؟ ئامۆژگاریی پێغه‌مبه‌ر (صلی الله علیه وسلم) چۆن ده‌كرێ؟ (نصیحة) یانی: دڵسۆزی، به‌ ته‌نگه‌وه‌بوون، به‌خه‌مه‌وه‌بوون، به‌ په‌رۆشه‌وه‌ بوون، ئنجا پێغه‌مبه‌ری خوا (علیه الصلاة والسلام) دینداریی و، مسوڵمانه‌تیی له‌ دڵسۆزییدا كورتهه‌ڵدێنێ، كه‌واته‌: ده‌بێ دڵسۆز بین بۆ یه‌ك، با ئه‌و كه‌سه‌ له‌ (دین)یش دا دیندیشدا له‌گه‌ڵت نه‌گونجێ و تێك نه‌كاته‌وه‌، مادام كه‌ كارێكی پێسپێردراوه‌، تۆ ده‌بێ بۆی دڵسۆز بی، ئه‌و كاره‌ی چاك بكات، ئه‌گه‌ر ئه‌و كاره‌كه‌ی باش بكات، بۆ خۆشیی باشه‌و بۆ خه‌ڵك و

جەماوەرەكەش باشە، بەڵام ئەگەر كارەكەی خراپ بكات، بۆ خۆشیی خراپە، دەبێ پێتناخۆش بێ ئەو كەسە زەرەر بكات، بۆ خەڵك و جەماوەرەكەش خراپە، تۆش لەگەڵ خەڵك و جەماوەرەكەدا زەرەر دەكەی و، هەر چۆنیش بێ دەبێ زیانی خەڵكت پێناخۆش بێ.

**دانـــا: مامۆستا! كاتێك ئێوە ئۆپۆزسیۆن بوون، من بیرمە جەنابت هەموو جارێك دەتگوت: ناكرێ هێڵێكی ڕاست و چەپی سوور بێنین بەسەر هیچ لایەنێك و هیچ كەسێكدا، دەبێ بە شتە چاكەكانی بوترێ چاك و، بە شتە خراپەكانی بوترێ خراپ، زۆرجار ڕووبەڕووی رەخنە ئەبوونەوە ئەوترا سیاسەت وا ناكرێ، ئەبێ ئۆپۆزسیۆن لە بۆسەدا بێ بۆ شكستەكانی دەسەڵات، بۆ ئەوەی دوایی بتوانێ بە شكستانە قەرەبووی خۆی بكاتەوە، خۆی بگەیەنێتە دەسەڵات؟**

**مامۆستا:** بەڵێ، نەك هەر ئەوەندە، ئەو كاتە مشتومڕم بوو لەگەڵ هەندێ خەڵكی خۆشمان دا، لە ئاستی قیادا، دەیانگوت: ئەوە غەڵەتە، دەبێ ئۆپۆزسیۆن هەمیشە هەر ڕەخنە بگرێ، نابێ قەت بە چاكەی دەسەڵات بڵێ: چاكە، دەبێ چاكەكانیشی هەر بە خراپە لێكبدرێنەوە! بەڵام پێموایە ئەوانە لە ژێر كاریگەریی سیاسەتی میكیاڤێلییدان، بۆچی؟ من ئایەت دێنم، تا قورئان لەوێ بێ، كەسی دیكە بواری قسەی نیە، مادام خۆی بە مسوڵمان بزانێ، خوا چی دەفەرموێ؟

﴿ وَإِذَا قُلْتُمْ فَاعْدِلُوا وَلَوْ كَانَ ذَا قُرْبَىٰ ﴾ الأنعام: ١٥٢

واتە: ئەگەر قسەتان كرد، دادگەرانە قسە بكەن، با ئەو قسە دادگەرانەیە بە زیانی ئەو كەسەبێ، كە خزم و نزیكتە.

ئەدی ئەگەر كەسێ دوژمن بێ؟

﴿ وَلَا يَجْرِمَنَّكُمْ شَنَآنُ قَوْمٍ عَلَىٰٓ أَلَّا تَعْدِلُوا ﴾ [المائدة : ٨]

واتە: با دژایەتییتان بۆ كەسانێك، واتان لێ نەكات كە نادادگەر بن، دادگەر بن لەگەڵ ناحەزانیشتاندا، ئەوە لە پارێزكارییەوە نزیكترە. دەتوانی لەگەڵ دوژمن دا چاكەكار نەبی، بەڵام هەر دەبێ دادگەر بی.

ئنجا خوا سبحانه وتعالى هیچ قەیدێکی نەخستۆتە سەر (عدل):

﴿ إِنَّ ٱللَّهَ يَأۡمُرُ بِٱلۡعَدۡلِ ﴾ [النحل: ٩٠]، واتە: خوا فەرمان دەکا بە دادگەری.

بەنسبەت پێغەمبەریشەوە (علیه الصلاة والسلام) خوا پێی دەفەرموێ:

﴿ وَأُمِرۡتُ لِأَعۡدِلَ بَيۡنَكُمُ ﴾ [الشورى : ١٥].

واتە: (بڵێ) فەرمانم پێکراوە لە نێوانتاندا دادگەر بم.

ڕووی دواندن لە کافرەکان بووە، کەواتە: دادگەریی، (عدل) لە ئیسلامدا گوێرەیی (نسبة)ی تێدا نیە، بگوترێ: لەگەڵ فلانکەس دا دادگەر بە، بەڵام لەگەڵ فیسار کەس دا، قەیدێ ناکات، ئنجا ئەو خەڵکە زۆری لە ئەرکی ئۆپۆزسیۆن بوون، حاڵیی نەبووە، ئۆپۆزسیۆن لە ئەصڵدا دژی دەسەڵات نیە، کێبەرکێ لەگەڵ دەسەڵاتدا دەکات ئەگەرنا دڵسۆزیەتی، یانی: حکومەت چۆن دەیەوێ وڵات بەڕێوە بەرێ، ئۆپۆزسیۆنیش دەبێ بیەوێ ئەو حکوومەتە ئەگەر هەڵەی کرد، ڕاستی بکاتەوە، چاکی بکات تاکو خزمەتی خەڵك بکات و خەڵکەکە قازانج بکات.

ئنجا ئێمە لە ڕووی حکوومەت و دەوڵەتدارییەکەوە، لێی حاڵیی نەبووبووین و حکوومەتیش وای تەماشای ئۆپۆزسیۆن دەکرد، کە ئەوە دوژمنیەتی و دەیەوێ زەعیفی بکات و نارەحەتی بکا، ئۆپۆزسیۆنیش وای تەماشای حکوومەت دەکرد کە بڕووخێ و ناشیرینی بکا و نارێکی بکات! کە هەردووکی غەڵەتن و ئەوەش هۆکارەکەی کەوتنە ژێر کاریگەریی کلتوور و فەرهەنگی ڕۆژئاوایە، بە بارە سەقەتەکەیدا، هەڵبەتە خەڵکی ڕۆژئاوا شتی باشیشیان زۆرە، ئێمە لێیان وەربگرین، بەس سبحان الله میللەتانی دواکەوتوو، کۆمەڵگا دواکەوتووەکان هەمیشە بەدوای شتە خراپەکان دەکەون، هەمیشە بە دوای خاڵە ڕەشەکان دەکەون، وەك مێشە ڕەشە!! ئەدی بۆچی ئەوە وەرناگرن لە ڕۆژئاوا: سادەیی و خاکیەتیی بەرپرسان، دەستاودەستی دەسەڵات، دڵسۆزییان بۆ خەڵك، ئنجا کە خەڵك نارەزایی دەردەبڕێ و خۆپیشاندان دەکات، ئەو وەزیرە چاوبەخۆیدا دەگێڕێتەوە، بەڵکو

جاری وا هەیە حكوومەت هەڵدەوەشێتەوە، ئەو شتانەیان بۆ لێوەرناگرن، بۆچی دێن ئەوەیان لێ وەردەگرن، كە لە ڕیزی هەڵە و كەموكوڕییەكانی ڕۆژئاوایە، كە حوكم و سیاسەت ئەخلاقی تێدا نەبێ، شاكاری بەرزی تێدا نەبێ، ئنجا ئەگەر پشتی یەكدییش بشكێنن، هەرچەندە لەوێ كەمتر وایە، ئەگەر واش بكەن، من لەوێ نەمبینیوە، ئۆپۆزسیۆن و حكوومەت سەنگەر لە یەك بگرن، بەڵام گریمان ئەگەر شتێكی واشیان هەبێ، ئێمە بۆچی شتە خراپەكانیان لێوەربگرین، لەحاڵێكدا كە پێچەوانەی ئایەتی قورئانە؟!.

**دانـــا: مامۆستا! ئەگەر بینەرێ بیسەرێ گوێی لەم قسانەی جەنابت بێ، ئەڵێ: جا ئەگەر وابێ هەركاتێ حیزبی ئەلیف و با، كارە چاكەكانیان كرد و، كارە خراپەكان لە لایەن حیزبی جیم و دال و ها وە بۆیان ڕاستكرایەوە، وجودێك نامێنێ بۆ ئەو حیزبانەی تر و، هەتا هەتایە ئەمان هەر لەسەرەوە ئەبن و ئەوان بەرەو پووكانەوە ئەچن، تۆ وەڵامی ئەمە چۆن ئەدەیتەوە؟**

**مامۆستا:** وای وەڵام دەدەمەوە: خوا دەكا ئەو حیزبانەی (أ و ب) هەر كاری باش دەكەن با هەر ئەوان حوكمڕان بن، ئێستا لە ئەمریكا ئەوە حیزبی كۆماری و حیزبی دیموكراسی هەرجارە یەكێكیان حوكمڕانیی دەكا، زۆربەی خەڵكی ئەمریكا وای پێ چاكە، دیارە حیزبی دیكەش هەن، ئنجا ئەگەر ئەوانەی ئێمەش توانییان وابن، بەڵام توانییان وابن، لە ڕێی قەناعەت پێ هێنانی خەڵك، نەك لە ڕێی تەزویر و فرتوفێڵەوە، نەك لە ڕێی كڕینی وەلائی خەڵكەوە، نەك لە ڕێی تەخشان و پەخشانی ئیمتیازە مادديی و مەعنەوییەكانەوە، ئەگەر توانییان قەناعەت بە خەڵك بێنن، دەستیان خۆش بێ.

ئەگەرنا، لە ڕۆژئاوا چ لە ئەمریكا، چ لە وڵاتانی ئەورووپا، بەزۆریی وایە كە ئۆپۆزسیۆن چاوێكە بەسەر حكوومەتەوە بەسەر دەسەڵاتەوە، نەك بۆ ناشیرینكردنی و پەكخستنی و ڕێ لێگرتنی، بەڵكو بۆ ڕاستكردنەوەی و چاككردنی و، حەق و مەنتیقیش هەر ئەوە دەخوازێ، ئایەتەكانیش هەر ئەوە دەگەیەنن و بەپێی فەرمایشتەكانی پێغەمبەریش (علیە الصلاة والسلام)، ئێمە

دەبێ ڕێگریی لە خراپە بکەین، (النهي عن المنكر)، خۆ نابێ ئەگەر چاکە (معروف)یشیان کرد، هەر ڕێگریی لێ بکەین!! (لتأمرون بالمعروف ولتنهون عن المنكر)، بەڵێ دەبێ: (أن نقول للمحسن أحسنت وللمسيء أسأت) بە چاکەکار بڵێین چاکت کرد و، بە خراپەکار بڵێین خراپت کرد، ناکرێ بە چاکەکاریش هەر بڵێی: خراپت کرد!!

**دانـا: مامۆستا! جەنابتان هەر لە سەردەمی لاوێتییەوە وەك ئەوەی جەنابت هەموو جارێك ئەفەرمووی: تەنانەت ڕیشی ڕەشتان لە کاری ئیسلامییدا سپی کردوە، بەو تەجرەبەیەی ژیانی خۆت، بەڕاست سیاسییەکانی ئێمە، بەگشتی باس دەکەم و، لایەنە سیاسییەکانی ئێمە، بە گرێ و گۆڵی دەروونیی بە ڕابردووەوە مامەڵەوە لەگەڵ یەکتریدا دەکەن، یان نەخێر بەپێچەوانەوە، لە واقیعدا دەژین؟**

**مامۆستا:** بەزۆریی وامبینیوە بە گرێ و گۆڵی دەروونیی پێکەوە ڕەفتار دەکەن و، بەزۆریی وام بینیوە: لە مێژوودا دەژین، بە داخەوە، وەك گوتم: هۆکاری ئەوەش پێموایە زیاتر دەگەڕێتەوە بۆ ئەوە، کە ئەوانە هەوێنی ئیمان و تەقوا و ئەخلاقی ئیسلامیی و عیبادەت و بۆخوا سوڵحانیان ئاوێتە نەکردوە بە کارە سیاسییەکەیانەوەو، وەك ڕۆژئاواش نین، سیستمێکی حوکمڕانیی ڕەشید هەبێ، دامەزراوەکان هەبن و یاسا سەروەر بێ، کلتوورێکی سیاسیی و حوکمڕانیی چاکی ڕیشە داکوتراوی قووڵ هەبێ لەنێو کۆمەڵگادا، کە کۆمەڵگا بزانێ: حوکمڕان لەکوێ لادەدا و لەکوێ لانادا؟ لە کوێ ڕاست دەڕوا و لە کوێ چەوت دەڕوا؟ کە ئەگەر لایدا ڕاستی دەکەنەوەو قبووڵ ناکەن.

نە ئەو کلتوورە هەیە و، نە ئەو کارە سیستماتیکە هەیە و، نە ئەو دەمەزراوانە هەن و، نە ئەو یاسا سەروەرییە هەیە، ئنجا لەولاشەوە: ئەو هەوێنە دینیی و ئیمانی و ئەخلاقیی و ڕووحانیەش نیە لە کارە سیاسییەکەدا، بۆیە شەیتان و نەفس و، بەرژەوەندیی بنەماڵەیی و، بەرژەوەندیی عەشیرەت و دەوروبەر و، حیزب و خزم و، هەموو ئەوانە هەیمەنەیان هەیە بەسەر ئەدای سیاسیی زۆر لە سیاسییەکان دا، سەرەنجام ئەوەی لێ کەوتۆتەوە دەیبینین چۆنە! کە بە

داخەوە هەم بۆ خۆیان، هەم بۆ خەڵك و كۆمەڵگایان مایەی عەیبداریی و گوناهباریی و سەربەفەتارەت چوونە، ئاخر ئینسان چەند جار دەژیەت؟ یەكجار دەژیەت لەم سەرزەوییە، كەسێك كە دەكرێت بە بەرپرسی كارێك و بەداخەوە بە شێوەیەكی ناشیرین ئەو دەرفەتە دەگوزەرێنێ و، كەس دوعای خێری بۆ ناكات، گریمان ئەوە هیچ كەسیش نەیتوانی كارەكەی لێ بستەنێتەوە و هەروا ڕۆیشت! چ تامێكی هەیە و چ سوودێكی هەیە، كە تۆ پۆست و مەقامێكت هەیە، بەڵام نەتوانی خوای پێ لەخۆت ڕازی بكەی و، خەڵكی پێ لە خۆت ڕازی بكەی و، دەروونی خۆت مورتاح بكەی، كە تۆ كوڕ و كچەكانی خۆت وەك هی خەڵك تەماشا نەكەی و، خزمەكانی خۆت وەك خەڵك تەماشا نەكەی و، هەژار و نەدارو بێ دەرەتانەكان وەك ئەوانە تەماشا نەكەی، كە لە ژێر هەیمەنەو دەسەڵاتی تۆدا بوونە حووت، بوونە ملیاردلێر و خەڵكەكەی دیكەش حاڵی ئاوا شپرز بێ، ئەوەی چی تێدایە؟! پێموایە ئەگەر گریمان هەروا بشچێتە سەرێ بەو شێوەیە، زۆر لە سەرۆكی وڵاتانمان بینیون بە دیكتاتۆریی و زوڵم و ستەم دەیبەنە سەر، تا ژیانە ئەمانەتەكەیان تەواو دەبێ، بەڵام فایدەی چی! لە مێژوودا چۆن تۆمار دەكرێ و، بۆ لای خوا چ وەڵامێكی هەیە؟!

**دانــا: مامۆستا! ئەگەر ڕەوشت و ئاكارە بەرزەكانی وەك دڵسۆزیی و ڕاستگۆیی و بێ گرێ و گۆڵیی و دادپەروەریی و ئەمانە بۆ تاكێكی ئاسایی لە كۆمەڵگادا زەروور بن و تا چەند بۆ سیاسییەكان، بۆ بڕیاربەدەستەكان، بۆ كاربەدەستەكان، ئەم ڕەوشت و ئاكارە بەرزانە، نەك زەروورن، بەڵكو لەسەرووی زەروورەوەن؟!**

**مامۆستا:** وەك پێشتر باسمكرد: مرۆڤێكی سادە هەڵەیەك دەكات، هەر خۆی باجەكەی دەدات، گوناحێك دەكات خۆی زەرەری لێ دەكات، بەڵام كە حوكمڕانێك هەڵەیەك دەكات، خەڵكێك لەگەڵیدا باجەكە دەدات، با دوور نەڕۆین نموونە بە مێژووی تازەی خۆمان بێنینەوە: صەددام حسێن كە شەڕی كوێتی كرد، شەڕی ئێرانی كرد، بەرامبەر بە هەموو پێكهاتەكانی عێراق، بەتایبەت كورد، ئەو هەموو قەتڵعام و جینۆسایدەی كرد، ئەو بڕیارانەی كە صەددام دەیدان، كێ باجەكەی لەگەڵ دەدا؟ خەڵكی هەموو عێراق، كاتی خۆی شای ئێران و هەموو

ئەوانەی کە بە زوڵم و ستەم، حوکمڕانیان کرد، کێ باجەکەی لەگەڵ دان؟ بێگومان خەڵك و کۆمەڵگایەکانیان بەگشتی، ئەوەتا ئێستاشی لەگەڵدا بێ، هەر باج دەدەن، کەواتە: ئەگەر بەها بەرزەکان و لایەنی مەعنەویی و ڕووحیی بۆ مرۆڤێکی سادە پێویست بێ، بۆ هاووڵاتییەکی سادە، بە تەئکید بۆ کەسێك کە چارەنووسی خەڵك و وڵاتێکی لەبەردەستە، زۆر زیاتر پێویستە، چونکە ئەگەر چاکە بکا، خەڵکێکی زۆر لەو چاکەی ئەو بەهرەمەند دەبن، ئەگەر ڕاست بڕوا و ڕێك بێ، ئەگەر بەپێچەوانەشەوە بێ، خەڵکێکی زۆر ئەو باجەی لەگەڵ دەدەن و زەرەری لێ دەکەن، کەواتە: وەك گوتراوە: (إذا هلكَ عالِمٌ هلكَ عالَمٌ) ئەگەر زانایەك فەوتا، عالەمێك دەفەوتێ، بۆ حوکمڕانیش بە تەئکید هەر وایە!.

**دانـا: بەڕێز مامۆستا عەلی باپیر نووسەر و ڕووناکبیر! سوپاس بۆ ئەوەی کە وەڵامی پرسیارەکانی ئەم ئاڵقەیەی ئێمەت دایەوە.**

**مامۆستا:** سوپاس بۆ ئێوەش، هەر سەربەرزو سەلامەت بن.

**دانـا: زۆر سوپاس، بینەرانی ئازیز و خۆشەویست، تا ئاڵقەیەکی دیکە خواتان لەگەڵ.**

# ئاڵقەی هەژدەیەم

بنەمای هەژدەیەم: با لەواقیعدا بژین نەك لە مێژووداو، لێنەگەڕێین ڕابردوومان دەستمان ببەستێ لەبەردەم ئێستاماندا.

بنەمای نۆزدەیەم: تێگەیشتن و بیرۆکە ڕاست و ئاکار و بەها بەرزەکان، هۆکارێکی گرنگی تەبایی کۆمەڵایەتیی و سیاسیین لەکۆمەڵگادا.

ameer.maktab@yahoo.com

دانـــا: بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان، سڵاوتان لێ بێ بینەرانی ئازیز و خۆشەویست! زۆر خۆم بە خۆشحاڵ ئەزانم لە ئاڵقەیەكی نوێی بەرنامەكەتان، بەرنامەی بەدانایی دا، لە خزمەت میوانە هەمیشەییەكەم جەنابی مامۆستا عەلی باپیر نووسەر و ڕووناكبیر دا، بە ئێوەی ئازیز و خۆشەویست شاد ببینەوە، بێگومان لە زنجیرە بابەتەكەی مامۆستادا، لەسەر بارودۆخی هەرێمی كوردستان كە جەنابیان لە ژێر ناوونیشانی "بۆ چاككردنی ئەم دۆخەی هەرێم، با گوێ لە قورئان بگرین" لەم ئاڵقەیەدا دەگەینە بنەمای هەژدە بەناوونیشانی "با لە واقیعدا بژین نەك لە مێژوودا و، لێنەگەڕێین ڕابردوومان دەستمان ببەستێ لەبەردەم ئێستاماندا"، دەپرسین بزانین مامۆستا مەبەستی چییە لەم دەستەواژەیە كە لە قورئانەوە هەڵیهێنجاوە؟!

مامۆستاگیان! دووبارە سوپاس بۆ ئەم دەرفەتە كە لەم ئاڵقەیەشدا بەئێمەت بەخشی.

**مامۆستا:** سوپاس بۆ جەنابیشتان، بەخێربێن كاكە دانا خۆت و هاوكارانت.

دانـــا: زۆر سوپاس، مامۆستا! لە بنەمای هەژدە داین، (با لە واقیعدا بژین نەك لە مێژوودا)، ئەمە بەشێكی، بەشێكی تریشی دەفەرمووی: (لێنەگەڕێین ڕابردوومان دەستمان ببەستێ لە بەردەم ئێستاماندا) وەك هەموو جارێك سەرەتا حەز دەكەم لەوێوە بچینە نێو پرسیارەكانەوە، ئەم دەستەواژەیەت چۆن هەڵێنجاوەو بۆچی؟

**مامۆستا:** الحمد لله، وصلی الله تعالی وبارك علی رسول الله محمد وآله المهتدین بهداه.

میللەتانی پێشكەوتوو و میللەتانی سەركەوتوو، ئەوانەن كە لە ئێستادا دەژین و بە گرێ و گۆڵی دەروونییەوە پێكەوە مامەڵە ناكەن، بە حیقد و بوغزی ڕابردوو، بەڵكو بە ساغیی و صافیی، وەك پێشتریش باسمان كرد، بەڕاستیی و دڵسۆزیی پێكەوە مامەڵە دەكەن، ئێمە بەشەرین، دیارە مرۆڤ لە كۆمەڵێك هەست و نەست پێكهاتوە و كۆمەڵێ غەریزە كە جەستە دەیانخوازێ، هەموو مرۆڤەكان هەر وان، كەواتە: ژیان كاریگەریی هەیە لەسەرمان، بەڵام ئەگەر ئێمە مەحكوومی غەریزەكانی خۆمان بین و، مەحكوومی ئەوەبین كە لە ڕابردوودا،

له ئێمه ڕوویداوەو به سەرمان هاتوە، لەلایەن كەسێكەوە قسەیەكمان پێ گوتراوە، لەلایەن گرووپێكەوە ستەمێكمان لێكراوە، ئەگەر ئێمه مەحكوومی ئەو شتانه بین، مانای ئەوەیه دەبێ هەموو ژیانەكەمان بریتی بێ لەوە: تۆ بەدوای ئەوەدا بگەڕێی چۆن تۆڵەی خۆت بكەیەوە و ئەویش دوایی كه دەرفەتی دەستكەوتەوە، دیسان بخەفتێ چۆن تۆڵەی خۆی له تۆ بكاتەوە؟ خوای پەروەردگار یەك ڕستەی قورئان له دوو شوێندا، له سووڕەتی (البقرة)دا دەفەرموێ:

﴿ تِلْكَ أُمَّةٌ قَدْ خَلَتْ لَهَا مَا كَسَبَتْ وَلَكُم مَّا كَسَبْتُمْ وَلَا تُسْـَٔلُونَ عَمَّا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴾

[البقرة : ١٣٤].

ئەم بنەما قورئانییەم لەو ئایەته موبارەكه هەڵهێنجاوە، كه دوو جاران دووبارەبۆتەوە، هەر شتێك له قورئاندا جارێك بێت به قەدەر ئەو جاره بایەخی هەیه، دووجاران بێ، به قەدەر دوو جاران بایەخی هەیه، هەڵبەته هەر شتێك له قورئاندا یەكجاریش بێ، مانای وایه ئەوە حەقیقەتێكه كه خوا سبحانه وتعالی خستوویەته نێو كتێبەكەی خۆیەوە، یەكجاریش بەسه بۆ ئەوەی بزانی ئەو شته گرنگه، بەڵام ئەگەر دووباره بووەوە و، سێ باره بووەوە و، چەندباره بووەوە، به تەئكید چەندجاران دووباره بێتەوە، ئەوەندە گرنگه.

ئەو ئایەتەش له یەك سیاقدا، له سووڕەتی (البقرة)دا دوو جاران دووباره بووەتەوە، له كۆتایی جوزئی یەكەم، پێش ئەوەی كه جوزئی دووەم دەست پێ بكات، باسی خاوەن كتێبەكان دەكات به گشتی، جوولەكه و نەصرانییەكان، بەڵام بەتایبەت باسی جوولەكەكان دەكات، دوایی دەفەرموێ: (تِلْكَ أُمَّةٌ) ئەوانه كۆمەڵێك بوون (قَدْ خَلَتْ) تێپەڕیون، ڕابردوون، (لَهَا مَا كَسَبَتْ وَلَكُم مَّا كَسَبْتُمْ وَلَا تُسْـَٔلُونَ عَمَّا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ) ئەوان چیی چاكیان كردبێ، بەرهەمەكەی بۆ خۆیانه، دیاره ئەگەر خراپیشیان كردبێ زەرەرەكەی بۆ خۆیانه، ئێوەش چیی چاك بكەن، بەرهەمەكەی بۆ خۆتانه، ئێوه لەبارەی ئەوەوە كه ئەوان دەیانكرد، لێتان ناپرسرێتەوە، وەك چۆن ئەوانیش لەسەر هەڵه و كەموكوڕیی ئێوه لێپرسینەوەیان

لەگەڵدا نەكراوە، ئێوەش لەسەر هەڵە و كەموكوڕیی ئەوان، لێپرسینەوەتان لەگەڵدا ناكرێ، یانی: چیی؟ یانی خۆتان مەبەستنەوە بە مێژووەوە.

لێرەدا خوا سبحانە وتعالی بە تێگەیشتنی من دەیەوێت جولەكەكان و نەصرانییەكان و خاوەن كتێبەكان لەو ڕابردووەی خۆیان، دەربێنێ، كە ئێستا واقیعێكی دیكە هاتۆتە گۆڕێ، ئەگەر پێشتر لەگەڵ عەرەبدا كێشەتان بووە، جوولەكە لە نێو خۆتانداو، لەگەڵ نەصرانییەكاندا یەكدییتان كوشتوە، لەگەڵ بابلییەكاندا، لەگەڵ كلدانیی و ئاشوورییەكاندا، (ئاخر گەلی جوولەكە لەگەڵ هەموویاندا كێشە و شەڕیان بووە) ئێستا بازاڕێكی دیكە هاتووەتە گۆڕێ، پێغەمبەرێك (علیه الصلاة والسلام) هاتووە، بەڵێ لە نێو گەلی عەرەبدا هاتوە، بەڵام بۆ هەموو بەشەر هاتوەو ئەو پێغەمبەرە (علیه الصلاة والسلام) لاپەڕەی سپی لەگەڵ هەموو لایەكتاندا هەڵداوەتەوەو، بە كۆنە قین شەڕ لەگەڵ كەسدا ناكات، ئێوەش وەرن وا بكەن.

لێرەدا دیارە خوای پەنهانزان ئەو ئایەتەی لەو سیاقەدا هێناوە، بەڵام بۆ مسوڵمانانیشە، ئەی مسوڵمانینە! مەچن لە مێژوودا مەژین.

جارێك باسی بەرپرسێكی حكوومەتی ئێستای عێراق كرا، یەكێك لە سوننەكان بۆی گێڕامەوە، گوتی: فڵانكەس كە سەرۆك وەزیران بوو، ئێمە بەتەمابووین پارەیەك تەرخان بكەین بۆ وەقفی سوننیی، گوتمان: وەرە ئەوە بڕیارەكەیەتی، نووسراوە، ئەو پارەیە دەبێ تەرخان بكرێ بۆ وەقفی سوننیی، بیاندەینێ پڕۆژەی شتی پێ ساز دەكەن، گوتی: ئەدی وەقفی شیعە، گوتمان: وەقفی شیعە جارێ مامەڵەكەتان دواكەوتووە، دوایی بۆ ئەوانیش دادەنێین، گوتی: نە و، نابێ، گوتمان چۆن نابێ؟ گوتی: ئەو فێڵەی كاتی خۆی لە ئەبو مووسای ئەشعەریی كرا كە نوێنەری عەلی كوڕی ئەبی تاڵیب بوو لە دەومەتولجەندەل، ئەو فێڵەی عەمری كوڕی عاص لێی كرد، كەنوێنەری معاویە بوو، نابێ ئەو فێڵە لە من بكرێ، گوتمان: فێڵی چی؟ ئێستا ئەوانە كاری خۆیانیان تەواو كردوە، با جارێ هی ئەوان بكەین، خۆت سەرۆكوەزیرانی، هی وەقفی شیعەش

دەكەین، گوتی: نەخێر نابێ، ئیللا دەبێ هی وەقفی شیعە بكەین، ئەوجار هی ئێوە بكەین، ئەگەرنا مانای وایە من پەندم لەو دەرسە مێژووییە وەرنەگرتوە.

كە بۆی گێڕامەوە، گوتم: هاوار بە حاڵی میللەتێك ئا ئەوە سەرۆك وەزیرانی بێ، بەو عەقڵیەتە وڵات ئیدارە بكا، بگەڕێتەوە بۆ هەزار و چوار سەد ساڵ لەمەوپێش، بیەوێ تەصفیەی حیساباتی ئەو كاتە بكات! ئا ئەوەیە لە مێژوودا ژیان!

بێگومان ئەوەم كە گوتوە هەم هەرێمی كوردستانیشم لەبەرچاو گرتوە، هەم عێراقیشم لەبەرچاو گرتوە، بەڕاستی، وەك گوتم: ئایەتە قورئانییەكەش باسی مێژووی هەموو بەشەر دەكات، زۆر گرنگە ئێمە بتوانین لە ئێستادا بژین، لە ئێستادا بژین، واتە: دەست و پێی خۆمان نەبەستین بە مێژوو، بە ڕووداوەكانی مێژوو لە بەردەم ئێستادا، كە نەتوانین مامەڵەیەكی بابەتییانە لەگەڵ ڕووداوەكان و پێشهاتەكاندا بكەین، بە گرێ و گۆڵی دەروونیی بە ڕووحی تۆڵە كردنەوە كردنەوەوە نابێ پێكەوە مامەڵە بكرێ، ئەگەرنا كەم حیزب هەن، لەم هەرێمی كوردستانەی ئێمەدا، شەڕی پێ نەفرۆشرابێ، یان شەڕی نەكردبێ، بەڵام دەبێ تا قیامەتێ هەر خەریكی ئەوە بین، نا، دەبێ لاپەڕەی سپی هەڵدەینەوە، میللەتانی سەركەوتوو ئەوانەن كە پەند لە ڕابردوو وەردەگرن، بەڵام ڕابردوو ناهێننە ئێرە و، خۆیانی پێ مەشغووڵ بكەن، دەرسی لێوەردەگرن و بەجێی دەهێڵن لە مێژوودا، بەڵام ئێستا لەگەڵ ئێستادا مامەڵە دەكەن.

**دانـا: بێگومان بۆیە جەنابت ئەمەت نووسیوە، نیشانەی ئەوەیە كە تۆ هەستت كردوە هەم لە هەرێمی كوردستان هەم لە عێراقیش بەشێك لە بڕیاربەدەستان و سیاسییەكانی ئێمە لە ڕابردوودا ئەژین و مەحكوومن بە ڕابردوو، نەك لە ئێستادا بژین، بۆیە ئەمەت ئاماژە پێكردوە!**

**مامۆستا:** بەڵێ، بۆیە ئاماژەم پێكردوەو، ناشمەوێ هەندێ شت بووروژێنم، كە چ حیزبێ شەڕی بە چ حیزبێ فرۆشتوە و، دیلەكانی كوشتووە و چ حیزبێك چ بەرپرسێكی گرتوە یان سجنكردوە یاخود قسەی پێ گوتوە! ئەویش بە

دوای ئەوەدا دەگەڕێ، چۆن تۆڵەی خۆی لێ بكاتەوە، ئەو شتانە بوون، ئەو كەموكوڕییانە بوون، نەدەبوو بووبوونایە، ئێمە كە ئەو دوژمنە زەبەلاحەمان لەبەردەم بوو، كە ڕژێمی بەعس بوو، ڕژێمە یەك لە دوای یەكەكانی عێراق و، لە بەشەكانی دیكەی كوردستانیش دا، ئەو گەلەی ئێمە كە چەوسێنراوەتەوە لەلایەنی میللەتە سەردەستەكان و دایم بندەست بووین، نەدەبوو ئەو هەموو دژایەتییەی یەكدی بكەین، كە ئێستاش لەگەڵدا بێ، ئێستاش بەداخەوە ئەو شتانە هەر دووبارە دەبنەوە، ئێستاش حیزبێك كە لە شوێنێ دەسەڵاتی هەیە قۆرخی دەكات، سەیتەرە دادەنێ بۆ ئەوانی دیكە، قەیناكا لایەنی ئەمنیی و ئاسایش بپارێزە، بەڵام مەعقووڵە بڵێی: من كوێخام، بە چاوی هاووڵاتیی پلە دوو و سێ تەماشای لایەنەكانی دیكە بكەی؟ یان كە دەسەڵاتت هەبوو لە شوێنێك، بێنی بوونی حیزبی سیاسی لەو شوێنە قەدەغە بكەی! یاخود ئەگەر هەشبێ، دەبێ لە ژێر هەیمەنە و سێبەری تۆدا بێ؟ مانای وایە بەعسییەكانیان چۆنیان كرد، ئێمەش هەروا دەكەینەوە، ئەتاتۆرك چی كردوە شای ئێران چی كردوە و بەشار ئەسەد چی دەكات، مانای وایە تۆش هەروا دەكەی، هەر ڕێك ئەزموونی ئەوت هێناوە نەقڵت كردوە! بەڵێ من هەرچی گوتوومە، لەخۆوە نەمگوتوە،چونكە لە نێو واقیعەكەدا ژیاوم، دەزانم كە ئێستاش لەگەڵدا بێ، ئەو ڕابردووە تاڵەی كاتی خۆی كاریگەریی هەیە لەسەر سیاسەتی ئێستامان، ئنجا من هەر داوام ئەوەبووە و داوام ئەوەیە، كە ئێمە دەبێ خۆمان لەو گرێ و گۆڵە دەروونییانەو هەڵەو پەڵە مێژووییانە دەربازكەین و، لە ئێستادا بژین، چۆنیش لە ئێستادا بژین؟ بە دڵسۆزیی بۆ یەكدیی، بە ساغیی و ڕاستیی لەگەڵ یەكدیی، بەشێوەیەك كە بەرژەوەندیی گشتی زاڵكەین، بەسەر بەرژەوەندیی تایبەتداو، بەشێوەیەك كە هەركامێكمان قازانج و زیانی بەرامبەرەكەی پێ وەك هی خۆی بێت، ناڵێم ئەوەش ئاسانە، بەڵام پێموایە ئێمە ئەگەر پابەند بین بە قورئانەوە، پابەندبین بە ڕێبازی پێغەمبەرەوە (علیه الصلاة والسلام) بۆ خوا سوڵحاو بین و، كاری سیاسییمان هەوێنی ئیمان و دین و ئەخلاقی تێكەڵ بكەین، ئەوكاتە بەو شێوە مامەڵە كردنەمان، بۆ ئەستەم نابێ، بەڵكو ئاسان دەبێ.

**دانــا: مامۆستا! وەك جەنابت هەمیشە دەگەڕێیتەوە بۆ قورئانی پیرۆز و فەرمایشتە جوانەکانی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)، بێگومان لە قورئانیشدا زۆر باسی مێژوو کراوە و باسی ڕابردوو کراوە، ئێستاش ئەوەی ئێمە لە هەرێمی کوردستان، لە ڕابردوودا بنیاتماننناوە، هەم بووەتە مێژوو و هەم بووەتە کلتوور، جەنابت فەرمووت: با ئێمە لەوێ دا نەژین، لە ئێستادا بژین، بەڵام پەند لەوێ وەربگرین، لەوانەیە بینەرێك بیسەرێك، ئێستا بپرسێ: چۆن ئێمە پەند لەو ڕابردوو و مێژوو و کلتوورەی خۆمان وەربگرین؟**

**مامۆستا:** بەوجۆرە پەندی لێ وەربگرین بزانین: کورد چ لەم بەشەی کوردستان، کە باشووری کوردستانی پێ دەڵێین: چ لەهەر سێ بەشەکەی دیکە: باکوور، ڕۆژهەڵات، ڕۆژئاوا، هەرچی زیانی لێمان کەوتوە، بەهۆی دووبەرەکیی ناوخۆمان، بەهۆی سەنگەر لە یەکدی گرتنمان، بەهۆی ناکۆکیی و لەیەکدی خوێندنمان، بەهۆی ئەوەوە کە هەرکاتێ لایەنێك ویستوویەتی بەرامبەرەکەی بخا، با بە قازانجی. ئەو ڕژێمەش بوو بێ کە هەموویان دەچەوسێنێتەوە، دەستی لەگەڵ دوژمن و ناحەزێك دا تێکەڵ کردووە، ئێمە هەرچی زەرەری کردوومانە، لێرەوە کردوومانە، هەموو زەفەر پێ برانەکان لە درز و کەلێنەکانی خۆمانەوە بوون، عاقڵ ئەو کەسەیە، پەند لە هەڵەو زیانەکانی وەربگرێ، گوتراوە: هەر عەقڵە لە خەسارێك،پێشینانیش دەڵێن: جارێك هەڵتخەڵەتاندم، خوا بتگرێ، دووجار هەڵتخەڵەتاندم، خوا بمگرێ! پێغەمبەریش (علیه الصلاة والسلام) دەفەرموێ: (لا یلدغ المؤمن من جحر واحد مرتین) متفق علیه. واتە: هیچ ئیماندارێك دوو جار لە کونێکەوە پێوەی نادرێ. دەزانی کەی وایفەرموو (صلی الله علیه وسلم)؟ کابرایەکی کافر هەبوو لە شەڕی بەدردا بەشداریی کردبوو، بەدیل گیرا، پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) فەرمووی: بەرت دەدەم و جارێکی دیکە شەڕ لە دژی ئێمە مەکە! یانی بە خۆڕایی بەردرا، دوایی لە جەنگێکی دیکەشدا دووبارە گیرایەوە، بە دیل گیرا، گوتی: ئەی موحەممەد! (مسوڵمانیش نەدەبوو) ئەم کەرەتەش مۆڵەتم بدە بگەڕێمەوە، جارێکی دیکە نایەمەوە شەڕی دژی ئێوە، دەڵێ پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) فەرمووی: بەرت نادەم کە لە کۆڕ

و مەجلیسی قورەیشییەكاندا دابنیشی و دەست بە سمێڵی خۆتدا بێنی و بڵێی: دووجاران موحەممەدم هەڵخەڵەتاند، (لا یلدغ المؤمن من جحر واحد مرتین) ئیماندار نابێ دووجار لە كونێكەوە بگەزرێ. واتە: تۆ پەیمانت شكاند، كە قەرار بوو شەڕ لە دژی ئێمە نەكەی، جاری یەكەم بەو مەرجە ئازادمان كردی، ئەمجارە بۆچی هاتیەوە؟ مەبەستم لە پەندوەرگرتن ئەوەیە، كە تۆ وەك پێشێ زەرەرت كردوە، ئەمجارە زەرەر نەكەی، من پەندێكم هەیە دەڵێم: ئینسان دەبێ پەند لە خەڵك وەربگرێ، نەك ببێتە پەندی خەڵكی، عەرەبیش دەڵێن: (السعید من اتعظ بغیره)، كە دەتوانین بەشێكی دیكەشی بۆ زیاد بكەین و بڵێین: (والشقی من اتعظ به غیره) ئەوەیان نەگوتراوە من دەیڵێم، واتە: بەختەوەر ئەو كەسەیە پەند لە خەڵك وەربگرێ، بەڵام بەدبەخت ئەو كەسەیە خەڵك پەندی لێ وەربگرێ. خوای پەروەردگار لە سەرەتای سووڕەتی (الحشر)دا لە باسی هۆزی جوولەكەی (بنوالنچیر)دا كە پەیمانیان شكاندو پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) دەری كردن لە مەدینە بڕۆن، مادام پەیمان دەشكێنن و، لە پشتەوە خەنجەری غەدر دەوەشێنن، بڕۆن، شارەكەمان بەجێ. بهێڵین، چونكە ئێوە كاتی خۆی (وپیقە)مان پێكەوە مۆر كرد، كە ئێوە هاوپەیمانێكی ڕاست و دروست بن، هەموو كاروباری خۆیان هەبوو وەك كۆنفیدڕاڵیی، بەڵام ئێوە هەموو جارێ خەنجەری غەدر بوەشێنن و لەگەڵ دوژمنانی ئێمەدا ڕێكبكەون و لە پشتەوە خەنجەرمان لێبدەن، نابێ! ئنجا لەو سیاقەدا خوای پەروەردگار دەفەرموێ: (فاعتبروا یا أولی الأبصار ...) ئەی خاوەن عەقڵەكان پەند وەربگرن، واتە: وەك (بنوالنچیر) مەكەن كە خیانەتیان كردو پەیمانیان شكاند و سەرەنجام دەركران، ئێوەش وەك ئەوان مەكەن، بۆ ئەوەی وەك ئەوان زەرەر نەكەن، كەواتە: پەندوەرگرتن، ئەوەیە ئەو هەڵەیەی كە كراوە لەلایەن كەسێكەوە، لەلایەن كۆمەڵێكەوە كە زەرەری لێكردوە، تۆ وەك ئەو نەكەی بۆ ئەوەی زەرەر نەكەی.

**دانــا: مامۆستا! ئەگەر بە دیوێكی تردا، ئێستا ئێمە لە مانگی ئازاردایـن كە ئەم بەرنامەیە لە خزمەت جەنابتا تۆمار ئەكەین، بێگومان مانگی ئازار كۆمەڵێك ڕووداوی مێژوویی هەم ئازاربەخش، هەم ئومێدبەخشی تێدان بۆ گەلی كورد، هەر لەم مانگەدا بوو لە ساڵی نەوەدو یەك دا، خەڵك لە دژی جەورو ستەمی حكوومەتی بەعس ڕاپەڕین، تا چەند پێویستە سیاسییەكان و بڕیاربەدەستانی ئێمە لەم هەرێمەدا، پەند لەوە وەربگرن: حكوومەتی بەعس بۆچی لەسەر دەور لاچوو، هۆكاری چیبوو لەسەر كار لاچوو، بۆ ئەوەی كە ئەمانیش تووشی ئەو لەسەر كار لابرانە نەبنەوە بەو شێوازە؟**

**مامۆستا:** كاكە دانا ئەگەر ئێمە لە ڕابردووەوە ڕانەمێنین و، پەندی لێ وەرنەگرین، هەمیشە مێژوو دووبارە دەبێتەوە، هەمیشە تۆ هەڵەكان دووبارە دەكەیەوە و باجدانەكەش دووبارە دەبێتەوە، هەڵبەتە ئینسان كە یەكەمجار هەڵە دەكات، ڕەنگە خەڵك عوزری بۆ بێنێتەوە، بڵێن یەكەمجاری بوو، ناشێ بوو، نەیزانی، بەڵام دووەمجار و سێیەمجار، نا، كە مێژووی ئێمە بە داخەوە، بە داخێكی زۆر گرانەوە ئاوایە، هەر لە سەردەمی میرنشینەكانی بابان و سۆران و بۆتان و ئەردەڵان و ...هتدەوە، بگرە، تەماشا دەكەی: دەوڵەتی عوسمانیی و صەفەویی هەبوون، یەكێك پاڵی بە دەوڵەتی عوسمانیی یەوە داوە، یەكێك پاڵی بە دەوڵەتی صەوفەویەوە داوە، ئەوانیش پێكەوە بە شەڕیان داون، شەڕی بە وەكالەت، وەك من لەو بەینەدا لە پەیجەكەی خۆم شتێكم نووسی، گوتم: ئەو تەق و تۆقەی كە لە شنگال بووە، ئەگەر شەڕی بە وەكالەت بێ بە زەحمەت چارەسەر دەكرێ، ئومێدم وایە شەڕی بە وەكالەت نەبێ، ئەگەر هەروا تێكهەڵچوونێكی كاتییش بووبێ، ان شاء الله چارەسەر دەبێ، دەبێ عاقڵمەندان دە فریای بێن، ئنجا ئەگەر ئێمە بەتایبەت بڕیاربەدەستان، بە چاوێكی ڕەخنە لەخۆگرانەوە، تەماشای مێژووی خۆمان نەكەین، بەبێ خاترگرتنی خۆ، تەماشای ڕابردوومان نەكەین و دان بە هەڵەكانمان دا نەهێنین، هەر لەسەر دووبارەكردنەوەی هەڵەكانیان بەردەوام دەبین، كە بە داخەوە ئەوە زۆر كەم دەبینم، پێم خۆشبوو جارێك لە جاران، ئەوە ئاواتێكی منە، بڕیاربەدەستێكی ئەم وڵاتەم بینیبایە، لەوانەی كە بیست و پێنج ساڵە ئەم وڵاتە بەڕێوە دەبەن یەك جار بینیبام لەسەر تەلەفزیۆن، لەسەر ڕادیۆ،

لە كۆبوونەوەیەكی گشتی دا، گوتبای: خەڵكینە! خەڵكی هەرێمی كوردستان، من فلان هەڵەیەم هەیە، ئێستا لێی پەشێمانم نەدەبوو وامانكردبایە، نەمبینی!!

**دانـــا: دیـــارە نیـــە؟**

**مامۆستا:** ئەدی ئەو هەموو ماڵوێرانییە، ئەو وەزعە ناهەموارە بۆچی پەیدا بووە؟ جاری دیكەش باسمانكردوە، كە خەڵكی دلێر و ئازا، ئەوانەن كە بوێریی ئەوەیان هەبێ دان بە هەڵەی خۆیاندا بێنن، دان بە كەموكوڕییەكانی خۆیاندا بێنن، وەك لە فەرمایشتی پێغەمبەردا (علیه الصلاة والسلام) هاتووە: (إذا أراد الله بعبدٍ خيراً، بصَّره بعيوب نفسه، وَزَّهده في الدنيا)رواه... ئەگەر خوا چاكەی بۆ بەندەیەكی ویست، عەیبەكانی خۆی دەخاتە بەرچاوی و دنیاشی لەلا بچووك دەكاتەوە، وای لێ دەكات دنیا بەكەم بگرێ، نەك باوەشی پێدا بكات.

ئێمە زۆر زۆرمان پێویستە بەتایبەت لەم مانگەدا مانگی ئازارەو فیعلەن ڕووداوی زۆر گەورە گەورەی تێدا بوون، جێی خۆیەتی هەڵوەستەی باش بكرێ، بەڵام هەڵوەستە هەر بۆ موزادەیەی سیاسیی و بۆ خۆڵكردنە چاوی خەڵك و، دڵخۆشكردنی خەڵك بۆ ماوەی چوار پێنج ڕۆژان، نا، هەڵوەستەی جیددیی تێدا بكرێ، بۆ وێنە: خەڵكێك كە لەم وڵاتەدا خۆی بە بڕیاربەدەست دەزانن، شەنءكەوێكی ئەو (٢٦) ساڵەی ڕابردوو قەیناكا، لە مێژووی كۆنتر گەڕێ، هەر ئەو بیست و شەش ساڵەی ڕابردووی خۆمان چیمان كردوە و، چۆنمان كردوە و، ئەم وڵاتە پڕ خێر و بێرەی خۆمان، چۆن مامەڵەمان لەگەڵ خێر و بێرەكەی دا كردوە؟ چۆن مامەڵەمان لەگەڵ ئەو خەڵكە بەش مەینەت و خەڵكە هەژار و نەدارەدا كردوە؟ دەڵێین: بەرپرسی ئەم هەرێمەین، دیارە ئەم هەرێمە بە مرۆڤەكانییەوە هەرێمە، بە هەموو شارەكانی، بە هەموو دەڤەرەكانییەوە، هەرێمە، ئەدی نابێ بە یەك چاو هەمووی ببینین! نابێ ماف و داواكارییەكانیان، ئازادییەكانیان، نارەزاییەتیەكانیان گوێ بدەینێ، لەگەڵ ئازارەكانیاندا بین، دەبوو هەڵوەستە بكەین، هەڵوەستەی جیددیی لە بەردەم ئەو چارەگە سەدە حوكمڕانییەی خۆماندا، ڕاپەڕین كە لە دەروازەی ڕاپەڕین ئنجا لە سلێمانیی

و لە دهۆك و لە كەركووك و لە هەولێر و ...هتد. ئێستاش لەزۆربەی شارو شارۆچكەكان دا ئەو يادە دەكرێتەوە، ئەو خەڵكە بير دەكاتەوە: بۆچى ڕاپەڕينمان كرد؟ ئێستا لە كوێين؟ ئەو كاتە چۆن بووين؟ ئەو شتانەی ئەو كاتە لێى ناڕازيى بووين و ئاواتەكانمان چى و چى بوون؟ چ دڵخۆشييەكمان هەبوو بەو حيزبانە كە دێنەوەو پەرلەمانمان پەيدا دەبێ و حكوومەتمان پەيدا دەبێ، بۆچى پەيدا دەبن؟ ئامانجەكان چين؟ ئێستا لە كوێى ئامانجەكانين؟ من ناڵێم: دنيا بە قوڕێ گيراوە و هيچ تروسكايەكى تێدا نيە، بەڵام بە تەئكيد خەڵك بێزاريى و نائومێدييەكى زۆرى هەيەو، ئەو كاتەش ئاوات و هيواى زۆر هەڵچنرابوون، كە بە داخەوە ئێستا واقيعەكە زۆر پێچەوانەی ئەو هيوا و ئاواتە زۆرانەيە.

**دانـــا: ئەكرا زۆر زۆر لەمە باشتر بووايە، مامۆستا! لە بنەمای نۆزدەدا، جەنابت باس لەوە دەكەی كە: (تێگەيشتن و بيرۆكە ڕاست و ئاكار و بەها بەرزەكان، هۆكارێكى گرنگى تەبايى كۆمەڵايەتيى و سياسيين، لە نێو كۆمەڵگەدا)، جەنابت باس لەوە ئەكەی: تێگەيشتن و بيرۆكە ڕاست و ئاكارە بەها بەرزەكان، هۆكارێكى گرنگى تەبايى كۆمەڵايەتيى و سياسيين، بۆچى كۆمەڵايەتييە پێش سياسيى خستوە؟**

**مامۆستا:** پێموايە قەوارەی سياسى، هەميشە لە هەناوى كۆمەڵگا دێتەدەرێ، واتە دەبێ كۆمەڵگايەك هەبێت ئەمجار دەگونجێ قەوارەيەكى سياسيى هەبێ، ئەگەر بەشێوەيەكى سروشتيى و ئاسايى ئەو قەوارە سياسييە لەدايك ببێ، هەروەك دەبێ پێشێ كۆمەڵێك هەبێ، خەڵكێك هەبێ ئەمجار كۆمەڵگايەك دروست دەبێ، كۆمەڵگاش هەبێ ئنجا لە هەناوى كۆمەڵگا، قەوارەی سياسيى بەشێوەيەكى ئاسايى دێتەدەر، ئەو ڕاستييە، ئەو بنەمايە، من لەم چەند ئايەتەی سووڕەتى (آل عمران) هەڵمهێنجاوە، كە خوا سبحانه وتعالى دەفەرموێ:

﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ إِن تُطِيعُوا۟ فَرِيقًا مِّنَ ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْكِتَـٰبَ يَرُدُّوكُم بَعْدَ إِيمَـٰنِكُمْ كَـٰفِرِينَ ﴿١٠٠﴾ وَكَيْفَ تَكْفُرُونَ وَأَنتُمْ تُتْلَىٰ عَلَيْكُمْ ءَايَـٰتُ ٱللَّهِ وَفِيكُمْ رَسُولُهُۥ ۗ وَمَن يَعْتَصِم بِٱللَّهِ فَقَدْ هُدِىَ إِلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ ﴿١٠١﴾ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ حَقَّ تُقَاتِهِۦ

وَلَا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنتُم مُّسۡلِمُونَ ﴿١٠٢﴾ وَٱعۡتَصِمُواْ بِحَبۡلِ ٱللَّهِ جَمِيعًا وَلَا تَفَرَّقُواْۚ.. ﴾ [آل عمران: ١٠٠ـ ١٠٣]

لەم ئايەتانە ئەمەم هەڵهێنجاوە، كە خوا سبحانە وتعالى پێشێ، ڕوو لە ئیمانداران دەكات دەفەرموێ: ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! ئەگەر بە قسەی كۆمەڵێك لە خاوەن كتێبەكان بكەن، دوای ئەوەی كە (مسوڵمان بوون) ئیمانتان هێناوە، هەڵتاندەگێڕنەوە.

ئەمە ئەوەی لێوەردەگیرێ كە هەمیشە خاوەن كتێبەكان، بەتایبەتی جوولەكە، كاری زۆر لەسەر ئەوە دەكەن، ئەهلی ئیسلام لە قورئان و لە ئیسلام و لە ئیمان دووربخەنەوە، كە ئەوە ئێستاش وایە و، كاتی خۆشیی وابووە و، لەمەودواش وا دەبێ، دیارە جوولەكەكان بە پلەی یەكەم و نەصرانییەكانیش بەهەمانشێوە، جارێك یەكێك لە (مُبَشِّر)ەكان، ئەوانەی ئایینی مەسیح بەحیساب بڵاو دەكەنەوە، كۆنگرەیەكی گەورە دەبەستێ، یەكێك دەست هەڵدەبڕێ دەڵێ: پێم بڵێ: بەرهەمتان چی بووە، لە ماوەی ئەو چەند ساڵەدا، چەند كەس بوونە مەسیحیی لە مسوڵمانان، ئەویش دەڵێ: پرسیارەكەی تۆ پرسیارێكی سادەیە، دەڵێ: بۆچی؟ دەڵێ: گرنگ نیە چەند لە مسوڵمانان دەبنە مەسیحیی، گرنگ ئەوەیە چەند مسوڵمان لە ئیسلام دووركەوتوونەوە، ئامانجی ئێمە ئەوەیە مسوڵمانان لە ئیسلام دووركەونەوە، ئەگەرنا مسوڵمانان شەرەفی ئەوەیان نیە بێنە نێو مەسیحییەتەوە!

لێرەش خوا هەواڵمان پێ دەدات، ئەی ئیماندارینە! ئەگەر بە قسەی كۆمەڵێك لە خاوەن كتێبەكان بكەن، دوای ئیمان هێنانتان هەڵتاندەگێڕنەوە، دوایی دەفەرموێ: (وَكَيۡفَ تَكۡفُرُونَ) چۆن بێ بڕوا دەبن (وَأَنتُمۡ تُتۡلَىٰ عَلَيۡكُمۡ ءَايَٰتُ ٱللَّهِ وَفِيكُمۡ رَسُولُهُۥۗ) لە حاڵێك دا ئایەتەكانی خواتان بەسەردا دەخوێنرێتەوە و پێغەمبەری خواش لە نێوتاندایە! (وَمَن يَعۡتَصِم بِٱللَّهِ فَقَدۡ هُدِيَ إِلَىٰ صِرَٰطٖ مُّسۡتَقِيمٖ) هەركەسێ دەست بە خوا بگرێ، بەرەو ڕێی ڕاست ڕێنمایی كراوە، دوایی دەفەرموێ: (يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ حَقَّ تُقَاتِهِۦ وَلَا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنتُم مُّسۡلِمُونَ)

ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! وەك بۆ خوا شایستەیە پارێزی لێ بكەن، بە مسوڵمانەتییش نەبێ، مەمرن، ئەمجار دەفەرموێ: ﴿ وَٱعْتَصِمُوا۟ بِحَبْلِ ٱللَّهِ جَمِيعًا وَلَا تَفَرَّقُوا۟ ﴾ دەس بەڕێسمانی خواوە بگرن و پەرتەوازە مەبن، كەواتە: ئەگەر ئێمە شوێنكەوتووی قورئان بین، شوێنكەوتووی ڕێبازی پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) بین و ئەهلی تەقوا بین، ئەهلی ئیسلام و ئیمان بین، مانای وایە دەست بە ڕێسمانی خواوە دەگرین و، دەپارێزرێین لەوەی كە پەرتەوازە ببین، واتە: تەبایی سیاسیی بەرهەمی ئەو بەها بەرزە ڕووحیی و ئیمانیی و مەعنەویی و ئەخلاقییانەیە، كە لە قورئان و سوننەتەوە سەرچاوە دەگرن.

ئنجا ئەوەی كە لە قورئاندا هەیە، لە دنیای واقیعدا بەرجەستە بووە، ئەگەر تەماشا بكەین: پێغەمبەری خاتەم موحەممەد (صلی الله علیه وسلم)، كە دەچێ بۆ مەدینە، پێش ئەوەی بچێ بۆ مەدینە ئەوس و خەزرەج پێكەوە ناكۆكیی و دووبەرەكیی زۆریان بووە، كە ئەم ئایەتانەی ئاماژەم پێكردن، هەر لەو سیاقەشدا هاتوونەتە خوار، ئەو دوو هۆزە خوێنێكی زۆریان لە بەیندا ڕژابوو، دوای ئەوەی كە پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) دەچێ، ئەها دەفەرموێ: ﴿ وَكُنتُمْ عَلَىٰ شَفَا حُفْرَةٍ مِّنَ ٱلنَّارِ فَأَنقَذَكُم مِّنْهَا ﴾ [آل عمران: ١٠٣] لەسەر كەناری ئاگرێك بوون، خوا ئێوەی دەرباز كرد، دووبەرەكیی ئاگرێكە خەڵك هەمووی دەسووتێنێ، خوا ئەو دووبەرەكییەی بە ئاگرێك داناوە، چاڵی ئاگر، ﴿ كَذَٰلِكَ يُبَيِّنُ ٱللَّهُ لَكُمْ ءَايَٰتِهِۦ لَعَلَّكُمْ تَهْتَدُونَ ﴾ [آل عمران: ١٠٣]، بەڵام بە تەشریفبردنی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)، و هاتنی ئیسلام بۆ نێویان، ئەو بوغز و قین و حیقد و حەسەد و شیر و تیر لە یەكدی سوینەیان نەما، لەجیاتی ئەوەی هێزەكانیان، وزەكانیان ئاڕاستەی یەكدیی بكەن، ئاڕاستەی پێچەوانە، هەموو هێز و وزەكانیان ئاڕاستەی دووژمنان و ناحەزان دەكرد.

بۆیە ئێمە ئەگەر ڕازاوە بین بە صیفەتە بەرزەكان، كە لە هەموو صیفەتان بەرزتر، ئیمان و خوا بەیەكگرتنە، دوای ئەوەش دادگەرییە، ئنجا ڕەحم و بەزەیی لەبەینی خۆماندا، ئەگەر ئێمە بە صیفەتە جوانەكان ڕازاوە بین، وە خۆمان لە صیفەتە خراپەكان بێزار بكەین و، ئەگەر بە ئەدەبی بەرز و ڕەوشتی جوان، پێكەوە

مامەڵە بکەین، بە تەئکید ئەوە زەمینە خۆش دەکات، بۆ تەبایی سیاسیی، کاتێك کە ئێمە بە ساغیی و صافیی و بە ڕاستیی و دڵسۆزیی پێکەوە مامەڵە بکەین، هەر کامێکمان قازانج و زەرەری ئەویدیکەی پێ وەك هی خۆی بێ، ئەوە زەمینە خۆش دەکات بۆ متمانە، چونکە بناغەی مامەڵەی سیاسیی لەگەڵ یەکدیدا بریتیە لە متمانە بە یەکدی کردن، من ئاگادارم کە لە ئەنجامی ئەوەدا بەرپرسێ قسەیەکی لێ بیستراوە، یان قسەیەکی بە دەمەوە کراوە، بەرپرسێکی دیکە یان لایەنێکی سیاسیی دیکە، سەرو دڵی گیراوە، ئاخر چۆن ئەو وای گوتوە! من چۆن مامەڵەی لەگەڵ دا بکەم؟! کەواتە: متمانە بەیەکدی هەبوون، بناغەیە بۆ پێکەوە مامەڵەکردنی ڕاست و دروست، متمانەش لە چی پەیدا دەبێت؟ لە ڕازانەوەی هەموو لایەنەکان بە ڕەوشتە بەرز و جوانەکان، بەوە کە پێکەوە دادگەر بین، دڵسۆز بین، بەرەحم بین، زەرەرو و قازانجی یەکدیمان پێ وەك هی خۆمان وابێ، بەو بەها و ڕەوشت و ئاکارە بەرزانە، پردی متمانە دروست بکەین، بناغەیەکی پتەو دروست بکەین، ئەوکاتەش دەتوانین مامەڵەیەکی ڕاست و دروست پێکەوە بکەین و، دەتوانین سەنگ و دەنگ و ڕەنگی خۆمان لەم هەرێمی کوردستانەدا، بکەینە یەك.

**دانـــا: کەواتە ئێمە دەتوانین تەنها بە چاکسازییکردن لە کایە و بواری سیاسییدا، کۆمەڵگەکەمان بەختەوەر بکەین، یان پێش ئەوە دەبێ لە بوارەکانی دیکەدا ئێمە چاکسازیی بکەین؟**

**مامۆستا:** نەخێر، بە بڕوای من چاکسازیی لە سیستمی سیاسیی دا و لە ڕووی حوکمڕانییەوە دەبێ زۆر جۆرە چاکسازیی لە بوارەکانی دیکەدا پێشکەوتبن، بەڵام لە پێش سیستمی سیاسییدا زۆر شتی دیکە هەیە، پێش هەموو شتێك لە ڕووی ئیمانیی و ڕووحییەوە، ڕەنگە کەسانێك وابزانن: خەڵکی چین، یاخود خەڵکی ئەورووپا، خەڵکی هیندستان، لایەنی مەعنەوییان نیە! ئەوانیش لایەنی مەعنەوییان هەیە بە دینی خۆیان و، موعتەقەدات و موقەددەساتی خۆیان هەیە، کە کاریگەریی هەیە لەسەر ئاکار و ڕەوشتیان، بۆ وێنە: لەوڵاتانی ئەورووپا، درۆکردن شتێکی عەیبە، پیس و پۆخڵیی شتێکی ناشیرینە، بێ

یاسایی شتێکی خراپە، نۆرەبڕی لەیەکدیی کردن شتێکی خراپە، هەندێ شت هەیە بە زەوق و سەلیقە، دەزانرێ، بۆ وێنە جارێك لە سۆپەرمارکێتێك دەهاتمە دەرێ، لە یەکێ لەو وڵاتانە، نازانم هۆڵەندا بوو، یان ئەڵمانیا بوو، ئافرەتێك لە پێش منەوە بوو، دەرگایەکە لەو جۆرە بوو کە دێتەوە یەك، ئەو لە پێش من چووە دەرێ، دەرگاکەی گرت تا من چوومە دەرێ، پێم سەیر بوو، یەکێکم لەگەڵدا بوو لەوێ دەژیا، گوتی: لێرەدا عادەتیان وایەو ئەوە کلتوورە، ئەگەر کەسێ لە پێش تۆ چووە دەرێ مادام لێی نزیك بووی، چووە دەر، دەرگاکەش لەوانەبوو کە بێتەوەیەك، نەوەك بە تۆ بکەوێ و ئازارت بدا، دەبێ بیگرێ، هەرکەسێك بێت، دەبێت ئەو دەرگایە بگرێ تاکو تۆ دەچییە دەرێ، کە ئەوە شتێکی جوانە، مەبەستم ئەوەیە میللەتان لەڕاستییدا چاکسازیی سیستمی سیاسیی یان دوا ئاڵقەی چاکسازییە، دەبێ پێشێ، لەڕیشەوە چاکسازیی ببێ، لە ڕووی موعتەقەداتەوە، لەڕووی فیکر و ئەخلاق و فەرهەنگ و کلتوورەوە، خەڵك پەروەردە بکرێ، چونکە ئەگەر خەڵك پەروەردە بوو، لەسەر ئەو ئاکارو بەها بەرزانە، ئەو کاتە ئەگەر حوکمڕانێك لایدا، لێی قبووڵ ناکەن و بەداریی هەڵدەگێڕن دەڵێن ئەوە تۆچی دەکەی؟ هەستی گشتی دروست دەبێ. بە داخەوە ئەوەی خەفەتی پێ دەخۆم: لە بیست و پێنجساڵی ڕابردوودا، ئەو حیزبە حوکمڕانانەی ئەم وڵاتەی ئێمە تەوژمی عەلمانیی، دەتوانم بڵێم: هیچ کاریان نەکردوە لەسەر پەروەردەکردنی خەڵك، بگرە ڕەنگە کار کرابێ لەسەر تێکدانی خەڵك و دوورخستنەوەیان لە ئیمان و ئەخلاق و لایەنی مەعنەویی و بڕوا بە قیامەت! بەڵام کار نەکراوە لەسەر ئەوەی ئەو خەڵکە هەندێ ئاکارو ڕەوشت و بەهای بەرزی هەبن، تۆ هەر بە لای خواشیدا مەبە، بەڵام ئەو خەڵکە بۆچی بایەخ پێدان و گرنگیی پێدانیان تەنیا چڕبێتەوە لەسەر گەدە و گیرفانیان! بۆچی وا دەکەن ئەو خەڵکە تەنیا هەست بە بوونی جەستەیی خۆی بکات؟ ئایا نازانن وێڕای جەستە ئینسان ڕووحە، عەقڵە، عاتیفەیە؟! کەواتە: لە وەڵامی پرسیارەکەی جەنابتدا دەڵێم: نەخێر بەس تەنیا سیستمەی سیاسی گۆڕانکاریی ناوێ، سیستمی سیاسی دوا ئاڵقەی گۆڕانکاریی چاکسازییە، دەبێ پێشتر جۆرەکانی دیکەی چاکسازیی بکرێن، ئەوانەش هەموو دەبنە پێشەکی و، زەمینە

خۆشكەر بۆ ئەوەی سیستمێكی سیاسی ڕەشید و ڕێك هەبێ كە لە قازانجی هەمووو لایەك بێ.

**دانــا: بەڵام مامۆستا! هەموو لایەنەكان، ئەوانەی كە بڕیاربەدەستن لە هەرێمی كوردستان دا، كەسیان ئیددیعای ئەوەیان نەكردوە كە ئەوان بەدەرن لە ئایینی پیرۆزی ئیسلام! بگرە كە دێتە سەر بابەتی دینداریی و مسوڵمانەتیی، لەوانەیە بشڵێن: لە كەس قبووڵ ناكەین موزایەدەی دینداریی بەسەر ئێمەدا بكات، بەڵام جەنابیشت ئەفەرمووی: نەمدیوە كار لەسەر پەروەردەی ڕووحیی و تاكیی ئەو خەڵكە بكرێت!**

**مامۆستا:** بەڵێ ڕاستییەكەی نەمبینیوەو لەو دیبەیتەشدا كە لە (٢٠١٦/٦/٤) دا كاتی خۆی لە سلێمانیی كرا، باسمكرد: كە تا ئێستا ئەوە بیست و پێنج (٢٥) ساڵ تێپەڕیوە بەسەر دامەزرانی ئەم قەوارە سیاسییە ئێمەدا لەبەر پرسێكی بڕیاربەدەستی ئەم وڵاتەم نەبیستوە باسی خوا سبحانە وتعالی بكات، باسی پێغەمبەر (علیە الصلاة والسلام) بكات، باسی قورئان بكاو باسی ئیسلام بكاو، باسی قیامەت بكا، نەمبیستوە.



**دانــا: هۆكارەكەی چییە بە بڕوای تۆ؟**

**مامۆستا:** هۆكارەكەی بە بۆچوونی من هەستكردنە بە تێشكان و بەزین، لەبەرامبەر ڕۆژئاوا و فەلسەفە مادییەكانی ڕۆژئاوادا، نازانن كە خەڵكی ڕۆژئاوا شانازی دەكەن بە دینە تێكدراوەكەی خۆیانەوە، نەصرانیی شانازیی دەكەن بە ئایینی تێكدراوی خۆیانەوە، جوولەكە شانازیی دەكەن بە دینی تێكدراوی خۆیانەوە، هەر ئەو برادەرانەی خۆمانم وا بینیوە، برادەرانی عەلمانیی خۆمان، كە بە ئیسلامی خۆیان شەرمە، بە دینی خۆیانیان شەرمە! ئنجا ئەوەش بناغەی تێكشكانە چونكە هەركەسێ ڕابردووی نەبێ، شانازیی بە ڕابردوویەوە نەكات، ئێستاشی نابێ و داهاتووشی نابێ، ئێمەش وەك میللەتی كورد، وەك ئەو گەلانەی كە لەم وڵاتانەدا پێكەوەین و، بە هەموویانەوە ئوممەتی ئیسلامیی پێكدێنین، هەرچی هەمانە لە ئیسلامەوەیە، ئنجا تۆ وەرە خۆت لە ئیسلام دابڕە، نە مێژووت دەمێنێ، نە كەسایەتییەكانت دەمێنن، نە خەباتی ڕزگارییخوازیت دەمێنێ،

چونكە ئێمە سەرجەم حوكمڕانەكانی میرنشینەكان، میر موحەممەدی ڕەواندوز، میرانی بابان، میرانی بۆتان، سۆران، ئەردەڵان، هەموویان خەڵكی خواناس و دیندار بوون، هەروەها سەرجەم سەرقافڵەكانی خەباتی ڕزگاریخوازییمان: شێخ عوبەیدللای نەهریی، شێخ عەبدولقادری شەمزینان، شێخ سەعیدی پیران، سمایل خانی شكاك، شێخ مەحمودی حەفید، یەزدان شێر، قازی موحەممەد، مەلا مستەفا، هەموویان دەرچووانی قوتابخانە شەرعییەكان و ڕێبازەكانی تەصەووف بوون ئنجا تۆ وەرە لە ڕووی ناسراوێتییمانەوە لە نێو میللەتانی دنیادا، ئەگەر صەلاحەددینی ئەیوبییمان لێ دارنی و، ئیبنو تەیمییەمان لێ دارنی و، ئەحمەد شەوقیی شاعیر و ئیبنو لحاجیب و مەولانا خالید و، ئیبنو صەلاحی شەهرەزووریی و، ئیبنو لئەسیرو، بەدیعولزەمان سەعیدی نۆرسیی، كێمان لێ دەمێنێتەوە، كە مایەی ناسراوییمان بن، لەلایەن میللەتانی مسوڵمان كە لەگەڵماندان لە ناوچەكەدا، بەڵكو لەسەر ئاستی دنیاش؟! كەواتە: زۆر جێی پرسیارە كە بۆچی ئەو دەستەبژێرە سیكۆلاریستەی كە بڕیاربەدەست بوون، لە ماوەی بیست و پێنج ساڵی ڕابردوودا، بۆچی وا بیریان كردووەتەوەو، دەبێ كەی بەتەما بن ئەو هەڵوێستەی خۆیان ڕاست بكەنەوە؟ یان وەك فیل مەحموودیان لێهاتوە، فیل مەحموود كاتی خۆی لەپێش سوپایەكەی ئەبرەهەوە بووە، بەس بۆ لای كەعبە ڕێی دانەگرتوە، دەنا ڕوویان پێ لە ڕۆژهەڵات دەكرد، هەر دەڕەتاو ڕایدەكرد، بەرەو ڕۆژئاوا هەر ڕایدەكرد، بەرەو سەرێ و بەرەو خوارێ، بەڵام كە ڕوویان پێ لە كەعبە دەكرد، جەنەی دەگرت و ڕاینەدەكرد!! وا پێدەچێ خەڵكێكی ئێمە لەو برادەرە بڕیار بەدەستانە بەس بڕیاریان دابێ ڕوو لە كەعبە نەكەن، ئەگەرنا مۆسكۆ بێ، پەككین بێ، واشنتۆن بێ، هەر شوێنێ بێ ڕووی تێ دەكەن، بەس ڕوو لە (كَعبة الله) نەكەن، كە ئەوە وەك گوتم: بێهێزییەكی گەورەیەو ئەوەش بەسەر خەڵك و جەماوەرێكدا شكاوەتەوە كە كارتێكراوە بەو عەقڵیەتە حوكمڕانییەی كە وەك گوتم: ڕۆژ بە ڕۆژ هەوڵیداوە دینداریی و مسوڵمانەتیی و ئەو ئاكارو بەها بەرزانەی لە ئیسلامەتیی وەردەگیرێن، كاڵ

بینەوە، كاریگەرییان لەسەر سیاسەت و حوكمڕانیی، بەڵكو لەسەر كەسایەت و ژیان و گوزەرانی خەڵك كەم بێتەوە، وە سەرەنجام وەزعەكە ئاوا پڕ بێ لە گەندەڵیی و خراپە، كە هەموو لایەكی بێزار و نائومێد كردوە.

**دانا: مامۆستا! ئایا ئەو چاكسازییانەی كە جەنابت باسیان ئەكەی، لە لایەنی ڕووحیی و لە بەها بەرزەكانەوە دەست پێ بكەین، كاتێكی زۆرمان ناوێت؟ یان پێت وایە ئێستە زەرووره لایەنە سیاسییەكە چاك بكەین و وردە وردەش دەست بكەینەوە بە چاكسازیی لە لایەنە ڕووحییەكان دا؟**

**مامۆستا:** سەرەتا با ئەوەت بۆ ڕاست بكەمەوە كە من باسی (لایەنە ڕوحییەكانم) نەكردووە بە گشتیی باسی پەروەردەكردنی تاكەكانم كردووە، لە هەموو ڕووەكانەوە، ئنجا ئەوە نیە بڵێی: لەبەرئەوەی خەریكی پەروەردەكردنی تاكەكان دەبین، لە بوارەكانی فیكریی و ئیمانیی و ڕووحیی و ئەخلاقیی و كۆمەڵایەتیی دا با لە لایەنی سیاسیی بگەڕێین! بەڵكو لە یەك كات دا سەرگەرمی ئەوەش دەبین و ئەوەش دەبین، كۆمەڵگا هەمووی پێكەوە بەرەوپێش دەچێ، یاخود هەمووی پێكەوە بەرەو دوا دەچێت، ئنجا كە دەڵێین: چاككردنی لایەنی سیاسیی دوا ئاڵقەی چاكسازییە، مانای وا نیە لە نووكەوە، لە سفرەوە دەست پێ بكەی، چونكە ئەو خەڵكەی ئێمەش لە سفرەوە نین، خەڵك الحمد لله مسوڵمانە، خەڵكی چاكیش هەر هەیە، بایی ئەوەندە، بەڵام بە داخەوە خەڵكە چاكەكە گوێی لێ نەگیراوە بواری پێ نەدراوە، لە لایەن حوكمڕانانەوە ڕووحی دینداریی و ئاكار و ئەخلاق و بەها بەرزەكان و بۆ خوا سوڵحان، برەوی پێ نەدراوە كاری لەسەر نەكراوە، بەڵكو پێچەوانەی ئەوە كاری لەسەر كراوە، گرفتەكەش زیاتر ئەوەیە، پێموایە ئێستا ئەگەر ئەو بڕیاربەدەستانە لە خەڵك گەڕێن، بەو ئەركە هەڵدەستن، ئایا ئەو مزگەوتانەی هەولێر و سلێمانی و ڕانیە و بتوێن و پشدەر و گەرمیان و كوێستان و هەموو شوێنەكان، كێ دروستیان دەكا؟ هەتا ئەوقاف مزگەوتێ دروست دەكات، خەڵك سەد (١٠٠) دروست دەكات، مانای وایە خەڵك هەر لێی گەڕێی، هەر ڕێی پێ نەگری، لە ڕووی پەروەردەو تێگەیاندن و پێگەیاندنی تاكەكانەوە، كاری زۆر باش دەكات، بەڵام حیزب و دەستەڵات هەر

مامۆستایەك خێرێكی هەبوو بۆ خەڵك و خەڵك متمانەیەكی پێی هەبوو، سومعە و ئیعتیبارێكی هەبوو، چوار قسەی حەقی بۆ خەڵك كرد، بەلای كەمەوە ئەگەر نەشیكوژن و نەشیگرن، لایبەرن، ئاخر ئەوە مانای دژایەتییكردنی ئیسلامە! ئنجا كوێش لایبەرێ؟ بەناوی ئەوقافەوە و بەناوی پەروەردەو بەناوی وەزارەتە ڕەسمییەكانەوە!! هەڵبەتە من لەگەڵ قسەی ناحەق و بەرز و نزمیشدا نیم، لەگەڵ تەشهیركردن بە هیچ كەسێكیشدا نیم، بەڵام بێگومان خەڵكی دیكەش هەیە قسەی زۆر بێ جێ و بێ مانا دەكات، ئەگەر هونەرمەندە، ئەگەر شاعیرە، ئەگەر مەلایە،[1] ئەگەر نووسەرە، ئەگەر هەر كەسێكە قسەی زۆر سەقەت و پەقەت و خراپ دەكەن، بۆچی كەس بەوان ناڵێ: بەری چاوت كلی پێوەیە، بەڵام مامۆستایەك چوار قسە دەكات، كە زەرەری هەیە بۆ پەزەكان، ئیجرائاتی لەگەڵدا دەكەن؟

مەبەستم ئەوەیە، وەنەبێ شتێكی زۆر قورس و بە زەحمەت بێ، پێموایە دەسەڵات ئەگەر هەر بێلایەنیش بێ، ناڵێن عەلمانییەت ئەوەیە بێلایەن بێ لە نێوان دینداریی و بێ دینییدا؟ ئەگەر بێلایەنیش بێ، هەر باشە، بەڵام ئەوەی من بینیومە بێ لایەن نییەو لایەنگریی بێدینیی دەكات، یان دەبێ دینێكی دەستەمۆی نینۆك كراو و كرابێتە تەیری مەعقووڵ و، قسەیەك نەكات بۆ پەزەكان زەرەری هەبێ و، لە خزمەتی ئامانجەكانی وی دابێ، یان دەبێ نەبێت! ئێمە ناڵێین: ئەوە گرفت و كێشە بنەڕەتیەكەیە، ئەگەرنا لە سفرەوە دەستپێدەكەین و جارێ با لە كاروباری سیاسیی گەڕێین!! ئەو وەزعە سیاسییە كاریگەریی نەرێنی لەسەر هەموو بوارەكان هەیە: لەسەر لایەنی پەروەردە، لەسەر لایەنی ئیمان، لایەنی ئەخلاق، لایەنی خوێندن، لایەنی خێزان، بۆچی ئێستا گرفت و كێشەی خێزانییمان كەمە! من پێموایە هەموو ئەو گەنجانەی سەری خۆیان هەڵدەگرن و دەچن بۆ دەرێ، وەك لە نامیلكەیەكدا "گەنج و قەیرانی ڕووحیی"دا كە كەوتووەتە بازاڕ، لەوێدا باسمكردوە كە یەكێ لە هۆكارەكان كە گەنجەكانمان سەری خۆیان هەڵدەگرن، ئەو قەیرانە ڕووحییەیە، قەیرانی

---

(١) واتە: مەلای سەر بەملاو لاو ئۆباڵكێشی بە ناهەق!

ڕووحیی، له ئەنجامی چی پەیدا دەبێ، تۆ له پرۆگرامی خوێندندا دەرسی ئایین، شتێکی وات تێدا نەهێشتووەو، زۆرت بێ ڕووح کردوە! ئنجا سەربارەش هەموو کایەکان بەکاردەهێنرێن بۆ کزکردنی دینداریی، وەك گوتم: زۆر ڕێ تەسك دەکرێتەوە له مامۆستایەکان، له بانگخوازەکان، سەرەنجام وای لێ دێ، که گەنجەکە بازاڕی بێ دینیی قەڵەباڵغتر و ئاچووغتر دەبینێ، ئەویش گەنجە، تازە دەگاتێ هەرزەکارە، پاشان زۆریش هاندەدرێ بۆ تێرکردنی غەریزەکانی و تێرکردنی غەریزەکانی بەشێوەی ناشەرعیی بۆ ئاسان دەکرێ، ئەگەر ماددەی سەرخۆشکەرە، شەڕابە، قومارە، چییە چییە، یانی: لەلایەکەوە تەنگی پێ هەڵدەچنرێ له ڕووی دینداریییەوەو لەولاشەوە ڕێی گوناهو خراپەکاری بۆ ئاچووغ و تەخت دەکرێ، سەرەنجام ئینحیراف دەکا و، دواییش هەموو لایەکیان زەرەر دەکەین!.

**دانـــا: مامۆستا! ئەوەی جەنابت باست کردوە، تەبایی کۆمەڵایەتی و سیاسی، ئایا ئەگەر تەبایی سیاسیی تێکدەچێ، تەبایی کۆمەڵایەتییش تێکەچێ، یان بەپێچەوانەوە، سەرەتا تەبایی کۆمەڵایەتیی تێکدەچێ ئنجا تەبایی سیاسیی؟**

**مامۆستا:** پێموایە هەردووکیان تێکهەڵکێشن، جاری وا هەیە تەبایی سیاسیی تێکدەچێت و بەدوایی دا ئاشتی کۆمەڵایەتییش، بۆ وێنە: کاتی خۆی پارتی و یەکێتی شەڕیان بوو، ئەم وڵاتە کرا بە دوو بەرەوە، هەتا ئەوەی کە لێرە خەڵکی یەکیەتی هەبوو، بەڵام دوای ئەوەی ئێرە[1] کەوتە دەست پارتی، هەمووی باری کرد، چوو بۆ لای سلێمانی، ئنجا پارتییەکانیش هاتنەوە بۆ ئێرە، یان ئەوەی دەشما لەوێ، یاخود یەکێتی لێرە، بەبێدەسەڵاتیی دەمایەوە، وەك ژێر چەپۆك!! کەواتە: جاری وا هەیە تێکچوونی تەبایی سیاسیی، دەشکێتەوە بەسەر ئاشتیی کۆمەڵایەتییدا، جاری واش هەیە له ڕووی کۆمەڵایەتییەوە کە بارودۆخی کۆمەڵگا تێکدەچێ، ئەوەش تەشەنە دەکات و سەردەکێشێ بۆ تێکچوونی تەبایی سیاسیی، پێموایە ئەوانە وەك وشە و تەعبیر لێك جیان، ئەگەرنا لایەنی سیاسی

---

(١) واتە: هەولێرو دەوروبەری.

و كۆمەڵایەتیی و دین و ئەخلاق و ...هتد. هەمووی تێكهەڵكێشە، بۆ وێنە: ئێمە كە دەڵێین: ئابووریی، بەدڵنیاییی لە دنیای واقیع دا لایەنی ئابوورییمان بە تەنێ نیە، لایەنی كۆمەڵایەتییمان بە تەنێ نیە، لایەنی سیاسییمان بە تەنێ نیە، هەمووی تێكهەڵكێشە، حكوومەت كە حكوومەتداریی دەكات، لە ڕووی سیاسییەوە، لە ڕووی پەروەردەییەوە، لە ڕووی كۆمەڵایەتیی، لە ڕووی ئابووریی، لە هەموو ڕوویەكەوە، واقیعەكە دەخاتە ژێر چاودێریی خۆیەوە و سەرپەرشتیی كۆمەڵگا دەكات، یانی: ئەو شتانە هەموویان تێكهەڵكێشن و كارلێكی دوو سەرانەیان لەگەڵ یەكدیی دا هەیە، هەم تێكچوونی تەبایی سیاسیی، دەبێتە هۆی نەمانی ئاشتیی كۆمەڵایەتیی، هەم تێكچوونی ئاشتیی كۆمەڵایەتیی دەبێتە هۆی ئەوە، هەم قەیرانی ئابووریی، دەبێتە هۆی كێشەی كۆمەڵایەتیی، ئێستا لە ئەنجامی قەیرانی ئابورییەوە، ئەها چۆن جۆرە دزیی عەجایب و سەیر سەیر دەكەن، ئەها باندو گرووپ دروست دەبن، كێشەی كۆمەڵایەتیی دروست دەبێ! بە هەمان شێوەش قەیرانی سیاسیی بۆتە هۆی قەیرانی ئابووریی و، قەیرانی ئابووریی بووەتە هۆی قەیرانی كۆمەڵایەتیی و، هەمووی تێهەڵكێشە.

**دانـــا: كەواتە: وەكو جەنابت هەموو جارێ ئەڵێی: كورتەی قسان ئەوەیە: هەموو لایەكمان بەتایبەت بڕیاربەدەستان و سیاسییەكانی ئێمە، بگەڕێنەوە بۆ لای خوای پەروەردگار و، بۆ لای بەرنامە جوانەكەی خوای دادگەر بۆ ئەوەی ئەم هەرێمەی ئێمە، ئەم وڵاتەی ئێمە، كە خوای بەخشەر بەم هەموو سەروەت و سامانەوە خستوویەتە بەردەستمان، بتوانین كەڵكی لێوەربگرین!**

**مامۆستا:** بەڵێ، ئەگەر بتەوێ كۆتایی بەم ئاڵقەیە بێنین، بەم ئایەتە موبارەكە كۆتایی پێ دێنین، كە لە سوورەتی (المائدة)دا خوا سبحانه وتعالى دەفەرموێ:

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ عَلَيۡكُمۡ أَنفُسَكُمۡۖ لَا يَضُرُّكُم مَّن ضَلَّ إِذَا ٱهۡتَدَيۡتُمۡۚ ﴾ [المائدة : ١٠٥]

واتە: ئەی ئەوانەی ئیمانتان هێناوە! وریای خۆتان بن، ئەگەر ئێوە ڕێی ڕاست بگرن، ئەوانەی ڕێیان لێ تێكچووە و گومڕان، زیانتان لێ نادەن.

كە مەبەست پێی غەیری ئەهلی ئیسلامە، دوژمنانتان زیانتان پێ ناگەیەنن، ئەگەر ئێوە ڕێی ڕاستگرتوو بن، چونكە لە درز و كەلێنەكانی خۆتانەوە، لەڕێی كەمتەرخەمییەكانی خۆتانەوە، زەفەرتان پێ دەبەن.

بێگومان وایەو ئەوەش -یانی: خەم لێخواردنی دینداریی كۆمەڵگا- ئەركی هەموو لایەكە، چونكە هەندێ كەس وا تەصەوور دەكات، دەبێ بەس مامۆستایان خەم لەوە بخۆن، هەر شێخانی تەریقەت، یان هەر لایەنە ئیسلامییەكان، یان هەر ڕیش سپییەكان! ئەركی هەموو لایەكە، هەركەسێ خۆی بە مسوڵمان دەزانێ، وەك زۆرجاری دیكە گوتوومە: ئێمە لە ئیسلامدا (علماء الدین)مان هەیە، (رجالُ الدین)مان نیە، هەموو پیاوەكان پیاوی دینن و، هەموو ئافرەتەكانیش ئافرەتی دینن، ئەوە زاراوەیەكی كلێسایی یەو، كە چینی ئەكلیرۆس (طبقة رجال الدین) پیاوانی ئایینی، پێ دەڵێن، ئەوە لە ئایینی نەصرانی دا هێنرا، دوای ئەوەی كە بەرنامەكەی مەسیح علیه السلام تەحریفكراو و گۆڕدرا، گوتیان: تەفسیری كتێبی پیرۆز (الكتاب المقدس) تایبەتە بە پیاوانی ئاینییەوە، بەڵام لە ئیسلامدا (زانایانی ئیسلام) هیچ حەق و مافێكی زیادەیان پێ نەدراوە، زیاد لە خەڵك، ئنجا زانایانی ئیسلام، نە بەرگێكی تایبەتییان هەیە، نە شێوەیەكی تایبەتییان هەیە، نە ناوێكی تایبەتییان هەیە و، هەركەسێ شارەزا بێ لە ئیسلامدا، لە قورئان و سونەتدا، زانای دینە، ئەوەی شارەزاش نەبێ، ئەگەر چەند جبەی لەبەر بن و چەند مەندیلی لەسەر بن، بایی فلسێكە! لە ئیسلامدا باسی (علمآ) كراوە، باسی مەلاو باسی شێخ و مەشایخ نەكراوە، (علماء) یش یانی: زانایان، مەبەستم ئەوەیە كە هەندێ كەس وا دەزانێ كە تەنیا توێژێك بەرامبەر بە ئیسلام بەرپرسیارە، وانیەو هەمووومان بەرپرسیارین، خوای پەروەردگار دەفەرمووێ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ﴾ ئەی ئەوانەی ئیمانتان هێناوە! هەمووتان، بە سەر و خوارەوە، بە بڕیاربەدەست و بەوانەی كە بڕیاریان لەسەر دەدرێ، بەوانەی كە زانان و بەوانەی كە نەشارەزان، بە پیاو و بە ئافرەتەوە، بە وردو درشتەوە، هەمووتان ﴿عَلَيۡكُمۡ أَنفُسَكُمۡۖ﴾ لە خۆتان وریا بن، ﴿لَا يَضُرُّكُم مَّن ضَلَّ إِذَا ٱهۡتَدَيۡتُمۡۚ﴾ ئەگەر ئێوە ڕێی ڕاست بگرن، ناحەزانتان، دوژمنانتان

زەفەرتان پێ نابەن، بە ئیزنی خوا ئێمە وابین، بە هیوای ئەوە کە بەو شێوە بین، چونکە ئێمە ئەم هەرێمی کوردستانە دوای ئەوەی کە (إن شاء الله) بەم زووانە شەڕی داعش کۆتایی پێ دێ و، ڕەشماڵی ڕەشیان دەپێچرێتەوە و دەچنە زبڵدانی مێژووەوە، دوای ئەوەی کە بوونە مایەی بێزارییەکی زۆر بۆ مسوڵمانان و، بوونە مایەی زەرەر و زیانێکی گەورە بۆ ئیسلام و بۆ تەوژمی ئیسلامیی هاوسەنگ، کە خەڵك زۆر ئومێدی پێیەتی و دڵی پێخۆشە، بە حەقیقەت ئەوانە بە پلەی یەکەم زەرەریان بۆ تەوژمی ئیسلامیی بوو و، بە گشتی زەرەریان بۆ ئیسلام و مسوڵمانان بوو.

دوای ئەوە ئەم هەرێمی کوردستانەی ئێمە، دەبێ بزانین کە مەرج نیە وەك ڕابردوومان بۆ بڕوا، چ وەك خەڵکەکە نێو خۆمان، چ وەك هۆکارە دەرەکییەکان، دەبێ بزانین کە بەغداد هەیە، تورکیا هەیە، ئێران هەیە لە ناوچەکەدا، ئەمریکا هەیەو ڕووسیا هەیە، زلهێزانی دیکە هەن، پێویستە چاوێکی جددیی بە خۆماندا بگێڕینەوە، چیدیکە وەك ئەو پەندە کوردییە دەڵێ: (ئاشی نەزان خوا دەیگێڕێ) لە وڵاتەکەمان نەگەڕێین، ئاخر ئاشی نەزان خوا جارێ دەیگێڕێ، بەڵام دوایی بەسەر ئاشەوانیشدا دەڕووخێ، دەبێ لێی وریا بین، بە تەمای قەدەر لێی نەگەڕێین، ئەگەر ئەم وەزعە چاك بکەین بە قەدەری خوا چاکی دەکەین و، ئەگەر لێشی گەڕێین بڕووخێ هەر بە قەدەری خوا کاول دەبێ، هەردووکیان هەر بە قەدەری خوان، بەڵێ دەبێ قەدەرە باشەکان هەڵبژێرین و، خۆمان چاك بکەین و، خۆمان سەربەرزی دنیا و ڕووسووری ڕۆژی دواییش بکەین و، وە لە لای خەڵك و لەلای خوا، سەربەرز و ڕووسوور بین، بەهۆی ئەوەیە کە خۆمان چاك دەکەین و خۆمان ڕێك دەکەین، وەك شەریعەتی خوا، کتێبی خوا و سوننەتی پێغەمبەری پێشەوا (علیه الصلاة والسلام) پێمان دەفەرمون.

**دانـــا: بەڕێز مامۆستا عەلی باپیر نووسەرو رووناکبیر! سوپاس بۆ ئەوەی کە لەم ئاڵقەیەشدا ماندوومان کردی، لە کاتی بەنرخی جەنابتمان گرت و وەڵامی پرسیارەکانی ئێمەت دایەوە.**

**مامۆستا:** من ماندوو نابم و منیش زۆر خۆشحاڵم بە دیدارتان و زۆر سوپاسی پرسیارەکانی جەنابیشت دەکەم و وە سوپاسی هەموو بینەران و بیسەرانی بەڕێزیش دەکەم.

**دانـــا: زۆر سوپاست دەکەم، بینەرانی خۆشەویست! بەم ئەندازەیەش هاتینە کۆتایی ئەم ئاڵقەیە تا ئاڵقەی داهاتوو، بەخواتان ئەسپێرین، کوردستانێکی ئاوەدان و ئارام بۆ هەموو لایەك، خواتان لەگەڵ.**

## ئاڵقەی نۆزدەیەم

بنەمای بیستەم: تەبایی و هاوکاریی پێکەوە کردنی پێکهاتەکانی کۆمەڵگا، مەرجی بنەڕەتیی بەرەو پێشچوون و سەرکەوتنیەتی.

بنەمای بیست و یەکەم: بەهۆی نەزانییو ترس و تەماعەوە، خەڵك بەژێردەستەیی ستەمکاران قایل دەبێ.

بنەمایی بیست و دووەم: هەمیشە ستەمکار و خۆشگوزەرانانی گەندەڵکار، دژی گۆڕانکاریی و چاکسازیی بوون.


ameer.maktab@yahoo.com

 /AliBapir  /AliBapir  /MediaAmeerOffice

www.alibapir.net

**دانـــا: بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان، سڵاوتان لێ بێ بینەرانی ئازیز و خۆشەویست! خۆشحاڵم خوای پەروەردگار دەرفەتی پێبەخشینەوە لە ئاڵقەیەكی نوێی بەرنامەكەتان، بەرنامەی بە دانایی دا، لە خزمەت میوانە هەمیشەییەكەمان: جەنابی مامۆستا عەلی باپیر، نووسەر و ڕووناكبیردا، بە ئێوەی ئازیز و خۆشەویست شاد بووینەوە، لە درێژەی ئەو زنجیرە بابەتەی كە لە ژێر ناوونیشانی: "بۆ چاككردنی ئەم دۆخەی هەرێم، با گوێ لە قورئان بگرین"، گەیشتووینەتە بنەمای بیستەم، كە جەنابی مامۆستا ئاماژەی بۆ ئەوە كردوە: (تەبایی و هاوكاریی كردنی پێكهاتەكانی كۆمەڵگا مەرجی بنەڕەتیی بەرەوپێشچوون و سەركەوتنیەتی) با بزانین مامۆستا مەبەستی لەم دەستەواژەیە چییە، كە لە قورئانەوە بێگومان هەڵیهێنجاوە، بۆ ئەم بارودۆخەی هەرێم؟!**

**مامۆستاگیان! سڵاوی خوات لێ و سوپاس كە دەرفەتت پێ بەخشین.**

**مامۆستا:** سڵاوی خوا لە ئێوەش بێ كاكە دانا، بەخێر بێن، سەرچاو، خۆت و هاوكارانیشت.

**دانـــا: مامۆستا گیان! وەك لە پێشەكییەكەدا ئاماژەم پێكرد، كە گەیشتووینەتە بنەمای بیست، ئەم بنەمایە وەك هەموو جارێ جەنابت ئاماژەت پێ كردوە، بەڕێزت لە ئایەتەكانی قورئانی پیرۆزەوە هەڵتهێنجاوە، مەبەستت لەم بنەمایە چییە؟**

**مامۆستا:** الحمد لله، والصلاة والسلام على رسول الله محمد، وآله المهتدين بهداه.

ئەم بنەمایە یەكێكە لە شتە زۆر ڕۆشنەكان بۆ هەموو كەس، كە هەر كۆمەڵگایەك بیەوێت، گەشە بكات و كۆمەڵگایەكی تۆكمەو تەندروست بێ، دەبێ پێكەوە تەبا بێ، لەسەر ئاستی پێكهاتەكان، دیارە مەبەستمان لە پێكهاتەكان، واتە توێژەكان كە كۆمەڵگا پێكدێنن، كە من حوكمڕانانیش بە توێژێك دادەنێم هەروەك: كرێكاران، جوتیاران، كاسبكاران، ڕاگەیانكاران، گەنجان، ئافرەتان، پیاوان، نووسەران و، سەرجەم ئەو توێژانەی دیكە كە كۆمەڵگا پێكدێنن، لە هەمانكاتدا سیاسەتمەداران و حوكمڕانانیش، ئەوانیش توێژێكن لە توێژەكانی كۆمەڵگا..

**دانـــا: مەبەستت پێی نەتەوە و ئایینە جیاوازەكانیشە؟**

**مامۆستا:** ئەوانیشم هەر پێ مەبەستە، هەموو ئەوانەی كە كۆمەڵگایەك پێكدێنن، جا هەندێ كۆمەڵگا فرەپێكهاتە (إثنی)ن، واتە: زیاتر لە نەتەوەیەكیان تێدا هەیە و هەندێكیشیان تاك نەتەوەن، گرنگ ئەوەیە كۆمەڵگا دابەش دەبێ بۆ چەند توێژێ، جاری واش هەیە بۆ چەند نەتەوەیەكیش، یان بۆ چەند ئایین و ئایینزایەكیش، ئنجا كۆمەڵگا تەندروستەكان، ئەو كۆمەڵگایانەی كە دەتوانن بەرەوپێشەوە بچن و، گەشە بكەن، ئەوانەن كە لەنێو خۆیاندا دەم تێك نانێن و، پێكەوە هاوكارن، لەجیاتی ئەوەی كە پێكەوە ناكۆك بن، پێكەوە هاوكارن، خوای پەروەردگار دەفەرموێ:

﴿ وَتَعَاوَنُوا۟ عَلَى ٱلْبِرِّ وَٱلتَّقْوَىٰ ﴾ [المائدة: ٢]

هاوكاریی یەكدیی بكەن لەسەر چاكەكاریی و پارێزكاریی.

ئەگەر تەماشای قورئانی بەرێز بكەین، فەرمایشتی خوا سبحانەو تعالى، هەمیشە ئەوانەی كە ویستوویانە كۆمەڵگا بەشێوەیەكی تاكڕەوانەو ئیستیبدادییانە بەڕێوەبەرن، هەوڵیانداوە كە پێكهاتەكانی كۆمەڵگا پێكەوە دژ و ناكۆك بن، دەم تێك بنێن و پێكەوە سەرگەرمبن، خەریكی ناكۆكیی بن، ئەگەر ناكۆكیی وەهمییش بێ، لە سەرەتای سووڕەتی (القصص)دا، خوا سبحانەو تعالى دەربارەی فیرعەون، كە دیارە فیرعەون ڕەمزی ئیستیبداد و خۆسەپاندنە، ڕەمزی حوكمی تاكڕەویی و حساب نەكردنە بۆ خەڵك و جەماوەر، خوا دەفەرموێ:

﴿ إِنَّ فِرْعَوْنَ عَلَا فِى ٱلْأَرْضِ وَجَعَلَ أَهْلَهَا شِيَعًا ﴾ [القصص: ٤]

فیرعەون خۆی لە زەویدا بەرزكردەوە، واتە دەسەڵاتی ڕانا بەسەر خەڵكدا، خۆی بەسەردا سەپاندن (وَجَعَلَ أَهْلَهَا شِيَعًا) خەڵكەكەی (واتە: خەڵكی میصر) خەڵكی كۆمەڵگایەكەی خۆی، بەش بەش كرد.

(شِيَعاً) كۆی (شیعة)یە، شیعە یانی كۆمەڵێك لە خەڵك، گرووپ گرووپ، وایدەكرد كە گرووپانە پێكەوە ناكۆكییان هەبێ، بەڵام پێغەمبەران (علیهم الصلاة

والسلام) بەپێچەوانەی فیرعەون و فیرعەون صیفەتەكان، هەمیشه ویستوویانه: ناكۆكییەكانی نێوان كۆمەڵگا نەمێنن، كۆمەڵگا پێكەوە هاوكار و دەستبارگر بن، تەماشا سوورەتی (آل عمران) بكەین، خوا سبحانه وتعالی پێشێ دەفەرمویێ:

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ حَقَّ تُقَاتِهِۦ وَلَا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنتُم مُّسۡلِمُونَ ﴾ [آل عمران: ١٠٢]

واته: ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوه! وەك بۆ خوا شایستەیه، پارێزی لێ بكەن، به مسوڵمانەتییش نەبێ، مەمرن، واته: لەسەر ئیسلام بژین، بۆ ئەوەی دوایی به مسوڵمانەتیی بمرن.

دوایی یەكسەر دوابەدوای ئەوه، له ئایەتی ژمارە (١٠٣)دا دەفەرمویێ:

﴿ وَٱعۡتَصِمُواْ بِحَبۡلِ ٱللَّهِ جَمِيعٗا وَلَا تَفَرَّقُواْۚ وَٱذۡكُرُواْ نِعۡمَتَ ٱللَّهِ عَلَيۡكُمۡ إِذۡ كُنتُمۡ أَعۡدَآءٗ فَأَلَّفَ بَيۡنَ قُلُوبِكُمۡ فَأَصۡبَحۡتُم بِنِعۡمَتِهِۦٓ إِخۡوَٰنٗا وَكُنتُمۡ عَلَىٰ شَفَا حُفۡرَةٖ مِّنَ ٱلنَّارِ فَأَنقَذَكُم مِّنۡهَاۗ كَذَٰلِكَ يُبَيِّنُ ٱللَّهُ لَكُمۡ ءَايَٰتِهِۦ لَعَلَّكُمۡ تَهۡتَدُونَ ١٠٣ ﴾ [آل عمران: ١٠٣]

واته: ئێوه دەست به ڕێسمانی خواوه بگرن و پەرتەوازە مەبن و، چاكەی خوا وەبیر خۆتان بێننەوه، كه ئێوه پێكەوه دوژمن بوون، بەڵام دوایی خوا دڵی پێكەوه گرێدان (دڵتان پێكەوه ناكۆك بوو، دووبەرەكییتان لەبن دا هەبوو، دوژمنایەتیی و ناحەزییتان له نێوان دا هەبوو) (فَأَصۡبَحۡتُم بِنِعۡمَتِهِۦٓ إِخۡوَٰنٗا)، بەڵام له چاكەو نیعمەتی خواوه بوونه برای یەكدی، (برایەتی و تەباییەكە، دەكاتە بەرهەمی دڵ پێكەوه گرێدان) دڵی پێكەوه بەستن و پێكەوه بوونه برا، دوایی خوای پەنهانزان ئەوەیان بۆ وێنا دەكات، حاڵەتی پێش هاتنی ئیسلام، پێش تەشریفبردنی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) بۆ مەدینه، كه ناوی (یثرب) بوو، به چوونی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) ناوی لێنرا: مەدینه (مدینة الرّسول) شاری پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)، دەفەرمویێ.

(وَكُنتُمۡ عَلَىٰ شَفَا حُفۡرَةٖ مِّنَ ٱلنَّارِ) واته: ئێوه لەسەر قەراغی چاڵێكی ئاگر بوون، لێرەدا خوا ئەو ناكۆكیی و دووبەرەكییەی پێشێیان، كه له نێوان ئەوس و خەزرەجدا هەبوو، هەروەها له نێوان ئەوس و خەزرەج له لایەك و، هەندێ

لە جوولەکەکان دا لەلایەکی دیکەوە هەبوو، تەشبیهی دەکا بە چاڵێکی ئاگر (فَأَنقَذَكُم مِّنْهَا)، بەڵام خوا لێی دەربازی کردن.

ڕزگاریکردن بۆ ئەوەی نەکەونە ئەو چاڵە، یاخود چیدیکە بەردەوام نەبن لە خزانە نێو ئەو چاڵە، چونکە پێشتر لە پێش ئیسلامدا شەڕو شۆڕی زۆریان پێکەوە کردبوو، خوێنی زۆریان لەبەیندا ڕژا بوو، بەڵام ئیسلام ئەو دەورە دەبینێت، هەمیشە پەیامی پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) وەك چۆن بە خەڵك دەنێ ئەهلی تەوحید بن، پێشیان دەڵێ: دەڵێن ئەهلی وەحدەت بن، زۆرجار گوتوومە: ئەم ڕستە موبارەکەی قورئان:

﴿ إِيَّاكَ نَعْبُدُ وَإِيَّاكَ نَسْتَعِينُ ۝٥ ﴾ [الفاتحە: ٥]

هەرتۆ دەپەرستین، پشتیش هەر بە تۆ دەبەستین، یان: داوای یارمەتیش هەر لە تۆ دەخوازین، ئەمە هەم تەوحید دەگەیەنێ بەس تۆ دەپەرستین، هەم وەحدەتیش دەگەیەنێ، واتە: ئێمە بە دەستەجەمعیی و پێکەوە تەنیا بەندایەتیی بۆ تۆ دەکەین.

بەڵێ وەك گوتم: ئەو کۆمەڵگایانەی بیانەوێ بەرەوپێشەوە بچن و گەشە بکەن، لەجیاتی ئەوەی بەنێو خۆیانەوە مەشغووڵ بن و دەم تێك نێن، پێکەوە سەرقاڵ بن، پێکەوە شەڕی دەوەن بە ئاش بکەن، گێچەڵ بە یەکدی بکەن، وەك ئەم میللەتەی ئێمە زۆرجار وای لێهاتوە، زۆرجار وابووە، ئێستاش بە داخەوە بەڵێ سەنگەر لە یەکدی گرتن نەماوە، بەڵام جۆرێك لە شەڕی سارد هەیە لە بەیندا، وەك خۆتان دەزانن، کە بریتیە لەو بارگرژییە سیاسییەو پێکەوە کۆنەبوونەوە و قسە لەگەڵ یەکدا نەکردنە، هەروەها حیزبێك بیەوێ ئەوانی دیکە بکاتە پاشکۆی خۆی و ڕەگەڵ خۆیان بخات، ئەوە حاڵەتێکی ناتەندروستە، ئێمە دەبێ ڕێز لە بوونی یەکدیی بنێین، ڕێز لە تایبەتمەندییەکانی یەکدی بگرین، تەبایی بەچی دروست دەبێ؟ تەبایی بەوە دروست دەبێ، کە ئەو مافەی بە خۆتی ڕەوا دەبینی بەوی دیکەش و بەوی دیکەش، هەموومان خۆمان لەو وڵاتەدا ببینینەوە بە ڕێز و حورمەتەوە، نەك هەندێکیان لە هەندێکماندا

بتوێینه‌وه، وه‌ك ئه‌هلی ته‌صه‌ووف ده‌ڵێن (لم فناءُ في الله) له خوادا توانه‌وه، كه ئه‌وه‌ش چه‌مكێكی ڕاستی هه‌یه، ئه‌ویش ئه‌وه‌یه كه ئینسان، هیچ بۆچوون و ئاره‌زووی نه‌فسی و شتی ناشه‌رعیی له وجوودیدا نه‌مێنێ، له به‌رامبه‌ر خوادا، له به‌رامبه‌ر شه‌رعی خوادا، له به‌رامبه‌ر به‌ندایه‌تیی بۆ خوادا، گنجی لێ ببڕێ و هیچ ده‌مارێكی ناشه‌رعیی تێدا نه‌جووڵێ. چه‌مكه چه‌وته‌كه‌شی ئه‌وه‌یه كه پێیده‌ڵێن: (وَحدة الوجود)، ئه‌وانه‌ی كه به وه‌هم وایان وێنا كردوه كه ئه‌م عالەمه جیسمه و خوای بێ وێنه ڕووحه‌كه‌یه‌تی! به‌ڵام ئه‌هلی عیرفان و ته‌صه‌ووفی ڕاسته‌قینه ده‌ڵێن: (وحدة الشهود) هه‌یه، ته‌نیا خوا بینین، ئه‌مما ته‌نیا خوا هه‌بوون و، هیچ شتێكی دیكه وجوودی نیه، نا، ئه‌هلی عیلمی كه‌لام و ته‌وحید گوتوویانه: (حقائق الأشياء ثابته) چییه‌تی شتان چه‌سپاوه، واته: ئه‌م دنیایه خه‌یاڵ و وه‌هم نیه.

ئه‌و براده‌رانه‌ش، كه چاویان له‌وه‌یه هه‌موو شتێك هی وان بێ و هه‌موو شتێ به‌ده‌ست وانه‌وه بێ، عیباد و بیلاد، ده‌یانه‌وێ خه‌ڵك (فناٌ في الحزب) ببێ، یانی (فناٌ في الشخص) ببێ! كه بێگومان ئه‌وه غه‌ڵه‌ته‌و ئێمه ده‌بێ هه‌موومان، هه‌ركامێك له ئێمه بوونی پێ ڕه‌وا ببینرێ و تایبه‌تمه‌ندییه‌كانی ڕێز لێبگیرێن، به‌وه ته‌بایی په‌یدا ده‌بێ، هه‌میشه ته‌بایی له‌سه‌ر بناغه‌ی دادگه‌ریی داده‌مه‌زرێ.

**دانـا: مامۆستا! ئه‌گه‌ر له چینه سیاسییه‌كه بێینه خواره‌وه، بۆ نێو كۆمه‌ڵگا، ئه‌وه‌ی جه‌نابت ئاماژه‌ت پێكردوه من به وردی خوێندوومه‌وه، ئێستا ئه‌گه‌ر وێنه‌ی كۆمه‌ڵگه‌ی كوردیی بێنینه به‌رچاوی خۆمان، زۆر جار سۆرانیی و بادینیی، سلێمانیی و هه‌ولێریی، ژن و پیاو، گه‌نج و پیر، لادێ و شار، جاران ئاغا و ده‌ره‌به‌گ و جوتیار، به‌گژیه‌كدا ده‌درێن، جه‌نابت ئه‌فه‌رمووی: ده‌ستی ده‌سه‌ڵات و به به‌رنامه، ئه‌مه ئه‌خه‌نه نێو كۆمه‌ڵگاوه؟**

**مامۆستا:** زۆرجار وایه، با من یه‌ك بنچینه‌ت پێ بڵێم، به تۆش و به بینه‌ران و بیسه‌رانی به‌ڕێزیش: ئینسان ئه‌گه‌ر ئامانجه‌كه‌ی باش بوو، خه‌فتانی ئامرازی باشیشی بۆ ده‌كات و له ئامراز و شێوازی باشیش ده‌خه‌فتێ، به‌ڵام ئه‌گه‌ر ئامانجه‌كه‌ی خراپ بوو، وه‌ك ده‌ڵێن: (ڕاوچی خراپ له ئاوی لێڵدا ڕاو ده‌كات)

یان (دز بازاڕی ئاڵۆزی دەوێ) بۆیە ئەگەر ئینسان مەبەستی خزمەتی خەڵك و وڵات و کۆمەڵگا بێ، بەبێ جیاوازیی، ئەوکاتە نایەت بگەڕێ بزانێ: کێ بە مەرجە ناشەرعییەکانی ئەو ڕازییە، پڕی بکات، ئەوەش کە بە مەرجەکانی ڕازیی نیە، قڕی بکات، وەك ئێستا دەیبینین وایە، هەموو جارێ ناڵێم: حیزب و خزم، پڕ بوون، خەڵك و جەماوەریش قڕ بوون، واقیعێکە دەچێتە چاوی هەموو کەسێکەوە، کێ پێی خۆشە، با پێی خۆش بێ، کێ پێی ناخۆشە، با پێی ناخۆش بێ، بەڵام ئەوە حەقیقەتە: ژمارەیەکی کەمی خەڵك لەم وڵاتەدا، بە واریداتی ئەم وڵاتە، کە هی هەموو لایەك بووە، بەبێ جیاوازیی، بوونە ملیاردلێر، کە ئەوە بە ژیانیانەوە دیارە، بە خۆیان، بە جێگاو ڕێگایان، بە سەیارەیان، بە ئیمکانیەتیان، بە دەوروبەریان، خەڵکی دیکەش دیارە وەزعی چۆنە! ئنجا پێکدادانی توێژو پێکهاتەکانی کۆمەڵگاش، بێگومان ئامرازێکی خراپەو ئامانجێکی فرایی لە پشتەوەیە، چونکە بادینان و سۆران، سلێمانی و هەولێر، لادێی و شاریی، پیر و گەنج، ئافرەت و پیاو، ...هتد. هەڵبەتە کۆمەڵگا هەمووی لەمانە پێکدێت: کۆمەڵگا دەبێ بە تەمەنی هەبێ، بێ تەمەنیشی هەبێ، کۆمەڵگا خوا وای خوڵقاندوە، هەمیشە نیوەی بەشەران مێن، نیوەشیان نێرن، خواش سبحانەو تعالی ڕەگەزی نیە، نە نێرە و نە مێیە، ئەم بنچینەی جووتێتیی (زوجیة)، خوا لە دروستکراوەکانی خۆیدا دایناوە، هەتا هەندێك لە زانایان ئەم ئایەتەی سووڕەتی (الفجر):

﴿ وَالشَّفْعِ وَالْوَتْرِ ﴿٣﴾ ﴾ [الفجر : ٣]

**سوێند** بە جووت و بە تاك، دەڵێن جووتەکان دروستکراوەکانی خوان، تاکەکەش تەنیا خۆیەتی، ئنجا خوا سبحانە وتعالی دەفەرموێ:

﴿ وَمِن كُلِّ شَيْءٍ خَلَقْنَا زَوْجَيْنِ ﴾ [الذاریات: ٤٩]

لە هەموو شتێك جووتمان دروستکردوە، هەموو شتێك، تەنانەت گەردیلە، (ئەتۆم)ش، ئەلیکترۆن و پرۆتۆنە، بارگەی سارد و بارگەی گەرمی تێدایە، ئنجا ئاسمان و زەویی، دنیا و دوارۆژ، بەهەشت و دۆزەخ، سارد و گەرم، هاوین

و زستان، تاریكیی و ڕووناكیی، مەسەلەی جووتێتی (زوجیة) ئەوە نیە تەنیا لە نێو جیهانی مرۆڤ و ئاژەڵ و زیندەوەر و ڕووەك و ئەوانەدا بێ، كە دەزانرێ، بەڵكو لە ماددەی بێ ژیانیشدا هەیە، بەهەمان شێوە، یانی خوا سبحانه وتعالى، جووتێتیی (زوجیة) كردووەتە بنچینەیەك، كە هەموو دروستكراوەكانی لەسەر خوڵقاندوون، تەنیا خۆی تاك و بێ وێنەیە.

پاشان كۆمەڵگا پێویستیی بە لادێش هەیە و پێویستی بە شاریش هەیە، هەروەها كۆمەڵگا پیریشی تێدایە و، ئەوەش كە ئەمڕۆ گەنجە، دوایی خۆ پیر دەبێ.

هەروەها كۆمەڵگا دەوڵەمەندو نەداریشی هەیە.

مەبەستم ئەوەیە كۆمەڵگا دەبێ ئەو پێكهاتانەی هەبن، ئەوە حاڵەتی سروشتی كۆمەڵگا وایە، ئنجا بێینەسەر هەرێمی كوردستان، هەرێمی ئێمە لە چەند شارێك پێكهاتوە، لە دەڤەری بادینان و سۆران بە گشتی و، دواییش دەڤەری بادینان چەند شارێكە: ئەوە زاخۆیە، ئەوە دهۆكە، ئامێدیی و شوێنەكانی دیكە، دەڤەری سۆرانیش: هەولێر و سلێمانی و شارەزوور و ئیدارەی گەرمیان و هەورامان و ئیدارەی ڕاپەڕین و كەركووك و ناوچەكانی دیكە، ئنجا ئەگەربێت و خەڵكی هەر شارە، دەمارگیرییان هەبێت بۆ دانیشتوانی شارەكەی خۆیان، لەسەر حسابی تەبایی لەگەڵ شارەكانی دیكە، ئێمە دەبینە ئاردی نێو دڕووان و بە شەنە و سێلكەش كۆناكرێینەوە!!

بۆیە ئەگەر تەماشای قورئان بكەین چیمان پێ دەفەرموێ؟

﴿ وَٱعۡتَصِمُواْ بِحَبۡلِ ٱللَّهِ جَمِيعٗا وَلَا تَفَرَّقُواْ ﴾ [آل عمران: ١٠٣]

واتە: توند دەست بە ڕێسمانی خواوە بگرن و پەرتەوازە مەبن!

ئنجا ئەگەر تەماشای ئەزموونی حوكمڕانیی پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) بكەین: خەڵكی بیابانشین و لادێی هەبووەو خەڵكی شاریش هەبووە، سیاسەتی حوكمڕانیی پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) وابووە كە خەڵكی شار،

له چه‌ند فه‌رمایشتدا هاتوه، فێڵ نه‌که‌ن له خه‌ڵكی لادێ، خه‌ڵكی بیابان نشین، که که‌لوپه‌له‌کانیان دێنن ساغیان بکه‌نه‌وه، پێکه‌وه ڕێك بن، ته‌با بن، چونکه ئه‌و شاره‌ش به‌و واریداته به‌ڕێوه ده‌چێ که له‌و لادێیانه‌وه دێن، ئه‌و کاته وابووه، ئێستاش ئێمه ئه‌گه‌ر حاڵه‌تێکی ته‌ندروستمان هه‌بێ، ده‌بێ هه‌روابێ، ده‌بێ کشتوکاڵ به‌ره‌وپێشه‌وه به‌رین، ئاژه‌ڵداریی به‌ره‌وپێشه‌وه به‌رین، به پێچه‌وانه‌ی ئه‌وه که ئه‌م میلله‌ته‌ی ئێمه فێرکراوه که وه‌ك به‌چکه چۆله‌که زار ده‌گرێته‌وه، که‌نگێ له تورکیا و له ئێران و له ئه‌ورووپا و له کوێ و له کوێوه، شتێك دێت بیخاته نێو زاری ده‌بوو هه‌موو به‌رهه‌می خۆماڵییمان هه‌بێ، ئه‌و شتانه‌ی له وڵاتی خۆماندا هه‌ن و ڕه‌نێو ده‌هێنرێن.

مه‌به‌ستم ئه‌وه‌یه ئه‌وکاته شاره‌که پێویستی به لادێیه، لادێش پێویستی به شاره، هه‌روه‌ها بادینان و سۆران، هه‌ولێر و سلێمانی، گه‌رمیان و کوێستان، هه‌ورامان و کوێ و کوێ، ده‌بنه ته‌واوکه‌ری یه‌کدی.

**دانـــا: کێ له پاراستنی ئه‌م ته‌باییه به‌رپرسه، ئایا کۆمه‌ڵگایه لایه‌نه سیاسیه‌کان به‌ره‌و ناته‌بایی ده‌بات، یان حوکمڕانه‌کانن، کۆمه‌ڵگا وا لێ ئه‌که‌ن؟**

**مامۆستا:** به پله‌ی یه‌که‌م حوکمڕانان به‌رپرسیارن، حوکمڕانه‌کان ده‌بێ به‌و شێوه‌یه ڕه‌فتار بکه‌ن، که ئه‌و پێکهاتانه پێکه‌وه ته‌با بن. به‌پله‌ی دووه‌م: خه‌ڵکیش به‌رپرسیاره، زۆرجار له به‌رنامه‌کانی پێشوودا باسمان کردوه، که خه‌ڵك نابێ ده‌س له کراسی ده‌رهێنێ، ئه‌ی مرۆڤ، برا! خوشك! خۆ تۆ مه‌ڕ نی به‌پێش خۆیانت بده‌ن! تۆ به‌شه‌ری، ڕه‌خنه بگره له ده‌سه‌ڵات، بڵێ: بۆچی تێکمان به‌رده‌ده‌ن؟ ئێمه سۆران و بادینان، هه‌ورامان و پشده‌ر، سلێمانی و هه‌ولێر، که‌رووك و هه‌ڵه‌بجه، پێویستییمان به‌یه‌کدیی هه‌یه، بۆچی تێکمان به‌رده‌ده‌ن؟ بۆچی به‌رپرسێك ته‌نیا شاره‌که‌ی خۆی ده‌بینێ؟ ئه‌ویدیکه‌ش ته‌نیا ئه‌ولا ده‌بینێ؟ ده‌بێ له‌سه‌رێوه که‌سانێك هه‌بن، حوکمڕانانێك، سیاسه‌تمه‌دارانێك هه‌بن، هه‌موویان ببینن، نابێ هه‌رکه‌س بۆ لای شاره‌که‌ی خۆی تێنووسێ، نابێ شارێك پڕ بێ، ئه‌ویدیکه قڕ بێ، نابێ شارێك پڕ بێ له پرۆژه‌ی باش باش، ئه‌ویدیکه پشتگوێ بخرێ، ئه‌وه چییه، جا عه‌جایب ئه‌وه‌یه، هه‌ندێك له‌وانه‌ی که وا بیر ده‌که‌نه‌وه، شیعاری

گەورە گەورەشیان هەن، ئێمە دەبێ دەوڵەتمان هەبێ، ئێمە دەبێ سەربەخۆ بین، ئنجا ئاوا سەربەخۆ دەبی؟ عەقڵەكەت هەر بەشیماڵی خۆتانی كردوە، یان ئەو پەڕی بەشی حیزب و خزم! ئاوا سەربەخۆ دەبی؟!

**دانــا: چ سوودێك ئەكەن لەم بەیەكدادانی جیاوازییەكان؟**

**مامۆستا:** وەك پێشتریش گوتمان: بەرژەوەندیی ناشەرعیی، وا لە ئینسان دەكات خەم بخوا لە ئامرازی ناشەرعیی، كەسێك، حیزبێك، كە خۆی كورت هەڵدێنێ لە شوێنێكدا، ئنجا دەیەوێ خەڵكی ئەو شوێنە وەلائیان بۆ ئەو بێ، بڵێن: ئەشەدو بیللا بۆ ئێمە زۆر دڵسۆزە، خزمەتی بە ئێمە كردوە! بەڵام پێموایە دەبێ ئێمە عەقڵ و دڵی خۆمان فراوانكەین، دەبێ ئەوە لە مێشكی خۆمان دەركەین، كە سیاسەتمان ئێمە لەسەر ناكۆكییەكانی كۆمەڵگا بنیات بنێین، دەبێ هەوڵبدەین سیاستەمان لەسەر پێكەوە تەباكردنی پێكهاتەكانی كۆمەڵگا بە هەموو ڕەنگ و شێوەكانەوە، بنیات بنێین، هەركەسێك بەرژەوەندیی خۆی، سیاسەتی خۆی، شێوەی ئیدارەدانی خۆی، لەسەر ئەوە بنیات بنێ، كە خەڵكە پێكەوە ناكۆك و ناڕێك بێ، چ لەسەر ئاستی پیاو و ئافرەت، ژن سالاریی و پیاوسالاریی، چ لەسەر ئاستی سۆران و بادینان، چ لەسەر ئاستی هەولێر و سلێمانی، چ لەسەر ئاستی گەرمیان و كوێستان، هەركەسێك وا بكات، هەر حیزبێك وا بكات، مانای وایە دڵسۆزی خەڵك و خاكەكەی نییەو كارەكەیشی هیچ ئەنجامێكی باشی نابێ، چونكە ناكۆكیی پێكهاتەكانی كۆمەڵگا گوریس پچڕكێنە كردنیان، سەرەنجام هەموویان زەرەری لێ دەكەن، وەك لە تەبایی هەموویان بەهرەمەندن، لە ناكۆكیی و دوورەبەكییش، هەموویان زەرەرمەندن.

**دانــا: زۆر باشە، بێینە سەر بنەمای بیست و یەك، جەنابت ئەفەرمووی: (بە هۆی نەزانیی و ترس و تەماعەوە، خەڵك بە ژێردەستیی ستەمكاران قاییل دەبێ) مەبەستت لەم دەستەواژەیە چییە؟**

**مامۆستا:** ئەو دەستەواژەیەم هەر لە بەسەرهاتی مووسا (سەڵات و سەلامی خوای لەسەربێ) و گەلە ستەمدیدەكەی، كە بەنوئیسرائیل بوون، لەگەڵ فیرعەون

و هامان و قاروون، ئەو سێکوچکە شوومە وەرگرتووە، لە قورئاندا بەسەرهاتێك کە زۆرترین جار دووبارە بووبێتەوە، وە زۆرترین پانتایی گرتبێ، بەسەرهاتی مووسایە (علیه الصلاة والسلام) مووساو هاڕوونی برای (سەلامی خوایان لێ بێ) و گەلە ستەمدیدە و مەزڵوومەکەیان، لەلایەك و لایەنی بەرامبەریشیان: فیرعەون و قارون و هامان، ئەو سێکوچکە شوومە، کە ڕەمزی ئەو سێ کۆڵەکەیەن کۆمەڵگا دەچەوسێننەوە، فیرعەون ڕەمزی خۆسەپاندنی سیاسیی و خەڵك ترساندن و خستنیانە ژێر هەژموونی ناشەرعییانە و ستەمکارانەی خۆی، چونکە فیرعەون یەکێ لە قسەکانی، ئەوەیە کە دەڵێ:

﴿ مَآ أُرِيكُمۡ إِلَّا مَآ أَرَىٰ وَمَآ أَهۡدِيكُمۡ إِلَّا سَبِيلَ ٱلرَّشَادِ ٢٩ ﴾ [غافر: ٢٩]

دوای ئەوەی کە مووسا (علیه الصلاة والسلام) دەچێ و دەفەرمووێ: من ڕەوانەکراوی خوام بۆ لای تۆو بۆ لای گەلەکەت و، چیدی ئەو خەڵکە مەچەوسێنەوە و خۆتیان بەسەردا مەسەپێنە! دەڵێ:

﴿ مَآ أُرِيكُمۡ إِلَّا مَآ أَرَىٰ وَمَآ أَهۡدِيكُمۡ إِلَّا سَبِيلَ ٱلرَّشَادِ ٢٩ ﴾

هەر ئەوەتان پێ دەڵێم، کە خۆم بە چاکی دەزانم، هەرچی منیش دەیڵێم هەمووی هەر چاکە.

ئا ئەوە مەنتیقێکی فیرعەونییە، ئەو قسەیە شێخێك بیکا هەروایە، هەر مەنتیقێکی فیرعەونییە، مەلایەك بیکات، ئیسلامییەك بیکات، عەلمانییەك بیکات، خەڵکی ئێستا بیکا، لە مێژوودا کرا بێ، ئەوە مەنتیقێکی فیرعەونییە، ئاخر یانی چی حەق لە تۆدا کورت هەڵهاتوە؟ بۆچی کە عەقڵ و زانست دابەشکراوە، بەس بەشی تۆی لێ دراوەو خەڵکی دیکە هەمووی مەحرووم و بێ بەش بووە؟! هەرکەس خۆی پێ لە خەڵك زیاد بوو، خەڵکیشی پێ کەم دەبێ و، لێرەوە فیرعەونایەتیی سەرهەڵدەدات، ئنجا ئەوە مرۆڤ خۆی پێ زۆر بوو، وەك خۆی، وەك بنەماڵەی، وەك حیزبی، وەك دەڤەری، وەك نەتەوەی، وەك هیتلەرو مۆسۆلۆنیی، هیتلەر لە ئەڵمانیا و مۆسۆلۆنییش لە ئیتاڵیا، دەیانگوت: ڕەگەزی ئاریی، ڕەگەزەی ئێمە، باشترینەو دەبێ خەڵکەکەی دیکە،

توخمەکانی دیکە، ڕەنگەکانی دیکە، هەموویان ملکەچ بن بۆ ڕەگەزەی ئێمە! ئا لێرەوە هیتلەرایەتیی و مۆسۆلۆنییایەتیی سەریهەڵدا.

ستالین کاتی خۆی، چینی پرۆلیتاری کردبوو بەسەردەستە، چینی پرۆلیتاری چی؟ ئەوە وەك دێوجامەیەك بوو حوکمی پێ دەکرد، ئەگەرنا کرێکار و جووتیاری داماو، کەی ئەصڵەن بە بەشەر دادەنران، لە کاتی حوکمی ستالیندا! مەبەستم ئەوەیە کە ئەم مەسەلەی خۆسەپاندنە، ڕیشەیەکی بیرکردنەوەی هەیە، هەموو تەصەڕووفێك ڕیشەیەکی تەصەووریی هەیە.

ئنجا فیرعەون ڕەمزی ئیستیبداد و خۆسەپاندنە، لەبەرئەوەی ئاوا بیری دەکردەوە، دەیگوت: ئەوەی من دەیڵێم، هەر ئەوە ڕاستە، غەیری ئەوەش کە دەیڵێم، نابێ هیچکەس هیچ قسەی دیکەی هەبێت:

﴿ مَآ أُرِيكُمۡ إِلَّا مَآ أَرَىٰ وَمَآ أَهۡدِيكُمۡ إِلَّا سَبِيلَ ٱلرَّشَادِ ﴾

ئنجا ئەمە سەری بەچی کێشا؟ سەری بەوە کێشا، بڵێ:

﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلۡمَلَأُ مَا عَلِمۡتُ لَكُم مِّنۡ إِلَـٰهٍ غَيۡرِي ﴾ [القصص: ٣٨]

ئەی دەست و پێوەندەکانم، ئەی کۆڕو مەجلیسی دەوروبەرم! (وەك پەرلەمانی ئێستا) جگە لە خۆم پەرستراوێکی دیکەم بۆ ئێوە پێ شك نایەو، هەر دەبێ من بپەرستن! بەڵکو بە مووسا دەڵێ:

﴿ قَالَ لَئِنِ ٱتَّخَذۡتَ إِلَـٰهًا غَيۡرِي لَأَجۡعَلَنَّكَ مِنَ ٱلۡمَسۡجُونِينَ ﴿٢٩﴾ ﴾ [الشعراء : ٢٩]

ئەگەر جگە لە من پەرستراوێکی دیکە بگری، ڕەگەڵ گیراوانت دەخەم، تۆش زیندانیی دەکەم، هەروەها دەیگوت: ((أنا ربكم الأعلى) من پەروەردگاری هەرە بەرزی ئێوەم، دیارە کەسێك پێی وابێ لە هەموو کەس چاکترە، ئەو جۆرە قسانەش دەکا!

ئەدی قاڕوون چ دەورێکی دەبینی؟ فیرعەون ئەوە دیارە لە گەلی (أقباط) یانی: قیبتیی بووەو ئەو زوڵم و ستەمەی لە گەلی ژێردەستەی بەنوئیسرائیل

بوو، بەڵام لێیان یاخی بوو ﴿ إِنَّ قَٰرُونَ كَانَ مِن قَوۡمِ مُوسَىٰ فَبَغَىٰ عَلَيۡهِمۡۖ ﴾ [القصص: ٧٦]

قارون له بەنو ئیسرائیل بوو، بەڵام سەروەتمەندێك بوو، وەك ئەو ملیاردلێرانەی ئێستا كه له پەنای حوكمڕانانی گەندەڵدا پێدەگەن، وەك زیندەوەری مشەخۆر، گەنەو قورنو، ئەها كه لەسەر جەستەو لاشەی ئاژەڵ دەژین قاڕوون له بەنوئیسڕائیل بوو، بەڵام به هۆی ئەو هەموو سەروەت و سامانه ناشەرعییەی، كه فیرعەون ڕێگای دابوو كۆی بكاتەوە و پەزمەندەی بكات، له بەنوئیسڕائیلی هەژار هەڵگەڕابۆوە:

﴿ فَبَغَىٰ عَلَيۡهِمۡۖ وَءَاتَيۡنَٰهُ مِنَ ٱلۡكُنُوزِ مَآ إِنَّ مَفَاتِحَهُۥ لَتَنُوٓأُ بِٱلۡعُصۡبَةِ أُوْلِي ٱلۡقُوَّةِ ﴾ [القصص: ٧٦]

واته: له گەلی بەنوئیسڕائیل یاخی بوو، هێندەشمان خەزێنەدابوونێ كه كلیلەكانیان كۆمەڵه كەسێكی بەهێز به زەحمەت بۆیان هەڵدەگیران!

هامان چ ڕۆڵێكی بینیوە؟ ئەگەر تەماشا بكەین، وەك چۆن له سووڕەتی (القصص)دا خوای بەرزو مەزن باسی قاروون دەكات، له سووڕەتی (غافر) دا باسی هامان دەكات، ڕۆڵی هامان، لەوێدا زیاتر باس دەكات، هەرچەندە له سووڕەتی (القصص)یشدا باس دەكات و له چەند شوێنی دیكەشدا باسی دەكات، بەڵام له سووڕەتی (غافر)دا:

﴿ وَقَالَ فِرۡعَوۡنُ يَٰهَٰمَٰنُ ٱبۡنِ لِي صَرۡحٗا لَّعَلِّيٓ أَبۡلُغُ ٱلۡأَسۡبَٰبَ ٣٦ أَسۡبَٰبَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ فَأَطَّلِعَ إِلَىٰٓ إِلَٰهِ مُوسَىٰ وَإِنِّي لَأَظُنُّهُۥ كَٰذِبٗاۚ وَكَذَٰلِكَ زُيِّنَ لِفِرۡعَوۡنَ سُوٓءُ عَمَلِهِۦ وَصُدَّ عَنِ ٱلسَّبِيلِۚ وَمَا كَيۡدُ فِرۡعَوۡنَ إِلَّا فِي تَبَابٖ ٣٧ ﴾ [غافر: ٣٦-٣٧]

واته: فیرعەون گوتی: ئەی هامان! كۆشكێكم بۆ دروست بكه، (قەڵایەك، بورجێكم بۆ دروستبكه) بەڵكو (بچمه سەر ئەو بورج و قەڵایه بەرزەو) بگەمە ڕێ و بانەكانی ئاسمان (ئەو هۆكارانەی كه ئاسمان بەڕێوە دەبەن) ئنجا لەو

شوێنه بڵندەوه تەماشا بكەم، بزانم پەرستراوی موسا له كوێیه؟ پێشموایه درۆ دەكات، (وەك چۆن لەسەر زەوی نیه، پێموایه له ئاسمانیش هەر نیه)، ئنجا خوا عزوجل دەفەرموێ: (وَكَذَٰلِكَ زُيِّنَ لِفِرْعَوْنَ سُوٓءُ عَمَلِهِۦ وَصُدَّ عَنِ ٱلسَّبِيلِۚ وَمَا كَيْدُ فِرْعَوْنَ إِلَّا فِى تَبَابٍ ) ئاوا فیرعەون كردەوە ڕازێنرابۆوەو، لەڕێ لادرابوو، وەك ئیرادە و ئیختیاری بەدەست خۆی نەمابێ) دوایی دەفەرموێ: (وَمَا كَيْدُ فِرْعَوْنَ إِلَّا فِى )...(تباب) خوای پەنهانزان ئەو قسەو داواكارییەی فیرعەون له هامان، ناودەنێ: فێڵ (كید)، چارەنووسی فێڵ و پیلانی فیرعەون هەر سەر بە فەتارەت چوونە، چونكە فیرعەون لێرەدا ویستوویەتی ئەو خەڵكەی خۆی چەواشە بكات و، بە خەڵك بڵێ: خەڵكینە! خوای موسا لەسەر عەرزێ نیە، ئەوە دیارە، ئەگەر لێرەبایە دەمانزانی: داخۆ لە كوێیه؟ دەمانبینی، یانی: بە پێنج هەستەكان نازانین خوای مووسا له كوێیه؟ ئنجا با تەماشایەكی ئاسمانیش بكەم، پێشوەختیش حوكم دەدا: (وَإِنِّى لَأَظُنُّهُۥ كَٰذِبًا) پێشموایە درۆ دەكات، خوا لەوێش هەر نیە! دیارە فیرعەون مولحید بووە، یانی: ئەو پەرستراوەی مووسا ئێمەی بۆ بانگ دەكاو دەیكاتە بیانووی ئەوەی كە من چیدیكە ئەو خەڵكە نەمپەرستێ و دەیكاتە پاساوو بەڵگەی ئەوە، ئەو پەرستراوەی موسا، بوونی نیە، بە بەڵگەی ئەوە كە لەسەر عەرزێ نیە! دەیگوت بورجێكم بۆ دروستبكەن با تەماشای ئاسمانیش بكەم، بەڵام پێشوەختیش دەڵێ: پێم وایە لەوێش هەر نیە!

ئا ئەوە خوا ناوی دەنێ: فێڵ، چونكە فیرعەون مەبەستی چەواشەكردنی خەڵك بوو.

مەبەستم ئەوەیە، كە هامان دەوری ڕاگەیاندنی خراپ، ڕاگەیاندنی چەواشەكار، ڕاگەیاندنی تەزویر و هەڵخەڵەتاندنی خەڵكی دیوە ئەگەر تەماشا بكەین له بەسەرهاتی مووسا (علیه الصلاة والسلام)دا، لەگەڵ فیرعەون، زۆر جوان ئەو سێكوچكەیە دیارە: فیرعەون ڕەمزی خۆسەپاندن (إستبداد)ی سیاسیی و، قارون ڕەمزی چەوساندنەوە (إستغلال)ی ئابووریی و هامان ڕەمزی چەواشەكاریی ئیعلامیی و ڕاگەیاندن.

ئەو سیناریۆیەش بەردەوام لە هەموو دنیادا دووبارە دەبێتەوە، تەماشا بکە! هەرچی چاوی لەوە بێت کە خۆ بەسەر خەڵکدا بسەپێنێت، پەنا دەباتە بەر چی؟

١- دەسەڵاتێکی هەبێ، هێزێکی چەکدارو ناشیلێ ئەو هێزە چەکدارە لە دامەزراوەیەکدا خۆی ببینێتەوە، یان دەبێ ئەگەر دامەزراوەش بوو ڕیشمەکەی بەدەستی ئەوەوە بێ، ئنجا ئەو ئیستیبداد و خۆسەپاندنە سیاسییە، بەهۆی ئەو پاڵپشتە چەکدار (مسلّح)ەوە بۆ خۆی دەستەبەر دەکات.

٢- دوایی بیردەکاتەوە لەوەی کە دەبێ سەروەت و سامانیش لە دەستی خۆی دا قۆرخ بکات، تاکو ئەوەی بە ترس نەهاتە ژێر بار، بە برس بیهێنێتە ژێر بار، ئەوەی کە بە ترساندن نەهات، بە تەماع وەبەرنان، یاخود بە برسیی کردن: بە قسەم بکەی، شتێکم لەگەڵ دەخۆی، بە قسەم نەکەی بێبەشت دەکەم! ئایا ئەوە لەم هەرێمی کوردستانەی خۆماندا نایبینی؟ زۆر زۆر بە ڕوونیی دەیبینی، لە هەموو عالەمدا، لەو شوێنانەی کە کەسانێك، لایەنانێك حوکم دەکەن، کە خۆیان سەپاندوە، هەمیشە هەوڵ دەدەن کە هەموو سەرچاوە سروشتییەکان، هەموو ئیمکانیاتی مادديی لە دەستی خۆیاندا کورت هەڵهێنن، دواییش هەر ڕۆنی خەڵکەکەیە لە سەری خۆشیان دەدەنەوە، بەڵام لە بەرامبەر ئەوەدا کە وەلائیان دەکڕن.

٣- ئەی ئایا ئاگادارکردنەوەی خەڵك و کاکردنە سەر بیروزەینییان و هەواڵ و زانیاریی جێی مەبەست دەرخوارد دانییان، ئەوە بەدەست کێ بێ؟ هەوڵ دەدەن هۆیەکانی ئاگادارکردنەوەو ڕاگەیاندنیش، ئەوانیش لەدەستی خۆیاندا بن، بۆ ئەوەی بە کەیفی خۆیان فێڵ و فەرەج و تەزویر بکەن و خەڵك چەواشە بکەن و هەڵخەڵەتێنن!

**دانــا: ئا لەمەیان دا فەرقێك نیە لە کوردستان دا ؟ ئێستا هەموو لایەك، بگرە کۆمپیانیایەکیش کەناڵێکی میدیایی: ڕادیۆ و تەلەفزیۆنێکی هەیە، یان ئەتەوێ بڵێی میدیاکانی ئەوان جیاوازن لە میدیاکانی ئەوانی تر؟**

**مامۆستا:** بەڵێ، ڕاستە کۆمپانیایەك کەناڵێکی هەیە و، حیزبێك بە لاتیی، بە قەرزو قۆڵە، کەناڵەکەی بەڕێوە دەبا، بەڵام ئایا ئەوە وەك ئەو کەناڵە نەوتییانە

وایە كە دنیایان پڕكردوە لە هەواڵنێر و ڕاگەیانكاری جۆراو جۆر، بەو تەكنیكە تازەیە و، بەو ئیمكانیەتەو، بەو تیر و پڕییە؟! ئەوە شتێكی ئاشكرایە لەم ڕۆژگارەدا لە ڕووی ڕاگەیاندنەوە، تاكو گیرفانت پڕتر بێ دەنگت زوڵاڵترەو ڕەنگ جوانترە، جارێك گوتیان: مامۆستا! ئەرێ تەلەفزیۆنەكەی ئێوە بۆچی وایە، گوتم: گیانەكەم ڕەنگەكەشمان لە قەدەر ئیمكانیەت و گیرفانمانە! ئنجا بۆیەش خوا سبحانە وتعالى زۆر باسی ئەو چیرۆكە دەكات و لە قورئانیێ دا زۆر دووبارە دەبێتەوە، چونكە ئەوە شتێك نەبووە، لە مێژوودا بووبێ و تێپەڕ بووبێ و تەواو و دووبارە دەبێتەوە، تۆ تەماشا بكە! هەرێمی لێ بەرە دەرێ، بچۆ بۆ هەر شوێنێكی دنیا، تەماشای ئەمریكاو ڕووسیاو چین و زلهێزانی دیكە بكە.

**دانــا: مەبەست لە: هەرێمی لێ بەرە دەرەوە، بینەر وا تێئەگا یانی ئەوە: لە هەرێم نیە؟ یان لێرە هەیە و با بچینە دەرەوەش؟**

**مامۆستا:** مەبەستم ئەوەیە: زۆرجار هی ئێرەمان باسكردوە، بەڵام ئەوە حاڵەتێكی گشتییە و هەموو ئەوانەی كە دەیانەوێ خەڵك لە ژێر هەژموون و هەیمەنەی ئەواندا بێ، هەوڵ دەدەن ئەو سێ شتە بەدەس خۆیانەوە بگرن: هێز، سەروەت و سامان، ڕاگەیاندن، ئنجا هەیە دەستی نەگاتە هێزی سیاسیی، مشووری سامان، دەخوات، چونكە سەروەت و سامانت بوو، ڕاگەیاندنیشت دەبێ، هەیە تەركیز دەخاتە سەر ڕاگەیاندن، گوتراوە: خەڵك عەقڵی لە چاواندایە، كەپێویستە ئەوەشی بۆ زیادبكەین: خەڵك لە گوێیاندایە، زۆرجار وایە، بەشەر بەشەرە، كارتێكراو دەبێ بەو قسەیەی دەیبیستێ، بەو دیمەنەی كە دەیبینێ، بۆ وێنە: وێنەكەی (ئایلان) ئەو منداڵە كوردە سوورییەی خەڵكی كۆبانێ، ئەوەی بەخنكاویی لە قەراغ دەریا كەوتبوو، دەڵێن: دەوری شەست هەزار (٦٠٠،٠٠٠) كەس لە سووریا كوژراوە، بەڵام ئەو دیمەنە كە هی خۆ منداڵێك بوو، كە چەندان منداڵی وا، لەو ڕۆژانەدا لە (ئیدلب) ڕژێمی سووریا بە كیمیاویی كوشتنی، بەڵام ئەو وێنەیە زۆر كاریگەر بوو.

وێنەیەكی دیكە، ئەو وێنەیەی كە دالێك هەڵنیشتووە بە دیار منداڵێكی ئەفریقییەوە، منداڵەكە بە دانیشتنەوە ئاوا كووڕ بووەتەوە، داڵەكەش ڕاوەستاوە چاوەڕێ دەكات: كەنگێ گیانی دەربچێ، بچێ بیخوات! زۆر كاریگەرە.

مەبەستم ئەوەیە خەڵك دەكەوێتە ژێر كاریگەریی دیمەنەكان، ژێر كاریگەریی قسەكان، بۆیە حوكمڕانانی خۆسەپێن هەمیشە خەم لەوە دەخۆن، كە ئەو سێیە بەدەست خۆیانەوە بن، دەستەڵات و سامان و ڕاگەیاندن (السلطة و الثروة و والإعلام). هەڵبەتە ئەگەر بە ئیمكانیاتی حیزبیی خۆی و بەپارەی حەڵاڵ دەیكات، گرفت نییە هەموو كەس مافی خۆیەتی قسەی خۆی بكات، بەڵام بەكارهێنانی سامانی خەڵك و وڵات بۆ چەواشەكردنی خەڵك تاوانە.

**دانـا: پرسیارەكە لێرەدایە، بۆچی دەسەڵاتداران و حوكمڕانان لە ڕێگەی خاڵە بەهێزەكانەوە مامەڵە لەگەڵ كۆمەڵگا ناكەن، بۆ لە ڕێی ئەم خاڵە لاوازانەی وەكو نەزانی و ترس و تەماعەوە رەفتاریان لەگەڵ دەكەن؟**

**مامۆستا:** دووبارەی دەكەمەوە: هەركەسێ ئامانجی باشی هەبێ، خەفتانی ئامرازی باشی بۆ دەكات، بەڵام هەركەسێك ئامانجەكەی خراپ بێ، بەناچاریی دەبێ پەنابەرێتە بەر ئامرازی خراپ و شێوازی خراپ، ئەوانە لەبەرئەوەی ئامانجەكەیان باش نیە، دەگەڕێن بۆ خاڵە بێهێزەكانی مرۆڤ.

**١)** ترس، خاڵی بێ هێزی مرۆڤە، ئینسان كە ترسا، لە ترسان زۆر مەبدەئی خۆی پێشێل دەكا، لە ترسان خۆی دەفرۆشێ، لە ترسان شتی خراپ دەكات.

**٢)** هەروەها برسیەتی: بە هەمانشێوە، خاڵی لاوازی مرۆڤە.

**٣)** هەروەها نەزانیی (جهل)یش خاڵێكی دیكەی بێهێزی مرۆڤە.

ئنجا تەماشا بكە! لە بەرامبەری ئەواندا پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) كاریان لەسەر چی كردوە؟ لەسەر خاڵە بەهێزەكانی مرۆڤ، مرۆڤ بە چی مرۆڤە؟ بە عەقڵی و بە دڵی، عەقڵێكی هۆشیار و دڵێكی بێدار، پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) هاتوون:

١) خەڵك بە زانيارييی بەسوود، بە تێگەيشتن، بەتێگەيشتن لە خۆيان و لە خوا و بوونەوەر و دەوروبەر، هۆشيار بكەنەوە. دڵيان بێداركەنەوە بە يادی خوا، بە پەيوەنديی لەگەڵ خوا، بە بەندايەتيی بۆ خوا، چونكە پێغەمبەران (عليهم الصلاة والسلام) ئامانجەكەيان بەرزە و پاك و چاكە، بۆيە بۆ شێواز و ئامرازی باشيش دەگەڕێن، كە لە قەدەر ئەو ئامانجە بەرزە بێ. ئەوانی ديكەش، چونكە ئامانجەكەيان بريتيە لە خۆبەسەر خەڵكدا سەپاندن و خەڵك كردنە پەرستراو و پەروەردگار، دەبێ، هەوڵبدەن لە شێوەی ئەو ئامانجەش، ئامراز و شێواز پەيدا بكەن.

**دانا: كەواتە كۆمەڵگاش ئەركی ئەكەوێتە سەر شان، كە لەم سێ خاڵە بێهێزەوە: نەزانيی و ترس و تەماعەوە بگۆڕێ بۆ ئەو دوو خاڵە بەهێزەی كە جەنابت باست كردن؟**

**مامۆستا:** بەڵێ، ئەركی هەر كۆمەڵگايەكە، دەست لە كراسی دەرنەهێنێ و دەست بە خۆيدا بەرنەداتەوە، بەڵكو هەوڵبدا هۆشيار بێت، شارەزا بێ، چاوكراوە بێ، چونكە لە حەقيقەتدا ئينسان بە هۆشياريی دەتوانێ ئەو ترسە وەهمييەش كە ڕووی تێدەكا، بڕەوێنێتەوە ئينسان لە چی دەترسێ؟ لە ژياندا دوو شت خەڵك دەترسێنێ:



أ- هاتنی مردن.

ب- نەمانی بژێو، ئنجا ئەگەر ئينسان هۆشيار بێ، بەتايبەت ئەگەر ئيماندار بێ، دەزانێ كە خوای پەروەردگار ئەو دوو شتەی بەدەست خۆيەوە گرتوون و بۆ كەسی بەجێ نەهێشتوون :

١) ﴿ وَمَا كَانَ لِنَفْسٍ أَن تَمُوتَ إِلَّا بِإِذْنِ ٱللَّهِ كِتَٰبًا مُّؤَجَّلًا ﴾ [آل عمران: ١٤٥]

واتە: هيچ نەفسێك بۆی نيە بمرێ، (بشيەوێ بمرێ، هەر بۆی نييە بمرێ) مەگەر بە مۆڵەتی خوا، تۆماركراوە و دياريیكراوە، .

٢) ﴿وَمَا مِن دَآبَّةٍ فِي ٱلْأَرْضِ إِلَّا عَلَى ٱللَّهِ رِزْقُهَا﴾ [هود : ٦]

واتە: هیچ زیندەوەرێك لەسەر زەوی نیە، مەگەر ڕۆزیی و بژێوی لەسەر خوایە سبحانەو تعالی.

ئەو دوو شتەشن خەڵك دەترسێنن، کەواتە: ئینسان بەهۆشیاری دەزانێ کە: نە ژیانی بە دەست خەڵکە، نە ڕزقی بە دەست خەڵکە.

**یەکەم:** ئنجا خەڵك دەبێ لەسەر حەقی خۆی وەدەنگ بێت، لەسەر نانی خۆی، لەسەر ژیانی خۆی، ئەو ڕزق و ڕۆزییانە کە خوا دایناون، ئەو نازو نیعمەتانەی کە خوا دایناون بۆ هەمووانی داناون بەبێ جیاوازیی، وەك خوا لە سوورەتی (البقرة)دا دەفەرموێ:

﴿ هُوَ ٱلَّذِى خَلَقَ لَكُم مَّا فِى ٱلْأَرْضِ جَمِيعًا ﴾ [البقرة: ٢٩]

زانایان دەڵێن: وشەی: (جميعاً) هەمووتانە، پەیوەستە بە (لكم) بۆ ئێوە، وە، یانی (خلق لكم جميعاً ما في الأرض) ئەوەی لەسەر زەوییە بۆ هەموانتانی خوڵقاندوە، نەك بۆ ماڵێك و بۆ دوو ماڵ و، بۆ حیزبێك و دوو حیزب و، چەند کەسێك، بۆ هەمووتانی خوڵقاندوە، هەمووتان وەك یەك بەشتان پێوەی هەیە، کەواتە: تۆ کە بەشەکەت دەخورێ، عەیبە و حەیفە، بەشە خوراوەکەی خۆت، کە دوایی هەندێکت دەدرێتەوە، هەندێ لە ڕۆنەکە لەسەرت دەدرێتەوە، حەیفە تۆ لەبەرامبەریدا خۆت بفرۆشی، حەیفە لە بەرامبەریدا خاوەنی بوونی خۆت نەمێنی! خاوەنی ئیرادە و دەنگ و ڕەنگی خۆت نەمێنی! حەقی خۆتە و هەندێکیت دەدەنەوە، زۆری دەخۆن، هەندێکت دەدەنەوە، ئنجا مامەڵەشت لەگەڵدا دەکەن، دەڵێن: ئەو تۆزەت دەدەینەوە، بەمەرجێ کە تۆ لە بەرامبەریدا ببی بە هی ئێمە!!

**دووەم:** بەنسبەت ترسان لە مردنیشەوە: ئەگەر ئینسان بەڕاستیی خوا بناسێ، دەزانێ کە بەبێ مۆڵەتی خوا هیچکەس نامرێ:

﴿ وَمَا كَانَ لِنَفْسٍ أَن تَمُوتَ إِلَّا بِإِذْنِ ٱللَّهِ كِتَـٰبًا مُّؤَجَّلًا ﴾ (ال عمران: ١٤٥)

کەواتە: بۆیە پێغەمبەران (عليهم الصلاة والسلام) لێرەوە دەستیان پێکردووە:

أ- هۆشیارکردنەوەی خەڵك.

**ب**- بێداركردنەوەیان.

چونكه ئەگەر هۆشیار و بێدار بن، مل بۆ هیچ ستەمێك نادەن، هیچ ستەمێكی سیاسیی، یاخود ستەمێكی ئابووریی، ستەمە سیاسییەكە ملی بۆ نادەن، چونكه دەزانن خوا بەڕێوەبردنی ئەم سەرزەوییەی حەواڵەی مرۆڤەكان كردوە:

﴿وَإِذْ قَالَ رَبُّكَ لِلْمَلَٰٓئِكَةِ إِنِّى جَاعِلٌ فِى ٱلْأَرْضِ خَلِيفَةً﴾ [البقرة : ٣٠]

ئەو خەلیفەیەی خوا، مرۆڤە، ئەو مرۆڤەش نەیفەرمووە: فلان و فیسار، بەڵكو مرۆڤ بە گشتی، هەمووی خەلیفەی خوایە، كەواتە: هەموویان وەك یەك مافیان كۆمەڵگای خۆیان بەڕێوەبەرن، دوایی كۆمەڵگا كۆدەبێتەوە دەسەڵاتێك هەڵدەبژێرێ، حوكمڕانانێك هەڵدەبژێرێ و سپاردەی حوكمڕانییان پێ دەسپێرێ و مەرجیشیان بۆ دادەنێ، نابێ لەو مەرجانە لابدەن، ئەگەر لایاندا بۆی هەیە لایانبەرێ و سزایان بدات.

هەروەها بە نسبەت سەروەت و سامانەكەشەوە بەهەمان شێوە، خوا بژێوی داناوە بۆ هەموو لایەك و نابێ خەڵك و جەماوەر قبووڵ بكات، هیچ كەسێك ئەو ڕۆزیی و بژیوە، ئەو نازو نیعمەتانە كە خوا بۆ هەمووانی خوڵقاندوون، نابێ هیچ قبووڵ بكات، لێی داگیر بكرێ و لێی زەوت بكرێ و، دواییش مامەڵەی پێ لەگەڵدا بكرێ!!

**دانـــا: زۆر باشە لەم ئەڵقەیەدا كۆتا بنەمایەكی باس دەكەین، بنەمای بیست و دوو: (هەمیشە ستەمكار و خۆشگوزەرانانی گەندەڵ، دژی گۆڕانكاریی و چاكسازیی بوون) ئەمە ڕاستییەكی بێ چەندو چوونە، بەڵام هۆكارەكەی چییە؟**

**مامۆستا:** با سەرەتا دوو ئایەتان لەوبارەوە بێنین:

**١)** لە سوورەتی (الزخروف)دا، خوا دەفەرمویٚ:

﴿وَكَذَٰلِكَ مَآ أَرْسَلْنَا مِن قَبْلِكَ فِى قَرْيَةٍ مِّن نَّذِيرٍ إِلَّا قَالَ مُتْرَفُوهَآ إِنَّا وَجَدْنَآ ءَابَآءَنَا عَلَىٰٓ أُمَّةٍ وَإِنَّا عَلَىٰٓ ءَاثَٰرِهِم مُّقْتَدُونَ ﴿٢٣﴾﴾ [الزخرف : ٢٣]

خوا پێغەمبەری خاتەم موحەممەد (صلى الله عليه وسلم) دەدوێنێ و دەفەرموێ: هەر بەو شێوەیە بووە: لە پێش تۆدا لە هیچ ئاوەدانییەكدا وریاكەرەوەیەكمان نەناردوە مەگەر خۆشگوزەرانەكانی گووتوویانە: (بەو پێغەمبەرە، بەو وریاكەرەوەیە) ئەها ناوی لە پێغەمبەران ناوە: (نَّذِيرٍ)، چونكە پێغەمبەران هاتوون خەڵك وریا و هۆشیار بكەنەوە، بەڵام فیرعەونەكان هاتوون خەڵك نەفام بكەن، بێ ئاگا بكەن!

ئنجا خۆشگوزەرانەكان چییان گوتوە؟ (إِنَّا وَجَدْنَآ ءَابَآءَنَا عَلَىٰٓ أُمَّةٍ) ئێمە باب و باپیرانی خۆمانمان لەسەر ڕێیەك بینیوە {(أُمَّةٍ) لێرەدا بە مانای ڕێباز دێ} (وَإِنَّا عَلَىٰٓ ءَاثَٰرِهِم مُّقْتَدُونَ) ئێمە بە دوای شوێنەواری ئەواندا دەڕۆین، واتە: وشك و دۆگمابوون و لاساییكردنەوەی پێشینان و، قبوڵ نەكردنی شتی تازە و داهێنان و گۆڕانكاریی.

٢) لە سوورەتی (سبأ)دا دەفەرموێ: ﴿ وَمَآ أَرْسَلْنَا فِى قَرْيَةٍ مِّن نَّذِيرٍ إِلَّا قَالَ مُتْرَفُوهَآ إِنَّا بِمَآ أُرْسِلْتُم بِهِۦ كَٰفِرُونَ ﴿٣٤﴾ ﴾ [سبأ : ٣٤].

واتە: لەپێش تۆدا هیچ پێغەمبەرێكمان نەناردوە، مەگەر خۆشگوزەرانەكانی گوتوویانە: ئەوەی كە ئێوە پێی ڕەوانەكراون، ئێمە پێی بێ بڕواین.

ئنجا ئایا بۆچی خۆشگوزەرانەكان وادەكەن؟ چونكە پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) و شوێنكەوتووانیان، هاتوون ئەو كۆمەڵگایە كە خێروبێرەكانی تێدا قۆرخ كراون، دەسەڵاتی سیاسیی تێدا قۆرخكراوە، چەواشەكاریی و هەڵخەڵەتاندنی خەڵكی تێدا كراوە بە پیشە، بیگۆڕن، هەڵبەتە حوكمڕانە خۆسەپێنەكانیش لە بەرژەندییان نیە، خەڵك هۆشیار بێ و بێدار بێ و، خاوەنی ئیرادە و بوونی خۆی بێ، هەموو فیرعەونێك پێی خۆشە: خەڵك مەڕ بێ و، ئەویش لێیان خوڕێ، حوكمڕانە ستەمكارەكان ئەوە سروشتیانە: پێیان خۆشە خەڵك مەڕ بێ، وەك مەڕ پێش خۆیان بدەن بۆ لەوەڕگا و، ئێواران بیهێننەوە و، لەكاتی دۆشین دا بیدۆشن و ئەگەر پێویستیش بوو سەریان ببڕن و تەواو! هەروایان نەكردوە؟! هەموو ئەو خۆسەپێنانەی كە لە وڵاتاندا حوكمیان كردوە، بەدرێژایی مێژوو، تەماشایان

بكە: پێیان خۆش نەبووە خەڵك هۆشیار و ئاگادار بێ، پێیان خۆش نەبووە خەڵك ئازاد و ئازا بێ، پێیان خۆشە خەڵك ژێردەست و زەلیل و زەبوون بێ، بەو جۆرە مەداری وان باشتر دەسووڕێ، ئەگەر خەڵك بەوشێوەیە بێت، چاكتر بۆیان دەستەمۆ دەبێ، چاكتر بە قسەیان دەكا، هیچ رەخنە و ئیعتیرازی نابێ! هەموو جارێ نموونە دەهێنمەوە بە (معمر قذافي) كە چل و دوو (٤٢) ساڵ حوكمی كرد لە لیبیا، ئنجا كاتێك خەڵك لێی راپەڕی، دەیگوت: "مَن أنتم مَن أنتم، أنتُم جراثیم، أنتُم جرذان"، ئێوە كێن؟ ئێوە كێن؟ ئێوە میكرۆبن، ئێوە جورجن! دوایی دەیگوت : "نحن أحق بليبيا" ئێمە شایستەترین بە خاوەندارێتیی لیبیا! لیبیای وەك كێڵگەیەك دادەنا كە بەس خۆی خاوەنیەتی و دەبێ هەمووی لە خزمەتی ئەودا بێ! ئنجا ئەگەر خەڵك هۆشیار بێ و ئازادو بوێر بێ، ڕازیی نابێ كە كەسێك خۆی لێ بكا بە خاوەن و پەروەردگار و پەرستراو! بۆیە كێشەی گەورەی پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) لەگەڵ كێدا بووە؟ هەمیشە لەگەڵ ئەوانەدا بووە كە سامان (ثروة) و دەستەڵات (سلطة)یان داگیركردووەو قۆرخیان كردوە لە دەستی خۆیاندا، كێشەی پێغەمبەران هەمیشە لەگەڵ ئەوانەدا بووە، كە چاویان لەوە بووە كە خەڵك ژێردەست و زەبوون و زەلیل بێ، بەڵام پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) هاتوون: گوتوویانە: نەخێر، خەڵك دەبێ بەندەی خوا بێ، پێكەوە تەبا بن و هەموویان بەندەی خوا بن.

**دانـــا: كەواتە: مامۆستا! با بپرسم، ئێمەی مسوڵمان، ئەگەر لە كۆمەڵگەیەكی بەو شێوازەدا ئەم دوو تەبەقەیە دروست بوون، ئێمەی مسوڵمان ئەبێ لە كام بەرە بین، لە بەرەی خەڵك و جەماوەری ستەم لێكراودا بین، یان نەخێر لەو بەرەیەدا بین كە دەسەڵاتی هەیە؟ با من پرسیارەكە ئاوا لێبكەم: ئێستا لە هەرێمی كوردستان دا دەوڵەتداری و حوكمەتدارییەك هەیە، چەند حیزبێكی حوكمڕان هەن، ئێمە وەك كۆمەڵی ئیسلامیی، ئەبێ لە بەرەی خەڵك و جەماوەردا بین، یان بەرەی حیزبە حوكمڕانەكان دا؟!**

**مامۆستا:** ئێمە ئەگەر شوێنكەوتووی پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام)، بە گشتی و بەتایبەت پێغەمبەری خاتەم (صلى الله علیه وسلم) هەردەبێ لەبەرەی خەڵك و جەماوەری ستەمدیدە دابین، كێ شوێنكەوتووی پێغەمبەران

بووه؟ زۆرجار باسمانكردوه:

﴿ وَمَا نَرَىٰكَ ٱتَّبَعَكَ إِلَّا ٱلَّذِينَ هُمْ أَرَاذِلُنَا (١) بَادِىَ ٱلرَّأْىِ ﴾ [هود: ٢٧]

گەلی نووح به نووح دەڵێن: ئێمه نابینین شوێنت كەوتبێ مەگەر ئەوانەمان كەسادەو بێبایەخن (بَادِىَ ٱلرَّأْىِ) یانی: ئەوانەی كه ساده لەوحن، سەركێڵن، تێناگەن، هەمیشه فیرعەونەكانی خەڵكیان به سادەلەوح و نەفام و نەزان له قەڵەمداوە!

فیرعەونیش به مووسا و به قەومەكەی دەڵێ:

﴿ إِنَّ هَٰٓؤُلَآءِ لَشِرْذِمَةٌ قَلِيلُونَ ﴿٥٤﴾ ﴾ [الشعراء: ٥٤]

ئەوانه كۆمەڵ و كەمۆكەیەكی نابووتن. ئنجا پێغەمبەری خاتەم موحەممەد (صلى الله عليه وسلم) كێی لەگەڵ دا بوو؟ ڕەش و ڕووتەكانی مەككه، تاك و تەرایەكیش، له ساماندارەكان چونكه له ئیسلام دا چینایەتیی نیه بڵێی: دەوڵەمەند هەمووی خراپه و، هەژار هەمووی چاكه! نا، بەڵام دەوڵەمەندەكان به ژمارەی پەنجەكانی دەستێك دەژمێرران: ئەبوبەكری صدديق و عوسمانی كوڕی عەففان و عەبدوڕەحمانی كوڕی عەوف، بوون، كه له مەككه ئیمانیان به پێغەمبەری خاتەم (عليه الصلاة والسلام)، هێنا ئەویدیكه هەموویان ڕەش و ڕووت و نەدارو هەژار بوون، چونكه ڕەش و ڕووت و هەژار و نەدارەكان، بوونی خۆیان، ڕێز و كەرامەتی خۆیان، مافەكانی خۆیان لەلای پێغەمبەری خاتەم (عليه الصلاة والسلام) دەبینیەوە، لەو ئیسلامەدا كه دەفەرموێ:

﴿ إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِندَ ٱللَّهِ أَتْقَىٰكُمْ ﴾ [الحجرات: ١٣]

بەڕێزترتان لەلای خوا پارێزكارترتانه، نەیفەرمووە: (أغناكم)، نەیفەرمووە: (أقواكم)، نەیفەرمووە: (أبيضكم)...هتد، بەڵكو فەرموویەتی: (أَتْقَاكُمْ) پارێزكارترتان، چونكه هەژار هەیه دەتوانێ بەتەقواتر بێ له دەوڵەمەند، ئافرەتێك

---

(١) أراذل كۆی (أرذل)ە، یانی: كەسانی بێبایەخ و هەرچیی و پەرچیی!!

دەتوانێ بە تەقواتر بێ لە پیاوێك، گەنجێك دەتوانێ بە تەقواتر بێ لە بە تەمەنێك، نەخوێندەوارێك دەتوانێ بە تەقواتر بێ لە خوێندەوارێك، بێدەستەڵاتێك دەتوانێ بە تەقواتر بێ لە دەسەڵاتدارێك، خوا پێوەرێكی داناوە هەموو كەس بگرێتەوە، مەیدانێك هەموو كەس دەتوانێ پێشبڕكێیی تێدا بكات، ئنجا ڕەش و رووتەكان ماف و بوون و كەرامەت و ڕێزی خۆیان لەو پەیامەدا دەبینیەوە، ئەدی حوكمڕانە خۆسەپێن و دەوڵەمەندەكان؟ حوكمڕان پارەدارە ناشەرعییەكان، ئەوانەی كە چاویان لەوە بوو ئەو بەزم و بازاڕەیان لێ تێك نەچێ، زەرەری خۆیان لەو پەیامەدا دەبینیەوە، بۆ وێنە: ئەبو جەهل كاتێ كە بڕوا ناهێنێ بە پێغەمبەری خاتەم (علیه الصلاة والسلام)، نەچری كوڕی حاریث لێی دەپرسێ: (یا أبا الحكم) ! (ئەبوجوهل ئەبا حەكەمیان پێ گوتوە، یانی: پیاوی عاقڵ) تۆ پێت وایە موحەممەد (صلی الله علیه وسلم) ڕاست دەكا، یان درۆ دەكات؟ ئەویش دەڵێ: موحەممەد هەتا تەمەنی چل (٤٠)ساڵیی، ئێمە درۆمان لێ نەبیستوە، ئنجا دوای ئەوەی كە مووی سپی لە لاجانگی دەركەوت، تۆ بڵێی بەناوی خواوە درۆ بكا؟ دەزانم ڕاست دەكا، ئەدی بۆچی ئیمانی پێ ناهێنێ؟ دەڵێ: (بنوعبدالشمس) كە عەشیرەتی ئەبوجەهلە، لەگەڵ (بنو هاشم) كە عەشیرەتی پێغەمبەرە (صلی الله علیه وسلم)، (لە سەردەمی نەفامییدا) (كُنا كَفَرسِي رِهانٍ) وەك دوو ئەسپ كە پێكەوە پێشبڕكێ دەكەن، ئێمە وابووین، ئەوان شتێكیان دەكرد، ئێمە شتێكمان دەكرد، ئەوان دەستكەوتێكیان دەبوو، ئێمەش دەستكەوتێكمان دەبوو، ئێستا ئەوان دەڵێن: ئێمە پێغەمبەرێكمان لەنێودایە، ئێمە پێغەمبەرێكی دیكە لە كوێ بێنین؟ دەبێ عەشیرەتی ئێمە بە دوای عەشیرەتی ئەوان بكەوێ، كەواتە: ئێمە دەبێ لە كوێ بین؟ ئێمە دەبێ لەسەر ئەو خەتە بڕۆین كە پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) لەسەری ڕۆیشتوون كە بریتیە لە پارێزگارییكردن و بەرگریی كردن لە مافی هەژارن و نەدارن و مافخوراو و ماف پێشێلكراوان.

**دانــا:** كەواتە: هەڵوێستە سياسييەكانى مامۆستا عەلى باپير وەك كەسى يەكەمى كۆمەڵى ئيسلاميى و، هەروەها كۆمەڵى ئيسلاميى بە تەواوى نوێنەرەكانيەوە لە پەرلەمان و حكوومەت و ئەنجومەنە خۆجێيەكان دا، لەوەوە سەرچاوەى گرتوە، لە پاشخانە دينييەكەوە، سەرچاوەى گرتوەو هەميشە لە بەرەى خەڵكدان؟

**مامۆستا:** بەدڵنيايى وايە، هەڵبەتە مەيدانى (درۆ)ش كورتە، بەڵام ڕاستيى) لە مەيدانى درێژدا تاقيى دەكرێتەوە، با هەر كەسێك گومانێكى هەيە لەوەدا با تەماشاى بكات، دنيا دەگۆڕێ ئێمە ناگۆڕێين، شاخ دەجووڵێ، ئێمە ناجووڵێين، چونكە ئێمە هەڵوێستەكانمان لە عەقيدەمانەوە سەرچاوە دەگرن، لە ڕقى كەس نيەو لە خۆشەويستيى كەسيش نييە، ئێمە وەك ديندارێى ئەو هەڵوێستە سياسييە دەنوێنين، بۆ وێنە:

١) دواى ئەوەى خوا دەفەرموێ: ﴿ وَٱلْأَرْضَ وَضَعَهَا لِلْأَنَامِ ﴿١٠﴾ ﴾ [الرحمن: ١٠] خوا زەوى دروستكردوە و بۆ تێكڕاى خەڵكى داناوە.

٢) هەروەها دەفەرموێ: ﴿ هُوَ ٱلَّذِى خَلَقَ لَكُم مَّا فِى ٱلْأَرْضِ جَمِيعًا ﴾ [البقرة: ٢٩] واتە: (خوا) ئەو كەسەيە كە ئەوەى لە زەمين دايە بۆ هەمووتانى دروستكردوە.

٣) هەروەها فەرموويەتى: ﴿ كَىْ لَا يَكُونَ دُولَةًۢ بَيْنَ ٱلْأَغْنِيَآءِ مِنكُمْ ﴾ [الحشر: ٧] واتە: با سەروەت و سامان لە دەست دەوڵەمەندەكانتاندا كورت هەڵ نەيەت.

وەختێ ئەو ئايەتانە دەبينن، پێغەمبەرى خاتەم (عليه الصلاة والسلام) دەبينين وەك لە صەحيحى بوخارييدا هاتوە: ڕۆژێ وەفدێك هاتن، خەڵكێكى هەژار و نەدار و ڕەش و ڕووت بوون، نەداريیان بە پێوە دياربوو (پۆشاكيان، خواردنيان) فەرمووى: (مَن كان عنده فضل ظهرٍ، فَلْيَعُدْ به على مَن لا ظهر له، ومَن كان له فضل زادٍ فَلْيَعُدْ به على مَن زادَ لا له، فذكر مِن أصناف المال ما ذكر حتى ظَنّنا أنه ليس لأحد منا حق في فضلٍ) واتە: فەرمووى: هەركەسێ وڵاخى زيادى پێيە، با بيدا بەوەى نيەتى و، هەر كەسێ خۆراكى زيادەى پێيە، با بيدا بەوەى نيەتى

{هەركەسێ پۆشاكی زیادەی پێیە، بابیدا بەوەی نیەتی}[1]، هەموو جۆرەكانی ماڵ و سامانی باسكرد، هەتا ئێمە یەقینمان بۆ پەیدا بوو، كە هیچ كەس بۆی نیە شتی زیادەی هەبێت.

یانی: ئەوەی كەشیوعییەت خەونی پێوە دەدی، پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) بە كردەوە لەسەر ئەرزی واقیع جێبەجێی كردوە.

ئنجا كاتێك دەزانین خوا ئاوا دەفەرموێ و پێغەمبەری ئەكرەم (علیه الصلاة والسلام) ئاوای كردوە، ئێمەش لەو بنەماو پرەنسیپە شەرعییانە و ئینتیلاق دەكەین، نە لە رقی كەسە و، نە لە خۆشەویستیی كەسە، لەوەوەیە كە دینەكەمان وا دەفەرموێ، ئەوەش عەقڵی سەلیم و فیترەتی ساغ پشتگیریی دەكەن.

**دانــا: بەڕێز مامۆستا عەلی باپیر، نووسەر و رووناكبیر! سوپاس بۆ ئەوەی كە لەم ئاڵقەیەدا وەڵامی پرسیارەكانی ئێمەت دایەوە.**

**مامۆستا:** سوپاس بۆ ئێوەش كاكە دانا، دووبارە بەخێر بێن.

**دانــا: بینەرە بەڕێزەكان! تاكو ئەڵقەیەكی نوێی بەرنامەكەمان، هەموو لایەك بەخوای گەورە ئەسپێرین، كوردستانێكی ئاوەدان و ئارام بۆ هەموو لایەك، خواتان لەگەڵ.**



---

(١) نێوان كەوانەكان {} زیادەی خۆمەو فەرموودەكە دەیگەیەنێ.

# ئاڵقەی بیستەم

بنەمای بیست و سێیەم: نیشتەجێ بوون لەشوێنی ستەمکاران داو، دووبارە کردنەوەی کردەوە وڕەفتارەکانیان، نیشانەیەکی زەقی حوکمڕانانی خۆسەپێن و قۆرخکارە.

بنەمای بیست و چوارەم: هاندان و وروژاندنی خەڵك و جەماوەرو چەواشەکردنیان، لەبەرانبەر هەوڵدان بۆ پاکسازیی‌و چاکسازیی، نەریتێکی کۆنی قۆرخکەرانی دەستەڵات‌و سامانە.

بنەمای بیست و پێنجەم: داهاتوو بۆ پارێزکارانی پاکسازیی و چاکسازییکارەو، سەرەنجامی دنیا و دوارۆژی ستەمکاران، شوومە.

ameer.maktab@yahoo.com

 /AliBapir  /AliBapir  /MediaAmeerOffice

www.alibapir.net

**دانـــا:** بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان، سڵاوتان لێ بێ بینەرانی ئازیز و خۆشەویست! خۆم بە خۆشحاڵ ئەزانم كە خوای پەروەردگار دەرفەتی پێبەخشینەوە لە كۆتا ئاڵقەی بەرنامەی بە دانایی دا لە بابەتی: (بۆ چاككردنی ئەم دۆخەی هەرێم، با گوێ لە قورئان بگرین) لە خزمەت میوانە هەمیشەییەكەم جەنابی مامۆستا عەلی باپیردا، بە ئێوەی ئازیز و خۆشەویست شاد ئەبین، لەم ئاڵقەیەدا سەرەتا بنەمای بیست و سێ باس ئەكەین، كە مامۆستا نووسیوەتی بەناوونیشانی: (نیشتەجێبوون لە شوێنی ستەمكاراندا و دووبارەكردنەوەی كردەوە و ڕەفتارەكانیان، نیشانەیەكی زەقی حوكمڕانانی خۆسەپێن و قۆرخكارە) لێرەوە ئەچینە ناو بەرنامەكە و بزانین جەنابی مامۆستا مەبەستی چییە لەم بنەمایە؟

مامۆستا گیان! سڵاوی خوات لێ بێ.

**مامۆستا:** سڵاوی خۆ لە جەنابیشت و لە هاوكارانیشت و بەخێربێن یاخوا.

**دانـــا:** زۆر سوپاس، وەك لە پێشەكییەكەدا ئاماژەم پێكرد، كە لەسەر بابەتی (بۆ چاككردنی ئەم دۆخەی هەرێم با گوێ لە قورئان بگرین!) پشت بە خوا ئەمە كۆتا ئاڵقەی بەرنامەكەمان ئەبێ، ئەم بنەمای بیست و سێیە، كە ئاماژەم پێكرد مامۆستا مەبەستت پێی چییە؟

**مامۆستا:** ئەم بنەمایە كە بنەمای بیست و سێیە، كە دەڵێم: (نیشتەجێبوون لە شوێنی ستەمكاراندا) مەبەستم ئەوەیە كە چاولێكردنی حوكمڕانان و لاساییكردنەوەیان، بۆ حوكمڕانانی خۆسەپێنی پێشوو و بە ڕێی واندا ڕۆیشتنیان، كە ستەمیان كردووەتە پیشە، ئەو ڕەفتارە ئەوانی دوایەش بە هەمان دەرەنجامی تاڵ و شووم دەگەیەنێ، كە ئەوانی پێشی پێی گەیشتوون، ئەمەم لەم دوو ئایەتە موبارەكە وەرگرتوە، كە لە سوڕەتی (ابراهیم)دا، خوا سبحانه وتعالی دەفەرموێ:

﴿ وَسَكَنتُمْ فِي مَسَٰكِنِ ٱلَّذِينَ ظَلَمُوٓاْ أَنفُسَهُمْ وَتَبَيَّنَ لَكُمْ كَيْفَ فَعَلْنَا بِهِمْ وَضَرَبْنَا لَكُمُ ٱلْأَمْثَالَ ﴿٤٥﴾ وَقَدْ مَكَرُواْ مَكْرَهُمْ وَعِندَ ٱللَّهِ مَكْرُهُمْ وَإِن كَانَ مَكْرُهُمْ لِتَزُولَ مِنْهُ ٱلْجِبَالُ ﴿٤٦﴾ ﴾ [إبراهيم : ٤٥-٤٦].

خوا سبحانه وتعالی لەم دوو ئایەتەدا ڕوو دەكاتە دەسەڵاتدارانێك كە خۆیان بەسەر خەڵك و كۆمەڵگاكاندا سەپاندوە، دەفەرمویَ: ﴿ وَسَكَنتُمْ فِى مَسَٰكِنِ ٱلَّذِينَ ظَلَمُوٓا۟ أَنفُسَهُمْ ﴾ ئێوە لە هەمان جێگا و لە هەمان خانووبەرەدا كە ستەمكارانی پێش ئێوە تێیاندا نیشتەجێبوون، ئێوەش هەر لەوێدا نیشتەجێبوون، ﴿وَتَبَيَّنَ لَكُمْ كَيْفَ فَعَلْنَا بِهِمْ ﴾ بۆشتان دەركەوتوە، كە چیمان بەوان كردوە، ﴿وَضَرَبْنَا لَكُمُ ٱلْأَمْثَالَ ﴾ وێنەشمان بۆ هێناونەوە، ﴿ وَقَدْ مَكَرُوا۟ مَكْرَهُمْ ﴾ ئەوانەی پێش ئێوە فێڵی خۆیان كرد، ﴿وَعِندَ ٱللَّهِ مَكْرُهُمْ ﴾ فێڵی ئەوان هەر لەلای خوا بوو، لەبەردەستی خوا بوو، لە ژێر كۆنترۆڵی خوادا بوو، ﴿وَإِن كَانَ مَكْرُهُمْ لِتَزُولَ مِنْهُ ٱلْجِبَالُ﴾ هەرچەندە بە تەئكید فێڵەكەشیان هێندە بەهێز بوو، كە چیاكان لە شوێنی خۆی لابەریَ.

من كە تەماشای واقیعی ئێستای هەرێم و عێراق دەكەم، ئەو بنەمایەم لەوێوە هەڵهێنجا، چونكە تەماشا دەكەم كاتی خۆی ڕژێمی بەعس چۆنی حوكم دەكرد:

**١)** حیزبی كردبوو بە هەمەكارەی وڵات و، هەركەسێك ئینتیمای بۆ حیزبی بەعس نەبووایە، مەگەر چۆن، ئەگەرنا مەحرووم دەبوو لە زۆر پێگەو پلەی گرنگ و هەستیار.

**٢)** صەددام لە سەرووی سوڵتەی سیاسییەوە بوو و، ئەوانەش كە لە دەوری بوون، خۆیان بە خاوەنی خەڵكەكە دەزانی، ئنجا ئەگەر شەڕیان پیَ بكەن، ئەگەر بە كوشتیان دەن، ئەگەر هەرچییان لیَ بكەن، وەك ئەوەی ئەوان خاوەنیان بن و، ئەو خەڵك و وڵاتەیان بە موڵكی خۆیان دەزانی و، سامان و ئیمكانیاتی ئەو وڵاتەشیان لە پێناو تێركردنی غەریزەكانی خۆیان و دابینكردنی بەرژەوەندییەكانی خۆیاندا بەكاردەهێنا!

كە تەماشای بەرپرسانی ئەم وڵاتەم كرد، (ئەم وڵاتە وەك عێراق بە گشتی و هەرێم بەتایبەتی) كە من چوار ساڵیش لە بەغدا بووم، تەماشام دەكرد كۆشكەكانی صەددام شەڕ بوو لەسەریان، لە نێوان بەرپرسانی چینە سیاسییەكەی

ئەمڕۆی عێراقدا، بە هەرێمیشەوە، ئەویان لە فڵان کۆشکەدا و، ئەو حیزبە لە فڵان کۆشکەدا و، ئەویدیکە لە فڵان کۆشکەدا، لێرەش —لە هەرێم- سەرەتا لەو خانوو و کۆشك و جێ و ڕێیانەی کە ڕژێمی پێشێ بەجێی هێشتبوون، هەرکەسە چووە شوێنێکەوە، بەڵام دوایی بەوە ڕازیی نەبوون و زۆریشیان زیادە خستە سەری.

ئەوە تەفسیری ڕواڵەتی مانای ئایەتەکە: ﴿ وَسَكَنتُمْ فِي مَسَٰكِنِ ٱلَّذِينَ ظَلَمُوٓاْ أَنفُسَهُمْ ﴾ [إبراهيم: ٤٥] بەڵام زانایان دەڵێن: ئەم ئایەتە وەك چۆن مانایەکی ڕواڵەتیی هەیە، مانایەکی مەعنەویی و قووڵیشی هەیە.

واتە: ستەمکارەکانی پێشەوە چۆنیان دەکرد، ئێوەش هەرواتان کرد، ئێوەش عادەتی ئەوانتان کردە پیشە، ئێوەش بەڕێی واندا ڕۆیشتن، ئێوەش هەڵسوکەوت و ڕەفتارەکانی ئەوانتان ڕەچاو کرد.

ئنجا بەپێی هەردوو ماناکەی، هەم بە مانا ڕواڵەتییەکەی و هەم بە مانا قووڵ و مەعنەوییەکەشی: فیعلەن حوکمڕانان و دەسەڵاتدارانی هەرێمیش و عێراقیش، بەداخەوە دەڵێم: ئەم ئایەتەیان بەسەردا دەچەسپێ ﴿ وَسَكَنتُمْ فِي مَسَٰكِنِ ٱلَّذِينَ ظَلَمُوٓاْ أَنفُسَهُمْ ﴾ [إبراهيم: ٤٥]، لەجیاتی ئەوەی ئێمە بێنین، ئەو خەڵکەی خۆمان هۆشیاریکەینەوە: کاتی خۆی ڕژێمی بەعس ئاوایکردوە، با ئێمە پێچەوانەکەی بکەین: ڕژێم کاری دەکرد لەسەر چەواشەکردنی خەڵك، با ئێمە پێچەوانەی ئەوە بکەین.

کاری دەکرد لەسەر ترساندنی خەڵك، با ئێمە بە پێچەوانەی ئەوەوە، ڕەفتار بکەین.

ڕژێمی بەعس کاری دەکرد لەسەر ئەوە کێ ئینتیمای هەبێ بۆ حیزبەکەی خۆی، دەستی کراوە و ئاوەڵا بێ، کێ ئینتیمای نەبێ، بە هاووڵاتیی پلە دوو و سێ دابنرێ، با ئێمە پێچەوانەی ئەوە بکەین، بەڵام بە داخەوە، چ لێرە، لە هەرێم و چ لەسەر ئاستی عێراقیش، هەمان سیناریۆ، هەمان شێوەی حوکمڕانیی دووبارە بووەوە.

كه ڕژێمی بەعس نەوت و ئیمكانیاتی عێراقی بەكاردەهێنا، بۆ ئەو شەڕە دۆڕاوانەی كه دەیكردن، لەگەڵ ئێران و لەگەڵ كوێت و لەگەڵ كوێ و لەگەڵ كوێ، بۆ له نێوخۆش كۆنترۆڵكردنی خەڵك! لێرەش موڵك وماڵی گشتی ئەگەر بۆ شەڕیش بەكارنەهێنرابێ، بەكارهێنراوە بۆ بەرژەوەندییە ناشەرعییەكانی خەڵكێكی كەم. حیزب و خزم، لەسەر حیسابی خەڵكی دیكە.

بەڵێ زۆر خاڵی وێكچوو هەن، له نێوان شێوەی حوكمڕانیی دوای ڕاپەڕیندا، لەسەر ئاستی عێراق و، شێوەی حوكمڕانیی پێشوو، دوایی خوا دەفەرموێ: (وَتَبَيَّنَ لَكُمْ كَيْفَ فَعَلْنَا بِهِمْ ) [إبراهيم: ٤٥] بۆتان دەركەوت چیمان بەوان كرد، واتە: چیمان بەوان كرد، ئەگەر ئێوەش لەسەر هەمان ڕێ و شوێنی ئەوان برۆن، هەمان بەڵاشتان بەسەر دێ، (وَضَرَبْنَا لَكُمُ ٱلْأَمْثَالَ ) [إبراهيم: ٤٥] وێنەشمان بۆ هێناونەوە بۆ ئەوەی عیبرەتتان لێ وەربگرن.

دوایی دەفەرموێ: ( وَقَدْ مَكَرُوا۟ مَكْرَهُمْ ) [إبراهيم: ٤٦] ئەوان زۆر پیلانیان گێڕان، زۆر نەخشەیان دانان، (وَعِندَ ٱللَّهِ مَكْرُهُمْ ) [إبراهيم: ٤٦] بەڵام پیلانەكەیان سەرەنجام هەر لەبەردەستی خوادایە، واتە: ئێوەش ئەی حوكمڕانانی ئەمڕۆ! ئەو پیلانانەی دەیانگێڕن، له هەڵبژاردنەكاندا تەزویر و فرت و فێڵ دەكەن، وەلائی خەڵك دەكڕن، چاو له خەڵك سوور دەكەنەوە، خەڵك دەكوژن، خەڵك دەگرن، تەخشان و پەخشانی ئیمتیازە ماددیی و مەعنەویی یەكان، دەكەن، بۆ كڕینی خەڵك.

(وَعِندَ ٱللَّهِ مَكْرُهُمْ ) بەڵام هەمووی ئەوە له ژێر كۆنترۆڵ و هەیمەنەی خوادایە، (وَإِن كَانَ مَكْرُهُمْ لِتَزُولَ مِنْهُ ٱلْجِبَالُ ) [إبراهيم: ٤٦] ئەگەر فێڵەكەیان واش بووبێ، چیاش هەڵقەنێ، بەڵام سەرەنجام هەر بەندەن لەبەردەستی خوادا، كەواتە: ئێوەش مەغروور و لەخۆبایی مەبن، بەو ئیمكانیەتەی كه لەبەردەستاندایە، بەو سەروەت و سامانە، بەو دەسەڵاتە سیاسییە، بەو خێروبێرەی كه قۆرختان كردوە، پێی لەخۆبایی مەبن، چونكە خەڵكی پێش ئێوەش ئەو شتانەیان لەبەردەستدا هەبوون، بەڵام سەرەنجامێكی شوومیان هەبوو، ئێوە پەند لەوان وەربگرن و، هەوڵبدەن پەند له خەڵك وەرگرن، نەك ببەنە پەندی خەڵكی.

**دانــا: بەڵێ، مامۆستا! لەلای جەنابیشت ئاشكرایە، لە ژمارەیەك هەم وڵاتی دراوسێ و هەم وڵاتانی ئەوڕووپیش دا زۆرێك لەو كۆشك و تەلارانەی دەسەڵاتدارە ستەمكارەكانی سەدەكانی ڕابردوو، وەكو مۆزەخانەیان لێهاتوە، نەك بچنە ناوی؟**

**مامۆستا:** بچۆ بۆ ئێران، كۆشكەكانی شا، كەس پڕمۆڵێكی لێ دەست نەداوەتێ، هەروەك خۆیان هێشتوویانن و خەڵك تەماشایان دەكەن، بگرە بوونە سەرچاوەی داهاتێكی گەورە بۆ وڵاتەكەشیان، بچۆ بۆ توركیا، لە ئەستەمبوڵ لە تۆپ قاپی، لە شوێنەكانی دی، بچۆ بۆ هەر وڵاتێكی دیكە، هەموو كۆشكەكانی ئەو شوێنانەی دەسەڵاتدارانی پێشوویان، مەگەر چۆن، ئەگەرنا هەموویان كردوو بە مۆزەخانە، خەڵك دەچێ تەماشایان دەكا، دەرسیان لێوەردەگرێ، هەرِەمەكانی میصر.

ئنجا دەڵێم: بە داخەوە پەندوەرنەگرتن لەوانەی لەپێش تۆدا، هەڵەیان كردووەو دووبارەكردنەوەی هەڵەی ئەوان، بە هەمان سەرەنجامت دەگەیەنێ، كە ئەوان بوویانە، بەڵام بەشەر زۆر عەجایبە، زاكیرەی زۆر بێهێزە یاخود ئەو دەسەڵات و سەروەت و سامانە، شیرینییەكەی وایە، كە ئەو خەڵكە چاوی دەبەسترێ، (حُبُّكَ للشيءِ يُعمي ويُصم) خۆشەویستیت بۆ شتێك، كوێرت دەكا و كەڕت دەكات.

ئەگەرنا دەبووایە پەند وەربگیرێ، باشە ئاخر دوێنێ ئێمە گلەیی چیمان لە ڕژێمی بەعس دەكرد، ئێستاشی لەگەڵدا بێ، ئێمە هەر باسی هەڵەو تاوان و ستەمەكانی ڕژێمی بەعس ڕووخاو و ئاوە و ئاوە چوو، دەكەین، بۆیە نابێ هەڵەكانی ئەوان دووبارە بكەینەوە، نابێ ئەو شتانەی ئەوان پێیان ناشیرین بوون و ڕەخنەیان پێ لەوان دەگرین، لە خۆماندا دووبارەیان بكەینەوە: (لا تنه عن خُلقٍ وتأتي مثلهُ عارٌ عليكَ إذا فعلتهُ عظيمٌ) ڕێگریی لە ئاكارێك مەكەو، خۆیشت هەر هەمان شێوە بكەی، ئەگەرنا ئەوە عەیبەیەكی گەورەیە دێتە سەرت.

**دانــا: مامۆستا! وەك خۆشت ئاماژەت پێكرد، بەڵام ئێستا لەوانەیە بینەرێك بپرسێ: باشە کەسی عاقڵ بۆچی مێژووی پێش خۆی دووبارە ئەکاتەوە؟ یان شتێك کە تاقییکراوەتەوە، بۆچی جارێکی دیکە تاقیی ئەکاتەوە؟ بۆ ئەمانە پەند وەرناگرن، بە بڕوای تۆ؟**

**مامۆستا:** وەڵڵا وەك گوتم: ئەم دەسەڵات و سەروەت و سامانە حەرامە، شیرینایەتی هەیە، پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) فەرموویەتی: (الدنیا حلوة خضرة وإن الله مستخلفكم فیها، فینظر كیف تعملون) واتە: ژیانی دنیا سەوز و شیرینە (واتە: ڕەنگەکەی جوانە و تامەکەی خۆشە) خواش ئێوەی لەوێدا کردووەتە جێنشین و تەماشاتان دەکا داخۆ چۆن ڕەفتار دەکەن! پێموایە بە پلەی یەکەم پەیوەندیی توندوتۆڵ لەگەڵ خوادا سبحانەو تعالی، ئەوە بەڕاستیی پارێزەری مرۆڤە، لەوە کە بە سەروەت و سامان هەڵخەڵەتێ، بە دەسەڵات لەخۆ بایی بێ، ئەگەرنا مرۆڤ، کە پەیوەست نەبوو بە خواوە، وەك دەڵێن: (بە تۆزە ئاوێکی دەکەوێتە مەلە) ئەگەرنا ئەم وڵاتەی ئێمە بەتایبەت ئەم هەرێمە، وەك کەڵەکی سەر ئاوێ وایە! زۆر جار گوتوومە: قەززافیی کە لەخۆی بایی بوو، تۆزێك ڕێی تێدەچوو، صەددام تۆزێ ڕێی تێدەچوو خۆی بە قائیدی عەرەبان دەزانی، ئیمکانیاتێکی زۆر، دەوڵەتێکی خاوەن سیادە، بەڵام هەرێمێك: کە نە ژێرخانێکی ئابووریی وامان هەیە لەسەر پێی خۆمان بوەستین، دەزانم نەوتمان هەیە، بەڵام کوا ژێرخانە ئابوورییەکە کە لەسەر پێی خۆت بوەستی، تۆ بۆ هەموو شتێ پێویستیت بە دەرەوەیە.

ئنجا نە هێزێکی سەربازیی بە دامەزراوە کراومان هەیە، کە ئینتیمای بۆ نیشتمان بێ و بۆ هەموان وەك یەك بێ، نە هێز و پێزێکی وامان هەیە کە لە خەڵك بێ منەت بین! کەواتە: بۆچی دەبێ لەخۆمان بایی بین! بەڵام بە بۆچوونی من: ئینسان کە ئیمانی نەبوو، یان ئیمانەکەی بێ هێز بوو، زوو دەکەوێتە ژێر کاریگەریی دنیا و تەماع و سەروەت و سامان و هی وا هەیە کە دەوری خۆی بە قەرەباڵغیی بینی، یەکسەر خۆی لێ دەگۆڕێ، هی وا هەیە چوار دیناری زیادەی لە گیرفانی خۆیدا بینی، یەکسەر لەخۆی بایی دەبێ! پێموایە ئەگەر دڵ پەیوەست بێ بە خواوە، هەرگیز ئاوا لە کەوڵی خۆی دەرناچێ، بۆ نموونە:

داود و سولەیمان صەڵات و سەلامی خوایان لەسەر بێ، هەردووكیان پێغەمبەر بوون و، پادشاش بوون، تەماشا بكە! چەند خۆ بەكەمگر بوون، چەند خاكیی بوون، چۆن ئەو ئیمكانیەتەی لەدەستیاندا هەبوو، بۆ هیدایەتی خەڵك بەكاریان هێناوە! بۆ بەختەوەركردنی خەڵك، نەك بۆ خۆسەپاندن و دەسەڵات ڕانان بەسەر خەڵكدا و خەڵك كردنە كۆیلە! شاژنی (سبأ) كە سولەیمان (علیه الصلاة والسلام) نامەی بۆ دەنێرێ و دێ، دەڵێ: چی؟ لە كۆتایی چیرۆكەكەدا شاژن (ملكە)ی (سبأ) كە هەندێ دەڵێن: ناوی (بەڵقیس) بووە، دەڵێ:

﴿ وَأَسْلَمْتُ مَعَ سُلَيْمَـٰنَ لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَـٰلَمِينَ ﴾ [النمل : ٤٤]

لەگەڵ سولەیماندا بۆ خوای جیهانەكان ملكەچم، واتە: سولەیمانیش بۆ خوا ملكەچە، منیش لەگەڵ ئەودا بۆ خوا ملكەچم، چونكە لەو ڕۆژگارەدا گەلی (سبأ) خۆر پەرست بوون.

پێموایە ئەوەی دەبێتە پارێزەری مرۆڤ، لە بوغرایی و خۆبەزلگریی ئیمان و خواناسی یە.

لێرەدا ڕەنگە یەكێ بپرسێ: ئەدی بۆچی ئەو وڵاتە ئەوروپییانە دینێكی ڕاست و دروستیشیان لەبەردەستدا نیە و ئایینی مەسیحیی شێوێنراو، تەبەننی دەكەن و كاریگەرییشی زۆر كەم ماوە لەسەر ژیانیان؟ كەچی ژیان و گوزەرانی خۆشیان باش ڕێكخستووە؟! دەڵێین ڕاستە، بەڵام:

**١)** ئەوان لە ئەنجامی ئەزموونی تاڵدا پەندیان وەرگرتوە لە ڕابردوو.

**٢)** خەڵكەكەش هۆشیارە، حوكمڕانێك خەت لاربكات، لێی قبووڵ ناكەن، خۆپیشاندان دەكەن، مان دەگرن.

**٣)** ئەوانە هەندێك شت لایان بووەتە باو و كلتوورێكی ڕۆچووی، كۆمەڵایەتیی و سیاسیی و ڕۆشنبیریی، بۆ وێنە: لەوێ خەڵك ئۆتۆماتیكی شت لەسەر جادە فڕێ نادا.

ئۆتۆماتیكی لەسەرەدا ڕادەوستێ ئەگەر وەزیر بێ، هەر كەس بێ.

ئۆتۆماتيكى كه ماوەى حوكمڕانييەكەى تەواو دەبێ دەچێتەوە ماڵێ و نايكاته هەراو وه ناچێ به كورسييەكەيەوه بچەسپێ.

بەڵام ئەو حوكمڕانانەى ئەم وڵاتانەى ئێمه، بەگشتى قسه دەكەم، هەرێم و عێراق و وڵاتانى ديكەش، حوكمڕانەكان نەيانهێشتوه ئەو شتانه ببنه كلتوور، خەڵكيان نەك لەسەر پەروەردە نەكردوون، بەڵكو خەڵكيان بەپێچەوانەى ئەوەوه پەروەردە كردوه، حوكمڕانه ستەمكارو، خۆسەپێنەكان، پێيانخۆشه خەڵك هەمووى لەسەر مەزهەبى مەڕ بێ مەڕ، مەڕ پێش خۆتى بده، دەڕوا، نايانەوێ بەشەر بەشەربێ، چونكه پێيانوايه كه ئەوان شتێكى جيان له خەڵك، ئەوان زيادەيان هەيه لەسەر خەڵك و خەڵك قەرزداريانه، خەڵك هەر ئەرك و واجبى لەسەرەو، هيچ مافێكى نيه!!

**دانـا: يەكێ له لايەنه سياسييەكان ئەگەر گوێى لەم قسانه بێ، لەو حيزبه دەسەڵات و حوكمڕانانه، كه دايمەن ئاڕاستەى ڕەخنەكان لەوانه، ئەڵێن: ئەگەر ئێوەش بێنه سەر حوكم، بەهەمان شێوه ئەكەن، يان قسەيەك هەيه لەوانەيه جەنابيشت بيستبێتت، ئەڵێ: وازبێنه ئەوان تێريان خواردوه، بەخوا ئەمانەى تر بچنه ئەوێ، هەتا وەك ئەوان تێر بخۆن، زۆرى پێ ئەچێ، وەڵامت بۆ ئەو دوو قسەيە!!**

**مامۆستا:** ئەو قسەيه كه ئێوەش بچنه سەر حوكم، هەروا دەكەن، ئەوە وەك عەرەب دەڵێن: (قصاص قبل الجناية)يه تۆڵه لێكردنەوەى پێش تاوان ئەوە به بۆچوونى من: له هەمبانەى خۆدا گوێز ژماردنه، خەڵك قياسكردن لەسەر خۆيه، ئنجا باباى دز پێى وايه هەموو كەس دزه، لەلاى زاڵميى وايه هەموو كەس زاڵمه، ئەوە گومانى خراپ به خەڵك بردنه، بەهەرحاڵ من ناڵێم: ئەو خەڵكەى ديكەش فريشتەيه، بەڵام دەڵێين: يەكەم: بەرنامەكەمان خۆى قبووڵ ناكات ستەم و خراپەبكرێ، ئنجا بەرنامەكەى ئێمه هى خوايه، هى خۆمان نيه، هەڵقوڵاوى ئارەزووى خۆمان، يان ئارەزووى چەند كەسێكى ديكه نيه، وەحيى خوايه و پابەندكەره بۆ هەموو لايەك، تۆ يان دەبێ بڵێى مسوڵمان نيم، يان دەبێ پابەند بى پێيەوەو، بەدەست خۆت نيه،

﴿ ثُمَّ جَعَلْنَٰكَ عَلَىٰ شَرِيعَةٍ مِّنَ ٱلْأَمْرِ فَٱتَّبِعْهَا وَلَا تَتَّبِعْ أَهْوَآءَ ٱلَّذِينَ لَا يَعْلَمُونَ ﴿١٨﴾ ﴾ [الجاثية: ١٨]

واته: تۆمان لەسەر ڕێبازێك داناوە و شوێنی بكەوە و مەكەوە دوا ئارەزووی ئەوانە كە نازانن.

**دووەم:** كەسانێكی بڕوادار بە خواو بە ڕۆژی دوایی و خاوەن عیبادەت و طاعەت، جیاوازن لە كەسانێك كە بەو جۆرە نین و واقیعیش باشترین بەڵگەیە لەو بارەوە، بەنسبەت قسەكەی دیكەشەوە.

**دانـــا:** ئەمە زیاتر لەناو جەماوەردا ئەم قسەیە دەكرێ.

**مامۆستا:** بەڵێ دەزانم، بەڵام ئەوە قسەیەكی قەڵبە، ماڵی قەڵبیش سەر بە خاوەنییەتی، یانی: چی ئەوانە تێریان خواردوە؟ خەڵك بۆچی دەیهێشت تێر بخۆن؟ پاشان ڕاستیش نیە، كە ئەوانە دوای تێرخوادن دەست هەڵدەگرن، بەڵكو وەك دۆزەخ هەر دەڵێن: بابێ!

**دانـــا:** كەواتە خەتای خەڵك بووە ئەوان تێریان خواردوە؟

**مامۆستا:** بێگومان خەڵك گوناهبارە، بەداخەوە دەڵێم: زۆربەی ئەو خەڵكە نازانێ، كەلەسەر قبووڵكردنی زوڵم، گوناهبارە، وەك چۆن لەسەر زوڵمكردن و گوناهبارە، خوا دەفەرموێ:

﴿ لَا تَظْلِمُونَ وَلَا تُظْلَمُونَ ﴾ [البقرة: ٢٧٩].

واته: نە زوڵم بكەن نە قبووڵی زوڵمیش بكەن، نە زوڵم لە بەرامبەرەكەت بكە، نە بهێڵە بەرامبەرەكەشت زوڵمت لێ بكات، یانی: ئەگەر زوڵم بكەی گوناهباری، ئەگەر لێشگەڕێی زوڵمت لێ بكەن، هەر گوناهباری، بۆیە لە فەرمایشتێكی پێغەمبەردا (علیه الصلاة والسلام) هاتووە، مەدحی ڕۆم دەكات، (واته: ئەوروپا) كە عەمری كوڕی عاص دەڵێ گوێم: لە پێغەمبەری خوا (علیه الصلاة والسلام) مەدحی ڕۆمەكانی كردو فەرمووی: كاتێك دنیا تێك

دەچێ، ڕۆم لە هەموو شوێنەکانی دیکە خەڵکی زیاتر لێیە، ئنجا بەم بۆنەیەوە عەمری کوڕی عاص باسی چوار سیفەتی باشی ڕۆم دەکات و، دەڵێ: یەکێك لە صیفەتەکانیان: (أمنعهم من ظلم الملوك) لە هەموو کەس زیاتر دژی ستەمی پادشا و حوکمڕانەکانن، یانی: بێدەنگ نابن لە بەرامبەر زوڵمدا.

سیفەتی چاك لەهەر کەسێك دا هەبێ، چاکە، ئێستا لەو ئەوڕووپایە ئەوەی لێرەدا دەگوزەرێ، کە وەزیر نقووم بووە لەگەندەڵییدا، حکوومەت مەسەلەن نوقم بووە لە پێشێلکاریی یاسادا، ئەگەر لەوێ بێ، خەڵك ڕازیی دەبێ؟ نەخێر، لێکی هەڵدەوەشێننەوە، وەزیر ناچار دەکەن کە یەکسەر دەست لەکار بکێشێتەوە، بەڵام هەتا ئاستی بەرپرسیارێتی بەرزترە، حیساب کردن بۆ سیستم و یاسا کەمترە!

**دانـــا: مامۆستا! دێینە سەر بنەمای بیست و چوار: فەرمووتە (هاندان و ورووژاندنی خەڵك و جەماوەر و چەواشەکردنیان لە بەرامبەر هەوڵ دان بۆ پاکسازیی و چاکسازیی دا، نەریتێکی کۆنی قۆرخکارانی دەسەڵات و سامانەکانە)، مەبەست چییە و لە چ ئایەتێکی قورئانەوە هەڵتهێنجاوە؟**

**مامۆستا:** مووسا (علیه الصلاة والسلام) کە دەچێت بۆ لای فیرعەون، کە بۆیە چووە بەنی ئیسرائیل دەربازکات، چونکە دەڵێ:

﴿ فَأَرْسِلْ مَعَنَا بَنِيٓ إِسْرَٰٓءِيلَ وَلَا تُعَذِّبْهُمْ ﴾ [طه: ٤٧]

بەنی ئیسرائیلم لەگەڵ بنێرەو چیدیکە مەیانچەوسێنەوە.

سۆغرە و بێگاری پێ دەکردن، نێرینەکانی سەردەبڕین و مێینەکانی دەهێشتنەوە، لە عەزابێکی زۆر مەینەتباردا بوون، فیرعەون دەڵێ چی؟ دەڵێ:

﴿ ذَرُونِيٓ أَقْتُلْ مُوسَىٰ وَلْيَدْعُ رَبَّهُۥٓ ۖ إِنِّيٓ أَخَافُ أَن يُبَدِّلَ دِينَكُمْ أَوْ أَن يُظْهِرَ فِي ٱلْأَرْضِ ٱلْفَسَادَ ﴿٢٦﴾ ﴾ [غافر: ٢٦]

واتە: لێمەگەڕێن با مووسا بکوژم و ئەویش لە پەروەردگاری خۆی بپاڕێتەوە، من دەترسێم ئاینەکەتان لێ بگۆڕێ یاخود ئاشووب و فیتنە لەوڵاتدا بڵاو بکاتەوە.

فیرعەون ئەوە دەکاتە پاساو، کە لێیگەڕێن با مووسا بکوژێ، چونکە دەترسێ دینەکەیان لێ تێکبداو دەترسێ کە ژینیان لێ تێکبدات و، ئاشووب و ئاژاوە لە وڵاتدا پەیدا بکا، فیرعەون دینێکی زۆر زەریفی هەبووە، کە بریتیە بووە لەوەی، خۆی بپەرسترێ و خەڵکەکەش کۆیلە بێ، گوتوویەتی: دەترسم ئەو دینە چاکەتان لێ تێك بدات!!

**دانـــا: بە زاراوەکەی ئەمڕۆ، مووسا دەستی لە پشت بووە!**

**مامۆستا:** بەڵێ، ئنجا ژینەکەشیان ماشەڵڵا ژینێکی زۆر شەرافەتمەندانە بووە، خەڵکەکە هەمووی کۆیلە بووە، هەمووی زەبوون و زەلیل بووە (أَوْ أَن يُظْهِرَ فِي ٱلْأَرْضِ ٱلْفَسَادَ ) دەترسم ژینەکەیشتان لێ تێکدا و ئاژاوە گێڕیی بەرپابکات!

ئەم قسەی فیرعەون وەك ئەوە وایە دەڵێن: جارێك پیرەژنێك لەنێو جەنازان دەگەڕا، دەیگوت خوایە! نەیکەیە فیتنە، خوایە فیتنە نەقەومێ! وەك خوا سبحانەو تعالی دەفەرموێ:

﴿ أَلَا فِي ٱلْفِتْنَةِ سَقَطُواْ ﴾ [التوبة: ٤٩]

واتە: ئاگادار بن! کەوتوونە نێو فیتنە.

با وێنەیەکی دیکە بێنینەوە: کاتێ نووح (علیه الصلاة والسلام) دەچێ بۆ لای گەلەکەی، لەگەڵ زلە زلان و کاربەدەستان داو ئەوانەی کە کارهەڵسووڕێنەری کۆمەڵگایەکەن، ڕووبەڕوو دەبێتەوە، چی دەڵێن؟ دەڵێن:

﴿ يُرِيدُ أَن يَتَفَضَّلَ عَلَيْكُمْ ﴾ [المؤمنون: ٢٤]

ئەوە نووح هاتوە دەیەوێ خۆی بەسەر ئێوەدا فەرز بکات، سبحان الله، ئەو دەستڕۆیشتووانەی نووح لەگەڵیاندا ڕووبەڕوو بووەتەوە، خۆیان بەسەر گەلەکەیاندا فەڕز کردوە، ئنجا ئەوان بە کردەوە خۆیان فەرز کردوە، کەچی خەڵك بەوە دەترسێنن، دەڵێن: نووح هاتوە خۆی بەسەر ئێوەدا فەرز بکا، لە هەمبانەی خۆیاندا گوێزیان ژماردوە، وایانزانیوە خۆیان چییان لەو خەڵکە کردوە، نووحیش

هەمان شت دەكات، هەروەك چۆن عەلمانییەكان زۆر بانگەشە لە دژی تەوژمی ئیسلامیی دەكەن و تۆمەتباریان دەكەن بەو شتانەی كە بەدرێژایی مێژوو نەیارانی پێغەمبەران (علیهم السلام) ئەو زاتە بەرزەو شوێنكەوتووانیان پێ تۆمەتبار كردوون. (مەبەستیشم لە عەلمانییەكان ئەوانەیە كە بڕیاربەدەستن و حوكمڕانن، نەك عەلمانییەكی ڕەشءڕووتی چەوساوەی بێبەشكراو، من لەگەڵ وانم نیە، مەزڵووم هەر مەزڵوومە، هەر فیكرەیەكی ببێ، زاڵمیش هەر زاڵمە هەر فیكرەیەكی ببێ)، لەوێش ئەو تۆمەتە ئاڕاستەی نووح دەكەن:

﴿ يُرِيدُ أَن يَتَفَضَّلَ عَلَيْكُمْ ﴾ [المؤمنون : ٢٤]

دەیەوێ خۆی بەسەر ئێوەدا فەرز بكات، خۆی لە ئێوە بەچاكتر دابنێ، ئنجا ئەوە ئەو تۆمەتباركردنەی پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) لەلایەن ئەو خۆبەزلگرانەوە، كە خەڵكەكانیان چەوساندۆتەوە و، پێغەمبەران هاتوون ئەوانە دەرباز بكەن، چەكێكی زۆر كاریگەری ئەو ستەمكار و خۆسەپێنانە بووە، چونكە ئەگەر پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام)، خۆیان، وەك حەقیقەتی خۆیان، بە خەڵك بناسێنن و، بەرنامەكەیان وەك خۆی بە خەڵك بناسێنن، خەڵك دەڵێ: بەرنامە لەوە باشتر نابێ و هیچ كات پیاو لەوانەمان چاكتر دەستناكەوێ! بەڵام ناحەزانی ڕێی خوا دەیانەوێ چاوپێچك بخەنە سەر چاوی خەڵك و چەواشەیان بكەن، كە: ئەوە نەهاتوە هیدایەتتان بدات، نەهاتوە بتانخاتە سەر ڕاستە ڕێ، نەهاتوە گرفت و كێشەكانی دین و ژینتان بۆ چارەسەر بكات، بەڵكو هاتوە دینەكەتان تێكبداو ژینەكەشتان بشێوێنێ، لەولاشەوە ئەو نووحە (علیه الصلاة والسلام) نەهاتوە كە خۆی وەك ئێوە حیساب بكا و تەبایی و برایەتیی بەرپا بكا (كە خۆی بەرنامەی نووح وابووە) بەڵكو هاتوە خۆی بەسەر ئێوەدا بكاتە كوێخا و خۆیتان بەسەردا بسەپێنێ، ئەوەش چەواشەكارییەك بووە كە حوكمڕانە ستەمكارەكان كردوویانە بەرامبەر بە خەڵك و جەماوەرەكەیان، بۆ ئەوەی پەردە و نێوانێك بخەنە نێوان ئەو پێغەمبەرە (علیه الصلاة والسلام) پایەبەرزە و پەیام و بەرنامەكەی، لەگەڵ ئەو خەڵك و جەماوەرە ڕەش و ڕووتە، كە ئەو پێغەمبەرە هاتوە ئەو خەڵكە دەربازكات، كەچی هەر ئەو خەڵكەشیان بە گژ پێغەمبەراندا كردوە.

**دانـا: کەواتە ئەتەوێ بڵێی: دەسەڵاتدارانی ئێستای هەرێمی کوردستان و عێراق و بە شێوازێکی گشتی ناوچەکە، بەڵام ئێمە زیاتر لەسەر هەرێم قسە دەکەین، بەرامبەر بە نەیارە سیاسییەکانیان کە باسی چاکسازیی و ڕیفۆرم ئەکەن، ئەیانەوێ بەهەمان شێواز خیتاب لەگەڵ جەماوەردا بکەن؟**

**مامۆستا:** نەخێر ناڵێم کت و مت وایە، چونکە خەڵك هەیە لە نێو ئەو دوو حیزبە بڕیاربەدەستەش دا، کە لە ماوەی بیست و پێنج ساڵی ڕابردوودا حوکمڕانییان کردوە، نارازیین، ڕەخنەیان هەیە، گلەییان هەیە، لە هەردوو حیزبەکەدا خەڵك هەیە، کەم و زۆر کەوتوە. بۆیە ناڵێم: هەموویان، وان، بەڵام بە تەئکید ئەوە واقیعێکە و دەچێتە چاوی هەموو کەسێکەوە، کە ئەوانیش دەیانەوێ: هەرکەسێك باسی ئەوە بکا کە ئەم وەزعە خراپە و با بگۆڕدرێ، یەکسەر بەرچەسپێك حازرە، تۆمەتێك حازرە! ئنجا وای بە حاڵی حیزبێك، وای بە حاڵی کەسێك، هەر لەگەڵ باسی زوڵمت کرد، بیباتە سەر خۆی، هەر لەگەڵ باسی کوێخایەتییت کرد، بڵێ: لەگەڵ منیەتی، هەر لەگەڵ باسی گەندەڵییت کرد، بڵێ: بەمن دەڵێ، هەر لەگەڵ باسی پێشێلکردنی یاسات کرد، بڵێ: مەبەستی منە! مانای وایە ئەو شتانە هەموویان لە خۆیدا شك دەبات، دەڵێن: (مل بە قوڕ بۆ خۆی لەخۆی دەگات دەزانی یانی چی؟ یانی کەسێك ملی بە قوڕ بێ، بشزانێ ملی بە قوڕە، هەر بڵێی (مل بە قوڕ) یەکسەر ئاوڕ دەداتەوە، ئەگەرنا لە (بڕۆکسل) لە پایتەختی (بەلجیکا)، پازدەمین کۆنگرەی (KNK) بوو، لەوێ باسی نەتەوەی کورد و مەزڵوومیەتی کوردم کرد، کە لە سەر نەخشەی سیاسیی بوونمان نیە، دوایی باسی ئەوەم کرد کە ئێمە دەبێ پێکەوە تەبا بین، ڕێك بین، پێکەوە هاوکار بین، دوایی باسی ئەوەم کرد، کە نابێ هیچ کەس لە لایەنە سیاسییەکان کەڵکەڵەی کوێخایەتیی لە کەللەدا هەبێ و، خۆی بە نوێنەری بەشەکانی دیکەی کوردستان بزانێ، کوردی ڕۆژهەڵات خۆیان دەزانن، چۆن بۆ ئەوان باشترە، دەبێ ئێمە ڕێز لە بۆچوونی ئەوان بگرین، کوردی ڕۆژئاوا دەبێ ڕێز لە بۆچوونیان بگرین و، دەستوەرنەدەینە ئیش و کاریان، ئەگەر پێویستیی کرد بە هاوکاریی، هاوکارییان بکەین لەقەدەر توانا، بەس خۆیان لێ نەکەینە کوێخا

و ملۆزم، هەروەها كوردی باكوور و باشووریش، هەركاميان چاكتر دەزانێ چی دەكا! نابێ هيچ كەس ئيشی ئەويديكه تێك بدات.

كەچی حيزبێك بردوويەته سەر خۆی: فڵان كەس كه باسی كوێخايەتيی كردوە، لەگەڵ ئێمەيەتی، منيش گوتم: من كه باسی كوێخايەتييم كرد، تۆ بيبەيه سەر خۆت، دياره تۆ وای، باسی زوڵمم كرد، تۆ بيبەيه سەر خۆت، دياره تۆ وای، باسی گەندەڵييمكرد، بڵێی لەگەڵ منيەتی، دياره تۆ وای، مادام وايه ئەو سيفەته خراپه له خۆتدا لابەره، بۆ ئەوەی قسەكەم نەتگرێتەوە!

ئنجا ئەوە قسه قسه دێنێ: من كاتی خۆی له ساڵی (١٩٨٣) له ناوچەی پشدەر، له دێيەك له دێيەكانی پشدەر وتارێكی جومعەم دا، كه چووم بۆ دێيەكه، خەڵكەكه تەكليفيان كرد و مامۆستای دێيەكەش گوتی: مادام خەڵكەكه داوا دەكەن، تۆ وتاری جومعەمان بۆ بده، منيش وتارم دا و دوايی هەر عادەتم وايه، مامۆستاش له من به تەمەنتر بوو، گوتم: مامۆستا گيان! تێبينييەك ئامۆژگارييەك، شتێك هەبوو، پێمخۆشه، (ئەو كاته تەمەنم (٢٢) ساڵ بوو) با ئيستيفاده له ئامۆژگاريی جەنابت بكەم، گوتی: يەك تێبينييم هەيه، ئەويش ئەوەيه ئەگەر بەو شێوه وتار بدەی، دڵی كەس به خۆتەوه ناهێڵی، گوتم: چۆن مامۆستا؟ گوتی: تۆ هەندێ لەو قسانەی كه دەتكردن ڕژێمی دەگرتەوە، هەندێكی ئەو حيزبانەی دەرێ دەگرێتەوە، باسی شەڕابخۆرت كرد، باسی قومارچييت كرد، باسی زوڵمت كرد، باسی جاشايەتييت كرد، ئنجا ئەو خەڵكەش هەمووی ئەو شتانەی هەيه، ئنجا ئەگەر وابێ، ئەو خەڵكەت هەمووی لێ عاجز دەبێ، منيش گوتم ئنجا مامۆستا! لەجياتی ئەوەی تۆ ئامۆژگاريی من بكەی، باسی زوڵمێ نەكەم، باسی شەرابخۆريی و باسی سەربەرژێم بوون و، باسی شوێنكەوتنی فيكری نامۆ (ئەو كاته بازاڕی ماركسيزم و ئيلحاد گەرمبوو) نەكەم،دەبێ بەو خەڵكه بڵێی: واز لەو شته خراپانه بێنن، بۆ ئەوەی كه من قسەم كرد، ئەوان نەگرێتەوە، ئەگەرنا من چی بكەم، كاتێك ئايەت ئايەت دەخوێنمەوه و فەرمايشتی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) باس دەكەم، بڵێم چی لەگەڵ ئەو خاوەن گوناه و تاوانانەدا تێكدەگيرێ! دەبێ ئەوان گوناه و

تاوانەكان واز لێبێنن، بۆ ئەوەی ئایەت و حەدیسەكان نەیانگرنەوە، نەك من واز لە باسكردنی شەریعەت بێنم، تاكو ئەو جۆرە كەسانە نیگەران نەبن! شایانی باسیشە ئەوەی كە بە درێژایی مێژوو گۆڕانكاریی ڕیشەیی كردوە، پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) بوون، دواییش ئەو خەڵكە چاكەخواز و موصلیح و فەیلەسووف و حەكیمانە، هەموویان لە وەحی و پەیامێ، كە خوا بە پێغەمبەراندا ناردوویەتی، بەهرەمەند بوون، پێغەمبەران بوون ئەو بەها بەرزانەیان بە نێو مرۆڤایەتییدا بڵاو كردوونەوە، كە:



١- مرۆڤ هەر مرۆڤە.

٢- كەس لە كەس گەورەتر نیە.

٣- خوا نیعمەتەكانی بۆ هەموو لایەك داناون.

٤- پێغەمبەران بوون (علیهم الصلاة والسلام) بوون خەڵكیان بۆ (توحید) بانگكردوە، هەموو پێغەمبەران تەماشا بكە، خەڵك بۆچی بانگ دەكەن؟

﴿ أَنِ ٱعْبُدُوا۟ ٱللَّهَ مَا لَكُم مِّنْ إِلَٰهٍ غَيْرُهُۥٓ ﴾ [المؤمنون: ٣٢]

بەندایەتیی بۆ خوا بكەن، جگە لەو پەرستراوێكی دیكەتان نیە، ئنجا ئەو تەنیا خوا پەرستن و خوا بەیەكگرتنە، ڕیشەی یەكرێزییە بناغەی دادگەرییە، چاوگی یەكسانییە، كانگای نەهێشتنی فەرق و جیاوازییەكانە، بۆیە كێ بە بانگی تەوحیدیی پێغەمبەران قەڵس بووە؟ فیرعەونەكان، قارِوونەكان، نەمروودەكان، خۆبەزلگرەكان، چونكە ئەگەر خەڵك خوا بەیەكگر (موحد) بێ ئەو كاتە بازاڕی شیرك دەشكێ، ئەو كاتە فیرعەون بواری نابێ بڵێ: ئەوە نیە دار و بەردیش دەپەرستن، كەواتە: منیش بپەرستن، بەڵام ئەگەر پەیامی پێغەمبەران چەسپا، كە دەبێ تەنیا خوا بپەرسترێ، ئەو كاتە فیرعەون و نەمروود و قاروون و ئەو خۆبەزلگرانە، دەرفەتیان نامێنێ، بڵێن: خەڵكینە! مادام دار و بەرد و خۆر و مانگ و ئەستێرە و هەوا و ئارەزوو و چی و چی دەپەرستن، ئێمەش بپەرستن، نا، تەنیا خوا شایستەی پەرستنە!

بەڵێ زۆر كەس نازانێ، كە خوا بەیەك گرتن (توحید) ڕیشەی چاكسازیی سیاسیی و كۆمەڵایەتیی و ئابوورییە، چونكە ئەگەر تەنیا خوا پەرستراو بێ، كەواتە: كەس بۆی نیە خەڵكی دیكە بچەوسێنێتەوە لە ڕووی سیاسیی، یان لە ڕووی ئابووریی، یان لە ڕووی كۆمەڵایەتییەوە، هەموومان بەندەی خواین، خواش تاكە پەرستراوێكە، واتە: تاكە زاتێكە دەبێ لە هەموو كەس و هەموو شتێ زیاتر:

١- خۆشبویستری.

٢- سام و هەیبەتمان بەرامبەری هەبێ.



٣- بۆی ملكەچ بین.

٤- پشتی پێ ببەستین.

٥- بە گەورەو مەزن بگیرێ.

هیچ كەس نابێ ئەو سیفەتانەی بۆ بەكار بهێنرێن، جگە لە خوا سبحانەو تعالى، هەڵبەتە حوكمڕان و بەرپرسێك كە بڕوادارو خواپەرست و بەپێی شەریعەتی خوا بەڕێوەدەچێ، ملی بۆ كەچ دەكرێ، بەڵام بەس خوا ملكەچیی رەهای بۆ هەیە، كەواتە: لێرەدا ڕێ دەگیرێ لەوە، كە هەندێ لە مرۆڤەكان، خۆیان بكەنە ملۆزم و كوێخا و خۆسەپێن بەسەر خەڵك.

**دانــا: زۆر باشە، كۆتا بنەما، كە جەنابت ئاماژەت پێ كردوە لە بابەتی "بۆ چاككردنی ئەم دۆخەی هەرێمی كوردستان با گوێ لە قورئان بگرین"، بنەمای بیست و پێنجە: (داهاتوو بۆ پارێزكارانی پاكسازیی چاكسازییكارە و سەرەنجامی دنیا و دوارۆژی ستەمكارانیش شوومە)، مامۆستا ئەم داهاتووە كەیە؟ یانی خەڵك تۆزێك بەپەلەیە، خەڵك ئەیەوێ زوو دەرەنجامی كارەكانی دەستكەوێتەوە، ئەپرسێ كەی؟ چەند جیل بڕوا، ئەم داهاتووە بۆ ئێمە ئەبێ و، ستەمكارانیش داهاتوویان شووم دەبێت؟**

**مامۆستا:** بە دوو شێوە وەڵامی ئەو پرسیارە دەدەمەوە:: یەكەم: وەك شتێكی مەبدەئیی و تیۆریی خوا سبحانە وتعالى لە قورئاندا لە چەندان ئایەتدا ئەوەی ڕاگەیاندوە، بۆ وێنە:

**١)** دەفەرمویٚ: ﴿ فَٱصۡبِرۡۖ إِنَّ ٱلۡعَٰقِبَةَ لِلۡمُتَّقِينَ ﴾ [هود: ٤٩]

خۆڕاگربە بێگومان سەرەنجام (واتە: سەرەنجامی چاك لە دنیادا) بۆ پارێزكارانە.

**٢)** هەروەها خوا دەفەرمویٚ: ﴿ وَٱلۡعَٰقِبَةُ لِلتَّقۡوَىٰ ﴾ [طه: ١٣٢]

سەرەنجام (واتە: سەرەنجامی چاك، بردنەوە) بۆ تەقوایە، یانی بۆ ئەهلی تەقوا، خوا سبحانە وتعالی كە ئەوەی فەرمووە، بۆخۆی بەدیهێنەر و پەروەردگار و مشوورخۆری ئەو كەون و كائیناتەیە، دەزانیٚ بۆچی وا دەفەرمویٚ و، ئەوە یاسایەكی خوایە، هەڵبەتە ئەوە كە سەرەنجام بۆ پارێزكارانە، یانی: ئەو پارێزكارانەی كاری پاكسازیی و چاكسازیی و ڕاستكردنەوە ئەنجام دەدەن، خوا ئەمەی وەك یاسایەك فەرمووەو، خۆیشی ئەم گەردوونەی دروستكردوەو، خۆیشی یاساكانی تێدا داناون، كەواتە: مسوڵمان نابیٚ هیچ دوودڵییەكی لەوەدا هەبیٚ.

**دانــا: ئایا مەرجەكە بۆ ئەم دنیایە، یان مەرجەكە بۆ هەردووك دنیایە؟**

مامۆستا: هەردووكیان دەگرێتەوە، بۆ وێنە: خوای پەروەردەگار لە سوڕەتی (الأنبیاء)دا دەفەرمویٚ:

﴿ وَلَقَدۡ كَتَبۡنَا فِي ٱلزَّبُورِ مِنۢ بَعۡدِ ٱلذِّكۡرِ أَنَّ ٱلۡأَرۡضَ يَرِثُهَا عِبَادِيَ ٱلصَّٰلِحُونَ ﴿١٠٥﴾ إِنَّ فِي هَٰذَا لَبَلَٰغٗا لِّقَوۡمٍ عَٰبِدِينَ ﴿١٠٦﴾ وَمَآ أَرۡسَلۡنَٰكَ إِلَّا رَحۡمَةٗ لِّلۡعَٰلَمِينَ ﴿١٠٧﴾ ﴾ [الأنبیاء: ١٠٥-١٠٧]

ئەم سیٚ ئایەتە موبارەكە تەماشا بكە! سەرەتا خوا دەفەرمویٚ: (وَلَقَدۡ كَتَبۡنَا فِي ٱلزَّبُورِ مِنۢ بَعۡدِ ٱلذِّكۡرِ)، (ذكر) لێرەدا مەبەست پێی تەوراتە، بە ئیتیفاقی هەموو توێژەرەوانی قورئان، واتە: لە دوای زیكر لە زەبووردا نوسیوومانە، یانی: ئەوە قانوونی خوایە، لەوێدا تۆمار كراوە، ئنجا یاساكە دەخاتەڕوو (أَنَّ ٱلۡأَرۡضَ يَرِثُهَا عِبَادِيَ ٱلصَّٰلِحُونَ) كە سەرزەوی بەندە

چاكه‌كانم به میراتی ده‌گرن، ( إِنَّ فِي هَٰذَا لَبَلَٰغًا لِّقَوْمٍ عَٰبِدِينَ ) له‌مه‌دا ڕوونكردنه‌وه‌یه‌كی به ئامانجگه‌یه‌نه‌ر هه‌یه، بۆ كۆمه‌ڵێك كه به‌ندایه‌تیی بۆ خوا بكه‌ن، (وَمَآ أَرْسَلْنَٰكَ إِلَّا رَحْمَةً لِّلْعَٰلَمِينَ) ئه‌ی موحه‌ممه‌د! (صلی الله علیه وسلم) تۆشمان مه‌گه‌ر ته‌نیا به به‌زه‌یی بۆ هه‌موو جیهانییان، ڕه‌وانه كردوه.

كه‌واته: كه خوا له ئایه‌تی سێیه‌مدا ده‌فه‌رمویَ (وَمَآ أَرْسَلْنَٰكَ إِلَّا رَحْمَةً لِّلْعَٰلَمِينَ) دیاره ڕه‌حمه‌ت بوونی پێغه‌مبه‌ر (صلی الله علیه وسلم) بۆ جیهانییان له دنیادا به‌رجه‌سته بووه.

كه‌واته: به‌نده شایسته‌كانی خوا، سه‌رزه‌وی خوا به میرات ده‌گرن، ئنجا به چیی به‌نده‌كان شایسته ده‌بن، سه‌رزه‌وی خوا به میرات بگرن؟! به‌هۆی عیباده‌ت و به‌ندایه‌تیی بۆ خوا كردنه‌وه، ئنجا ئایا ئه‌گه‌ر به‌نده بۆ خوا سولَحاوه‌كان و خواپه‌رسته‌كان سه‌رزه‌مینیان به میرات گرت، سه‌ره‌نجام چی لیَ دیَ؟ ده‌بنه مایه‌ی ڕه‌حمه‌ت و ئاسووده‌یی و خێر و خۆشیی بۆ جیهانییان، ئه‌مه به به‌رجه‌سته‌كراویی له ژیانی پێغه‌مبه‌ری خاته‌مدا (علیه الصلاة والسلام) و خه‌لیفه ڕاشیده‌كانی و هاوه‌ڵانی به‌ڕێزی و تاڕاده‌یه‌ك له درێژه‌ی ده‌وڵه‌تی ئیسلامییدا، بووه، ئه‌و ده‌وڵه‌تی ئیسلامییه كه، كه سێزده سه‌ده ده‌وامی كردو له مێژووی به‌شه‌ردا پێم شك نایه‌ت ده‌وڵه‌تێكی دیكه سێزده سه‌ده، هه‌زار و سێسه‌د ساڵ ده‌وامی كردبیَ، تاكو له ساڵی ١٩٢٤ دا له‌سه‌ر ده‌ستی كه‌مال ئه‌تاتۆرك یه‌كجاریی كۆتایی پێهات، به‌ڵیَ به‌رزیی و نزمیی و كه‌م و كوڕیی تێكه‌وتووه، به‌ڵام گرنگ ئه‌وه‌یه چه‌تر و سێبه‌رێك بووه، وێڕای مسوڵمانان، جووله‌كه، نه‌صرانیی، بووڈایی، ئاگرپه‌رست، هه‌رچی ئه‌صناف و ئه‌شكالی خه‌ڵكه، له‌ژێر سایه‌ی ئه‌و ده‌وڵه‌ته ئیسلامییه‌دا حاواوه‌ته‌وه، نه‌ك هه‌ر حاواوه‌ته‌وه، به ڕێز و حورمه‌ت لێگیرانیشه‌وه‌و به بۆدابینكرانی ماف و ئازادییه‌كانیشه‌وه.

**دانـــا: به‌ڕه‌غمی كۆمه‌ڵێك تێبینی، له‌سه‌ر ده‌سه‌ڵات و پادشا و با بڵێین والییه‌كان.**

**مامۆستا:** به‌ڵیَ، به‌ڵیَ، چه‌ندان جار باسمانكردوه، له مه‌سه‌له‌ی شێوه‌ی حوكمڕانییدا، هه‌ر له سه‌ره‌تای ده‌سه‌ڵاتی ئومه‌وییه‌كانه‌وه، له سه‌رده‌می

موعاویەی كوڕی ئەبو سوفیانەوە، خوا عەفوی بكات، لەوێوە لادان دروست بووە، دوایی عەباسییەكانیش لەسەر هەمان ڕێچكەی حوكمی و میراتیی و بنەماڵەیی بوون، دوایی عوسمانیەكانیش بەهەمان شێوە، بەڵام بە گشتی، حوكم بە شەریعەت كراوە، بە گشتی ئەو دادگەرییەو، ئەو یەكسانییەی لەو دەوڵەتە ئیسلامییەدا بووە، وێڕان ئەو لادان و كەموكوڕییانەش، لە هیچ دەوڵەتێكی دیكەدا پێم شك نایەت، خەلیفە و حوكمڕان لەگەڵ هەژارێكدا، قاچی بردوونیە بەرامبەریەك، حوكمیش بەسەر خەلیفەدا دراوە! هەرگیز شتی وا قەت نەبووە لە مێژوودا، مەگەر لە وڵاتانی ڕۆژئاوایی ئێستادا شتی وا ببینین، ئەگەرنا لە مێژووی بەشەردا شتی وا نەبینراوە.

مەبەستم ئەوەیە: خوا، كە دەفەرموێ: (أَنَّ ٱلۡأَرۡضَ يَرِثُهَا عِبَادِيَ ٱلصَّٰلِحُونَ ) [الأنبياء: ١٠٥].

بەندە صاڵحەكانم زەمین بەمیرات دەگرن، (صالحون) یانی چی؟ ئایا هەر كەس نوێژی كردن و ڕۆژووی گرتن صاڵح دەبێ؟ نا، صاڵح یانی شایستە، بۆیەش پێویستە هەڵوەستە لەبەردەم چەمكی (صلاح) و (صالحون)دا بكەین، چونكە ئەوە قانوونێكی خوایەو ئێستا شایستەیی (صلاح) زیاتر لەو بەندانەدا هەیە، لەو مرۆڤانەدا هەیە كە لە ئەوڕووپا و شەرق و غەربن، بۆیەش تەماشا دەكەین ئەوان زیاتر زەمینیان بەدەستەوەیە، چونكە ئەوە قانوونی خوایە، قانوونەكانی خواش، خوا تەنیا بۆ مسوڵمانانیان دانانێ! زۆرجار وەك مسوڵمان وادەزانین، خوا ئەو ئایەتەی فەرمووە، بەس بۆ ئێمەیە! نا، نا، خوا یاسایەكانی خۆی بۆ هەموو بەشەر داناون، كە دەفەرموێ: سەرزەمینی من، بەندە شایستەكانم بە میراتی دەگرن، تێیدا دەبنە دەسەڵاتدار، ئێستا كێ دەسەڵاتدارە، لەم سەرزەوییەدا؟ ئەوانەی كە لە ڕووی عیلمییەوە لەپێشن، ئەوانەی كە لە ڕووی ئیدارییەوە، لە ڕووی سیاسییەوە، لە ڕووی ئابوورییەوە، لە ڕووی دادگەرییەوە، یانی: شایستەن و خاوەن (كفاءة)ن، بەڵێ ئەو كەفائەتە ماددیی و ڕواڵەتییە، ئەگەر كەفائەتە ئیمانیی و مەعنەویی و ئەخلاقییەكەشی لەگەڵدا بایە، بە تەئكید زۆر زۆر باشتر دەبوو، ئەو كاتە لە جیاتی ئەوەی، ئەمریكا ئەو هەموو ستەمە بكات، ئەو

هەموو بنكە سەربازییانە دابنێ لە دنیادا، جوولەكە بێنێ فەلەستین داگیربكا، ڕووسیا بێ یارمەتیی دیكتاتۆرێك بدا لە سووریا، دەوڵەتەكانی دیكەش كەم و زۆر دەستیان بچێتە نێو ئەو زوڵمەوە كە لە خەڵكی سووریا دەكرێ، لەجیاتی ئەوە، ئەگەر ئیمان و تەقوا و ئەخلاق و لایەنی ڕووحی لەگەڵدا بووایە، ئاوایان نەدەكرد، بەڵكو ئەو توانایانەیان بەكاردەهێنان، بۆ دیفاعكردن لە مەزڵوومان و دەستگرتنی زاڵمان.

مەبەستم ئەوەیە كە باسی ئەوەمان كرد، شایستەكان (صالحون) دەبنە حوكمڕان، ئەوە لە ژیانی پێغەمبەری خوادا (علیه الصلاة والسلام)و خەلیفە ڕاشیدەكاندا بەچاكترین شێوەو زۆرترین ڕێژە، دوایی لە ئاڵقەكانی دیكەی دەوڵەتی ئیسلامیی دا، ئومەویی و عەبباسیی و عوسمانییش تا ڕاددەیەك بەرجەستە بووە، چونكە ئەوان شایستە بوون، لە سۆنگەی ئەوەوە ئەهلی عیبادەت بوون، دوایی بوونە مایەی ڕەحمەتیش:

﴿ وَمَآ أَرۡسَلۡنَٰكَ إِلَّا رَحۡمَةٗ لِّلۡعَٰلَمِينَ ﴿١٠٧﴾ ﴾ [الأنبياء : ١٠٧]

چونكە خوای پەروەردگار كە بە پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) دەفەرموێ: ﴿ وَمَآ أَرۡسَلۡنَٰكَ إِلَّا رَحۡمَةٗ لِّلۡعَٰلَمِينَ ﴿١٠٧﴾ ﴾، تەنیا پێغەمبەری خاتەم موحەممەد (علیه الصلاة والسلام) وەك شەخسی خۆی ڕەحمەت نیە بۆ جیهانییان (عالمین)، بەڵكو ئەوانەش كە بەڕێی ئەودا دەڕۆن و هەر ڕەحمەتن بەڵام لە قەدەر خۆیان، یانی: ئەبوبەكر و عومەر و عوسمان و عەلییش - خوایان لێ ڕازی بێ -، و هەر حوكمڕانێكی دیكەش كە بەڕێی پێغەمبەردا (علیه الصلاة والسلام) دەڕوا ئەویش لە قەدەر خۆی، دەبێتە مایەی ڕەحمەت و ئاسوودەیی و بەختەوەریی بۆ خەڵكی ڕۆژگاری خۆی.

**دانـا: زۆر باشە مامۆستا! لەم بابەتە گرنگەی: (بۆ چاككردنی ئەم دۆخەی هەرێمی كوردستان، با گوێ لە قورئان بگرین) جەنابت بیست و پێنج بنەمات نووسیوە، ئێمەش لە كەناڵی ئاسمانی پەیام وابۆ نزیكەی ساڵێك ئەچێ لە خزمەت جەنابتداین و، لە خزمەت ئەو بنەمایانەین كە لە قورئانەوە هەڵتهێنجاون، هەڵە نەبم نزیكەی**

**بیست ئەڵقەمان لێ تۆمار كردوە، ئەمە كۆتا ئاڵقەیەتی و گەیشتین بە پایان لەسەر ئەم بابەتە، ئەگەرنا بێگومان بەرنامەكە إن شاء الله لە داهاتوویەكی نزیكدا لەسەر بابەتێكی تر هەر درێژەی دەبێ، خۆت وتەنی: كورتەی قسان، پوختەی قسان: دەتەوێ لە كۆتایی ئەم بیست و پێنج بنەمایەدا، هەم بە دەسەڵاتداران، هەم بە خەڵك و جەماوەر، چییان پێ بڵێی؟**

**مامۆستا:** دەمەوێ بڵێم: ئێمە مادام بە خۆمان دەڵێین: مسوڵمان، گەلێكی مسوڵمانین، بەشێكین لە ئوممەتی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)، بێگومان مسوڵمانەتیی ئێمە، بەبێ شوێنكەوتنی قورئان و لێ تێگەیشتنی قورئان و پابەندیی بە قورئانەوە، هیچ مەعنای نیە، چونكە جەوهەر و كاكڵی مسوڵمانەتیی بریتیە لە كارلێككردن لەگەڵ قورئاندا: بە خوێندنەوەی، لێتێگەیشتنی، كارپێكردنی، بەتایبەت بۆ چاككردن و پاكسازی و چاكسازی تێدا كردن و ڕاستكردنەوەی ئەم بارودۆخەی ئێستای خۆمان، لەم هەرێمی كوردستانەدا، هەروەها لە بەشەكانی دیكەی كوردستاندا، هەروەها لە شوێنەكانی دیكەدا، چونكە هەرچەندە قسەكانم بۆ ئێرە كردوون، بەڵام بەڕاستیی قسەكان هەموو مسوڵمانان دەگرنەوە.

ئنجا حوكمڕانان ئەگەر ڕاست دەكەن لەوەدا كە خۆیان بە مسوڵمان دەزانن و ڕێزیان هەیە بۆ ئیسلام، با تەماشا بكەن! قورئان چی تێدایە، ئایا قورئان چارەسەری ئەو دەرد و نەخۆشیی و گرفت و كێشانەی ئێمەی تێدایە، یان نا؟ با تەماشای بكەن، بەداخەوە دەڵێم: ئەو چینە سیاسییەی ئەم وڵاتەی ئێمە، زۆری بێ ئاگایە لە قورئان، من پێیان دەڵێم، دڵسۆزانەش پێیان دەڵێم: بەس خوا دەزانێ كێ چاكە و كێ خراپەو، تەنیا خوا دەزانێ و سەرەنجاممان چۆن دەبێ؟ با وا نەزانن بەهەشتمان بۆ خۆمان داناوە و دۆزەخیشمان بۆ خەڵك داناوە! نا، بەڵام دەڵێم: خوا ئەم قورئانەی ناردوە، قورئان بۆ چی هاتوە؟

﴿كِتَٰبٌ أَنزَلْنَٰهُ إِلَيْكَ مُبَٰرَكٌ لِّيَدَّبَّرُوٓاْ ءَايَٰتِهِۦ وَلِيَتَذَكَّرَ أُوْلُواْ ٱلْأَلْبَٰبِ ﴿٢٩﴾﴾ [ص: ٢٩]

واتە: ئەمە كیتێبێكە پڕ بەرەكەت و بەرهەمدارە، دامانبەزاندووە تاكو لێی وردببنەوە و عاقڵان پەندی لێ وەربگرن، ئەوانەش هەموویان خۆیان بە عاقڵ و

ژێر دەزانن، با تەماشا بكەین، بزانین داخۆ قورئان چی تێدایە؟ با بزانن داخۆ ئایا چارەسەری كێشەكانی ئێمە لە قورئاندا هەیە؟ ئەو بیست و پێنج یاسایەم لە قورئان دەرهێنا، ئەو بیست و پێنج بنەمایە، بەڵام قورئان سەدان یاساو بنەمای تێدان، كە كاپێكردنیان دەربازبوونمان لەم قەیرانانە بۆ دەستەبەردەكەن.

**دانـــا: مامۆستا لەسەر دەسەڵاتداران پرسیارێكم بۆ دروست بوو، فەرمووت بەوان دەڵێم: با لە قورئان ڕامێنن و ئەگەر خۆیان بە شوێنكەوتەی ئیسلام دەزانن، ئەمە یانی چی؟!**

**مامۆستا:** یانی: مادام مسوڵمانن و خۆیان بە موسڵمان دەزانن، مسوڵمانیەتی: ئەگەر بڕوا هەبوون بە قورئان و خوێندنەوەی قورئان و لێبوردنەوەی قورئان و لێتێگەیشتنی قورئان و كارلێككردن لەگەڵ قورئان و پێوەپابەند بوونی لەگەڵدا نەبێ، مانایەكی نامێنێ.

**دانـــا: پرسیارەكە ئەوەیە، لێرەوە داوا لە دەسەڵاتداران دەكەی، یان لە كۆبوونەوە و دیدارە تایبەتەكانیشدا داوتە بەگوێی دەسەڵاتداراندا؟**

**مامۆستا:** لەوێش بەپێی دەرفەت و بوار، ئەوەندەی كە دەرفەت بووبێ، من هەر عادەتم وایە، قسەی ئێرەم و قسەی كۆبوونەوەی تایبەت و، لەگەڵ حیزب و ئەندامانی خۆمان و، لەگەڵ خەڵكی دیكەش، هەر یەك جۆرە قسەمان هەیەو بەیەك شێوە قسە دەكەین و دڵسۆزانەش قسە دەكەین.

**دانـــا: زۆر باشە، خەڵك و جەماوەر؟**

**مامۆستا:** پێش ئەوەی بچینە سەر خەڵك و جەماوەر، قسەیەكی دیكەم هەیە: كە دەڵێم: قورئان، یەكێ بۆی هەیە بڵێ: سوننەتی پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام)؟ دەڵێم: بەپێی ئەو پێناسەیەی كە پسپۆڕانی سوننەت و فەرموودەناسیی گوتوویانە، كە {سوننەتی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) بریتیە لە بەرجەستەكردنی قورئان لەسەر ئەرزی واقیع، لەلایەن پێغەمبەرەوە (علیه الصلاة والسلام) }، كە لە ئاڵقەی یەكەمدا بە وردیی ئەوەمان باسكرد، كەواتە: كە باسی قورئان

دەكەین، بێگومان بەرجەستەكردنی قورئان لە ڕێبازی پێغەمبەردایە (علیە الصلاة والسلام)، بۆیە خوا دەفەرمویٰ:

﴿ لَقَدْ كَانَ لَكُمْ فِيهِمْ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ ﴾ [الممتحنة : ٦]

بۆ ئێوە سەرمەشقییەكی باش هەیە لە پێغەمبەری خوادا، یانی: تەماشای پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) بكە، پێغەمبەری خوا قورئانی لەخۆیدا بەرجەستە كردوە، دایكمان عائیشە ڕەزای خوای لیٰ بێت، گوتوویەتی: (كان خلقه القرآن) رواه مسلم، واتە: هەڵسوكەوتی پێغەمبەری خوا (علیه الصلاة والسلام) قورئان بوو، بۆیە با كەس وانەزانیٰ، كە ئێمە لەم بنەمایانەدا سوننەتمان نادیدە گرتووە! چونكە یەكێك گوتبووی مامۆستا ئەو بنەمایانەی هەر لە قورئان دەرهێناون! ئاخر بۆیە لە قورئان دەرمهێناون، چونكە پێغەمبەریش فەرمایشتەكانی خۆی لە قورئان دەرهێناون، هەتا ئیمام شافیعی ڕەحمەتی خوای لیٰ بێت لە كتێبی (الرسالة)ی خۆیدا دەڵیٰ: ڕایەكی زانایان هەیە كە پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) هەرچی فەرموویەتی و كردوویەتی، وەك ڕێبازی خۆی هەمووی لە قورئان وەرگرتوە، هەرچۆن بیٰ، من دەزانم وەك چۆن خوا قورئانی بە وەحی ناردوە، وەحی دیكەشی بۆ پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) ناردووە، بەڵام كە سوننەتی پێغەمبەر (ڕێبازی پێغەمبەر) (صلی الله علیه وسلم) هەمووی وەحیی نیە، هەندێكی ئیجتیهادی بەشەریی خۆی بووەو هەندێكی وەك سروشتی بەشەرسی و ...هتد. ئەوەمان زۆرجار باسكردوە، بەڵام گرنگ ئەوەیە: ڕێبازی پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) لەگەڵ قورئاندا دوو شتی لێك جودا نین، بەڵكو دوو شتی تێكهەڵكێشن، كاكڵ و جەوهەری ڕێبازی پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) بریتیە لە قورئان و سوننەت بریتیە لە قورئان بە بەرجەستەكراویی و تەتبیقكراوی.

بەنیسبەت خەڵك و جەماوەرەوە، دەڵێم:

ئەی خەڵك و جەماوەر! ئێمە مادام میللەتێكی مسوڵمانین، حوكمڕانان و دەسەڵاتداران ئەوە ئەركی سەرشانیانە، كە دەبیٰ هەوڵدەن لە خەڵك و جەماوەر باشتر

لە قورئان تێبگەن، چاكتر تێيەوە ڕامێنن، چونكە ئەوان بەرپرسيارن بەرامبەر بەو گرفت و كێشانەى كە هەن، بەڵام خەڵك و جەماوەر نابێ دەستەوئەژنۆ بەرامبەر بە دەسەڵاتداران و حوكمڕانانێك دابنيشێ كە بەرێى غەيرى پێغەمبەردا (صلى الله عليه وسلم)، دەيبەن، بەڵكو دەبێ لەسەر ئەو بەرپرسانەى خۆت، لەسەر ئەو كەسەى كە تۆ ڕيشى خۆت لە مست ناوە، لەسەر ئەو كەسەى كە تۆ بەدوايدا دەچى و بە قسەى دەكەى، لەسەرى فەرز بكەى بڵێى: ئەگەر بەرێى پێغەمبەرم دا دەبەى (عليه الصلاة والسلام) پێشم دەكەوى، ئەگەر بەرێى قورئانمدا دەبەى، ئەوە فەرمانبەرييت بۆ دەكەم و لە خزمەتتدام، بەڵام بەرێى غەيرى ئيسلاممدا بەرى، ڕێيەكەت ناشەرعييە و من وەك موسڵمانێك خوا لێم تووڕە دەبێ، بە دواى تۆ بكەوم، ئەوە ئەركى خەڵكە، ئەوەش كاتێك خەڵك ئەوە دەتوانێ، كە هەوڵدات لە قورئان تێبگات، لە ڕێبازى پێغەمبەر (عليه الصلاة والسلام) شارەزابێ، لە شەريعەت حاڵيى بێ، بە عەقڵێكى ئەمڕۆيى، بە بەهرە وەرگرتن لە بەرهەم و كەلەپوورى زانايان و ئيجتيهادى زانايان، بەڵام بە عەقڵێكى كراوە و ئازاد و ئازا، تەماشاى قورئان و تەماشاى ڕێبازى پێغەمبەر بكات (عليه الصلاة والسلام)، خەڵك ئەگەر شارەزا و ئاشنا بێ بە قورئان و بە سوننەتى پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) و بە ئيسلام، بە تەئكيد ئەو كاتە دەزانێ چۆن حوكمڕانان دادەنێ، كێ ڕاست دەڕوا، كێ چەوت دەڕوا؟ ئەگەرنا ئەگەر خەڵك بێئاگا بێ، ئەگەر خەڵك نائاشنا بێ بە ئيسلام، فەرقى حەڵاڵ و حەڕام و چاكە و خراپە ناكات و فەرقى ڕاسترەويى و كەچڕەويى ناكات.

**دانـــا: لە ئاڵقەيەكيشدا بيرمە فەرمووت: خەڵك دەبێ لەبەرامبەر زوڵم دا بێ، نەك لە ژێر بارى زوڵم دا بێ!**

**مامۆستا:** گوتم خەڵك دەبێ خۆڕاگر بێ، بەڵام خۆڕاگر نەبێ لە بن بارى زوڵمدا، بەڵكو خۆڕاگربێ لە بەرامبەر زوڵمدا، خواى تاك و پاك وامان پێ دەفەرموێ:

﴿ وَٱلصَّٰبِرِينَ فِي ٱلۡبَأۡسَآءِ وَٱلضَّرَّآءِ وَحِينَ ٱلۡبَأۡسِۗ ﴾ [البقرة : ١٧٧]

ئەوانەی كە خۆڕاگرن، لە هەژارییدا و لە كاتی نەخۆشییدا و لە جەنگ و ڕووبەڕووبوونەوەدا.

ئەو جۆرە خۆڕاگرییە لە ئیسلامدا پەسەند ستایشكراوەو ئەرێنییە، صەبری پەسەند ئەوەیە تۆ بۆ گۆڕانكاریی، بۆ پاكسازیی و چاكسازیی، هەرچی دێتە ڕێت، خۆت ڕابگری، باج لەسەر ئەو كارەی خۆت بدەی، بەڵام صەبری نەرێنی ئەوەیە كە تۆ زوڵمیشت لێ بكەن، هەر سەر نەوی بكەی و ملكەچ بكەی، لەبن باری زوڵمدا خۆت ڕابگری! بە تەئكید ئەوە صەبرێكی ڕەتكراوەیە لە ئیسلامدا.

**دانـــا: ماموستا گیان! زۆر سوپاست دەكەین لە ماوەی نزیكەی ساڵی ڕابردوودا، لە دە مانگ بۆ یادزە مانگی ڕابردوودا لە كاتی بەنرخی بەڕێزتمان گرتوە، بێگومان جەنابت جگە لە كاری سیاسیی، سەرقاڵییت بە كۆمەڵێك پرۆژەی دیكەی نووسین و تەفسیر و وانە گوتنەوە.**

**مامۆستا:** وێڕای گەشت و گەڕان بەنێو خەڵك و جەماوەردا، ئێمە خۆمان لە خەڵك نەشاردۆتەوە، ماڵیشمان كاروانسەرایە، ئەنواع و ئەشكاڵ خەڵك دێ، لە خزمەتیاندایین.

**دانا: ئێمە لە كاتی جەنابتمان گرتوە، هەموو مانگێك دوو سەعات بۆ دوو سەعات و نیو و بۆ سێ سەعات، تاكو ئەم ئاڵقانە تۆمار ئەكرێن، داوای لێبوردنت لێ ئەكەین، كە لە كاتی بەنرخی جەنابتمان گرتوە.**

**مامۆستا:** من یەكەم: زۆر سوپاسی جەنابت و ئەو بەڕێزانەش دەكەم كە هەموو جارێ لەگەڵت هاتوون، زۆر سوپاستان دەكەم و دەستخۆشییتان لێ دەكەم.

**دووەم:** داوای لێبوردنم هەیە ئەگەر لە ئاستی ئیسلامدا نەمتوانیبێ قسە بكەم،پێشێ داوای لێبوردن لە خوا دەكەم دوایی لەو خەڵك و جەماوەرە ئەگەر شتێكم گوتبێ بە كەڵك نەیەت، ماڵی قەڵب سەر بە خاوەنیەتی، من هەوڵمداوە لە ڕوانگەی قورئانەوەو لە ڕوانگەی سوننەتی پێغەمبەرەوە (علیه الصلاة والسلام)

قسە بكەم، ئەگەر شتێكم گوتبێ كە لەگەڵ قورئان و سوننەت دا تێكبگیرێ، داوای لێبوردن لە خوا دەكەم، پاشان لە خەڵك و جەماوەری مسوڵمان.

**سێیەم:** كاتێ من وەختێك بەرەكەتی دەبێ، تەمەنی من كاتێك بەرەكەتی دەبێ، كە لە خزمەتی قورئان و سوننەتدا بەسەر ببرێ و، لە خزمەت ئەو خەڵكە مسوڵمانەدا، كە هەوڵبدەین بە ئایینەكەیان خۆیان ئاشنایان بكەینەوە، بەرچاویان ڕۆشنبكەینەوە، بە بەهرەوەرگرتن لە قورئان و سوننەت (شەریعەت) تێبكۆشین بەسەر گرفت و گێشەكانی خۆماندا، زاڵ بین و، هەم ژیانی ئێستامان بەختەوەربكەین، هەم دواڕۆژیشمان سەرفرازیی بێ.

**دانـــا: خوای گەورە بەرەكەت بخاتە تەمەنتەوە جەنابی مامۆستا! لە كۆتایی ئەم ئاڵقەیەدا كە كۆتایی ئەم بابەتەشە: (بۆ چاككردنی ئەم دۆخەی هەرێم، با گوێ لە قورئان بگرین) وەك هەواڵ بۆ جەنابیشت و بۆ بینەرانیش ئەم كۆ ئاڵقانە هەموویان هێنراونە سەر كاغەز و تەفریغ كراون و، لە داهاتوویەكی نزیكدا إن شاء الله دەكرێتە كتێب.**

**مامۆستا:** خزمەت لە ئێمەوە من لە خزمەتدام زۆر بە خۆشحاڵییەوەو دەستخۆشیشتان لێ دەكەم، ئەوەش مژدەیەكی خۆش بوو، كە وەك چۆن ئەم ئاڵقانە بە بینراویی و بە بیستراویی (إن شاء الله) سوودیان لێ بینراوە، بە خوێنراوەییش سوودیان لێ ببینرێ.



**دانـــا: لە كۆتاییدا دووبارە سوپاست دەكەین.**

**مامۆستا** عەلی باپیر: زۆر سوپاس.

**دانـــا: بینەرانی ئازیز و خۆشەویست! هەموو لایەك بە خوای گەورە ئەسپێرین، كوردستانێكی ئاوەدان و ئارام بۆ هەموو لایەك، سوپاسی تەواوی ئەو برایانە ئەكەم: كامێرامان، شۆفێر، برایانی مۆنتێر، برایانی كەناڵی ئاسمانیی پەیام، هەر لە بەڕێوەبەر تاكو كارگوزارەكان كە بەشێوەیەك لە شێوەكان بەم بەرنامەی ئێمەوە ماندوو بوون، بەتایبەت ستافی نووسینگەی كەناڵی ئاسمانی پەیام لە هەولێر، سوپاسی یەك بەیەكیان دەكەم، هەموو لایەك بە خوای میهرەبان ئەسپێرین، خواتان لەگەڵ.**

# بەرهەمەکانی دانەر

## أ - کتێبە کوردییەکان :

| ژ | کتێبەکان | بەروارو چاپ | تێبینی |
|---|---|---|---|
| | قورئان و سوننەت | | |
| ١ | پوختەیەك دەربارەی ئیسلام لەبەر ڕۆشنایی سورەتی فاتیحەدا | چاپی یەك/١٩٨٤ چاپی دوو/٢٠٠٦ | |
| ٢ | با لە خزمەت قورئاندا بین، {کۆی هەردووك کتێبی: (چۆن باشتر لە قورئان بەهرەمەند دەبین؟)و (ئەرکی سەرشانمان بەرانبەر بە قورئان)ە} | چاپی یەك/٢٠٠٨ چاپی دوو/٢٠١٥ | |
| ٣ | تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز، بەرگی یەکەم: سووڕەتەکانی: (الفاتحة) و (البقرة) | چاپی یەك/٢٠١٢ | |
| ٤ | تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز، بەرگی دووەم : سووڕەتی: (آل عمران) | چاپی یەك/٢٠١٢ | |
| ٥ | تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز، بەرگی سێیەم: سووڕەتی: (النساء) | چاپی یەك/٢٠١٣ | |
| ٦ | تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز، بەرگی چوارەم: سووڕەتی: (المائدة) | چاپی یەك/٢٠١٤ | |
| ٧ | تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز، بەرگی پێنجەم: سووڕەتی: (الأنعام) | چاپی یەك/٢٠١٥ | |
| ٨ | تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز، بەرگی شەشەم : سووڕەتی: (الأعراف) | چاپی یەك/٢٠١٦ | |
| ٩ | تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز، بەرگی حەوتەم: سووڕەتی: (الأنفال) | چاپی یەك/٢٠١٦ | |

| ژ | ناونیشان | چاپ | تێبینی |
|---|---|---|---|
| ١٠ | ته‌فسـیـری قورئانی به‌رزو به‌پێز، به‌رگی هه‌شته‌م: سووڕه‌تی: (التوبة) | چاپی یه‌ك/٢٠١٧ | |
| | ته‌فسـیـری قورئانی به‌رزو به‌پێز، به‌رگی نۆیه‌م: سووڕه‌تی: (یونس) | چاپی یه‌ك/٢٠١٨ | |
| ١١ | شوێنكه‌وتنی سوننه‌تی پێغه‌مبه‌ر (صلى الله عليه وسلم) له‌نێوان كه‌مته‌رخه‌میی و زێده‌ڕۆییدا | چاپی یه‌ك/٢٠١٥ | |
| ١٢ | ڕێبازی پێغه‌مبه‌ری خوا: پێناسه‌و گرنگیی و پێویستیی | چاپی یه‌كه‌م/٢٠١٨ | |
| | **بیـروبڕواو فیكـری ئیسـلامیی** | | |
| ١٣ | ده‌به‌رێك ڕاچوونی ئیسـلام و ڕێچكان | چاپی یه‌ك/١٩٨٥<br>چاپی سێ/٢٠٠٦ | |
| ١٤ | پرۆژه‌ی به‌رنامه‌ی فیكریی كاری ئیسـلامیی | چاپی یه‌ك/١٩٩٦ | |
| ١٥ | بنه‌ما شه‌رعییه‌كان و هێڵه‌ گشتییه‌كانی كۆمه‌ڵی ئیسـلامیی | چاپی یه‌ك/٢٠٠١<br>چاپی سێ/٢٠١٤ | وه‌رگێڕراوه‌ته‌ سه‌ر زمانی عه‌ره‌بییش |
| ١٦ | چه‌ند مه‌سـه‌له‌یه‌كی بـاوی سـه‌رده‌م، سـه‌رنجێكی واقیعییانه‌و هه‌ڵسـه‌نگاندنێكی شه‌رعییانه‌ | چاپی یه‌ك/٢٠٠٢<br>چاپی شه‌ش / ٢٠١٦ | وه‌رگێڕراوه‌ته‌ سه‌ر زمانی عه‌ره‌بی و توركـیی و فـارسـییش |
| ١٧ | خواناسـیی، ئاییـن، ئیمان (ڕاسـتییه‌كانی ئیسـلام ده‌دره‌وشێنه‌وه‌و ئه‌فسـانه‌كانی ڕێچكان ده‌پووچێنه‌وه‌) | چاپی یه‌ك/٢٠٠٢<br>چاپی دوو/٢٠٠٩ | |
| | مه‌وسـووعه‌ی : ئیمان و عه‌قیده‌ی ئیسـلامیی له‌به‌ر ڕۆشنایی قورئان و سـوننه‌تدا، (٦ به‌رگ) | چاپی یه‌ك/٢٠٠٦-٢٠٠٨ چاپی دوو/٢٠١٦ | |
| ١٨ | به‌رگی یه‌كه‌م: ئیمان و عه‌قیده‌ی ئیسلامیی چیه‌و چۆنه‌؟ | | |
| ١٩ | به‌رگی دووه‌م: خوا به‌یه‌كگرتن له‌ به‌دیهێنه‌رایه‌تیی و په‌روه‌ردگارێتییدا | | |
| ٢٠ | به‌رگی سێیه‌م: خوا به‌یه‌كگرتن له‌ ناو و سیفه‌ت و له‌په‌رستراوێتییدا | | |
| ٢١ | به‌رگی: چواره‌م: ئیمان به‌: فریشته‌كانی خوا، كتێبه‌كانی خوا، پێغه‌مبه‌رانی خوا | | |

| ژ | ناونیشان | چاپ | تێبینی |
|---|---|---|---|
| ٢٢ | بەرگی پێنجەم: ئیمان بە: ڕۆژی دواییء قەزاو قەدەر | | |
| ٢٣ | بەرگی شەشەم: تایبەتمەندیی و دیدوبۆچوونەكانی پەیڕەوانی ڕێبازی ڕاست | | |
| ٢٤ | ڕێبــازی پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم كامەیە ؟! | چاپی یەك/١٩٨٩ | دواتر خرایە نێو كتێبی (مسـوڵمانی كامڵ: بەشی یەكەم: بیروباوەڕی مسـوڵـمان) |
| ٢٥ | سـوڵمانی كـامڵ : بەشی یەكـەم : بیـروباوەڕی مسـوڵـمان | چاپی یەك/١٩٩٧ | دواتر خرایە نێو كتێبی (ئیمان و عەقیدەی ئیسـلامیی لەبەر ڕۆشنایی قورئان و سـوننەتدا) |
| ٢٦ | تەوژمی ئیسلامیی و عەلمانیی و خاڵە هاوبەش و جیاوازەكانیان | چاپی یەك/٢٠٠٨<br>چاپی سێ/٢٠١٥ | زۆربەی بە (٢٤) ئاڵقــە لە هەفتەنـامەی (هـاووڵاتیی) و، ئەوەی دیكەش بە (٩) ئاڵقە لە هەفتەنامەی (ئاوێنە)دا بڵاوكراوەتەوە |
| ٢٧ | ڕوونكردنەوەی بنەما شەرعییەكان و هێڵە گشتییەكانی كۆمەڵی ئیسـلامیی | چاپی یەك/٢٠١٢<br>چاپی سێ/٢٠١٤ | |
| ٢٨ | تەرجەمەی كوردیی عەقیدەی طــەحاویی | چاپی یەك/٢٠١٤ | |
| ٢٩ | ڕوونكردنەوەی عەقیدەی طەحــاویی | چاپی یەك/ ٢٠١٥<br>چاپی دوو/٢٠١٧ | |
| ٣٠ | سیكۆلاریزم و دیموكراسیی لەئەزموونی كوردستاندا (دیبەیتی ساڵ) | چاپی یەك/٢٠١٦ | |
| | **فیقهـی ئیسـلامیی** | | |
| | مەوسـووعەی: خواپەرسـتیی ئیسـلامیی (٤ بەرگ) | چاپی یەك/٢٠٠٠<br>چاپی دوو/٢٠٠٩ | |
| ٣١ | بەرگی یەكەم: خواپەرستیی بەگشتیی، وردە بابەتە خیلافییەكان، پاكء خاوێنیی | | |
| ٣٢ | بەرگی دووەم: نوێژ بەرپاكردن یەكەمین درووشمی خواپەرستیی | | |

| ٣٣ | بەرگی سێیەم: زەكات و ماڵ بەخشین | | |
|---|---|---|---|
| ٣٤ | بەرگی چوارەم: ڕۆژو گرتن، حەج و عومرەكردن، زیكری خواكردن | | |
| ٣٥ | بنچینە گرنگەكانی هەڵسـەكەوتی شەرعییانەو ژیرانە لەگەڵ وردە بابەتە خیلافییەكاندا | چـاپی یەك/١٩٩٩ | بۆ زمانی عەرەبیش وەرگێـڕراوە |
| ٣٦ | جـەژن و یـادو بۆنەكان و هەڵسـەنگاندنێك | چـاپی یەك/٢٠١٣ | |
| ٣٧ | چـەند بابەتێكـی هونـەریی لەبەر ڕۆشـنایی قورئـان و سـوننەتـدا | چاپی یەك/٢٠٠٩<br>چاپی دوو/٢٠١٥ | بۆ زمـانی فارسـییش تەرجەمـە كـراوە |
| ٣٨ | چەند بنەمایەكی گرنگی ماڵ و سـامان بەخشین لەڕێی خوادا | چاپی یەك/٢٠١٣ | |
| | تەزكیـەی نەفس و ڕەوشت و ئاكـار | | |
| ٣٩ | یادی خوا، گرنگیی یادی خوا لە ژیانی مرۆڤدا | چاپی یەك/١٩٨٧ | |
| ٤٠ | ڕێگای صاڵح بوون و بەرەو خوا چوون، تەزكیەی نەفس لەبەر ڕۆشنایی قورئان و سوننەتدا | چاپی یەك/١٩٩٠<br>چاپی پێنج/٢٠١٢ | وەرگێڕدراوە بۆ زمانی عەڕەبی و فارسـییش |
| ٤١ | مزگەوتەكانی كوردسـتان لەنێوان ئاوەدانكردنەوەو وێرانكردندا | چاپی یەك/١٩٩٩ | |
| ٤٢ | گەڕانەوە بۆ لای خـوا (سـبحانه وتعالى)، بەرەو خوا وەرچەرخانء وازهێنان لە گوناهو سـەرپێچیی و گۆڕانكاریی ڕیشەیی بەسـەر خۆدا هێنان | چاپی یەك/٢٠٠١<br>چاپی پێنج/٢٠١٠ | |
| ٤٣ | شـەهید كێیەو چ پلـەوپایەیەكی هـەیە ؟! | چاپی یەك/٢٠٠٢ | |
| ٤٤ | باسـێك لەبارەی بینینی خوای بەرزو مەزن لەدنیاو دواڕۆژدا | چاپی یەك/٢٠١٥ | |
| ٤٥ | گیانی ژیـان، باش خوا پەرسـتن و خۆ پاك و چاك كردن | چاپی یەك/٢٠١٥ | |
| ٤٦ | مەوســـووعەی: ڕەوشت و ئاكاری ئیســـلامیی لەبەر ڕۆشـــنایی قورئان و سـوننەتدا | چاپی یەك/٢٠١٦ | |

| بانگەوازو كاری ئیسلامیی | | | |
|---|---|---|---|
| ٤٧ | كۆمەڵی خوا | چاپی یەك/١٩٨٨ | |
| ٤٨ | پێشمەرگەی ئیسلام، یان مسوڵمانی موجاهید كێیەو چۆنە؟ | چاپی یەك/١٩٨٨<br>چاپی سێ/١٩٩٨ | |
| ٤٩ | دەردو دەرمانی بزووتنەوەی ئیسلامیی | چاپی یەك/١٩٩٠ | |
| ٥٠ | بزووتنەوەی ئیسلامیی لە دووڕیانی مان و نەماندا | چاپی یەك/١٩٩٣ | |
| ٥١ | بزووتنەوەی ئیسلامیی و قۆناغی نوێی | چاپی یەك / ١٩٩٤ | |
| ٥٢ | چەند ڕێڕوونییەك بۆ ئیسلامییەكانی كوردستان | چاپی یەك / ١٩٩٧ | |
| ٥٣ | بزووتنەوەی ئیسلامیی و ئاسۆیەكی گەش و ڕوون، بنەما شەرعی یەكان و بنچینە ئەخلاقی یەكان | چاپی ١ / ١٩٩٧ | |
| ٥٤ | ئیسلام و كێشە هەنووكەیی یەكان | چاپی یەك / ١٩٩٨ | |
| ٥٥ | زانایانی ئیسلام كێن و چۆنن ؟! | چاپی یەك/ ٢٠٠٢<br>چاپی سێ / ٢٠١١ | وەرگێڕراوەتە سەر زمانی عەرەبی |
| ٥٦ | كۆمەڵی ئیسلامیی: ئامانج و هەڵوێستەكانی | چاپی یەك/ ٢٠٠٢ | |
| ٥٧ | چۆن هەڵسوكەوت لەگەڵ خەڵكی دا بكەین؟! | چاپی یەك / ٢٠٠٢ | وەرگێڕراوەتە سەر زمانی عەرەبی |
| ٥٨ | چۆن لە جیهاد بگەین؟ | چاپی یەك / ١٩٩٨ | |
| ٥٩ | جیهاد لە ڕێی خواداو چەند سەرنج و ئاگادارییەك | چاپی یەك/ ٢٠٠٢ | |
| ٦٠ | بۆئەوەی لەسەر جیهادكردنمان قەرزدار نەبینەوە! | چاپی یەك / ٢٠٠٢ | |
| ٦١ | جیهاد لە ڕێی خوادا چی یەو بۆچی دەكرێ و چۆن دەكرێ ؟ | چاپی یەك / ٢٠٠٢ | |
| ٦٢ | چەند ڕێڕوونییەك بۆ خوشك و برایانمان لە هەندەران | چاپی یەك/ ٢٠٠٢ | |
| ٦٣ | ئیسلام و مسوڵمانەتیی و كاری ئیسلامیی، لەبەر ڕۆشنایی قورئان و سوننەتدا | چاپی یەك/٢٠٠٦ | |

| ژ | ناونیشان | چاپ | تێبینی |
|---|---|---|---|
| ٦٤ | هاوپەیمانێتی لەبەر ڕۆشنایی قورئان و سـوننەتدا | چاپی یەك / ٢٠٠٩ | |
| ٦٥ | بەشدارییکردن لە هەڵبژاردن و پەرلەماندا، هەڵسـەنگاندنێکی شەرعییانەو ژیرانە | چاپی یەك / ٢٠٠٩<br>چاپی دوو / ٢٠١٣ | چاپی یەکەم بە دوو ئاڵقەی جیاوازو بە دوو ناوونیشانی جیاواز کراوە، بەم شێوەیە:<br>ئاڵقەی یەکەم: بەڵگەکانی ئەوانەی بەشداریکردن لە هەڵبژاردن و پەرلەماندا بەشەرعیی نازانن و هەڵوەشاندنەوەیان.<br>ئاڵقەی دووەم : بەڵـگەکانی ڕەوایی بەشداریکردن لە هەڵبژاردن و پەرلەماندا |
| ٦٦ | هەڵوەشاندنەوەی بیـروڕاو ڕەفتارە پەڕگیـرانەکانی ڕێکخراوی (داعش) | چاپی یەك/ ٢٠١٥<br>چاپی دوو/٢٠١٧ | وەرگێڕاوەتە سەر زمانی فارسیی |
| ٦٧ | با لادان و تاوانی پەڕگیران، بەرانبەر بە ئیسلام نەمانخاتە دوودڵـیی و گومان | چاپـی یەك/٢٠١٥ | وەرگێڕاوەتە سەر زمانی فارسیی |
| ٦٨ | پەڕگیـریی: پێناسـەی، نیشانەکانی پەڕگیـران، هۆکارەکانی پەڕگیریی، شـوێنەوارو دەرهاوێشتەکانی، چـارەســەری | چـاپی یەك/ ٢٠١٥ | وەرگێڕاوەتە سەر زمانی فارسیی |
| | **زنجیرەی بنەمـا شەرعییەکانی کۆمەڵی ئیسـلامیی** | | |
| ٦٩ | ئاڵقەی یەکەم: بەڵگە شەرعیجیەکانی بنیاتنانی کۆمەڵی ئیسـلامیی | چاپی یەك / ٢٠٠١ | |
| ٧٠ | ئاڵقەی دووەم و سـێیەم: حوکمی لادانی خەلیفەو کاربەدەسـتانی مسـوڵمان لەکاتی لاریی و سـتەمکارییدا | چاپی یەك / ٢٠٠١ | |
| ٧١ | ئاڵقەی چـوارەم : شێخ ئەبو بەصـیـرو هەڵسـەنگاندنێکی شـەرعی یانەو ژیرانەی فەتوانامەکەی | چاپی یەك / ٢٠٠١ | |

| | وتاری کۆنگرەکانی کۆمەڵی ئیسلامیی کوردستان | | |
|---|---|---|---|
| ٧٢ | کارو پرۆژەی ئیسلامییمان (وتاری کۆنگرەی یەکەمی کۆمەڵی ئیسلامیی) | چاپی یەك/٢٠٠٥<br>چاپی دوو/ ٢٠٠٦ | |
| ٧٣ | ڕاپۆرتی : ئیمانیی، فیکریی، سیاسیی کۆمەڵی ئیسلامیی کوردستان (وتاری کۆنگرەی دووەمی کۆمەڵی ئیسلامیی) | چاپی یەك/٢٠١٠ | |
| ٧٤ | چاوپێداگێڕانەوەیەکی بارودۆخی نێوخۆمان و واقیعی دەرەکییمان (وتاری کۆنگرەی سێیەمی کۆمەڵی ئیسلامیی)، ٣٠ /٥/ ٢٠١٥ | چاپی یەك/٢٠١٦ | |
| | نەتەوایەتیی و مەسەلەی کورد | | |
| ٧٥ | کوردستان بۆ وێران بوو و چۆن ئاوەدان دەبێتەوە؟! | چاپی یەك / ١٩٨٩ | |
| ٧٦ | حوکمی گەڕانەوە ژێر نیری طاغوت لە ڕوانگەی ئیسلامەوە | چاپی یەك/١٩٩٠<br>چاپی دوو/٢٠٠٥ | |
| ٧٧ | سۆزی نەتەوایەتیی و بیری ناسیۆنالیزم لە تەرازووی ئیسلامدا | چاپی یەك/١٩٩٠، چاپی دوو/ ١٩٩٨، چاپی سێ/٢٠٠٥، چاپی چوار/ ٢٠١٨ | |
| ٧٨ | چارەسەری کێشەی کورد لە نێوان ئیمان و پەرلەماندا | چاپی یەك/١٩٩٢ | |
| | سیاسەت و حوکمڕانیی | | |
| ٧٩ | چەند بابەتێکی سیاسیی هاوچەرخ لەبەر ڕۆشنایی عەقڵ و وەحییدا | چاپی یەك / ٢٠١٠ | |
| | مەوسووعەی: ئیسلام و دەوڵەتداریی، (٤ بەرگ) | چاپی یەك / ٢٠١٤-٢٠١٦ | |
| ٨٠ | بەرگی یەکەم: قەوارەی سیاسیی لەئیسلامدا: بەڵگەکانی پێویستبوونی، چۆنیەتی بنیاتنانی، سروشت و بناغەی فیکریی، پێناسەی چەند وشەو زاراوەیەك | | |
| ٨١ | بەرگی دووەم: بنەمایەکانی سیستمی حوکمڕانیی لەئیسلامدا | | |
| ٨٢ | بەرگی سێیەم: (سێ دەستەڵاتەکان):<br>یاسادانان<br>جێبەجێکردن<br>دادوەریی | | |

| | | | |
|---|---|---|---|
| ٨٣ | بەرگی چوارەم: نا مسوڵمانان لە كۆمەڵگاو دەوڵەتی ئیسلامییدا | | |
| ٨٤ | ڕوانینێكی ئیسلامییانە بۆ واقیعی ئێستامان | چاپی یەك/٢٠١٧ | |
| | **ئافرەت و خێزان** | | |
| ٨٥ | ئافرەتی مسـوڵمانی كورد، مافە شەرعییەكانی و ئەركە گرنگەكانی | چاپی یەك / ٢٠٠٣ | |
| ٨٦ | مەوسـووعەی : ئـافرەت و خێزان لە سـایەی شــەریعـەتدا | بەرگی یەكەم چاپی یەك/٢٠٠٢<br>بەرگی یەك و دوو چـاپی سێ/٢٠١٣ | |
| | **مـێــــژوو** | | |
| ٨٧ | پوختەی ژیاننامەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، دەرس و پەندەكانی | چاپی یەك/٢٠٠٩<br>چاپی سێ/٢٠١٣ | |
| ٨٨ | چەند مەڵۆیەك لە خەرمانی تەمەنم (بیرەوەرییەكانم)، بەشی یەكەم (١٩٦١-١٩٩١) | چاپی یەك/٢٠١٥ | |
| ٨٩ | بەركولێكی كاروچالاكیی و ڕووداو و وێستگەكانی ژیانم | چاپی یەكەم/٢٠١٨ | |
| | **دیدارو گفتوگۆ** | | |
| ٩٠ | سـنووره قەدەغەكان مەشكێنن! (چاوپێكەوتنی دكتۆرحسـین محمد عزیز) | چاپی یەك/٢٠٠١<br>چاپی دوو/٢٠٠٤ | |
| ٩١ | ئەشـكەنجـەو زیندان، پێشـمەرگەیەك بیسـت و دوو مانگ لە زینـدانی داگیركـەردا | چاپی یەك / ٢٠٠٥<br>چاپی سێ/ ٢٠٠٩ | وەرگێڕراوەتە سـەر زمانی عەرەبی، هەروەها دوو تەرجەمەی فارسـیشی كراوەو چـاپ و بڵاوكراوەتەوە، هەروەها بۆ زمانی ئینگلیزیش وەرگێڕراوەو چاوەڕێی چاپە |
| ٩٢ | گەنج لە چەمكە هەنووكەییەكاندا | چاپی یەك /٢٠١٠ | |

| زنجیرەی بابەتە هەنووكەییەكان | | | |
|---|---|---|---|
| ٩٣ | گەنجەكانمان لە نێوان ڕەسەنایەتیی و لاسایی كردنەوەدا (١) | چاپی یەك/ ٢٠٠٦ | بۆ زمانی فارسییش وەرگێڕاوە |
| ٩٤ | با وریا بین ! داڕووخانی ڕەوشت كۆمەڵگاكەمان بەرەو هەڵدێر دەبات (٢) | چاپی یەك / ٢٠٠٢<br>چاپی دوو/ ٢٠٠٦ | |
| ٩٥ | بەدوورخستنەوەی ئافرەت لە ئیسلام چ زیانێك دەكەین؟! (٣) | چاپی یەك / ٢٠٠٧ | |
| ٩٦ | چۆنیەتی بوونە پێشەنگ و بنیاتنانی بنكەی جەماوەریی (٤) | چاپی یەك / ٢٠٠٧ | |
| ٩٧ | سیاسەتی ئیسلامیی و چەند ڕوونكردنەوەیەك (٥) | چاپی یەك / ٢٠٠٧ | |
| ٩٨ | چەند بنەمایەكی گرنگی وتاربێژیی (٦) | چاپی یەك / ٢٠٠٦ | بۆ زمانی فارسییش وەرگێڕاوە |
| ٩٩ | قوتابیانی زانیاری شەرعیی و چەند سەرنج و ڕێنمایی یەك (٧) | چاپی یەك / ٢٠٠٧ | |
| ١٠٠ | خوو ڕەوشتی بەرزو پەسند سەنگی مەحەكی مسوڵمانەتییە (٨) | چاپی یەك / ٢٠٠٧ | |
| ١٠١ | بانگەواز بۆ لای خودا، چی یەو چۆنەو بە كێ دەكرێ؟ (٩) | چاپی یەك / ٢٠٠٧ | بۆ زمانی فارسییش وەرگێڕاوە |
| ١٠٢ | قوتابیان لەم هەل و مەرجەدا، پێویستە چۆن بن و چی بكەن ؟! (١٠) | چاپی یەك / ٢٠٠٨ | |
| ١٠٣ | واقیعی هەرێمی كوردستان، دیدێكی ئیسلامییانە (١١) | چاپی یەك / ٢٠٠٨ | |
| ١٠٤ | سروشت و پایەكانی خێزان و مەسەلەی چەندژنیی لە تەرازووی شەرع و عەقڵدا (١٢) | چاپی یەك/٢٠٠٩ | ئەم نامیلكەیە بە(١٤) ئاڵقە لە ڕۆژنامەی (ڕۆژنامە)دا بڵاوكراوەتەوە |
| ١٠٥ | كاری ئیسلامیی و ڕەواندنەوەی چەند تەمومژێك (١٣) | چاپی یەك / ٢٠١١ | |
| ١٠٦ | حوكمی لە ئیسلام هەڵگەڕانەوەو هەڵسەنگاندنێك (١٤) | چاپی یەك/ ٢٠١١ | |
| ١٠٧ | مەلای گەورەی كۆیەو تەفسیرەكەی و چەند سەرنجێك (١٥) | چاپی یەك / ٢٠١١ | |

| | | | |
|---|---|---|---|
| ١٠٨ | لێکۆڵینەوەیەك لەبارەی : هەبوون و نەبوونی نەسخ لە قورئاندا (١٦) | چاپی یەك / ٢٠١٢ | |
| ١٠٩ | تاقیکردنەوەی خوا بۆ بەندەکانی چی یەو چۆنە؟ (١٧) | چاپی یەك/ ٢٠٠٣<br>چاپی دوو/ ٢٠١٢ | |
| ١١٠ | ڕەوەندی کورد لە هەندەران و ئەرکی سەرشانی (١٨) | چاپی یەك / ٢٠١٢ | |
| ١١١ | خاتوون مەلاژن : ئافرەتێکی هەڵکەوتوو و هاوسەرێکی ناوازە (١٩) | چاپی یەك / ٢٠١٢ | |
| ١١٢ | گەنج و قەیرانی ڕووحیی: هۆکار، شوێنەوار، چارەسەر (٢٠) | چاپی یەك ٢٠١٧ | |
| ١١٣ | ژیان لەسایەی ئیمانداو ڕەواندنەوەی گومانەکان (٢١) | چاپی یەك/ ٢٠١٧ | |
| **ب- کتێبە عەرەبییەکان** | | | |
| | موسوعة : الإسلام كما يتجلّى في كتاب الله | ط الأولى/٢٠١٥ | کە لە چاپی یەکەمدا (٨) بەرگەو، لە چاپی دووەمیدا لە (١٢) کتێبدا دەبێ، بەم شێوەیە: |
| ١١٤ | الكتاب الأول: الإسلام: معرفة صحيحة بالخالق عز وجل والخلق | ط الثانية/٢٠١٦ | |
| ١١٥ | الكتاب الثاني: تعريف الإيمان | ط االثانية/٢٠١٧ | |
| ١١٦ | الكتاب الثالث: الإيمان بالله تبارك وتعالى: الخالق الرب المالك الإله ذي الأسماء الحسنى والصفات العلى | ط الثانية/٢٠١٧ | |
| ١١٧ | الكتاب الرابع: الإيمان بالملائكة و بالجن | ط الثانية/٢٠١٧ | |
| ١١٨ | الكتاب الخامس: الإيمان بكتب الله الحكيم | ط الثانية/٢٠١٧ | |
| ١١٩ | الكتاب السادس: الإيمان برسل الله تعالى وأنبيائه الكرام | ط الثانية/٢٠١٧ | |
| ١٢٠ | الكتاب السابع: خاتم النبيين محمد صلى الله علية وسلم: موجز سيرته وبراهين نبوّته | | |
| ١٢١ | الكتاب الثامن: الإيمان باليوم الآخر وموجز عن القدر | | |
| ١٢٢ | الكتاب التاسع: إهتداء الإنسان بهدى الله، أو الإلتزام الفردي بشريعة الله | | |

| | | | |
|---|---|---|---|
| ١٢٣ | الكتاب العاشر: إلتزام المجتمع بشريعة الله تعالى | | |
| ١٢٤ | الكتاب الحادي عشر: تطبيق المجتمع للشريعة و معالم الدولة في الإسلام | | |
| ١٢٥ | الكتاب الثاني عشر: الإسلام: نظرة سديدة تجاه الناس وتعامل صحيح معهم | | |
| ١٢٦ | نقض فكرة التطرف | "ط الأولى/٢٠١٦-لندن-، ط الثانية/ ٢٠١٧، -القاهرة (نقض التطرف ودحض أفكار المتطرفين)" | |
| ١٢٧ | ضيف و قضية (مقابلة مع قناة العربية) | ط الأولى/٢٠٠٦ | |
| ١٢٨ | لقاء خاص (مقابلة مع قناة العالم) | ط الأولى/٢٠٠٦ | |
| ١٢٩ | حديث مختصر حول مايجري على الساحة العراقية | ط الأولى /٢٠١٦ | |
| ١٣٠ | طريق الصلاح والسير الى الله / تزكية النفس في ضوء القرآن والسنة | ط الأولى/٢٠١٢ | |
| ١٣١ | أمير وراء القضبان | ط الأولى/ ٢٠٠٩ | |
| ١٣٢ | مسائل عصرية رائجة | ط الثانية/٢٠١٤ | |
| ١٣٣ | قواعد مهمة في التعامل الشرعي الحكيم مع المسائل الفرعية الخلافية | ط الأولى/ ٢٠١١ | |
| ١٣٤ | علماء الإسلام من هم وماهي صفاتهم؟ | ط الأولى/ ٢٠٠٥ | |
| ١٣٥ | الأُصول الشرعية والخطوط العامة للجماعة الإسلامية | ط الأولى/ ٢٠١٢ | |
| ١٣٦ | كيف نتعامل مع الناس؟ | ط الأولى/٢٠٠٢ | |
| ١٣٧ | حوارات ساخنة حول قضايا راهنة، في ميادين الفكر والفقه والدعوة والسياسة | ط الأولى/٢٠١٨ | |
| ١٣٨ | العلمانية والديمقراطية في تجربة كوردستان | ط الأولى/٢٠١٨ | |
| | ئەو كتێبانەی لەژێر چاپن | | |
| ١٣٩ | تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز، بەرگی دەیەم: سوورەتی: (هود) | | |
| ١٤٠ | تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز، بەرگی یازدەیەم: سوورەتی: (یوسف) | | |

| مەوسووعەی: بیرکردنەوەی ئیسلامیی لەنێوان وەحیی و واقیعدا | |
|---|---|
| کتێبی یەکەم: پێناسەو چییەت و سەرگوزشتەو سەرچاوەکان و گرنگیی: بیرکردنەوەی ئیسلامیی | ١٤١ |
| کتێبی دووەم: هێڵە گشتییەکانی ڕێبازی جەماوەری مسوڵمانان | ١٤٢ |
| کتێبی سێیەم: تەوژمە فیکرییە سیاسییەکانی مێژووی مسوڵمانان | ١٤٣ |
| کتێبی چوارەم: پایەکانی بیرکردنەوەی ئیسلامیی | ١٤٤ |
| کتێبی پێنجەم: چەند پرسێکی فیکریی هەنووکەیی جۆراوجۆر | ١٤٥ |
| مەوسووعەی: درەوشاوەیی ئیمان و پووچەڵی ئیلحاد لەبەر ڕۆشنایی: زگماك و عەقڵ و زانست و وەحیی دا. | ١٤٦ |

ameer.maktab@yahoo.com

 /AliBapir  /AliBapir  /MediaAmeerOffice

www.alibapir.net

## نێـوەڕۆك

# قورئان و پاكسازيى و چاكسازيى

# لە هەرێمی كوردستاندا

بەدڵنیایی كۆمەڵگای زیندوو و تەندروست، ئەو كۆمەڵگایەیە كەتاكەكانی بەگشتیی بەوردو درشت و سەرو خوارەوە، خۆیان لەبەرانبەر دین و ژینی كۆمەڵگایەكەیاندا بەبەرپرسیار دەزانن و، هیچ كاتێك بەڕەوای نازانن گوێی خۆیان لەئاست گیرو گرفت و هاوارو ئازارەكانیدا بخەوێنن و، هەرگیز لەخۆیانی ناوەشێننەوە، لەبەرانبەر دەردو نەخۆشیی و نەهامەتییەكانیدا چاوی خۆیان بنووقێنن!

ئنجا ئەم بەرهەمەی بەردەستیشت هەوڵ و هەنگاوێكی دیكەی بەندەیە لەوپێناوەدا "دوای كتێبی: (ڕوانینێكی ئیسلامییانە بۆ واقیعی ئێستامان: گرفت و چارەسەر)" كە هیوادارم كەلێنێكی باش بگرێ و، مایەی بەرچاو ڕوونیی و هۆشیاریی و بێداریی زیاتری خەڵكێكی زۆر بێ.


ameer.maktab@yahoo.com

 /AliBapir  /AliBapir  /MediaAmeerOffice

www.alibapir.net


COVER DESGIN